# سینۆهە



## پزیشکی تایبەتی فیرعەون







میکا ڤالتاری

وەرگێڕانی: عیمران هاواری

لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

زنجیرە: (٣٢٦)

## ناسنامەی کتێب


• **سینوهە/ پزیشکی تایبەتی فیرعەون**

• نوسینی: میکا ڤالتاری

• وەرگێڕانی: عیمران هاواری

• بابەت: ڕۆمانی مێژوویی

• نەخشەسازی و بەرگ: فواد کەوڵۆسی

• بەرگ: بەرگی یەکەم

• نۆبەت و ساڵی چاپ: یەکەم، ٢٠١١

• شوێنی چاپ: چاپخانەی کەنج

• تیراژ: ١٠٠٠

لەبەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانەگشتییەکان ژمارە سپاردنی: ١٣٨٧ی ساڵی ٢٠١١ی پێدراوە.


ناونیشان: سلێمانی ــ بازاڕی سلێمانی ــ بەرامبەر بازاڕی خەفاف.

ژمارەی مۆبایل: (٠٧٧٠١٥٧٤٢٩٣)، (٠٧٥٠١١٩١٨٤٧)



# پێڕست

# پێشەکی وەرگێڕ و ڕونکردنەوەیەک سەبارەت بە شێوازی داڕشتنی کتێبی سینۆهە

ئێستا سالّی ١٣٦٤ی هەتاوی سەدەی چواردەیەمی پیرۆزی ئیسلامە و لەوباوەڕەدانیم کە تا کۆتایی ئەم سەدەیە، لەبازاڕی وێژە"ئەدەب"ی جیهاندا کتێبێك بلاّو بکرێتەوە کە لەڕوی مێژووی دێرینی ولاّتانی ڕۆژهەلاّتی ناوەڕاست و لێکدانەوەی کۆمەلاّیەتی و دەرونناسی ئەو مێژووەوە، بتوانێت لەبەرامبەر ئەم کتێبەدا کە "١٣٥٠ سالّ پێش لە دایکبوونی مەسیح" نوسراوەتەوە بوەستێت.

ئێمە ئەم مێژووە لەسەرەتای دەستەلاّتی زنجیرەی نۆزدەیەمی فیرعۆنەکانی میسرەوە دەرمانهێناوەو بەشێوەیەك کە"سینۆهە"نوسەری ئەم کتێبە باسی دەکات شەش سالّ دوای دەستپێکردنی دەستەلاّتی ئەو پیاوە لەمیسردا دور دەخرێتەوە و دەست بەنوسینی ئەم کتێبە دەکات، بۆئەوەی ئێمە دوچاری هیچ هەڵەیەك نەبین مێژووی نوسینی ئەم کتێبە لەسالّی١٣٥٠ی پێش زاین، کە بەسالّی فەرماڕەوایی و دەستەلاّتی زنجیرەی نۆزدەیەمی فیرعەونەکانی لەقەلّەم دەدەین و ئاشکرایە بۆ بەدەست هێنانی مێژووی ڕاستەقینەی سەرەتای نوسینی ئەم کتێبە دەبێت ماوەی شەش سالّ لە مێژووی هاتنە سەر تەختی ئەو پیاوە کەم بکەینەوە.

خوێنەرانی ئەم کتێبە ئیتر چ لاو بن یان پیر، سود لەخوێندنەوەی ئەم مێژووە دێرینە کە لەهەمان کاتدا هەویرێکە لەهەلّسەنگاندن و شیکردنەوەی کۆمەلاّیەتی و دەرونی، وەردەگرن.

بەلاّم ئەگەر لاون من ئەوەتان پێ ڕادەسپێرم دوای خوێندنەوەی، ئەو کتێبە لەدەست نەدەن و لەلای خۆتان هەلّی بگرن و بیپارێزن، بۆئەوەی کاتێك تەمەنتان

گەشتە شەست ساڵی یان زیاتر دوبارە سەرلەنوێ ئەم کتێبە بخوێننەوە، لەوکاتەدا هونەری"سینوهە"نوسەری ئەم کتێبەتان جوانتر بۆ دەردەکەوێت و زیاتر پەی بەلێکدانەوەی کۆمەڵایەتی و دەرونی ئەم کتێبە دەبەن.

یەکێك لەسودەکانی ئەم کتێبە، ڕاوەستانە لەبەرامبەر مێژووی هەندێك لە وڵاتانی ڕۆژهەڵاتدا کە لەهەندێك مێژووی گشتیدا بگرە ناوەکانیشیان نەنوسیون و لەهەندێکی تردا، ناویان هێناون بێئەوەی لەڕویی مێژووییەوە باسیان بکەن، بەڵام لەم کتێبەدا، ئێمە چەند زانیاریەکی تاڕادەیەك سادەمان لەمێژووی نەتەوەی وەك"هاتی"و "میتانی"و "کوش" بەدەست هێناوە.

وەرگێڕ بەپێویستی دەزانێت ئەوە بەخوێنەران بڵێت کە شێوازی داڕشتنی ئەم کتێبە، بەپێنوسی "سینۆهە"شێوازێکە کە دەقاودەق وەك شێوازی داڕشتنی باوباپیرە سەرەتاییەکانمانن و لەو شێوازەدا، هەندێك لەڕستە کورتەکان دوبارە دەبنەوە بێئەوەی دووبارەکردنەوەیان ناپەسەند بێتە بەرچاو. ئەویتریشیان ئەوەیە کە لەسەردەمی تاریکی سەدە و هەزارەی پێش زایندا، نەتەوە نەزانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست شەراب و ئارەقیان دەخواردەوە و خواردنەوەی ئارەق و شەراب لەلای ئەوان، بەڵگەی ئەوە نیە کە وەرگێڕ یان بڵاوکەرەوەکەی بێزار نەبن لەدەرئەنجامی زیان و تاوانی جەستەیی و گیانی ئەم جۆرە ڕەفتارانە.

یەکێك لەبەشە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەم کتێبە ئەوەیە کە لەمیسری دێریندا، فیرعەونەکانی میسر بەدەستی پزیشکەکانی خۆیان بەکوشت دەدران، هەروەها بەشە گرنگەکانی تری ئەم کتێبە، پەیوەست دەکرێت بە بەرفراوانی زانستی پزیشکی لەڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و بەتایبەت لەوڵاتی میسردا.

بێزیادەڕۆیی هیچ بەشێك لەم کتێبە بەدی ناکرێت کە لەڕوی لێوانلێو بونی لەزانیاری مێژووی دێرین بەسود نەبێت و دوبارە بێ زیادە ڕۆیی، بەکۆمەڵە کتێبێکی فەرهەنگنامەی مێژوویی بۆ خوێندنەوەی مێژووی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لەسەدە و هەزارەی پێش زاین لەقەڵەم دەدرێت و هەندێك بەش و بابەتی مێژوویی ئەم کتێبە شایستەی ئەوەیە بەیادی بسپێریت.

لەمیرزا نوسێکی وەك من ئەوە پەسەند ناکرێت کاتێك کتێبێك وەردەگێڕم، خۆم لەو ئاستەدا ببینم کە توانای هەڵسەنگاندن و ستایشکردنی ئەم کتێبەم هەبێت، بەڵام

بێئەوەی زیادەڕۆیی بکەم دەڵێم کتێبی "سینۆهە پزیشکی تایبەتی فیرعەون"کە ئێستا لەبەردەستاندایە، کتێبێکە کە دوای ئەوەی خوێندتەوە ئاگاداری ئەوە دەبیت کەشایستەی ئەوە بووە کە ئەو هەموو کاتە بۆ خوێندنەوەی تەرخان بکەیت.

زبیح الله حکیم الهی دەشتی

کە لەڕوی نوسینەوە بە((زبیح الله منسوری)) ناوبانگی هەیە.

## چەند وشەیەك دەربارەی وەرگێڕانی نوسینی میسری بۆ یەكێك لە نوسینە نێونەتەوەییەكان

دوای ئەوەی چاپی یەكەمی"سینۆهە پزیشكی تایبەتی فیرعەون" بڵاو كرایەوە، چەند كەسێك لەخوێنەرانی ئەم كتێبە، لەڕێی نامەوە پەیوەندیان بە وەرگێڕەوە كرد و داوایان لێ كرد كە ئەوەیان بۆ باس بكات كتێبی"سینۆهە"كە بەنوسینی وێنەیی میسری نوسراوەتەوە چ كاتێك وەرگێڕدرا بۆ نوسینە نێو نەتەوەییەكان و وەگێڕەكەی كێ بوو؟

بەو شێوەیەی كە هەموو كەسێك دەزانێت و ئاگادارە نوسینی سەرەكی میسری "هیرۆگلیفی"بووە، بەواتا نوسینی وێنەیی. میسریە كۆنەكان شێوەی مرۆڤ و گیانەوەر و ڕووەك و بێگیانەكانیان دەكێشا و مەبەستی خۆیان لەڕێی ئەو شێوە و وێنانەوە دەخستە ڕوو.

فێركارانی میسری كە نوسینی وێنەییان فێری خوێندكارەكانیان دەكرد، تەنها وێنەی نوسینەكانیان دەكێشا و زۆر گرنگیان بە تاریك و ڕونی شێوەكان نەدەدا، بۆیە ئەوەی بەدەستی فێرخوازەكان دەنوسرا وێنەبوو نەك وێنەكێشان. مێژووی پەیدابونی هێرۆگلیفی (نوسینی وێنەیی میسری) تائێستاش لەلای مێژوو نوسەكان نادیارە و دەڵێن هەر ئەو سەردەمانەی یەكەمین زینجیرە فیرعەونەكان لەمیسردا فەرمانڕەواییان گرتووەتە دەست، نوسینی وێنەیی بونی هەبووە و بەگوتەی مێژوو نوسەكان نوسینی وێنەیی لەبیروباوەڕی ئاینی میسرەوە لەدایك بووە. سەرەڕای ئەوەی مێژوو نوسەكان دەربارەی زنجیرە فیرعەونەكانی میسر ناكۆك و ناتەبان، بەڵام بۆچونیان دەربارەی سێ سەردەمی مەزن كە لەمێژووی فیرعەونەكانی میسردا هاتووەتە بون لەیەك دەچێت و هاوڕان و ئەو سەردەمانەش بەسێ سەردەمی"كۆن...ناوەند ...نوێ" دابەش دەكرێت.

لەسەردەمی کۆندا کە لەساڵی ٣٤٠٠ تاساڵی ٢٤٧٥ی پێش زاینی خایاند نوسینی وێنەیی"هیرۆگلیفی" گۆڕانکاری بەسەردا نەهات، بەڵام لەسەردەمی "نێوەند"دا کە لە"ساڵی ٢٤٧٥ تا ساڵی ١٧٨٨ی پێش زاین و لەسەردەمی"نوێ" کەلەساڵی ١٧٨٨ تا ساڵی ١٠٩٠ی پێش زاین درێژ دەبێتەوە، شێوازی نوسینی وێنەیی میسری گۆڕانی زۆری بەسەردا هات. گۆڕین لەشێوازی نوسین، بەشێوەیەك هاتە پێش کە نوسەرەکان یان(وێنەکێشەکان) لەپانی گۆشەکانیان کەم کردەوە و شێوەی گۆشە تیژیان لێ دروست کردن و هێڵەکانیان کورتتر کردەوە و ئەوەندە کورتیان کردنەوە کە هەندێك لەهێڵەکانیان لەشێوەی خاڵێکدا هێلایەوە، لەم کاتەدا ئەگەر نوسەرێك بیویستایە وێنەی باڵندەیەك بکێشێت وەك باوباپیرانی وێنەیەکی تەواوی باڵندەیەکی نەدەکێشا، بەڵکو دوو هێڵی ئاسۆیی کورتی دووباڵی باڵندەی دەکێشا لەگەڵ هێڵێکی ستونی کورت کە وێنەی هەردوو پێی دەنواند.

نوسەرانی میسر ئەوەندە لە گۆشە و کەوان و هێڵی شێوەکانی هێرۆگلیفیان کەم کردەوە تا ئەوەیکە نوسینی باوی "دمۆتیك" دروستبوو.

ئەو ڕۆژەی کە"سینۆهە" هەر بەوشێوەی لەم کتێبەدا دەنوسێت لەقەراخ دەریای ڕۆژهەلات نیشتەجێ دەبێت و دەست بەنوسینی یادگاری خۆی دەکات، نوسینی وێنەیی میسری چیتر نوسینی وێنەیی کۆن نەبوو و میسریەکان بەنوسینی "دمۆتیك" کە بەنوسینێکی"ئەلف بێ"لەقەڵەم دەدرا دەیاننوسی و"سینۆهە" یادگاریەکانی خۆی بەهەمان ئەو نوسینە نوسیەوەو (میکاڤاڵتاری) کە کۆکەرەوەی کتێبی(سینۆهە)یە، لەنوسینی(دمۆتیك)وە وەریگێڕایە سەر زمانی "فنلاندی"و دوای ئەوە ئەم کتێبە وەرگێردرا بۆ تەواوی زمانە ئۆروپاییە بەرفراوانەکان و ئەوەی بە گۆڕینی نوسینی وێنەیی مسیرییەوە پەیوەست دەکرێت، کەوتە بەرچاوی خوێنەرانەوە، بۆم ئەم کارە (میکاڤاڵتاری) سودی لەم دوو سەرچاوەیە وەرگرتووە "اقتباس"کە یەکێکیان فەرهەنگی زمانی زانستی و وێژەیی(کۆلۆمبیا)یيە و ئەویتریان پێشەکی ناوەڕۆکی "فەرانسا"ی کتێبی(سینۆهە پزیشکی تایبەتی فیرعەون)ە.

## پێشەکیەکی کورتی نوسەر

ناوی من، نوسەری ئەم کتێبە"سینۆهە"یە و من ئەم کتێبە بۆ پیاهەڵدان بەسەر خوداکاندا نانوسم، چونکە لەخوداکان بێزار بووم. من ئەم کتێبە بۆ باس و پیاداهەڵدانی فرعەونەکان نانوسم، چونکە لەفرعەونەکانیش بێزار بوم. من ئەم کتێبە تەنها بۆ خۆم دەنوسم بێئەوەی چاوەڕێی پاداشتێك بکەم یان ئەوەیکە بمەوێت ناوبانگم لەجیهاندا بمێنێتەوە.

لەژیاندا ئەوەندە لەفیرعەون و خەڵکی ئازارم چێشتووە کە لەهەموو شتێك بگرە لەهیوای بەدەستهێنانی جاویدانیش وەڕسم.

من ئەم کتێبە تەنها بۆئەوە دەنوسم کە خۆم ڕازی بکەم و لەوباوەڕەشدام تاکە نوسەریم کە بیٚ هیچ مەبەستێکی سامانی و دەرونی کتێبێك دەنوسم.

ئەوەی تا ئەمرۆ نوسراوەتەوە، یان بۆخۆشحاڵکردنی خوداکان بووە یان بۆ ئەوەی مرۆڤەکان ڕازی بکەن.

من فیرعەونەکان بەبەشێك لەمرۆڤەکان دەزانم، چونکە هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ ئێمەدا نیە و من ئەم بابەتە بەهەموو باوەڕێکمەوە باس دەکەم.

من لەبەرئەوەی لەنزیکەوە پزیشکی فیرعەونەکان بوم، شەووڕۆژ، لەگەڵ فیرعەونە کاندا دانیشتوم و گفتوگۆم لەگەڵیاندا کردووە و دەزانم کە ئەمانیش لەڕوی لاوازی و ترس و زەبونی و هەستەکانیانەوە وەك ئێمەن. بگرە ئەگەر فیرعەونێك هەزار ئەوەندەی تر گەورەتر بکەن و بیخەنە ڕیزی خوداکانەوە سەرەڕای ئەوەش هەر مرۆڤەو وەك ئێمە دەمێنێتەوە.

ئەوەی تا ئەمرۆ نوسراوەتەوەو بەدەستی نوسەرانێك بڵاوكراوەتەوە كە گوێڕایەڵی فەرمانەكانی دەستەڵاتداران بون و تەنها بۆ ئەوە دەیانوسی كە ڕاستیەكان ئاوەژوو بكەن.

من تا ئەمرۆ كتێبێكم بەرچاو نەوكەوتووە كە باسی ڕاستی تێدا كرابێت.

لەو جۆرە كتێبانەدا یان چەورەییان بۆ خوداكان یان چەورەییان بۆ خەڵكی – مەبەست فیرعەونەكان– كردووە. لەم جیهانەدا تا ئەمڕۆ لەهیچ كتێب و نوسراوێكدا ڕاستی بونی نەبووە، لەوباوەڕەشدام كە دوای ئەمانەش ڕاستی لەنێو كتێب و نوسراوەكاندا بونیان نابێت.

لەوانەیە گۆڕانكاری بەسەر پۆشاك و زمان و نەریت و بیروباوەڕی خەڵكیدا بێت، بەڵام هیچ گۆڕانێك بەسەر گەمژەییاندا نایەت و لەهەموو چەرخێكدا دەتوانرێت لەڕێی گوتارو نوسینە درۆینەكانەوە فریویان بدەیت، چونكە هەروەك چۆن مێش حەزی لەهەنگوینە، خەڵیكیش بەهەمان شێوە حەزیان لە درۆ و خۆ نواندن"ڕیا" و ئەو بەڵێنە پوچانەیە كە هەرگیز نابنە كردار.

ئایا نابینیت خەڵكی بەچ شێوەیەك لەگۆڕەپاندا چواردەوری ئەو چیرۆك بێژە شڕپۆشەیان داوە كە لەسەر زەوی دانیشتووە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش گوێی بۆ دەگرن كە بەچ شێوەیەك باسی زێڕ و گەوهەریان بۆ دەكات و بەڵێنی پێدانی گەنجینەیان پێدەدات، بەڵام من كە ناوم"سینۆهە"یە لەم كۆتایی تەمەنەمدا زۆر لەدرۆكردن بێزارم ، هەر لەبەرئەوەش ئەم كتێبە بۆ خۆم دەنوسم نەك بۆ خەڵكی.

من نامەوێت هیچ كەسێك ئەم كتێبەی من بخوێنێتەوە و ستایشی بكات. نامەوێت منداڵان لەقوتابخانەكاندا چەند بڕگەیەكی ئەم كتێبەم لەسەر تەختە ڕەشی پۆلەكەیاندا بنوسنەوە و مەشق لەسەر گوتەكانم بكەن، نامەوێت كەسانی بیرمەند لەكاتی گفتوگۆكردنیان لەگەڵ یەكدا چەند بڕگەیەك لەگوتە و نوسراوەكانی من وەك گەواهیەك بهێننەوە و لەم ڕێیەوە زانست و ژیری خۆیان بسەلمێنن.

هەموو كەسێك كاتێك شتێك دەنوسێت بەهیوای ئەوەیە لەدوای خۆی، نوسراوەكەی بخوێننە و ستایشی بكەن و هیچ كاتێك ناوی فەرامۆش نەكەن.

بەمشێوەیە بیروباوەڕەكەی دەخاتە ژێر پێی خۆیەوە و ڕەنگی كۆمەڵی دەوروبەری خۆی دەگرێت و كەمتەرخەمترین و بێواتاترین گوتەیەك دەنوسێتەوە كەخۆی باوەڕی

پێیاننیە، تەنها بۆئەوەی کەسانی تر ستایش و دەستخۆشی لێ بکەن، بەڵام من لەبەرئەوە نامەوێت هیچ کەسێك ئەم کتێبەم بخوێنێتەوە، چونکە هاوڕەنگی کۆمەڵگا نابم و ستایشی خەیاڵپلاوی و ئەفسانەکانیان ناکەم.

من لەوباوەڕەدام مرۆڤ گۆڕانکاری بەسەردا نایەت بگرە ئەگەر سەدهەزار ساڵی بەسەردا تێپەڕێت. ئەگەر مرۆڤێك نوقمی ڕوبارێك بکەیت و دەری بهێنیتەوە هەر کە جلەکانی بەری وشك بویەوە، دەگەڕێتەوە بۆ هەمان ئەو مرۆڤەی کە پێشتر بووە.

ئەگەر مرۆڤێك نوقمی خەمەکان بکەیت، ئەوا لەکردارەکانی ڕابردووی پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام هەر ئەو کاتەی خەمەکانی لەناو چون، دوبارە دەگەڕێتەوە بارودۆخی جارانی و هەروەك جاران خۆپەرست و بێبەزەیی دەبێت.

کاتێك شێوە و ڕەنگی هەندێك لەشتەکان و گفتوگۆی هەندێك لەخێڵەکان گۆڕانکاری بەسەردا دێت و هەندێك خواردن و جل وبەرگی ئەو سەردەمە دەبێتە شتێك کە دوێنێ نەبووە، خەڵکی والێکی دەدەنەوە کە ئەمڕۆ جیاوازە لەدوێنێ، بەڵام من دەزانم کە وانیە و لەئایندەشدا وەك ئەمڕۆ و دوێنێ هیچ کەسێك حەز لەڕاستیەکان ناکات.

لەبەرئـەوەش نامـەوێت هـیچ کەسـێك ئـەم کتێبـەم بخوێنێتـەوە و حـەز دەکـەم لەئایندەدا ناوم ون بێت و گوم ناو ببم.

من ئەم کتێبە لەبەرئەوە دەنوسم، کە دەزانم ئەم زانینەی منیش وەك تێزاب دڵی مرۆڤ دادەڕزێنێت و دەیخوات، لەهەمان کاتدا ئەگەر مرۆڤێکیش دانایی خۆی بەکەسانی تر نەڵێت، دڵی لەناو دەچێت.

من ناتوانم باسی دانایی خۆم بۆ کەسانی تر بکەم و هەر لەبەرئەوەش بۆ خۆمی دەنوسمەوە بۆئەوەی بەم شێوەیە دڵنەوایی خۆم بدەمەوە.

من لەسەردەمی ژیانمدا شتگەلێکم بینی. بەچاوی خۆم بینیومە کە کوڕ باوکی خۆی کوشتووە. بینیومە کە کەسانی کەمدەست دژی کەسە دەوڵەمەندەکان بگرە چینی خوداکانیش ڕاپەڕیون. بەچاوی خۆم ئەو کەسانەشم بینیوە کە سەردەمانێك لەقاپی زێڕیندا ئاویان خواردۆتەوە، دواجارلەکەنار ڕوبارەکاندا بەمشتی دەستیان ئاویان دەخواردەوە. ئەو کەسانەشم بینیوە کە سەردەمانێك زێڕی خۆیان بەقەپان

کێشانە دەکرد، ژنی خۆیان لەبەرامبەر یەك دەستبەندی "مس"دا فرۆشتووە بەڕەش پێستەکان، بۆ ئەوەی بتوانن نان بۆ منداڵانی هەمان ئەو ژنەیان بکڕن.

لەڕابردوودا جێگای من لەکۆشکی فیرعەوندا لەلای دەستی ڕاستی فیرعەونەوە بوو، ئەو کەسە مەزنانەی کە سەدەها کۆیلەیان هەبوو چەورەییان بۆ دەکردم و دیاریان بۆ دەناردم، هەروەها خاوەنی ملوانکەی ئاڵتونی بوم.

ئەمرۆش لێرەدا- کە خاڵێکە دەکەوێتە قەراخ دەریاری ڕۆژهەڵاتەوە- دەژیم، بەڵام سەروەت و سامانم لەدەست نەداوە و هەر بەوشێوەیەش بەدەوڵەمەندی ماومەتەوە و بەندەکانم هەردوو دەستیان لەسەر ئەژنۆیان دادەنێن و لەبەرامبەرمدا سەرم بۆ دادەنەوێنن.

هۆکاری ئەوەی منیان لەمیسر و شاری"تبس"دور خستەوە و ناردمیانە ئێرە ئەوەیە کە من لەژیاندا هەموو شتێکم هەبوو، بەڵام ویستم شتێك بەدەست بهێنم کە پێویستی بەدەست هێنانی ئەو شتەش ئەوەیە مرۆڤ دەبێت هەموو شتێکی لەدەست بدات.

من دەمویست ڕاستی فەرمانڕەوا بێت و خۆنواندن"ریا" و درۆ و ڕوکەشپەرستی لەناو بچێت، بەڵام نەمزانی کە فەرمانڕەوایی ڕاستی لەژیانی مرۆڤەکاندا شتێکی مەحاڵە و هەرکەسێك ڕاستگۆبێت و ڕاستگۆیانە بژی دەبێت هەموو شتێکی لەدەست بدات و منیش سەرەڕای ئەوەش دەبێت زۆر خۆشحاڵبم کە هێشتا سەرەوەت و سامانی خۆم پاراستووە و لەدەستم نەداوە.

*بەشی یەکەم*

## سەردەمی منداڵی

ئەو پیاوەی من بەناوی باوك بانگی دەکەم لەشاری"تبس"بەواتا مەزنترین و جوانترین شاری جیهان، پزیشکی کەسە کەمدەستەکان بوو، ئەو ژنەی کە بەدایك بانگم دەکرد بەهاوسەری ئەو لەقەڵەم دەدرا. ئەم ژن و مێردە تا ئەوکاتەی پیر بون متداڵیان نەبوو، لەبەرئەوە منیان وەك کوڕی خۆیان پەسەند کرد.

ئەوان لەبەرئەوەی سادە بوون دەیانوت کە خودا منی بۆ ئەوان ناردووە و نەیاندەزانی کە ئەم دیاریەی خوداکەیان، چەندێك بۆ ئەوان دەبێتە مایەی بەدبەختی.

دایکم منی بە"سینۆهە" بانگ دەکرد، چونکە ئەم ژنە زۆر حەزی لە چیرۆك بوو ناوی "سینۆهە"ی لەیەکێك لە چیرۆك و داستانەکاندا بیستبوو.

یەکێك لە داستانە بەناوبانگەکانی میسر ئەوەیە کە"سینۆهە"بەپێی ڕێکەوت ڕۆژێکیان لەدەواری فیرعەوندا نهێنیەکی هەڕەشەئامێزی بیست و کاتێکیش پەیی بەوە برد کە فیرعەون ئاگاداری ئەوە بووە کە ئەو ئاگاداری ئەم نهێنیە بووە، لەترسی گیانی خۆی هەڵهات و بۆ ماوەیەك لە بیابانەکاندا دوچاری جۆرەها نەهامەتی بوو، تا ئەوەبوو لەکۆتاییدا سەرکەوتنی بەدەست هێنا.

دایکیشم وای دەزانی کە من تا گەشتومەتە لای ئەو بەهەموونەهامەتیەکاندا تێپەڕیوم و چیتر دوای گەشتنیشم بەو لەهەموو نەهامەتیەك ڕزگارم بووە.

کاهینەکانی میسر دەڵێن کە ناوی هەموو کەسێك ڕەنگدەرەوەی چارەنوسییەتی و لەڕێی ناوەوە دەتوانیت ئاگاداری ئەوە بیت کە چی بەسەر ئەو کەسەدا هاتووە.

لەوانەیە هەر لەبەرئەوەش بێت منیش لەژیاندا گرفتاری جۆرەها نەهامەتی بوبێتم و بۆ وڵاتانی بێگانە کۆچم کردبێت و پەیم بەنهێنی ژنەکانیان بردبێت"ئەو نهێنیانەی کە دەبووە هۆکاری مەرگی ئەو کەسانەی پەییان پێ ببردایە". بەڵام من لەوباوەڕەدام ئەگەر ناوێکی ترم ببوایە، هەر دوچاری ئەم نەهامەتی و هەڕەشانە دەبومەوە و "ناو"یش هیچ کارێك لەژیان و چارەنوسی مرۆڤ ناکات. بەڵام کاتێك بەدبەختیەك، یان خۆشبەختیەك بەرۆکی هەندێ کەس دەگرێت بەسود وەرگرتن لەم جۆرە بیروباوەڕانە، لەکاتی بەدبەختیدا خۆیانی پێ هێور دەکەنەوەو لەکاتی خۆشبەختیشدا خۆیان بەشایستەی ئەو خۆشبەختییە دەزانن کە توشیان بووە.

من لەساڵێکدا لەدایك بوم کە کوڕەکەی فیرعەون لەدایك بوو، ژنی فیرعەون کە ماوەی بیستو دوو ساڵ نەیتوانی کوڕێك پێشکەشی هاوسەرەکەی خۆی بکات، لەو ساڵەدا کوڕێکی بوو. بەڵام کوڕی فیرعەون لەوەرزی بەهاردا بەواتا لەسەردەمی وشکیدا لەدایك بوو و منیش لەوەرزی پاییزدا لەدایك بووم کە سەردەمی ئاوێکی لەڕادە بەدەر و فراوانە[1].

من نازانم کە بەچ شێوەیەك و لەکوێ چاوم بەجیهان هەڵهێناوە، لەبەرئەوە کاتێك دایکم منی لەکەنار ڕوباری "نیل"دا دۆزیەوە، من لەناو سەبەتەیەکدا بوم کە بەداری "جەگن"دروست کرابوو، کون و کەلەبەری ئەو سەبەتەیە بە"جەوگ[2]"ی درەخت گرتبوو بۆئەوەی ئەو سەبەتەیە ئاوی تێنەچێت.

ماڵی دایکم لەکەنار ڕوباردا بوو، لە وەرزی پاییزدا کە ئاستی ئاوی ڕوبار بەرز دەبوویەوە دایکم بۆ هێنانی ئاو پێویستی بەوە نەدەکرد زۆر لەماڵەکەی دور بکەوێتەوە.

---

[1] ڕوباری نیل کە ئاودێری میسری پێ دەکرا بەپێچەوانەی ڕوبارەکانی باکوری ئاسیا و ئەوروپا لەوەرزی پاییزدا بەرز دەبێتەوە و بەلێشاوی دێت و خەڵکی میسر لەسەرتای دەست پێکردنی بەرزبونەوە و هەڵسانی ئەو ڕوبارە دەست بەئاهەنگ گێڕان دەکەن، چونکە زەوی کشتوکاڵی تێرئاو دەکرد و چینێك پەین " کودی "ی سروشتی لەسەر زەویدا بەجێ دەهێلا کە بۆ بەپیتکردنی زەوی زۆر بەسود بوو و بگرە لەمرۆشدا میسر بەڕوباری نیل ئاودێری دەکرێت، بەڵام لەوکاتەوەی بەنداوی بەرز"سد العالی" لە باشوری میسردا دروست کراوە، ئاوی نیل لە وەرزی پاییزدا زەوی کشتوکاڵەکان وەك جاران داناپۆشێت و لەم سەردەمەدا زەوی کشتوکاڵی میسر بە کودی کیمیایی گەشە پێ دەدرێت.

[2] جەوگ:ناوێکی پاراوی کوردیە کە لەو مادە لینج و سپی ڕەنگە دەنرێت کە زۆرێك لەدرەختەکان دەری دەکەن بۆنمونە"قەیسی، هەڵوژە، چەقالە"، و لەکارە کوردەواریەکاندا وەك سیکۆتین و کەتیرەی ئەم سەردەمە سودیان لێوەرگرتووە......وەرگێڕ.

پۆژێکیان لەکاتی راوەستانی لەبەرامبەر ماڵەکەیدا ئەو سەبەتەیە بەسەر ئاوەوە دەبینێ کەمنی تێدا بووم و دەیوت کە پەڕەسێلکەکان بەسەرمەوە سەمایان دەکرد و دەیانخوێند، چونکە لێشاوی نیل ئەوانی لەماڵی ئێمە نزیك کردبووەیەوە.

دایکم منی بردە ماڵەوە و لەنزیك ئاگردانەکەوە دایناوم بۆئەوەی تۆزێك گەرمم بێتەوە و دەمی نا بەدەممەوە و فوی بەدەممدا دەکرد بۆئەوەی هەوا بڕواتە ناو سیەکانمەوە و دوبارە گیانم بێتەوە بەبەردا. ئەوکات منیش هاوارم کرد، بەلأم هاوارێکی نزم و لاوازم هەبوو.

باوکیشم کە ڕۆشتبوو بۆ ناوچە هەژار نشینەکان بۆئەوەی نەخۆشەکانیان چارەسەر بکات و لەبەرامبەر چارەسەرکردنیاندا بەدوو مراوی و پڕی کاسەیەك ئارد گەڕایەوە بۆ ماڵ، کاتێك گوێی لەدەنگم بوو وایزانی دایکم بەچکە پشیلەیەکی هێناوەتەوە بۆ ماڵ، بەلأم دایکم وتی: ئەمە بەچکە پشیلە نیە، بەڵکو منداڵێکەو دەبێت خۆشحاڵ بیت، چونکە ئێمە بوین بەخاوەنی منداڵێك.

باوکم یەکسەر گۆڕا و دایکیشمی لەڕوی توڕەییەوە بەناوی"تاقلەبوو"بانگ کرد، بەلأم کاتێك منی بینی زەردەخەنەیەکی کرد و ڕازی بوو بەوەی من وەك کوڕی خۆی تەماشا بکات و پارێزگاریم لێ بکات.

ڕۆژی دوایی دایك و باوکم بەدراوسێکانیان وت کە خوداکان کوڕێکیان پێداون، بەلأم من لەوباوەڕەدانیم ئەوان ئەو گوتەیەیان پەسەند کردبێت، چونکە هیچ کاتێك بەسکپڕی دایکمیان نەبینیوە.

دایکم، ئەو سەبەتەیەی منی تێدا بوو بەلاسەری بێشکەکەمەوە هەڵواسی و باوکم کاسەیەکی مسینی برد بۆ پەرستگا بۆ ئەوەی لەبەرامبەر پێشکەشکردنی ئەم کاسەیەدا ناوی من وەك کوڕی ئەوو ژنەکەی تۆمار بکەن[3].

[3] نەریتی تۆمارکردنی منداڵی تازە لەدایکبوو سەرەتا لەمیسردا داهێنرا و سەری هەڵدا و دوای ئەوە هەمان ئەو نەریتە بۆ ئەوروپا گواسترایەوە و لە ئەوروپادا دایك و باوك ئەرکی ئەوەیان گرتە ئەستۆ کە بەرواری لەدایك بون و ناوی منداڵی لەدایك بوو لەپەرتوکی تۆمارگەی کلیسادا تۆمار بکەن و فەرمانگەی ڕەگەزنامە و تۆمارکردنی ناو لەهەموو جیهاندا لەنەریتی میسریە کۆنەکانەوە سەرچاوەی گرتووە، لەهەمان کاتدا هەر بەوشێوەی کە لەم کتێبەدا دەیخوێنینەوە نەریتی خەتەنە کردنی"پیاوان"یش لەسەرەتاوە لەوڵاتی میسردا سەری هەڵداوە.

ئەوکات لەبەرئەوەی باوکم پزیشك بوو خۆی خەتەنەی کردم، چونکە دەترسان لەوەی من بدەنە دەست کاهینەکان بۆئەوەی خەتەنم بکەن، لەبەرئەوەی دەیانزانی کە چەقۆکانی ئەوان دەبێتە مایەی برینێکی کێمدار[4]، بەڵام باوکم تەنها بۆئەوەی لە کێم و برینی چڵکن بمپارێزت خەتەنەی نەکردم، بەڵکو لەبەرئەوە منی بۆ مەراسیمی خەتەنەکردنی پەرستگا نەبرد کە دەیزانی سەرەڕای ئەو کاسە مسیە، بۆ خەتەنە کردنیشم دەبوو دیاریەکی تری پێشکەشی پەرستگای بکردایە، چونکە باوکم دەوڵەمەند نەبوو، کاسەیەکی مس بەلای ئەوەوە شتێکی زۆر گرانبەها بوو.

ئاشکرایە من ئاگاداری ئەم ڕوداوانە نەبووم و دوای ئەوەی گەورە بووم لەدایك و باوکم پرسی.

تا ئەو کاتەی منداڵ بووم ئەو دوانەم بەدایك و باوکی خۆم دەزانی، بەڵام دوای ئەوەیکە سەردەمی منداڵیم تێپەڕاند و چومە ناو قۆناخی گەنجیەتیەوە و پرچمیان بەبۆنەی ئەوەی چومەتە ناو ئەم قۆناخەوە بڕی، دایك و باوکم سەرگوزەشتەی ڕاستی خۆمیان بۆ گێڕامەوە، چونکە لەخوداکان دەترسان و نەیاندەویست من هەمیشە لەگەڵ ئەم درۆ مەزنەدا بژیم.

من هیچ کات نەمزانی دایك و باوکی ڕاستەقینەم کێیە، بەڵام دەتوانم لەڕوی لێکدانەوەی هزری خۆمەوە بڵێم کە دایك و باوکم بەشێك بون لەچینی هەژاران یان لەچینی دەوڵەمەندەکان و من یەکەمین منداڵ نەبووم کە بە ڕوباری"نیل"ی بسپێرن و بگرە بەدوایین منداڵیش لەقەڵەم نادرێم.

لەو سەردەمەدا"تبس"کە دەکەوێتە میسرەوە، یەکێك بوو لەشارە پلە یەکەکان یان ببووە مەزنترین شاری جیهان، لەو شارەدا تەلارگەلێکی زۆری دەوڵەمەندانە دروست کران.

ناوبانگی"تبس"بووە هۆی ئەوەی کە ڕێژەیەکی زۆری بیابانشینەکان لە وڵاتانی ترەوە بێن و لە"تبس"دا نیشتەجێ بن، زۆربەشیان هەژار بون، دەهاتن بۆئەوەی لەو شارەدا سەروەت و سامانێك بەدەست بهێنن.

---

[4] کێم: وشەیەکی ڕەسەنی کوردیە کە بەواتای جەراحەتێك کە ئیلتهاب بکات دێت. وەرگێڕ

لەکەنار تەلای دەوڵەمەند و پەرستگا مەزنەکاندا، لەمبەرە و بەری"نیل"دا تا چاو بڕیدەکرد ماڵی هەژاران بەدی دەکرا و لەناو ئەو ماڵانەدا یان هەژارە مسریەکانی تێدا دەژیا، یان هەژارانی بێگانە.

زۆرجار ئەوە ڕووی دەدا کە ژنانی هەژار کاتێك منداڵێکیان دەبوو، ئەو منداڵەیان دەخستە ناو سەبەتەیەکەوە بەڕوباری"نیل"یان دەسپارد، بۆئەوەی بەرەو ڕوی دەریا ببیات. زۆرجاریش ئەوە ڕوی دەدا کە ژنانی دەوڵەمەندیش منداڵی نایاسایی "نامەشروع"ی خۆیان دەخستە ناو سەبەتەیەکەوە و دەیاندا بەدەم روباری"نیل"ەوە، بەڵام لەبەرئەوەی کەسێکی میسری منداڵەکەی خۆی دوای لەدایکبون خەتەنە دەکات و منیش خەتەنە نەکرابوم، لەوباوەڕەدام دایك و باوکم بیانی بن.

کاتێك قۆناخی منداڵیم تێپەڕاند و چومە قۆناخی هەرزەکاریەوە، بەواتا یەکەمین سەردەمی لاویەتیم، قژیان بڕیم و دایکیشم لەوکاتەدا قژی براوم و یەکەمین جوتە پێڵاوی سەردەمی منداڵیمی خستبوە ناو سنوقێکی دارینەوە و ئەو سەبەتەیەی پێنیشان دام کە من لەناویدا بەناو ڕوباری"نیل"دا تێپەڕیبوم.

من بینیم داری ئەو سەبەتەیە زەرد بووبوو و هەندێکیشیان شکابون و هەندێك لەدارەکانیان بەهۆی پەتێکەوە بەیەکیان بەستبویەوە و دایکم وتی کاتێك من ئەم سەبەتەیەم دۆزیەوە ئەم پەتانەی پێوە بوو.

بارودۆخی ئەو سەبەتەیە ئەوەی نیشان دەدا کە دایك و باوکی ڕاستەقینەم دەوڵەمەند نەبون، چونکە ئەگەر دەوڵەمەند بونایە منیان دەخستە ناو سەبەتەیەکی باشترەوە و ئەوکات دەیانسپاردم بە ڕوباری "نیل".

ئـەمڕۆش کـە پـیر بـوم، سـەردەمی منـداڵیم بەدرەوشـاوەیی دێتـە بەرچـاوو لـەم ڕوەشـەوە لـەنێوان دەوڵەمەنـد و هەژارێکـدا هـیچ جیاوازیـەك بـەدی ناکرێـت، چـونکە پیرەمێردێکـی هـەژاریش وەك پیرەمێردێکـی دەوڵەمەنـد سـەردەمی منـداڵی خـۆی بەدرەوشاوەیی دەبینێت، چونکە بەبۆچونی هەموو کەسێك ئەوەیان بۆ ئاشکرا دەبێت کە سەردەمی منداڵیان لەسەردەمی ئێستایان باشترە.

مـاڵی ئێمـە، دەکەوێتـە کـەنار ڕوبـاری"نیـل" لـەنزیك پەرسـتگا و گـەڕەکی هـەژار نیـشینان، لەتەنیـشت ماڵـەکانی ئێمـەدا لەنگەرگایـەك هـەبوو کـە کەشـتیەکانی ڕوبـاری"نیل"لەوێـدا لەنگـەریان دەگـرت، یـان بارەکـانی خۆیـان لەوێـدا خـاڵی دەکرد.

لەکۆڵانە تەنگەکانی ئەو ناوچەیە دەیان فرۆشگای "مەی فرۆشی" هەبوون کە دەریاوانانی ڕووباری "نیل" لەوێدا دەیانخواردەوە، لەهەمان کاتیشدا لەو گەڕەك و کۆڵانانەدا ماڵگەلێك بۆ ڕابواردن هەبوون کە هەندێکات دەوڵەمەندانی نێوەندی شار بۆ خۆشگوزەرانی و ڕابواردن دەڕۆشتن بۆ ئەوێ.

لەو ناوچە هەژار نشینەدا، کەسایەتییە دیارەکانی ئەو ناوچەیە بریتی بون لە بەرپرسانی گەیاندنی دەرامەت و ئەفسەرانی بەش و لێخوڕانی بەلەم و چەند کاهینێکی پلە پێنجی پەرستگای شار، باوکی منیش بەیەکێك لە کەسە دیارەکانی ئەو ناوچەیە لەقەڵەم دەدرا و ماڵی ئێمە لەچاو ماڵی کەسە هەژارەکان کە بەقوڕ دروست کرابوو بەکۆشکێك دەهاتە بەرچاو.

ئێمە لەماڵەکەماندا باخچەیەکمان هەبوو کە باوکم درەختێکی "نارون"[5]ی تێدا ناشتبوو و ئەم باخچەیە بەڕیزێك درەختی "ئەقاقیا[6]" لەکۆڵان جیا دەبویەوە و لەناوەڕاستی ئەم باخچەیەی ئێمەشدا هەسێرێك هەبوو کە جگە لەوەرزی پایز، بەواتا وەرزی هەڵسانی ڕووباری نیل، نەماندەتوانی ئاوی تێبکەین.

ماڵی ئێمە لەچوار ژور پێك دەهات کە دایکم لەیەکێکیاندا چیشتی لێدەنا و یەکێکیشیان بەدەرمانگای پزیشکی باوکم لەقەڵەم دەدرا.

هەفتەی دووجار خزمەتکارێك دەهات و لەئیش و کاری ماڵدا یارمەتی دایکمی دەدا و هەفتەی جارێکیش ژنێك دەهات و پۆشاك و ژێرخەرەکانی دەبردین و لەکەنار ڕووباردا بۆی دەشۆردین[7].

من ڕۆژانە لەژێر سێبەری درەختی باخچەکەماندا ڕادەکشام و کاتێك دەڕۆشتمە کۆڵان یەك "تیمساح"ی دارین کە یاری دەستی من بوو بەپەتێکەوە دەمبەستەوە و لەگەڵ خۆمدا دەمبرد و بەسەر سەنگفەرشی کۆڵانەکاندا بەدوای خۆمدا ڕامدەکێشا و

---

[5] نارون، درەختێکی پڕ چڵ و گەڵایە و شێوەیەکی چەتر لەخۆ دەگرێت، گەڵاکەی هێلکەیی و نوکدارە. سەرچاوە ﴿فەرهەنگی عەمید﴾ وەرگێڕ.

[6] ئەقاقیا: ناوی ئەم درەختە لەوشەی یۆنانی "akakia"وە وەرگیراوە، درەختێکی دڕکدارە کە بەرزایی دەگاتە بیست مەتر، گوڵەکانی سپی و وێنشکەیی و بۆنخۆشە، لەباخ و کەنار شەقامەکاندا دەڕوێنرێن. سەرچاوە ﴿عەمیدی فارسی﴾ وەگێڕ

[7] تەواوی ئەو زانیاریانەی لەبارەی بارودۆخی ژیانی خێزانێکی میانحاڵی شاری "تبس" و شتەکانی تر دەیخوێنیتەوە، پشت بەبەڵگەی مێژوویی پاپیرۆسەکان دەبەستێت بەواتا "مامۆستا نوسەری میسری"یە و لەوباوەڕەدا نەبیت کە نوسەر بەلاسایی کردنەوەی بارودۆخی سەردەمانی ئەمڕۆ، ساختەی لەم نوسینەدا کردبێت.

تەواوی منداڵان، بەخەفەت و داخەوە تەماشای ئەو تیمساحەی دەستمیان دەکرد کە دەمێکی سور ڕەنگی هەبوو و ئارەزوی ئەوەیان دەکرد کە یاریەکی دەستی وەك ئەوەی منیان هەبێت و من کە دەمزانی تەنها منداڵانی نەجیب زادە دەتوانن خاوەنی یاریەکی دەستی ئاوا بن، ڕێم پێ دەدان یاری پێ بکەن. ئەو یاری دەستیەش دارتاشێکی فەرمانڕەوایان دابوی بەباوکم، چونکە باوکم چارەسەری دومەڵی ئەو دارتاشەی کردبوو کە نەیدەهێڵا دانیشێت.

سەر لەبەیانیان دایکم منی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ بازاڕ و گەرچی شتی زۆری نەدەکڕی، بەڵام خووی بەوەوە گرتبوو کە بۆ کڕینی هەر شتێك ماوەی کاتژمێرێکی ئاوی[8] لەگەڵ کابرای فرۆشیاردا مامەڵە بکات.

بەقسەی دایکمدا وادیاربوو کە پارەی پێویستی پێیە، لەبەرئەوە لەگەڵ کابرای فرۆشیاردا مامەڵەی دەکرد بۆئەوەی من فێری ئەوە بکات دەست بەپارەوە بگرم و بزانم بەچ شێوەیەك خەرجی بکەم، هەمیشە دەیوت دەوڵەمەند ئەو کەسە نیە کە ئاڵتون و زیوی هەیە بەڵکو ئەو کەسەیە لەگەڵ کەمدا خۆی بسازێنێت.

بەڵام سەرەڕای ئەوەی بەوشێوەیە قسەی دەکرد، من لەچاوانی ئەوەوە کە تەماشای کاڵاکانی ناوبازاری پێدەکرد تێگەشتم کە حەزی لەقوماشە خوریە ڕەنگاوڕەنگەکان و ئەو ملیوانکانەی کە لەشفرەی فیل دروست دەکران دەکرد لەگەڵ و پەڕی"نەعامە" دا، من تا ئەوکاتەی گەورە نەبوم تێنەگەشتم لەوەیکە دایکم حەزی لەسەرووەت و سامانە و لەسەرتاپای تەمەنیدا ئارەزوی ئەوەی دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی بەژنی پزیشکێکی گەڕەگی هەژارەکان لەقەڵەم دەدرا ناچاربوو بەکەم ڕازی بێت.

دایکم شەوانە چیرۆکی بۆ دەگێڕامەوە، هیچ کات ئەوەم لەبیر ناچێت لە ئاو و هەوایەکی گەرمی هاویندا، کاتێك ئێمە لەهەیواندا دەخەوتین، دایکم دەستی بەگێڕانەوەی چیرۆکێك دەکرد، باوکم ناڕەزایی دەردەبڕی و دەیوت بۆچی هێزی ئەم کوڕە پڕە لەشتی بێهودە دەکەیت؟

---

[8] کاتژمێری ئاوی: کاسەیەك بوو کە کونێکی بچوکی تێدابوو و دەیانخستە سەر تەشتێکی پڕ ئاو و ئاویش لەکونە بچوکەکەوە دەهاتە ناو کاسەکە و پڕی دەکرد و بۆ هەرجارێك پڕبونی ئەو کاسەیە کاتژمێرێکی دەخایاند و لەهەموو پڕبونێکدا کاسەکەیان خاڵی دەکردەوە و دوبارە دەیانخستەوە سەر ئەو تەشتە ئاوە.

دایکیشم بەهۆی ناڕەزایی باوکمەوە بێدەنگ دەبوو، بەڵام هەرئەوەیکە دەنگی بۆڵەبۆڵی باوکم کۆتایی پێدەهات، دایکم لەشوێنی دابڕانی چیرۆك دوبارە دەستی دەکردەوە بەگێڕانەوەی.

هەندێکات باسی چیرۆکی"سینۆهە"و سەردەمانی تایبەت بە فیرعەون و دێو و جادوگەرانی بۆ دەکردم، من ئێستا تێدەگەم کە خودی ئەویش چێژی لەگێڕانەوەی ئەم جۆرە داستانانە وەردەگرت.

من لەبەرئەوە حەزم لەم جۆرە چیرۆکانە بوو کە کاتێك بەرگوێم دەکەوت وام دەزانی لەشوێنێکی جیاواز و دور لەم کۆڵانە پیس و پڕ مێش و خاشاکدا دەژیم.

بەڵام هەندێکات"با"بۆنی داری تەڕ و زێڕینی درەختێك کە لەکەشتیەك خاڵی دەکرا لەگەڵ خۆیدا دەهێنا و کاتێکیش ژنێك بەسەر کەژاوەیەکەوە لەو کۆڵانەوە تێدەپەڕی بۆنی عەترێك دەهات بەلوتمدا.

لەکاتی ئاوابونی خۆردا، کاتێك کەشتی زێڕینی خودای ئێمە ئامون[9]، دوای ئەوەی بە نیل و تەپۆڵکە و دەشتە تەختەکاندا تێدەپەڕی و لەبن تەپۆڵکەکاندا ونبون دەبوو ، لەو ماڵانەی دەکەونە کەناری ڕوباری"نیل"ەوە بۆنی نانی تازە و ماسی سورکراوم دەکرد، من لەسەردەمی منداڵیدا زۆر حەزم لەم بۆنە بوو و ئێستاش کە پیربوم هەر حەزی لێدەکەم.

یەکەمین قوتابخانە کە من وانەی ژیانی تێدا فێربوم هەیوانی ماڵەکەی خۆمان بوو. شەوانە کاتێك نانی ئێوارەمان دەخوارد، لەهەیوانی ماڵەکەماندا لەسەر چوارپایەك دادەنیشتین و دایکم خواردنەکەی بەسەردا دابەش دەکردین و لەبەردەممانەوە تێدەپەڕی و پێش ئەوەی باوکم دەست بەخواردن بکات ئاوی دەکرد بەدەستیدا.

هەندێکات ئەوە ڕویدەدا کە کۆمەڵێك دەریاوانی مەست کە شەراب یان ئاوجۆیان خواردبویەوە لەو کۆڵانەوە تێدەپەڕین و لەژێر درەختی"ئەقاقیا"کانی ئێمەدا ڕادەوەستان و خۆیان لەپیساییەکانی خۆیان خاڵی دەکردەوە[10].

---

[9] لێرەدا مەبەستی خۆرە.

[10] ماڵە هەژارەکان لە"تبس"دا بەهۆی دیوارەوە لەکۆڵانەکان جیا نەدەکرایەوە بەڵکو بەهۆی پەرژینێکی دارین یان پەرژینێکی قامیشی جیا دەکرایەوە.

باوکم کە پیاوێکی خۆپارێز بوو لەوکاتەدا هیچی نەدەوت، بەڵام کاتێك ئەوان دەڕۆشتن، دەیوت کە تەنها ڕەش پێستێك یان سریانیەك لە کۆڵاندا خۆی لەپاشەڕۆ سروشتیەکانی خاڵی دەکاتەوە، بەڵام میسریەك تەنها لەماڵدا خۆی لەپاشەڕۆ سروشتیەکانی خاڵی دەکاتەوە، هەروەها دەیوت هەرکاتێك گۆزەیەك شەراب بخۆنەوە دەکەونە جۆگە ئاوێکەوە و لەهۆش خۆیان دەچن و کاتێکیش دێنەوە هۆش خۆیان دەبینن کە جلەکانیان لێ دزیون.

هەندێکات بونی عەترێکی توند لەکۆڵانەوە دێتە ناو هەیوان و ئەو ژنەی کە جلێکی ڕەنگاوڕەنگی لەبەرکردووەو ڕوخسارو لێوو برژانگەکانی سوراو کردووە و لەچاوانیدا هەست بەحاڵەتێکی نائاسایی دەکرێت و لەبەردەم ماڵی ئێمەوە تێدەپەڕی، لەوکاتەدا یەکسەر تێدەگەشتم کە ئەو ژنانەی بەو شێوەیەن لەگەڵ ژنە ئاساییەکاندا جیاوازن و لەو ماڵانەی کە تایبەت بۆ ڕابواردن دروست کراوە دێنە دەرەوە، هەروەها باوکم دەیوت خۆت لەو ژنانەی کە پێت دەڵێن تۆ کوڕێکی جوانی دور بگرە و هەرگیز میواندariyan پەسەند نەکەیت و نەڕۆیت بۆماڵیان، چونکە دڵیان شوێنی بۆسەیە و لەسینەی ئەم جۆرە ژنانەدا ئاگرێك بەدی دەکرێت کەتۆ دەسوتێنێت. هەرلەبەرئەوەش بەهۆی ئەم جۆرە گوتانەوە لەسەردەمی منداڵیەوە لەگۆزەی شەراب و لەو ژنانەی لەژنە ئاساییەکان ناچن زۆر دەترسام.

لەمنداڵیەوە باوکم منی لەگەڵ خۆیدا دەبردە ژوری پزیشکیەکەی، بۆئەوەی چاوم بە شێوازی چارەسەر کردنەکانی بکەوێت. منیش زۆر بەزوویی ئاشنای چەقۆ و گیرە"پلایس" و مەڵهەمەکانی باوکم بووم و کاتێکیش ئەو سەرقاڵی چارەسەر کردنی نەخۆشێك بوو، من دەرمان و پێچەر"لەفاف" و ئاو و شەرابم پێدەدا.

دایکم وەك تەواوی ژنەکانی تر لە برین و دومەڵ و کێم و چڵکی برین دەترسا و هەرگیز هیچ کات نەدەهاتە ژوری پزیشکی باوکمەوە، جگە لەوکاتانەی کە باوکم بۆ هەندێك کار بانگی دەکرد.

من ئاگاداری ئەوە بوم کەباوکم سێ جۆر وەڵام بەنەخۆشەکان دەداتەوە، بەهەندێکیان دەڵێت نەخۆشیەکەی تۆ چارەسەر دەکرێت، بەهەندێکی تریان دەڵێت چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشیەی تۆ پێویستی بەکاتێکی زۆرە و هەندێکی تریان

پارچە "پاپیرۆس"ێکی[11] پێدەدان و پێی دەوتن ئەمە ببە بۆ ماڵی ژیان"دار الحیات" بۆئەوەی لەوێ چارەسەرت بکەن.

"ماڵی ژیان" شوێنێك بوو کە نەخۆشی سەختیان لەوێدا چارەسەر دەکرد و هەرکاتێك یەکێکی ڕەوانەی ماڵی ژیان بکردایە، بەخەمێکەوە دەیوت: ئەی داماو....!

سەرەڕای ئەوەی باوکم پزیشکی کەسانی هەژار بوو، هەندێکات نەخۆشەکانی بەدیارییەکەوە دەهاتن بۆ لایەو هەندێجاریش لەماڵی تایبەت بە عەیش و خۆشیەکانەوە(ماڵی سۆزانییەکان) کەسانێك بەمەبەستی چارەسەر کردن سەردانی باوکمیان دەکرد کە پۆشاکێکی گرانبەهایان لەبەردابوو.

کاتێك گەشتمە تەمەنی حەوت ساڵی دایکم "لونگ"ێکی- *پارچە قوماشێکە کە لەکەمەری مرۆڤ دەپێچرێت و تا سەر ئەژنۆی دادەپۆشێت*- منداڵانەی لەبەرکردم و منی بۆ پەرستگای (ئامون) کە مەزنترین و جوانترین پەرستگای خوداکانی میسری بوو برد بۆئەوەی لەوێدا تەماشای قوربانی بکەم.

شەقامێکی درێژ کە لەهەردوو لایەوە"ئەبول هول"لەمەودایەکی دیاریکراودا دانیشتبوو تا پەرستگا درێژ دەبوویەوە و کاتێك گەشتینە پەرستگاکە بینیم بەئەندازەیەك دیواری پەرستگا بەرزبوو کە من زۆر بەگرانی دەمتوانی چاوم بەترۆپکی ئەو دیوارە بکەوێت.

کاتێك چوینە ناو حەوشەی پەرستگاوە فرۆشیارەکان کتێبی"مردووەکان"یان – *کۆنترین کتێبی جیهانی کە نوسرابێتەوە کتێبی مردوەکانی میسرە*- ئاڕاستەی دایکم کرد بۆئەوەی بیکڕێت، بەڵام ئێمە لەماڵدا "کتێبی مردووەکان"مان هەبوو و پێویستمان بەکڕینی نەبوو.

دایکم بازنەیەکی مسینی لەدەستی خۆی داکەند و لەبەرامبەر ئەوەی ڕێیان پێداوین لەم مەراسیمەدا بەشداری بکەین بەخشیە پەرستگا و من بەچاوی خۆم بینیم کاهینەکانی پەرستگا کە جلێکی سپییان لەبەردابوو و سەری تاشرا و چەورکراویان بریقەی دەدایەوە، دەیانویست مانگایەك سەر ببڕن و لەناوەڕاستی دوو شاخی ئەو

---

[11] پاپیرۆس: جۆرێك کاغەزی بەناوبانگی میسریە.

مانگایەدا مۆرێك هەڵواسرابوو كە نیشانی دەدا لەتەواوی جەستەی ئەو گایەدا مویەكی ڕەش بەدی ناكرێت.

من بەچاوی خۆم بینیم كاتێك ئەو مانگایەیان سەر دەبڕی چاوی دایكم پڕ بوو لەفرمێسك، بەڵام من هیچ گوێ و گرنگیەكم بە سەربڕینی مانگاكە نەدەدا، بەڵكو تەماشای پایە مەزنەكانی پەرستگا و وێنەی جەنگەكانم دەكرد كە لەسەر دیوارەكان كێشرابون .

دوای ئەوەی لەو پەرستگایە هاتینە دەرەوە، دایكم پێڵاوەكانمی لەپێم داكەند و پێڵاوێكی نوێی لەپێكردم و كاتێك گەشتینە ماڵەوە، دوای خواردنی نانی نیوەڕۆ، باوكم دەستی بەسەرداهێنام و لێی پرسیم تۆ ئێستا تەمەنت حەوت ساڵە و دەبێت پیشە و كارێك هەڵبژێری، بڵێ دەتەوێت ببیت بەچی؟

منیش وتم دەمەوێت ببمە سەرباز، چونكە خۆشترین یاری كە من لەكۆڵاندا لەگەڵ منداڵاندا دەمكرد یاری سەربازی بوو و هەروەها دەشمبینی كە سەربازەكان چەكێكی درەوشاوەیان هەیە و گالیسكەكانیان بەدەنگێكی بەرز بەسەر سەنگفەرشی كۆڵاندا تێدەپەڕین و بەلاسەری گالیسكەكانیشەوە ئاڵای ڕەنگا و ڕەنگ لەحاڵی شەكانەوەدا بەدی دەكرا.

چیتر دوای ئەوە تێگەشتم كە سەرباز پێویستی بە خوێندن و نوسین نیە و من لەمنداڵانی گەورەتر كە دەڕۆشتن بۆ قوتابخانە سەرگوزەشتەی ترسناكم لەبارەی ئازاری خوێندنەوە و نوسین بیستبوو و دەیانوت مامۆستا قژی منداڵێك كە بێ ئاگا تەختە ڕەشەكەی خۆی شكاندبوو، تاڵ تاڵ هەڵدەكێشا.

باوكم بەبیستنی وەڵامەكەم ڕۆچووە ناو هزری خۆی و زۆریش پێی كاریگەر بوو و دوای ئەوە وتی بەدایكم كە گۆزەیەكی سوفالی پێبدات و دایكیشم پێی دا، دوای ئەوە باوكم دەستی گرتم و بەدەستەكەی تری گۆزەكەی هەڵگرت و منی بردە قەراخ ڕوباری نیل و بینیم كە هەندێك لەكرێكارەكان سەرقاڵی خاڵی كردنی شتومەكی كەشتیەكن، یەكێك بەردەوام قامچی دەدا لەپشتی كرێكارەكان و ئەوانیش بەدەم ڕشتنی ئارەق و هەناسە بڕكێوە، خەركی خاڵیكردنی باری گەشتیەكە بوون.

باوكم وتی تەماشا بكە، ئەمانەی كە دەیانبینی كۆڵبەرن و پێستی جەستەی ئەمانە ئەوەندە خۆر و "با"ی بەركەوتووەكە لەپێستی"تیمساح"ئەستورتر بووە و ناچارن تا

ئاوابونی خۆر لەژێر قامچیدا خەریکی کۆڵبەری و خاڵی کردنی کەشتی بن و شەویش کاتێك دەگەڕێنەوە ماڵە قوڕینەکەیان، ژەمی خواردنیان یەك پارچە نان و پیازێکە.

بارودۆخی جوتیارەکانیش بەهەمان شێوەیە و بەشێوەیەکی گشتیش هەرکەسێك بەدوو دەستی خۆی کار بکات ژیانی بەم شێوەیە دەبێت کە بینیت.

منیش وتم باوکە من نامەوێت کەسێکی کۆڵبەر و جوتیارم لێ دەربچێت، بەڵکو دەمەوێت ببمە سەربازێك و سەربازەکانیش چەکگەلێکی درەوشاوەیان بەدەستەوەیە و لەملی هەندێکیشیاندا ملاوانکەی ئاڵتون دەبینرێت و لەجەنگدا زێڕ و مس و کۆیلە و کەنیزە لەگەڵ خۆیاندا دەهێننەوە و خەڵکی باسی جەنگ و ئازایەتی ئەوان بۆ یەکتری دەکەن.

باوکم هیچی نەوت و منی لەگەڵ خۆیدا برد و لەوێ دور کەوتینەوە و ئەو گۆزەیەی کە بەدەستیەوە بوو پڕی کرد لەشەرابێك کە لەشەراب فرۆشێکی کڕی و کەوتینە ڕێ تا گەشتینە ماڵێکی قوڕینی کەنار ڕوباری"نیل"و باوکم سەری کرد بەو ماڵەدا و بانگی کرد(ئین تب)...(ئین تب).

پیاوێکی پیر و پیس و پۆخل کە تەنها دەستێکی هەبوو، پێڵاوەکانیشی لەپیسیاندا دیار نەبوو چ ڕەنگێکی هەیە لەو ماڵە هاتە دەرەوە، منیش بەسەر سوڕماویەوە وتم باوکە ئایا ئەمە"ئین تب"ی سەربازی بەناوبانگ و ئازایە؟

باوکم سڵاوی لەکابرای پیرەمێرد کرد و ئەو پیاوەش دەستی خۆی بەرزکردەوە و بەسڵاوێکی سەربازی وەڵامی دایەوە و لەبەرئەوەی لەبەردەم ماڵەکەیدا کورسی و چوارپایە نەبوو، لەبەرئەوە ناچار بوین لەسەر زەوی دانیشین و باوکیشم لەوکاتەدا قۆزە شەرابەکەی لەبەردەم کابرای پیردا دانا و ئەویش گۆزەکەی بەتاکە دەستی خۆی برد بۆ لێوی و بەتامەزرۆیەکەوە خواردیەوە.

باوکم وتی:(ئین تب) کوڕەکەم(سینۆهە) حەزدەکات ببێتە سەرباز و منیش هێنام بۆ لای تۆ بۆئەوەی تۆ کە تاکە پاشماوەی قارەمانانی جەنگە مەزنەکانی ئێمەی بەچاوی خۆی ببینێت و باسی ئەو جەنگانە لەزمانی تۆوە ببیستێت.

(ئین تب) گۆزەی شەرابەکەی لەلێوی دور خستەوە و بەنیگایەکی توڕە و دەمی بێ ددان و باڵایەکی خەمگین و ئەبرۆیەکی سپی و لێوانلێو لەخەم و پەژارە پێی وتم: بە(ئامون) سوێندت دەدەم ئەرێ تۆ شێت بویت.

دوای ئەوەی بەدەمی بێ ددانیەوە، پێکەنینێکی ترسناکی کرد و وتی: ئەگەر من لەبەرامبەر هەر نەفرین و جنێودان و سوکایەتیەك کە ئاڕاستەی خۆم دەکەم تەنها لەبەرئەوەی بۆچی بوم بەسەرباز، یەك قوم شەرابم بەدەست بهێنایە، بەو شەرابانە نەك تەنها دەمتوانی دەریاچەیەك کە فیرعەون بۆ خۆشگوزەرانی ژنەکەی هەڵی کەندبوو پڕ بکەمەوە، بەڵکو توانای ئەوەشم هەبوو تەواوی دانیشتوانی شاری"تبس"بۆماوەی یەك ساڵ بەشەراب تێر بکەم.

من وتم: بیستومە کە کاری سەربازی پڕ شانازیترین کاری جیهانە.

(ئین تب)وتی: شانازی و ناوبانگی سەربازی لەم وڵاتەدا بریتیە لە خاشاك"زبڵ"و پاشەڕۆی گیانەوەرەکان کە مێشیان لێ کۆ دەبێتەوە، تەنها شانازیەك کە من لەکاری سەربازی بەدەستم هێنابێت ئەوەیە کە ئەمڕۆ دەبێت بۆ خەڵکانی تری بگێڕمەوە تەنها بۆئەوەی پاروە نانێك یان قومێك شەرابم پێ ببەخشن و ئەویش لەسەد کەس تەنها کەسێك پێت دەدات، لەبەرئەوە من پێت دەڵێم هێی کوڕە، لەنێو کار و پیشەکانی جیهاندا هیچ کار و پیشەیەك لەسەربازی خراپتر نیە و کۆتایی تەواوی شانازیەکانی سەربازی، ئەم ژیانەی منە کە بەچاوی خۆت دەیبینی.

دوای ئەوە(ئین تب) شەرابی ناو گۆزەکەی تا دوا قوم هەڵقوڕاند و گەرمی شەرابەکە ڕوخساری سور هەڵگێڕا، دوای ئەوە سەری بەرز کردەوە و وتی: ئایا ئەم ملە باریك و پڕ لە چرچ و لۆچیەی من دەبینی؟، ئەوە ملێکە کە ڕۆژانێك پێنج ملوانکەی زێڕینی پێوە هەڵواسرابوو، خودی فیرعەون ئەو ملیوانکانەی کردبووە ملم، کاتێك لەگۆڕەپانی جەنگ دەگەڕامەوە ئەوەندە دەستی بڕاوەم لەگەڵ خۆمدا دەهێنایەوە کە لەبەردەم دەوارەکەمدا تەپۆڵکەیەکی لێ دروست دەبوو. بەڵام ئەمڕۆ لەو هەموو شانازی و ئاڵتونانە هیچ شتێکم بۆ بەجێ نەماوە.

ئاڵتونەکانم لەناو چون و کارەکەر و کۆیلە و کەنیزەکانم لەبرساندا مردن یان لێم هەڵهاتن و دەستی ڕاستیشم لەگۆڕەپانی جەنگدا بەجێ ما.

تا ئەوکاتەی لاو بووم ڕۆژ و شەو لەبیابانەکاندا بەبرسیەتی و تینویەتی ڕوبەڕوی گۆڕەپانی جەنگ دەبومەوە و ئێستاش کە پیر بوم هێشتا هەر برسی و تینومە. ئەگەر لەباوکی خۆت دەپرسی کاتێك دەستی بریندارى سەربازێك دەبڕنەوە و پاشماوەی ئەو

دەستە بڕاوە نوقمی ناو ڕۆنی داخکراو دەکەن چ حاڵێکی هەیە، ئەو کە پزیشکە ئەم بابەتەت بەجوانی بۆ باس دەکات.

هەر پارچە گۆشتێکم لەگۆڕەپانێکی جەنگدا بەجێماوە و ددان لەدەم و مو بەسەرمەوە نەماوە و لەمڕۆشدا ئەگەر پیاوانی خێرخوای وەك باوکی تۆ جارناجارێك هاوکاریان نەکردمایە، ئەوکات دەبوو لەبەردەم پەرستگای(ئامون)دا سواڵم بکردایە.

دوای ئەم قسانە"ئین تب" تەماشایەکی گۆزەی شەرابەکە کرد و وتی بەداخەوە تەواو بوو.

باوکم بازنەیەکی مسی لەمەچەکی خۆی داکەند و پێی دا بۆئەوەی بەو مسە شەرابی تر بکڕێت و "ئین تب"لەخۆشیاندا هاوارێکی کرد و بانگی منداڵێکی کرد و بازنە مسەکەی پێدا و پێی وت ئەم گۆزەیە ببە و شەرابم بۆ بکڕە، بەڵام بەفرۆشیارەکە بڵێ کە پێویست ناکات شەرابی پلە یەکت پێ بدات، بەڵکو با شەرابێکی ناوەند بێت، نەزۆر چاك و نەزۆر خراپ، گۆزەکەم بۆ پڕ بکات و پاشماوەی مسەکەم بۆ بگەڕێنەرەوە.

منداڵ ڕۆشت و منیش وتم: سودی سەربازی ئەوەیە کە سەربازێك پێویستی بەخوێندن و نوسین نیە و نابێت بەرگەی گرانی ڕۆشتن بۆ قوتابخانە لەئەستۆ بگرێت.

(ئین تب)وتی: ڕاست دەکەیت سەرباز پێویستی بە خوێندن و نوسین نیە تەنها دەبێت بجەنگێت، بەڵام ئەگەر خوێنەواری هەبێت، فەرمانڕەوایی سەربازەکانی تر دەکات و کەسانی تر لەژێر فەرمانی ئەودا دەجەنگن.

مەحاڵە کەسێکی نەخوێنەوار بتوانێت پلە و پایە بەدەست بهێنێت و هیچ کاتێکیش سەد کەس بەکەسێك ناسپێرن گەر ناتوانێت بنوسێت، بەردەوامیش بەم شێوەیە بووە و دوای ئەوەش هەر بەوشێوەیە دەبێت.

لەبەرئەوە لەگەڵ تۆمە کوڕە، ئەگەر تۆ دەتەوێت لەئایندەدا فەرمانڕەوایی سەربازەکان بکەیت، دەبێت خۆت فێری نوسین بکەیت و ئەوکات ئەو کەسانەی ملوانکەی ئاڵتونیان لەملدایە بەڕێزەوە سەرت بۆ دادەنوێنن و لەکاتی جەنگدا سواری کەژاوەیەك دەبیت و بەندەکانت بەشان دەتبەنە گۆڕەپانی جەنگ.

ئەو منداڵەی ڕۆشتبوو شەراب بکڕێت بە گۆزەیەکی پڕ لە شەرابەوە گەڕایەوە و چاوانی پیرەمێرد لەخۆشیاندا دەبریسکانەوە، سەربازی کۆن وتی:

باوکی تۆ هەرگیز جەنگی نەکردووە و ناتوانێت تاڵی کەوانێك بکێشت یان شمشێرێك لە کێلانەکەی دەربهێنێت، بەڵام لەبەرئەوەی دەتوانێت بنوسێت ئەمڕۆ بەئاسانی و ئاسودەیی دەتوانێت ژیان بکات، لەبەرئەوەی کەسێکی پاك و چاکە خوازە من ئیرەیی پێ نابەم.

کاتێك بینیم پیرەمێرد گۆزەی شەرابەکەی بەرزکردەوە لەترسی ئەوەی کە مەستی ئەو کار لەئێمەش بکات و ئێمە بکەوینە جۆگە ئاوێکەوە و کەسانی تر جلەکانمان لێ بدزن، قۆڵی کراسەکەی باوکمم ڕاکێشا بۆ ئەوەی لەو شوێنە دور بکەوینەوە، کاتێك ئێمە دور کەوتینەوە(ئین تب) یەکێك لەسرودەکانی جەنگی لەبەر خۆیەوە دەوتەوە و ئەو منداڵەی شەرابی بۆ کڕیبوو پێدەکەنی.

بەڵام من، کە (سینۆهە)م لەو بڕیارەم پەشیمان بومەوە کە ویستم ببمە سەرباز و ڕۆژی دوایی بردمیان بۆ قوتابخانە.

*بەشی دووەم*

## ڕۆشتن بۆ قوتابخانە

باوکم نەیدەتوانی بمنێرێت بۆ ئەو قوتابخانانەی کە لە پەرستگاکاندا هەبوون، چونکە لەو جۆرە قوتابخانانەدا کوڕان و کچانی کەسە وەجاخزادە و کاهینی پلە یەك وانەیان دەخوێند و کرێی خوێندن لەوێدا زۆر گران بوو.

فێرکارەکەی من کاهینێکی پلە پێنج بوو کە لەهەیوانی ماڵی خۆی قوتابخانەیەکی دروست کردبوو ئێمە لەبەهارو هاویندا لەهەیواندا دەمانخوێند و لەوەرزی زستانیشدا دەڕۆشتینە ژورەوە.

خوێندکارەکانی بریتی بون لە کوڕانی ئەفسەرەکانی بەش و خوێندەواران و کاهینانی پلە نزم، کە باوکی ئەوانە ئارەزوی ئەوەیان دەکرد ڕۆژێك بێت کوڕەکەیان بتوانێت بەنوکی تیژی تیرێکەوە بەژمێریاری پارێزگاری لەکەرەستەی فرۆشگاکەی بکات یان ئەوەیکە بتوانێت ژمێریاری ئەوەی بۆ بکات کە گوێدرێژانی سوپا لە گەوڕدا چەندێك ئالیك دەخۆن و خەرجی ئالیکی ئەسپی هەر گالیسکەیەکی جەنگ چەنێکە.

لە شاری"تبس"پایتەختی مەزنی جیهان، لەو جۆرە قوتابخانانەی کە لەماڵەکاندا بەرپا بوون زۆر بەدی دەکرێت و کرێی خوێندکارانی ئەم جۆرە قوتابخانانە بەو شێوەیەش گران نەبوو، چونکە خوێندکاران لەبەرامبەر ئەوەی فێر دەکران بازنەی مسینیان نەدەدایە فێرکارەکەیان، بەڵکو تەنها خواردن و قوماشیان بۆ دەبرد.

بۆ نمونە کوڕی خەڵوز فرۆش لەوەرزی زستاندا خەڵوز و داری وشکی دەبرد بۆ مامۆستاکەی و کوڕی وەستای چنین، هەموو ساڵێك چەند باڵێك پارچە قوماشی پێشکەشی مامۆستا دەکرد و کوڕی جوتیاریش گەنمی پێ دەدا، بەڵام باوکی من

لەبەرامبەر خەرجی خوێندنی من دەرمانی پێ دەدا، هەندێکاتیش من ئەوگیاکوڵاوانەی کە لەشەراب هەڵدەکێشران، دەمبرد بۆ فێرکارەکەم.

ئەو ڕۆژەی یەکێك لە خوێندکارەکان گۆزەیەك ئاوجۆی بۆ مامۆستاکەمان بهێنایە ئەو ڕۆژە ڕۆژی جەژنی ئێمە بوو، لەبەرئەوەی هەرکە مامۆستاکەمان ئاوجۆکەی دەخواردەوە ئیتر وانە و فێرکردنی لەبیر دەچویەوە و بەدەمی بێ ددانی، باسی خودا سەرخۆشەکانی بۆ دەکردین و ئێمە لەقاقامان دەداو کاتێك خەڵکی لەوێوە تێدەپڕین، ڕادەوەستان و گوێیان لێدەگرتین بۆئەوەی بزانن بۆچی پێدەکەنین.

بەڵام کاتێك گەورە بوم تێگەشتم ئەو فێرکارەی ئێمە مەبەستێکی والای هەبوو، دەیویست لەڕێی ئەو چیرۆکە خۆش و پێکەنیناویانەوە ئاشنای ئەرکەکانی ژیانمان بکات و تێمان بگەیەنێت کە لەنێو خوداکاندا یەك خودا هەیە کە سەری لە"چەقەڵ" دەچێتو ئەم خودایە بەردەوام چاودێری کردارەکانی مرۆڤ دەکات و هەرکەسێك کردارێکی خراپ ئەنجام بدات، ئەو خودایە ئەو کەسە هەڵدەداتە ناو دەمی گیانەوەرێکەوە کە نیوەی جەستەی تیمساحە و نیوەکەی تری ئەسپێکی شینە، بۆ ئەوەی قوتی بدات.

ئەو دەیوت:خودایەکی تر هەیە لەسەر ڕوبارەکاندا قەیاخ"بەلەم"لێدەخوڕێت و دوای مەرگ، مرۆڤ دەباتە شوێنێك کە دەبێت هەمومان بۆی بڕۆین بۆئەوەی خۆشبەخت بین.

دوای ئەوەی من لەو قوتابخانەیەدا خوێندنم تەواو کرد دەتوانم بڵێم شتێکی سەیر ڕویدا و ئەو شتە سەیرەش ئەوە بوو کاتێك ئەو دوو شێوەیەم بەیەك گەیاند لەواتاکەی تێگەشتم.

کاتێك شێوەی شتێك بەنوکی ڕمێك لەسەر تەختە ڕەشێك دەکێشن، نەزانترین کەسیش دەتوانێت لەواتاکەی تێبگات.

بەڵام کاتێك تەنها وێنەی مرۆڤێك بکێشیت و پیشانی کەسێکی نەخوێندەواری بدەیت، ئەو کەسە یەکسەر تێدەگات کە ئەوە وێنەی مرۆڤێکە. ئەگەر وێنەی تیمساحێك لەسەر تەختە ڕەشێك بکێشیت و پیشانی کەسێکی نەخوێندەواری بدەیت، ئەو کەسە یەکسەر تێدەگات کە ئەوە وێنەی تیمساحێکە.

بەڵام ئەگەر کەسێك هەبێت کە بتوانێت لەواتای مرۆڤێك و تیمساحێك و درەختێك و گالیسکەیەك کە بەیەکەوە لکێنراون تێبگات و بڵێت کە مەبەستی تۆ لەلکاندنی ئەمانە بەیەکەوە چیە، بەو کەسە دەڵێن کەسێکی خوێندەوار.

لەو ڕۆژەوەی توانیم لەواتای دوو شێوە وێنە کە بەیەکەوە لکێنراون تێبگەم، چیتر پێویستی بەوە نەدەکرد فێرکارە بەساڵاچووەکەم هانی فێربونم بدات.

خودی خۆم ئەوەندە لەوکارەدا ئارەزوم پەیدا کردبوو کە ئەوکاتانەی دەگەڕامەوە بۆ ماڵ داوام لەباوکم دەکرد کە شێوەکان بەیەکەوە بلکێنێت بۆئەوەی بتوانم لەواتاکانیان تێبگەم.

لەو کاتەوەی من لەبواری فێربوندا بەرەوپێش دەچوم، تێگەشتم لەوەی لەکەسانی تر ناچم و جیاوازم، چونکە ڕوخسارم سپی و دەست و پەنجەیەکی ناسك و ڕەنگ و شێوەیەکی سپی و ڕونتر لەکەسانی ترم هەبوو و هەر ئەمەش بوبووە هۆی ئەوەی هەندێك لە خوێندکارەکان ئازارم بدەن و کوڕی جوتیارەکە، قوڕگی دەگرتم و دەیگوشی و دەیوت: تۆ لەکێ دەچیت و منیش لەوکاتەدا ناچار بوم نوکە تیرەکەم "لەشێوەی پێنوسی ئەمڕۆ" بەجەستەیدا بچەقێنم بۆئەوەی ناچاربێت دەستم لێ هەڵگرێت.

بەڵام بەپێچەوانەوە یەکێك لە خوێندکاران کەکوڕی ئەفسەری بەش بوو منی زۆر خۆش دەویست، ئەم خوێندکارە هەموو ڕۆژێك قوڕی خۆشە کراوی[12] لەگەڵ خۆیدا دەهێنا بۆ فێرگەکە و لەوێ پەیکەری گیانەوەرەکانی پێ دروست دەکرد، ڕۆژێکیان پەیکەری منی دروست کردو پێی دام، بەڵام کاتێك پەیکەرەکەم بردەوە بۆ ماڵ دایکم خەمگین بوو و وتی:

ئەمە کاری جادووگەرییە، بەڵام باوکم ئەوی لەو گومان و هەڵە تێگەشتنە ڕزگار کرد و تێی گەیاند ئەگەر دروستکردنی پەیکەر کارێکی جادووگەری بوایە، ئەوا ئەو هەموو پەیکەرەیان لەکۆشکی فیرعەوندا دا نەدەنا.

[12] قوڕی خۆشە کراو: ئەو وشەیە لەزمانی فارسیدا بە"خاك ڕس" هاتووە کە واتای "قوڕی سەناعە" دەگەیەنێت کە منداڵان دەیکرڕن بۆئەوەی پەیکەر و شێوەی جۆراوجۆری پێ دروست بکەن و کاتی خۆشی لەگەڵدا بەرنە سەر، بەڵام من بەباشم زانی هەمان ئەو وشە کوردیە بەکار بهێنم تا ئەوەی پەنا بۆ وشە بیانیەکان ببەم.....وەرگێڕ.

ماوەیەك بەسەر خوێندنم لەو لەفێرگایەدا تێپەڕی، تا ئەوەی ڕۆژێك باوکم جلە تازەکەی خۆی لەبەرکردو دەستی گرتمو لەگەڵ خۆیدا بردمی بۆپەرستگای "ئامون"و وتی دەمەوێت تۆ ببمە ناو ماڵی ژیان"دار الحيات"، بۆئەوەی لەوێ فێری زانستی پزیشکی ببیت.

بۆ چونە ناو قوتابخانەی ماڵی ژیان پێویستی بەڕەزامەندی کاهینەکانی پەرستگا دەکرد، بەڵام باوکم کە لەهەموو تەمەنیدا تەنها چارەسەری هەژارەکانی دەکرد، ببووە هۆی ئەوەی بێبەشبێت لەوەی مامەڵە و تێکەڵاوی لەگەڵ کاهینەکاندا بکات، ئەم بابەتەش زیانێکی زۆری بەژیانی ئەو گەیاندبوو.

چونکە لە"میسر"دا هەموو شتێك و بگرە تەواوی کارەکانیش لەدەستی کاهینەکاندا بوو، ئەوە ئەوانن کە خوێندکارەکان هەڵدەبژێرن بۆئەوەی بتوانن لەقوتابخانەی پزیشکیی ماڵی ژیاندا بخوێنن و کرێیەکی لەسەر دابنێن،کاتێك ئاستی ڕوباری"نیل"بەرز دەبێتەوە و هەڵدەچێت، ئەوان ئاستی ئەو لێشاوە پێوانە دەکەن، توانا و دەستەڵاتی ئەمانە لەئاستێکدایە کە ئەگەر فیرعەون سزا بەسەر هەرکەسێکدا بسەپێنێت و هەمان ئەوکەسە لەنێو کاهینەکاندا هاوڕێیەکی هەبێت، ئەمانە دەتوانن سزای فیرعەون ڕەت بکەنەوە.

لەبەرئەوەی باوکم هیچ کەسێکی لەو پەرستگایەدا نەدەناسی ناچاربوو لەناوحەوشەی پەرستگاکەدا دانیشێت بۆئەوەی وەك کەسانی تر نۆرەی پەسەندکردن لەلایەن یەکێك لە کاهینەکانەوە بەدەست بهێنێت، ئێمە سەرلەبەیانیەکەی ڕۆشتین بۆ ئەو پەرستگایە تا ئێوارە لەوێ دانیشتین و نۆرەمان نەهات.

هەرلەوکاتەدا کەسێك خۆی کرد بەپەرستگادا و کاتێك باوکم چاوی پێی کەوت ناسیەوە و وتی ئەوە"پاتور"ە ئەوکاتانە لەماڵی ژیاندا دەمخوێند ئەو هاوپۆلم بوو و ئێستا کونتێکەری کاسەی سەری فیرعەونە.

من لەو سەردەمانەدا نەمدەزانی کە کونتێکەری کاسەی سەر چ کارێك دەکەن و چ شایستەییەك لەخۆ دەگرێت کە کەسانی تر هەڵگری نین، لەدواییدا کاتێك خۆم بوم بەپزیشك تێگەشتم کە کونتێکەرەکانی کاسەی سەر کەسانێکن کە کاسەی سەری فیرعەون و کەسانی تر کون تێدەکەن و هۆرمۆنە زیادەکان دەردەهێنن کە لەناو سەردا، لەسەر مێشك درووست دەبێت.

سەرەڕای ئەوەش کونتێکەرەکانی ئێسقان کەسانێکن کەکاسەی سەر کون تێدەکەن بۆئەوەی ئەو هەڵم و گەرمیە هەڕەشەئامێز و ژەهراویەی لەناو کاسەی سەردا کۆ نەبێتەوە و دەبێتە هۆی نەخۆش کەوتنی مرۆڤ لەسەر بهێننە دەرەوە.

کاتێك باوکم"پاتور"ی بینی هەستایە سەر پێ و سڵاوی لێکرد و "پاتور"یش ئەوی ناسیەوە و دەبتی خستە سەرشانی و لێی پرسی: بۆچی هاتوی بۆ ئێرە و چ کارێکت هەیە.

باوکیشم وتی: هاتووم مۆڵەت لەکاهینەکان وەربگرم، بۆئەوەی کوڕەکەم لە قوتابخانەی پزیشکی ماڵی ژیان پەسەند بکەن.

"پاتور"یش وتی: ئەم هەوڵەی تۆ بێسودە و تەنها بەداواکردن بەمەبەستی خۆت ناگەیت، بەڵام من خۆم دێم بۆ ماڵتان و لەمبارەیەوە گفتوگۆت لەگەڵدا دەکەم.

ســـەرلەبەیانی ڕۆژی دوایـــی بـــاوکم ڕۆشـــت بـــۆ بـــازاڕ و بـــۆ پیـــشوازی و میوانـــداری"پـــاتور"، "غـــاز"[13]" "قـــاز"ێـــك و چـــەند ماســـیەك و بڕێـــك هـــەنگوین و خواردنـــەوەی کـــڕی و دای بـــەدایکم کەقازەکـــە بکوڵێنێـــت و ماســـیەکان ببرژێنێـــت، بەهەنگوینەکانیش نانی شیرین دروست و ئامادە بکات.

کاتێك بۆنی کوڵانی قاز لەهەوادا بڵاو بویەوە، سواڵکەر و کوێرەکان لەبەردەم ماڵماندا کۆبونەوە و هەرچی دایکم پێی وتن بڕۆن و لەوێ نەمێنن هەر نەڕۆشتن، لەبەرئەوەش دایکم ناچار بوو بڕێك نان لەڕۆنی چەوری قازەکە هەڵکێشێت و بەسەریاندا دابەشی بکات بۆئەوەی دووریان بخاتەوە.

باوکم گۆزەیەکی پڕکرد لەئاوی بۆندار و دای بەدەستمەوە و وتی: کاتێك"پاتور" هات ئاو بەسەر دەستیدا بڕێژیت و دایکیشم پارچە کەتانێك کە بۆ ڕووپۆشی لاشەی مردووی خۆی ئامادەی کردبوو لەتەنیشت منەوە دانا و وتی کاتێك ئاوت بەدەستیدا ڕشت بەم کەتانەش دەستی وشك بکەرەوە.

ئێمە وامان دەزانی"پاتور"هەر وەك چۆن باوە سەرلەئێوارەکەی دێت بۆماڵمان، بەڵام ئێوارە تێپەڕی و شەو هات و"پاتور"نەهات.

---

[13]غاز: باڵندەیەکی ئاوییە کە زۆر لەمراوی دەچێت، بەڵام لەمراوی گەورەترە و خاوەنی ملێکی درێژ و کێشی"١٢"کیلۆ دەبێت.... لەبەر ئەوەی کە لەوڵاتی ئێمەدا نییە وام بەباش زانی بەقاز ناوی بهێنم بۆئەوەی لای خوێنەر ناسراوبێت.

وەرگێڕ.

من لەبەرئەوەی برسیم بوو لەدواکەوتنی"پاتور" زۆر خەمگین بووم، چونکە دەمزانی تا ئەو نەیەت خواردنیش بەمن نادەن.

باوکم بەشێوەیەك بێتاقەت بوو هەر کە شەو داهات چراکانی دانەگیرساندو منوباوکم، لەهەیوانی ماڵەکەماندا لەسەر چوارپایەکە دانیشتبوین، نەماندەوێرا تەماشای یەکتری بکەینو ئەو ڕۆژە من تێگەشتم لەوەی کە بێئاگابونی کەسە مەزنەکان لەبەرامبەر کەسە بچوکەکان، چەنێك بۆ ئەو کەسانەی کە بچوكوهەژارن بێزارکەرە. سەرئەنجام لەکۆڵانداڕوناکی مەشخەڵێك دەرکەوت ولەدوای مەشخەڵەکەشەوە کەژاوەیەك بەدی کرا کە دوو ڕەشپێست هەڵیانگرتبوو، بەڵام ئەوەی مەشخەڵەکەی بەدەستەوە بوو میسری بوو.

کاتێك"پاتور"پێی نایە سەر زەوی باوکم هەردوو دەستی لەسەر ئەژنۆی دانا و لەبەرامبەریدا سەری دانەواند،"پاتور"یش بۆ دەربڕینی خۆشەویستی خۆی یان بۆئەوەی پەناگایەکی هەبێت، دەستی خستە سەرشانی باوکم.

ئەوکات"پاتور"و باوکم، بەرەو هەیوانەکە ڕۆشتن و دایکم بەپەلە چڵەدارێکی داگیرساوی لەچێشتخانەکەوە هێناو هەردوو چرای ماڵەکەمانی داگیرساند.

باوکم"پاتور"ی لەسەر کورسیەك دانیشاند و منیش ئاوم بەسەر دەستیدا ڕێژا و بەکەتانەکە دەستیم وشك کردەوە.

هیچ کەسێك قسەی نەکرد تا ئەوکاتەی"پاتور"تەماشایەکی منی کردو بەباوکمی وت: کوڕەکەت زۆر جوانە و ئەوکات هەستی تینویەتی خۆی ئاشکرا کردو داوای شەرابی کردو باوکیشم شەرابی پێدا، بۆماوەیەك بۆنی شەرابەکەی کرد و تامی کرد و دوای ئەوەی دڵنیابوو لەوەی شەرابێکی باشە خواردییەوە، هەرئەوکاتەی سەرقاڵی تاقیکردنەوە و خواردنەوەی شەرابەکە بوو من بەوردی تەماشای سەرتاپایم کردو بینیم پیاوێکی بەتەمەنە کە قژێکی کورتی هەیە و پێیەکی کورت و سینەیەکی کوڕ و ڕۆچوو بۆ ناو جەستەی و ورگێکی گەورەی هەیە و ملوانکەیەکی ئاڵتونیشی لەمل کردووە و لەسەر جلەکانی پەڵەگەلێکی زۆر بەدی دەکرێت و دوای ئەوەی شەرابەکەی خواردەوە، باوکم نانی شیرین و ماسی سورکراوە و قاز و میوەی لەبەر دەمدا دانا.

سەرەڕای ئەوەی دەیزانی"پاتور"پێش ئەوەی بێت بۆ ماڵی ئێمە لەشوێنێکی تردا بانگێشتی میوانداری کراوە، بەمەبەستی پێزانین و ڕێز کەمێك لەخواردنەکانی

بەردەمی خوارد و زۆر باسی تامە خۆشەکانی کردن و من ئاگاداری ئەوە بووم کە دایکم چەنێك بەو پیاداهەڵدانەی "پاتور" خۆشحاڵ بووە.

"پاتور"وتی: کە مەشخەڵدار و ڕێپۆشنکەرەکەم ئەوەندە نانی خواردووە کە هیچ پێویستیەکی بەنان و خواردنەوە نیە، بەڵام خراپ نیە گەر کەمێك خواردن و ئاوجۆ ببەن بۆ ئەو دوو ڕەش پێستە.

منیش خواردن و ئاوجۆم بۆ بردن، بەڵام ئەوان لەباتی ئەوەی خۆشحاڵ بن، نارەزایی خۆیان دربڕی و لێیان پرسیم: ئایا نازانیت ئەم پیرەمێردە چ کاتێك هەڵدەستێت بۆ ئەوەی لێرە بڕۆین؟

وتم:من هیچ زانیاریەکم لەمبارەیەوە نیە و گەڕام و بینیم مەشخەڵدارەکەی "پاتور" لەژێر درەختی"نارون"ەکەماندا خەوی لیّ کەوتووە.

باوکم ئەو شەوە بۆئەوەی هانی میوانەکەی بۆ خواردنەوە بدات، زۆری خواردەوە و دوای ئەوەی ئەو شەرابەی کە لەبازاڕ کڕیبویان تەواو کرد، شەرابە پزیشکیەکانی باوکمیشیان خواردەوە و تەنها یەك گۆزە ئاوجۆ لەماڵەکەماندا مابوو ئەویشیان خواردەوە و ئەوکات هەردوکیان گەشانەوە و مەست بون و دەستیان کرد بەباسکردنی ساڵەکانی خوێندنیان لە ماڵی ژیاندا، دەیوت کاری من کە کونتێکەری کاسەی سەری فیرعەونە بۆ کەسێکی تەمەڵ زۆر گونجاوە، چونکە لەنێو بەشەکانی پزیشکیدا هیچ بەشێك ئاسانتر نیە لە بەشی کاسەی سەر و مێشك، بیّ لە"ددان و گویّ و قوڕگ" چونکە ددان و گویّ و قورگ پێویستی بەپسپۆڕێکی جیاوازی ئەو بوارەیە.

"پاتور"باسی ئەوەی دەکرد ئەگەر من کەسێکی تەمەڵ نەبومایە و بەشێکی ترم هەڵبژاردایە، ئەوا وەك تۆ پزیشکێکی ئاساییم لیّ دەردەچوو و ئەوکات دەمتوانی چارەسەری نەخۆشی خەڵکی بکەم و دوبارە ژیانیان پیّ ببەخشمەوە، لەکاتێکدا ئەمرۆ کاری من ئەوەیە کە خەڵکی بمرێنم.

کاتێك خەڵکانێك لەپیرەمێرد و پیرەژن و ئەو کەسانەی نەخۆشیەکانیان هیچ چارەسەرێکی نیە دەکەونە تەنگانەوە، دەیانهێنن بۆ لای من بۆئەوەی کاسەی سەریان بکەمەوە. منیش لەبەرئەوە کاسەی سەری مرۆڤەکان دەکەمەوە بۆئەوەی هەڵمی زیانبەخش و ئازاربەخش لەسەریان دەربکەم و هەر بەهۆی ئەو کارەوە پیران و کەسە نەخۆشەکان دەمرن.

ئەوکات"پاتور"بەباوکمی وت: من ئەگەر وەك تۆ پزیشکی کەسە هەژارەکان بومایە لەئێستادا بەو شێوەیە قەڵەو نەدەبوم و ئەم ورگە کە ناهێڵێت ڕێبکەم، لەبەرئەوە هاتووەتە بون کە پزیشکی فیرعەونم و بەردەوام خواردنگەلێکی بەهێز و بەتام دەخۆم، بەڵات تۆ لەبەرئەوەی کەمدەستی ئەو خواردنانەی کە بۆ تەندروستیت پێویستە دەخۆیت و لەئەنجامیشدا ورگت گەورە نابێت و دوو ئەوەندەی منیش دەژیت، چونکە بۆ کورت کردنەوەی تەمەن هیچ شتێك لەوە کاریگەر تر نیە کە مرۆڤ خواردنگەلێك بخوات کە پێویستی لێنانی ئەو جۆرە خواردنەی نەبێت.

"پاتور"دەمی باوکمی کردەوە و تەماشای ددانەکانی کرد، دوای ئەوە دەمی خۆی کردەوە و پێی وت: تەماشای بکە، زیاد لە سیازدە ددان لەدەممدا بەدی ناکرێت، لەکاتێکدا تۆ هەڵگری بیست و نۆ ددانی و ددانەکانی من بونەتە قوربانی خواردنە کوڵاوەکان، بەڵام تۆ لەبەرئەوەی کەمدەستی و زۆربەی کات خواردنی سادە و سروشتی دەخۆیت بووەتە هۆی ئەوەی ددانەکانت بەو شێوەیە بەپارێزراوی بمێنێتەوە.

دوای ئەوە بەخەمێکەوە سەری ڕاوەشاند و وتی: من زۆر تەمەڵ و بێ ورەم و زێڕ و مسێکی فراون منی کردووە بە ئاژەڵ.

باوکم پێی وتم:"سینۆهە"باوەڕ بەم قسانەی مەکە، لەبەرئەوەی"پاتور" لەمرۆدا مەزنترین پزیشکی کونتێکەری کاسەی سەری جیهانە و سەدان کەس لە کاهینان و نەجیبزادەکان بەدەستی ئەو لەمەرگ ڕزگاریان بووە، بەڕادەیەکیش شارەزای هونەر و زانستەکەی خۆیەتی کە دەتوانێت دمەڵێك بەئەندازەی یەك هێلکەی مریشك لەسەر دەربهێنێت، ئەوکاهین و نەجیبزادانەی کە لەمەرگ ڕزگاریان بووە، بەدیاری ملیوانکەی زێڕ و قاڵبە زیو و کاسەی مسی پێشکەش دەکەن.

بەڵام "پاتور"وەك پێشوو بەخەمێکەوە سەری ڕاوەشاند و وتی: تا کەسێك کە دوای کونتێکردن و کردنەوەی کاسەی سەری بەزیندویی دەمێنێت، دە کەس بگرە سەد کەس لەژێر دەستمدا دەمرن.

ئایا تۆ هیچ کاتێك ئەوەت بیستووە کە یەك فیرعەون، دوای ئەوەی کونیان کردووەتە سەری، زیاد لەسێ ڕۆژ بمێنێت و بژێت؟

ئەوانەی دەڵێن چەقۆی نەشتەرگەریەکەم لە بەردی"سماق"ە و خۆشی بەخشە، لەلایەکەوە ڕاست دەکەن چونکە چەقۆ بەردینەکەی من، یەك کاهین و یەك شازادەو یەکێك لەنەجیبزادەکان لەماوەی چەند ڕۆژێکدا دەمرێنێت و دوای مردنی ئەویش زێڕو زیو و مانگا و مەڕ و خەزێنەی دانەوێڵەکانی ئەو بۆ پاشماوەکانی دەمێنێتەوە و ئەوان خۆشبەخت دەکات و هەرکاتێك فیرعەون لەیەکێك لەژنەکانی خۆی بێزار دەبێت، سەردانی من دەکات بۆئەوەی لەڕێی چەقۆ بەردینەکەی منەوە، ئەو ئاسودە بکەم و بگرە هەندێکاتیش خودی فیرعەون ئاسودە دەکەم....

بەڵام"پاتور"لەمکاتەدا وەك بڵێی ئاگاداری ئەوە بووە کە خەریکە شتێك بڵێت کە لەدواییدا لەوتنی پەشیمان ببێتەوە، هەر بۆیە بێدەنگ بوو. دوای کەمێکی تر وتی: من زۆر شت دەزانم... زۆرێکیش لەنهێنیەکان لەلای مندا شاردراوەتەوە و ئەو کەسانەی کە ئاگاداری ئەم بابەتەی منن زۆر لەمن دەترسن، بەڵام خۆدی خۆم بەدبەختم، لەبەرئەوەی شارەزاییم لەزۆر شتدا هەیە و هەرچی دانایی مرۆڤ زیاتر ببێت زیاتر هەست بەخەمۆکی دەکات.

لەمکاتەدا"پاتور"دەستی کرد بەگریان و فرمێسکەکانی بە پارچە کەتانەکەی دایکم سڕی و بەباوکمی وت: تۆ پیاوێکی هەژاری، بەڵام داوێنپاك و شەریفی، لەبەرامبەریشدا من کەسێکی دەوڵەمەند و گەندەڵم. بگرە لەسەنێری مانگای سەر زەوی پیستر و گەندەڵترم، لەکاتێکدا خەریکی قسەکردن بوو ملوانکە ئاڵتونیەکەی لەمل داکەند و کردیە ملی باوکم.

بەڵام باوکم ئەو ملوانکەیەی پەسەند نەکرد، لەبەرئەوەی دەیزانی ئەو دیاریەی لەکاتی مەستیدا پێشکەش دەکرێت دیاریەکی ڕاستەقینە نیە و لەوانەیە ئەو کەسەی ئەو دیاریەی بەخشیوە پەشیمان ببێتەوە و ڕۆژی دوایی داوای بکاتەوە.

باوکم و "پاتور" لەتەنیشت یەکەوە لەژورەکەدا خەوتن و من لەهەیواندا خەوم لێکەوت.

بەیانی کاتێك لەخەو هەستام بینیم کە "پاتور" لەخەو هەستاوە و بەهەردوو دەستی سەری گرتووە و دەڵێت: ئێرە کوێیە و بۆچی من لێرەم.

منیش بەرەوڕووی ڕۆشتم و هەردوو دەستم لەسەر ئەژنۆم دانا و سەرم بۆ دانەواند و وتم:"پاتور" ئێرە ماڵی پزیشکێکە کە چارەسەری هەژارەکان دەکات و تۆ دوێنێ شەو میوانی ئەم ماڵە بویت و ئێستاش لەخەو هەستاویت.

بەهۆی گفتوگۆ من و "پاتور"ەوە باوکم لەخەو هەستا و دایکم کە پێش ئێمە هەستابوو گۆزەیەك دۆ و ماسیەکی سوێری بۆ میوانەکەمان هێنا.

جارێکی تر ئاوم بەسەر دەستی"پاتور"دا ڕێژا، و ئەویش لەوکاتەدا سەری دانەواند و وتی: ئاو بەسەر سەریدا بڕێژم و دوای ئەوە سەر و دەستیم بەکەتانەکەی دایکم وشك کردەوە.

"پاتور"پێش ئەوەی قومێك دۆ و تیکەیەك لەو ماسیە بخوات، بەرەوڕووی باخچەکە ڕۆشتو مەشخەڵ هەڵگرەکەی خۆی بەلەقەیەك هەستاند و هاواری کرد هەی گووخلێنکە[14]ی پیس ئایا بەو شێوەیە چاودێری لە خاوەنەکەت دەکەیت؟ بەندەکانم لەکوێن؟ ئەی بۆچی کەژاوەکەم نابینم؟

ئاگربەدەستەکەی هەستایە سەرپێ و"پاتور" پێی وت بڕوات و ڕەشپێستەکانی بۆ بدۆزێتەوەو دوای ئەوە دەرکەوت کە بەندەکانی"پاتور"شەوی ڕابردوو، دوای خەوتنی خاوەنەکەیان ڕۆشتون بۆ سۆزانی خانەیەکی ئەو ناوچەیە و کەژاوەکەیان وەك بارمتە دانابوو، بەپشت بەستن بەو بارمتەی دایاننابوو تا درەنگانێك ڕایانبواردبوو و هێشتا لەخەو هەڵنەستابون.

"پاتور"بازنەیەکی مسی دا بە مەشخەڵ هەڵگر و ڕێ ڕۆشنگەرەکەی، بۆئەوەی بڕوات و کەژاوە و بەندەکانی لەو بارمتەیە ڕزگار بکات و دوای ئەوە بڕێکی زۆر دۆی خواردەوە و تیکەیەك ماسی سوێری خوارد و وتی: دوێنێ شەو نەمانتوانی لەبارەی ئەم کوڕەوە لەگەڵ یەکتردا گفتوگۆ بکەین، لەکاتێك من بەتایبەت بۆ ئەم بابەتە سەردانی ماڵی ئێوەم کردووە...کوڕە...ناوت چیە؟

وتم:ناوم"سینۆهە"یە؟

"پاتور" وتی: ئایا دەتوانی بخوێنیتەوە و بنوسیت؟

---

[14] مەبەستی ئەو قالۆنچانەیە کە دەڕۆنە سەر پاشەڕۆی گیانەوەرەکان و لەشێوەی تۆپێك کۆیان دەکەنەوە و پاڵی پێوە دەنێن...وەرگێڕ.

وتم: بەڵێ.

وتی: بڕۆ کتێبی مردووەکان بهێنە.

منیش ڕۆشتم و بەستەیەک"پاپیرۆس"م هێنا کە کتێبی مردووەکانی لەسەر نوسرابوو، ئەویش بەشێکی هەڵبژارد و منیش بۆم خوێندەوە.

دوای ئەوە چەند ڕستەیەکی وت، منیش هەمان ئەو ڕستانەم نوسی و ئەو وێنانەی بینی کە من کێشابوم و پەسەندیکردن و وتی:

-زۆر باش دەخوێنیتەوە و دەنوسیت، ئێستا بڵێ دەتەوێت ببیت بەچی؟

وتم: من دەمەوێت وەك باوکم ببمە پزیشك و بۆ ئەو مەبەستە بڕۆم لە قوتابخانەی ماڵی ژیان بخوێنم.

"پاتور"وتی: سینۆهە گوێ لەو قسانە بگرە کەمن بۆتی باس دەکەم و بەیادی بسپێرە، بەڵام بێژەری ئەم گوتانە فەرامۆش بکە و لەبیری خۆتی ببەرەوە و هەرگیز مەڵێ کە ئەم گوتانەم لەدەمی کونتێکەری فەرمانڕەوای میسر بیستووە، ئەو شوێنەی کە تۆ دەڕۆیت بۆئەوەی تێیدا فێری زانستی پزیشکی ببیت، بارەگای کاهینەکانە و ژیان و پلەوپایەی تۆ پەیوەست دەکرێت بەبۆچونەکانی ئەوانەوە. لەوێدا دەبێت کەسێکی گوێڕایەڵ و ملکەچ بیت. ئاگادار بە هیچ کات ڕەخنە لەهیچ شتێك نەگریت‌و هیچکات بیروباوەڕی دەرونی خۆت نەخەیتە ڕوو، وەهەرچیت پێ دەڵێن پەسەندی بکە و بزانە کە مرۆڤ لەژیانی خۆیدا بەتایبەت لە "ماڵی ژیان"دا دەبێت وەك ڕێوی فێڵباز و بێدەنگ بێت، بەڵام بەڕوکەش دەبێت خۆی وەك کۆترێکی بێدەستەڵات و وەك مەڕێك خۆی بەنەزان و بێئاگا نیشان بدات.

ئەوەت لەیاد نەچێت کە مرۆڤ تەنها لەیەك کاتدا دەتوانێت خۆی بەو شێوەی کە هەیە پیشانی خەڵکی بدات و ئەویش ئەو کاتەیە کە کەسێکی بەهێز و زەبردەستی لێدەرچوبێت و تا ئەو ڕۆژەی کەسێکی بەهێز و زەبردەستت لێدەرنەچووە ملکەچ و نهێنی پارێز و گوێڕایەڵ بە و منیش ئەمڕۆ پێیان ڕادەسپێرم کە تۆ لەقوتابخانەی پەرستگای"ئامون"وەربگرن و دوای تێپەڕبونی خولێکی سێ ساڵە، لەقوتابخانەی ماڵی ژیان وەردەگیرێیت.

ئەوکات"پاتور" ماڵئاوایی لەدایك و باوکم کرد و سواری کەژاوەکەی خۆی بوو و ڕۆشت.

*بەشی سێیەم*

# ئامادەیی فێرگەی پزیشکی

لەو سەردەمانەدا خوێندنی باڵا لە "تبس"دا لەژێر دەستی کاهینەکانی"ئامون" دا بوو، ماڵی ژیان بە قوتابخانە و نەخۆشخانەیەك لەقەڵەم دەدرا کە لەپەرستگادا ئەرکەکانی خۆی بەجێ دەهێنا.

تەواوی قوتابخانە باڵاکانی"تبس"بەدەستی کاهینەکانەوە بەڕێوە دەبرا و ئەوانیش چاودێری ئەوکەسانەیان دەکرد کە لەم قوتابخانەیەدا دەیانخوێند، بۆئەوەی ئەوانە دەر بکەن کەدژایەتیان دەکەن لەقوتابخانە والاکانیان دا.

لەقوتابخانەدا جگە لەزانستی پزیشکی، زانستی مافناسی و زانستی بازرگانی و زانستی ئەندازیاری و بیرکاری و زانستی ئەستێرە ناسی لە پەرستگای"ئامون"دا دەخوێنرا.

کاهینەکانیش لەبەرئەوە وردبینیان لەهەڵبژاردنی خوێندکارەکاندا دەکرد، چونکە نیوەی خاك و زەوی میسر بەکەسە ڕۆحانیەکانەوە پەیوەست دەکرا، بەواتا بەڕوکەش بەخودای"ئامون"ەوە پەیوەست دەکرا و کاهینەکان نەیاندەهێڵا بێ لەو کەسانەی کە لایەنگری ئەوانن، کەسێکی تر پزیشك و ئەندازیار و بازرگان و ئەستێرە ناسیان لێ دەربچێت.

لەبەرئەوەی ئەفسەرانی لەشکر پێش ئەوەی پەیوەندی بەلەشکرەکەیانەوە بکەن، دەبوو خولێکی مافناسیان لە قوتابخانەدا بخوێندایە، کاهینەکانی پەرستگای"ئامون" فەرمانڕەوای تەواوی دەستگای بەڕێوبردن و سیستەمی میسریان دەکرد.

لەنێو ئەم قوتابخانانەدا، دوو زانست لە زانستەکانی تر گرنگیەکی زیاتری پێدەدرا، یەکێکیان زانستی پزیشکی ئەویتریان زانستی مافناسی بوو.

خولی ئامادەیی هەریەك لەم دوو زانستە، سێ ساڵی دەخایاند و خوێندکار دەبوو سێ ساڵ لە خولی ئامادەییدا بمێنێتەوە، ئەگەر دوای تاقیکردنەوە خودای"ئامون" خۆی پێ نیشان بدات، ئەوا ڕێی پێدەدەن بچێتە قوتابخانەی پزیشکی یان مافناسیەوە.

من لەبەشەکانی ئایندەدا ئەوەتان بۆ باسدەکەم کە خودای"ئامون"بەچ شێوەیەك خۆی پێشانی خوێندکارەکان دەداتو ئێستاش پێتان ڕادەگەیەنم کەمەبەستی کاهینەکانی میسر لەوەیکە خوێندکار بۆماوەی سێ ساڵ لەخولی ئامادەییدا ڕادەگرن ئەوەیە کە هەرجۆرە بیروبۆچونێکی سەربەخۆ کە لەگەڵ بەرژەوەندی کاهینەکانی میسردا نەگونجێت لەبون و کەسایەتی خوێندکاردا لەناوی ببەن و پاکی بکەنەوە.

لەماوەی ئەم سێ ساڵەدا خوێندکارەکان، هیچ کارێکیان نەبوو جگە لەوەی کە لەپەرستگادا کاری پەرستن ئەنجام بدەن و فێری داستانە ئاینیەکان ببن.

کەسە ڕۆحانیەکان زۆر باش ئەوەیاندەزانی ئەو خوێندکارەی کە بەشداری خولی ئامادەیی دەبێت منداڵێکە کە تازە پێ دەنێتە قۆناخی هەرزەکاریەوە. تا ئەوکاتە هەر یاری کردووە و هەڵگری هیچ بیروباوەڕێکی سەربەخۆ نەبووەو قۆناخی چونی بۆقوتابخانەی ئامادەیی پەرستگای"ئامون" خولێکە کە تێیدا بەشداری دەکات بۆئەوەی هەڵگری ڕا و بۆچون بێت.

کەواتە دەبێت لەهەمان ئەم خولەدا، ئازادی بیر و باوەڕی تایبەتی خۆی لەناو ببرێت و بگۆڕدرێت بەکەسێك کە بێ هیچ ئەملاولایەك ئەوەی دەیبیستێت و دەیخوێنێتەوە پەسەندی بکات و کاتێك سێ ساڵی لەم قۆناخەدا تێپەڕاند و چووە ناو قوتابخانەی مافناسی یان پزیشکیەوە و خولی هەریەك لەو دوو قوتابخانەی تەواو کرد، دەگۆڕێت بە لاوێکی تەواو، بەڵام لاوێك کە بێ لەزانیاری کاهینەکانی میسر هیچی تری بەرگوێ نەکەوتبێت و نەیخوێندبێتەوە و بیر و هزری بەشێوەیەك لەچوارچێوەی دیواری فێرکاری کاهینەکان زیندانی کرابێت، کە چیتر دوای کۆتایی هێنانی ئەم خوێندنە باڵایەی، ناتوانێت بەشێوەیەکی تر بیر و باوەڕی خۆی بخاتە ڕوو.

ئێمە کۆمەڵێك خوێندکاربوین کەنزیکەی بیستوپێنج کەس دەبوین، لەخولی ئامادەیی قوتابخانەی پزیشکیدا دەستمان کرد بەخوێندن، من هەموو بەیانیەك دەڕۆشتم بۆ قوتابخانە و خواردنی نیوەڕۆم لەگەڵ خۆمدا دەبرد و پێش ئاوا بونی خۆر دەگەڕامەوە بۆ ماڵ.

دوای ئەوەی چومە قوتابخانەی ئامادەیی پەرستگای"ئامون"زۆر بەزوویی هەستم بەوە کرد کە پزیشکی فیرعەون ڕاستی دەکرد کە دەیوت تۆ دەبێت گوێڕایەڵ و ملکەچ بیت و هەرگیز نابێت ڕەخنە بگریت و بیروباوەڕی دەرونی و تایبەتی خۆت بخەیتە ڕوو.

چونکە ئاگاداری ئەوە بوم کە کاهینەکان لەنێو خوێندکارەکاندا سیخوڕیان هەیە و هەر کە خوێندکارێك گومان لەبابەتێك بکات و بڵێت بەم شێوەیە نیە و کاهینەکان درۆ دەکەن، ئەو خوێندکارە لەو قوتابخانەیە دەردەکەن و چیتر مەحاڵە ئەو خوێندکارە بتوانێت جارێکی تر لەو قوتابخانە باڵایەی"تبس"دا بخوێنێتەوە، بۆ دەرکردنی هەر خوێندکارێك بیانویەکی کاریگەریان هەیە و بانگەشەی ئەوە دەکەن کە"ئامون"دەڵێت ئەم خوێندکارە هیچ ئامادەکارییەکی تێدا نیە.

ئەو ڕۆژەی چومە قوتابخانەی ئامادەییەوە تەمەنم سیانزە ساڵ بوو، سەرەڕای ئەوەی یەکێك بوم لە خوێندکارانی تەمەن بچوکی ئەو قوتابخانەیە، زیاد لەخوێندکارانی کوڕی نەجیبزادە و کاهینە مەزنەکان ئامادەکاریم بۆ خوێندن هەبوو، دەتوانم بڵێم ئەگەر لەوکاتەدا منیان بناردایەتە قوتابخانەی پزیشکیەوە، دەمتوانی تێیدا بخوێنم و لەهەموو شتێك تێبگەم، لەبەرئەوەی جگە لەخوێندەواری و نوسین، زانیاری زانستیشم هەبوو.

چونکە هەر بەوشێوەیەی وتم باوکم پزیشك بوو، من لەژێر دەستی ئەودا فێری ناوگەلێکی زۆری دەرمانەکان ببوم و دەمزانی بەچ شێوەیەك برینێك کە هیچ کێم و چڵکێکی نیە بەڕۆن چارەسەر دەکەن و بەچ شێوەیەك برینێك کە هەڵگری کێم و چڵکیە دوای دەرکردنی ئەو کێم و چڵکیە بەهۆی ئاگرەوە دەیسوتێنن بۆئەوەی چیتر کێم و چڵك نەکاتەوە.

من بەچاوی خۆم بینیومە کە باوکم بەچ شێوەیەك دەڕوات بۆ ئەوەی هاوکاری مامانێك بکات و بەهۆی کەرەستەیەکی تایبەتەوە کە لەداری"سەدر"[15]"دروستکراوە، منداڵ لەسکی دایکیدا پارچە پارچە دەکات و بەپارچە پارچەیی لەسکی دایکی دەیهێنێتە دەرەوە، بۆئەوەی دایکی منداڵەکە لەمەرگ ڕزگار بکات.

سەرەڕای ئەوەی من زیاد لە زۆربەی خوێندکارەکانی تر بۆ وەرگرتنم لە قوتابخانەی ماڵی ژیان"دار الحیات" ئامادەکاریم تێدابوو، بەڵام سێ ساڵ منیان لەقوتابخانەی ئامادەییدا دوا خست.

ئەو خوێندکارانەی کە باوکیان بەشێك بون لە کەسە مەزن و نەجیبزادەکان، دوای چەند هەفتەیەك دەگواسترانەوە بۆ ماڵی ژیان"دار الحیات"و کاهینەکان دەیانوت کە"ئامون"فەرمانی داوە ئەمانە بگواسترێنەوە بۆ ماڵی ژیان.

گەرچی کاتەکانمان بە نوێژکردن و فێربونی چیرۆکە ئاینیەکانەوە تێدەپەڕاند، بەڵام سەرەڕای ئەوەش بڕێك کاتمان بەدەستەوە دەما و لەوکاتەدا کەسە ڕۆحانیەکان فەرمانیان پێدەداین کە"کتێبی مردووەکان"بنوسینەوە و دوای ئەوە هەمان ئەو کتێبانەی کە دەماننوسینەوە لە حەوشەی پەرستگاکەدا دەیانفرۆشتن.

دوای سێ ساڵ کە من بێ لەبەفێرۆدانی تەمەنم، کارێکی باشم ئەنجام نەدا، لەگەڵ ئەو بڕە خوێندکارانەدا بۆ نمونە من کە بەشێك نەبوم لە نەجیبزادە و کەسە مەزنەکان، پێیان ڕاگەیاندم کە دەبێت خۆم بۆ ڕۆشتن بۆ ماڵی ژیان ئامادە بکەم.

پێش ڕۆشتنمان بۆ ماڵی ژیان دەبوو بۆماوەی یەك هەفتە ڕۆژوو بگرین و تەواوی کاتمان لەناو پەرستگادا تێپەڕێنین و لەوێ نەچینە دەرەوە.

لەدوایین شەودا، خودای"ئامون"دەبێت خۆیمان پێ نیشان بدات و قسەمان لەگەڵدا بکات و ئەگەر خۆیمان پێنیشان بدات و قسەمان لەگەڵدا بکات، لەم حاڵەتەدا ئەوەمان بۆ ئاشکرا دەبوو کە ئێمە شایستەی چونە ناو ماڵی ژیانین.

---

[15] سەدر: درەختێکە لە شوێنی گەرمەسێردا دەڕوێت و زۆریش گەورە و قەدی قایم دەبێت و بەرزاییەکەی دەگاتە ٤٠ مەتر و دەڵێن تەمەنی تا سێ هەزار ساڵ دەکات و بەرێك دەگرێت زۆر لەبەری گۆیژی کێوی کوردستانی خۆمان دەچێت و عەرەبی بە"بغداد" پێی دەڵێن"نەبگ".....وەرگر.

**بەڵام بەو شێوەی کە باسی دەکەم بەلایەنی کەم مەحاڵ بوو دوای ئەوەی بۆماوەی سێ ساڵ مێشکی خوێندکارانیان بەبیروبۆچونێك کە بە خودای"ئامون"ەوە پەیوەست دەکرێت پڕدەکرد، لەو شەوەدا"ئامون" قسەیان لەگەڵدا نەکات.**

**تەنها من لەنێو خوێندکارەکاندا جیاواز بووم، لەبەرئەوەی لەگەڵ باوکمدا دەڕۆشتمە سەر نەخۆشەکان و مەرگی ئەوانم بەچاوی خۆم دەبینی.**

**من لەسەردەمی منداڵیەوە تا تەمەنی شانزە ساڵی زیاد لەپەنجا نەخۆشم بینیبوو کە لەبەرچاوی خۆمدا گیانیان لەدەست دا.**

**من لەهەمان ئەو کاتەدا سەرەڕای ئەوەی تەمەنێکی کەمم هەبوو، تێگەشتم کە هیچ شتێك وەك مەرگ، مرۆڤ ئاگاداری پوچی هەندێك بابەتی کاهینەکان ناکاتەوە، چونکە مرۆڤ بەچاوی خۆی دەبینێت کە هیچ جیاوازیەك لەنێوان مەرگی مرۆڤ و گیانەوەرێکدا نیە و لەوە تێدەگات ئەگەر کاهینەکان هەر بەوشێوەی کە باسی دەکەن لەسەر ڕوی زەویدا نوێنەر و هەڵبژاردەی "ئامون"ن ، ئەوا دەیانتوانی ڕێ لەمەرگ بگرن یان بەلایەنی کەم نەیاندەهێلا خۆیان بمرن.**

**مرۆڤ کاتێك چاوی بەمەرگ دەکەوێت، لەوە تێدەگات کە هەموو بابەت و بیروباوەڕێك پوچ و بێ بنەمایە و بگرە هەموو شتێك بەپوچی و بێ بنەما دەبینێت.**

**خوێندکارەکانی تر وەك من چەند جارێك مەرگیان بەچاوی خۆیان نەبینیبوو، لەبەرئەوە نەیاندەتوانی وەك من لێکدانەوە لەبارەی داستانی کاهینەکانەوە بکەن.**

**ئێمەی خوێندکاران دوای ئەوەی ماوەی یەك هەفتە لەناو پەرستگادا ماینەوە و ڕۆژومان گرت لەڕۆژی حەوتەمدا سەریان تاشین و ئێمەیان لەناو"هەسێر[16]"ی مەزنی پەرستگادا شۆرد، دوای ئەوە جلێکی زبری پێ لەبەر کردین کە جلی سەرەکی ماڵی ژیان بوو.**

---

[16] هەسێر: وشەیەکی پاراوی کوردیە کە بەواتای ئەو حەوزە ئاوە دێت کە لەناو باخەکاندا بەهۆی کەمی ئاو دروستی دەکەن بۆئەوەی ئاوەکەی تێدا کۆ بکەنەوە تا بتوانن باخەکەیانی پێ ئاودێری بکەن، لێرەدا هەسێر هەمان واتای وشەی عەرەبی"حوج"ی هەیە کە کوردیش بە"حەوز"دەینوسێت و دەیهێنێتە زمان. گەر ئێمەش وەك زمانە دراوسێکانمان وشەیەکی پاراومان تایبەت بە هەر شتێك هەبێت بۆ وشەی بیانی بەکار بهێنین، گەر هەبوو و هاوزمانەکانمان پێی ئاشنا نەبوون، ئەوا ئەرکی زمانەوان و نوسەر و شاعیر و وەرگێڕە پیان ئاشنا بکەن........ وەرگێڕ.

کاتی ئاوا بوون، ئەو کاتەی"ئامون"لەپشت تەپۆڵکەکانی خۆرئاواوە ون بوو[17]، پاسەوانەکان فویان بە بوقەکانیاندا کرد و دەرگای پەرستگاکان بەستران، ئەوکات یەکێك لەکاهینەکان ئەوەندەی خواردبوویەوە کە نەیدەتوانی بەشێوەیەکی ئاسایی ڕێ بکات بەئێمەی وت: وەرن.

ئێمە بەڕێنمایی هەمان ئەو کاهینەی بانگی کردین، لەدالآنێکی"ڕێڕەو" درێژەوە تێپەڕین و ئەو دەرگایەکی بۆ کردینەوە و ئێمەی بردە ژوورێکی فراوان و گەورەوە کە یەك فەرشی تێدابوو و بینیم ئەو ژوورە تاریکە، بەڵام لەناوەڕاستی ئەو ژوورەدا پەردەیەك هەڵواسراوە کە بڕێك ڕوناکی لەپشت ئەو پەردەوە دەیدا لەمبەری ژوورەکەوە.

تا ئەوکاتە من هێشتا نەچوبومە ئەو ژوورەوە، بەڵام تێگەشتم کە ئەو ژورە ژوری تایبەتی"ئامون"ە.

کاتێك پەردەی ژورەکەی لادا، ئەوکات بۆیەکەمین جار چاوم بەخودای"ئامون"کە لەشێوەی مرۆڤدا بوو کەوت و لەبەرئەوەی لاو بوم و باوەڕم بە خودای"ئامون"هەبوو لەشم کەوتە لەرزین.

بینیم"ئامون"جلی لەبەردایە و ئەو چرایانەی کە لەچواردەوری ئەودا دایاننابوو، زێڕ و بەردە گرانبەهاکانی سەر و گەردنی ئەویان دەدرەوشاندەوە.

کاهین وتی: ئێوە دەبێت ئەمشەو تا بەیانی لێرەدا بەبێداری بمێننەوە و نوێژ و پەرستنی خۆتان بکەن کە لەوانەیە خودای ئامون قسەتان لەگەڵدا بکات، ئەگەر قسەی لەگەڵدا کردن، ئەوا بەڵگەی ئەوەیە کە ئێوە بەشایستەی ئەوە دەزانێت بچنە ناو ماڵی ژیانەوە و کاتێکیش شایستەی ئەوەتان پێ بەخشرا بچنە ناو" ماڵی ژیان"ەوە. سبەینێ سەر لەبەیانیەکەی لەگەڵ مندا"ئامون" دەشۆرین و جلەکانی بەری دەگۆڕین و دوای ئەوە دەڕۆن بۆ ماڵی ژیان.

دوای ئەوەی کاهین قسەکانی تەواو کرد، پەردەکەی بەسەر ئاموندا دادایەوە و بێئەوەی دەستی بخاتە سەر ئەژنۆی و سەر بۆ ئامون دانەوێنێت لەو ژورە ڕۆشتە دەرەوە و دەرگاکەی لەدوای خۆیەوە بەست.

[17] لێرەدا مەبەست لەئامون خۆرە کە لەهەمان کاتدا خودای مەزنی میسریش بووە.

هەرئەوکاتەی کاهین لەو ژورە چوویە دەرەوە ئەو خوێندکارانەی کە وا دەهاتنە بەرچاو لەمن بەتەمەنترن دەستیان بەقسەکردن و پێکەنین کرد و گۆشت و نانیان لەگیرفنیاندا دەرهێنا و خۆیان بەخواردنەوە سەرقاڵ کرد.

یەکێك لەوانەش ڕۆشتە دەرەوە و دوای ئەوە خوێندکارەکان وتیان کە ئەو بۆ ژورەکەی کاهین ڕۆشتووە کە لەوێدا نان بخوات و شەویش لەوێ دەخەوێت، چونکە ناتوانێت لێرەدا لەسەر ئەم بەردانەدا ڕاکشێت.

بەڵام من بەڕۆژو بوم و ئامادە نەبووم خواردنی کەسانی تر بخۆم، لەکاتێکدا کە"ئامون" لەپشت ئەو پەردەوە بێت نانخواردنم بە کفر دەزانی.

لاوەکانی تر دوای نان خواردن دەستیان بەیاری ئێسقانی پاژنە کرد[18] و خۆیان بەو یاریەوە سەرقاڵ کرد و دوای ئەوە هەریەك لەوانە لەسەر بەردە ڕێك و سواق دراوەکانی ئەو ژورەدا ڕاکشان و خەویان لێکەوت.

بەڵام من نەمدەتوانی بخەوم و بەردەوام لەبیری"ئامون"دا بووم و نزای ئاینی خۆمانم لەبەر خۆمەوە دەخوێندەوەو گوێم لەوە گرتبوو کە چ کاتێك دەنگی "ئامون" دەبیستم.

تا ئەو کاتەی بەشێوەیەکی نادیاری هەستم کرد ئەو پەردەیەی لەبەرامبەری "ئامون"دا بوو دەستی بەجوڵان کرد.

لەبەرەبەیاندا پاسەوانانی پەرستگا دەستیان بە بوق لێدان کردو دەرگاکان کرانەوەو خەڵکیش خۆیان دەکرد بەناو پەرستگاکەدا و منیش دەنگی ئەوانم وەك شڵپ‌وهوڕی شەپۆلی دەریا دەبیست کە لەدورەوە بەرگوێ دەکەوێت.

کاتێك خۆر هەڵهات، کاهین لەگەڵ ئەو لاوەی کە شەو ڕۆشتبوو لەسەر جێگە خەوێکی نەرمدا بخەوێت خۆی کرد بەژوردا و من لەبەژن و باڵای هەردوکیان تێگەشتم شەرابیان خواردووەتەوە.

---

[18] لێرەدا مەبەست یاریەکە کە زیاتر لەناو عەرەبەکاندا باوە کە یاری بە پارچە ئێسقانێك دەکەن کە شێوەیەکی لاکێشەی هەیە و دەکەوێتە بەشی پاژنەی پێی مرۆڤ و گیانەوەرانەوە و لەکاتی یاریکردنیشدا ئەگەر ئەو ئێسقانە وەك شقارتە ڕاست بەلایەکدا بکەوێت ئەوا نەکەوتووە و بردویەتەوە، دەقاودەق وەك یاری "شقارتێنە"ی کوردی سەردەمی منداڵی ئێمەیە کە بەتایبەت عەرەبی عێراقی بەو یاریە دەڵێن یاری"چەعب" ........وەرگێڕ.

کاهینەکەش لەوکاتەدا پێی وتین: هەی ئەو کەسانەی ئارەزوی ئەوە دەکەن بچنە ناو ماڵی ژیانەوە، ئایا دوێنێ شەو بێداربون و نوێژتان کردووە؟

ئێمەش بەیەك دەنگ وتمان: بەڵێ.

کاهین وتی: ئایا"ئامون" قسەی لەگەڵدا کردن و دەنگی ئەوتان بیست؟

بۆماوەیەك بێدەنگی باڵی بەسەر ئەو ژورەدا کێشا و دوای ئەوە یەکێك لەخوێندکارەکان بەناوی موسا وتی: بەڵێی ئەو قسەی لەگەڵدا کردین.

پاشان خوێندکارەکانی تریش هەمان قسەیانکردەوە، بەڵام من هیچم نەوت لەبەرئەوەی "ئامون" قسەی لەگەڵ مندا نەکردووە و سەیرم لەوە دەهات کەسانی تر بەچ شێوەیەك دەتوانن بەو ئاسانییە درۆ بکەن.

ئەو لاوەی کە شەو ڕۆشتبووە ژوری کاهینەوە بۆ ئەوەی لەوێ بخەوێت، بەبێشەرمیەکی سەرسوڕهێنەرانە وتی: "ئامون" خۆی پیشانی منیش دا و چەند نهێنیەکی پێی وتم، بەڵام دوپاتی کردەوە کە بۆ هیچ کەسێکی نەگێڕمەوە و منیش زۆر چێژم لەبیستنی دەنگی ئارام و سۆزئامێزی ئەو وەرگرت.

موسا وتی: کاتێك من ئامونم بینی ئەو دەستی خستە سەر سەرم و وتی هەی موسا، من بەرەکەت بەخۆت و خێزانەکەت دەبەخشم و تۆش ڕۆژێك دێت دەبیتە یەکێك لەپزیشکە بەناوبانگەکانی میسر.

دوای موسا دانە دانەی خوێندکارەکانی تر، داستانێکی درۆینەیان لەبارەی ئەوەیکە "ئامون"یان دیوە و قسەی لەگەڵدا کردون گێڕایەوە، تا ئەوەیکە نۆرەی من هات و کاهین وتی: "سینۆهە" ئایا تۆ"ئامون"ت بینی و قسەی لەگەڵدا کردیت؟

وتم: نەخێر...من نە ئەوم بینی و نەگوێم لەدەنگی بوو و تەنها لەبەرەبەیاندا نەبێت هەستم کرد کە پەردەی چواردەوری ئامون دەجوڵێتەوە.

لەوکاتەدا کاهین بەکرژییەکەوە تەماشایکردم، دوای ئەوە بێدەنگی باڵی بەسەر ژورەکەداکێشا.

یەکێك لەو لاوانەی کە هەر لەسەردەمی ڕۆشتنمان بۆ قوتابخانە بوبوین بەهاوڕێ، دەستی کاهینی گرت و بردیە کەنارەوە و دوای ئەوە بەچپەوە قسەی لەگەڵدا کرد و کاتێك ئەوسێ کەسە گەڕانەوە بۆلامان کاهین بەتوڕەییەوە وتی"سینۆهە" لەبەرئەوەی هیچ گومانێك لە بیروباوەڕی پاکی تۆ ناکرێت لەوانەیە"ئامون" قسە لەگەڵ تۆدا بکات.

ئەوکات بەهێمایەکی دەستی ئەو کاهینە هەمان ئەو لاوە پەردەی چواردەوری ئامونی لادایەوە و منی بردە بەردەم پەیکەری"ئامون"و پێی وتم: وەکو جاران سەرم بنێمە سەرزەوی و لەو حاڵەدا بمێنمەوە.

یەکسەر دەنگێك لەو ژورەدا دەستی کرد بەقسەکردن و و پێی وتم: سینۆهە ... سینۆهە.... من دوێنێ شەو دەمیوست قسەت لەگەڵدا بکەم، بەڵام تۆ زۆر تەمەڵی و خەوت لێ کەوتبوو..

منیش سەرم بەرز کردەوە و ئاگاداری ئەوە بووم کە دەنگ لەدەمی"ئامون"ەوە دێتە دەرەوە، دوای ئەوە هەمان ئەو دەنگە وتی: سینۆهە...من "ئامون"م و لەبەرامبەر ئەو بێئاگایی و کەمتەرخەمیەی دوێنێ شەو کردت، دەبێت تۆ هەڵدەمە دەمی خودای قوتدەرەوە، بەڵام لەبەرئەوەی دەزانم کە باوەڕت بەمنە ئەمجارەیان لێت دەبورم و ....

چیتر دوای ئەوە نەمزانی ئەو دەنگە چی دەڵێت، چونکە تێگەشتم ئەو دەنگەی کە من وام دەزانی لەدەمی"ئامون"ەوە دەردەچێت، جگە لەو کاهینە، دەنگی هیچ کەسێکی تر نەبوو! ئەو بابەتەش حاڵەتێکی وەك نەفرەت و توڕەیی لەمندا دروست کرد.

تا ئەوکاتەی کاهن هاتو منی لەزەوی بەرزکردەوە و وتی: وەرە لەشۆردن و گۆڕینی جلوبەرگی"ئامون"دا بەشداری بکە.

من دەقاودەق نازانم بەچ شێوەیەك بۆ شۆردنو وشککردنەوە و گۆڕینی جلی ئەو پەیکەرەی "ئامون" هاوکاریم کردن، چونکە بیر و هزرم پرژوبلاوبوو، وا هەستم دەکرد کە کەتنێکی گەورەم کردووە و کەلێنێك کەوتۆتە بیرو باوەڕمەوە.

ئەو ڕۆژە ڕۆنی پیرۆز لەسەری من و ئەوانی تر ماڵرا و پاپیرۆسێکیان پێدام کە ڕەزامەندی وەرگیرانم بوو لەماڵی ژیان. کاتێك مەراسیمی چونی من بۆ ماڵی ژیان لەو ڕۆژەدا کۆتایی پێ هات، لە پەرستگا چوومە دەرەوە بۆ ئەوەی بڕۆمەوە بۆماڵ، بەهۆی ئەو نەفرەتە زیادەڕۆیەی کە لەدەرونمدا هەستم پێدەکرد دوچاری ڕشانەوە بووم.

*بەشی چوارەم*

# خوێندن لە ماڵی ژیان

مامۆستایانی قوتابخانەی پزیشکی ماڵی ژیان، پزیشکی فەرمانڕەوایان بون و کەمتر سەردانی ماڵی ژیانیان دەکرد. لەبەرئەوەی نەخۆشە دەوڵەمەندەکان سەردانیان دەکردن و کاتی ئەوان بەشێوەیەك بۆ چارسەرکردنی نەخۆشەکانیان تەرخانکرابوو و هەلی ئەوەیان بۆ نەدەڕەخسا سەردانی ماڵی ژیان بکەن، بەڵام ئەوکاتانەی پزیشکە ئاساییەکان توانای چارەسەرکردنی کەسە نەخۆشەکانیان نەبوو، داوایان لەو پزیشکانە دەکرد کە بێن بۆ ماڵی ژیان و چارەسەری نەخۆشەکان بکەن و بەم شێوەیە لەشاری"تبس"دا هەژارترین نەخۆش، کاتێك پزیشکانی تر نەیاندەتوانی چارەسەریان بکەن سودیان لە زانست و ئەزمونی پزیشکی فەرمانڕەوایان وەردەگرت.

سەرەڕای ئەوەی لە"تبس"دا هەژارترین کەس دەیتوانی بچێتە ناو ماڵی ژیانەوە و لەوێدا چارەسەر بکرێت، من ئارەزوی ئەوەم نەدەکرد کە لەجێی ئەواندا بم و سود لەدەرمانی خۆڕایی وەرگرم. تەنها بۆئەوەی پزیشکانی لاو و خوێندکاران لەماڵی ژیاندا دەرمانە جۆراوجۆرە تازەکان لەنەخۆشە هەژارەکاندا بەکار بهێنن و تاقیان بکەنەوە بۆئەوەی بزانن کاریگەری ئەو دەرمانە تا چ ڕادەیەکە؟ لەم جۆرە کاتانەدا دەیانویست نەشتەرگەری برینداریێك بکەن یان کاسەی سەری کەسێك کون تێبکەن یان ورگی نەخۆشێکی تر هەڵدڕن و بێئەوەی پەنا بۆ ئەو دەرمانانە ببەن کە ئازارەکان هێور دەکاتەوە، دەستیان بەئەنجامدانی ئەم جۆرە نەشتەرگەریانە دەکرد.

ئەو جۆرە دەرمانانە زۆر گران بون و کەسە هەژارەکان نەیاندەتوانی بیکڕن، هەروەها ماڵی ژیان ئەم جۆرە دەرمانانەیان نەدەدا بەکەسە هەژارەکان، لەوکاتانەدا

هەر کەسێك خۆی بە ماڵی ژیاندا بکردایە هاواری دڵ هەژێنی بریندارەکانیان لە ژوری نەشتەرگەریدا دەبیست.

سەردەمی خوێندن لەقوتابخانەی ماڵی ژیاندا درێژخایەن بوو، چونکە خوێندکار سەرەڕای فێربوونی زانستی پزیشکی و هونەری هەڵدڕینی سەر و سك و چارەسەرکردنی سی و جگەر و گورچیلە و میزڵدان و نەخۆشی ژنانە و ئەو نەخۆشیانەی بە منداڵبونەوە پەیوەست دەکرێت، دەبێت شارەزای جۆری کاریگەری تەواوی دەرمانەکان ببێت و ئاگاداری ئەوە بێت بەچ شێوەیەك ئەو جۆرە درەمانانە لە چ جۆرە گیایەك بەدەست دەهێنن و لە چ کاتێك دەبێت ئەو جۆرە گیایانە کۆبکەیتەوەو وشکی بکەیت. خوێندکاری قوتابخانەی ماڵی ژیان دەبێت بزانێت هەموو گیایەکی پزیشکی لەکوێدا هەیە و لە چ وەرزێکدا کۆ دەکرێتەوە و سەرەتا دەبێت شارەزای خودی گیا و وشککردنی بێت.

بۆنمونە سێ جۆر ڕیشکی گیای پزیشکیان تێکەڵ دەکرد و دەیانخستە بەردەم خوێندکارەوە و دەیانوت ئەم ڕیشکانە لەیەك جیا بکەنەوە، من لەوە دڵنیاتان دەکەمەوە کە هەندێکات پزیشکی فەرمانڕەواکانیش دەربارەی ڕیشکی گیاکان هەڵەیان دەکرد، چونکە ڕیشکی هەندێك لەگیاکان ئەوەندە لەیەك دەچن کە ناتوانیت لەیەکیان جیا بکەیتەوە.

لەمجۆرە حاڵەتانەدا ڕێگەی ناسینەوەی ڕیشکی گیا پزیشکیەکان ئەوەیە کە پزیشك ڕیشکی هەر گیایەك بخاتە دەمیەوە و بیجوێت و لەڕێی تامەکەیەوە تێبگات کە لەچ گیایەکە.

هەندێك لەپزیشکە فەرمانڕەواکان بەهۆی پیرییانەوە، ددانیان لەدەستدابوو، بۆیە ناچار بون ڕیشکی گیاکان بکوتنەوە و کاتێك بەتەواوی نەرم دەبوو ئەوکات بیخەنە دەمیانەوە و لەڕێی تامەکەیەوە پێمان بڵێن ئەمە لەچ جۆرە گیایەکە.

لە ماڵی ژیاندا گرفتئامێزترین بابەتی خوێندنمان بریتی بوو لەوەی بتوانین بەهۆی پەنجە و چاومانەوە هەست بەجۆری نەخۆشی هەر کەسێك بکەین و بزانین چ شوێنێکی نەخۆش ئازار دەکات و ئەو ئازارە لەچ نەخۆشیەکەوە سەرچاوە دەگرێت.

من لەوباوەڕەدام کە پزیشکێك، پزیشکێکی ڕاستەقینە نیە مەگەر ئەوەی کە چاو بەچاو و ڕوو بە ڕوو تەماشای نەخۆش بکات و بتوانێت لەچاو و ڕوخساریەوە پەی

بەنەخۆشیەکەی ببات و کاتێک پەنجەکانی بەسەر جەستەی نەخۆشدا دەکێشێت هەست بەئازارەکانی بکات و هەر لەبەرئەوەش لەنێو ئەو خوێندکارانەی کە چونە قوتابخانەی ماڵی ژیانەوە جگە لە چەند کەسێکیان نەبێت، ئەوانی تریان پزیشکی ڕاستەقینە نەبوون، بەڵکو بەپزیشکێکی ڕوکەش لەقەڵەم دەدران.

بگرە ئەگەر ببونایە بەپزیشکی فەرمانڕەواش، ئەوا لەبۆنی ناسینەوەی نەخۆشیەکان بێبەش دەبون. لەماڵی ژیاندا تەنها خوێندنەوەیان بۆ دوو جۆر نەخۆشی دەکرد، یەکێکیان ئەو نەخۆشیانەی کە لەجەستەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەم جۆرە نەخۆشیانە لە خواردنی کولاو و پیریەوە سەرهەڵدەدات.

دووەمیشیان لەڕۆحەوە دروست دەبێت، چونکە ڕۆحیش دەبێتە هۆی دروست بونی نەخۆشی، بۆئەوەی ببێتە هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشیەک، ئەم ئەرکە بەڕۆحە بچوکەکان دەسپێرێت. ئەم ڕۆحانەش ئەوەندە بچوکن کە دەتوانیت سەدان هەزار دانە لەم ڕۆحانە لەسەر پانتایی ناخونێکی پەنجە جێیان بکەیتەوە، بەڵام هەریەک لەمانە بەتەنهایی دەتوانێت، ببێتە هۆی سەرهەڵدانی نەخۆشیەک.

ئێمە لەماڵی ژیاندا دەبوو بمانزانیایە کە بەچ شێوەیەک ئازارەکان لەڕێی دەرمانەکانەوە هێور دەبنەوە و چی بکەین بۆئەوەی کاتێک سەر یان ورگی کەسێک هەڵدەدڕین هەست بەئازار نەکات. ئێمە دەبوو بمانزانیایە کە بەچ شێوەیەک هەندێک لە ئازارەکان زیاد بکەین، چونکە ناتوانرێت هەندێک لەو نەخۆشیانە چارەسەر بکرێن، جگە لەوکاتانەی کە کەمێک لەئازارەکانیان زیاد بکەین. یەکێک لەڕێگاکانی فێربون ئەوەیە کە بەچ شێوەیەک ئێمە لەڕێی دروستکردنی نەخۆشیەکی تر لەجەستەیدا، نەخۆشیەکەی تریان چارەسەر بکەین.

لەم ڕێیەوە نەخۆشیەکی مەترسیدارمان لەڕێی دروستکردنی نەخۆشیەکی بێترسەوە چارەسەر دەکرد و دوای ئەوە نەخۆشیە بێزیانەکەمان زۆر بەئاسانی لەناو دەبرد.

ئێمە دەبێت تێبگەین کە کام بەش لەدەربڕینی حاڵەتی کەسی نەخۆش ڕاستەقینەیەو کام بەش درۆینەیە، بەواتا کامیان لە ڕوانگە و ئەندێشەکانیەوە سەرچاوە دەگرێت.

چونکە نەخۆش وەك بونەوەرێك کە گرفتاری ڕۆحە ئازاربەخشەکان بوبێت دوچاری ئەندێشەو ڕوانگە گەلێکی ترسناك دەبێت و ئازارگەلێکی بێبنەما لەجەستەیدا دێتەبون و ئەو جۆرە ئازارانەش لەگەڵ ئازارە ڕاستەقینەکاندا تێکەڵ دەکات، لەم کاتانەدایە کە دەربڕینی کەسی نەخۆش کابرای پزیشك بەهەڵەدا دەبات وکەسی پزیشکیش لەڕێی هەڵەوە دەست بەچارەسەرکردنی دەکات و بەو هۆیەوە کەسی نەخۆش دەکوژێت. کاتێك من لەماڵی ژیاندا بوم پەیم بەم ڕاستیە برد کە بابەتی ئامادەکاری و ئامادەبوون لەبواری پەروەردەکردنی پزیشکیدا زۆر گرنگە. هەروەها ئاگاداری ئەوەش بووم ئەوەندە بابەتی ئامادەیی و ئامادەکاری لەبواری پەروەردەکردنی پزیشکیدا گرنگە، خودی خوێندن ئەو گرنگیە لەخۆ ناگرێت.

چونکە ئەگەر خوێندکار هەڵگری ئەو ئامادەکاریە نەبێت، ماڵی ژیان کە مەزنترین قوتابخانەی پزیشکی جیهانە، ناتوانێت بیکاتە پزیشکێکی لێهاتو.

کەسێك بچێتە ماڵی ژیانەوە، دەبێت عاشقی بواری پزیشکی بێت و خۆشی بوێت و ئامادە بێت لەپێناو ئەم زانستەدا هەموو شتێکی بکاتە قوربانی، بەتایبەت دەبێت ئاسودەیی خۆی بکاتە قوربانی.

من لەماڵی ژیاندا تێگەشتم لەوەی کە بابەتی متمانەپێکردنی کەسی نەخۆش لەبەرامبەر کەسی پزیشکدا، لەڕوی چارەسەرکردنیەوە زۆر گرنگە و نەخۆش دەبێت باوەڕ بەوە بهێنێت کە ئەو پزیشکەی خەریکی چارەسەرکردنیەتی زۆر شارەزا و زیرەکە و دورە لەهەر جۆرە هەڵەیەك.

هەر لەبەرئەوەش پزیشك نابێت هەڵەبکات، چونکە ئەگەر هەڵەبکات متمانەی نەخۆشەکانی لەدەست دەدات و هەر دەرمانێك کە ئەم پزیشکە بۆ نەخۆشەکانی دەستنیشان بکات بێکاریگەر دەبێت.

من لەکاتی خوێندنم لەماڵی ژیاندا تێگەشتم لەوەی کە واتای ئەم ڕستەیەکە (پزیشکەکان بەهەرەوەزی نەخۆشەکانیان بەخاك دەسپێرن) واتای چی دەگەیەنێت؟ چونکە لەماڵی دەوڵەمەندەکاندا کە چەند پزیشکێك بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکانیان ئامادە دەبێت، کاتێك پزیشکی دووەم و سێیەم دێن و دەبینن پزیشکی یەکەم هەڵەی کردووە، هەڵەکەی ئاشکرا ناکەن، بۆئەوەی خەڵکی متمانەی خۆیان لەبەرامبەر پزیشکەکاندا لەدەست نەدەن.

ئەو پزیشکانەی دەڕۆنە ماڵی کەسە دەوڵەمەندەکان پزیشکی فەرمانڕەوایانن و کاتێك خەڵکی ئاگاداری ئەوە بن کە پزیشکێکی فەرمانڕەوایان هەڵەی کردووە، ئەوا لەم حاڵەتەدا متمانەیان لەبەرامبەر تەواوی پزیشکاندا لەدەست دەدەن.

گرنگترین شت ئەوەیە کە خەڵکی بەهیچ شێوەیەك پەی بەهەڵەی هیچ پزیشێك نەبەن، چونکە ئەگەر بزانن پزیشکێك هەڵەی کردووە، وا هەست دەکەن کە هەموو پزیشکێك ئەگەری ئەوەی هەیە هەڵە بکات.

لەبەرئەوە هەموو پزیشکێك هەڵەی پزیشکێکی تر بەشاراوەیی دەهێڵێتەوە، بۆئەوەی لەبەرامبەر ئەویشدا ئەو باوەڕەیان لەدەست نەدەن کە هیچ کاتێك هەڵە ناکات، هەر لەبەرئەوەش دەڵێن کە پزیشکەکان بەهەرەوەزی نەخۆشەکانیان بەخاك دەسپێرن.

لەماڵی ژیاندا گەرچی خزمەتگوزار هەیە، بەڵام خزمەتگوزارەکان کار ناکەن، چونکە لەوێدا تەواوی کارەکان لەئەستۆی خوێندکارە تازەکاندایە.

ئەو لاوەی کە بۆ خوێندن دەچێتە ماڵی ژیانەوە پلە نزمترین خزمەتگوزاری ئەو بەشەیە و پیسترین کاری پێدەسپێرن.

تەنها کوڕی کەسە وەجاخزادە و کاهینە مەزنەکان لەبەرئەوەی سەروەت و سامانیان هەیە، ئەم جۆرە کارانەیان پێ ناسپێردرێت، بەڵام ئەمانیش کارەکانی خۆیان بە خوێندکارە هەژارەکان دەسپێرن. لەئەنجامدا خوێندکارێکی هەژار، هەم خزمەتکاری ماڵی ژیانە و هەم خزمەتکاری کەسە دەوڵەمەندەکانە.

پێش ئەوەی لەماڵی ژیاندا دەست بەلێکۆڵینەوەی پزیشکی بکرێت، خوێندکار دەبێت لەبواری پاك و خاوێنیدا بەتەواوی ئامادە بکرێ و ئەم ڕاستیە ڕۆبچێتە مێشکیەوە کە هەرگیز و لەهیچ کاتێکدا نابێت چەقۆیەکی بەردین یان ئاسنین بەکار بهێنێت، جگە لەو کاتەی کەپێش ئەوەی بەکاری بهێنێت بیخاتە ناو ئاگرەوە، هەروەها نابێت ئەو پارچانەی سودیان لێ وەردەگرێت پێش ئەوەی لەئاوی سوێراودا بیانکوڵێنێت بەکاریان بهێنێت.

هەروەها تەواوی ئەو کەرەستە دارینانەی کە ناتوانرێت بخرێتە ناو ئاگرەوە، بۆ هەرجارێك کە بەکاردەهێنرێت دەبێت بکوڵێنرێت.

بابەتی ئەوەی کە دەبێت چەقۆ بەردین و ئاسنینەکان بخرێنە ناو ئاگرەوە و پارەچە قوماشەکان دەبێت لەناو سوێراودا بکوڵێنرێن، بیر و هەستی منی بەشێوەیەك پەرێشان کردبوو کە نیوە شەویش لەترساندا خەوم لێنەدەکەوت و وا هەستم دەکرد چەقۆیەك پێش ئەوەی بیخەمە ناو ئاگرەوە بەکارم هێناوە.

من زۆر قسە لەسەر ئەم جۆرە بابەتانە ناکەم کە لەتەواوی کتێبە پزیشکیەکاندا نوسراوەتەوە، لەبەرئەوەی هەرکەسێك کتێبێکی پزیشکی بکرێت دەتوانێت پەی بەم خاڵانە ببات، بەڵکو باسی ئەو شتانە دەکەم کە هێشتا لەهیچ کتێبێکی پزیشکیدا نەنوسراوەتەوە و لەوانەیە لەئاییندەیشدا نەنوسرێتەوە.

ماڵی ژیان خاوەنی پۆشاکێکی تایبەت بوو کە ئێمە کاتێك دەچوین بۆ ئەویٚ هەمان ئەو پۆشاکەمان لەبەر دەکرد، ئەم پۆشاکەش وەك تەواوی ئەو شتانەی کە لە ماڵی ژیاندا بەکار دەهێنرا لەناو سوێراودا دەکوڵێنران.

تەواوی خوێندکارانی ئەویٚ، یەك جۆر پۆشاکیان لەبەر دەکرد، بەڵام ملپێچەکەیان جیاوازی هەبوو، هەموو خوێندکارێك بەپێی پێشکەوتنی لەخوێندنەکەیدا ملپێچێکی جیاوازی لەمل دەکرد.

من گەشتبومە ئاستێك کە دەمتوانی ددانی پیاوانی بەتەمەن هەڵکێشم و دمەڵی شوێنە جیاوازەکانی جەستە بتەقێنم و کێم و چڵکی ناو دمەڵەکە دەربهێنم و ئێسقانە شکاوەکانی جەستەش بەشێوەیەك بیانلێکنمەوە بەیەکەوە بۆئەوەی جارێکی تر یەکبگرێتەوە و لەگەڵ ئێسقانی تەندروست و نەشکاودا جیاوازی نەبێت.

دەمتوانی بەشێوەیەکی سەرەتایی جەستەکان مۆمیا بکەم، چونکە مۆمیاکردنی جەستەکان لەلای ئێمە بەکردارێکی پزیشکی لەقەڵەم نادرێت، چونکە ئەو کەسە ئاساییانەی کە خوێندەواریشان نیە، دەتوانن بەفەرمانی پزیشکێك جەستەیەك مۆمیا بکەن.

من خۆم لەهیچ کارێکی سەختی پزیشکی نەدەدزیەوە، لەبەرئەوەی زانستی پزیشکیم زۆر خۆش دەویست، هەربۆیە خۆبەخشانە لەکاتی چارەسەرکردندا، دەربارەی ئەو نەخۆشانەی هیچ چارەسەرێکیان نەبوو، پیسترین کارم پەسەند دەکرد و ئەنجامم دەدا، بۆئەوەی بزانم پزیشکانی فەرمانڕەوا بەچ شێوەیەك ئەو نەخۆشانەی

هیچ چارەسەرێکیان نەبوو و کە لەهەر دە کەس لەو نەخۆشانە، نۆیان دەمردن، هەوڵی چارەسەرکردنیان دەدان.

پزیشکانی فەرمانڕەوا بۆ چارەسەرکردنی ئەو نەخۆشانەی هیچ چارەسەرێکیان نەبوو، بەشێوەیەك چارەسەریان دەکردن کە ناتوانرێت تیمساحیش بەوشێوە کەمتەرخەمانە چارەسەر بکرێت، من زۆرباش لەوە تێگەشتبووم کە خەڵکی بەبێ هۆ لەمەرگ دەترسان، چونکە خودی مەرگ هیچ ترسێکی نیە، بەڵکو بۆ زۆربەی خەڵکی وەك بەهرەیەك مەزنی چاوپێکەوتنی خودای"ئامون"ە.

ئەو نەخۆشانەی هیچ چارەسەرێکیان نەبوو، تا ئەو ڕۆژەی زیندوو بون بەردەوام لەئازاردا دەیانناڵاند و پێچیان لەخۆیان دەدا، بەڵام کاتێك دەمردن لەجەستەی ئەواندا جۆرێك لەئارامی و ئاسایش بەدی دەکرا، بەشێوەیەك کە هەرکەسێك ئەوانی ببینیایە تێدەگەشت کە ئاسودە بون.

لەکاتێکدا بۆ فێربونی هونەری پزیشکی لەژێرچاودێری پزیشکی فەرمانڕەوایان نەخۆشە چارەسەرنەکراوەکانم چارەسەر دەکرد، لەناکاو توشی شتێکی سەیری وەك ئەو شتە سەیرەی کە لەقوتابخانەدا بەسەرمدا هاتبوو بووم، لەڕۆحمدا، ئەو بیرۆکەیەم هات بەمێشکدا(بۆچی؟)

من تا ئەو کاتە(بۆچی؟)م بەمێشکدا نەهاتبوو و لەوکاتەدا لەوەتێگەیشتم کە (بۆچی؟) کلیلی ڕاستەقینەی هەموو نهێنیەکانە و ئەگەر کەسێك بتوانێت بەهۆی ئەوەی بڵێت(بۆچی؟) و بەدڵسۆزیەکەوە وەڵامی ئەم پرسیارە بدۆزێتەوە دەتوانێت پەی بەهەموو نهێنیەك ببات، هۆکاری ئەوەی من توانیم پەی بەوە ببەم (بۆچی؟) بونی هەیە ئەوەیە:

ڕۆژێکیان ژنێکی چل ساڵە کە تا ئەو کاتە، منداڵی نەبوبو، هات بۆماڵی ژیان و بەترسەوە وتی: کە ماوەیەکە سوڕی خوێنی مانگانەی"عادە"وەستاوە و لەبەرئەوەی بەتەمەنی چل ساڵی گەشتووە چیتر منداڵی نابێت، پرسیاری ئەوەی کرد کە ئایا وەستانی سوڕی مانگانە هۆکارەکەی بۆ بەتەمەنبونی دەگەڕێتەوە، یان ئەوەیکە ڕۆحێکی زیانبەخش لەجەستەیدایەتی؟

منیش بەو ژنەم وت: کە بەپێی کتێبی پزیشکی کاردەکەم بۆئەوەی بزانم بڕینی سوڕی خوێنی مانگانەت لە سکپڕبونەوە سەرچاوە دەگرێت یانە؟ بەڵام چیتر دوای

ئەوە دەبێت هەموو ڕۆژێك بێیت بۆ ئێرە و هەموو جارێك کاتێك هاتیت بۆ ماڵی ژیان بتوانی "میز"ی خۆتمان پێ بدەیت.

ژنەکەش پرسی: تۆ چی لە "میز"ی من دەکەیت؟

منیش وتم: بەو میزەی تۆ گەنم دەچێنم.

دوای ئەوە هەر بەوشێوەیەی کە لەکتێبدا نوسراوە، من دوو قاپی بچوك گەنمم لەدوو شوێنی جیاواز لەژێر خۆردا لەسەر زەویدا چاند و ئاوی ئاسایی و سروشتیم بەسەر یەکێکیان دەپڕاند و بەسەر ئەویتریاندا میزی ئەو ژنەم بەسەریدا دەڕشت و چەند هێمایەکی جیاوازم بۆ ئەو دوو پەڵە گەنمە جیاوازە دانا بۆ ئەوەی لێم تێك نەچێت.

دوای ئەوە هەموو ڕۆژێك، ئەو دوو کێڵگە بچوکەم یەکێکیان بەئاو و ئەویتریان بە میزی ئەو ژنە دەدێرا.

دوای چەند ڕۆژێك ئەو کێڵگەیەی کە بەمیزی ئەو ژنە دەدێردرا، زۆر بەهێز گەشەی کردو پەڵو ساقی گەنمەکە زۆر ئەستور و بەهێز بوو، لەکاتێکدا گەنمی کێڵگە بچوکەکەی تریان زۆر لاواز بوو و منیش بەو ژنەم وت: خۆشحاڵ بە، چونکە بڕانی سوڕی خوێنی مانگانەت لە پیریەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو "ئامون" تۆوی پێ بەخشیوی و سکی پڕ کردویت.

ژن بەهۆی ئەم مژدەیەوە دەستی کرد بەگریان و بازنەیەکی زیوی بەئەندازەی دوو دنیە[19]ی پێدام، چونکە ژنی بەدبەخت ئۆمێدی منداڵبونی لەدەست دابوو و وای دەزانی کە هەرگیز سکی پڕ نابێت.

دوای ئەوەی لێی پرسیم: ئایا منداڵەکەم کوڕ دەبێت یان کچ؟

من لەبەرئەوەی دەمزانی کە دایکەکان زیاتر حەزدەکەن کوڕیان ببێت، بۆیە پێم وت: منداڵەکەت کوڕ دەبێت.

---

[19] دنیە-یان-دین- لەگرامێك کەمترە، بەواتا نۆ سەد میلی گرامە و وەك بڵێی هۆکاری ئەم وشەیە بێت کە لەچەرخەکانی تردا بوو بە "دینار".

بەڵام ئەم بەشەم لەڕوی بیر و ئەندێشەی خۆمەوە پێوت، چونکە لەو کتێبەدا هیچ شتێك دەربارەی ئەم بابەتە نەنوسراوە، بەڵام وابزانم کاتێك ژنێك سکی پڕ دەبێت بەختی ئەوەی کە منداڵەکەی کوڕ یان کچ بێت یەکسانە.

دوای ئەوەی ئەو ژنە بەخۆشحاڵیەوە لەماڵی ژیان چووە دەرەوە، من بەخۆمم وت: بۆچی؟ تۆوی گەنمێك زانیاری لەبارەی شتێکەوە هەیە کە پزیشکێك ناتوانێت پەیی پیّ ببات.

چونکە هیچ پزیشکێك ناتوانێت لەمانگی یەکەم و دووەمی سك پڕبوندا، پێش ئەوەی سکی ژنی دووگیان بەرز ببێتەوە بڵێت ئەو ژنە سکی پڕە یان نە؟

تەنها خودی ژن بەهۆی دابڕانی سوڕی خوێنی مانگانەیەوە دەتوانێت پەی بەم بابەتە ببات، بەڵام هەندێك لەژنەکان، وەك ئەم ژنە ناتوانن پەی بەم بابەتە ببەن.

ئەو ڕۆژە بۆیەکەمینجار چەمکی(بۆچی؟) بەهزرمدا هات و ڕۆشتم بۆ لای یەکێك لەمامۆستاکان و پێم وت: بۆچی تۆوی گەنمێك دەتوانێت ئاگاداری ئەوە ببێت کە ژنێك سکی پڕە یانە، بەڵام ئێمە ناتوانین ئاگادار ببین.

مامۆستاکەش بەسەرسوڕمانەوە تەماشایەکی کردم و وتی: لەبەرئەوەی ئەم بابەتە لەکتێبدا نوسراوەتەوە.

بەڵام ئەم وەڵامەی منی ڕازی نەکرد، لەبەرئەوە ڕۆشتم بۆ لای مامۆستایەکی تر کە ئەو مامانی منداڵانی کەسە فەرمانڕەواکانی دەکرد و لێم پرسی: بۆچی مشتێك گەنم کە لەزەویدا چێنراوە ئێمە لەوە ئاگادار دەکاتەوە کە ژنێك سکی پڕە یانە نە؟

مامانی منداڵانی فەرمانڕەوایان وتی: لەبەرئەوەی"ئامون"کە خودای تەواوی خوداکانە وای خواستووە کە کاتێك گەنم بەمیزی ژن ئاودێری بکرێت باشتر گەشە بکات.

کاتێك ئەم وەڵامەی دامەوە، ئاگاداری ئەوە بووم کە بەچاوی لادێییەکی نەخوێندەوار تەماشام دەکات و من بەهۆی ئەم پرسیارەوە لەبەرچاوی ئەودا زۆر بچوك بومەوە، بەڵام وەڵامەکەی ئەو منی ڕازی نەکرد و تێگەشتم کە ئەو و تەواوی پزیشکی دەستەڵاتدارەکانی تر، تەنها شارەزای نوسراوی ناو کتێبەکانن و هیچ زانیاریەکیان لەبارەی هۆکاری بەکارهێنانی دەرمانەکانەوە نیە و هیچ یەك لەمان ئامادە نەبوون

لەخۆیان بپرسن "بۆچی دەبێت هەموو چەقۆیەکی بەردین و ئاسنین پێش بەکارهێنانی بخرێتە ناو ئاگرەوە."

ڕۆژێکیان پرسیارم لەیەکێك لەپزیشکە فەرمانڕەواکان کرد و پێم وت: بۆچی کاتێك تۆڕی پەسپەسکەرە و کەڕوو بخەینە سەر برینێك یەکسەر ئەو برینە سارێژ دەبێت؟ لەوەڵامی ئەم پرسیارەمدا وتی: لەبەرئەوەی لەکتێبدا بەوشێوەیە نوسراوە و نەریتیش هەر بەوشێوەیە بووە.

لەکتێبدا ڕێ بەوە درابوو ئەو کەسەی چەقۆیەکی بەردین یان ئاسنین لەجەستەی مرۆڤدا بەکار دەهێنێت دەتوانێت سەد و هەشتا و دوو نەشتەرگەری بکات.

شێوازی هەریەك لە ١٨٢ نەشتەرگەریەکە لەو کتێبەدا باسکراوە و کاتێك لێم پرسی بۆچی ناتوانرێت ١٨٣ نەشتەری پێ بکەین، وەڵامی دامەوە لەبەرئەوەی لەو کتێبەدا بەوشێوەیە نوسراوەتەوە و نەریتیش بەو شێوەیە و دەبێت پەیڕەوی لەنەریت و ئەو شتەی لەو کتێبەدا نوسراوەتەوە بکەین.

کەسانێك هەبون کە تا دەهات لاواز دەبون و ڕوخساریان تا دەهات سپی تر دەبوو، بەڵام پزیشکەکان نەیاندەتوانی هۆکار و نەخۆشی ئەم جۆرە حاڵەتانە ئاشکرا بکەن، بەڵام لەو کتێبەدا ئەوە نوسرابوو کە ئەم جۆرە کەسانە کە بەبێ هیچ نەخۆشیەك لاواز دەبن و ڕەنگیان سپی هەڵدەگەڕێت، دەبێت گورچیلەی گیانەوەران بێ ئەوەی بیکوڵێنن بخۆن.

کاتێك پرسیارم لە پزیشکی فەرمانڕەوایی کرد کە بۆچی ئەمانە گورچیلەی کاڵی گیانەوەران دەخۆن، قەڵەو دەبن و سپیەتی ڕوخساریان لەناو دەچێت؟ دەیوت لەبەرئەوەی لەو کتێبەدا بەو شێوەیە نوسراوە یان نەریت هەمیشە بەو شێوەیە بووە.

من ئاگاداری ئەوە بووم کە پرسیارەکانی من بووەتە هۆی ئەوەی خوێندکاران و مامۆستایان بەشێوەیەکی تر تەماشام بکەن و وەك بڵێی گومانیان لەتەندروستی مێشکی من هەبێت، یان وا هەست دەکەن من کەسێکی گەمژەم و ڕونکردنەوەم لەبارەی بابەتگەلێکی ئاسایی دەوێت.

ئێمە هیچ کات لە "ماڵی ژیان"دا نەدەڕۆشتینە دەرەوە، چونکە ئەوەندە کارمان هەبوو کە نەماندەتوانی بچینە دەرەوە، سەرەڕای ئەوەش لەساڵی یەکەم و دووەمدا، دەرچون لەماڵی ژیان قەدەغە بوو و پاسەوانەکان بەهیچ شێوەیەك ڕێیان بە

خوێندکارەکان نەدەدا بڕۆنە دەرەوە، بەڵام لەساڵی سێیەمدا، ڕێیان بەخوێندکارەکان دەدا کە لەماڵی ژیان بڕۆنە دەرەوە بەمەرجێك هیچ زیانێك بەخوێندنەکەیان نەگەیەنن.

ساڵی یەکەم و دووەمم تێپەڕاند و ساڵی سێیەمیش گەشت و لەهەمان ئەم ساڵەدا بوو کە ئەو ژنە بازنەیەکی زیوی پێدام و بۆ یەکەمین جار ئەندێشەی(بۆچی؟) هات بەمێشکمدا.

لەساڵی سێیەمدا، لەنێو هەموو خوێندکارانی ماڵی ژیان، من لەڕوی دەوڵەمەندیەوە لەدوای هەموویانەوە بوم، هەرلەبەرئەوەش هەڵگرتنی لاشەکانیان خستە ئەستۆی منەوە. کاتێك سەرێکیان شەق دەکرد و ورگێکیان دەدڕی و ئەو کەسە دەمرد، منیش دەبوو لاشەی ئەوم لەماڵی ژیان ببردایەتە دەرەوە، بەڵام هیچ کەسێك بێ لەوانەی کە کارگوزاری ماڵی ژیان بون نەیان دەزانی کە من لاشەیەك دەبەمە درەوەی ماڵی ژیانەوە، چونکە لاشەکان لەدەرگای دواوەی ماڵی ژیانەوە دەردەکران و دوای دەرکردنی هەر لاشەیەك، من لەهەسێری ماڵی ژیاندا کە بەردەوام ئاوی"نیل"ی بەسەردا تێدەپەڕی خۆم دەشۆرد.

ڕۆژێکیان دوای دەرکردنی لاشەیەك، خۆم لەو هەسێرەدا شۆرد و دوبارە جلەکانم لەبەر کرد و ویستم بگەڕێمەوە ژورەوە، دەنگی ژنێك هات: هێی کورە... هێی کوڕی لاو و جوان ناوت چیە؟

منیش بینم ئەو ژنەی کە پرسیاری ناوم لێ دەکات جلێکی کەتانی ئەوەندە تەنکی لەبەردایە کە بەئاسانی دەتتوانی چاوت بەسینەی ڕوتی بکەوێت. ئاشکرابوو ئەو ژنە کەسێکی دەوڵەمەندە، چونکە زیاد لە دە بازنەی ئاڵتون و زیوی لەدەستدابوو، لێوێکی سور و چاوێکی ڕەشی هەبوو، قژیشی کە بەهۆی لێدانی جۆرێك رۆنەوە بۆنێکی زۆرخۆشی لێ دەهات، نازانم بۆچی من کە لەماڵی ژیاندا ژنگەلێکی زۆری نەخۆشم بینیبوو کاتێك ئەم ژنەم بینی شەرمەزار بووم، لەکاتێکدا ژنەکانی تر کە من چەقۆ بەردینەکەی خۆم لەسەر جەستەیان بەکار دەهێناو نەدەبونە مایەی شەرمەزاریم.

ئەو ژنە زەردەخەنەیەکی بۆ کردم و وتی: بۆچی وەڵامم نادەیتەوە؟ پرسی ناوت چیە؟

وەڵامم دایەوە: ناوم"سینۆهە"یە.

ژنەکە وتی: چ ناوێکی جوانت هەیە. تۆ کە بەم سەر تاشراویەوە ئەوەندە جوانی ئەگەر قژت ببوایە جوانتر دەبویت.

وابزانم من دوای بیستنی ئەم قسانە سور هەڵگەڕام، چونکە یەکەمینجاربوو کە ژنێك بەو شێوەیە قسەم لەگەڵدا بکات، بۆئەوەی شەرمەزاری خۆم بشارمەوە و قسەیەك بکەم وتم: ئایا تۆ نەخۆشی و هاتویت بۆ ئێرە چارەسەری خۆت بکەیت؟

ژنەکە بەدەم پێکەنینەوە وتی: بەڵێ، من نەخۆشم بەڵام نەك نەخۆشێکی ئاسایی، بەڵکو لەبەرئەوەنەخۆشم کە کەسێکم نیە لەگەڵیدا ڕابوێرم، ئەمڕۆ هاتوم بۆ ئێرە کە ببینم کامیەك لەم لاوانەی ئێرە سەرنجم بەلای خۆیاندا ڕادەکێشێ.

کاتێك ئەو ژنە ئەم قسانەی کرد، من بەجۆرێك شەرمەزار بووم کە ترسام و ویستم بڕۆم، لەم کاتەدا لێی پرسیم: "سینۆهە" بۆ کوێ دەڕۆیت؟

وتم: کارم هەیە و دەبێت بگەڕێمەوە.

ژنەیش پرسی: "سینۆهە" تۆ خەڵکی کوێیت؟

وتم: من خەڵکی ئێرەم.

ژنەکە وتی: درۆ دەکەیت، چونکە ڕەنگ و ڕوی جەستە و ڕوخساری تۆ سپیە و دەست و گوێ و لوتێکی بچوك و جوانت هەیە و کاتێك من لەدورەوە تۆم بینی، وام دەزانی کە کچیت و پۆشاکی خوێندکارانی ماڵی ژیانت لەبەرکردووە.

کاتێك گوێم لەم قسانەی بوو نازانم بۆچی دڵم کەوتە لێدان و تەپە تەپ و حاڵەتێکی نائاسایی و سەیرم لەخۆمدا هەست پێکرد.

ژنەکە وتی: "سینۆهە" ئایا تۆ هەرگیز لێوەکانی خۆت چەسپاندووە بەلێوی ژنێکی لاوەوە؟ دەزانی چەنێك چێژ بەخشە؟

وتم: نەخێر...من هەرگیز لێوەکانم بەلێوی هیچ ژنێکی لاوەوە نەچەسپاندووە.

ژنەکە وتی: ناوم "نفر"ە و لەبەرئەوەی هەمووان دەڵێن من جوانم، بۆیە بە "نفر نفر نفر"[20] بانگم دەکەن و من دوای ئەوەی خۆم کرد بەئێرەدا، جوانی تۆم پەسەند کرد و داوات لێدەکەم کە بێیت بۆ ماڵی من بۆئەوەی پێکەوە بخوێنەوە و فێرت بکەم کە بەچ شێوەیەك دەبێت لەگەڵ ژنێکی لاودا یاری بکەیت.

---

[20] وشەی "نفر" لەزمانی میسری کۆندا بە واتای "جوان و (نفر نفر نفر) کە دوبارەکردنەوەی ئەو سێ وشەی جوانە یە.

هاتەوە یادم کە باوکم وتبوی ئەگەر ژنێك پێی وتی تۆ زۆر جوانی دەبێت خۆتی لێ دووربگریت، چونکە لەسینەی ئەم جۆرە ژنانەدا ئاگرێك هەڵگیرساوە کە تۆ دەسوتێنێت و دوای ئەوە وتم: نفر نفر نفر(لەدووبارەکردنەوەی ئەم سێ ناوە زۆر چێژم وەردەگرت) لەسینەی تۆدا هیچ ئاگرێك بەدی دەکرێت کە من بسوتێنێت؟

ژنە پێکەنی و وتی: چ کەسێك پێی وتی کە ئاگرێك لەسینەی مندا هەیە کە تۆ دەسوتێنێت؟

وەڵامم دایەوە: باوکم ئەمەی پێ وتوم.

دەستی گرتم و خستیە سەر سینەی خۆی بەواتا لەسەر کراسەکەی و وتی: ئایا تۆ لێرەدا هەست بەبونی ئاگرێك دەکەیت؟! ئایا دەستت خەریکە دەسوتێت؟

وتم: نەخێر...

ژنەکە کراسە کەتانیەکەی خۆی کێشایە خوارترەوە و دوای ئەوە دەستمی خستە سەر سینەی خۆی و وتی لەوانەیە کراسەکەم بەری ئاگرەکە بگرێت... ئێستا دەستت بخەرە ئێرە و بزانە ئایا ئاگرێك لەسینەی مندا بەدی دەکەیت یان نە؟

من نەك هەستم بەئاگر نەکرد، بەڵکو کاتێك دەستم لەسەر سینەی ئەو ڕاگرتبوو، هەستم بەچێژێکی بێوێنە کرد و ژنەش کاتێك ئاگاداری ئەوە بوو، خۆڕاگری و بەرگری کردنی منی تێك و پێك شکاند و وتی: (سینۆهە) وەرە با بڕۆین، من وەك ئەو کەنیزەکەی خۆی دەخاتە بەردەستی خاوەنەکەی ئاوا خۆم دەخەمە بەردەستت.

من کە لەپێشنیاری ئەو ژنە لاوە ترسابوم وتم: (نفر نفر نفر) وازم لێ بێهێنە و دەستبەرداری من بە لەبەرئەوەی دەترسم.

ژنەکە وتی: لەچی دەترسی؟

وتم: لەتۆ دەترسم و لەوەش دەترسم کە بێم بۆماڵتان.

ژنەکە بەدەم پێکەنینەوە وتی: کوڕی فیرعەون ئارەزوی من دەکات و لاوانی دەوڵەمەندیش بازنەو ملوانکەگەلێکی ئاڵتونم پێدەبەخشن کە تەنها ڕۆژێك یان شەوێك لەگەڵ مندا بەسەرببەن‌و منیش داواکانیان ڕەت دەکەمەوە، بۆیە خوازیاری تۆم، لەبەرئەوەی تۆ جوانترین لاوی میسریت، هەتا ئێستا کوڕێکی وەك تۆ جوانم نەبینیوە.

وتم:(نفر نفر نفر) بەزەییت پێمدا بێتەوە و بەمن ڕازی مەبە بۆئەوەی منیش وەك پیاوەکانی ترم لێ نەیەت و پاکیزەیی خۆم لەدەست نەدەم، چونکە پیاوێك لەگەڵ

ژنێکدا کە خودای"ئامون" بۆی هەڵنەبژاردبێت هاوخەو بێت، پاکیزەیی خۆی لەدەست دەدات.

ژنە بەپێکەنینەوە وتی:"سینۆهە" تۆ کەسێکی زۆر سادەیت و من سەیری ئەوەم لێدێت کە ژنانی"تبس"بەچ شێوەیەك دەستبەرداری تۆ بون و وازیان لەتۆ هێناوە، چونکە مەحاڵە کوڕێکی لاوی وەك تۆ لەکۆڵانەکانی ئەم شارەدا هاتوچۆ بکات و چەند کچێك دوای نەکەون و چاودێریی نەکەن، مەگەر ئەوەیکە بەردەوام لەگەڵ دایك و باوکتدا بیت.

ئەوکات وتی: (سینۆهە) ئێستا کە ناتەوێت ببیت بۆماڵم و لەگەڵتدا ڕابوێرم، هیچ نەبێت دیاریەکم پێبدە.

دەمویست ئەو بازنە زیویەی کە ژنە سکپڕەکە پێی دابوم بەو ببەخشم، ئەویش وتی: ئەم بازنەیە شایستەی من نیە و تۆ دەبێت دیاریەکم پێ بدەیت کە شایستەی من بێت.

وتم: من لاوێکی هەژارم و دایك و باوکیشم خێزانێکی هەژارن، لەبەرئەوە ناتوانم دیاری گرانبەهات پێشکەش بکەم.

ژنەکە وتی: لەمحاڵەتەدا تۆ دیاریەك لەمن وەرگرە. پاشان ئەنگوستیلەیەکی لەپەنجەی خۆی دەرهێنا کە نگینێکی سەوزی بەسەروە بوو، پێشکەشی کردم.

دەمویست خۆم لەوەرگرتنی ئەو ئەنگوستیلەیە بپارێزم، بەڵام وتی: من ژنێکی دەوڵەمەندم و پێدانی ئەم ئەنگوستیلەیە، هیچ کارێك لەمن ناکات، بەڵام دەبێتە هۆی ئەوەی تۆ من فەرامۆش نەکەیت و لەوانەیە ڕۆژێك بێت ئەم شەرمەزاریەت وەلاوە بنێیت و بێیت بۆ لام، لەو ڕۆژەدا دەتوانیت لەبەرامبەر ئەو ئەنگوستیلەیەدا دیاریگەلێکی گرانبەهام پێشکەش بکەیت.

ئەنگوستیلەکەم لێ وەرگرت، دوای ئەوە ژنی لاو بەزەردەخەنەوە بەجێی هشتم و من لەوکاتەدا هەستم بەوەکرد دوای چونە دەرەوەی سواری کەژاوەکەی خۆی دەبێت و دەگەڕێتەوە بۆماڵی خۆی.

## بەشی پێنجەم

# ئامۆژگاری هونەرمەندی پەیکەرتاش

(پاتور) پزیشکی فەرمانڕەوایان کە ناونیشانی سەرەکی پیشەکەی"کونتێکرنی سەر" بوو ئەو ڕۆژەی هات بۆ ماڵمان و نانەکەی خوارد، لەبەردەم باوکمدا پێی وتبوم کە لەماڵی ژیاندا دەبێت گوێڕایەڵبم و هەرگیز ڕەخنە لەهیچ شتێك نەگرم و هەرچیم پێ دەڵێن پەسەندی بکەم، بەڵام من نەمدەتوانی هەستی گەڕانم بەدوای ڕاستیدا هێور بکەمەوە ،بۆیە دەموت"بۆچی".

پزیشکی دەستەڵاتداران کە مامۆستایانی ماڵی ژیان بوون لەگەڵ خوێندکارانی هەمان ئەو قوتابخانەیەدا لەم "کونجکاو"[21]یەی من زۆر بێزار بون و من لەساڵی سێیەمی خوێندنمدا لەماڵی ژیاندا تێگەشتم کە "پاتور" بۆچی وتبوی نابێت ڕەخنە بگرم و هەرچیم پێ دەڵێن بێ هیچ ئەملاولایەك پەسەندی بکەم. بەڵام پێشتر وتم: دڵنایی وەك تێزاب دڵی مرۆڤ دەخوات و پیاوی دانا ناتوانێت وەك خەڵکانی تر، نەزان بێت و خۆی وەك کەسێکی گەمژە بنوێنێ. کەسێك کە هەر لەبنەچەوە گەمژە بێت، لەنەزانی خۆی ئازار ناچێژێت، بەڵام ئەوکەسەی کە ڕاستیەکی بەدەست هێناوە ناتوانێت وەك کەسە گەمژەکان خۆی پیشان بدات.

---

[21] خوێنەری بەڕێز "کونجکاو" لەزمانی فارسیدا بەواتای ئەوە دێت کە کەسێك هەمیشە بەگومان بێت لەهەموو شتێك و نیمەوێت بەڕاستیەکانی بەو شتە بگات ئەویش بەردەوام بەپرسیارکردن و گەڕان بەدوایدا هەوڵی بەدەست هێنانی دەدات، بەڵام نەبەرئەوەی دەقاودەق زاراوەیەکی ئاوامان لەزمانی کوردیدا نیە بۆیە بەپێویستم زانی هەمان زاراوەی فارسی بەکار بهێنمەوە و مەکەلێنیشی نازانم، چونکە ئەگەر ئێمە بگەڕێینەوە بۆ ڕەچەڵەکی زمانی فارسی بێ لەکاریگەری زمانەکانی دەوروبەر دەبینین زمانی ڕەچەڵەکی فارسی "پەهلەویە" کەزمانی "ماد"ەکانی باوباپیرانی ئێمەیە و دەتوانم بڵێم گەر ئەم دوو نەتەوە لایەنی سیاسیەکانی لێ دابڕین دەبینین دوو نەتەوەی تەواوکەری یەکترن یان باشتر بڵێم هەردووکیان نەتەوەیەك بون، بەڵام بەرژەوەندی سیاسی بەپێی تێپەڕ بونی کات وای خواستووە کە ئێمە دوو نەتەوەی جیاوازمان لێ دەربچێت............وەرگێڕ.

کاتێك من دەمبینی ئەو پزیشکانەی ناوبانگیان لەجیهاندا بڵاوبووبوویەوە و نەخۆشەکان لە"بابل و نەینەوا"وە بۆ چارەسەر کردن دێن بۆ لایان، ئەوەندە هەستیان نیە لەوە تێبگەن بۆچی فلأن دەرمان دەدەن بەو نەخۆشە، لەبەرامبەر ئەمەشدا تەنها دەڵێن لەبەرئەوەی لەکتێبدا نوسراوە، منیش نەمدەتوانی خۆپارێز و بێدەنگ بم.

دەرئەنجامی کونجکاوی و ڕەخنەکانی من بونە هۆی ئەوەی ڕێ لە بەرزبونەوەم بگرێت و نەیانهێڵا بچمە دوایین قۆناخەکانی خوێندنم.

ئەو خوێندکارانەی هاوپۆلی من بون پێش من کەوتن و چەند قۆناخێك کەوتنە پێشمەوە، بەڵام من لەساڵی سێیەمی ماڵی ژیاندا بەجێ مام، لەکاتێکدا دەمتوانی بڵێم هیچ کام لەو خوێندکارانەی کە لەگەڵ مندا دەیانخوێند، ئامادەکاری منیان بۆ خوێندن نەبوو و هیچ یەك لەمانە وەك من ئاشقی بواری پزیشکی نەبون.

خۆشبەختانە لەتەواوی ئەو ماوەیەی کە من بەبڕیاری پزیشکی فەرمانڕەوایان دواخرابوم، ناوی "ئامون"م نەدەهێنایە سەرزمان و تەنها لەوانی ترم دەپرسی بۆچی؟

چونکە ئەگەر ناوی"ئامون"م بهێنایە و بموتایە"ئامون"شارەزای ئەو بوارە نەبووەو ئەوانی تری بەهەڵەدا بردووە، بەدڵنیاییەوە منیان لە "ماڵی ژیان"دا دەردەکردو ئیتر نەمدەتوانی لە "تبس"دا بخوێنم، لەمکاتەدا ناچار دەبوم بڕۆم بۆ"سوریا"یان" بابل"و تا ئەو کاتەی دەمرم لەژێر دەستی یەکێك لەپزیشکەکانی ئەوێ سەرقاڵی کارکردن بم.

بەڵام پزیشکی فەرمانڕەوایان هیچ بیانویەکیان بۆ دەرکردنی من لەقوتابخانەدا بەدەستەوە نەبوو، لەبەرئەوە تەنها بەوە خۆیان ڕازی دەکرد کە ڕێ لەقۆناخەکانی تری خوێندنم بگرن و نەهێڵن پێش بکەوم.

دوای ئەوەی چەندساڵێك لەنیشتەجێبونم لەماڵی ژیاندا تێپەڕی، ڕۆژێکیان پۆشاکی قوتابخانەم داکەند و خۆم شۆرد و بەپۆشاکی ئاساییەوە لەقوتابخانە چومە دەرەوە بۆئەوەی بڕۆم بۆ لای دایك و باوکم.

کاتێك بەشەقامەکانی"تبس"دا تێدەپەڕیم بینیم گۆڕانکاری بەسەر بارودۆخی شاردا هاتووە و ژمارەیەکی زۆر لە دانیشتوانی سوریا و ڕەش پێستەکان بەجل و بەرگێکی بەنرخ و گرانبەها لەشاردا پیاسە دەکەن، لەکاتێکدا لەڕابردوودا ژمارەی ئەم کەسانە زۆر نەبوو.

چیتر لەهەموو لایەکەوە دەنگی موزیکی سریانی(موزیکی وڵاتی سوریا) دەبیستراو ئەم دەنگە لەماڵە سۆزانیەکانەوە دەهاتە دەرەوە.

سەرەڕای ئەوەی لەشاردا هێمای دەوڵەمەندی و پەیوەندی و تێکەڵاوبونی خەڵکی زۆر بوو، بەڵام خەڵکی نیگەرانبوون، وەك ئەوەی هەموویان چاوەڕێی بەدبەختیەك بکەن و نەتوانن سود لەساتی هەنوکە وەرگرن و خۆشحاڵ بن.

منیش وەك خەڵکی نیگەران و خەمگین بوم، چونکە تێدەگەشتم کە تەمەن لەماڵی ژیاندا بەفیڕۆ دەڕوات و ناهێڵن لەخوێندنەکەمدا پێش بکەوم.

کاتێك گەشتمە ماڵەوە بەبینینی دایك و باوکم زۆر بەداخ بوم، چونکە هەردوکیان پیر ببون.

باوکم بەڕادەیەك پیر ببوو کە بۆ بینینی هەر دێڕێك بەشێوەیەك پاپیرۆسەکەی لەچاوی نزیك دەکردەوە کە خەریکبوو بەلوتیەوە بلکێت، دایکیشم تەنها باسی مردنی خۆی دەکرد و زانیم کە ئەوو باوکم سەرەڕای خۆپاراستنیان لەوێڵخەرجی، گۆڕێکیان لەدەوروبەری خورئاوای "نیل"، لەپاڵ گۆڕستانی کاهینەکان، کە زەویەکانیان بەنرخێکی گران دەفرۆشن کڕیوە و دایك و باوکم منیان لەگەڵ خۆیاندا برد بۆئەوەی گۆڕی دایکم کە دەبێت باوکیشمی تێدا بنێژرێت پێم نیشان بدەن و بینیم کە ئەو گۆڕە بەخشت دروست کراوە و بۆ خۆی ماڵێکی بچوکە کەدیوارەکانی هەڵگری شێوەو وشەگەلێکی ئاساییە.

دایك و باوکم لەسەرەتای ژیانی هاوسەریانەوە ئارەزوی ئەوەیان کردووە گۆڕێکیان لە بەرد هەبێت، بۆئەوەی لەئایندەدا باران و خۆر و لافاو و زریانە نائاساییەکانی ڕوباری"نیل" گۆڕەکەیان وێران نەکات، بەڵام بەئارەزوی خۆیان نەگەشتن و ناچار بون گۆڕێك لەخشت دروست بکەن.

لەو شوێنەی گۆڕی دایك و باوکمی تێدا دروست کرابوو، گۆڕی فیرعەونەکانی میسر کە شێوەیەکی قوچەکیان"هەرەمی"هەبوو لەدورەوە دەبینران و هەرجارێك کە دایك و باوکم چاویان بەو شێوە قوچەکیانە دەکەوت ئاهێکیان هەڵدەکێشا، چونکە نەیانزانی قوچەکیەکان بەهیچ شێوەیەك وێران نابن و ناڕوخێن ، خۆر و لافاو و زریانە نائاساییەکانی ڕوباری"نیل"هیچ گرفتێك لەسوچەکانیان دروست ناکات.

من کتێبی مردووەکانم بێ هیچ هەڵەیەك بۆ دایك و باوکم نوسیبویەوە، بۆئەوەی کاتێك مردن، ئەو کتێبە لەگەڵ خۆیاندا بنێنە گۆڕەوە، دایك و باوکم لەجیهانێکی تردا بەهۆی هەڵەی کتێبی مردووەکانەوە، ون نەبن.

دوای ئەوەی دەستمان لەتەماشاکردنی گۆڕەکە هەڵگرت، گەڕاینەوەی بۆماڵ و دایکم نانی پێدام و باوکیشم پرسیاری خوێندنەکەی لێکردم و وتی: کوڕم، بەچ شێوەیەك بیرت لەمەرگی خۆت کردۆتەوە؟.

وتم: باوکە، من هێشتا هیچ دەرامەتێکم نیە کە بتوانم بیر لەمەرگ بکەمەوە و هەرئەوەی بوم بەخاوەنی دەرامەتێك ئەوکات بیر لەجیهانەکەی تر دەکەمەوە.

لەکاتی ئاوا بونی خۆردا لەدایك و باوکم جیابومەوە و پێم وتن: دەگەڕێمەوە بۆ ماڵی ژیان، بەڵام دوای ئەوەی لەماڵ هاتمە دەرەوە ڕۆشتم بۆ قوتابخانەی هونەرە جوانەکان کە لەپەرستگایەکدا بوو، چونکە دەمزانی یەکێك لەهاوڕێ کۆنەکانم لەوێیە.

ئەو کوڕە لاوێك بوو کە بە"توتمس"بەناوبانگ بوو و ئامادەکاریەکی زۆری بۆ هونەرە جوانەکان تێدابوو، ماوەیەك بوو یەکتریمان نەبینیوە.

کاتێك ڕۆشتمە ناو قوتابخانەی هونەرە جوانەکانەوە بینیم خوێندکارەکان بەڕێبەری مامۆستاکەیان سەرقاڵی کارکردنن و هەرئەوەی ناوی"توتمس"یان بەرگوێ کەوت لەنەفرەتدا تفێکیان کردە سەر زەوی و یەکێکیان وتی: ئەویان لەم قوتابخانەیە دەرکردووە.

ئەویتریان وتی:ئەگەر دەتەوێت بەدوایدا بگەڕێیت بڕۆ بۆ شوێنێك کە لەوێدا جنێو بەخوداکان دەدەن، چونکە"توتمس"جنێو بەخوداکان دەدات.

سێیەمیان وتی: هەرشوێنێك شەڕ و دەمەقرەی تێدا بێت "توتمس" لەوێیە و دوای هەز دەمەقرەیەکیش بریندار دەبێت.

بەڵام دوای ئەوەی مامۆستاکە ڕۆشتە دەرەوە و خوێندکارەکان زانیان ئەو لەوێدا نەماوە پێیان وتم: تۆ ئەو لەو مەیخانەیەی کە بە"گۆزەی سوری"بەناوبانگە دەدۆزیتەوەو ئەم فرۆشگایەش دەکەوێتە کۆتایی ناوچەی هەژار نشینەکانو سەرەتای ناوچەی دەوڵەمەندەکانەوە، هونەرمەندە هەژارەکانو کەسانێك کە لە قوتابخانەی هونەرە جوانەکاندا دەرکراون شەوانە لەو مەیخانەیەدا کۆ دەبنەوە و بنکەیان لەوێیە.

من بێ هیچ گرفتێك ئەو فرۆشگایەم دۆزیەوە و بینیم"توتمس"بەجلێکی کۆنەوە لەگۆشەیەکی فرۆشگاکەدا دانیشتووە و وا دەردەکەوت کە بەم تازەکییە شەڕێکی کردبێت، چونکە هەڵئاوسانێك بەناوچاویەوە دەبینرا.

وتم: دڵم لێوانلێوی خەمە و پێویستم بەهاوڕێیەکە کە بتوانم لەگەڵیدا بخۆمەوە، چونکە باوکم وتبوی بڕێك خواردنەوە بۆ لەناوبردنی خەم و خۆشحاڵکردنی خود زۆر باشە، لەبەرئەوەش خەمگینم کە هیچ کەسێك ناتوانێت وەڵامی"بۆچی"ەکانم بداتەوە، بەڵام هەمان ئەو کەسانەی کە توانای وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەیان نیە، بەچاوی شێتەوە تەماشای من دەکەن.

"توتمس" دەستەکانی خۆی پێنیشان دام، بۆئەوەی تێمگەیەنێت قرانێکی بۆ کڕینی خواردنەوە پێ نیە.

بەڵام من ئەو دوو بازنە زیوەی کە لەدەستمدا بوو پێم نیشان دا و یەکێك لەوانە ئەو ئەنگوستیلە بوو کە ژنەکە پێی دابوم و دوای ئەوە فرۆشیارەکەم بانگکرد و ئەویش لێمان نزیك بویەوە و هەردوو دەستی خستە سەر ئەژنۆی و سەری دانەواند و منیش لێم پرسی : چ جۆرە خواردنەوەیەکت لایە؟

ئەویش وتی: لێرەدا هەموو جۆرە خواردنەوەیەك دەست دەکەوێت، من ئەو خواردنەوەیەی داوای دەکەیت لەپێکە ڕەنگاوڕەنگەکاندا پێشکەشتی دەکەم، بۆئەوەی لەکاتی تەماشاکردنی پێکە ڕەنگاوڕەنگەکاندا دڵت خۆشحاڵتربێت.

"توتمس"داوای کرد خواردنەوەی ئاوێتە بەعەتری نەرگزمان بۆ بهێنێت و شاگردێك هات و ئاوی بەسەر دەستماندا ڕشت و دوای ئەوە لەقاپێکدا ناوکە شوتی لەسەر مێزەکە بۆ دانایین، دوای ئەوەش خواردنەوەی بۆ هێنایین، منیش بینیم کە ئەو پێکانەی خواردنەوەکەی تێدابوو، ناسك و ڕەنگاوڕەنگ بوون.

"توتمس"خواردنەوەکەی بەیادی قوتابخانەی هونەرەجوانەکان و بۆئەوەی مامۆستاکانی دوچاری خودای قوتدەر بین خواردەوە، منیش بەیادی ئەوەیکە تەواوی کاهینەکانی"ئامون" گرفتاری هەمان خودا بین خواردمەوە، بەڵام لەسەر خۆ ئەوقسەیەم کردو"توتمس" وتی: مەترسە، تەواوی کڕیارانی ئەم مەیخانەیە، وەك من و تۆ هەڵگری بیرێکی ئازادن.

دوای خواردنەوەی دووپێك، تیشکی ئەو خواردنەوەیە دڵمانی ڕوناك کردەوە و وتم: لە ماڵی ژیاندا من لە کۆیلە ڕەشپێستەکان نغرۆترم و بەشێوەیەك ڕەفتارم لەگەڵدا دەکەن کە وەك بڵێی کەسێکی تاوانبار بم.

"توتمس" پرسی: بۆچی بەوشێوەیە ڕەفتارت لەگەڵدا دەکەن؟

وتم: لەبەرئەوەی من دەڵێم "بۆچی؟".

توتمس وتی: تۆ شایستەی مەزنترین سزایت، چونکە کاتێك دەڵێیت"بۆچی"، هێرش بۆ ئاین و بیروباوەڕ و دەستەڵاتی کەسانێك دەکەیت کە فەرمانڕەوایی میسر دەکەن...و ئەوانیش کە دەزانن پرسیاری تۆ پایەی دەستەڵات و سەروەت و خۆشبەختی ئەوان دەهێنێتە لەرزە ناچارن تۆ لەخۆیان دور بخەنەوە، منیش سەرم لەوە سوڕدەمێنێ، بەچ شێوەیەك تائێستا تۆیان لەماڵی ژیان دەرنەکردووە و تۆیان دوچاری چارەنوسی من نەکردووە کە لە قوتابخانەی هونەرە جوانەکان دەریان کردم؟

ئەوانەی کە تۆ دەیبینی گەرچی لەڕوی ڕواڵەت و ڕەنگ و پێستی جەستە و بگرە بیروباوەڕی ئاینیانەوە جیاوازیان لەگەڵ یەکتردا هەیە، بەڵام لەڕویەکی ترەوە هەموویان لەگەڵ یەکدا هاوڕان، ئەویش ئەوەیە کە ئەم خەیاڵپڵاوی و بیروباوەڕە پڕوپوچە و ئەم شێواز و سیستەمە وەك خۆی بپارێزن، چونکە ئەم شێوازە لەبەرژەوەندی ئەوان و کوڕەکانیاندا دەبێت، ئەوان لەڕێی ئەم شێواز و سیستەمەوە فەرمانڕەوایی دەکەن و دەستەڵاتیان هەیە و سەروەت و سامانیان لەڕادە بەدەرە. بەڵام کاتێك تۆ دەڵێیت"بۆچی"دەتەوێت بنەمای ئەم سیستەم و ڕێکخراوە وێران بکەین و نادانی ئەوان بسەلمێنی، ئەوانیش ئەگەر لەگەڵ یەکتریشدا ناکۆك بن، بەناچاری لە دژت دەست لەناو دەست دەنێن بۆئەوەی لەناوت ببەن، چونکە هەڕەشەی تۆ، بۆ ئەوان، زۆر لەو ناکۆکیانەی کە لەگەڵ یەکتردا هەیانە ترسناکترە، تا "میسر هەیە و قوچەکەکان"ئەهرام" لێرەدا بونیان هەبێت، ئەمانە ئامادەن سەدان کەسی وەك تۆ بکەنە قوربانی، لەبەرئەوەی ئەم سیستەم و ڕێکخراوە پارێزەری تواناو سەروەت و سامانی ئەوانە، هەربۆیە بەهەموو باوەڕێکی پوچیانەوە پارێزگاری لێدەکەن و هەرکەسێکیش سەرپێچی بکات، ئەوا بەناوی"ئامون"یان بەناوی"فیرعەون"لەناوی دەبەن.

دوای ئەوە"توتمس" وتی: کاتێك من چومە ناو قوتابخانەی هونەرە جوانەکانەوە ئەوەندە خۆشحاڵ بوم کە وەك بڵێی دوای مەرگم لەناو قوچەکیەکاندا"ئەهرام" دەمنێژن. کاتێك لەسەر تەختە ڕەشەکان دەستم بەوێنە کێشان کرد و ئەوکاتەی قوڕی خۆشەکراوم بۆ دروستکردنی پەیکەر بەکارهێنا و سەرەتا مۆمم بەسەر قاڵبی هەر پەیکەرێکدا دەڕێژا، بۆئەوەی لەسەر ئەو قاڵبانە پەیکەرێکی بەردینیان لێ دروست بکەم، وەك تینویەك بوم کە بەئاو گەشابێتەوە و هەموو کارێکی خۆم بەتامەزرۆییەکی زۆرەوە ئەنجام دەدا، تا ئەوەبوو ڕۆژێکیان ئەوەم بەبیردا هات کە بەپێی خواست و ئارەزوی خۆم پەیکەرێك دروست بکەم و وێنەیەك بکێشم. بەڵام لەو ڕۆژەدا هەموو مامۆستایانی قوتابخانەی هونەرە جوانەکان دەنگی ناڕەزاییان بەرزکردەوە و وتیان: ئەو پەیکەرەی تۆ دەتەوێت دروستی بکەیت لەگەڵ یاساکاندا ناگونجێت، چونکە هەر بەوشێوەیە هەریەك لەم پیتانە، هەڵگری شێوەیەکی تایبەت بەخۆیەتی و بێ لەو شێوانە، ناتوانیت هیچ شێوەیەکی تر بنوسیت، لەبەرئەوەی هەریەك لەشێوە و پەیکەرەکان لەهونەرە جوانەکانیشدا هەڵگری شێوەیەکی تایبەتن و ناتوانین لێیان لا بدەین و شێوەیەکی تریان لێ دروست بکەین و ڕەنگێکی تازەیان تێدا بەکار بهێنین.

لەسەرتای پەیدابونی هونەرە جوانەکاندا، شێوازی دانیشتنی پیاوێك کە لەسەر زەوی ڕاوەستاوە دەستنیشانکراوەو دەبێت هەربەو شێوەی کە باوباپیرانمان کێشاویانە، دوبارە بیانکێشینەوە و لەسەرتای دروستبونەوە، هونەرمەندان، شێوازی بەرزکردنەوەی پێی ولاخێك لەکاتێکدا ڕێدەکات لەشێوازی وێنەکێشاندا دیاری کردووە و ئەگەر ئێمە بەپێچەوانەی ئەوانەوە وێنەیان بکێشین ئەوا لەمحاڵەتەدا دوچاری کوفر دەبین و ناتوانن ئێمە بە هونەرمەندێك لەقەڵەم بدەن، گەر هەموو کەسێك بەپێی یاسا و نەریتەکان، وێنەکێشی و پەیکەرتاشی بکات، ئەوا ئێمەش ئەو کەسە لەقوتابخانە کەماندا وەریدەگرین و بۆنی"پاپیرۆس"و قوڕی خۆشەکراو و قەڵەم و کەرەستەی بەردینی پێدەدەین، هەرکەسێك نەیەوێت بەپێی یاسا و نەریتە کۆنەکان ڕەفتار بکات، ئەوا لەقوتابخانەی هونەرە جوانەکان دەری دەکەین.

ئەی"سینۆهە"منیش وەك تۆم و لە قوتابخانەدا بەمامۆستاکانی خۆمم وتووە، بۆچی دەبێت وا بێت و بۆچی دەبێت وا نەبێت؟ بۆچی سینەی پەیکەرێك لەهەموو کاتێکدا دەبێت ڕەنگی شین بێتو بۆچی چاوەکانی بەڕەنگی سور دەکەن؟ ئایا باشتر

نیە کە ئێمە چاوی پەیکەرێك ڕەش بکەین و جلەکەشی بەڕەنگی ئەو قوماشانەی کە لەبەریدایەتی بکێشین؟

بەڵام کاهینەکان کە لەهەمووشوێنێکدا مامۆستان، منیان لەقوتابخانە دەرکردو هەر لەبەرئەوەش تۆ لەئێستادا من لەم فرۆشگایەدا بەم هەڵئاوسانی نێوچاوانمەوە دەبینی؟ بەڵام ئەی "سینۆهە" سەرەڕای ئەوەی کاهینەکان لەم پەرستگاو قوتابخانانەی کەلەم پەرستگایەدا دروستکراون بەهەردوو دەستیان چەسپاون بەنەریت و یاسا و دروشمەکانی خۆیانەوەو هەوڵی ئەوە دەدەن کە هەر بیرێکی تازە لەڕەحمی دایکدا خەفە بکەن و نەهێڵن هیچ کەسێك هەنگاوێك بەرەو گۆڕان بنێت، من زۆر جوان هەست بەوە دەکەم کە جیهان بەشێوەیەکی سەیر لەگۆڕاندایە.

ئەم خەڵکەی کە ئێستا لە شەقامەکانی "تبس"دا هەنگاو دەنێن، سەرەڕای ئەوەی هێشتا باوەڕیان بە"ئامون"و تەواوی خوداکانی میسرە، بەڵام لێیان ناترسن و گوێنادەنە شێوازی پۆشاك لەبەرکردن، ئەم گوێنەدانەش گەشتووەتە ڕادەی بێشەرمی، چونکە خەڵکی بەبێشەرمیەکەوە سینەو ورگی خۆیان لەژێر پارچە ڕەنگاوڕەنگەکاندا دادەپۆشن، لەکاتێکدا خوداکان مرۆڤەکانیان بەڕوتی دروستکردووە، بۆئەوەی مرۆڤ بەردەوام ڕوت بێت و هیچ کاتێکیش جەستەیان دانەپۆشن، بگرە ژنانیش وەك پیاوان بێشەرمن، ئەوانیش پۆشاکگەلێك لەبەر دەکەن کە سینە و ورگی خۆیان پێ دادەپۆشن[22].

هەرکاتێك بیر لەم بابەتانە دەکەمەوە، واهەست دەکەم کە ئێمە لەدوایین چەرخدا دەژین و بەم زوانە کۆتایی بەجیهان دێت.

ئەگەر پەنجاساڵ پێش ئێستا ژنێك یان پیاوێك پۆشاکێکی لەبەربکردایە کە سینەی داپۆشیایە، بەسزای سوکایەتی کردنی خوداکان بەردبارانیان دەکرد و ئێستا هەمان ئەم ژن و پیاوانە بەئازادی لەشەقامەکانی "تبس"دا هاتوچۆ دەکەن.

---

[22] خوێنەر دەبێت ئاگاداری ئەوە بێت ئەوەی لەم کتێبەدا نوسراوەتەوە ڕاستی مێژوییە و لەمیسری کۆندا جلی خەڵکی بەشێوەیەك بووە کە سینە و ورگی دانەدەپۆشی.

نۆۆه! جیهان چەنێك کۆن بووە و خۆزگەم بەو کەسانەی کە دوو هەزارساڵ پێش ئەم قوچەکە مەزنانە و هەزار ساڵ پێش دروستکردنی قوچەکە بچوکەکان ڕۆشتون و بەزیندویی نەماون کە ئەم هەلومەرجەی ئێستا بەچاوی خۆیان ببینن.

پێکی خواردنەوەکان سەرەڕای ئەوەی دڵمانی خۆش دەکرد، ڕۆحیشمانی بەشێوەیەك سوك کردووە کە وەك بڵێی پەڕەسێلکەبین و لەوەرزی پایزدا دەستمان بەسەماکردن کردبێت[٢٣].

(توتمس)وتی: باشتروایە هەستین و بڕۆین بۆ ماڵێك کە بەزم و ڕابواردنی تێدا بێت و تەماشای سەما بکەین، بۆئەوەی ئەمشەو بیر لە"بۆچی"نەکەینەوە.

منیش فرۆشیارەکەم بانگ کرد و ئەویش هات و هەردوو دەستی لەسەر ئەژنۆی دانا و سەری دانەواند و منیش یەکێك لەودوو ئەنگوستیلە زیویەم پێدا، بۆئەوەی بەهای خواردنەوە و ناوکە شوتیەکەی لێ دەربکات، فرۆشیارەکەش دوای داشکاندنی بەهای خواردنەوە و ناوکە شوتیەکە، چەند ئەنگوستیلەیەکی مسینی وەك باقی پێداینەوە، منیش یەکێك لەئەنگوستیلە مسیەکانم دا بەو شاگردەی کە شەرابی بۆ هێناین و ئاوی بەدەستماندا ڕشت.

کاتێك ویستمان لەو فرۆشگایە بێینە دەرەوە، مەیفرۆشەکە لێم نزیك بویەوە و سەری بۆ دانەواندم و وتی: ئەگەر حەز دەکەیت لەگەڵ کچانی سریانیدا ڕابوێری من هەندێکیان دەناسم و ئامادەم کە ڕێنماییت بکەم و ماڵی ئەم کچانەت پێنیشان بدەم، مەرجی چونە ناو ئەو جۆرە ماڵانەش ئەوەیە کە تۆ گۆزەیەك خواردنەوەم لێ بکڕیت و بڕۆیت بۆ ماڵی ئەوان، ئەوانیش هەرکەخواردنەوەکەیان بەدەستتەوە بینی یەکسەر ڕێی چونە ژورەوەت پێدەدەن.

"توتمس" وتی: من ڕقم لەکچانی سریانیە کەزۆربەیان تەمەنی دایکیمان هەیە، واهەستدەکەم ئەوان ئەو کەسانە بن کە کاتێك باوکم لاوبوو لەگەڵیاندا ڕایبواردووە.

فرۆشیارەکەش وتی: من ماڵی کچانێکتان پێنیشان دەدەم کاتێك چاوتان بەڕوخسیاریان بکەوێت دڵتان لێوانلێوی خۆشی ببێت و ئەوانیش بەخۆشحاڵیەوە ئامادەن ببنە "خوشك"ی ئێوە.

---

[23] لەبەرئەوەی لەمیسردا لەوەرزی پایزدا بەرزدەبێتەوە، پەڕەسێلکەکانیش لە پایزدا دەردەکەوتن.

بەڵام"توتمس" پەسەندی نەکردو منی لەو فرۆشگایەبردە دەرەوە و لەشەقامەکانی شاردا دەستمان کرد بەڕێ کردن.

شاری"تبس" شەو و ڕۆژی بۆنیە، شەویش وەك ڕۆژ لەشەقام و کۆڵانەکانی شاردا سەرقاڵی هاتوچۆن.

دەوڵەمەندە خۆشبەختەکانیش بەسەر کەژاوەکەیانەوە، لەشەقامەکانەوە تێدەپەڕین، لەبەرامبەر ماڵە سۆزانیەکانداو لەسەر چوار ڕێیانەکاندا مەشخەڵ داگیرسابوو.

لەهەندێك ماڵی ئەو ناچەیە دەنگی موزیکی سریانی"موزیکی سوری"دەبیسترا و لەهەندێکیشیان دەنگی تەپڵی ڕەشپێستەکان، ئێمە بەهۆی دەنگی تەپڵەکانەوە دەمانزانی کە ئەو ماڵە ڕەشپێستن و "توتمس" لەوباوەڕەدابوو کە هەندێك لەژنە ڕەش پێستەکان جوانن و گەر مرۆڤ ئەوانە بەناونیشانی خوشکی خۆی هەڵبژێرێت دەبێتە کەسێکی بەختەوەر[٢٤]

من زۆر جار شەوانە، لەگەڵ باوکمدا، بۆئەوەی سەردانی ماڵە نەخۆشەکان بکەین لەشەقامەکانی"تبس"ەوە تێپەڕدەبووم، بەڵام تا ئەو شەوەش نەمدەزانی بارودۆخی ناوماڵی سۆزانییەکان بەچ شێوەیەکە.

"توتمس" منی بردە ناو ماڵێکی بچوکەوە کە بەناوی ماڵی"پشیلە تریٚ" بانگ دەکرا و لەوێدا قاڵی نەرم لەسەر زەویەکەی ڕاخرابوو، لەسەری چراکانیشەوە کڵاوەیەکی زەردیان دانابوو. ژنە لاوەکانی ئەو ماڵە، لەژێر ڕوناکی زەردی چراکاندا جوانتر دەردەکەوتن، بینیم هەندێك لەمانە سەرقاڵی ژەنینی شمشاڵ و هەندێکی تریشیان سەرگەرمی ژەنینی عودن. یەکێك لەکچەکان کاتێك چاوی بەمن کەوت شمشاڵەکەی لەسەر زەوی دانا و هەستا و هات بۆلام و دەستی خستە سەر دەستمو کچێکی تر لە"توتمس"نزیك بویەوە و دەستی خستە سەر دەستی ئەو. ئەو کچەی دەستی خستبووە سەر دەستی من، دەستی بەرز کردمەوە و تەماشایەکی کرد، دوای ئەوە تەماشای سەرە تاشراوەکەمی کرد و پرسی: ئایا تۆ لەقوتابخانەی پزیشیدا

---

[24] چوار هەزار ساڵ لەوەو پێش، لەوڵاتی میسردا، ئاسایی بوو کە کوڕێك خوشکێکی خۆی وەك هاوسەر هەڵبژێرێت و هەر لەبەرئەوەش، پیاوان هاوسەرەکانی خۆیان بەخوشك بانگ دەکەن.

دەخوێنی یان لەقوتابخانەی مافناسی یان لەقوتابخانەی بازرگانی و ئەستێرە ناسیدا؟ بەڵام لەبەرئەوەی دەستی"توتمس" لەدەستی من زبرتربوو بەوی وت کە ئەو خوێندکاری هونەرە جوانەکانە، چونکە دەستی ئەوانەی کاری بەرد و پەیکەرتاشی دەکەن لەدەستی پزیشکان و خوێندکارانی بەشەکانی تر زبرترە. پاشان لەبەرئەوەی زیادەڕۆییم لەخواردنەوەدا کرد، دەقاودەق لەبیرم نیە چی ڕویدا، بەشێوەیەکی نادیار واهەست دەکەم لەوماڵەدا لەنێوانی من و ڕەش پێستێك تێکچونێك دروست بووبێت، کاتێك بەئاگا هاتمەوە خۆم لەپاڵ ئەو ماڵە لەناو جۆگە ئاوێکدا بینیەوە و بینیم کە ئەنگوستیلە زیوین و ئەنگوستیلە مسیەکانم دیار نین، لەوکاتەدا گوتەی باوکمم هاتەوەیاد کەدەیوت کاتێك مرۆڤ بخواتەوە، دەرئەنجامەکەی ئەوە دەبێت کە کاتێك چاوی دەکاتەوە خۆی لەناو جۆگە ئاوێکدا دەبینێتەوە، "توتمس"یش منی بردە کەنار ڕوباری"نیل"ەوە بۆئەوەی لەوێدا دەست و ڕوخساری قوڕاویم بشۆرم.

کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵی ژیان، ڕۆژ بوبویەوە، سەرەڕای ئەوەی بەهۆی زیادەڕۆیم لەخواردنەوەدا بارودۆخم باش نەبوو، خۆم گەیاندە بەشی نەخۆشی گوێ، چونکە لەو ڕۆژەدا دەبوو لەو بەشەدا ئەرکە پزیشکیەکانم ئەنجام بدایە.

لەڕێڕەوەکەدا مامۆستاکەم، کە پزیشکی فەرمانڕەوایان بوو و پسپۆڕی نەخۆشی گوێ بوو، کاتێك منی بینی و تەماشایەکی جلە دڕاوەکانمی کرد سەرم داخست، وتی: "سینۆهە" ئایا تۆ دوێنێ شەو لەماڵی سۆزانیەکاندا بوی؟ منیش سەرم دانەواند.

مامۆستاکەش وتی: بهێڵە با چاوم بەچاوانت بکەوێت، منیش چاوەکانم پێنیشان دا، دوای ئەوە تەماشای زمانمی کرد و لێدانی دڵی گرتم و وتی: تۆ دوێنێ شەو زۆرت خواردووەتەوە و بۆ خوێندکارێکی ماڵی ژیان زیادەڕۆیی لەخواردنەوەدا زۆر خراپە، چونکە توانای کارکردنی ناهێڵێت.

تۆش ئەگەر خۆت چارەسەر نەکەیت، تاسبەی بەیانیەکەی تەمەڵ دەبیت و ناتوانیت پڕبەدڵ کار بکەیت، وەرە با دەرمانێکت پێبدەم بۆئەوەی ناوسکت پاك بکاتەوە و پاشماوەی خواردنەوەکە لەناو سکتدا لەناو ببات، بەڵام بەمەرجێك چیتر نەڵێیت"بۆچی"چونکە لەماڵی ژیانەوە ڕۆشتن بۆ ماڵی سۆزانیەکان و خواردنەوە شتێکی نەنگ نیە، بەڵام پرسینی "بۆچی" نەنگیەکی مەزنە.

من تائەوشەوە هەستم بەهاوخەوی هیچ ژنێك نەكردبوو، لەوباوەڕەدا نەبوم كە بونی ژن، بۆ پیاو تا ئەو ڕادەیە مایەی ڕازی بون بێت.

دوای ئەوە هەر هەلێكم بۆ بڕەخسایە دەمقۆستەوە و هەر ئەوەی بڕێك زیو و مسم دەست بكەوتایە یەكسەر دەڕۆشتم بۆ ماڵی سۆزانیەكان، لەبەرئەوەی هەندێك لە نەخۆشەكان لە ماڵی ژیاندا مس و بەتایبەت زیویان پێدەداین. بۆ ئێمە گرفت نەبوو خشڵە كانزاییەكان بەدەست بهێنین.

دوای ئەوە ئاگاداری ئەوە بووم مامۆستایانی قوتابخانە كە لەڕابردوودا لەبەرامبەر مندا ڕەشبین بوون، سەرەڕای ئەوەی دەیانزانی سەردانی ماڵە سۆزانیەكان دەكەم، پێم گەشبین بون، چونكە پەییان بەوەبرد كەمن بەشێوەیەك لەشێوەكان بەلایەنە خۆشگوزەرانیەكانەوە پەیوەست بوم و چیتر بیر لەڕەخنەگرتن ناكەمەوە.

هەرلەوكاتانەدا فیرعەون بەناوی"ئامن هوتب"زۆر بەسەختی نەخۆش كەوت و پزیشكی فەرمانڕەوایان نەیاندەتوانی چارەسەرێكی بۆ بدۆزنەوە، سەرەڕای ئەوەی لەپەرستگای"ئامون"ڕۆژی جارێك لەڕێی فیرعەونەوە قوربانیان پێشكەشی خودای پەرستگا دەكرد، ئەم قوربانیە نەدەبووە هۆی مایەی چارەسەركردنی نەخۆشیەكەی.

دەگێڕنەوە فەرمانڕەوا سەرەڕای ئەوەی كوڕی خودایە ڕقی لەخودای "ئامون" هەڵگرت لەبەرئەوەی چارەسەری نەخۆشیەكەی بۆ نەكردبوو، بۆیە دەستەیەكی نارد بۆ"نەینەوا" كە دەكەوێتە نێوەندی دوو ڕووبار"بین نهرین"، بۆئەوەی بۆ چارەسەركردنی داوای یارمەتی لەخودای "نەینەوا بەناوی"عەشتار"ەوە بكەن و ئەم بابەتە لەڕوی میللیەوە ئەوەندە مایەی نەنگ بوو كە هیچ كەسێك نەیدەوێرا بەدەنگی بەرز بڵێت فیرعەون بۆچارەسەركردنی خۆی داوای هاوكاری لەخودای نەینەوا دەكاتو بەردەوام لەبەرخۆیانەوە باسی ئەم بابەتەیان دەكرد.

ڕۆژێكیان پەیكەری خودای نەینەوا خۆی كرد بەشاری "تبس"دا و من بینیم كۆمەڵێك ڕۆحانی كە ڕیشێكی درێژو لول و ئاڵۆزیان هەبوو چواردەوری پەیكەرەكەیان داوە.

بەوشێوەی لێكم دەدایەوە كە من خوێندكارێكی ڕۆشنبیرم، لەوەیكە خودایەكی بێگانە هاتووە بۆئەوەی فیرعەونی ئێمە چارەسەر بكات، زۆر ئازاری دەدام و ئاگاداری

ئەوە بووم کە تەواوی خوێندکاران و مامۆستایانی ماڵی ژیان وەك من دڵگرانی ئەم بابەتەن.

خوای بێگانە تا یەك هەفتە پێش بەرزبونەوەی ئاستی ڕوباری"نیل" لە"تبس"دا بوو، بەڵام نەیتوانی کارێکی بەسود ئەنجام بدات و چارەسەری فیرعەون بکات و ئێمەش هەمووومان زۆر خۆشحاڵ بوین بەوەی خودای بێگانە نەیتوانیوە تیماری نەخۆشیەکەی بکات.

"پاتور"سەرکونتێکەری فەرمانڕەوایان وەك تەواوی پزیشکی فەرمانڕەوایانی تر هاتبوو بۆ ماڵی ژیان، بەڵام ئەویش وەك ئەوانی تر بۆماوەیەك هیچ گرنگیەکی بەمن نەدا.

بەڵام کاتێك زانی من چیتر وەك جاران پرسیار ناکەم و ناڵێم"بۆچی"، کەمێك بەلای مندا هەستی بزوا و پێی وتم"سینۆهە" باوکت پیاوێکی مەزن و شەریفە، بەڵام وەك تەواوی مەزنە ڕاستەقینەکان هەژارە و منیش بەهۆی ئەوەی باوکت هاوڕێیەکی دڵسۆزی من بووە، هەروەها بەهۆی ئەو ڕێزەی هەمە بۆ مەزنی و شەرافەتی باوکت، دەمەوێت هاوکاریەکت بکەم.

من نەمدەزانی کە"پاتور" چ هاوکاریەکم دەکات، تائەوەبوو ڕۆژێکیان هەواڵیاندا کە "پاتور" بۆ کونکردنی سەری فیرعەون دەڕوات بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی.

*بەشی شەشەم*

## ڕۆشتین بۆئەوەی کون بکەینە سەری فیرعەون

تەواوی پزیشکەکان لەچارەسەرکردنی فیرعەون بێهیوا بون، تەنها یەك ڕێگای چارەسەرکردن مابوو، ئەویش ئەوە بوو کە درزێك بکەنە سەری و بزانن ئایا هیچ عەیبێك لەمێشکیدا هەیە یان نە؟ ئەم کارە لەهەموو لایەکەوە بەسودبوو، چونکە ئەگەر مێشکی هەر کەموکورتیەکی تێدا بێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا چارەسەری ئەو کەموکورتیەیان دەکرد، ئەگەر هیچ کەموکورتیەکی تیدا نەبێت ئەوا هەڵمی ژەهراوی ناوی ئێسقانەکان دەهاتە دەرەوە و سەری فیرعەون سوکتر دەبوو.

ئەو ڕۆژەی بڕیار بوو"پاتور" بڕوات بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی و کون بکاتە سەری فیرعەون، بەیانی زوو هات بۆ ماڵی ژیان و بانگی کردم و جانتایەکی ڕەشی پێدام و وتی: کەرەستەی نەشتەرگەریەکانم کەخراوەتە ئاگرەوە یان لەناو سوێراودا کوڵێنراوە هەمووی لەناو ئەم جانتادایەو ئەمرۆ حەز دەکەم پێش ئەوەی بڕۆین بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی، لێرەدا کون بکەمە سەری چەند کەسێکەوە، بۆئەوەی کەمێك مەشق بەدەستەکانم بکەم، هەروەها دەمەوێت لەو نەشتەرگەریەدا تۆ کەرەستەی نەشتەرگەریەکان بدەیت بەدەستمەوە.

تێگەشتم کە بابەتی هاوکاریەکەی ئەوەبوو، چونکە کاتێك خوێندکارێك لەلایەن پزیشکی فەرمانڕەواییەوە هەڵبژێردرێت بۆئەوەی کەرەستەی نەشتەرگەریەکانی بدات بەدەستەوە، وەك ئەوە وایە من خوێندکاری تایبەت و نزیکی ئەوم و شایستەی ئەوەیە لەکارە پزیشکیەکاندا هاوکاری بکەم.

دوای ئەوە"پاتور"لەپێشەوە و منیش لەدەوای ئەوەوە خۆمانکرد بەبەشێکدا کەنەخۆشی چارەسەرنەکراو و ئیفلیج و ئەو کەسانەی لێبوو کەسەریان بریندار بوو، کەلەوێدا دەخەوێنران.

"پاتور"دوای ئەوەی خۆی کرد بەو شوێنەدا سەری چەند کەسێکیانی پشکنی، دوای ئەوە سەری دوو کەسیانی بۆ نەشتەرگەری کونتێکردن هەڵبژارد. یەکێکیان پیرەمێردێك بوو کە هیچ چارەسەرێکی نەبوو، مەرگ بەلایەوە دەبووە مایەی خۆشبەختی. ئەویتریان بەندەیەکی ڕەشی کەتە بوو بەهۆی بەردێکەوە کە درابوو لەسەری نەدەیتوانی قسە بکات و نەئەندامەکانی جەستەی بجوڵێنێت.

هەردوکیان بردە ژوری نەشتەرگەریەوە و یەکسەر گوشراوی تلیاکیان تێکەڵی خوێنبەری جەستەیان کرد، بۆئەوەی هەست بەهیچ ئازارێك نەکەن.

منیش زۆر بەخێرایی سەری هەردوکیانم تاشی، دوای ئەوە شلەمەنیەکی کەفاویم بەسەریاندا ساوی، چونکە لەکتێبدا نوسرابوو پێش هەر نەشتەرگەریەك دەبێت شوێنی نەشتەرگەریەکە لەڕێی دەرمانەوە پاك بکرێتەوە.

"پاتور"چەقۆکەی خۆی گرتە دەست و پێستی سەری بڕی و پێستەکەی لەدوو لاوە کرد بەدوو بەشەوە.

لەمکاتەدا لەهەردوولای پێستی سەرەوە خوێن دەڕژا، بەڵام "پاتور" گوێی بەو خوێنە نەدەدا.

دوای ئەوە"پاتور" ئامێری کونکردنی ئێسقانی سەری گرت بە دەستەوە و چەقاندیە ناو سەری‌و هەرکە نوکی ئامێرەکە برێك ڕۆچوو، لەناوسەریا سوڕاندی، بەشێوەیەك کە پارچەیەك ئێسقانی خڕی لەسەری جیاکردەوە و مێشکی سەری دەرکەوت.

"پاتور"تەماشایەکی سەری کرد و وتی: من هیچ گرفتێك لەسەری ئەم پیاوەدا نابینم و ئێسقانەکەی خستەوە جێی خۆی و دوو لای پێستەکەی کە کۆی کردبووەوە چەسپاندنی بەیەکەوە و سەری بەست.

بەڵام هەر لەوکاتەی ئەو خەریکی بەستنی سەری بوو، ڕەنگی کەسی نەخۆش شین وەرگەڕا و گیانی لەدەست دا. کاتێك لاشەی ئەو پیاوەیان بردە دەرەوە، لەبەرئەوەی سەرۆکی ماڵی ژیان و کۆمەڵێك خوێندکار لەوێ ئامادە بوون"پاتور"بەدەنگێکی بەرز

بەخوێندکارەکانی وت یەکێکتان کە لەوانی تر لاوترە بڕوات بۆئەوەی کەمێك خواردنەوەم بۆ بهێنێت، چونکە دەستم کەمێك دەلەرزێت.

یەکێك لەخوێندکارەکان ڕۆشت و پیاڵەیەك خواردنەوەی بۆ هێنا و ئەویش خواردیەوە، دوای ئەوە دەستی لە لەرزین کەوت، ئەوکات فەرمانی دا بەندە رەش پێستەکە بۆئەوەی نەشتەرگەری بۆ بکەن بیبەستنەوە و لەسەرخۆ وتی: کەرەستەکانی قاڵبگیری ئێسقانی سەر ئامادە بکەن.

جارێکی تر کەرەستەکانی نەشتەرگەریم دایەوە دەستی و ئەویش بەپەلە پێستی سەری شەق کرد، بەڵام ئەمجارەیان بەفەرمانی ئەو دوو کەس، یەکێکیان لەلای ڕاستەوە و ئەویتریان لەلای چەپەوە ڕێگایان لەخوێنڕشتنی سەری کابرای لەهۆش چوو دەگرت، چونکە"پاتور"نەیدەویست خۆی بەم جۆرە کارە لاوەکیانەوە سەرقاڵ بکات، بۆئەوەی کارە سەرەکیەکەی خۆی بەئەنجام بگەیەنێت.

لەماڵی ژیاندا، پیاوێکی نەخوێندەوار هەبوو، کاتێك دەهاتە ژوورسەری کەسێکی نەخۆش، خوێنڕێژی برینی کەسی نەخۆش ڕادەوەستا، بەڵام"پاتور" لەوکاتەدا نەیویست سود لەو پیاوە وەرگرێت، بۆئەوەی لەکاتی کونکردنی سەری فیرعەوندا ببێتە مایەی ڕاگرتنی خوێنی سەری.

دوای ئەوەی پێستی سەریان هەڵدڕی"پاتور"ئێسقانی سەری بەندەکەی پیشانی من و ئەوانی تر دا و بینیمان کە بەشێك لە ئێسقانەکە بەهۆی بەرکەوتنی بەردێکەوە چاڵێکی لەسەریدا دروست کردووە.

ئەوکات بەچەقۆیەکی تایبەت و مشارێك ئەو بەشەی لە ئێسقان و دەوروبەری کە پارچە ئێسقانێکی بەئەندازەی لەپەدەستێك لەسەری جیاکردەوە، "پاتور"مێشکی بەندە ڕەشپێستەکەی پیشانی هەموان دا کە سپی بوو و تەکانی دەخوارد.

ئێمە بینیمان کە بڕێك خوێن ڕژاوەتە سەر مێشکەکە و لەناو مێشکیدا مەییوە، "پاتور" وتی: هۆکاری ئەوەیکە ئەم پیاوە ناتوانێت قسە بکات و ئەندامانی جەستەی بجوڵێنێت بونی ئەم خوێنە مەییوەی ناو مێشکیەتی.

پاشان بەوریاییەوە خوێنە مەییوەکەی بەپارچە پارچەیی لەمێشکی جیاکردەوە، هەروەها پارچە ئێسقانێکی بچوك لەسەر مێشکەکە بوو ئەویشی دەرهێنا.

لەکاتێکدا ئەو سەرقاڵی ئەم کارانە بوو، ئەوانی تر قاڵبی ئەو ئێسقانەیانگرت کە لەسەری جیابوبویەوە، بەڵام بەچەکوشێکی دارین دەیاندا لەئێسقانەکە بۆئەوەی ڕۆچون و قوپاویەکەی نەمێنێت و ڕێك ببێتەوە، دەوای ئەوە قاڵبیان گرت و خستیانە ناو قاڵبێکی زیوی تواوەوە، پاشان ئەو قاڵبە زیوەی لەناو ئاودا کوڵاندبوویان ساردیانکردەوە و دایان بە"پاتور"و"پاتور"یش ئەو پارچە زیوەی کە بەئەندازە و شێوەی ئێسقانە شکاوەکە بوو، خستە سەر ئەو کونە گەورەی کە لەسەریدابوو، وەبەهۆی چەند گیرەیەکی بچوکەوە زیوەکەیان بەلاکانی چواردەوری ئێسقانەکەدا بەستەوە و پێستی سەریان دایەوە بەسەر ئێسقان و پارچە زیوەکەدا و دوای ئەوە دووریانەوە و وتی: ئێستا ئەم پیاوە بهێننەوە هۆش خۆی، بەڵام نابێت بۆماوەی سێ ڕۆژ ببزوێت.

پیاویان بێدار کردەوە، ئەو پێش ئەوەی کون بکەنە سەری، نەیدەتوانی قسە بکات و دەست و پێی بجوڵێنێت، دوای ئەو نەشتەرگەریە هەم دەستی کردەوە بەقسەکردن و هەم دەست و پێی کەوتنەوە جوڵە، "پاتور" پێی وت: نابێت بۆماوەی سێ ڕۆژ سەرت بجوڵێنیت.

کاتێك کابرای بەندەکەیان برد بۆئەوەی لەژورەکەی تردا بیخەوێنن"پاتور" بەئێمەی وت: ئەگەر ئەم پیاوە تا سێ ڕۆژی تر نەمرێت ئەوا چاك دەبێتەوە و دەتوانێت لەماڵی ژیان بچێتە دەرەوە و تۆڵە لەو کەسەش بکاتەوە کە سەری شکاندووە، دوای ئەوە خوێندکارەکانی بڵاوە پێکرد و بەمنی وت: ئێستا کاتی ئەوەیە کەرەستەکانم بخەیتە ناو ئاگرەوە یان لەناو سوێراودا بیانکوڵێنیت، بۆئەوەی بڕۆین بۆ لای فیرعەون و تۆش لەگەڵمدا دەبیت.

منیش زۆر بەخێرایی کەرەستەی نەشتەریەکانی"پاتور"م شۆرد و خستنمە ناو ئاگرەوە و کوڵاندنم، دوای ئەوە لەماڵی ژیان چوینە دەرەوە و لەوکاتەی خەریکی هەڵگرتنی جانتاکەی بووم، لەناو کەژاوەی فەرمانڕەوایدا کە لەبەردەم ماڵی ژیاندا چاوەڕێی دەکردین دانیشتین و لەگەڵ پیاوێکدا کە بونی ئەو دەبووە هۆی وەستانی بەربونی خوێن، ڕێگای کۆشکی فەرمانڕەواییمان گرتەبەر.

ئەو کۆیلانەی کە کەژاوەکەیان لەسەرشانیان هەڵگرتبوو بەشێوەیەك بەڕێوە دەچون کە کەژاوەکە بەهیچ شێوەیەك نەدەجولا و منیش بەجۆرێك هەستم بەشانازی دەکرد،

چونکە بەمزانی بەمزوانە دەڕۆمە ناو کۆشکی فەرمانڕەواییەوە و فیرعەون لەنزیکەوە دەبینم.

دوای ئەوەی بۆماوەیەك بە كەژاوەكەوە ڕۆشتین و گەشتینە كەنار ڕوباری "نیل" و سواری كەشتی فەرمانڕەوایی بوین، ڕێگای "ماڵی زێڕین" بەواتا كۆشكی فەرمانڕەوایمان گرتە بەر.

كاتێك لەوێ نزیك بوینەوە ئەوەندە بەلەم وكەشتی گرانبەهامانبینی كە بەداری بەهادار دروست كرابوون لەگەڵ هەندێ بەلەم و كەشتی تر كە بەتەواوی ڕوباری "نیل"یان داپۆشیبوو.

خەڵكی بەدەم هاوارەوە دەیانوت كونتێكەری سەری فەرمانرەوایی هات، هەموو دەستیان بەهێمای ماتەمینی بەرز كردبویەوە و دەگریان، چونكە دەیانزانی هێشتا هیچ شتێك ڕوینەداوە، بەڵام دوای ئەوەی سەری فیرعەونیان شەق كرد زیندوو دەبێتەوە.

ئێمە لەبەرامبەر كۆشكدا لەكەشتیەكە دابەزین و لەو دەروازەی كە بە "زەنبەق" ناوبانگی هەیە ئێمەیان ڕەوانەی ناو كۆشك كرد.

كەسە مەزن و پیاوە خانەدانەكان لەبەرامبەر ئێمەدا هەردوو دەستیان لەسەر ئەژنۆیان دانا و سەریان بۆ دانەواندین، چونكە دەیانزانی ئێمە كەسانێكین كە هەڵگری مەرگین.

ئێمەیان ڕەوانەی ژوری خەوتنی فیرعەون كرد و بینیم فیرعەون لەسەر چوارپایەك ڕاكشاوە كە بەئاوریشمێكی ناسك داپۆشرابوو. پایەی چوارپاكانیشی پەیكەری خوداكان بوو.

فیرعەون لەوكاتەدا هیچ یەك لە هێماكانی فەرمانڕەوایی پێوە نەبوو، ڕوخساری هەڵئاوسابوو، جەستەشی بەڕووتی دەبینرا و سەریشی بۆ لایەك سوڕاندبوو، لەلایەكی دەمیەوە لیك دەچۆڕایە خوارەوە.

من كاتێك فیرعەونم بەوحاڵەوە بینی ئاگاداری ئەوەبووم كەتوانای ئەم جیهانە بەڕادەیەك ناجێگیرە كە فیرعەون لەسەر تەختی نەخۆشی و مەرگ، لەگەڵ هەژارترین كەسانێك كە لەماڵی ژیاندا چاودێریان لێ دەكردن و دەمردن، جیاوازی نەبوو.

بەڵام تەواوی بەشەکانی ئەو ژوورە شکۆمەندبوو، لەسەر دیوارەکان وێنەی گالیسکەی فەرمانڕەوایی بەدی دەکرا و فیرعەون بەسەر ئەو گالیسکانەوە تیری دەگرتە شێرەکان.

ڕەنگە ئاڵتونی و شین و سورەکان لەسەر دیوارەکانی ئەو ژوورەدا دەدرەوشانەوە و گۆمێکیشیان لەناوکەفی ژەورەکەدا دروستکردبوو کە تێیدا ماسیومراویەکان لەحاڵی مەلەکردندابون و هەندێك قازوقوڵنگیش بەئاسمانی ئەو گۆمەوە لەحاڵی فڕیندابون.

ئێمە هەردوو دەستمان لەسەر ئەژنۆمان دانا و لەبەرامبەر فیرعەوندا سەرمان دانەواند.

"پاتور"و مـن، دەمـانزانی کـە کـونکردنی سـەری فیرعـەون بێـسودەو حـاڵی ئـەو لەئێستادا ئـەوەمان پـێ نیشان دەدات کـە دەمرێـت، بـەڵام نـەریت وایـە دەبێـت سـەری فیرعـەون کـونی تـێ بکرێـت پـێش ئـەوەی بمرێـت ، بۆئـەوەی هـەڵمی نـاو مێشکی بێتـە دەرەوەو نەڵێن خۆیان لەدوایین هەوڵ بۆچارەسەر کردنی دزیوەتەوە.

من جانتا ڕەشەکەی"پاتور"م کردەوە کەبەداری"ئابنوس"[25]دروستکراوە، بۆئەوەی کەرەستەکانی لەکاتی نەشتەرکەریدا پێبدەم.

پێش ئەوەی بچینە ژوورەوە، پزیشکانی فەرمانڕەوا، قژی فیرعەونیان تاشی بوو، ئامادەیان کردبوو بۆ نەشتەرگەری.

"پاتور"فـەرمانی دا بـەو پیاوەی کـە دەبووە هـۆی ئـەوەی ڕێ لەخوێنڕێـژی بگرێـت بەلاسەری فیرعەونەوە ڕاوەستێت و سەری لەنێو هەردوو دەستیدا ڕابگرێت.

بەڵام لەمکاتەدا شاژنی میسر بەناوی"تی تی" هاتە پێشەوە و وتی نەخێر!

تـا ئـەوکاتـە مـن بەهـۆی گرنگـی هەلومـەرج و مـەزنی شـوێنەکە نـەمتوانیبوو شـاژن و فـەرمانڕەوای میـسر و خوشـکەکەی کـە هـەموویان بەمەبەسـتی ماتـەمینی دەسـتیان بەرزکردبوویەوە ببینم.

---

[25] ئابنوس، ئەم وشەیە لەوشەی یۆنانی"ئابانس"ەوە وەرگیراوە کە درەختێکە لە هیندستان و حەبەشەدا دەڕوێت وەك درەختی گوێز گەشە دەکات و گەورە دەبێت. بەرەکەی لەبەری ترێ دەچێت، گەڵاکەشی وەك گەڵای داری سنۆبەرە و گوڵەکەشی لەگوڵی خەنە دەچێت. دارەکەی قورس و بەهێز و ڕەقە و هەڵگری چەند پەڵەیەکی ڕەشە و دوای ئەوەی بڕیانەوە بۆماوەیەك دەیخەنە ناو ئاوەوە بۆئەوەی یەکپارچە ڕەش ببێت.....سەرچاوە "فەرهەنگی عەمید" ...وەرگێڕ.

جێنشینی فیرعەون بەشێوەیەك كە لەسەرەتای ئەم كتێبەدا وتم، لەهەمان ئەو ساڵەی من لەدایك بوم لەدایك بووە، بەڵام لەمن باڵا بەرزتربوو و چەناكەیەكی پان، بەڵام سنگێكی بۆ ناوەوە كوڕی هەبوو، ئەویش وەك دایك و خوشكەكەی دەستی بەرزكردبوویەوە.

خوشكەكەی بەیەكێك لەكچە جوانەكانی میسر لەقەڵەم دەدرا، لەبەرئەوەی وێنەی ئەوم لە پەرستگای "ئامون"دا بینیبوو ئاگاداری ئەم بابەتە بووم.

بەتایبەت زۆر باسی "تی تی" شاژنی میسر كە لەوكاتەدا ژنێكی قەڵەو و گەنم ڕەنگ بوو دەكراو دەیانوت كە ئەو ژنێكی ئاسایی بووە و هەر لەبەرئەوەش ناوی باوباپیرانی لەبەڵگەنامە سەرەكیەكاندا نەهاتووە.

ئەو پیاوەی ئامادەبونی دەبووە هۆی خوێن وەستان، كاتێك بیستی شاژنەكە وتی نەخێر! دوو هەنگاو چووە دواوەوە.

ئەو پیاوە بەكەسێكی لادێیی و نەخوێندەوار لەقەڵەم دەدرا و بچوكترین زانیاری لەبارەی زانستی پزیشكەوە نەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئامادەبونی دەبووە هۆی ئەوەی ڕێگا لەخوێنبەربوون بگرێت، ئەویان لەماڵی ژیان بەكاردەهێنا بۆ ڕێگرتن لە خوێنبەربوونی كەسانێك كە نەشتەرگەرییان بۆ دەكردن. من لەوباوەڕەدام هۆكاری ئەو پیاوە كە ئامادەبونی دەبووە هۆی ئەوەی بەتەواوی ئەو خوێنبەربوونە ڕاوەستێت ئەوەبوو كە جۆرێك بۆنی ناخۆشی لێ دەهات. ئەم بۆنە بەئەندازەیەك توندبوو، ئەگەر بیشیانشۆردایە هەر لەناو نەدەچوو، وەك ئەو مێخەی دایدەچەقێننە مێشكی مرۆڤەوە، ڕۆدەچووە ناو مێشكەوە. لەبەرئەوەی مێشك و دەمارەكان فەرمانڕەوایی ئەندامانی جەستە دەكەن، ڕێی لەو خوێنبەربوونە دەگرت.

من دڵنیانیم لەوەی بۆنی ئەو دەبێتە هۆی وەستانی خوێن، بەڵام لەبەرئەوەی هیچ ڕونكردنەوەیەكی جێی باوەڕمان بۆ ئەم بابەتە نیە، وای بۆ دەچم كە بۆنی ئەو ڕێ لەم خوێنڕێژیە بگرێت.

شاژن وتی: من ڕێ نادەم ئەم پیاوە بەدەستەكانی سەری خودا بگرێت، بەڵكو خۆم سەری دەگرم.

"پاتور" وتی: خانم کۆنتێکردنی سەر دەبێتە هۆی ئەوەی لەسەریدا خوێنڕێژی دروست ببێت و بەباشی نازانم تۆ چاوت بەو خوێنڕێژیە بکەوێت. بەڵام شاژن وتی: من لەتەماشاکردنی خوێنی خودا ناترسم و خۆم سەری بەدەستەکانم دەگرم.

لەبەرئەوەی پزیشکە فەرمانڕەواییەکان پێش هاتنە ژورەوەی ئێمە فیرعەونیان بێهۆش کردبوو "پاتور"یش دەیزانی کە ئەو گوێی لەدەنگی ئێمە نیە و ئەگەر گوێشی لێ بێت توانای کاردانەوەی نیە، بۆیە دەستی بەقسەکرد و لەهەمان کاتدا بەچەقۆ بەردینەکەی خۆی پێستی سەری فیرعەونی هەڵدڕی و لەبەرخۆیەوە دەیوت: فیرعەون کە لەخوداکانە بەرەو ئاسمان دەڕوات و لە کەشتی زێڕینی"ئامون"ی باوکی جێنشین دەبێت. فیرعەون لە خۆرەوە هاتووەتە بون و دەگەڕێتەوە بۆ لای خۆر و ناوی ئەو بۆ هەمیشە لەیادەکاندا دەمێنێتەوە... هەی پیاوی بۆگەن... تۆ لەکوێی، بۆچی نایەیت ئەم خوێنە بوەستێنی.

دوایین ڕستەکانی"پاتور"ئاراستەی پیاوێك کرا کە دەبوو بەئامادەبونی ڕێی لەم خوێنبەربوونە بگرتایە، چونکە"پاتور" دەیبینی خوێن لەژێر پێستی سەری فیرعەونەوە دەڕژێتە خوارەوە و ئەوکات تێگەشت کە ئەو پیاوە لەوێ ئامادە نیە.

ئاشکرا بوو کە ئەو پیاوە لەترسی شاژن پاشەکشەی کردووە و پاڵی داوە بەدیوارەکەوە و کاتێك بیستی لەگەڵ ئەودا قسە دەکات لەچوارپا و سەری فیرعەون نزیك بویەوە و دەستی بەرزکردەوە و هەر کە دەستی بەرزبویەوە خوێنی سەری فیرعەون کە پرژابوو بەسەر جەستەی شاژندا ڕاوەستا، بەڵام بۆنێکی کەسکون بەناو ژورەکەدا بڵاو ببویەوە.

"پاتور"دوای ڕاوەستانی خوێنەکە دەستی بەکونکردنی ئێسقانی سەری فیرعەن کردو لەهەمان کاتدا سەرقاڵی قسەکردن بوو، بەڵام ئەو لەبەرئەوە قسەی دەکرد کە تەنها شتێك بڵێت، چونکە دەیزانی پزیشکێك لەکاتی لەتکردنی سەردا دەبێت قسە لەگەڵ کەسوکاری نەخۆشدا بکات، بۆئەوەی بەقسەکانی هەست و بیریان پەرت بکات و تا بەهۆی ئەو نەشتەرگەریەی ئەنجامی دەدات نەترسن.

"پاتور" وتی: خانم، خودا دوای ئەوەی ڕۆشت بۆ ئاسمان لەلایەن"ئامون"ەوە بەرەکەتی بەسەردا دەڕژێت.

لەم کاتەدا جێنشینی میسر لە"پاتور"نزیك بویەوەو وتی: تۆ هەڵە دەکەیت "ئامون" بەرەکەتی بەسەردا ناڕێژێت، بەڵکو ئەو دەچێتە ژێر پارێزگاری"ئاتون"ەوە.

"پاتور" وتی: تۆ ڕاست دەکەیت و من هەڵە بووم، باوکت "ئاتون"چاودێری و پارێزگاری لێ دەکات. منیش مافم بە"پاتور" دەدا کە نەزانێت فیرعەون زیاتر بەچ خودایەکەوە پەیوەستە، چونکە بەدڵنیاییەوە مرۆڤ ناتوانێت لەوە تێبگات کە ئەو خودایەی جێی سەرنجی هەموو کەسێکە کێیە، لەمیسردا زیاد لە سەدخودا هەیە و بگرە ئەو کاهینانەش کە کاریان ئەوەیە ناوی خوداکان بزانن، ناتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن کەناوی هەموو خوداکانیان لەبەرە.

جێنشین دەستی کرد بەگریان و"پاتور" لەکاتی قسەکردنیدا دڵنەواییشی دەدایەوە تائەوکاتەی ئێسقانی سەری فیرعەونی بەتەواوی بڕی و پارچە ئێسقانێك کە لەهەموو لایەکەوە بەپانی دوو پەنجە درێژ بوو، لەکاسەی سەری جیاکردەوە.

من و "پاتور" بەوردی تەماشای مێشکی فیرعەونمان دەکرد کە مێشکێکی ڕەنگ خۆڵەمێشی هەبوو لەهەمان کاتیشدا دەجوڵایەوە.

"پاتور" وتی:"سینۆهە" چراکە لەمبەرەوە بگرە بۆئەوەی بتوانم بەباشی ناو سەری ببینم، منیش بەشێوەیەك چراکەم گرت کە ڕوناکی بۆناو سەری بدەرەوشێتەوە و "پاتور" وتی: زۆرباشە، زۆر باشە، من کاری خۆمم ئەنجام دا و چیتر هیچ کارێك لەمن ناوەشێتەوە، بەڵکو"ئاتون" دەبێت بڕیاری خۆی بدات، چونکە لێرە بەدواوە ئێمە ئەرکی خۆمان بەخوداکان دەسپێرین.

ئەوکات ئێسقانی سەری لەسەرخۆ خستەوە جێی خۆی، بەڵام دوای ئەوەی ئێسقانەکە لەسەری جیا کرایەوە، من هەستم کردکە حاڵی فیرعەون سەرەڕای ئەوەیکە بێهۆش بوو تا ڕادەیەك باشتر بووە.

دوای ئەوەی"پاتور"برینەکەی بەستەوە، بە شاژنی وت: ئەگەر خوداکان ڕێ بدەن و ئەو تا هەڵهاتنی خۆر بەزیندویی بمێنێتەوە، ئەوا زیندوو دەبێتەوە، ئەگینا دەمرێت[٢٦].

[26] هەر بەوشێوەی کە دەبینی"پاتور" کاتێك بیەوێت بە شاژنی میسر بڵێت کە فیرعەون کۆچی دوایی دەکات، هیچ تێبینی ئەوە ناکات کە ئەو بەم قسانەی خەمگین دەبێت و بێ هیچ پێشەکیەك ڕاستەوخۆ ئەم قسەیەی بۆ دەکات، چونکە خەڵکی لەمیسردا

ئەوکات"پاتور" دەستی بەهێمای ماتەمینی بەرزکردەوە و ئێمەش لەگەڵیدا هەمان شتمان کرد، دوای ئەوەش کەرەستەی نەشتەرگەریەکانم کۆکردەوە و خستنمە ناو ناگرەوە و دوای پاککردنەوەیان خستنمە ناو جانتاکەوە.

شاژن پێی وتین کە من دیاریەکی شایستەتان پێدەدەم، دوای ئەوە وتی ئێوە ئێستا دەتوانن بڕۆنو ئێمەش لەو ژورەی کە فیرعەونی تێدا خەوتبوو ڕۆشتینە دەرەوە و ڕۆشتین بۆ ژورێکی تر و لەوێدا خواردنیان بۆ هێناین و بەندەیێکیش ئاوی بەسەرە دەستماندا ڕشت.

من پرسیارم لە"پاتور" کرد کە بۆچی جێنشین دەیوت باوکی لایەنگری خودای "ئاتون"ە نەك"ئامون".

"پاتور"یش وتی: ئەم بابەتە داستانێکی دورو درێژە، ئەگەر بمەوێت لەسەرەتاوە بۆت باس بکەم زۆر درێژە دەکێشێت، لەبەرئەوە تەنها ئەوەت پێ دەڵێم کە"ئامن هوتب" کە هەر ئێستا کونمان کردە سەری، ڕۆژێکیان وا لێکی دەدایەوە کە خودای"ئاتون"خۆی پێنیشان داوە و هەر لەبەرئەوەش خودا پەرستگایەکی لەم شارەدا دروستکرد کە ئێستا جگەلەخێزانی فەرمانڕەوایان هیچ کەسێك سەردانی ئەم پەرستگایە ناکات و کاهینی ئەم پەرستگایەش پیاوێکە بە"ئامی"بانگ دەکرێت، ئەم کەسە و ژنەکەی، پەرستیاری جێ نشینی میسر بون و ئەو جێنشینەی کە تۆ ئێستا بینیت شیری ئەو ژنەی خواردووە و"ئامی"کچێکی هەیە بەناوی"نفر تی تی" لەبەرئەوەی ئەم کچە لەگەڵ جێنشیندا هاوشیرە بەناچاری ڕۆژێك دەبێتە خوشکی[27].

"پاتور" پێکێکی خواردەوە و وتی: ئەی"سینۆهە"بۆ پیاوێکی پیری وەك من هیچ شتێك لەوە چێژ بەخشترنیە کەبخوات و بخواتەوە و بەتایبەتی قسە لەسەر ئەو بابەتانە بکات کە هیچ پەیوەندیەکی بەوەوەنیە، چونکە پیرەمێردەکان زۆر حەزیان لەقسەکردنە.

---

بەشێوەیەك شەوو ڕۆژ بەریان لەمەرگ کردووەتەوە کە هیچ کەسێك لەبیستنی ئەوەیکە کەسێك مردووە یان دەمرێت ڕفاچڵەکێت، بەڵام پێی کاریگەر دەبێت.

[27] ئەو ناوانەی کە تۆ لێرەدا دەیانخوێنیتەوە چەند ناوێکی مێژوویین و "نفر تی تی" هەمان ئەو کەسەیە کە لەدواییدا دەبێتە شاژنی میسر و مەبەستی "پاتور" لەوەیکە دواجار دەبێتە خوشکی ئەوەیە کە ڕۆژێك دەبێتە هاوسەری ئەو، چونکە لەمیسردا شوکردنی خوشك بەبرا ڕێ پێدراو بوو.

من ئەگەر کونێك بکەمە نێوچەوانی خۆمەوە ئەوا دەبینی نهێنیگەلێکی زۆر لەناو نێو چەوانمدا شاردراوەتەوە، ئایا تۆ هەرگیز بیرت لەوە کردووەتەوە کە بۆچی هەموو ژنەکانی فیرعەون بەردەوام کچیان دەبێت نەك کوڕ.

وتم: نەخێر من هەرگیز بیرم لەم بابەتە نەکردووەتەوە.

"پاتور" وتی: ئەو فیرعەونەی کە ئێستا ئێمە کونمان کردە سەری، لەسەردەمی لاویەتیدا خۆی زیاد لە پێنج سەد شێرو گاکێوی لەباشوری سوداندا ڕاوکردووەو پیاوێکی بەهێزبوو کە لە"تبس"دا هەر ڕۆژە و لەگەڵ ئافرەتێکدا دەخەوت، سەرەڕای ئەوەش لەتەواوی ئەم ژنانە جگە لە کچ هیچی تریان نەبووەو تەنها ئەو شاژنە کوڕێکی بوو کە ئێستا جێنشینی باوکیەتی، ئایا تۆ ئەم بابەتە بەشتێکی ئاسایی لێکدەدەیتەوە؟

هۆکاری ئەوەی لەم فیرعەونە جگە لەکچ هیچی تری نەبووە ئەوەیە کە شاژن بەهۆی پزیشکی فەرمانڕەوایان ڕێی لەم کارە دەگرت، بەوەی ئەوکوڕانەی کە لەدایك دەبون نابێـت بەزینـدویی بمێننـەوەو هـەرکاتێك کوڕێـك لـەدایك ببوایـە، هـەر لەوکاتـەدا دەیکوشت.

دوای ئـەوە"پـاتور"چاوێکی لێداگرتمو وتـی: ئـەی"سـینۆهە" تـۆ پـشت بـەمجۆرە هەواڵانە مەبەستە، لەبەرئەوەی شاژن یەکێکە لە میهرەبانترین و باشترین ژنانێك کە لەمیسردا ژیاون.

ئێمـە ماوەیـەك سـەرقاڵی خـواردن و خواردنـەوە بـوین و منـیش چێژم لـەخواردنی فـەرمانڕەوایی وەرگـرت، چـونکە هەسـتی چەشـتنی مـن بڕیـار دەدات ئـەو جـۆرە خواردنانە بەچ شێوەیەك لێدەنێن، کە لەخواردنەکانی ماڵی ژیان چێژ بەخشتر بوو.

کاتێکمان زانی شەو داهات.

"پاتور"وتی:"سینۆهە"دەستم بگرە و لەم کۆشکە بمبەرە دەرەوە، چونکە خواردنەوە گەرچی خۆشحاڵی بەدڵ دەبەخشێت، بەڵام مەستمان دەکات و من بێ هاوکاری تۆ لەوانەیە لەکاتی ڕێکردندا بکەوم. منیش دەستیم گرت و لەکۆشك ڕۆشتینە دەرەوە و کاتێك ڕۆشتینە دەرەوە بینیم ڕوناکیەکانی شار لەلای بەشی ڕۆژهەڵاتیەوە، ئاسمانی ڕوناك کردووەتەوە.

سەرەڕای ئەوەی من زیاد لەڕادەی ئاسایی خواردووەمەتەوە، لەخۆمدا هەستم بە خۆشحاڵی دەکردو دڵم داوای ژنێکی دەکردو وتم: "پاتور" من دەبێت بڕۆم و لەماڵی یەکێك لەسۆزانیەکاندا، ژنێك بەدەست بهێنم و بیکەم بەخوشکی خۆم.

"پاتور" وتی: هەموو کەسێکی لاو لەکاتی شەودا، کاتێك کاری ڕۆژانەی تەواو دەبێت، بیر لە ئیشق دەکاتەوە، بەڵام ئیشق بونی نیە.

وتم: ئایا تۆ نکوڵی لەبونی ئیشق دەکەیت؟....دەی کەواتە ئەوە چیە کە ئێستا من بەرەو ڕووی ماڵی خۆشگوزەرانی و سۆزانیەکان پەلکێش دەکات؟

"پاتور" وتی: ئەوەی تۆ بەلای ماڵی سۆزانیەکان و خۆشگوزەرانیەکان پەلکیش دەکات ئەوەیە کە تۆ پێویستت بەژنێکە، چونکە پیاو، ئەگەر نەتوانێت ژنێکی لاو بەدەست بهێنێت و لەلای خۆیدا بیخەوێنیت، ئەوا خەمگین دەبێت، بەڵام دوای ئەوەیکە ئەو ژنە بوو بەخوشکی، لەڕابردوو دڵتەنگتر دەبێت.

وتم: بۆچی وایە؟، بۆچی پیاوێك دوای ئەوەی ژنێکی کرد بەخوشکی خۆی، لەڕابردوو خەمگینتر دەبێت؟

"پاتور" وتی: ئەوپرسیارەی تۆ لەمنی دەکەیت، پرسیارێکە کە خوداکانیش نەیانتوانیوە وەڵامی بدەنەوە. لەوەتەی ئەم جیهانەهەیە بەوشێوەیە بووە و دوای ئەوەش هەر بەوشێوەیە دەبێت و هەرجارێکیش پیاوێك لەگەڵ ژنێکدا هاوخەوببێتو ئەو ژنە ببێتە خوشکی ئەوا زۆر زیاتر لەو کاتژمێرانەی کە ئەو ژنە هێشتا نەبووەتە خوشکی دوچاری خەم و پەژارە دەبێت.

وتم: "پاتور" ئایا تۆ هیچ کاتێك ئاشق نەبویت؟

"پاتور" وتی: ئەگەر بتەوێت لەبارەی ئیشقەوە لەگەڵ مندا بدوێیت، ئەوا هانی ئەوەم دەدەیت وەك فیرعەون کونێك بکەمە سەرت، بۆئەوەی ئەو هەڵمە سوتێنەرەی کە لەکاسەی سەرتدا کۆبووەتەوە بهێنمە دەرەوە، چونکە ئەوەی دەبێتە هۆی ئەوەی تۆ لەبارەی ئیشقەوە بدوێیت هەمان ئەو هەڵمانەیە کە لەسەرتدا کۆبونەتەوە، چونکە ئیشق بونی نییەو ئەوەی بەناوی ئیشق ناودەبرێت، ئەو پێویستیەیە کە ژن و مێرد هەیانە بۆ یەکتری، بۆئەوەی ببنە خوشك و برای یەکتر.

لەبەرئەوەی"پاتور"زۆری خواردبویەوە نیگەرانی خۆی دەربڕی و وتی: بمبەرە ئەو ژورەی کە لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا بۆیان تەرخانکردوم و لەوێدا بمخەوێنەو تۆش

هەر لەو ژورەدا بخەوە، چونکە ئێمە ئەمشەو دەبێت لەم کۆشکەدا تاکاتی مردنی فیرعەون بمێنینەوە، دەرچونی ئەو باڵندەیە ببینین کە لەلوتییەوە دێتە دەرەوە.

وتم: "پاتور" گونجاونییە لەدەمی پیاوێکی وەك تۆوە قسەی وا بێهودە و پڕ و پوچ بێتەدەرەوە.

"پاتور" وتی: ئایا من قسەی بێهودە و پڕ و پۆچ دەکەم؟

وتم: بەڵێ، چونکە لەکاتی مردندا باڵندە لەلوتی مرۆڤەوە نایەتە دەرەوە، لەبەرئەوەی خودی من، پێش ئەوەی بڕۆمە ماڵی ژیان و ڕۆشتنم بۆ ئەو قوتابخانەیە بڕێکی زۆر خەڵکیم بەچاوی خۆم بینیوە کە مردوون و لەلوتی هیچ یەك لەمانەوە باڵندەیەك نەهاتووەتە دەرەوە، سەرەڕای ئەوەش زانستی پزیشکی دەڵێت کە لەجەستەی مرۆڤدا تەنها یەك شوێن هەیە کە گیانەوەرێك دەتوانێت تێیدا بژی، ئەویش سکی ژنە، لەمحاڵەتەدا بەچ شێوەیەك باڵندەیەك دەتوانێت لەناو جەستەی مرۆڤدا بژیەت، سەرەڕای ئەوەش لە لوتیەوە بێتە دەرەوە.

"پاتور" وتی: هەی"سینۆهە" بەهۆی ئەم ڕەخنانەتەوەیە کە بەرزبونەوەی پلەت لە ماڵی ژیاندا بۆ ماوەیەکی درێژخایەن ڕاگیراوە، سەرەڕای ئەوەش هێشتا دەستت لەم جۆرە ڕەخنانە هەڵنەگرتووە، هێشتا تەمێ نەبویت، لەبەرئەوەی فیرعەون کوڕی خودایە جیاوازە لەکەسانی تر و کاتێکیش دەمرێت لەلوتیەوە باڵندەیەك دێتە دەرەوە و ئەو باڵندەیەش ڕۆحی ئەوە کە دوای مەرگیش فیرعەون هەر بەزیندویی دەمێنێتەوە.

بۆ جارێکی تر "پاتور"چاوی لێداگرتمەوە و وتی: ئەگەر دەتەوێت ببیت بەپزیشك و بتوانی چارەسەری خەڵکی بکەیت و زۆربەی نەخۆشەکانت بکوژیت و لەم ڕێیەوە سەروەت و سامانێکی لەڕادە بەدەر و بەندە و کەنیزەگەلێکی لەڕادەبەدەر بەدەست بهێنی و لە "تبس"دا کەسێکی بەناوبانگت لێ دەربچێت و هەموو شەوێك لەکۆشکەکەتدا میوانداری و هەرا بەرپا بکەیت، دەبێت باوەڕت بەوەبێت کە لەکاتی مەرگدا باڵندە لەلوتی فیرعەونەوە دێتە دەرەوە. خەڵکانی تریش وەك تۆن و زۆر باش دەزانن کە لەنێوان مەرگی فیرعەون و پیسواترین سواڵکەری ئەم شارەدا لەدیدی پسپۆڕانی جەستەوە هیچ جیاوازیەك بەدی ناکرێت، بەڵام ئەمانە زێڕ و زیو و بەندە و کەنیزەی جوان و دانەوێڵە و گۆشتیان دەوێت، دوای ئەوەش بەو شێوەیە خۆیان

نیشاندەدەن کە بەڕاستی باوەڕیان بەوە هێناوە کە فیرعەون کوڕی خودایە و دوای مەرگیشی باڵندەیەك لەلوتیەوە دێتە دەرەوە.

بەڵام ئەگەر تۆ، سبەی لەماڵی ژیاندا بڵێیت کە ئەمشەو من ئەم قسانەم بۆکردیت، من نکوڵیان لێ دەکەم و دەڵێم کە تۆ بوختان بەدەمی منەوە دەکەیت، دڵنیابە کە قسەی منیان لا پەسەند ترە و تۆ بەسزای تاوانبارکردنی پزیشکێکی فەرمانڕەوایان و مامۆستای ماڵی ژیان لە قوتابخانە دەتکەنە دەرەوە، بەبەڵگەی ئەوەی تەواوی ئەندامی فەرمانڕەوایان کە لەماڵی ژیاندا کار دەکەن، وەك من، زۆر پەیوەستن بە زێڕ و زیو و خواردن و ژنانی جوانەوە.

ئەی "سینۆهە" وەرە و باوەشم پێدا بکە و بمبەرە ژورەوە بۆئەوەی بخەوم و تۆش بخەویت، چونکە لەبەرەبەیانی سبەیدا، دەبێت چاودێری دەرچونی ئەو باڵندەیە بکەین کە لەلوتی فیرعەونەوە دێتە دەرەوە و بەدەستی خۆمان بنوسین ئەو باڵندەیەمان بینی کە لەلوتی فیرعەونەوە دەهاتە دەرەوە و دای لەشەقەی باڵ و ڕۆشت بۆ ئاسمان.

من وەك بەندەێك کە خاوەنەکەی لەباوەش دەگرێت، ئەوم لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکی تر دەگواستەوە، ئەو پیاوە کێش سوکەم لەباوەش گرت و بردمە ناو کۆشکی فەرمانڕەواییەوە و لەو ژورەی کە بۆ ئەویان ئامادەکردبوو خەواندم.

بەڵام خۆم نەمدەتوانی بخەوم، چونکە لاویەتیم ڕێگەی خەوی لێگرتبووم، بۆیە لەو کۆشکە ڕۆشتمە دەرەوە و لەبەرامبەر کۆشکی فەرماڕەواییدا، لەناو گوڵەکاندا ڕاوەستام و خۆم سەرقاڵی ڕوناکی شار و ئەستێرەکانی ئاسمان کرد، لەکاتێکدا کە بۆنی گوڵەکانم دەکرد ئەو ژنە جوانەم کەوتەوە یاد کە ڕۆژێکیان هات بۆ ماڵی ژیان و خۆی بەناوی "نفر نفر نفر" ناساند و داوای لێکردم بڕۆم بۆ ماڵیان، بەڵام من نەڕۆشتم، چونکە لەوە دەترسام ئەو ژنە کارێکم لەگەڵدا بکات کە خوشکەکان لەگەڵ براکانیاندا دەیکەن.

بەڵام لەو شەوەدا ئارەزوی ئەو ژنەم دەکرد و بەخۆمم دەوت، چەندێك باش دەبوو گەر ئەو بهاتایە بۆ لام، یان بمزانیایە ماڵی لەکوێیە و هەر ئێستا بڕۆشتایەم بۆ ماڵەکەی.

*بەشی حەوتەم*

## جێنشینی میسر و نەخۆشی پەرگەم

لەناکاو لەناو گوڵەکاندا دەنگێکم بەرگوێ کەوت، ئاگاداری ئەوە بوم کە یەکێك لێم نزیك دەبێتەوە و هەمان ئەو کەسەش لێم نزیك بویەوە و تەماشایەکی کردم بۆئەوەی بمناسێتەوە.

منیش ئەوم ناسیەوە و زانیم کە جێنشینی میسرە و بەبینینی ئەو کوڕە لاوە لەشوێنێکی ئاوادا سەرم زۆر سوڕما و زۆریش ترسام و هەردوو دەستم خستە سەر ئەژنۆم و سەرم بۆ دانەواند.

جێنشین وتی: سەرت بەرز بکەرەوە، چونکە هیچ کەسێك لێرەدا چاوی بەئێمە ناکەوێت و پێویست ناکات لەبەرامبەر مندا سەر دانەوێنی، ئایا تۆ هەمان ئەوکەسەنیت کە ئەمڕۆ لەژوری باوکمدا، چەقۆ و چەکوشت دەدا بەدەست ئەو پیرە مەیمونەوە؟

من کە سەرم سوڕمابوو لەبیستنی ناوی پیرەمەیمون، سەرم بەرز کردەوە و جێنشین وتی: مەبەستی من لە مەیمونی پیر ئەو"پاتور"ەیە کە ئەمڕۆ کونی کردە سەری باوکم و ئەم ناوە دایکم لەوی ناوە و هەرکاتێك باوکم بمرێت ئەویش و تۆیش دەکوژرێن.

لەم قسەیەی دوایی زۆر ترسام، چونکە نەمدەزانی ئەگەر کون بکەنە سەری فیرعەونێکەوە و بەهۆی ئەو نەشتەرگەریەوە چاك نەبێتەوە، دەبێت ئەو کەسەی کونی کردووەتە سەری بکوژرێت.

"پاتور"منی لەم بابەتە ئاگادار نەکردبوەوە، من سەرم لەوە سوڕمابوو کە بۆچی ئەو پیاوە شتی وای بەمن نەوتبوو، یان منێك کە هیچ تاوانێکم لەم کارەدا نیە بۆچی دەبێت بکوژرێم.

ئەو کەسەی لەکاتی نەشتەرگەریدا چەقۆ و چەکوش دەدات بەدەستی پزیشکەوە بێتاوانە و نابێت بەکوشتی بدەن، لەبەرئەوەی ئەو دەستی لەچارەسەرکردنی نەخۆشدا نییە.

جێنشین وتی: من دەزانم کە ئەمشەو خودا دەبینم، بەڵام لەکۆشکی فەرمانڕەوایی خودادا سەردانم ناکات، بەڵکو لەدەرەوەی کۆشکدا خۆیم پیشان دەدات.

من دەزانم لەکاتی دەرکەوتنی خوادا، جەستەم دەکەوێتە لەرزە و دەنگم دەگیرێت، بۆیە دەبێت کەسێك هاوکاریم بکات. کاتێك تۆم لەسەر ڕێی خۆمدا بینی و دەزانم کە پزیشکی بۆیە بریارمدا لەگەڵ خۆمدا بتبەم... وەرە با بڕۆین.

من نەمدەویست لەگەڵ ئەو لاوەدا بڕۆم، لەبەرئەوەی"پاتور"پێی وتبووم لەکاتی مەرگی فیرعەوندا ئێمە دەبێت لەکۆشکدا بمێنینەوە، بەڵام نەمدەتوانی سەرپێچی لە فەرمانی جێنشین بکەم و ناچاربووم لەگەڵیدا بڕۆم.

جێنشینی میسر، پارچە قوماشێکی کورتی لەکەمەری پێچابوو، بەشێوەیەك کە ڕانەکانی دەبینران و من بینیم کە ئەو لەمن باڵا بەرزترە و بەشەقاوی درێژ ڕێ دەکات.

کاتێك گەشتینە کەنار ڕوباری"نیل"جێنشین وتی: دەبێت لەم ڕوبارە بپەڕینەوە و خۆمان بگەیەنینە ڕۆژهەلات، ئەو"قایخ - بەلەم"ەی کەلەکەنار ڕوباردا بەسترابوویەوە، پەتی بەستنەوەکەی کردەوەو هەردووکمان سواری قایخ بوین و من دەستم کرد بەسەوڵ لێدان. کاتێك گەشتینە ئەوبەری ڕوبارەکە، جێنشین بێنەوەی قایخەکە ببەستێتەوە لێی دابەزی و بەجێی هێشت و ئاویش قایخەکەی لەگەڵ خۆیدا برد و ئێمەش ڕێگای ڕۆژهەلاتمان گرتەبەر، لەبەرئەوەی جێنشین بەپەلە ڕێی دەکرد، ناچاربوم بەدوایدا ڕابکەم و بەو هۆیەوە سەرتاپای جەستەم ئارەقی لێ دەچۆڕا، دواجار گەشتینە شوێنێك کە شاری"تبس"و باخەکانی کەوتە پشتمانەوە و سێ گردۆلکە کە دەکەوتنە ڕۆژهەلاتەوە و پاسەوانی "تبس"بون، دەرکەوتن.

کاتێك گەشتینە شوێنێك کە هیچ کەسێکی لێوە دیار نەبوو، وە هیچ دەنگێك لەو ناوچەیەدا نەدەبیسترا، لاوەکە لەسەر زەوی دانیشت و وتی: ئا لێرەدا خودا خۆیم پیشان دەدات.

من سەرم سوڕمابوو کە بەچ شێوەیەك خودا خۆی پیشانی ئەو دەدات، ئایا منیش چاوم پێی دەکەوێت یان نە؟

کاتێك ڕۆژ بویەوە و خۆر هەڵهات، جێنیشین بانگی کرد"سینۆهە"خودا هات، دەستم بگرە، چونکە دەستم دەلەرزێ.

منیش دەستیم گرت و هەرچی خۆر زیاتر بەرز ببوایەتەوە ورووژانی جێنشین زیاتر دەبوو، کەوتە سەر زەوی و پێچی لەخۆی دەدا، ئەوکات من کە لەگۆڕانی بارودۆخی ئەو ترسابوم، ئاسودە و هێور بومەوە، چونکە زانیم کە جێنیشین توشی "پەرکەم" بووە و ئەم جۆرە نەخۆشیەم لەماڵی ژیاندا بینیبوو.

کاتێك کەسە نەخۆشەکان دوچاری پەرکەم دەبن، لەوانەیە زمانی خۆیان بەددانیان ببچڕن، بۆیە دارێکی درێژ دەخەنە هەردولای دەمیەوە، من لەو شوێنەدا دارم پێ نەبوو بۆئەوەی بخەمە ناو دەمیەوە بۆئەوەی زمانی خۆی بەددانی نەبچڕێنێت، بۆیە ناچار بوم پارچەیەك لەکراسەکەی خۆم بدڕم و بیخەمە ناو دەمیەوە بۆئەوەی زمانی خۆی لەت نەکات.

ئەوکات هەربەو شێوەی کە لەکتێبدا نوسراوەتەوە، بۆ چارەسەرکردنی دەستم کرد بەشێلانی جەستەی و کاتێك سەرقاڵی شێلانی جەستەی بوم، شەهێنێك وەك ئەوەی لەناو خۆرەوە بێتە دەرەوە پەیدابوو بەلاسەری ئێمەوە دەستی کرد بەسەماکردن و وەك بڵێی بیەوێت بەسەر سەری جێنشینەوە بنیشێتەوە.

من لەدڵی خۆمدا وتم: لەوانەیە ئەو خودایەی کە جێنشین چاوەڕێی بوو هەمان ئەو شەهێنە بێت، بەڵام دوای چەند خولەکێك لاوێکی جوان کە ڕمێکی بەدەستەوە بوو و وەك کێو نشینەکانی خەڵکی سوریا تەنها نیوەی جەستەی بەپۆشاك داپۆشرابوو دەرکەوت.

ئەو کوڕە لاوە ئەوەندە جوان بوو کە بووە هۆی ئەوەی من لەبەرامبەریدا کڕنوش ببەم، چونکە وامدەزانی ئەو خودای جێنشینە.

لاویش بەزمانی وڵاتی میسر پرسی: ئەو کەسە کێیە؟ ئایا نەخۆش کەوتووە؟

منیش وتم: ئەگەر تۆ خودایت، چارەسەری ئەم لاوە نەخۆشە بکە و ئەگەر چەتەشی، دڵنیابە لەوەی هیچمان پێ نیە کە پێتی بدەین، ئەو شەهێنەی کە لەئاسماندا سەمای دەکرد هاتە خوارەوەو لەسەر شانی ئەو کوڕە لاوە نیشتەوە و لاویش وتی: من خودا نیم و کوڕی ژن و پیاوێکم کە پەنیر دروست دەکەن، بەلام توانیومە فێری نوسین ببم و پێش بینی ئەوەیانکرد ڕۆژێك دێت من دەبمە فەرماندەی کەسانی تر و ئێستا دەڕۆم بۆ شاری "تبس"بۆئەوەی خزمەتی فیرعەون بکەم، چونکە بیستومە فیرعەون نەخۆش کەوتووە و پادشایەکی نەخۆشیش پێویستی بەکەسانێکی وەك منە، بۆئەوەی پارێزگاری لێ بکات.

دوای ئەوە تەماشایەکی جێنشینی میسری کرد و وتی: ئایا ئەو بەم نەخۆشیە دەمرێت؟

وتم: نەخێر... نەخۆشیەکەی نابێتە هۆی مردنی، بەلام مرۆڤ لەهۆش خۆی دەبات و مرۆڤی بێهۆشیش دەستەلاتی خۆی لەدەست دەدات.

جێنشین لەوکاتەدا هاتەوە هۆش خۆی، بەلام بەهۆی سەرمای بەیانیەوە لەرزی لێ هاتبوو، لاوی ڕم بەدەستیش نیوە پۆشاکەکەی بەری خۆی داکەند و جێنشینی پێ داپۆشی و وتی: ئێستا دەتەوێت چی بکەیت؟

وتم: ئەگەر تۆ هاوکاریم بکەیت دەیبەینەوە بۆشار و لەوێ کەژاوەیەکی بۆ پەیدا دەکەین و سواری کەژاوەکەی دەکەین و دەیگەڕێنینەوە بۆ ماڵ.

جێنشین دانیشت، بەلام بەشێوەیەك دەلەرزی کە لاوی ڕم بەدەست هاوکاری کردم بەنیوەی پۆشاکەی ئەوم پێداپۆشی وپێی وتم: ئەم لاوە دەوڵەمەندە، چونکە دەستێکی سپی و ناسکی هەیە، دوای ئەوە دەستی منیشی گرت و وتی: تۆش دەستێکی ناسکت هەیە، کارت چیە؟

وتم: من پزیشکم و لە قوتابخانەی ماڵی ژیان فێری زانستی پزیشکی بوم.

لاوی ڕم بەدەست وتی: بەدڵنیاییەوە ئەم کوڕە لاوەت هێناوە بۆ ئێرە بۆئەوەی لێرەدا چارەسەری بکەیت، بەلام باشتر وابوو هەندێك جلت پێ لەبەر بکردایە، چونکە هەوای سەرلەبەیانیانی بیابان زۆر ساردە.

جێنشین بەهۆی گەرمای پۆشاك و بەرزبونەوەی خۆر لە لەرزین کەوت و لەناکاو چاوی بەو کوڕە لاوە کەوت و وتی: ئەم کوڕە زۆر جوانە، لێی پرسی: ئایا تۆ لەلایەن خودای"ئاتون"ەوە هاتویت بۆ لای من؟

لاوی ڕم بەدەستیش وتی: نەخێر...

جێنشین وتی: ئەمڕۆ دەمتوانی خودای"ئاتون"ببینم و هەر ئەوکاتەی خۆر هەڵهات چاوم پێی کەوت و وامدەزانی ئەو تۆی ناردووە بۆ لام.

لاو وتی: من لەلایەن خوداوە نەهاتوم، بەڵکو لەدوێنێ شەوەوە کەوتومەتە ڕێ بۆئەوەی ئەمڕۆ بچمە ناوشاری "تبس" و ببمە خزمەتکاری فیرعەون، دوای هەڵهاتنی خۆر بینیم شەهێنەکەم بەرەو پێش دەستی کرد بەفڕین، وام هەستکرد لێرەدا شتێك هەبێت کە سەرنجی شەهێنەکەی بەلای خۆیدا ڕاکێشابێت، کاتێك هاتم ئێوەم لێرەدا بینی.

جێنشین وتی: بۆچی ئەم ڕمەت بەدەستەوەیە؟

لاو وتی: سەری ئەم ڕمە لەمەفرەخ دروستکراوە و من هاتوم تاکو بەخوێنی دوژمنانی فیرعەون سوری بکەم.

جێنشین وتی: من ڕقم لەخوێنڕێژیە، لەبەرئەوەی ڕشتنی خوێن خراپترین شتە.

لاوی ڕم بەدەست وتی: من بیروباوەڕێکی پێچەوانەی تۆم هەیە و لەوباوەڕەدام کە ڕشتنی خوێن دەبێتە هۆی پاکردنەوەی میلەتەکان‌و بەهێزیشیان دەکات‌و خوداکان خوێنیان خۆشدەوێت، چونکە بەخواردنی خوێن قەڵەو دەبن، تا ئەو کاتەی ئەگەری جەنگ هەبێت، بەردەوامی بەخوێنڕێژیش دەدرێت.

جێنشین وتی: من کارێك دەکەم چیتر جەنگ دروست نەبێت.

لاوی ڕم بەدەستیش تەماشایەکی منی کرد و وتی: وەك بڵێی ئەم کوڕە شێت بێت، چونکە هەمیشە جەنگ بووە و بەبەردەوامیش دەبێت و هەرکارێك کە میلەتەکان بیکەن بۆئەوەی خۆیان لەجەنگ دور بخەنەوە، زیاتر لەجەنگەوە نزیك دەبنەوە، چونکە جەنگ وەك هەناسەدان پێویستی ژیانی میلەتەکانە.

جێنشین تەماشای خۆری کرد و وتی: تەواوی میلەتەکان کوڕی ئەون، چونکە ئەو "ئاتون"ە و دوای ئەوە بەهێمای دەستی پەنجەی بۆ خۆرەکە ڕاکێشا و بەردەوامی بەقسەکانی دا، تەواوی سەردەم‌و زەویەکان بەوەوە پەیوەست دەکرێن و من

لـه"تـبس"دا پەرسـتگایەکی بـۆ دروسـت دەکـەم، شـێوەی ئـەو پەرسـتگایە بـۆ هـەموو فەرمانڕەواکان دەنێرم، لەبەرئەوەی من لەوەوە هاتومو بۆ لای ئەویش دەگەڕێمەوە.

لاوی ڕم بەدەستیش دوای بیستنی ئەو گوتانەی ڕوی لەمن کردو وتی: هیچ گومانێك لەوەدا نیە کە ئەو شێتەو تۆش مافی خۆتبوو کە ئەوت هێناوەتە ئەم بیابانە بۆئەوەی چارەسەری بکەیت.

منیش وتم: ئەو شێت نیە، بەڵکو لەوحاڵەی توشی پەرکەم دەبێت توانیویەتی خودای خۆی ببینێت، بەڵام ئێمە مافی ئەوەمان نیە دەربارەی ئەوەی بینیویەتی ڕەخنەی لێبگرین، چونکە هەمووکەسێك دەتوانێت هەرخودایەك کەخۆی حەزی لێبکات بپەرستێت و بەپێی گوتەکانی ئەویش ڕەفتار بکات.

ئێمە جێنشینمان هەڵگرت و بەرەو ڕوی شار بردمان و لەبەرئەوەی بەهۆی کاریگەری ئەو پەرکەمەوە لاواز ببوو لەهەردوو لاوە هەردوو بازوویمان گرت و شەهێنەکەش لەبەرمانەوە لەحاڵی فڕیندا بوو، لەنزیك شاردا بینیم کاهینێك بە کەژاوەیەك و کۆمەڵێك بەندەوە چاوەڕێی جێنیشین دەکەن، بەلێکدانەوەی خۆم، بەلایەنی کەم زانیم کە ئەو کاهینە"ئامی"یە.

یەکەمین هەواڵ کە"ئامی"بە جێنشینی گەیاند ئەوەبوو کە باوکی فیرعەون"ئامن هوتب"ی سێیەم کۆچی دوایی کردووە و پۆشاکی کەتانیان لەبەر کردووە و کلاوێکیان کردووەتە سەری.

"ئامی" بەمنی وت: "سینۆهە" ئایا جێنشین توانی خودای خۆی ببینێت.

وتم: خودی ئەو دەڵێت کە خودای خۆی بینیوە، بەڵام من تەنها چاودێری ئەوەم دەکرد کەتوشی هیچ زیانێك نەبێت و خەریکی چارەسەرکردنی بوم و لەوکاتەدا نەمزانی خودا لەچ کاتێکدا خۆی ئاشکرا کردووە، بەڵام تۆ چۆن ناوی من دەزانی، چونکە لەوباوەڕەدانیم لەهیچ شوێنێکدا چاوم بەتۆ کەوتبێت.

"ئامی"وتی: ئەرکی من ئەوەیە کە ناوی تۆ بزانم و ئاگاداری هەموو ئەو ڕوداوانەبیم کە لەناو کۆشکی فەرمانڕەواییدا ڕوو دەدات، هەروەها تێگەشتم کە شەوی ڕابردوو جێنشین کە ئێستا فیرعەونە دوچاری نەخۆشی "پەرکەم"بووە و دەبێت تەنها بێت، چونکە هەرکاتێك هەست بەوە بکات خەریکە توشی ئەم حاڵەتە دەبێت، تەنهایی هەڵدەبژێرێت، ئەگەر نەشیەوێت تەنهابێت ئێمە هەوڵی ئەوە دەدەین

کەبەتەنهایی بیهێڵینەوە. لەبەرئەوەی نابێت هیچ کەسێك چاوی بەنەخۆشی "پەرکەم"ی جێنیشین بکەوێت و بەو حاڵەوە تەماشای بکات کە کەف لەدەمیەوە دەچۆڕێت. شەوی ڕابردوو کاتێك من بینیم جێنشین دوای دەرچونی لەکۆشك چاوی کەوت بەتۆ لێی بێخەم بووم، چونکە دەمزانی تۆ پزیشکی، سەرەڕای ئەوەش، بەکاهینی پەرستگای"ئامون" لەقەڵەم دەدرێیت، چونکە تا ئەوکاتەی کەسێك نەبێتە کاهینی پەرستگا، لەقوتابخانەی ماڵی ژیاندا پەسەندی ناکەن، من کاهینی پەرستگای"ئاتون"م، سەرەڕای ئەوەی من و تۆ پەیڕەوی لەدوو خودای جیاواز دەکەین، بەڵام ڕێگەمدا شەوی ڕابردوو جێنشین لەگەڵ تۆدا بڕواتە دەرەوە، تەنها هیچ نەبێت پزیشکێك چاودێری لیّ بکات و من دڵنیا بوم کە دوبارە دوچاری"پەرکەم" دەبێتەوە.

ئەوکات بەدەستی هێمای بۆ لاوی ڕم بەدەست کرد و وتی: ئەو لاوە کێیە؟

وتم: ئەو لاوێکە کە ئەمرۆ سەر لەبەیانیەکەی لە بیاباندا ڕێمان کەوت لەیەکتری و شەهێنێکیش بەلاسەریەوە سەمای دەکرد، ئەوەش هەمان ئەو باڵندەیەیە کە بەسەر شانیەوە نیشتووەتەوە.

"ئامی" وتی: ئایا ئەوکاتەی جێنیشین دوچاری"پەرکەم" بوو، ئەم لاوە لەویّ ئامادە بوو، ئایا دیمەنی نەخۆشییەکەی ئەوی بینی.

وتم: بەڵیّ.

وتی: لەمحاڵەتەدا دەبێت ئەم لاوە بکوژین.

پرسیم: بۆچی؟

وتی: لەبەرئەوەی جێنشین لەئێستادا فیرعەونە و ئەگەر خەڵکی بزانن کە فیرعەونی ئێمە توشی نەخۆشی"پەرکەم"بووە و جار ناجارێك دوچاری هێرشی ئەم نەخۆشیە دەبێت و لەهۆش خۆی دەچێت، چیتر هیچ متمانەیەکی پیّ ناکەن.

وتم: ئەو لاوەی لەبەرچاوتدایە ئەمرۆ لەبیاباندا ئەو نیوە پۆشاکەی لەبەری کردبوو دایکەند و جێنشینی پێداپۆشی، بۆئەوەی لەسەرماندا نەلەرزێت و خۆشی دەڵێت تەنها بۆ ئەوە هاتووە، کە لەگەڵ دژمنانی فیرعەوندا بجەنگێت، سەرەڕای ئەمەش لاوێکی زۆر سادەیە و هێشتا نازانێت کە جێنشین دوچاری نەخۆشی"پەرکەم" بووە.

"ئامی"لاوەکەی بانگ کرد و وتی: بیستومە کە تۆ ئەمڕۆ خزمەتی جێنشینت کردووە، بۆیە ئەم ئەنگوستیلە ئاڵتونە وەك پاداشتێك لەبەرامبەر خزمەتکردنت بە جێنشین وەرگرە.

دوای ئـەم قـسانەی"ئـامی"ئەنگوسـتیلەیەکی ئـاڵتونی بـۆ هەڵـدا، بـەڵام لاو ئەنگوستیلەکەی نەگرتەوە و ئەنگوستیلە کەوتە سەر زەوی.

"ئامی"وتی: بۆچی ئەو ئاڵتونەی پێتی دەدەم لێم وەرناگریت؟

کوڕی لاویش وتی: لەبەرئەوەی من تەنها گوێڕایەڵی فەرمانەکانی فیرعەونم، نەك کەسانی تر، وادیارە فیرعەونیش هەمان ئەم لاوەیە کە تاجێکی لەسەردایە و ئەمڕۆ ئەم شەهێنەم منی بەرەو ڕووی ئەو ڕێنمایی کرد.

ئەوکات لاو بەرەو ڕوی فیرعەونی تازە ڕۆیشت و وتی: من هاتوم بۆئەوەی ببمە خزمەتکاری تۆ، ئایا تۆ کە ئەمڕۆ فیرعەونی، من وەك خزمەتکاری خۆت پەسەند دەکەیت؟

فیرعەون وتی: بەڵێ، من تۆ دەخەمە ناو خزمەتەوە، بەڵام دەبێت ئەم ڕمەت بدەیت بەدەستی یەکێك لەم بەندانەمەوە، چونکە من زۆر ڕقم لەو ڕمەیە کە دەبێتە هۆی خوێنڕشتن، هەموو میلەتان بەیەکسانی تەماشا دەکەم، چونکە هەموویان کوڕی"ئاتون"ن، لەبەرئەوە نابێت هیچ کامیان ئەویتریا بکوژێت.

کوڕی لاویش ڕمەکەی دا بەیەکێك لەبەندەکان و ئەوکات فیرعەون سواری کەژاوەکەبوو و ئێمەش بەپێ دوای کەوتین، تا ئەوکاتەی گەشتینە کەنار ڕوباری"نیل"و سواری کەشتی بوین و پێمان نایە کۆشکی فەرمانڕەواییەوە.

کۆشکی فەرمانڕەوایی پڕ بوو لەخەڵکی، فیرعەون دوای ئەوەی چووە ناو کۆشکەکەوە، ئێمەی بەجێ هێشت و ڕۆشت بۆ لای شاژن، بەواتا دایکی.

لاوی ڕم بەدەستیش لێی پرسیم: ئێستا من چی بکەم و بڕۆم بۆ کوێ؟

وتم: لێرە نەجوڵێیت تا فیرعەون لەڕۆژانی تردا بتبینێت و کارێکت بۆ دیاری بکات، چونکە فیرعەون خودایە و خوداکانیش شت زوو فەرامۆش دەکەن، ئەگەر نەتبینێتەوە هەرگیز ئەوەی نایەتەوە یاد کە تۆی وەك خزمەتکارێکی خۆی پەسەند کردووە.

لاوی ڕم بەدەستیش وتی: من زۆر نیگەرانی ئایندەی میسرم.

لێم پرسی: بۆچی نیگەرانی؟

وتی: لەبەرئەوەی فیرعەونی تازەمان لەخوێن دەترسێت و حەزناکات خوێنڕێژی بەرپا بکات و دەڵێت کە تەواوی میلەتەکان لەبەرچاوی ئەودا یەکسانن و منیش کە جەنگاوەرم ناتوانم ئەم بیروباوەڕە پەسەند بکەم، چونکە دەزانم ئەم باوەڕە بەلای سەربازێکەوە زۆر زیانبەخشە، بەهەرحاڵ دەڕۆم ڕمەکەم لەکابرای بەندە وەردەگرمەوە.

وتم: من ناوم"سینۆهە"یە و لەماڵی ژیاندا، کەدەکەوێتە ناو پەرستگای"ئامون"ەوە دەژیم، ئەگەر هەرکاتێکی پێویستت بەمن هەبوو وەرە بۆ لام.

من لەو لاوە جیابومەوە و بەرەوڕووی ژەورەکەی"پاتور"کە شەوی ڕابردوو تێیدا خەتبوو ڕۆشتم و ئەویش هەرکە چاوی پێم کەوت زمانی ناڕەزایی باداو وتی:"سینۆهە"تۆ دوچاری هەڵەیەك بویت کە لێبوردنی نیە.

پرسیم: تاوانم چیە؟

"پاتور" وتی: لەو شەوەی کە فیرعەون کۆچی دوایی دەکرد تۆ لەم کۆشکە ڕۆشتیتە دەرەوە و شەوت لەیەکێك لەماڵە سۆزانیەکاندا تێپەڕاندووە و بەهۆی ئەوەی تۆ لێرە نەبویت کەسێك منی لێرە لەخەو هەڵ نەستاندووە و من ئامادەی کۆچی دوایی فیرعەون نەبوم و فڕینی ئەو باڵندەیەم لەلوتیەوە نەبینی.

منیش وتم: نەبونم لەم کۆشکەدا تاوانی من نەبوو، بەڵکو جێنشین فەرمانی پێدام لەگەڵیدا بڕۆم، ئەوکات بەسەرهاتەکەم لەسەرەتاوە تا کۆتایی بۆ گێڕایەوە.

کاتێك "پاتور" گوێی لەقسەکانی من بوو وتی: پەنا بە"ئامون"، چونکە فیرعەونی تازەمان شێتە.

وتم: شێت نیە، بەڵکو توشی نەخۆشی"پەرکەم" بووە و هەندێکجار ئەم نەخۆشیە هێرشی بۆ دەبات.

"پاتور" وتی: پەرکەمو شێتی یەکێکە، چونکە کەسێك کە توشی نەخۆشی "پەرکەم" بێت، هزرێکی دروستی نیە و زۆر زوو دەبێتە ئامێری دەستی کەسانی ترو من زۆر خەم بۆ خەڵکی میسر دەخۆم کە دەبێت لەژێر فەرمانڕەوایی ئەم فیرعەونە نەخۆشەدا ژیان بەسەر ببەن.

لەمکاتەدا لەڕێی دادوەری مەزنەوە لەوە ئاگاداریان کردینەوە کە فەرمانی داوە دەبێت بڕۆین بۆ لای بۆئەوەی بەپێی یاسا سزایەکمان بەسەردا بسەپێنن، چونکە

یاسا دەڵێت کاتێك فیرعەون بەهۆی کونکردنی سەریەوە کۆچی دوایی بکات، دەبێت ئەو کەسانەی کە دەستیان لەم کارەدا هەبووە بکوژرێن.

من بەبیستنی ئەم هەواڵە لەرزم لێهات، بەڵام پاتور دوبارە چاوێکی لێداگرتمەوە بۆئەوەی نەترسمو لەسەرخۆ وتی: ئەم یاسایە هەرگیز بەواتا ڕاستەقینەکەی جێبەجێ ناکرێت.

کۆمەڵێك سەرباز هاتنو ئێمەیان بردە لای دادوەری مەزن لەکۆشکی فەرمانڕەوایی‌و بینیم چل پێستی لوولکراو، کەهەڵگری چل یاسای وڵاتی میسرە لەلای ئەوە و هەریەك لەو لولانە تۆمارێك بوو کە یاساکانیان لەسەر ئەو پێستە لولکراوە دەنوسیەوە.

"پاتور"دوای چونە ژورەوە و ڕۆشتنی بۆ بەردەم دادوەر، لەگەڵیدا قسەی کرد و ئێمەش سێ کەس بوین کە یاسا بەشایستەی کوشتنی دەزانی، یەکێکیان"پاتور"و ئەویتریان من و سێیەمیان ئەو پیاوە بوو کە بەئامادەبوونی دەبووە هۆی وەستانی خوێن.

دوای ئەوەی ئێمە ڕۆشتینە بەردەم دادوەر، سەربازەکانی ڕێگای چونە دەرەوەیان گرت، بۆئەوەی نەتوانین هەڵبێین و دوای ئەوە جەلادێك هاتە ژورەوە.

دادوەری مەزن وتی: تۆ بەهۆی ئەوەی کە نەتوانیوە چارەسەری فیرعەون بکەیت، شایستەی مەرگی و ئێستا دەبێت بمریت.

ئەو لاوە بەدبەختەی کە ئامادەبونی دەبووە ڕێگر لەبەردەم خوێنبەربووندا سەرتاپای دەلەرزی و "پاتور"بەدەمی بێ ددانەوە پرسی: ئایا دایکی تۆ زیندووە یان نە؟

ئەو پیاوەش وتی: دایکم چوار ساڵ لەمەوپێش کۆچی دوایی کردووە.

"پاتور"یش بەدادوەری وت: کەواتە یەکەم دەبێت ئەم پیاوە لەناو ببەن، چونکە دایکی لەجیهانێکی تردا ئاوگۆشتی لۆبیا و نۆکی بۆ ئامادە کردووە و چاوەڕێی دەکات.

پیاوی داماویش نەیدەزانی بەگاڵتەوە ئەم قسانە دەکات، بۆیە لەبەرامبەر جەلاددا لەسەر ئەژنۆ کەوت و جەلاد شمشێرە گەورەکەی خۆی کە ڕەنگێکی سوری هەبوو

جولاندەوە و لەسەر خۆ خستیە پشتملی ئەو پیاوە و بێئەوەی ئەو شمێشرە هیچ زیانێك بەو پیاوە بگەیەنێت پیاوەکە لەهۆش خۆی چوو.

جەلاد بەسەربازەکانی وت: ئەو پیاوە لەبەردەمیدا لا ببەن و دوای ئەو من لەسەر ئەژنۆ کەوتم و جەلاد بەدەم پێکەنینەوە شمشێرەکەی خۆی خستە سەر ملم و دوای ئەوە بێ هیچ برین و زیانێك هەستامەوە.

کاتێك نۆرەی"پاتور" هات، جەلاد تەنها بەوە ڕازی بوو کە شمشێرەکەی بەلاسەرەوە تەکان بدات.

ئەوکات پێیان وتین کە فیرعەونی تازە، دەیەوێت پاداشتی ئەوکارەمان پێبدات کە ئەنجاممان داوە، ئێمەش لەژوری دادوەر هاتینە دەرەوە، بەلام هەرچیان کرد، نەیانتوانی ئەو پیاوەی کە لەهۆش خۆی چوبو بیهێننەوە هۆش خۆی و بەسەر سوڕمانەوە ئاگاداری ئەوە بوون کە مردووە.

من ناتوانم بڵێم هۆکاری مەرگی ئەو چی بوو، چونکە هیچ جۆرە نەخۆشیەکی نەبوو، مەگەر ئەوەی بڵێم لەترسی مەرگ مردووە و سەرەڕای ئەوەی ئەو پیاوە کەسێکی نەزان بوو، بەلام خەمم بۆ ئەو مەرگەی دەخوارد، چونکە لە نمونەی کەسێکی وەك ئەو بەدی نەدەکرا و لەتەواوی ئەو ماوەیەی کە من کاری پزیشکیم ئەنجام دەدا، کەسێکی وەك ئەوم نەبینی کە بەئامادەبونی ببێتە هۆی وەستانی خوێنبەربوونی کەسێك کە نەشتەرگەری بۆ دەکەن.

فیرعەونی تازە ملوانکەیەکی ئاڵتونی دا بە"پاتور"و ملوانکەیەکی زیوینیشی دا بەمن، ئەو دوو ملوانکەیەیان لەملمان ئالاند و هەردووکیشمان پۆشاکی کەتانمان لەبەر کرد، کاتێکیش لەکۆشکی فەرمانڕەواییەوە گەڕامەوە بۆ ماڵی ژیان، تەواوی خوێندکارەکان لەبەرامبەر مندا کڕنوشیان برد و مامۆستایانیش چەورەییان بۆ دەکردم.

نوسینی ڕاپۆرتی نەشتەرگەری فیرعەون لەلایەن"پاتۆر"ەوە سپێدرا بەمنو پێی وتم:"سینۆهە" لەم ڕاپۆرتەدا تۆ دەبێت چەند شتێك بنوسیت، یەکەم کاتێك کونمان کردە سەری فیرعەون بۆنێکی خۆش لەمێشکی فیرعەونەوە دەهات، دووەم لەکاتی مەرگدا بینیمان کە لەلوتی ئەوەوە باڵندەیەك هاتە دەرەوە و ڕاستەوخۆ بەرەو خۆر ڕۆشت.

وتم: "پاتور" ئەگەر هەڵەنەکەم ئەوکاتەی فیرعەون کۆچی دوایی کرد هێشتا خۆر هەڵنەهاتبوو.

"پاتور" یش وتی: گەمژە خۆر هەمیشە هەیە، بەڵام هەندێ کات لەسەروی ئاسۆیە و هەندێکات لەخوار ئاسۆیە.

وتم: زۆر باشە ئەوەش دەنوسم.

"پاتور" وتی: ئەوەش بنوسە کە فیرعەون چەند ساتێك پێش ئەوەی بمرێت چاوی کردەوە و لەگەڵ خوداکاندا قسەی کرد و وتی: دەگەڕێمەوە بۆ لاتان.

منیش راپۆرتێکی چڕوپڕو سەرنج ڕاکێشم دەربارەی مەرگی فیرعەون نوسی، کاتێکیش "پاتور" ئەو راپۆرتەی خوێندەوە دەستی کرد بەپێکەنین و وتی: زۆرباش راپۆرتەکەت نوسیوە، دوای ئەوە راپۆرتە پزیشکییەکە بۆماوەی حەفتا ڕۆژ، هەموو ڕۆژێك لە پەرستگای "ئامون" و پەرستگاکانی تری شاری "تبس" دا دەخوێندرایەوە.

لەو حەفتا ڕۆژەدا کە تەرمی فیرعەون لەمردووخانە بوو بۆ ژیانی جیهانێکی تر ئامادە دەکرا و خەریکی مۆمیاکردنی بون، تەواوی مەیخانە و ماڵە سۆزانیەکان داخرابون، بەڵام لەم حاڵەتەشدا، وەك بابەتی لەسێدارەدانی پزیشکان، تەنها بەشێوەیەکی ڕوکەش ئەو یاسایەیان پیادە دەکرد، چونکە تەواوی مەیخانە و ماڵە سۆزانیەکان دوو دەرگایان هەبوو، خەڵکی لەدەرگای دواوە خۆیان بەم جۆرە شوێنانەدا دەکرد و دەیانخواردەوە و ڕایاندەبوارد.

هەرلەو ڕۆژانەدا کە لەماڵی ژیاندا سەرقاڵی مۆمیاکردنی تەرمی فیرعەون بون مژدەیان پێدام کە قوناخی خوێندنم لە ماڵی ژیاندا کۆتایی پێهاتووە و دەتوانم لەهەر ناوچەیەکی شاردا کە خۆم حەزم لێی بێت کاری پزیشکی خۆم ئەنجام بدەم.

ماڵی ژیان خاوەنی چواردە بواری پسپۆڕی زانستی بوو، کە خوێندکار حەزی لەهەرکامێکیان ببوایە دەیتوانی هەڵیانبژێت و منیش بەخۆشحاڵیەوە لەم قوتابخانەیە دەرچوم و بەو ملیوانکە زیوینەی کە فیرعەونی تازە پێی بەخشیبووم ماڵێکی بچوك و بەندەیێکیشم پێکڕی بەناوی "کاپتا" کەتەنها چاوێکی هەبوو، ئەویش دوای ئەوەی تێگەشت کە من پزیشکم وتی: من لەهەموو شوێنێکدا دەڵێم کە هەردوو چاوم کوێر ببوو خاوەنەکەم چاوێکیانی بۆچاککردمەوە.

داوام لە"توتمس"ی هاوڕێم کرد کە ماڵەکەم بەوێنە بڕازێنێتەوە و ئەویش وێنەی خودای پزیشکی لەسەر دیواری ژورەکەمدا کێشا و وێنەیەکی خۆشمی کێشا و خودای پزیشکی لەو وێنەیەدا دەیوت کە"سینۆهە"باشترین خوێندکاری من و تیژبینترین و زیرەکترین پزیشکی "تبس"ە.

بەڵام بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك لەماڵدا دانیشتم و هیچ نەخۆشێك سەردانی ماڵەکەمی نەکرد بۆئەوەی چارەسەریان بکەم.

*بەشی هەشتەم*

## من بوم بە پزیشکی کەسە هەزارەکان

ڕۆژێکیان لەژوری پزیشکی خۆمدا کە چاوەڕێی نەخۆشەکانم دەکرد بینیم یەکێك لە پاسەوانانی بارەگای دەوڵەت خۆی کرد بەژوردا و پرسی: کێ "سینۆهە"یە؟

وتم: من "سینۆهە"م

وتی: "پاتور" بانگت دەکات.

پرسیم:"پاتور" لەکوێیە؟ وەڵامی دایەوە کە ئەو لەکۆشکی فەرمانڕەوایی چاوەڕێت دەکات.

پرسیم: ئایا نازانی چ کارێکی بەمنە؟

وتی: وابزانم پەیوەندی بەفیرعەونی ڕابردووەوە هەیە.

منهەستام و ڕۆشتم بۆ بارەگا و"پاتور"م دۆزییەوە و ئەو پێی وتم: "سینۆهە" بەو شێوەی خۆتدەزانی ئێمە دوایین کەسانێك بوین کەچارەسەری فیرعەونی ڕابردومان دەکرد، هەر لەبەرئەوەش مۆمیاکردنی تەرمەکەشی دەبێت لەژێر چاودێری ئێمەدا ئەنجام بدرێت.

وتم: بۆچی ئێستا ئەم فەرمانەمان پێدەدەن، چونکە گەر بەهەڵەدا نەچوبم ماوەیەکە خەڵکانی تر دەستیان بەم کارە کردووە.

"پاتور" وتی: ئامادەبونی ئێمە لەئەنجامدانی مەراسیمی مۆمیاکردندا، لایەنێکی بەرزڕاگرتن لەخۆ دەگرێت، لەبەرئەوەی من ناتوانم لەم کارەدا بەشداری بکەم، ئەم کارەم بەتۆ دەسپێرم.

وتم: ئێستا من دەبێت چی بکەم؟

"پاتور" وتی: تۆ ئێستا دەبێت بڕۆیت بۆ "ماڵی ژیان" و باشتروایە خواردن و پۆشاك لەگەڵ خۆتدا ببەیت، چونکە ڕاوەستانی تۆ لەوێدا زیاد لەپانزە ڕۆژ درێژە دەکێشێت و لەو ماوەیەدا تۆ دەبیتە چاودێری دوایین کاری مۆمیاکردنی فیرعەون.

وتم: ئایا بەندەکەشم لەگەڵ خۆمدا ببەم یان نە؟

"پاتور" وتی: باشتر وایە لەگەڵ خۆتدا نەیبەیت، چونکە ئەو وەك تۆ پزیشك نیە و لەوانەیە سەری سوڕ بمێنێت لەو شتانەی کە لەماڵی ژیاندا دەیبینێت.

من کە پزیشکم، تا ئەو کاتە، وامدەزانی ئەوەی لەبارەی مەرگەوە پێویستە بیبینم بینیومە، وامدەزانی چیتر شتێك نەماوە کە بەمەرگەوە پەیوەست بکرێت و من نەمبینیبێت.

لەپێشەکیەکەدا باسی ئەوەم کردووە کە ئێمەی پزیشکانی میسر، مۆمیاکردن بە بەشێك لە زانستی پزیشکی لەقەڵەم نادەین، چونکە کەسە ئاساییەکانیش دەتوانن ئەم کارە بکەن، بەڵام دوای ئەوەی ڕۆشتم بۆ"ماڵی ژیان"ئاگاداری ئەوە بووم کە زۆر بەهەڵەدا چووم و هەڵەی من لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کە وەك تەواوی پزیشکانی میسر، بواری پسپۆڕیمان، بەکەسانێکەوە پەیوەست دەکەین کە لەزانکۆی"ماڵی ژیان"دەرچون.

ئێمەی پزیشکان بەهۆی کورتبینی و لەخۆباییمانەوە وا دەزانین تەنها ڕێگای گرتنە بەری کاری پیشەیی ئەوەیە کە مرۆڤ خولی خوێندن لەقوتابخانەی پزیشکی ماڵی ژیان تەواو بکات، ئەگەر کەسێك ئەم قوتابخانەیە تەواو نەکات، نابێتە کارناس و پیشەکارێکی پزیشکی.

بەڵام کاتێك ڕۆشتم بۆ"ماڵی ژیان" لەوێدا کرێکارگەلێکم بینی کە لەژیانیاندا پێیان نەناوەتە "ماڵی ژیان"ەوە، سەرەڕای ئەوەش پسپۆڕی ئەوان لەبواری هەڵوەشانی جەستە"تشریح"لەمن کە پسپۆڕی پزیشکی بووم زۆر زیاتر بوو[28].

---

[28] وەك"سینۆهە" نوسەری ئەم کتێبە لەیەکێك لە بەشەکانی ئایندەدا، بەلایەنی کەم بەوردیەوە باسی مۆمیاکردنی جەستەی دوو کەس لە خۆشەویستانی، دەربارەی مۆمیاکردن جەستەکان لە ماڵی ژیاندا ڕون دەکاتەوە، لێرەدا ناڵێت کە جەستەی فیرعەونیان بەچ شێوەیەك مۆمیا دەکرد و بەشێوەیەکی گشتی شێوازی مۆمیاکردن"بەپلەی یەکەم" تایبەت بەفیرعەون و سەرۆکە مەزنەکانی پەرستگا و کەسە دەوڵەمەندەکان ئەوە بوو کە سەرەتا هەرچی لەسینە و ورگ و کاسەی سەردا بووایە دەریان دەهێنا، هەروەها هێلکەی چاویشیان دەردەهێنا"لەبەرئەوەی دەگەنێت"و جەستەکەیان بۆماوەی چل تا شەست ڕۆژ لەسوێراوی خەستدا دا دەنا و دوای ئەوەی جەستەیان لەناو سوێراوەکەدا دەردەهێنا، شوێنە چاڵەکانی جەستە و چاویان پڕ دەکرد لە نترون"کاربۆناتی دوو و سودیومی هایدرۆجین. و پسپۆڕانی مۆمیاکاری ئەم سەردەمە بەو شێوەیەی کە وەرگێڕ لە

منیش دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆ خانەی پزیشکیەکەی خۆم بۆماوەی چەند ڕۆژێك هەموو ڕۆژێك خۆم دەشۆرد، بۆئەوەی بۆنی ئەو مردووانەم پێوە نەمێنێت کە لەمردووخانەدا پێمەوە چەسپیبوون.

ئـــەمجارەیان نەخۆشـــەکان ســـەردانیان کـــردمو بۆچارەســـەرکردنی نەخۆشـــیە جیاوازەکانیان داوای دەرمانیان لێ دەکردم.

من لەماوەیەکی کورتدا لە"تبس"لەنێو هەژارەکاندا خۆشەویست بوم، چونکە هەرچیان لەبەرامبەر چارەسەردنیاندا پێبدایەم لێم وەردەگرتن و وەك پزیشکی فەرمانڕەوایان لەخۆبایی نەبوم بۆئەوەی بڵێم کرێی چارەسەرکردنی من زێڕ یان زیوە.

شەوانەش بەهۆی ئەوەی دڵم هەڵگری گەرمی سەردەمی لاویەتی بوو دەڕۆشتم بۆ مەیخانە و لەگەڵ دۆستی خۆم"توتمس" دەمخواردەوە و دەربارەی بارودۆخی ئەو سەردەمە لەگەڵ یەکتردا دەدواین.

"ئامن هوتب"ی سێیەمی فیرعەونی میسر کە من چاودێری مۆمیاکردنی بووم، قوچەکی "هەرەم"ی نەبوو، بۆ ئەوەی لاشەکەی تێدا بنێژن، لەبەرئەوەی فیرعەونیان لەیەکێك لەگۆڕە ئاساییەکاندا ناشت. بەڵام دوای ئەوەی فیرعەون نێژرا، کوڕەکەی کە جێنیشینی بوو لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشت و وتیان ئەو دەیەوێت سەرەتا خۆی لەلای خوداکانی پاك بکاتەوە، دوای ئەوە بەشێوەیەکی سەرەکی ببێتە فیرعەونی میسرو لەچاوەڕوانی ئەو ماوەیەی کە جێنشین پاکژ ببێتەوە، دایکی ڕیشێکی درێژی بەچەناکەیەوە نا هەروەها کلکێکی شێری بەپشتیەوە هەڵواسی و کاتێك ڕێی دەکرد لەکەمەری خۆی دەبەست و لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دادەنیشت و لەباتی کوڕەکەی خۆی بەکاروباری وڵاتەوە سەرقاڵ دەکرد.

دایکی جێنشین یەکەمین کار کە ئەنجامیدا ئەوەبوو کەدادوەری مەزنی لەکارەکەی خۆی دەرکردو لەجێگەی ئەودا"ئامی"کە وتم بە کاهینی پەرستگای"ئاتون"لەقەڵەم

---

گۆڤاری گرپیر(چارەسەر کردن) چاپی فەرانسەدا خوێندبوی لەو باوەڕەدان مۆمیاکارانی میسر ڕۆنی ڕوەکی"گەرچەك" یان ڕۆنی "کونجی"یان بۆ ئەو نیترۆنە زیاد دەکرد ئەوکات جەستەیان لە ژورێکی گەرمدا دادەنا بۆئەوەی شێی کەم ببێتەوە و دوای ئەوە بەشریتی یان ئەو مۆمایەی کە"قیری سروشتی"یان بەسەردا ماڵی بوو سەرتاپای جەستەیان بەو شریتە دەپێچا و لەحەوت لاوە ئەو شیرتە لە جەستە دەپێچرا و ئەوکات جەستە مۆمیاییکراویان لەمردووخانەکەدا دەردەهێنا و دەیانبرد بۆ گۆڕستان بۆ ئەوەی ئەوێ بینێژن.

دەدرا کردە دادوەری مەزن و"ئامی" لەجێی دادوەری کۆن، لەبەرامبەر چل تۆماری چەرمی کە هەڵگری یاساکانی میسر بوو دانیشت و دەستی کردە بڕیاردان.

بەهۆی ئەم ڕوداوەوە هەندێك لەخەڵکی خەوگەلێکی سەیریان دەبینی و ڕەشەباگەلێکی نائاسایی هەڵیانکرد، بۆ ماوەی دوو ڕۆژ لە"تبس"باران باری و ئەم بارانە بەشێك لەوگەنمانەی داپۆشی کە لەکەنار ڕوباری نیلدا کۆیان کردبوویەوە. بەڵام هیچ کەسێك سەری لەم ڕوداوە سوڕ نەما، لەبەرئەوەی هەمیشە وابووە، هەر کاتێك کاهینەکانی پەرستگای"ئامون" توڕە بن، ئەم جۆرە بەسەرهاتانە ڕوو دەدات و لەمکاتەدا کاهینەکانی پەرستگای"ئامون"یش زۆر توڕە بون بەوەی"ئامی" کە پیاوێکی گومناوە ببێتە دادوەری مەزنی وڵات.

سەرەڕای ئەوەی کاهینەکانی پەرستگای"ئامون"توڕەبون، بەڵام لەبەرئەوەی موچەی سەربازەکان بەشێوەیەکی ڕێك و پێك دەگەشتە دەستیان و لەڕوی خواردن و خواردنەوەوە هیچ کێشەیەکیان نەبوو، بۆیە هیچ ڕوداوێکی دڵتەزێن ڕووی نەدا.

تەواوی پادشاکان بۆ مەرگی فیرعەونی میسر بەداخ بون و لەوڵاتە دراوسێکانەوە پارچە تاتە قوڕی خۆشەکراو کە چەند وشەیەکی ماتەمینی و جێی داخی تێدا تۆمارکرابوو دەنێردرا بۆ میسر، پادشای"میتانی"یش کچە شەش ساڵەکەی خۆی نارد بۆئەوەی ببێتە خوشکی جێنشینی میسر، بەواتا فیرعەونی تازە[29].

وڵاتی "میتانی"دەکەوێتە سوریا و نزیکی دەریاوە کە مەودای سنوری نێوان سوریا و وڵاتانی باکورە و ئەو کاروانانەی کە لە نێوان دوو ڕوبارەوە دێن لەوڵاتی "میتانی"یەوە تێدەپەڕن و خۆیان دەگەیەننە دەریا.

هەموو شەوێك من و"توتمس"لەمەیخانەدا باسی ئەم جۆرە شتانەمان دەکرد، هەندێکاتیش بەپێی خواستی"توتمس"دەڕۆشتین بۆ ماڵی سۆزانیەکان و من لەوێ تەماشای سەمای کچەکانم دەکرد، بەڵام زۆر چێژم لەسەمایان وەرنەدەگرت. لەو ڕۆژەوەی کە"نفر نفر نفر"م لە"ماڵی ژیان"دا بینیبوو، چیتر هیچ کچێك بەلامەوە

---

[29] وڵاتی "میتانی" لەو وڵاتە بەناوبانگانەی جیهانی کۆن بوو لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا و دێرین ناسەکان دەڵێن کە جەقی وڵاتی میتانی لەبەشی "علیایا" لەسەر سەرچاوەکانی دووڕوباری فرات و دیجلە بووە و فەرمانڕەوایانی"میتانی" لەهەندێك سەردەمدا وڵاتی خۆیان لە خۆرئاواوە تا قەراخ دەریای میدیتڕانە کە لەمڕۆدا قەراخ دەریا وڵاتی سوریایە بەرفراوان کردبوو و وڵاتی دوو ئاو کە لەنوسراوەکاندا دەیخوێنینەوە "نێوان دوو ڕوبار"ە کە دوڕوباری دیجلە و فوراتی پێدا تێدەپەڕێت.

سەرنج ڕاکێش نەبوو، ژنی جوانیش وەك خواردنی خۆشتام وایەو کاتێك مرۆڤ خواردنێکی خۆش بخوات دوای ئەوە ناتوانێت خواردنی بێتام بخوات، گەرچی"نفر نفر" نەبوو بەخوشکم، بەڵام لەوانەیە لەبەرئەوەی هێشتا نەبووە بەخوشکم، بوبێتە هۆی ئەوەی ئارەزوی ئەو ژنە بکەم.

شەوانە کاتێك دەگەڕامەوە بۆ ماڵ، بەهۆی خواردنەوەکانەوە زۆر زوو خەوم لێدەکەوت و بەیانی کە هەڵدەستام مەستی لەڕۆحمدا نەدەما و "کاپتا" بەندە یەکچاوەکەم ئاوی دەکرد بەدەست و دەمووچاومدا و خواردنی نان و ماسی سوێری پێدەدام.

دوای ئەوەی پارویەك نان و ماسی سوێرم دەخوارد، لەژوری خەوەکەمەوە دەرۆشتمە ژوری پزیشکیەکەم و کەسە هەژارەکانیش بۆ چارەسەرکردنیان سەردانیان دەکرم، منداڵی هەندێك لەژنەکان ئەوەندە لاواز بون کە ناچاربوم نۆکەرەکەی خۆم بنێرم بۆئەوەی نان و گۆشت و میوەیان بۆ بکڕێت و پیان بدات.

ئەگەر ئەم خەرجییە بێسودانەم نەکردایە، ئەوا دەمتوانی دەوڵەمەندببم، بەڵام هەرچیم بەدەست بهێنایە یان لەمەیخانەو سۆزانیخانەکاندا خەرجم دەکرد، یان دەمبەخشیەوە بەسەرکەسە هەژارە کاندا.

ڕۆژێکیان"توتمس"هات بۆ ژوری پزیشکیەکەم و وتی:"سینۆهە"ئەمرۆ لەماڵی یەکێك لە خانەدانەکان ئاهەنگ دەگێڕدرێت و چەند هونەرمەندێکیشیان بانگێشتی ئەو ئاهەنگە کردووە کە بڕۆن بۆئەوێ و کاتێك منیان بانگێشتی ئەو میوانداریە کرد منیش وتم: من و "سینۆهە" پێکەوە بەشداری لەو ئاهەنگەدا دەکەین.

پرسیم: ئەو کەسەی کە میوانداری خەڵکی دەکات کێیە؟

ئەویش لەوەڵامدا وتی: ژنێکە، بەڵام ژنێکی زۆر دەوڵەمەندە کە دەتوانێت ئەنگوستیلە ئاڵتونیەکان وەك ئەنگوستیلە مسینەکان خەرج بکات[٣٠].

هەردوکمان خۆمان شۆردو عەترمان لەلەشماندا و بەرەو ئەوماڵە ڕۆشتین کە"توتمس"باسی کردبوو، هێشتا نەگەشتبوینە نزیك ئەو ماڵە، گوێمان لەدەنگی ئاوازی موزیك ژەنەکان بوو، لەهەمان کاتدا بۆنی عەتر ئەوازشی لوتمانی دەکرد.

---

[30] ئەنگوستیلەی ئاڵتون و مس وەك پارە لەو سەردەمەدا ڕەواجیان هەبووە و مامەڵەیان پێکردووە.

کاتێك خۆمان کرد بەومالّەدا پێمان نایە ناو تەلارێکی زۆر فراوانەوە، من بەچاوی خۆم بینیم کە لەو تەلارەدا، کۆمەڵێکی زۆر لە جوانترین ژنانی"تبس"ئامادە بوون و هەندێك لەو ژنانە هاوسەریان هەبوو و هەندێکی تریشیان بێوەژن بوون.

کوڕانی لاو و پیریش لەویّ ئامادە بون و بەلاسەری ئەو تەلارەوە وێنەی خودای خواست و ئارەزو بەدی دەکرا کە سەری لەشێوەی پشیلە وێنە کێشرابوو.

هەندێك لەو ژنانە کە ئارەزوی ئەوەیان دەکرد ئاشقێکی دەوڵەمەند ببێتە بەشیان، پێکی خواردنەوەیان بەرز دەکردەوە و بەدەستیان هێمایان بۆ خودای خواست و ئارەزوو دەکرد و دوای ئەوە دەیانخواردەوە.

بەندەکان لەناو تەلاردا بەگۆزەیەکی پڕ لەخواردنەوە بەملاو لادا دەجولاّن و خواردنەوەیان دەڕشتە ناو پێکە خالّیەکانەوە و ئەوەندە گولّ ڕژابووە سەر زەوی، کە بەتەواوی زەوی ناو ئەو تەلارە داپۆشرابوو، لەوکاتەدا "توتمس" وتی: تەماشاکە، ئایا لەهیچ شوێن و لەهیچ ساتێکی تەمەنتدا ئەوەندە ژنی جوانت بینیوە؟

وتم: نەخێر.

"توتمس"وتی: تۆ کە دەتوانی زێر و زیو بەدەست بهێنی و خوشکت نیە، کەواتە یەکێك لەم ژنانە بکە بەخوشکی خۆت.

لەناکاو ژنێك لەناوەڕاستی ئەو تەلارەوە بەرەو ڕوی ئێمە هات و هەرکە چاوم پێی کەوت دلّم حالّگرتی و وتم: "توتمس"وابزانم خوداکانیش عاشقی ئەم ژنەن... تەماشاکە بەچ شێوەیەك ڕێدەکات و چ چاوو دەمێکی جوانی پێوەیە؟

بەلاّم من سەرم لەوە سوڕمابوو کە بۆچی سەرەڕای ئەوەی ئەو ژنە لەتەواوی ژنانی ناو ئەو تەلارە جوانتر بوو بەلاّم پیاوەکان چوار دەوریان نەگرتبوو.

"توتمس" وتی: ئەم ژنە، خاوەن مالّە و ئەم ئاهەنگەش بەبۆنەی خودایەك کە ئارەزوەکان دەهێنێتە دی بەرپا کراوە، بۆئەوەی ئەو ژنانەی کە مێردیان نیە بتوانن لەم ئاهەنگەدا داوا لەخودا بکەن هاوسەرێکیان پیّ ببەخشێت، ئەوانەش کە هاوسەریان هەیە ئارەزوی ئەوە بکەن هاوسەرگەلێکی دەوڵەمەندتر بکاتە بەشیان.

وتم: "توتمس" من ئەم ژنەم بینیوە و دەیناسم، ئایا ئەو ژنە"نفر نفر نفر" نیە؟

"توتمس" وتی: با.

وتم: ئەوکاتەی من لە "ماڵی ژیان"دا بوم، لەناکاو ئەم ژنە خۆی کرد بەوێدا و قسەی لەگەڵمدا کرد.

"نفر نفر نفر" لێمان نزیکبویەوەو زەردەخەنەی بۆهەردوکمان کردو منیش بەسەرسوڕمانێکەوە پەیم بەوەبرد سەرەڕای ئەوەی لێوەکانی زەردەخەنە دەکەن، چاوەکانی پێناکەنن، لەو کاتەدا"نفر نفر نفر"دەستی خستە سەردەسەتی"توتمس"و ئاماژەی بۆ یەکێك لەدیواری تەلارە کە کرد و وتی: من لەتۆ کە وێنەت لەسەر ئەم دیوارانە بۆ کێشاوم زۆر ڕازیم، ئایا کرێکەیان پێدایت؟

"توتمس" وتی: بەڵێ من کرێی خۆمم وەرگرت و دوای ئەم قسانە چاوانی ئەو ژنە ڕویان کردە منو تێگەشتم لەوەی کەدەمناسێتەوە، هەرلەوکاتەدا خۆمم پێناساندو وتم: من"سینۆهە"ی پزیشکم.

ئەو ژنەش وتی: من کەسێك بەناوی "سینۆهە" دەناسم کە لە ماڵی ژیاندا دەخوێنێت.

وتم: من هەمان ئەو سینۆهەم.

ژنەش لەوکاتەدا تەماشای ڕوخساری کردم و وتی: درۆ دەکەیت، تۆ ئەو"سینۆهە"نیت! لەبەرئەوەی"سینۆهە" کوڕێکی لاو بوو کە لەڕوخساریدا هیچ چرچو لۆچیەك بەدی نەدەکرا، بەڵام ئێستا لەنێوان دوو برۆتدا چرچ و لۆچی دەبینم، سینۆهە ڕوخسارێکی جوانی هەبوو، بەڵام تۆ باڵا و ڕوخسارێکی پەژموردەت هەیە.

وتم:"نفر نفر نفر"من "هەمان ئەو"سینۆهە"م، ئەگەر باوەڕیش ناکەیت، بەڵگەیەکت بۆ دەهێنمەوە بۆئەوەی هیچ گومانێکت لەناسنامەی من نەبێت، ئەو بەڵگەیەش بریتیە لەو ئەنگوستیلەی کە لەماڵی ژیاندا پێتدام.

ئەوکات ئەو ئەنگوستیلەیەی کە لەدەستمدابوو پێم نیشانداو وتی: لەبەرئەوەی تۆ ڕقت لەمنە، فەرموو ئەنگوستیلەکەی خۆت ببەرەوە بۆئەوەی هیچ یادگاریەکی تۆ لەلای من نەمێنێت، دەڕۆم و چیتر سەر بەماڵی تۆدا ناکەم.

"نفر نفر نفر" وتی: ئەو ئەنگوستیلەیەی من با لەلای خۆت بێ، چونکە ئەم ئەنگوستیلەیە بەلای تۆوە گرانبەهایە، چونکە زۆر بەدەگمەن ڕێ دەکەوێت کە من دیاریەك بەکەسێك ببەخشم، لێرەش مەڕۆ، دوای ئەوەی میوانەکان ڕۆشتن، قسەت لەگەڵدا دەکەم.

ئەوکات من یەکێك لەبەندەکانم بانگ کرد بۆئەوەی خواردنەوە بکاتە پێکەکەمەوە و ئەوەی ئەو بۆی ڕشتم خۆشترین و بەچێژترین خواردنەوەبوو کە تائەوکاتە خواردبێتمەوە، چونکە دەمزانی"نفر نفر نفر" منی خۆش دەوێت و ئەگەر ڕقی لەمن بوایە پێی نەدەوتم کە تا کۆتایی ئەم ئاهەنگە لەماڵەکەیدا بمێنمەوە.

هەندێك لەمیوانەکان بەهۆی زیادەڕەوییان لەخواردنەوەدا توشی ڕشانەوە دەبون و بەندەکانیش لەوکاتەدا کاسەیەکیان بۆ دەهێنان بۆئەوەی بڕشێنە ناو ئەو کاسەیەوە.

بگرە"تونمس"یش بەهۆی ئەو زیادەڕەویەوە دوچاری ڕشانەوە بوو، بەڵام لەو ئاهەنگەدا دوو کەس خۆیان لەزیادەڕەوی خواردنەوە پاراست، یەکێکیان ژنی خاوەن ماڵ و ئەویتریان من کە ئارەزوی ئەوەم دەکرد قسەی لەگەڵدا بکەم.

کاتێك زەوی ئەو تەلارە لە پێکی شکا و گۆزەی خاڵی داپۆشرا، ژنان و پیاوانیش بەشێوەیەك لەهۆش خۆیان چوبون کە چیتر هیچ کەسێك نەیدەتوانی نەقسە بکات و نە ببیستێت، ژەنیارەکانیش دەستیان لەژەنین هەڵگرت و بەندەکانیش خۆیان کرد بەژوردا بۆئەوەی خاوەنە مەستەکانیان ببەنەوە بۆماڵی خۆیان.

ئەوکات "نفر نفر نفر" هات و منی لەژوری تەلاری ئاهەنگەکە بردە ژورێکی ترەوە و لەتەنیش خۆیەوە داینیشاندم و منیش لێم پرسی: ئەم ماڵە هی تۆیە؟

ژنەکە وتی: بەڵێ ئەم ماڵە هی منە.

وتم: ئەگەر وابێت کەواتە تۆ زۆر دەوڵەمەندی.

ژنەکەیش وتی: لە"تبس"دا هیچ یەك لەو ژنانەی کە ئامادەن لەگەڵ پیاواندا خۆشەویستی بکەم بەئەندازەی من دەوڵەمەند نین.

دوای ئەوە نەوازشی دەستی کردم و وتی: بۆچی ئەو ڕۆژەی پێم وتی وەرە بۆ ماڵی من، نەهاتی؟

وتم: ئەو ڕۆژە لێت دەترسام، چونکە منداڵ بوم.

"نفر نفر نفر"وتی: دیارە دوای ئەوەی بویت بەپیاو لەگەڵ ژنانێکی زۆردا ڕاتبواردووە و زۆرجار سەردانی ماڵە سۆزانییەکانت کردووە؟

وتم: بەڵێ هەموو شەوێك دەڕۆشتم بۆ ماڵە سۆزانیەکان، بەڵام تا ئەم ساتەی لەتەنیشتتەوە دانیشتوم، هچ ژنێك نەبووەتە خوشکی من.

"نفر نفر نفر" وتی: درۆ دەکەیت، چۆن ئەکرێت پیاوێك هەموو شەوێك بڕوات بۆ ماڵی سۆزانیەکان و ئەوژنانە نەبوبن بەخۆشکی.

وتم: چونکە هەرکاتێك یەکێك لە و ژنانە بەرەو ڕوم دەهات تۆم دەهاتەوە یادو هەر ئەوکاتەی لەش و لاری تۆم لەئەندێشەمدا ببینیایە ئاگاداری ئەوە دەبوم کە چیتر ئەو ژنە لەبەرچاوی مندا بونی نیە.

"نفر نفر نفر" وتی: ئەگەر تۆ درۆ بکەیت، ئەو ڕۆژەی من دەبمە خوشکت پەی بەڕاستی ئەم بابەتە دەبەم و ئاگاداری ئەوە دەبم درۆت لەگەڵدا کردوم.

وتم: من درۆ ناکەم و هیچکاتێکیش درۆم نەکردووە."نفر نفر نفر" پرسی: ئێستا دەتەوێت چی بکەیت؟

وتم: تا ئەمڕۆ من باوەڕم بەخوداکان نەبووە و باوەڕبون بەخوداکانیشم بەبەشێك لەخەیاڵ پلاویی لەقەڵەم داوە، بەڵام ئێستا دەڕۆم و لەتەواوی پەرستگاکاندا بۆ سوپاسی ئەوەیکە خوداکان منیان بەتۆ گەیاندووە و چاوم بەتۆ کەوتووە قوربانی پێشکەش دەکەم، دوای ئەوەش عەتر دەکڕم و دەرگای ماڵەکەت عەترڕێژدەکەم، بۆئەوەی کاتێك لەماڵ هاتیتە دەرەوە بۆنی عەتەر بکەیت، گوڵیش لە درەخت و نەمامەکان دەکەمەوە، بۆئەوەی کاتێك لەماڵ هاتیتە دەرەوە بیانڕێژمە بەرپێت.

ژنەکە وتی: ئەو کارە مەکە، چونکە ئەمانە هیچ کارێکم تێناکەن، چونکە منیش خاوەنی عەتر و گوڵم و پێویستم بە عەتر و گوڵی تۆ نیە، ئەگەر حەز دەکەیت من ببمە خوشکی تۆ وەرە با بڕۆین بۆ ناو باخ، بۆئەوەی داستانێکت بۆ بگێڕمەوە.

وتم: "نفر نفر نفر" من تۆم دەوێت نەك داستانەکانت.

ژنەکە وتی: ئەگەر منت دەوێت، ئەوا دەبێت گوێ لەداستانەکانیشم بگریت، لەوانەیە ئەمشەو ڕازیبم لەگەڵ تۆدا بنووم، حەز دەکەم پێکەوە نان بخۆین، ئەوکات بڕۆین بۆ ناو باخ. منیش کاتێك بۆنی گوڵی "ئاقاقیا"م کرد، بەشێوەیەك خۆشحاڵ بوم کە دەمویست "نفر نفر نفر" لەئامێز بگرم، بەڵام ئەو خۆی لێ دور خستمەوە و وتی: سەرەتا گوێ لەداستانەکەم بگرە.

ڕوناکی مانگ لەناو هەسێری باخەکەدا دەدرەوشایەوە و گوڵی سەر هەسێرەکە بەهۆی ئەوەی شەو بوو دەمیان داخستبوو و باڵندەکانی شەویش دەستیان بە خوێندن کرد.

بەپێی فەرمانی ژنەکە، بەندەیێك مراوییەکی برژاوو خواردنەوەی بۆ هێناین و ئێمەش دەستمان کرد بەخواردن و خواردنەوە و هەرجارێك بمویستایە"نفر نفر نفر" لەئامێز بگرم ئەو دەیوت: سەرەتا گوێ لەداستانەکەم بگرە، دوای ئەوە ئەگەر ئەوەی بۆم باسکردنی پەسەندت کرد، دەبمە خوشکت.

بەڵام سەر لەنوێ وروژانی سەردەمی لاویەتی هانی دام لەئامێزی بگرمو ڕێگربم لەوەی داستانەکەم بۆ بگێڕێتەوە، بۆیە پێم وت:"نفر نفر نفر"ئایا ئەکرێت من لەم شەوەدا لەژێر ڕوناکی ئەم مانگەدا سەری تاشراوی تۆ ببینم؟

ژنەکە وتی: کاتێك ڕازی بویت ببمە خوشکت، قژە دەستکردەکانم لا دەبەم و ڕێت پێدەدەم دەست بهێنی بەسەرمدا و نەوازشی بکەیت[31]

[31] دەبێت بڵێین کە چوار هەزار ساڵ لەوەو پێش لەوڵاتی میسردا ژنە خانەدانەکان سەری خۆیان دەتاشی و قژی دەستکردیان لەسەر دەکرد و یەکێك لە مەزنترین سەرکەوتنەکانی پیاوێکی میسری لەلای ژنێکدا ئەوەیە کە بتوانێت سەری تاشراوی ژنێك ببینێت و نەوازشی بکات.

*بەشی نۆیەم*

## دڵتەزێن ترین ڕوداوی سەردەمی لاویەتیم

ئەوکات"نفر نفر نفر" وتی: لەکۆندا پیاوێك بووە کە بە"سات نە" بانگ دەکرا، ڕۆژێکیان بۆ بینینی کتێبێکی دەگمەن ڕۆشت بۆ پەرستگاو لەوێ چاوی بە ژنە کاهینەیەك کەوت و لەیەکەم بینینیدا شەیدای بوو، کاتێك گەڕایەوە پەیامێکی بە بەندەکەیدا نارد بۆ ئەو ژنە کە بێت بۆ ماڵیان و بۆماوەی کاتژمێرێك ببێتە خوشکی و لەبەرامبەر ئەوەی لەگەڵیدا هاوخەوبووە ئەنگوستیلەیەکی قورسی ئاڵتون وەردەگرێت.

ژنەکە وتی: من نایەم بۆماڵی"سات نە"، لەبەرئەوەی هەموو کەسێك چاوی بەمن دەکەوێت و وا لێکی دەدەنەوە لەو جۆرە ژنانەم کە زۆر بەهەرزان خۆی هەڕاج دەکات، بۆیە بەئاغاکەت بڵێ کە ئەو بێت بۆ ماڵی من، چونکە ماڵی من چۆڵ و خەڵوەتە و کەسی تێدا نیە.

"سات نە"ڕۆشت بۆ ماڵی کاهینەکە و ئەنگوستیلەیەکی قورسی ئاڵتونی لەگەڵ خۆیدا برد بۆئەوەی پێبدات، ژنەیش کە دەیزانی ئەو بۆچی هاتووە، وتی: تۆ دەزانی کە من کاهینەم و ژنێك کە کاهین بێت خۆی بەهەرزان نافرۆشێت.

"سات نە" وتی: تۆ کەنیزەك نیت تاکو مامەڵەی کڕینت لەگەڵدا بکەم، بەڵکو من شتێکم لەتۆ دەوێت کە کاتێك ژنێك پێشکەشی پیاوێکی بکات، چیتر هیچ کەموو کورتیەك لەودا بەدی ناکرێت و هەر لەبەرئەوەش بەهای ئەو شتە لەهەموو شوێنێکدا هەرزانە.

ژنی کاهینەش وتی: ئەو شتەی تۆ لەمنت دەوێت هەرزانترین و بێنرخ ترین شتە و بگرە لەسەنێری مانگاش کە لەبیاباندا ڕژێنراوە هەرزانترە، بەڵام لەهەمان کاتدا

بەگرانترین شتیش لەقەڵەم دەدرێت. ئەم شتە بۆ ئەوکەسانەی هیچ گرنگیەکیان پێ نەداوە هەرزانترین شتە، بەڵام هەرکە پیاوێك گرنگی دا بەم شتە ، دەبێتە گرانترین شت و ئەو پیاوەش ئەگەر خوازیاری بێت، دەبێت بەنرخێکی زۆر گران بیکرێت. ئێستا بڵێ چەنێکم پێدەدەیت، بۆئەوەی من بۆ ماوەی کاتژمێرێك ببمە خوشکت؟

"سات نە" وتی: من ئامادەم دوو ئەوەندەی ئەو ئاڵتونەی بۆم هێناویت پێت بدەم.

ژنی کاهینیش وتی: ئەوە شایستەی ژنێکی وەك من نیە، ئەگەر تۆ خوازیاری من بیت، دەبێت ئەوەی هەتە و نیتە بیدەی بەمن.

پیاوەیش کە خوازیاری ئەو ژنە بوو وتی: هەرچیم هەیە پێتی دەدەم و لەهەمان کاتدا دادنوسێکیان هێنا و پیاو ماڵ و کێڵگە و بەندەکانی خۆی و هەرچی زێڕ و زیوو مسی هەبوو کرد بەناوی ئەو ژنەوە و پێی بەخشی، ئەوکات دەستی درێژکرد بۆئەوەی قژی دەستکردی ژنەکە لەسەری لا ببات و ماچێکی سەری بکات، بەڵام ژنەکە نەیهێڵاو وتی: دەترسم دوای ئەوەی بۆماوەی کاتژمێرێك منت کرد بە خوشکی خۆت، لێم بێزار ببیت و بگەڕێیتەوە بۆ لای ژنەکەی خۆت، ئەگەر تۆ دەتەوێت من ببمە خوشکت، دەبێت هەر ئێستا ژنەکەت دەربکەیت.

ئەو پیاوەی کە چیتر هیچ بەندەیێکی لەبەردەستدا نەمابوو، یەکێك لە بەندەکانی ژنەی نارد بۆئەوەی ژنەکەی لەماڵ بکاتە دەرەوە و ئەوکات ویستی قژە دەستکردەکەی لەسەری لا ببات.

بەڵام کاهینەکە وتی: لەو ژنەی کە دەرتکرد سێ منداڵت هەیە، بۆیە منیش دەترسم ڕۆژێك بێت سۆزی باوکایەتی تۆ بەرەو منداڵەکانت پەلکێش بکات و دواجار فەرامۆشم بکەیت، بۆیە هەرکاتێك ویستت من بەدەست بهێنی، سەرەتا دەبێت منداڵەکانی خۆت بهێنیت بۆ ئێرە بۆئەوەی بەدەستی خۆم بیانکوژم و گۆشتی جەستەیان بدەم بەسەگ و پشیلەکانم.

"سات نە" یەکسەر بێ ئەملاو لا لەڕێی بەندەی ژنەکەوە منداڵەکانی خۆی هێنا و سپاردی بەدەستی ژنە و ژنی کاهینیش چەقۆیەکی بەردینی گرت بەدەستەوە و هەرسێکیانی کوشت و هەرلەوکاتەی کە پیاوەکە سەرقاڵی شەراب خواردنەوە بوو، ژنەکە گۆشتی لاشەی منداڵەکانی دا بەسەگ و پشیلەکانی.

ئەوکات وتی: وەرە ئێستا بۆماوەی کاتژمێرێك دەبمە خۆشکت و دڵنیابە کە لەکانگای دڵمەوە لەگەڵتدا ڕادەبوێرم، چونکە هەموو ژنێك کاتێك ئامادە دەبێت لەڕوی سۆزەوە ببێتە خوشکی پیاوێك کە بزانێت خۆی بەهەرزان نەفرۆشتووە، تاکە جیاوازی ژنە هەڕاج فرۆشەکان لەگەڵ ژنانی وەك مندا کە کاهینە و ئابڕودارم ئەوەیە کە ژنە هەڕاج فرۆشەکان خۆیان بەهەرزان دەفرۆشن، بەڵام ژنە ئابرومەندەکان خۆیان بەبەهایەکی گران دەفرۆشن.

من وتم:"نفر نفر نفر" من ئەو داستانانەم بیستووە کە بۆت گێڕامەوە و دەزانم کە تەواوی ئەم ڕوداوانە لەخەودا ڕوو دەدات و کۆتایی ئەم داستانەش"سات نە" کە خەوتبوو، لەخەو ڕادەچڵەکیَ و سوپاسی خوداکان دەکات کە منداڵەکانی زیندون.

"نفر نفر نفر" وتی: وانیە، هەموو پیاوێك کاتێك ئاشقی ژنێك دەبێت وەك"سات نە"وایە و بۆئەوەی بتوانێت ئەو بەدەست بهێنێت ئامادەیە سامان و ژن و منداڵەکانی خۆی لەپێناویدا بکاتە قوربانی، ئەو کاتانەش کە ئەم قوچەکی"هەرەم" مەزنانەیان دروست دەکرد، بەوشێوەیە بووە و کاتێك با و خۆر قوچەکیەکانیش لەناو دەبات هەر وادەبێت. ئایا تۆ دەزانی بۆچی سەری خودای ئارەزووەکان لەشێوەی پشیلە دروست دەکەن و وێنەی دەکێشن؟

وتم: نەخێر.

"نفر نفر نفر" وتی: بۆ ئەوەی بڵێن ژن، وەك پەنجەی پشیلە وایە، لەبەرئەوەی کاتێك پشیلەیەك بیەوێت نێچیرەکەی خۆی فریوبدات پەنجە نەرمەکانی خۆی بەسەریدا دەخشێنێت و نێچیریش چێژ لەنەرمی پەنجەکانی وەردەگرێت، بەڵام لەناکاو نوکی تیژی چڕنوکەکانی لەژێر ئەو پێستە نەرمەدا دێنە دەرەوە و ڕۆی دەکاتە ناو جەستەی نێچیرەکەیەوە، منیش لەبەرئەوەی نامەوێت هیچ زیانێك لەمنەوە ببینیت و لەدواییدا بیرم بکەیت، پێت دەڵێم"سینۆهە" لێرە برۆ و جارێکی تر نەیەیت بۆ ئێرە.

وتم:"نفر نفر نفر" تۆ خۆت ئەمرۆ بەمنت وت کە نەڕۆم و لێرە بمێنمەوە، بۆئەوەی قسەم لەگەڵدا بکەیت.

ژنەکە وتی: بەڵیَ من ئەوەم وت و ئێستاش پێت دەڵێم برۆ، بۆئەوەی هەرکاتێك بتەوێت سودم لیَ وەرگریت، زۆر گران بەسەرتدا دەشکێتەوە و لەدواییشدا نەفرەتم لێدەکەیت کە بومەتە مایەی زیانت.

وتم: من هەرگیز گلەیی لەزیانەکانی خۆم ناکەم، ئەگەر مەبەستی تۆ ئاڵتون و زیو و مسە، هەرچیم هەیە پێشکەشتی دەکەم، بۆئەوەی پەسەندم بکەیت.

"نفر نفر نفر" وتی: ئەمڕۆ بەو شێوەی کە بینیت ئاهەنگێکی مەزنم بەدەستەوە بوو، ئەم ئاهەنگەش منی شەکەت کردووە و ئێستاش دەمەوێت بخەوم و تۆش بڕۆ و ڕۆژێکی تر وەرە بۆ لام، ئەگەر لەهەمان ئەو ڕۆژەدا ئەوەی لێت داوا دەکەم جێبەجێی بکەیت، دەبمە خوشکت.

من هەرچەندێك هەوڵم دا بۆئەوەی ئەو شەوە لەگەڵ ئەودا بەسەر بەرم، ڕازی نەبوو، بۆیە منیش ناچار بووم لەماڵەکەی بڕۆمە دەرەوە و گەڕامەوە بۆماڵی خۆم، بەڵام تا بەرەبەیان لەوروژانی ئیشقی"نفر نفر نفر" خەوم لێ نەکەوت.

ڕۆژی دوایی، سەرلەبەیانی زوو ئەو ڕاسپاردەیەم دا بە بەندەکەم"کاپتا" کە بەتەواوی ئەو نەخۆشانەی ڕاگەیەنێت کە سەردانم دەکەن، ئەمڕۆ تاقەتی چارەسەرکردنی هیچ کەسێکم نیە، دوای ئەوە ڕۆشتم بۆ سەرتاشخانە و خۆم شۆرد و عەترم دا لەخۆم و ڕێگای ماڵی"نفر نفر نفر"م گرتە بەر.

لەوێ بەندەێك منی بردە ژورەکەی ئەو و بینیم سەرقاڵی خۆڕازاندنەیە و من کە پشتم بەدۆستایەتی شەوی ڕابردوو بەستبوو، بۆیە خۆم لێ نزیك کردەوە، بەڵام ژنە منی لەخۆی دور خستەوەو وتی:"سینۆهە" بۆچی هاتی بۆ ئێرە.... بۆچی بویتە مایەی بێزاریم؟

وتم: "نفر نفر نفر" خۆشم دەوێیت و ئەمڕۆ لەبەرئەوە هاتوم بۆ ئێرە کە تۆ بەپێی ئەو بەڵێنەی پێت دام ببیتە خوشکم.

ئەو ژنەش وتی: ئەمڕۆ دەبێت خۆم زۆر بەجوانی بڕازێنمەوە، چونکە بازرگانێك کە لەسوریاوە هاتووە دەیەوێت ئەمڕۆ لەگەڵ مندا تێپەڕێنێت و وتویەتی لەبەرامبەر یەك ڕۆژدا یەك پارچە گەوهەرم دەدەم.

دوای ئەوە"نفر نفر نفر" لەسەر تەختە خەوەکەی خۆی ڕاکشا و ئەو ژنەی کە کەنیزەی بوو بەڕۆنی عەترئامێز دەستی کرد بەشێلانی جەستەی.

لەبەرئەوەی نەم دەویست بڕۆم، ئەو وتی: "سینۆهە"بۆچی بویتەتە مایەی سەرئێشەم و لێرە ناڕۆیت؟

وتم: لەبەرئەوەی من ئارەزوی تۆ دەکەم... لەبەرئەوەی دەمەوێت تۆ یەکەمین ژن بیت کە دەبێتە خۆشکی من.

"نفر نفر نفر" وتی: جارێکی تر وەك دوێنێ شەو پێت دەڵێم کە من نامەوێت ئازارت بدەم و پێت دەڵێم برۆ بەدوای ئیش و کاری خۆتدا و وازم لێ بهێنە.

وتم:"نفر نفر نفر" ئەگەر لەئێستاوە تا شەو لەگەڵمدا بیت هەرچیت بوێت پێتی دەبەخشم.

ژن پرسی: تۆ چیت هەیە؟

وتم: بڕێك ئەنگوستیلەی زیوو مسم هەیە کەلەنەخۆشەکانم وەرگرتووە بەناونیشانی کرێی چارەسەرکردنیان، هەروەها خاوەنیماڵێکم کە نەخۆشخانەکەشم لەوێیە، ئەم ماڵە ئەو خوێندکارانەی کە لەماڵی ژیان دەردەچن و پێویستیان بەنەخۆشخانەیەکە بەبەهایەکی باش دەیکڕن.

"نفر نفر نفر"یش هەر بەوشێوەی کە لەسەر تەختە خەوەکەی ڕاکشابوو و کەنیزەکەی جەستەی بەڕۆنی عەتراوی دەشێلا وتی: زۆر باشە"سینۆهە"بڕۆ و دادنوسێك بهێنە بۆئەوەی ئەم بابەتە بنوسێت و ئەو بەڵگەنامەیە لەلای دادوەری مەزندا دابنێت، بۆئەوەی ئەم گواستنەوەی سەروەت و سامانە لایەنی یاسایی وەربگرێت و تۆ نەتوانی لەئایندەدا لێم وەرگریتەوە.

منیش کاتێك تەماشای"نفر نفر نفر"م دەکرد کەئەندامێکی لە مەڕ مەڕ سپی تر و پاکتری هەبوو، بەڕادەیەك گرفتاری ئیشقی بوبوم کە نەمدەتوانی بەسەر دەرونی خۆمدا زاڵبم و وا هەستم دەکرد کە بەخشینی ئەوەی هەمە و نیمە لەبەرامبەر ئەوەی یەك ڕۆژ لەگەڵ ئەو ژنەدا بەسەر ببەم زۆر لەوە بێنرخترە، بۆیە وتم: "نفر نفر نفر" ئێستا دەڕۆم و دادنوسێك دەهێنم.

ژنەکە وتی: لەهەموو حاڵەتێکدا ئەمرۆ ناتوانم لەگەڵ تۆدا بم، بەڵام تۆ کابرای دادنوس بهێنەو هەموو سەروەت و سامانێکی خۆتم بۆ بگوازەرەوە و منیش لەڕۆژێکی تردا لەگەڵتدا دەبم.

من زۆر بەپەلە دادنوسێکم هێنا و ئەوەی هەمبوو لەزێڕ و زیو و مس و ماڵ بگرە بەندەکەی خۆشم گواستەوە بۆ"نفر نفر نفر" و ئەویش ئەو بەڵگەنامەیەی کە لەدوو پەڕەدا نوسرابوو وەرگرت و یەکێکیانی دەق کردو ئەویتریانی دا بەدادنوسەکە بۆ

ئەوەی لەلای دادوەری مەزندا داینێت، من بینیم کە بەڵگەنامەکەی خۆی خستە ناو سنوقێکی بچوکەوە و وتی: زۆر باشە من ئێستا دەڕۆم و تۆ سبەی وەرە بۆ ئێرە، بۆئەوەی ئەوەی لەمنت دەوێت پێتی ببەخشم.

من ویستم لەئامێزی بگرم، بەڵام هاواری کرد لێم دور کەوە، چونکە ئاڕایشتەکەم تێك دەدەیت.

دوای ئەوە سواری کەژاوەیەك بوو و لەگەڵ بەندەکانیدا ڕۆشت، منیش گەڕامەوە بۆماڵی خۆمو شتە تایبەتەکانی خۆم کۆکردەوە، بۆئەوەی کاتێك خاوەن ماڵی تازە دێت بتوانێت بێتە ناو ماڵەکەیەوە.

"کاپتا"کاتێك بینی خەریکی کۆکردنەوەی کەلوپەلەکانم، وتی: چیە دەتەوێت کۆچ بکەیت؟

وتم: نەخێر، من هەموو شتێکی خۆم هەروەها تۆشم داوە بەیەکێکی تر و بەمزوانە کەسێك دێت و ئەم ماڵە و تۆ دەخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و کاتێك لەلای ئەو کار دەکەیت دزی کەمتری لێ بکە، چونکە لەوانەیە ئەو لەمن بێبەزەیی تر بێت و زۆر بەهێز دارکاریت بکات.

"کاپتا"لەبەرامبەر مندا کڕنوشی برد و وتی: گەورەم، دڵی پیری من تۆی خۆش دەوێت و من لەخۆت دور مەخەرەوە، چونکە من ناتوانم لەلای کەسێکی تردا کار بکەم، ڕاستە کە من هەندێك شتم لەتۆ دزیوە، بەڵام زیاد لەڕادەی ترازوی دادوەری دزیم لێ نەکردویت و لەکاتژمێرە گەرمەکانی ڕۆژدا کە تۆ لەماڵدا دەحەوایتەوە من لەکوچە و کۆڵاندا باسی چاکی تۆم بۆ خەڵکی دەکرد و بەهەموو کەسێکم دەوت کە "سینۆهە"ی خاوەنم مەزنترین پزیشکی میسرە، لەکاتێك کۆیلەکانی تر لەپشت سەری خاوەنەکەیانەوە باسی خراپەیان دەکردن و ئاواتی مەرگیان بۆ دەخواستن.

دڵم بەو قسانەی تەنگ بوو و دەستێکم خستە سەرشانی و وتم: "کاپتا" هەستە.... زۆر بەکەمی ئەوە ڕوو دەدات کە من بەندەکەی خۆم بە"کاپتا" بانگ بکەم، چونکە دەترسام کە ئەو وا هەست بکات لەهەموو ڕویەکەوە هاوشانی منە و لەگەڵ مندا هیچ جیاوازیەکی نیە، بۆیە زۆربەی جار بە تیمساح یان دز یان گەمژە بانگم دەکرد.

کاتێك بەندەکە گوێی لەناوی خۆی بوو دەستی کرد بەگریان و هەردوو پێمی خستە سەر سەری و وتی: خاوەنە جوامێرەکەم دەرم مەکە و ڕازی مەبە کەسانی تر دارکاری بەندە پیرەکەت بکەن و بەرد بەنێوچەوانیدا بکێشن و ئەو خواردنەی دەرخوارد بدەن کە دەبێت بڕێژرێتە ناو ڕووبارەکانەوە.

سەرەڕای ئەوەی دڵم بۆی دەسوتا گاڵۆکەکەی خۆمم هەڵگرت- بەڵام نەك زۆر بەتوندی- بەگاڵۆکەکەی دەستم دەمکوتا بەپشتیدا و پێم وت: کورە هەی تیمساح هەستە سەر پێ و ئەوەندە مەگری، ئەگەر دەبینی کە من تۆ لەخۆم دور دەخەمەوە، لەبەرئەوەیە کە چیتر ناتوانم خواردنت پێبدەم، چونکە هەموو شتێکی خۆمم داوە بەکەسێکی تر، بۆیە ئەم گریانەت بێسودە.

"کاپتا" هەستایە سەرپێ و بەهێمای ماتەمینی دەستی خۆی بەرز کردەوە و وتی: ئەمڕۆ یەکێکە لەڕۆژە شومەکانی میسر.

دوای ئەوە کەمێك بیری لێکردەوە و وتی: "سینوهە" تۆ سەرەڕای ئەوەی لاویت یەکێکی لەپزیشکە بەناوبانگەکان و من پێشنیاری ئەوەم بۆت هەیە کە هەرچەنێك زیوو مست هەیە هەڵیانگرە و ئەمشەو سواری گەشتی دەبین و لێرە دەڕۆین، تۆ نەخۆشخانەیەك لەیەکێك لەشارەکانی میسر کە دەکەوێتە بەشی خوارەوەی ئەم ڕووبارەوە بۆ خۆت دەکەیتەوە، ئەگەر لەوێش بونە مایەی دەردی سەریمان، ئەوا ئەو کات دەتوانین بڕۆین بۆ وڵاتی"سور"و لەوڵاتی"سور"دا زۆر ڕێز لە پزیشکە میسریەکان دەگرن[32]. ئەگەر ناتەوێت لەوڵاتی سوردا بژیت، ئەوا دەتوانین ڕێگای "میتانی" یان وڵاتی "نێوان دوو ڕووبار" بگرینە بەر، من بیستومە کە لە وڵاتی "نێوان دو ئاو"دا دوو ڕووبار هەیە کە ئاڕاستەی ڕۆشتنی ئاوەکەیان بەپێچەوانەوەیە، چونکە لەباتی ئەوەی بەرەو باکور بڕوات بەرەو باشور دەڕوات.

وتم: "کاپتا" من ناتوانم لە "تبس" هەڵبێم، لەبەرئەوەی ئەو ڕشتە و پەتانەی منیان بەئێرەوە بەستووەتەوە، لەو سیمانەی کە لە مس دروستیان کردون بەهێزترە.

بەندەکەم لەسەر زەوی دانیشتو سەری بەهێمای ماتەمینی تەکانداو وتی: خودای"ئامون" ئێمەی بەجێ هێشتووە و چیتر ئێمەی خۆش ناوێت، چونکە

[32] مەبەست لە وڵاتی سور"عەرەبستانی"ئێستایە کە دەکەوێتە بەشی ڕۆژهەڵاتی دەریا سورەوە.

ماوەیەکە تۆ دیاریت پێشکەشی پەرستگای"ئامون" نەکردووە...من لەوباوەڕەدام ئەگەر هەر ئەمڕۆ دیاریەك پێشکەشی خودایەکی تر بکەین، ئەوا دەتوانین لە هاوکاری خودای تازە بەهرەمەند بین.

وتم: "کاپتا"تۆ ئەوەت فەرامۆش کردووە کە من چیتر هیچ شتێکم نیە کە بتوانم پێشکەشی خودایەکی تری بکەم، بگرە تۆش کە بەندەی من بویت ئێستا پەیوەستی بەیەکێکی ترەوە.

"کاپتا" پرسی: ئەو کەسە کێیە، ئایا پیاوە یان ژنە؟

وتم: ژنە.

هەرکە"کاپتا" تێگەشت خاوەنە تازەکەی ژنە، بەشێوەیەك هاواری کرد کە من ناچار بوم بەهەڕەشەی گاڵۆکەکەم بێدەنگی بکەم. دوای ئەوە وتی: هەی دایکە بۆچی ئەو ڕۆژەی من لەدایك بوم، منت بەپەتی ناوکم نەخنکاند بۆئەوەی زیندو نەمێنم و بەرگەی ئەم نەهامەتی و دەردیسەریە نەگرم؟ بۆچی من وەك کۆیلەیەك لەدایك بوم کە دواتر گرفتاری ژنێك ببم، لەبەرئەوەی ژنەکان هەمیشە لەپیاوان بێبەزەییترن، ئەویش ژنێکی وەك ئەم ژنە کە هەموو شتێکی لیّ زەوت کردویتو هەر ئەم ژنەش لەبەیانیەوە تا ئێوارە ڕاومان دەنێت و ناهێڵێت بۆ ساتێکیش بحەوێینەوە و ئاسودە بین، هەرگیز خواردنێکی باشیشم پێنادات، ئەویش لەحاڵەتێکدا ئەگەر من وەك خزمەتکاری خۆی بپارێزێت و پەسەندم بکات، ئەگینا من بەکانزاگەرێك دەفرۆشێت بۆئەوەی لەکانی کانزاکەیدا سەرقاڵی کارکردن بم، دوای چەند ڕۆژێك بەهۆی کارکردنم لەناو کانە کانزاکەیدا بەسەختی دەمرم، بێئەوەی هیچ کەس لاشەم مۆمیا بکات و گۆڕێکم بۆ خەوتن هەبێت؟[33]

من دەمزانی کە"کاپتا" ڕاست دەکات و لەماڵی"نفر نفر نفر"دا جیّ نیشتەجیّ بونی پیرەمێردێکی وەك ئەو نیە کە تەنها یەك چاوی هەیە، بەدڵنیاییەوە ئەو ژنە دەیفرۆشێت بەکەسێکی تر کە بەدڕەفتارانە مامەڵە لەگەڵ"کاپتا"دا بکات و ئەویش لەماوەیەکی زۆر کورتدا بەهۆی سەختی ژیانەوە کۆچی دوای دەکات. گریانی کابرای

---

[33] لەکۆندا کرێکارەکان ئامادە نەدەبون لەناو کانە کانزاکاندا کار بکەن و بۆ دەرهێنانی کانزاکان بەزۆر هانی کۆیلەکانیان دەدا کار بکەن؟

بەندە منیشی هێنایە گریان، بەڵام نەمدەزانی ئایا بۆ ئەو دەگریم یان بۆ خۆم کە هەموو شتێکم لەدەست دابوو.

کاتێک"کاپتا" بینی من دەگریم هێور بویەوە و لەجێی خۆی هەستایە سەرپێ و دەستی خستە سەر سەرم و وتی: هەموو ئەم شتانە تاوانی منە کە نەمدەزانی خاوەنەکەم قوماشێکی ئاو نەدیوو سادەیە و ئاگاداری بارودۆخی ژیان نیە و نازانێت کە کوڕێکی لاو شەوانە لە لەماڵەکەی خۆیدا دەحەوێتەوە، دەبێت ژنێکی لاویش لەتەنیشت خۆیەوە بخەوێنێت.

من هەرگیز لەژیانمدا کوڕێکی لاوی وەک تۆم نەدیوە کە بەو شێوەیە گرنگی بەژنان نەدات و هیچ کات ئەوە ڕوی نەداوە کە تۆ داوام لێ بکەیت بڕۆم یەکێک لەو ژنە لاوانەی کە لەماڵە سۆزانیەکاندا بەزۆری بەدی دەکرێن، بۆتی بهێنم. ئەو پیاوەی ئەزمونی لەگەڵ ژناندا نەبێت، وەک مشتێک گیای وشک وایە و یەکەمین ژنێک کە پێی دەگات وەک "تەنور"ی ئاگر وایە و هەرئەوەی گیا وشکەکە هەڵدەنە ناو تەنورەکەوە یەکسەر ئاگر دەگرێت. کوڕێکی لاوی بێ ئەزمونیش کاتێک چاوی بەژنێکی لاو دەکەوێت، ئاگر دەگرێت و بۆئەوەی بتوانێت بەدەستی بهێنێت، هەموو شتێکی خۆی دەکات بەقوربانی، ئیتر ئاگاداری ئەوە نیە چ زیانێک بەخۆی دەگەیەنێت، منیش داخی ئەوە دەخۆم کە بۆچی تۆ لەبارەی ژنانەوە پرسیارت لەمن نەکردووە، بۆئەوەی ڕێنماییت بکەم و پێت بڵێم کە لەجیهاندا، کاتێک ژنێک پیاوێکی خۆش دەوێت کە بزانێت ئەو پیاوە خاوەنی پارویەک گۆشتە، هەر ئەوەی ئاگاداری ئەوە بوو ئەو پیاوە وەک سواڵکەرێک هیچ شتێکی بەدەستەوە نەماوە خۆی لێ بەدور دەگرێت و دوای پیاوێکی تر دەکەوێت کە خاوەنی نان و گۆشت بێت. بۆچی ڕاوێژت لەگەڵ مندا نەکرد بۆئەوەی پێت بڵێم، کاتێک پیاوێک بیەوێت لەژنێک نزیک ببێتەوە دەبێت دارێک لەگەڵ خۆیدا ببات و هەرئەوەی خۆی کرد بەماڵی ژنەدا سەرەتا دارێک بکێشێت بەنێوچەوانیدا.

ئەگەر ئاگاداری ئەم حاڵەتانە نەبێت، هەمان ڕۆژ ئەو ژنە دەست و پێت بەپەتێک دەبەستێت و چیتر دوای ئەوە لەو ژنە ڕزگارت نابێت، مەگەر ئەوکاتەی کە هیچت بەدەستەوە نامێنێت و دەست بەسواڵکردن دەکەیت، ئەوکات ئەو ژنە دەستبەردارت

دەبێت و هەرچەنێك پیاو شەرمنتر بێت زووتر گرفتاری ئەو ژنە دەبێت و ڕەنج و زیانێکی زیاتری لێ دەبینێ.

ئەگەر تۆ لەباتی ئەوەی بڕۆیت بۆ ماڵی ئەم ژنە، هەموو شەوێك ژنێکت بۆ ئەم ماڵە بهێنایەو بەرەبەیانان ئەنگوستیلەیەکی مست پێ ببەخشیایە و دوای ئەوە وازت لێ بهێنایە ئەوا ئەمڕۆ منو تۆ گرفتاری ئەم بەدبەختیە نەدەبوین.

بەندەکەم بۆ ماوەیەك قسەی خۆی کرد، بەڵام من گوێم لەقسەکانی ئەو نەدەگرت، لەبەرئەوەی نەمدەتوانی ئەندێشەی خۆم لە"نفر نفر نفر" دور بخەمەوە و ئەو بەندە هەرچی پێ دەوتم: لەگوێیەکمەوە دەچووە ژوورەوە و لەگوێکەی ترمەوە دەردەچووە.

ئەو شەوە تا بەیانی زیاد لە دەجار بێدار بومەوەو هەموو جارێك دوای بێداربونم "نفر نفر نفر"م دەهاتەوە یاد و خۆشحاڵ بوم بەوەی کە لەڕۆژی دوایی‌دا چاوم پێی دەکەوێت.

بەڕادەیەك پەرۆشی دیداری بووم، کاتێك ڕۆژی دوایی ڕۆشتم بۆ ماڵی ئەو ژنە هێشتا لەخەو هەڵنەستابوو، بۆیە وەك سواڵکەرێك لەبەردەم ماڵەکەیدا دانیشتم، تا ئەو کاتەی لەخەو هەستا.

کاتێك خۆم کرد بەژورەکەیدا بینیم کەنیزەکەی خەریکی شێلانی جەستەیەتی و هەرکە منی بینی وتی: "سینۆهە" بۆچی بویتەتە مایەی تەمبەڵییم؟

وتم: من ئەمڕۆ هاتوم بۆئەوەی نانت لەگەڵدا بخۆم و ڕابوێرم، چونکە تۆ دوێنێ بەڵێنت پێدام کە ئەمڕۆت لەگەڵ مندا بەسەرببەیت.

"نفر نفر نفر" باوێشکێکی دا و وتی: تۆ دوێنێ درۆت لەگەڵدا کردم.

وتم: بەچ شێوەیەك درۆم لەگەڵدا کردویت؟

ژنەش وتی: دوێنێ تۆ وا خۆت دەنواند کە بێ لە بەندەیەك و ماڵێك هیچی ترن نیە، لەکاتێکدا من لێکۆڵینەوەم لەسەر تۆ کردووە و زانیم کە باوکت کوێر بووە و ناتوانێت بنوسێت، بۆیە مۆری خۆی بەتۆ داوە و وتویەتی تۆ دەبێت ماڵەکەی بفرۆشی.

"نفر نفر نفر"ڕاستی دەکرد، باوکم لەبەرئەوەی کوێر بووە و نەیدەتوانی بنوسێت، مۆرەکەی خۆی بەمن دابوو، بۆئەوەی ماڵەکەی بۆبفرۆشم، چونکە دایك‌و باوکم دەیانویست لەشاری "تبس" بڕۆن و کێڵگەیەك بکڕن و لەدەرەوەی شاردا ژیانی

خۆیان تێپەڕێنن، دایکیشم لەو کێڵگەیەدا جوتیاری بکات، لەهەمان شوێنیشدا بمێنێتەوە تا ئەوکاتەی کۆچی دوایی دەکات و لەگۆڕەکەی خۆیدا دەینێژن.

وتم: مەبەستت چیە؟

ژنەکەش وتی: تۆ کوڕی تاقانەی باوکی خۆتیت و باوکت کچی نیە بۆئەوەی دوای مەرگی بەشی هەرە زۆری سامانەکەی بەو ببەخشێت، بۆیە تەواوی سامانەکەی دەبێت بەهی تۆ. لەبەرئەوە مافی ئەوەت هەیە، لەوکاتەی کە باوکت هێشتا لەژیاندایە ماڵەکەی ئەویشم پێ بدەیت، چونکە ئەو مۆری خۆی بەتۆ داوە و تۆی لەفرۆشتنی ئەو ماڵەدا ئازاد کردووە.

کاتێك ئەم قسەیەم لەدەمی ئەو ژنە بیست لەشم کەوتە لەرزین، چونکە من دەستەڵاتی ماڵەکەی خۆم لەدەستدا بوو، بەڵام ناتوانم ماڵی دایك و باوکم بە"نفر نفر نفر" ببەخشم، بۆیە پێم وت: ئەم داوایەی کە تۆ لەمنی دەکەیت زۆر سەیرە، لەبەرئەوەی ئەگەر من ئەم خانووە بدەم بەتۆ، دایکم چیتر ناتوانێت ببێتە خاوەنی کێڵگەیەك کە پاشماوەی ژیانی لەوێدا بەسەرببات.

"نفر نفر نفر" بەکەنیزەکەی خۆی وت، لە ژورەکەی بڕواتە دەرەوە و من بۆ لای خۆی بانگ بکات و وتی: "سینۆهە"وەرە و دەست بەسەرمدا بهێنە و منیش بەخۆشی و تامەزرۆییەوە هەستام و دەستم بەنەوازشکردنی سەری کرد.

ژنەکە وتی: دەبێت بزانیت من لەو ژنانە نیم کە خۆی بەهەرزان بفرۆشێت و ئەو ماڵەی کە دوێنێ پێت بەخشیم شایستەی من نییە، ئەگەر حەز دەکەیت چێژم لێوەرگریت دەبێت ماڵی باوکیشتم پێ ببەخشیت، بۆئەوەی بزانم خۆمم بەهەرزان نەفرۆشتووە.

وتم:"نفر نفر نفر" دوێنێ تۆ بەڵێنت پێدام کە ئەمڕۆت لەگەڵ مندا تێپەڕێنی و باسی ماڵی باوکمت نەکرد.

ژنەکە وتی: لەبەرئەوەی دوێنێ هێشتا ئەو زانیاریەم پێ نەگەشتبوو کە دەستەڵاتی فرۆشتنی ماڵی باوکت هەیە و چیتر ئەوەی دوێنێ بوو لەگەڵ دوێنێدا ڕۆشت، ئەمرۆش ڕۆژێکی نوێیە، ئەگەر ماڵی باوکیشتم پێ ببەخشیت، ئەمڕۆ تا ئێوارە لەگەڵ مندا ڕادەبوێری، بەمەرجێك سەرەتا بڕۆیت و دادنوسەکە بهێنیت و

بەڵگەی گواستنەوەی ئەوماڵەشم پێ بدەیت، دوای ئەوە لەگەڵمدا ڕابوێرە، چونکە من متمانەم بەبەڵێنی پیاوان نیە، لەبەر ئەوەی درۆزنن.

وتم: "نفر نفر نفر" هەرچی تۆ پێم بڵێیت وا دەکەم.

ژنە منی لەخۆی دور کردەوە و وتی: سەرەتا بڕۆ دادنوسەکە بهێنە و کاری گواستنەوەی ماڵەکە تەواو بکە، دوای ئەوە من تا شەو هی تۆم.

من لەماڵ چومە دەرەوە و بۆ جارێکی تر دادنوسەکەم هێنایەوە، ئەمجارەیان ماڵی باوکم کە دەمزانی دوای گۆڕەکەیان تاکە دارایی و سامانی باوکمە دام بە"نفر نفر نفر".

کاتێك دادنوسەکە ویستی بڕوات، من زیوم پێ نەبوو پێی بدەم، بەڵام ژنە ئەنگوستیلەیەکی باریکی زیوی پێداو وتی: ئەمە کرێی ئەو کارەیە کە بۆئێمەت ئەنجامدا و دوای ئەوە دادنوسەکە لەماڵ ڕۆشتە دەرەوە.

ئەوکات"نفر نفر نفر" فەرمانی دا بەبەندەکانی خواردنی بەیانیمان بۆ بهێنن و ئەوانیش نان و ماسی سوێر و ئاوجۆیان بۆ هێناین، دوای ئەوە"نفر نفر نفر" وتی: ئەمڕۆ من تا ئێوارە هی تۆم و تۆ لەم ماڵەدا دەخۆیت و دەخۆیتەوە و لەگەڵ مندا ڕادەبوێری.

لەوکاتەوە تا کەمێك پێش ئاوابونی خۆر من لەماڵی"نفر نفر نفر"بوم، ئەویش بەسۆزەوە ڕەفتاری لەگەڵدا دەکردم و ڕێی پێدام نەوازشی سەری بکەم و دەیوت: من ئەمڕۆ دەبێت شتگەلێکت فێربکەم کە هێشتا فێری نەبویت و فێربونی ئەم شتانەش بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ خوشکێکتدا زۆر پێویستە، بەپێچەوانەشەوە ئەمشەو خوشکەکەت هیچ چێژێك لەنەوازشەکانی تۆ وەرناگرێت.

کاتێك خۆر گەشتە شوێنێك کەئاشکرابوو شەو نزیك بۆتەوە، ژنەکە پێی وتم: "سینۆهە"ئێستا بەتەنها جێمبهێڵە، چونکە ماندوم و دەبێت کەمێك بحەوێمەوە و بیر لەئاڕایشتی بەیانیم بکەمەوە. قژیشم کەمێك درێژ بووە ئەمشەو دەبێت بۆم بتاشن و ساف ببێتەوە، بۆئەوەی ئەگەر پیاوێکی تری وەك تۆ ویستی لەگەڵ مندا ڕابوێرێ، چێژ لەسافی سەرم وەرگرێت. منیش بەخەمی ئەوەی دەبێت لەم ژنە دور بکەومەوە ڕێگای ماڵی خۆم کە دەمزانی چیتر بەمنەوە پەیوەست نیە گرتە بەر و کاتێك گەشتمە ماڵەوە ئیتر شەو داهاتبوو.

کاتێك شەرمەزاری و پەشیمانی زۆر بەهێز بێت، هەندێکات لەتلیاك خەوهێنەر تر دەبێت و من لەو شەوەدا لەشەرم و پەشیمانی فرۆشتنی ماڵی باوکم خەوم لێکەوت و لەبەرئەوەی ڕۆژی پێشوو لەماڵی ئەو ژنە زۆرم خواردبوویەوە تا بەیانی بێدار نەبومەوە.

لەبەرەبەیاندا هەر کەچاوم کردەوە، ئەندامی جوان و نەرم و سەری سافی"نفر نفر نفر"م هاتەوە یاد و زانیم کە ناتوانم لەماڵدا بمێنمەوە، ئەویش لەماڵێکدا کە چیتر بەمنەوە پەیوەست نیە، بۆیە لەماڵ چومە دەرەوە و ڕێی ماڵی ئەو ژنەم گرتەبەر.

من وامدەزانی کە ئەو خەوتووە، بەڵام دەرکەوت بێدارە و لەباخچەکەیدایەتی کاتێك منی بینی پرسی: "سینۆهە" بۆچی هاتی و چیت لەمن دەوێت؟

وتم: هاتوم بۆئەوەی لەتەنیشت تۆدابم و وەك دوێنێ ئەوازشی سەرت بکەم و داوات لێ بکەم لەگەڵ مندا ڕابوێری.

ژنیش وتی: ئایا هیچت هەیە پێم بدەیت، بۆئەوەی ئەمڕۆ کاتەکانی خۆمت بۆ تەرخان بکەم.

وتم: ماڵی خۆم و ماڵی باوکمم پێداویت و چیتر هیچ شتێکی تر شك نابەم، بەڵام لەبەرئەوەی پزیشکمو دەرچوی قوتابخانەی ماڵی ژیانم، لەئایندەدا کاتێك دەوڵەمەندبوم، ئەو دیارییە کە ئەمڕۆ دەبێت بیدەم، وەك قەرزێك پێت دەدەمەوە.

"نفر نفر نفر" پێکەنی و وتی: ناتوانم متمانە بەبەڵێنی پیاوان بکەم، لەبەرئەوەی تا ئەوکاتە لەسەر بەڵێنەکەی خۆیان دەمێنن کە لەگەڵ ژنێکدا ڕادەبوێرن و هەرکە چەندجارێك لەگەڵیدا ڕایان بوارد و تێربوون، بەشێوەیەك ئەو ژنە لەیاد دەکەن کە تا دوا تەمەنیان بیریان نەکەوێتەوە. بەڵام لەبەرئەوەی توانیت پەیڕەوی لەڕێنماییەکانی من بکەیت و هونەری سود وەرگرتن لەژن فێر بوویت، لەوانەیە ئەمڕۆش حەز بکەم لەگەڵ تۆدا ڕابوێرم و ڕێگە چارەیەك بۆ دیاریەکەی ئەمڕۆ ببینمەوە.

من لەتەنیشت ئەوەوە دانیشتم و سەرم خستە سەر سینەی، ژنەکە فەرمانی بەبەندەکانی کرد کەخواردن و خواردنەوەمان بۆ بهێنن و وتی: لەبەر ئەوەی لەوانەیە ئەمڕۆ تۆ لەلای من بمێنیتەوە، بۆیە هەر لەئێستاوە دەست بەخواردن و خواردنەوە دەکەین.

دوای ئەوەی بۆ ماوەیەك خواردمانەوە"نفر نفر نفر" وتی: "سینۆهە" من بیستوومە کە باوك و دایکت خاوەنی گۆڕێکن کە دروستیان کردووە و ڕازاندویانەتەوە، لەبەرئەوەی دەستەڵاتی سامانی باوك و دایکت لەدەستی تۆدایە دەتوانی ئەم گۆڕەش بدەیت بەمن.

وتم: "نفر نفر نفر" ئەو قسەیەی تۆ دەیکەیت من گریرۆدەی"نەفرەت"دەکات، من بەچ شێوەیەك دەتوانم گۆڕی دایك و باوکم بەتۆ ببەخشم و ببمە هۆی ئەوەی ئەم جوتە بەدبەختە لەجیهانەکەی تردا بێ شوێن بن و جەستەیان وەك کەسە تاوانبار و کۆیلەکان هەڵدەنە ناو ڕوباری"نیل"ەوە.

"نفر نفر نفر" وتی: بۆچی ڕازی نیت کە دایك و باوکت بێ گۆڕ بن، بەڵام ڕازی دەبیت من خۆم هەڕاج فرۆش بکەم.

وتم: من دوێنێ و پێرێ دیاریەکم پێ بەخشیت، ئایا ئەم دوو دیاریە ئەوەندە بەهایان نیە کە تۆ ئەمڕۆ بێ ئەوەی هیچ دیاریەکی ترم لێ وەرگریت لەگەڵ مندا بەسەر بەریت؟

ژنەکە وتی: ئەم دوو دیاریەی کە تۆ دات بەمن بەهای نیو ڕۆژی جوانی من نەبوو، ئێستاش پیاوێکی خەڵکی وڵاتی"نێوان دوو ئاو"هاتووە و ئامادەیە لەبەرامبەر ئەوەی یەك ڕۆژ لەگەڵ ئەودا تێپەڕێنم، سەد"دین[34]" ئاڵتونی پاکم پێبدات.

دوای ئەوە پێکێکی تر شەرابی دامێ و وتی: ئەگەر حەز دەکەیت لەلای من بیت و هەرچەنێك کە خۆت بتەوێت من بکەیتە خوشکی خۆت، دەبێت گۆڕی باوك و دایکیشتم پێ ببەخشیت.

وتم: زۆر باشە.

هەر ئەوەی ژن زانی کە من بە بەخشینی گۆڕی دایك و باوکم ڕازی بوم، ناردی بەدوای کابرای داد نوسدا و ئەویش هات و بەڵگەنامەی بەخشینی گۆڕی دایك و باوکمی نوسی و بۆ جاری دووەم کرێی زەحمەتی پێدا، چونکە من هیچ شتێکم نەبوو بەوی بدەم.

---

[34] دین: یەکەی کێشانەی میسریە کە نزیکەی یەك گرام دەبێت.

ئەوکات پێی وتم: وەرە با ئەم باخە بەجێ بهێڵین و بڕۆینە ژوورەوە، چونکە باخ کەنیزەك و بەندەی تێدایە لەوانەیە بمانبینن، بۆیە لێرەدا ناتوانین لەگەڵ یەکتردا ڕابوێرین.

دوای ئەوەی ڕۆشتینە ژوورەوە"نفر نفر نفر" وتی: من ژنێکم کە بەڵێنەکانی خۆم دەبەمە سەر و تۆ لەئایندەدا ناڵێیت کە من فریو داویت. چونکە لەبەرئەوەی تۆ دیاریەکت پێ بەخشیوم، منیش تا ئێوارە لەلای تۆ دەبم و دەتوانی ئەو وانانەی کە دوێنێ فێرم کردیت ئەمرۆش بەکاریان بهێنی بۆئەوەی منیش بەهۆی بونی تۆوە لەم ماڵەدا کاتی خۆش بەسەر بەرم.

بەندەکان پێنج جۆر گۆشت و حەوت جۆر شیرینی و سێ جۆر خواردنەوەیان بۆ هێناین، بەڵام هەستم کرد کاتێك کارەکەرەکان دەکەونە پشتمەوە پێم پێدەکەنن و گاڵتەم پێ دەکەن، چونکە دەیانزانی من بگرە گۆڕی دایك و باوکیشم بە"نفر نفر نفر" داوە تەنها بۆئەوەی ڕۆژێکی تر لەلای ئەو بەسەر بەرم.

نازانم ئەو ڕۆژە بۆچی بەو خێراییە تێپەڕی و بۆچی ئەو خۆشیانەی کە مرۆڤ بە کانزاگەلێکی زۆر دەیانکڕێت لەماوەی چەند ساتێکدا کۆتاییان پێدێت، بەڵام ڕۆژە ناخۆشە کۆتاییان نیە.

کاتێکم زانی ڕۆژ کۆتایی پێهات و شەو داهات، "نفر نفر نفر" وتی: ئێستا کاتی ئەوەیە کە تۆ لەماڵەکەی من بڕۆیتە دەرەوە، چونکە شەوە و من ماندوم و دەبێت خۆم بۆ ڕۆژێکی تری ئاڕایشکردنم ئامادە بکەم.

وتم:"نفر نفر نفر" من حەز دەکەم ئەمشەویش لەلای تۆ بمێنم و سبەی بەیانیەکەی لێرە دەڕۆم.

ژنەیش وتی: بۆ ئەوەی ئەمشەو لەلای من بمێنیتەوە، دەتەوێت چیم پێ بدەیت؟

وتم: من چیتر هیچ شتێکم بەدەستەوە نەماوە کە پێتی بدەم و لەپێناو تۆدا بگرە دایك و باوکیشم لەجیهانەکەی تر بێ شوێن کردووە و ئێستا گرفتاری تووڕەیی"ئامون"م.

ژنەکە وتی: دەتوانی نەیەیت بۆ ئێرە، مەگەر من پێم وتویت بێیت بۆ ئێرە و لەگەڵمدا ڕابوێری؟

من پێداگری ئەوەم کرد کە شەو لەلای بمێنم،"نفر نفر نفر"یش وتی: نابێت چونکە ئەمشەو ئەو بازرگانەی کە لەوڵاتی"دوو ئاو"وەوە هاتووە، دەبێت بێت بۆ ئێرە و ئەویش لەبەرامبەر ئەم مانەوەیدا سەد"دین" ئاڵتونم دەداتێ و من ناتوانم چاوپۆشی لەو هەموو زێڕە بکەم. دووبارە ئەگەر تۆ شتێکت هەبوایە و بەمنت بدایە، لەوانەبوو کە من قەرەبوی هەندێك لەزیانەکانی خۆم بکردایەتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی هیچت نیە دەبێت لێرە برۆیت.

ئەوکات لەلام هەستا و ڕۆشت، بۆئەوەی بڕواتە ژورەکەی ترەوە و منیش دەستیم گرت بۆئەوەی ڕێ لەڕۆشتنی بگرم، لەوکاتەدا بەهۆی ئەو خواردنەوەیەی کە "نفر نفر نفر" پێیدابووم نەمدەزانی باسی چی دەکەم.

ژنەکە کاتێك بینی زۆر بەهێز دەستیم گرتووە و ناهێڵم بڕوات هاواری کرد و بەبەندەکانی خۆیی وت: چ کەسێك ڕێی بەئێوە دا ئەم سواڵکەرە بێننە ماڵەکەی منەوە. هەرئێستا ئەو لەم ماڵە دەکەنە دەرەوە و ئەگەر بەرگری لەڕۆشتنە دەرەوە کرد، ئەوکات بەدار لێی بدەن بۆئەوەی نەتوانێت بەرگری لەخۆی بکات.

بەندەکان هێرشیان بۆ هێنام و منیش سەرەڕای ئەوەی مەست بوم ویستم، بەرگری لەخۆم بکەم و نەڕۆمە دەرەوە، بەڵام ئەوان دار بەدەست ڕژانە سەرم و ئەوەندەیان لێدام کە خوێن لە سەر و ڕوخسار و سینە و زکم دەچۆڕا و دوای ئەوە گرتمیان و فڕێیاندامە دەرەوە.

کاتێك خەڵکی کۆبونەوە و پرسیان بۆچی ئەم پیاوەتان بریندار کردووە وتیان: لەبەرئەوەی سوکایەتی بە خانمەکەی ئێمە کردووە و هەرچی پێمان وت کە خانمی ئێمە ژنێك نیە کە خۆی بەهەرزان بفرۆشێت، هیچ گوێ لێنەگرتین و دەیویست بەزۆر لەگەڵ خانمەکەماندا ڕابوێرێت و ئێمەش ناچار بوین دەری بکەیت.

من ئەم قسانەم لەحاڵی نیوە بێهۆشیدا دەبیست و ئەوەندەیان کوتەك لێدابوم کە نەمدەتوانی هەنگاوبنێم، بۆیەهەرلەو شوێنەدا، بەوهەموو خوێن و برینەوە خەوم لێکەوت.

سەرلەبەیانی زوو بەهۆی دەنگی پێی ڕێبواران و دەنگی گالیسکەکان لەخەو هەستام. تەواوی جەستەم ئازاری دەکرد، مەستی شەرابیش بەتەواوی لەجەستەم

دەرچوبو. بەلأم ئەوەندەی هەستم بەئازاری شەرمەزاری و پەشیمانی دەکرد، ئەوەندە ئاگام لە ئازاری جەستەم نەبوو.

کەوتمە ڕێ و خۆم گەیاندە کەنار ڕوباری "نیل" و لەوێ خوێنی جەستەم بەئاوی نیل پاك کردەوە و دوای ئەوە ڕێگای دەرەوەی شارم گرتە بەر، چونکە ئەوەندە شەرمەزاربیووم کە نەمدەتوانی بگەڕێمەوە بۆ ماڵەکەی خۆم.

سێ ڕۆژ و سێ شەوم لەناو چڕە قامیشی کەنار ڕوباری "نیل" بەسەر برد و لەم ماوەیەدا بێجگە لەئاوو بڕێك گیای خۆراکی هیچ خواردنێکی ترم دەست نەکەوت.

دوای ئەو سێ ڕۆژە گەڕامەوە بۆ شار و ماڵەکەی خۆم، بینیم ناوی پزیشکێکی تر بەسەر دیواری ماڵەکەی مندا هەڵواسراوە و ئەم بابەتە ئەوە دەردەخات کە دەستیان بەسەر ماڵەکەشمدا گرتووە.

بەندە کۆنەکەم"کاپتا"لەو ماڵە هاتە دەرەوە و کاتێك منی بینی دەستی کرد بەگریان و وتی: خاوەنە بەدبەختەکەم، خانووەکەی تۆ پزیشکێکی لاو دەستی بەسەردا گرتووە و من ئێستا بەندەی ئەوم و کاری بۆ دەکەم.

دوای ئەوە وتی: ئەگەر بمتوانیایە تاکە چاوەکەی خۆم بەتۆ دەدا بۆئەوەی لەم بەدبەختیە ڕزگارت بکەم، چونکە دایك و باوکت کۆچی دواییان کردووە.

وتم: پەنا بۆ"ئامون"دوای ئەوە دەستەکانم بەرز کردەوە و پرسیم: بەچ شێوەیەك دایك و باوکم مردن؟

"کاپتا"وتی: لەبەرئەوەی تۆ ماڵەکەی ئەوانت فرۆشتبوو، ئەمڕۆ سەر لەبەیانیەکەی لەلایەن دادوەری مەزنەوە ڕۆشتن تاکو ئەوان لەماڵەکەیان دەربکەن و دەست بەسەر ماڵەکەیاندا بگرن و بیدەن بەخاوەنە ڕاستەقینەکەی، بەلأم دایك و باوکت تەخت لەسەر زەوی کەتبون و جوڵەیان نەدەکرد، هێشتا ڕوننەبۆتەوە ئایا مردون یان هەر دوای ئەوەی زانیویانە لەماڵەکەیاندا دەریاندەکەن زەهریان خواردۆتەوە و کۆتاییان بەژیانی خۆیان هێناوە، بەلأم تۆ دەتوانی بڕۆیت و لاشەکەیان کە هێشتا لەو ماڵەدایە ببەیتە مردووخانە.

وتم: ئایا تۆ چاوت بەدایك و باوکم کەوت؟

"کاپتا" وتی: دوێنێ خاوەنەکەم تازە هاتبوو بۆئەوەی سەردانم بکات و دایکیشی کارێکی زۆری بەسەردا دام، بینیم باوکت هاتووە بۆ ئێرە.

لەبەرئەوەی باوکت کوێرە، نەیدەتوانی ڕێ بکات و دایکیشت دەستی گرتبوو و هەردوکیان هاتبون بۆئەوەی چاویان بەتۆ بکەوێت، من تێگەشتم کە دایکیشت بەهۆی پیرییەوە نەیدەتوانی ڕێ بکات.

ئەوان دەیانوت کە کاربەدەستانی دادوەری مەزن هاتون بۆماڵ و مۆریان لەهەموو شتێك داوەو وتیان ئەمانە دەبێت هەر ئێستا ئەم ماڵە چۆڵ بکەن ئەگینا هەردوکیا بەزۆر دەکەینە دەرەوە.

باوکیشت لەکاربەدەستانی پرسی بوو کە بۆچی دەیانەوێت ئەوان لەو ماڵە بکەنە دەرەوە. ئەوانیش لەوەڵامدا وتبویان کە"سینۆهە" کوڕەکەی ئێوە ئەم ماڵەی داوە بەژنێکی بەدناو، تەنها بۆئەوەی بتوانێت چێژی لێ وەرگرێت.

باوکت داوای لێ دەکردم، پێت بڵێم کە سەردانی بکەیت، بەڵام من نەمدەزانی تۆ لەکوێیت؟

ئەوکات باوکت کە کوێر بوو، ویستی شتێك بنوسێت و بیدات بەمن، وتی"کاپتا" پارچە مسێکی باریکم پێ بدە بۆئەوەی بتوانم لەڕێی دادنوسێکەوە نامەیەك بنوسم، بۆئەوەی هەرکاتێك کۆچی دواییم کرد ئەو نامەیە بکەوێتە دەستی کوڕەکەم.

منیش پارچە مسێکی باریکم لەپاشەکەوتەکانی خۆم دا بەباوکت، دوای ئەوە لەگەڵ دایکتدا ڕۆشتن.

وتم: "کاپتا" ئایا باوکم لەڕێی تۆوە هیچ پەیامێکی بۆ بەجێ نەهێشتم، بەندەکەش وتی نەخێر.

دڵم لەناو سینەمدا لەبەرد ڕەقتر ببو، بەشێوەیەك کە نەمدەتوانی لەسەر پێی خۆم بوەستم، بۆیە لەسەر زەوی دانیشتم و وتم:"کاپتا" هەرچی پاشەکەوتی زیو و مست هەیە بیانهێنە و بیدە بەمن، چونکە ئێستا کە دایك و باوکم مردون، من بۆ مۆمیاکردنی ئەوان بەئەندازەی گەردێکی خۆڵ کانزا شك نابەم.

ئەگەر من زیندوو بمێنم مس و زیوەکەت بۆ دەگەڕێنمەوە و ئەگەر زیندوش نەمێنم"ئامون" پاداشتت دەداتەوە.

"کاپتا"دەستی کرد بەگریان و وتی: ئەگەر تۆ داوای تاکە چاوەکەشم بکەیت، ئامادەم پێتی ببەخشم، بەڵام زیو و مسم نیە.

بەڵام ئەوەندە پێداگریم لەسەر کرد تا ڕۆشت و دوای ئەوەی بەوردی تەماشای چواردەوری خۆی کرد بۆئەوەی هیچ کەسێك چاوی لێی نەبێت، بەردێکی لەباخچەکەدا هەڵکەند و لەژێر ئەو بەردەکۆنەدا شتێکی دەرهێنا و ئەوەی لەو شتەدا بوو، بریتی بوو لەچەند پارەچە زیو و مسێك، دوای ئەوە دای بەمن و وتی:

ئەی خاوەنە دێرین و خۆشەویستەکەم ئەم زیو و مسەی کە بەتۆی دەدەم پاشەکەوتی تەمەنی منە و بێ لەوانە لەم جیهانەدا هیچ شتێکی تر شك نابەم.

منیش وتم: "کاپتا"لەبەرئەوەی پزیشکم ئەگەر زیندوو بمێنم دە ئەوەندەت پێ دەدەمەوە.

من دەمتوانی بڕۆم و لەو بارودۆخە سەختەدا قەرز لە"پاتور" پزیشکی فەرمانڕەوا و لە "توتمس" بکەم، بەڵام لاوێکی بێئەزمون بوم و وامدەزانی ئەگەر قەرزیان لێ بکەم، کەسایەتی خۆم لەلای ئەواندا لەدەست دەدەم.

کاتێك ڕۆشتم بۆ ماڵی دایك و باوکم بینیم دراوسێکانم کۆبونەتەوە و ڕوخساری دایك و باوکم ڕەشە، لەناوەڕاستی ژورەکەدا هێشتا ئاگر لەناو مقەڵیەکی گڵیندا ماوە.

تێگەشتم کە دایك و باوکم لەڕێی دوکەڵی خەڵوزەوە خۆیان کوشتووە و مەقەڵی مەزنیان پڕ کردووە لەخەڵوز و ئاگریان تێ بەرداوە، لەبەرئەوەی دەرگای ژوورەکان داخرابوون کۆچی دواییان کردووە.

دایك و باوکمم لەپارچە قوماشێك پێچا و داوای ولاخدارێکم کرد و پارچە مسێکم پێدا و پێم وت دایك و باوکم ببە بۆ مردووخانە.

لەوێ ئامادە نەبون دایك و باوکم وەرگرن و دەیانوت کە سەرەتا دەبێت پارەی مۆمیاکردنی ئەو دوو کەسە بدەیت، بۆئەوەی سەرەتا بیانخەینە ناو سوێراوەوە.

من دەموت تا ئەوکاتەی ئێوە مۆمیایان دەکەن من کرێی کارەکەتان بۆ پەیدا دەکەم، بەڵام کرێکارانی مردوخانە ئەم پێشنیارەی منیان پەسەند نەکرد.

تا ئەوەی کرێکارێکی بەتەمەن کە لەکاتی مۆمیاکردنی لاشەی فیرعەوندا بوبو بەهاوڕێم و لەوێدا زۆر دەستەڵاتی هەبوو، پشتگیری ئەوەی لێکردم کە کرێی مۆمیاکردنی دایك و باوکم بەیەکجار یان بەش بەش بدەم.

دوای ئەوەی بازنەیەکی پەتینیان لەپێی باوك و دایکم بەست بۆئەوەی لەناو مردووەکانی تر دیاربن، خستنیانە ناو هەسێرێکی سوێراوی تایبەت بەکەسە هەژارەکانەوە.

کاتێك دڵنیابوم کە لاشەیان لەناو سوێراودا جێگیر بووە گەڕامەوە بۆماڵ، بۆئەوەی ئەو پارچە قوماشەی کە لەوێدا هەڵمگرت و دایك و باوکم تێوە پێچابوو بگەڕێنمەوە.

چونکە چیتر ئەو پارچە قوماشە بەئێمەوە پەیوەست نەبوو، هی خاوەن ماڵی تازە بوو، هەرکاتێك من ئەو پارچە قوماشەم دەق بکردایە دزییەك دەکرا.

کاتێك دەمویست لەماڵ بچمە دەرەوە و سەردانی "مردووخانە"کە بکەم، پیاوێك کە لەگۆشەیەکی نزیك دوکانی نانەواکەوە دادەنیشت و نامەی دەنوسی هەستایە سەرپێ و هاواری کرد...سینۆهە.....سینۆهە.

منیش خۆم لێ نزیك کردەوە و ئەویش پاپیرۆسێکی پێدام و وتی: ئەم نامەیە باوکت بۆی نوسیویت و ڕایسپاردبووم کاتێك تۆم بینی پێتی بدەم.

منیش نامەکەم کردەوەو بەمشێوەیە خوێندمەوە:(سینۆهە، کوڕی خۆشەویستمان، بەهۆی ئەوەیکە ماڵ و گۆڕەکەی ئێمەت فرۆشتووە خەمگین مەبە، چونکە باشتر وایە ئێمە گۆڕمان نەبێتو بەتەواوی لەناو بچین بۆئەوەی لەجیهانەکەی تردا توشی ئەرکی گەشتی درێژخایەنی ئەو جیهانەی تر نەبین، تۆ کاتێك هاتیت بۆ ماڵی ئێمە، ئێمە هەردوکمان پیر بوین و هاتنی تۆ بۆ ماڵی ئێمە، دواین ساڵەکانی تەمەنی ئێمەی لێوانلێوی خۆشی کرد و بویتە مایەی شادیمان، بەو هیوایەی منداڵەکانی تۆش ببنە مایەی خۆشبەختیت، ئێمە بەخەیاڵێکی ئاسودەوە ئەم جیهانە بەجێ دەهێڵین و بێ گۆڕ بەرەو ڕوی نەبونێکی ڕەها هەنگاو دەنێین، بەڵام دەزانین کە تۆ حەزت نەکردووە ئێمە بێ گۆڕ بین، بەڵکو ئەو ڕوداوەی کە تۆ دەستەڵاتت بەسەریدا نەشکاوە، بووە هۆی ئەوەی ئەم کارەساتە بێتە پێش)

کاتێك من ئەم نامەیەم خوێندەوە بۆماوەیەك گریام و هەرچی نوسەری ئەو نامەیە هەوڵی ئەوەی دەدا دڵنەواییم بداتەوە، بەڵام من هێور نەدەبومەوە، کاتێك فرمێسکی چاوەکانم تەواو بون بە نامەنوسەکەم وت من هیچ جۆرە کانزایەکم پێ نیە کە لەبەرامبەر گەیاندنی ئەم نامەیەدا بەتۆی بدەم، بەڵام ئامادەم لەبەرامبەردا نیوەی پۆشاکەکانی خۆمت پێ بدەم.

نیوەی پۆشاکەکانی خۆمم دا بەنوسەری نامەکە و ئەویش بەسەر سوڕمانەوە جلەکانی لیّ وەرگرتم و بۆماوەیەك تەماشای کردن بۆئەوەی بزانێت ئایا گرانبەها و نوێن یان نە، لەناکاو خۆشحالّ بوو و وتی:"سینۆهە" سەرەڕای ئەوەی خەڵکی باسی خراپەی تۆ دەکەن و دەڵێن کە تۆ ماڵی دایك و باوکت و بگرە گۆڕی ئەوانیشت فرۆشتووە و ئەوانت لەجیهانەکەی تردا بیّ شوێن و مالّ کردووە، دەستکراوەیی تۆ لەڕادە بەدەرە و چیتر لەمەودوا هەرکەسێك بیەوێت باسی خراپەی تۆ بکات بەرگریت لیّ دەکەم.

بەلاّم ئێستا کە تۆ نیوەی پۆشاکەکەی خۆتت بەمن داوە، خۆت بەنیوە پۆشاك ماویتەوە، خۆری گەرمیش دەدات لەشان و جەستەت و جەستەت دەسوتێنیّ و خوێن و کێمی لێدێت.

وتم: تۆ نازانی بەگەیاندنی ئەم نامەیە چ خزمەتێکت بەمن کردووە و بەچ شێوەیەك منت خۆشحالّ کردووە، بۆیە تۆ نیوەی پۆشاکەکەم هەڵگرە و خەمی منت نەبیّ.

کاتێك ئەو پیاوە ڕۆشت من جگە لەو دەستە جلە، هیچی ترم شك نەدەبرد و ڕێگای مردووخانەکەم گرتە بەر، بۆ ئەوەی لەویّ وەك کرێکارێکی ئاسایی کار بکەم، تا ئەوکاتەی مومیاکردنی تەرمی دایك و باوکم تەواو دەبێت.

وەستای پیری مردووخانە کە لەڕابردوودا منی دەناسی بە"راموز" بانگیان دەکرد، پێم وت: من حەز دەکەم ببمە شاگردی ئەوو لەگەڵیدا کار بکەم. ئەویش وتی: من زۆریش خۆشحالّ دەبم کە تۆ وەك شاگردی خۆم پەسەند بکەم، بەلاّم تۆ دەرچوی قوتابخانەی ماڵی ژیانی و پزیشکیت، بەچ شێوەیەك خۆت ڕازی کردووە کە بێیت و لێرەدا ببیتە شاگردی من.

وتم: پەیوەست بونم بەژنێکەوە منی ڕسوا کردووە، ئەو ژنە هەرچیم هەبوو لێی داگیر کردم و ئەمرۆ نە نەخۆشخانەم هەیە و نەماڵێك کە بتوانم کاری پزیشکی تێدا بکەم، کەسێکیش نیە کەبتوانم زێڕو زیوی بەقەرز لێوەرگرمو ماڵێك بکڕم. "راموز"یش بەدەم بیرکردنەوەوە سەرێکی ڕاوەشاندو وتی: هەرجارێك دەبیستم کە پیاوێك بەدبەخت بووە تێدەگەم کە ژنێك دەستی لەبەدبەختکردنیدا هەیە.

من ماوەی چل ڕۆژ و چل شەوم لەمردووخانەدا بەسەربرد و لەو ماوەیەدا وەك یەکێك لەڕسواترین کرێکارانی ئەو دەزگایە سەرقاڵی مومیاکردنی لاشەی مردووەکان

بوم، کرێکارەکان لەبەرئەوەی دەیانزانی کەمن لەچینی ئەوان نیم و بەدبەختی منی هێناوەتە مردووخانە، پیسترین کاریان بەمن دەسپارد، بۆئەوەی لەم ڕێیەوە – لەبەرئەوەی کە لەوان خوێندەوارترم و بڕوانامەی درچونم هەیە– تۆڵەم لێ بکەنەوە.

منیش بەناچاری فەرمانەکانی ئەوانم لەکاتی خۆیدا ئەنجام دەدا، بۆئەوەی بتوانم دایك و باوکم مۆمیا بکەم، تاکە خۆشبەختی من ئەوە بوو کە بتوانم دایك و باوکی خۆم وەك یەکێك لەکەسە دەوڵەمەندەکان مۆمیا بکەم.

بەدەستی خۆم، بەسۆز و خۆشەویستیەکەوە ورگ و سینەی دایك و باوکمم لەت کرد و گەدە و ڕیخۆڵە و دڵ و سی و گورچیلە و ئەندامە هەناویەکانی تری ئەوانم دەرهێنا و سکیانم پڕکرد لەقامیشی پڕ لە ڕۆن، هەر بەوشێوەیەی کە لە مردووخانەدا لەکاتی مۆمیاکردنی تەرمی فیرعەوندا فێر ببوم.

ئەوکات دەقاودەق بەپێی ڕەوشی "راموز" کە جاری پێشوو، لە مردووخانەدا بینیبووم، مێشکی دایك و باوکم لەڕێی کونکردنی لوتیانەوە دەرهێنا و ناو کاسەی سەریانم پڕکرد لەڕۆنی مۆمیایی[٣٥].

دایك و باوکم ددانی دروستکراویان نەبوو و منیش هێشتا ددانی دروستکراوم نیە، ئەگەر زووتر پەیم بەم داهێنانە ببردایە، دوو تاقم ددانی دەستکردم بۆ دایك و باوکم دروست دەکرد کە لەجیهانەکەی تردا بتوانن بەئاسودەیی نان بخۆن[٣٦].

ئەی خوداکان گەواهی دەربن کە من بۆ مۆمیاکردنی لاشەی دایك و باوکم ڕۆن و دەرمان و پارچە قوماشی مردووخانەم نەدزیوە، بەڵکو وەك کرێکارێکی ڕسوا....وەك بەندەیێك....لێرەدا کارم کردووە و خواردنی خۆشم نەخواردووە و شەرابم نەنۆشیوە و ئەو پارچە مسانەی کە لەبەرامبەر کارەکەمدا پێیان دەدام ڕۆن و دەرمان و پارچە قوماشم پێ کڕیوە، بۆئەوەی مۆمیاکردنی دایك و باوکمی پێ تەواو بکەم.

[35] ڕۆنی مۆمیا هەمان ئەوشتەیە کە ئێمە لەم سەردەمەدا بە قیر ناوی دەبەین.

[36] سینۆهە گێڕەوەری ئەم بەسەرهاتە بەو شێوەیەی کە خۆی لەم کتێبەدا باسی دەکات داهێنەری ددانی دروستکراوە و ئەمەش سەلێنەری ئەوەیە کە توانیویەتی ددانی دروستکراو لەمادەیەکی جیاواز لە عاجی فیل دروست بکات و پێش ئەو، ددانی دروستکراویان بەوشێوەیەی باسیان کردووە تەنها لەعاجی فیل دروست کردووە، لەبەرئەوەش کەسە هەژارەکان نەیانتوانی ببنە خاوەنی ددانی دروستکراو، چونکە ئەوەندە پارەیان نەبوو کە ددانێکی ئاوای پێ بکڕن.

لە"گەرم خانە"دا تەواوی ئەو ڕۆنەی لەناو کاسەی سەر و سینە و سکی دایك و باوکمدا بوو ڕۆچووە ناو گۆشتی جەستەیانەوە و دوای ئەوەی گۆشتەکە وشك بوو هەرچی ئاو لەناو گەردەکانی گۆشتیاندا بوو، بوون بەهەڵم.

کاتێك کۆتایی بەدوایین قۆناخ هات، زانیم کە دەبێت لاشەی دایك و باوکم لەمردووخانە دەربکەم، ئاگاداری ئەوە بووم کە کێشی جەستەی دایك و باوکم، یەك لەسەر سێ کەمی کردووە بەبەراورد لەگەڵ ئەوکاتەدا کە هێنامن بۆ ئێرە.

لەو چل شەو و ڕۆژەی من لەمردووخانەدا بووم، ڕەفتاری کرێکارانی بەدڕەفتار و زبری ئەوێ لەبەرامبەر مندا گۆڕانکاری بەسەردا هات و لەجاران باشتر بوون، گەرچی بەردەوام جنێویان پێدەدام و سوکایەتیان پێدەکردم، بەڵام هیچ توڕەیی و ڕقێکیان لەبەرامبەرمدا نەبوو، سوکایەتیەکانی ئەوان بەشێك بوو لەسروشتیان، لەبەرئەوە نەیاندەتوانی گۆڕانکاری لەخۆیاندا دروست بکەن.

کاتێك ئاگاداری ئەوە بوون دەمەوێت تەرمی دایك و باوکم لە مردووخانە دەربکەم هاوکاریان کردم و لەدەرامەتی کانزاکانی خۆم پێستی مانگایەکی باشیان بۆ کڕیم، منیش تەرمی دایك و باوکمم خستە ناو پێستی مانگاکەوە و بەپەتێکی چەرم دورینمەوە.

ئەو ڕۆژەی دەمویست لەماڵی مەرگ بێمە دەرەوە"راموز" پێی وتم: لێرە مەڕۆ و تا دوایین تەمەنت لێرە بمێنەرەوە، چونکە دەرامەتی کرێکارێکی مردووخانە لە پزیشکی فەرمانڕەوایان کەمتر نیە و تۆ ئەگەر تەنها نیوەی دەرامەتی خۆت پاشەکەوت بکەیت، لەسەردەمی پیریدا وەك یەکێك لەکاهینەکان ژیانی خۆت بەسەر دەبەیت و دەبیتە خاوەنی بەندە و کەنزەکیش، چونکە خەڵکی ڕقیان لەکارکردنی ئێرەیە، ڕکابەریمان لەگەڵدا ناکەن، بەڵام من نەمدەتوانی لەوێ بمێنمەوە، لەبەرئەوەی لەدڵی خۆمدا بیرم لەوە دەکردەوە، ئەو پیاوەی دەتوانێت کارێکی مەزنتر ئەنجام بدات نابێت خۆی بەکاری بچوکەوە سەرقاڵ بکات.

لەنێوەندی جنێو و پێکەنین و گاڵتەجاڕی کرێکارەکاندا ماڵئاواییم لە"راموز" کرد و چەرمی مانگاکە کەتەرمی دایك و باوکمی تێدابوو خستە سەر شانم و لەمردووخانە هاتمە دەرەوە.

خەڵکی لەکۆڵانەکاندا لێم دور دەکەوتنەوە و لوتی خۆیان دەگرت بۆئەوەی بۆنی من بەرلوتیان نەکەوێت، چونکە بەجۆرێك بونی مردووخانە لەمنەوە بەر لوتیان دەکەوت کە هەموویانی بێزاردەکرد و ترسیان لێدەنیشت.

"تبس"دووشاری مەزنی لیّ بوو، یەکێکیان شاری زیندووەکان و ئەویتریان شاری مردووەکان، شاری مردووەکان دەکەوێتە ئەوبەری"نیل"ەوە و لەکاتی شەودا، شاری مردووەکان بەواتا ناوەندی گۆڕی مردووەکان، لەشارەکان باشتر پارێزگاریان لیّ دەکرا.

من دەمزانی کە مەحاڵە بتوانم خۆم بکەم بەشاری مردووەکاندا، لەبەرئەوەی پاسەوانەکان دەستبەجیّ دەیانکوشتم، بەڵام دەمتوانی خۆم بە دۆڵی فەرمانڕەوایاندا بکەم. دۆڵی فەرمانڕەوایانیش دەکەوێتە ئەوبەری نیلەوە، بەڵام لەسەرەوەی شاری مردووەکانەوە دەکەوێتە بەشی باشوریەوە و تەواوی فیرعەونەکانی میسر لەسەرەتای دروستبونی جیهانەوە تا ئەمڕۆ لەدۆڵی فەرمانڕوایاندا نێژراون.

لەشەودا، بەوشێوەی کە شاری مردووەکان لەژێر پارێزگاری پاسەوانەکاندایە، بەڵام دۆڵی فەرمانڕەوایان وانیە، لەبەرئەوەی پاسەوانان و خەڵکی دەزانن کە کاهینەکان کاتێك فیرعەونێك لەگۆڕ دەنێن، بەشێوەیەك گۆڕەکەی تەلیسماوی دەکەن کە هەر کەسێك بیەوێت خۆی بکات بە گۆڕستانی مردووەکاندا دەمرێت.

من بەهیچ شێوەیەك باوەڕم بەتەلیسم نیەو لەوباوەڕەدانیم کە تەلیسم بتوانێت مرۆڤ بکوژێت، بەڵام وای بۆ دەچم کە کاهینەکانی میسر دوای ئەوەی فیرعەونێك دەنێژن، دار و دیوار و تەواوی شتەکانی ناو گۆڕستان بگرە خودی تەرمی فیرعەونیش ئالودەی جۆرێك زەهر دەکەن کە بەهۆی تێپەڕبونی کاتیش لەناو نەچێت و ئەو کاریگەریەی بێنێت، ئەگەر کەسێك بۆ دزی کردن بێتە ناو ئەم گۆڕستانەوە و بیەوێت کەلوپەلی گرانبەهای ناو گۆڕستانەکە ببات بەهۆی ئەو زەهرەوە دەمرێت. بەڵام من خوازیاری مەرگ بوم و پێشوازیم لێدەکرد و بەخۆمم دەوت ئەگەر من بتوانم گۆڕێك بۆ دایك و باوکم بەدەست بهێنم چیتر مردن بەلامەوە گرنگ نیە.

گرنگ ئەوەیە دایك و باوکم لەناو نەچن و لەجیهانێکی تردا بژین و دەست بەگەشتە درێژخایەنەکەی خۆیان بکەن، بۆئەوەیش لەناو نەچن دەبێت لاشەیان

لەگۆڕێکدا بنێژرێت، ئەگینا تەرمی مۆمیایی کراو بەهۆی هەواو و شیٚ هەڵدەوەشێت و لەناو دەچێت.

لە ڕۆژدا تەرمی دایك و باوکم خستە سەرشانم و ڕۆشتم بۆ بیابان بۆئەوەی هیچ کەسێك نەمبینێت و کاتێك شەو داهات چاوەڕێم کرد کەمێکیش بەسەر تاریکیدا تێپەڕێت و چەقەڵ و کەمتیارەکان بێنە دەنگ، ئەوکات گەڕامەوە بۆشار و زەنگنێکم بۆ هەڵکەندنی زەوی کڕی.

کاتێك گەشتمە دۆڵی فەرمانڕەوایان، نیوەی شەو تێپەڕیبوو، سەرەڕای ئەوەی دەمبینی کە مارەکان لەبنی درەختە کورتەباڵاکانەوە تێدەپەڕین، بەڵام سەرەڕای ئەوەش لێیان نەدەترسام و لەچەند شوێنێکیشدا چاوم بەمارەکوڵەکان"دوو پشك" کەوت، بەڵام لەوانیش نەدەترسام، چونکە داوای مەرگم لەخوداکان دەکرد، بنەمای سەرەکیش ئەوەیە کاتێك مرۆڤ خوازیار مەرگ بێت، مەرگ بەلایدا ناچێت.

من هیچ زانیاریەکم لەبنکەی پاسەوانیەکان نەبوو و نەمدەتوانی خۆمیان لیٚ بپارێزم، بەڵام هیچ یەك لەوانە چاویان بەمن نەکەوت و نەبونە ڕێگرم، لەوانەشە منیان بینیبێت و وایان زانیبێت یەکێکم لەو مردووانەی کە کەرەستە و خواردەمەنی خۆمم بەشانم هەڵگرتبێت و بەنێو گۆڕی فیرعەونەکاندا هاتوو چۆ دەکەم.

بۆماوەیەك بەنێو گۆڕی فیرعەونەکاندا هاتوچۆم کرد و بەدوای گۆڕێکدا دەگەڕام کە بتوانم دەرگای گۆڕەکەی بکەمەوە و تەرمی دایك و باوکمی تیٚ بکەم، بەڵام ئاگاداری ئەوە بووم کە تەواوی دەرگاکان بەستراون و کردنەوەی دەرگا دەبێتە هۆی لەدایك بونی گومان، لەمکاتەدا پاسەوانەکان ئاگاداری ئەوە دەبن کە مردوویەك لەگۆڕی فیرعەوندا نێژراوە.

من لەمەرگ ناترسم و ئەوەی بەناوی تەلیسمی فیرعەون بانگی دەکەن بەهیچ شێوەیەك نامتۆقێنیٚ، ئەگەر بمتوانیایە گۆڕێك بۆ دایك و باوکم فەراهەم بکەم خەیاڵم ئاسودە دەبو، ئەگەر بشمزانیایە دوای ئەو کارەم دەمرم.

کاتێك تێگەشتم ناتوانم دەرگای هیچ یەك لەگۆڕەکان بکەمەوە، لەپاڵ یەکێك گۆڕەکانی دەرەوەی دەرگاکە بەهۆی ئەو زەنگنەی کە لەگەڵ خۆمدا هێنابوم گۆڕێکم لەناو خاکێکی لمیدا هەڵکەند و بۆ دەرکردنی خۆڵی ناو گۆڕەکە بیٚ لەدەستەکانم هیچ

شتێکی ترم شك نەدەبرد و دەستەکانیشم بەهۆی بەرکەوتنی لەگەڵ زووخە بەردەکاندا بریندار و خوێناوی بوون، بەڵام من هیچ گرنگیەکم پێ نەدەدان.

ئەوەندە ئەو چاڵەم کەند تاکو بووە چاڵێکی قوڵ بەئەندازەی گونجاندنی لەگەڵ جەستەی دایك و باوکم، دوای ئەوە چەرمی گاکەم خستە ناو چاڵەکەوە و خۆڵم بەسەرێداکرد، لەبەرئەوەی بنی گۆڕی فیرعەون لم بوو هیچ گرفتێکم لە لەسڕینەوەی شوێن دەست و پێیەکانم نەبوو.

ئەوکات هەناسەیەکی ئاسودەییم هەڵکێشا، چونکە دڵنیابوم کە دایك و باوکم بەهۆی ئەوەی کە لەپاڵ فیرعەوندان لەجیهانەکەی تردا لەڕوی خواردن و خواردنەوەوە هیچ گرفتێکیان نابێت، چونکە بەردەوام لەگەڵ فیرعەندا ژیان بەسەر دەبەن و سود لەنان و گۆشت و شەرابی ئەو وەردەگرن.

کاتێك سەرقاڵی ڕشتنی خۆڵ بوم بەسەر تەرمەکەیاندا، دەستم بەرشتێکی ڕەق کەوت و کاتێك هەڵمگرت بینیم شتێکی خڕی بچوکە و بەدەوری ئەو شتە خڕەدا بەردی گرانبەهایان پێوە لکاندووە، تێگەشتم لەو شت و مەکانەیە کە لەکاتی ناشتنی لاشەی فیرعەون لەگەڵ خۆیاندا دەیانبرد بۆئەوێ و لەوێدا لێیان کەوتووەو دوای ئەوە بەهۆی تەلاری ئارامگای فیرعەونەوە کەوتووەتە ژێر خۆڵەوە.

ئەو شتە خڕەم هەڵگرت و دوای ئەوە دەستم بەرز کردەوە و ماڵئاواییم لەدایك و باوکم کرد و وتم: هیوادارم لاشەتان بۆ هەمیشە بمێنێتەوە.

کاتێك لەدۆڵی فەرمانڕەوایان چومە دەرەوە و خۆم گەیاندەوە کەنار ڕوباری"نیل"، گزنگی بەرەبەیان لەهەڵهاتندا بوو، هەر لەوێدا زەنگنەکەم فڕێدایە ڕوبارەکەوە و لەتەنیشت ڕوبارەکەوە ڕاکشام، بەڵام بەهۆی ماندویەتی و ئازاری جەستەم خەوم لێ نەدەکەوت.

تا دواجار ماندوویەتی لەڕادەبەدەر لەهۆش خۆمی بردم، وابزانم خەوم لێکەوت و کاتێك دەنگی مراویەکان بەرز بویەوە لەخەو ڕاچەنیمو بینیم خۆر هەڵهاتووە و لەڕوباری"نیل"دا کەشتی و قایخەکان سەرقاڵی هات و چۆن و ژنانی جل شۆریش لەکەنار ڕوبارەکەدا سەرقاڵی قسەکردن و جل شۆردنن.

بەرەبەیانێکی ڕوناك و هیوابەخش بوو، بەڵام دڵی من خەمگین بوو، بەڕادەیەك کە هەستم بەجەستەی خۆم نەدەکرد. جلەکانم تەنها نیوەی جەستەمی دادەپۆشی و

گەرمی خۆر پشتی سوتاندبووم و پارچە مسێکم شك نەدەبرد تا نان و ئاوجۆی پێبکرم.

جەستەم بۆنی دزێوی مردووخانەی لێدەهات، چونکە هێشتا لە"نیل"دا خۆم نەشۆردبوو.

من بەو هەلومەرجە نالەبارەمەوە نەمدەتوانی ڕوو لەهاوڕێکانم بکەم و داوای هاوکاریان لێ بکەم، لەبەرئەوە ئەگەر بەو حاڵەوە چاویان بەمن بکەوتایە، ئاگاداری ئەوە دەبون کە گرفتاری نەفرەتی خودایەك بوم و چیتر هەموو کەسێك ئاگاداری ئەوە بووە کە من ماڵی خۆم و دایك و باوکم بگرە قەبرەکەشیانم لەپێناو ژنێکدا فرۆشتووە، نەمدەتوانی بەم هەموو بەدناویەوە، خۆمیان لێ نزیك بکەمەوە.

بیرم لەوە دەکردەوە چی بکەم و بەچ شێوەیەك سکم تێر بکەم، لەناکاو ئاگاداری ئەوە بووم کە مرۆڤێك لەنزیکمەوە دەجولێت. بەڕادەیەك سەروچاوی ئەو پیاوە ترسناك بوو کە من لەو کاتەدا ڕاستەوخۆ وامدەزانی مرۆڤ نیە، چونکە لەباتی لوت کونێکی فراون لەناوەڕاستی ڕوخساریدا بەدی دەکرا، هەروەها هەردوو گوێی نەبوو، دیار بوو کە گوێکانیان بڕیوە.

ئەو پیاوە لاواز دەبینراو دەستێکی گەورە و کلۆسنی هەبوو، کاتێك پەیی بەوە برد کەمن ئاگاداری بووم، پرسی: ئەو شتەی لەناو دەستە داخراوەکانتدایە چیە؟

منیش دەستم کردەوە و ئەو پیاوە چاوی بەگۆی فیرعەون کەوت و ناسیەوە و وتی: بیدە بەمن چونکە من بەختێکی شوومم هەیە و زۆر پێویستم بە بەختێکی باشەو بیستومە کە هەرکەسێك گۆیەکی وای هەبێت خۆشبەخت دەبێت.

وتم: من پیاوێکی هەژارم و جگە لەوە هیچ شتێکی تر شك نابەم و دەمەوێت لەلای خۆم بیپارێزم بۆئەوەی ببێتە هۆی بەختەوەریم.

پیاوەکە وتی: سەرەڕای ئەوەی منیش هەژارم و تۆش هەژاریت، ئامادەم لەبەرامبەر ئەو گۆیەدا، ئەنگوستیلەیەکی زیوینت پێ بدەم.

دوای ئەوە ئەنگوستیلەیەکی زیوینی لەژێر کەمەربەندەکەیەوە دەرهێنا و ئاڕاستەی منی کرد و منیش وتم : گۆی خۆم نافرۆشم.

ئەوپیاوە وتی: تۆ ئەوەت فەرامۆش کردووە ئەگەر بمویستایە بێ بەرامبەر ئەم گۆیەت لێ زەوت بکەم دەمتوانی ئەو کارە بکەم، چونکە کاتێك تۆ خەوت لێکەوتبوو دەمتوانی بتکوژم و ئەو گۆیەت لێ بدزم.

وتم: بەگوێی براو و لوتی براوت ئاشکرایە کە پیاوێکی تاوانبار بویت و دوای ئەوەی هەردوو گوێ و لوتیان بڕیویت، بۆ کارکردن ناردویتیان بۆ کانە کانزاکان و ئێستاش لەکانە کانزاکان هەڵهاتویت، بۆیە دەبێت لێرە هەڵبێیت، چونکە ئەگەر پاسەوانەکان بێن و لێرەدا بتبینن، دەستگیرت دەکەن و دەتگەڕێننەوە بۆ ناو کانە کانزاکان، لەوکاتەدا گەر منت بکوشتایە ئەوا سەربەرەوخوار هەڵیان دەواسیت تا ئەو کاتەی دەمردیت.

پیاوەکە وتی: تۆ خەڵکی کوێیت و لەکوێوە دێیت کە هێشتا ئاگاداری ئەوە نیت تەواوی ئەو بەندەانەی لەکانە کانزاکاندا کاریان دەکرد ئازاد کراون.

وتم: چۆن شتی وا ڕوو دەدات؟

پیاوەکەیش وتی: ئەم فیرعەونە نوێیە کە تازە لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی دانیشتووە، پێش ئەوەش جێنشینی میسر بوو، بەڵام دوای ئەوەی چووە سەر تەختی فەرمانڕەوایی تەواوی بەندەکانی لەکانە کانزاکاندا ئازاد کرد، ئیتر لەمەو دوا تەنها ئەو کەسانە لەکانە کانزاکاندا کار دەکەن کە ئازادن و موچەش وەردەگرن.

واهەستم کرد کە ئەو پیاوە ڕاست دەکات، چونکە من چل شەوو چل ڕۆژ لە مردووخانە بوم، ئاگاداری هیچ هەواڵێك نەبوم و نەمدەزانی کە فیرعەونی تازە و لاو، بەندەی کانە کانزاکانی ئازاد کردووە.

پیاوەکە وتی: من سەرەڕای ئەوەی بەندەێك بوم و لەکانە کانزاکاندا کارم کردووە، لەخوداکان دەترسم و هەر لەبەرئەوەش کاتێك تۆ خەوتبویت نەمکوشتی، تۆ دەتوانی ئەو"گۆیە" لەلای خۆت بپارێزی و بۆ بەدەستهێنانی خۆشبەختی سودی لێوەرگریت.

بەڵام من سەرم لەوە سوڕمابوو کە فیرعەونی تازە بەواتا"ئامن هوتب"ی چوارەم بەچ شیوەیەك بەندەکانی لەکانە کانزاکاندا ئازاد کردووە، ئایا ئاگاداری ئەوە نیە کە مەحاڵە پیاوێکی ئازاد بڕوات لەکانە کانزاکاندا کار بکات.

ئەگەر مرۆڤ شێت نەبێت بەندەی کانە کانزاکان ئازاد ناکات، لەبەرئەوەی بەیەکجاری کاروباری کانە کانزاکان لەکار دەکەوێت، سەرەڕای ئەوەش زۆربەی ئەو

بەندانەی لەکانە کانزاکاندا کار دەکەن لەچینی تاوانبارانن و ئازادکردنی ئەوانەش لەشارەکاندا دەبێتە هۆی دوو زمانی و ئاشوبەیەکی مەزن.

پیاوی گویّ و لوت بڕاو وەك بڵێی پەیی بەبیرکردنەوەکانی من بردبێت وتی: من لەوباوەڕەدام خودای فیرعەونی تازەمان خودایەکی شێت بێت.

پرسیم: بۆچی؟

وتی: لەبەرئەوەی خودا، هانی فیرعەنی تازەی داوە تەواوی ئەو تاوانبارانەی لە کانە کانزاکاندا کار دەکەن ئازاد بکات، ئێستاش ئەمانە ئازادانە لەشار و بیابانەکانی میسردا دەگەڕێن و چیتر یەك"دین" زیو و زێڕ و مس لەزەوی دەرناهێنرێت و میسر گرفتاری هەژاریەکی ترسناك دەبێتەوە، گەرچی من بێگانە بوم و بەبێتاوانی بڕیاریان لەسەر دام کە لەکانەکانزاکاندا کاربکەم، بەڵام لەبەرامبەر هەر کەسێکی بێتاواندا هەزاران تاوانباری ڕاستەقینە لەکانە کانزاکاندا کاریان دەکرد و ئێستاش ئازاد بون.

لەکاتی قسەکردندا پیاوەکە تەماشای سەرتاپای جەستەمی دەکرد و ئاگاداری ئەوەبووم کە لەبۆنی ئەو مردووخانەیەی لەجەستەی منەوە دەهات بێزار نیە و وتی: خۆر پێستی جەستەتی سوتاندووە، بەڵام من ڕۆنم هەیە و دەتوانم بیساوم بەپشتتدا.

هەرلەوکاتەی کە بەڕۆن پشتمی دەهەنوو، دەیوت من سەرم لەوە سوڕدەمێنیّ کە بۆچی چاودێری لەتۆ دەکەم، چونکە کاتێك کوتەکیان لەمن دەدا و جەستەم بریندار دەبوو، نەفرەتم لەخوداکان دەکرد کە بۆچی منیان دروستکردووە و منیان گرفتاری ستەمی کەسانی تر کردووە و هیچ کەسێکیش پارێزگاریم لیّ ناکات.

من دەزانم کە تەواوی تاوانبار و بەندەکان، خۆیان بەبێتاوان لەقەڵەم دەدەن و ئەو پیاوەشم وەك ئەوانی تر لێك دەدایەوە، بەڵام لەبەرئەوەی چاکەی لەگەڵدا کردووم و جەستەمی بەڕۆن ماڵیبوو، سەرەڕای ئەوەی لەوکاتەدا تەنها بوم، لێم پرسی: ئەو ستەمەی لەبەرامبەر تۆدا کردیان چی بوو؟ باسی ئەو ستەمەم بۆ بکە، بۆئەوەی بۆ ئەو ستەمەت بەداخ بم.

پیاوەکە وتی: من کە ئێستا لەبەرامبەرتۆدا لەسەر زەوی دانیشتوم و لوت و گوێم نیە، ڕۆژانێك خاوەنی ماڵ و کێڵگە و مانگا بوم و نان لەماڵ و ئاوجۆ لەگۆزەمدا بەدی دەکرا، بەڵام لەبەدبەختی من پیاوێك لەکەنار ماڵەکەمدا بەناوی"ئانو کیس"دەژیا، ئەو پیاوە ئەوندە کێڵگەی هەبوو کە نەتدەتوانی چاوت بەکۆتاییەکەی بکەوێت و

بەڕادەیەك مانگای هەبوو كە ژمارەیان لەخۆڵی بیابان زیاتر بوو، بەڵام من داوا لەخوداكان دەكەم كە جەستەی سیس بكات و هەڵیوەشێنێت و هەرگیز دەست بەگەشتی دوای مەرگی نەكات، ئەو پیاوە سەرەڕای ئەو هەموو كێڵگە و مانگایە چاوی بڕیبووە كێڵگە بچوكەكەی من بۆئەوەی كێڵگەكەم لەچنگ دەربكات، بەردەوام بیانوی پێدەگرتم و هەموو ساڵێك لەوەرزی پایزدا دوای بەرزبونەوەی ئاستی ڕوباری نیل، كاتێك ئەندازیارەكان دەهاتن و ئەندازەی زەوی كێڵگەكانیان دەگرد، سەرم لەوە سوڕ دەما كە كێڵگەكەم بچوكتر بووە و ئەندازیارەكان كە دیارییان لە"ئانو كیس" وەرگرتبوو، بەشێك لەزەویەكەی منیان خستبووە سەر زەویەكەی ئەو، سەرەڕای ئەوەش من بەرگریم لەخۆم دەكرد و ئامادە نەبوم كێڵگەكەمی لەبەرامبەر چەند بازنە ئاڵتون و زیوێكدا پیێ بفرۆشم.

لەو سەردەمەدا خوداكان پێنج كوڕ و سێ كچیان پێدابوین، كچە بچوكەكەم لەهەمویان جوانتر بوو، كاتێك"ئانو كیس" كچە بچوكەكەم دەبینێت ئاشقی دەبێت، یەكێك لەبەندەكانی خۆی ناردە لام و وتی: كچە بچوكەی خۆتم پێ بدە و من چیتر كارم بەتۆوە نابێت.

من كە دەمویست جوانترین كچی خۆم بۆئەوە بدەم بەشوو كە لەكاتی پیریدا هاوكاریم بكات، بۆیە نەم دا بەو، ئەوەبوو ڕۆژێكیان"ئانو كیس"ئەمجارەیان بیانوی ئەوەی پێگرتم كە ساڵێكیان بەرهەمی دانەوێڵە زۆر كەم بووە و من دانەوێڵەم لەو بەقەرز وەرگرتووە و هێشتا قەرزەكەیم نەداوەتەوە. من سوێندم بەخوداكان خوارد كە وا نیە، بەڵام ئەو تەواوی بەندەكانی خۆی هێنابوو بۆ ئەوەی گەواهی ئەوەم لەسەر بدەن كە دانەوێڵەی بەقەرز پێداوم، لەهەمان ڕۆژدا بەندەكانی ڕژانە سەرم و ویستیان بمكوژن و من جگە لەدارێك بۆ بەرگریكردن لەخۆم هیچی ترم پێنەبوو، بۆیە دارەكەم بەر نێوچەوانی یەكێك لە بەندەكانی كەوت و گیانی لەدەست دا.

ئەوكات دەستگیریان كردم و گوێ و لوتیان بڕیم و ناردمیان بۆ كانە كانزاكان، ئەو پیاوەش ماڵ و كێڵگەكەمی لەبەرامبەر قەرزە خەیاڵیەكەیدا داگیر كرد و ژن و منداڵەكانیشمی فرۆشت، بەڵام كچە بچوكەكەم"ئانو كیس" كڕی و بۆماوەیەك وەك كەنیزەیەك بۆ خزمەتكردنی خۆی ڕایگرتبوو، دوای ئەوەش كردیە ژنی یەكێك لەبەندەكانی.

ماوەی دە ساڵە من لەکانە کانزاکاندا سەرقاڵی کارکردنم، تا ئەوەبوو بەفەرمانی فیرعەونی لاو ئازاد کرام، کاتێك گەڕامەوە بۆ ماڵ و کێڵگەکەم، بینیم کە هیچ شوێنەوارێکیان نەماوە و کچە بچوکەکەم کە خوشکی"ئانو کیس" بوو دیار نەماوە و دەڵێن کە لە"تبس"دا لەماڵێکدا بەناونیشانی خزمەتکار سەرقاڵی کارکردنە.

"ئانو کیس"ئەو کاتەی من لەکانە کانزاکاندا کارم دەکرد مرد، ئەویان لەشاری مردووەکاندا ناشت، بەڵام من زۆر حەز دەکەم بڕۆم و بزانم لەسەر گۆڕەکەی چی نوسراوە، چونکە بەدڵنیاییەوە دەبێت تاوانەکانی ئەو پیاوە لەسەر کێلی گۆڕەکەی نوسرابێت، بەڵام لەبەرئەوەی خوێندەواریم نیە نازانم نوسراوی سەر گۆڕەکان بخوێنمەوە.

وتم: من خوێندەواریم هەیە و دەتوانم نوسراوی سەر گۆڕەکەیت بۆ بخوێنمەوە، ئەگەر حەز دەکەیت دەتوانم لەگەڵتدا بێم بۆ شاری مردووەکان و هەرچی لەسەر گۆڕەکەی نوسراوە بۆتی بخوێنمەوە.

پیاوەکە وتی: هیوادارم تەرمەکەت بۆ هەمیشە بمێنێت، ئەگەر ئەم هاوکاریەم لەگەڵ بکەیت، زۆر خۆشحاڵ دەبم.

وتم: من لەکانگای دڵمەوە ئامادەم لەگەڵ تۆدا بێم بۆ شاری مردووەکان و نوسراوی گۆڕی"ئانو کیس"ت بۆ بخوێنمەوە، بەڵام نازانی کە بەمحاڵەوە ڕێمان پێنادەن بڕۆینە ناو شاری مردووەکانەوە.

پیاوە لوت بڕاوەکە وتی: تێگەشتم کە ئاگاداری هیچ شتێك نیت، چونکە ئەگەر ئاگادار بوایەیت، دەتزانی کە فیرعەونی تازە دوای ئەوەی بەندەکانی لەکانە کانزاکان ئازاد کردووە، وتویەتی: لەبەرئەوەی ئەمانە ساڵانێکە لەدیداری مردووەکانیان بێبەش بون، بۆیە مافی ئەوەیان هەیە بڕۆن بۆ شاری مردووەکان و سەردانی مردووەکانی خۆیان بکەن.

من و پیاوی لوت بڕاو کەوتینە ڕێ، تا گەشتینە شاری مردووەکان و لەوێدا ئەو پیاوە کە ناونیشانی گۆڕی"ئانو کیس"ی وەرگرتبوو، منی بردە سەر گۆڕی ئەو کابرایە و بینیم لەبەرامبەر ئەو گۆڕەدا بڕێك گۆشتی کوڵاوو میوە و گۆزەیەك شەراب دانراوە، پیاوی لوت بڕاو بڕێك شەرابی خواردەوە و بەشی منیشی دا، پاشان داوای لێکردم کە نوسراوی سەر گۆڕەکەی بۆ بخوێنمەوە، منیش بەم شێوەیە بۆم خوێندەوە:

(من کە "ئانو کیس"م، گەنمم چاندووە و درەختم نێژاوە و بەرهەمی کێڵگە و باخم زۆرە، چونکە لەخوداکان دەترسم... یەك لەسەر پێنجی بەرهەمەکەم داوە بەخوداکان و ڕوباری"نیل"یش تاڕادەیەك هاوکاری کردم و بەردەوام کێڵگەکانی منی ئاودێری دەکرد و هیچ کەسێك لەکێڵگەکەی مندا برسی نەبووە و نەمهێڵاوە هیچکام لە دراوسێ کێڵگەکانیشم برسیان ببێت، چونکە لەو ساڵانەی کە بەرهەمم باش نەبوو، من هاوکاری هەموویانم کردووە و دانەوێڵەم پێداون. من فرمێسکی چاوی هەتیوانم دەسڕی و ئەوەش لەمن نەدەوەشایەوە کە داوای قەرز لەو بێوەژنانە بکەم کە هاوسەرەکانیان قەرزارم بون، هەرجارێك کە پیاوێك دەمرد، من بۆئەوەی ئازاری ژنەکەی نەدەم چاوپۆشیم لەقەرزەکانی خۆم دەکرد. لەبەرئەوەیە کە لەسەرتاسەری وڵاتدا بەچاکە ناوم دەهێنن و لێم ڕازی بون، ئەگەر مانگای کەسێك دیار نەمایە، گایەکی تەندروست و قەڵەوم لەباتی مانگا ونبووەکەی پێدەدا، من لەکاتی ژیانمدا ڕێم لەوە دەگرت کە ئەندازیاران کێڵگە زەویەکانم بەناحەقی ئەندازە بگرن و زەوی کەسێك بەیەکێکی تر بدەن. ئەوە ئەو کارانەیە کە من"ئانو کیس" لەژیاندا ئەنجامم داوە بۆئەوەی خوداکان لێم ڕازی بن و لەو گەشتە دور و درێژەی کە من دوای مەرگم دەیگرمە بەر هاوکاریم بکەن.)

کاتێك نوسینی سەرکێلەکەم بەتەواوی خوێندەوە، پیاوی لوت بڕاو دەستی کرد بەگریان.

لێم پرسی: بۆچی دەگریت؟

وتی: لەبەرئەوەی دەزانم کە لەبەرامبەر"ئانو کیس" هەڵەیەکی زۆر گەورەم کردووە، چونکە ئەگەر ئەو پیاوە چاکەکار نەبوایە، ئەوەیان لەسەر کێلی گۆڕەکەی نەدەنوسی، چونکە هەرشتێك بنوسرێتەوە ڕاست و دروستە، تا ئەم جیهانە بمێنێت خەڵکی ئەم نوسراوە لەسەر کێلەکەی دەخوێننەوە، لەبەرئەوەی تەرمی پیاوێکی چاك هەرگیز لەناو ناچێت، ئەو هەر بەوشێوەیە بەزیندویی دەمێنێتەوە، بەڵام من دوای مەرگم نامێنم، لەبەرئەوەی لاشەی تاوانباران هەڵدەدەنە ناو ڕوباری نیلەوە و ئاوی ڕوباریش لاشەکەی بەرەو دەریا پەلکێش دەکات و دەبمە خۆراکی گیانەوەرە دەریاییەکان.

من زۆر سەیرم لەقسەی ئەم پیاوە لوت بڕاوە هات، ئەوکات تێگەشتم کە بەچ شێوەیەك گەمژەیی جۆری مرۆڤ هیچ کات لەناو ناچێت و لەهەموو قۆناخ و سەردەمێکدا دەتوانرێت نەزانیو ئەفسانە پەرستییان بقۆزریتەوە و سودیان لێوەربگریت، هەزارەها ساڵە کە کاهینەکانی میسر بەپشت بەستن بەنوسینەکانی "کتێبی مردووەکان" کە خۆیان نوسیویانە، بەڵام دەڵێن لەخواوە بۆمان دابەزیوە، لەڕێی ئەم کتێبەوە خەڵکیان کردە کۆیلەی خۆیان و هەموو پێشەنگیەکی میسر هی ئەوانە. بۆئەوەی نەهێڵن چاکسازی لەگەمژەیی خەڵکیدا بکرێت، دەڵێن هەر وشەیەك لە"کتێبی مردووەکاندا"سەرەڕای ئەوەی لەسەر زەویدا نوسراوەتەوە، لەئاسمانیشدا لەلای خوداکان نوسراوەتەوە و پارێزراوە و هەرگیز لەناو ناچێت.

هەروەها بۆئەوەی بیروباوەڕی خەڵکی لەبەرامبەر "کتێبی مردووەکاندا" نەگۆڕێت. بەو شێوەیە دەیخەنەڕوو کە هەر نوسراوێك بەهۆی ئەوەی نوسراوەتەوە دروستە و نکوڵی لێناکرێت و بەشێوەیەکیش ئەم بیروباوەڕە ڕۆچووەتە نێو بیروباوەڕی خەڵکیەوە کە پیاوێکی وەك ئەو بونەوەرە بەدبەختە کە گوێ و لوتی بڕاوە سەرەڕای ئەوەی بەهۆی ئەم دژایەتی و گومانی هەڵەی"ئانو کیس"ەوە زیندانی کرا و دە ساڵ لەکانە کانزاکاندا ژیانی بەسەر بردووە، کاتێك دەبینێت لەکێلی گۆڕی"ئانو کیس"ئەم بابەتانە نوسراوە، واهەست دەکات ئەوەی نوسراوە ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرەو هەڵەی کردووە کە"ئانو کیس"ی بەپیاوێکی بێبەزەیی و ستەمکار لەقەڵەم داوە.

پیاوە لوتبڕاوەکە فرمێسکی چاوەکانی سڕی و ئەو گۆشت و میوەیەی کە لەوێ بوو کێشایە بەردەمی خۆی و وتی: وەرە بخۆ و سکت تێرکە، لەبەرئەوەی ئەمرۆ ڕۆژی بەندانی کانە کانزاکانە و ڕێیان بەمن داوە بێمە ناو شاری مردووەکانەوە و دەتوانم ئەم خواردنە بخۆم.

دوای ئەوەی بەهۆی خواردنی گۆشت و میوە و شەراب گەشایەوە، بەگۆڕەکەی وت: "ئانو کیس" بەپێی ئەو شتەی لەسەر کێلەکەت نوسراوە تۆ پیاوێکی باش بویت، واباشە ئێستا بەشێك لە کاسەی ئاڵتونین و زیوین و میسینی ناو گۆڕەکەت بدەی بەمن و من ئەمشەو دێم و ئەم قاپانە لەتۆ وەردەگرم.

منیش بەترسەوە هاوارم کرد: هەی پیاو؟ دەتەوێت چی بکەیت؟ ئایا دەتەوێت ئەمشەو بێیت بۆ ئێرە و دەست بۆ گۆڕی ئەم پیاوە درێژ بکەیت؟، مەگەر نازانی هیچ

گوناهێك لە گوناهی دزینی گۆڕەکان مەزنتر نیە و بەهیچ شێوەیەك خوداکان لەمکارەت نابورن؟

پیاوی لوت بڕاو وتی: بۆچی ئەوەندە قسەی بێهودە دەکەیت، مەگەر تۆ خۆت ئەوەت لەسەر کێلی گۆڕەکەی نەخوێندەوە کە"ئانو کیس"کەسێکی زۆر چاکە و بەردەوام بەپێی فەرمانی خوداکان ڕەفتاری کردووە، کەواتە بەهیچ شێوەیەك بەوە ڕازی نابێت کە قەرزای من بێت، ئەگەر ئەو ئێستا زیندوو بوایە، داواکەی جێبەجێ دەکردم، چونکە هیچ گومانێك لەوەدا نیە کە ئەو دەستی بەسەر ماڵ و کێڵگە و ژن و منداڵەکانی مندا گرت و ماڵەکەی منی خستە ڕیزی سامانەکەیەوە و ژن و منداڵەکانیشمی فرۆشت و کچە بچوکەکەمی وەك کەنزەیەك کردە خزمەتکاری خۆی، لەبەرئەوەی"ئانو کیس" قەرزاری منە بەخۆشحاڵیەوە قەرزەکەی خۆی دەداتەوە پێم و من ئەمشەو بۆ وەرگرتنەوەی مافی خۆم دێم بۆ ئێرە و تۆش دەتوانی لەگەڵمدا بێیت و بەشێك بۆ خۆت هەڵگری، لەبەرئەوەی ئەو دەبێت داواکەی من جێبەجێ بکات، ئەوەی من لێی وەردەگرمەوە بەمن ڕەوایە و دەتوانم بەشێك لەو سامانە دوای ئەوەی لەوی وەردەگرم بدەم بەتۆ، ئەمەش باشترە لەوەی تۆ ئەمانە لەگۆڕدا دەربهێنی.

ئازادی ئەو بەندانەی کە لەکانە کانزاکاندا کاریان دەکرد، هەروەها ئەوەیکە بەندەکان ڕێیان پێدراوە سەردانی شاری مردووەکان بکەن، بەتەواوی سیستەمی شاری مردووەکانی لەناو برد، ئەو شارەی کە لەشاری زیندووەکان زیاتر پارێزگاری لێدەکرا، لەوشەوەدا کەوتە ژێر هێرشی کۆیلەکانی فەرهودەوە.

من و بەندەی لوت بڕاو چوینە ناو گۆڕی"ئانو کیس"ەوە و ئەوەی لەتوانامانداببوو بۆنمونە کاسەی زێڕ و زیو و مسی گۆڕەکەیمان هەڵگرت بۆ خۆمان، لەهەمان کاتدا پیاوی ئازادکراو دەیوت ئەوەی لەم گۆڕەدا بۆخۆمی دەیبەم ، مافی خۆمە و کاری من دزی کردن نیە.

کاتێك زێڕ و زیو و مسمان لەشاری لەمردووەکانەوە گواستەوە بۆ دەرەوەی شار، بینیمان تەواوی پاسەوانانی شاری مردووەکان کە ئەرکیان پاراستنی شار و ڕێگرتنە لەدزیکردن، وەك بەندە ئازادەکان ئەوانیش دەستیان کرد بەفەرهود کردن و کاتێکیش گەشتینە کەنار ڕوباری نیل، بنیمان هێشتا فەرهود لەشاری مردووەکاندا بەردەوامە.

گەشتنی ئێمە بە کەناری ڕوباری "نیل" هاوکات بوو لەگەڵ گزنگی بەرەبەیان و بەتەواوی ڕۆژبویەوە، لەوکاتەدا بڕێك لەکڕیارانی سوریا لەوبەری ڕوبارەوە، چاوەڕێمانبوون کە کەرەستە دزراوەکان لەدزەکان بکڕنەوە.

ئەوەی ئێمە هێنابومان فرۆشتمان بەکڕیارێکی سوریایی بەبڕی چوارسەد"دین" زێڕ.

ئەم بڕە زێڕە، دوسەد"دین"ی بەر من کەوت و پاشماوەکەشی بەندەی لوتبڕاو بردی بۆخۆی و وتی: بۆ بەدەست هێنانی زێڕ و زیو، ڕێگایەکی ئاسانمان دۆزیوەتەوە، چونکە ئەگەر ئێمە بۆماوەی پێنج ساڵ لە لەنگەرگای ڕوباری"نیل"دا کرێکاریمان بکردایە، نەماندەتوانی ئەو هەموو زێڕە لەوماوەیەدا بەدەست بهێنین.

دوای ئەوەی ئاڵتونەکەمان دابەش کرد، لەیەکتر جیابوینەوە و بەندەکە بەلایەکدا ڕۆشت و منیش بەلایەکی تردا.

بۆئەوەی بۆنی مردووخانەکە لەخۆم پاك بکەمەوە"کافور و ڕیشك[37]"م کڕی و لەکەنار ڕوباری"نیل"دا خۆم پاك شت، بەشێوەیەك کەبۆنی مردووخانەکە بەتەواوی بەجەستەمەوە نەما و پاك بومەوە، ئیتر خەڵکی لێم دور ناکەونەوە.

دوای ئەوەی دەستێك پۆشاکم کڕی و ڕۆشتمە فرۆشگایەکەوە بۆ ئەوەی نان بخۆم، کاتێك سەرقاڵی خواردن بوم دەنگە دەنگێك لەشاری مردووەکانەوە بەرگوێم کەوت، بینیم کە بوق لێدەدەن و گالیسکە جەنگیەکان کەوتونەتە ڕێ.

لەو کەسانەم پرسی کە زانیاریان زیاتر بوو، چی ڕویداوە؟ ئەوانیش وتیان سەربازە تایبەتەکان، کە پاسەوانی فیرعەونن، فەرمانی ئەوەیان پێدراوە کە بەندە ئازادەکان سەرکوت بکەن کە لەوە زیاتر لەشاری مردووەکاندا دزی نەکەن.

ئەو ڕۆژە پێش ئەوەی خۆر ئاوا بێت، زیاد لەسەد کەس لەبەندە تازە ئازادکراوەکان کە لەڕابردوودا لەکانە کانزاکاندا کاریان دەکرد، سەربەرەوخوار بەسەر دیواری شاری"تبس"دا هەڵیان واسین و کوشتنیان، دوای ئەوە دزی و دەنگەدەنگی شاری مردووەکان خامۆش بوو.

---

[37] ڕیشکی جۆرێك گیایە کاتێك وشکی دەکەنەوە، وەك سابون کەف دەکات و لەشی مرۆڤ لەهەمووپیسیەك پاك دەکاتەوە.

ئەو شەوەم لەسۆزانیخانەیەکدا بەسەر برد، مەبەستم ئەوەبوو کەمێك خۆش بگوزەرێنم و ڕابوێرم، بەڵام هیچ یەك لەژنانی سۆزانیخانەکەم نەکردە خوشکی خۆم.

دوای دەرچونم لەو سۆزانیخانەیە، ڕۆشتم بۆ میوانخانەیەك و لەوێ خەوتم و بەرەبەیانی ڕۆژی دوایی گەڕامەوە بۆ ماڵە کۆنەکەم بۆئەوەی قەرزی"کاپتا" بەندەی کۆنم بدەمەوە و سوپاسی بکەم، چونکە ئەگەر ئەو ئەو پاشەکەوتە کەمەی پێنەدابام، ئەوا من نەمدەتوانی تەرمی دایك و باوکم بگەیەنمە مردووخانە.

"کاپتا" کاتێك چاوی پێم کەوت دەستی کرد بەگریان و وتی: ئەی خاوەنە کۆنەکەم، وام دەزانی مردویت، بەخۆمم دەوت ئەگەر زیندوو بێت، ئەوا دێتەوە بۆلام بۆئەوەی بڕێك زیو و مسی ترم بەقەرز لێوەرگرێت، چونکە ئەو زیوو مسێکی بەقەرز لەمن وەرگرتووە، کەسێکیش جارێك زیو و مس بەقەرز بدات بەکەسێك ئەوا تالەژیاندابێت دەبێت زیو و مسی بەقەرز بداتێ.

منیش سەرەڕای ئەوەی وامدەزانی مردویت، پاشەکەوتم بۆ ڕۆژی تەنگانەم دەکرد، بۆئەوەی بتوانم هاوکاریت بکەم دزیم لە خاوەنەکەم و دایکی(کە خودا بکات لاشەی پارچە پارچە بکەن) دەکرد، دایکیشی بەردەوام بەدار لێی دەدام، بەم تازەییانە هەڕەشەی ئەوەی لێکردوم کە بمفرۆشێت، لەبەرئەوەی تۆ هاتویت واچاکە پێکەوە لێرە هەڵبێین و بڕۆین بۆ شوێنێك کە لەم تیمساحەوە دور بین.

من دوودڵ بوم لەوەڵامدانەوەی، بۆیە ئەو وتی: خاوەنە کۆنەکەم، ئەگەر لە پاشەکەوتکردنی ژیان دوودڵیت، ئەوا من بڕێك کانزام هەیە و دەتوانین بۆخۆمان خەرجی بکەین، کاتێك ئەم کانزایانە تەواو بون، من کار دەکەم و ناهێڵم برسیت ببێت، بەمەرجێك لەدەستی ئەم ژنە ڕزگارم بکەیت کە وەك تیمساح وایە و لەدەستی کوڕەکەیشی.

وتم: "کاپتا"من ئەمڕۆ بۆئەوە هاتوم بۆ ئێرە کە قەرزەکەی خۆمت بدەمەوە، چونکە دەزانم ئەوەی تۆ بەمنت دا کۆی پاشەکەوتی تۆیە لەماوەی ئەم چەند ساڵەدا. ئەوکات بڕێکی زۆرتر لەو کانزایەی کە"کاپتا"پێیدابوم خستمە نێو مشتیەوە و ئەویش کاتێك ئەو بڕە کانزایانەی بینی لەخۆشیاندا دەستی کرد بە سەماکردن، بەڵام لەدواییدا ئاگاداری ئەوە بوو کە بۆ پیاوێکی وەك ئەو کە کەسێکی پیرە، مایەی نەنگییە.

دوای ئەوەی لەسەماکردن وەستا وتی: گەورەم، دوای ئەوەی کانزاکانی خۆمم پێدایت دەستم کرد بەگریان، چونکە وام دەزانی تۆ چیتر کانزاکانی خۆمم بۆ ناگەڕێنیتەوە، تکایەلێم زویر مەبە، چونکە ئەو کەسەی تەمەنێك بەندەیی کردووە، بەرگەی ئەم جۆرە حاڵەتانە ناگرێت، دڵی زۆر لاوازە و ناتوانێت بڕە کانزاکانی خۆی بەکەسانی تر بدات و ئاسودە خەیاڵ دانیشێت تەنانەت ئەگەر ئەو کەسەی خاوەنی خۆشی بێت .

وتم: "کاپتا"سەرەڕای ئەوەی من قەرزەکەی تۆم داوەتەوە، بۆ قەرەبوکردنەوەی ئەو چاکەیەی کە لەگەڵ مندا کردت، تۆ لەخاوەنەکەت دەکڕمەوە و ئازادت دەکەم.

"کاپتا"وتی: ئەگەر تۆ من بکڕیت و ئازادم بکەیت، من شوێنێك شك نابەم کە بۆی بڕۆم و ئەو کەسەی کە تەمەنێك بەندە بووبێت، ناتوانێت بەئازادی بژی، من بەندەیەکی یەك چاوم و دەبێت خاوەنم هەبێت، بێخاوەن وەك مەڕێکی یەك چاو وام کە شوانەکەی خۆی ونکردبێت، بۆیە ئامۆژگاری ئەوەت دەکەم کە لەخۆڕا کانزاکانت بۆ کڕینی من بەفیڕۆ مەدە، چونکە من هی تۆم و تۆ دەتوانی لەگەڵ خۆتدا بمبەیت.

دوای ئەوە بەتاکە چاوەکەی چاوێکی لێداگرتم و وتی: خاوەنە دەستکراوەکەم، لەبەرئەوەی من خۆپارێزی و ئاگاداری خۆم لەدەست نەدابوو، هەموو ڕۆژێك پرسیارم لەبارەی کەشتیەکانەوە دەکرد، ئەو زانیاریانەم بەدەستهێناوە کە لەم ماوەیەدا کەشتیەك لێرەوە بەرەو"ئزمیر"دەڕوات و ئێمە دەتوانین سواری ئەم کەشتیە ببین و خۆمان بگەیەنینە"ئەزمیر"، تاکە گرفتێك کە بونی هەبێت لەڕێماندا ئەوەیە کە پێش دەرچونمان بەم کەشتیە دەبێت دیاریەك پێشکەشی خوداکان بکەین، بۆئەوەی بێ هیچ گرفتێك بگەینە شوێنی مەبەستی خۆمان، لەبەرئەوەی من چیتر باوەڕم بە خودای"ئامون"نەماوە، هێشتا خودایەکی ترم نەدۆزیوەتەوە کە دیاریەکەی پێشکەش بکەم.

بۆیە لەچەند کەسێکم پرسی کە ئایا دەتوانن ڕێنماییم بکەن و خودایەکم پێ نیشان بدەن کەمن بتوانم بیپەرستم و دیاری پێشکەش بکەم، ئەوانیش لەوەڵامدا وتیان خودای فیرعەون بەناوی"ئاتون"بپەرستە، پرسیم ئەو خودایە بەچی دەژی و بەچ شێوەیەك خودایی خۆی دەکات؟ وەڵامیان دامەوە: کە خودای"ئاتون"لەڕێی ڕاستیەکانەوە دەژی و خودایی خۆی دەکات، تێگەشتم کە ئەم خودایە بەکەڵکی من

نایەت، گەر خودایەك بیەوێت بەڕاستیەکان بژی و لەم ڕێیەوە خودایی خۆی بکات، شتێکی نەگونجاوە، ئێستاش خاوەنە خۆشەویستەکەم ئایا تۆ دەتوانی پێم بڵێیت چ خودایەك بپەرستم؟

من ئەو "گۆیەی"-بەواتا ئەو شتە خڕەی- کە لەبەرامبەر گۆڕی فیرعەوندا لەکاتی ناشتنی دایك و باوکمدا دۆزیبومەوە پێمداو وتم: ئەم خودایە بپەرستە.

"کاپتا" پرسی: ئەوە چیە؟

وتم: فیرعەون، باوەڕی بەو خودایە هەبوو و وایدەزانی کە خۆشبەختی بۆ دەهێنێت و منیش لەو ساتەوەی ئەو گۆیەم بەدەست هێناوە هەست دەکەم بەئاڕاستەی خۆشبەختیدا هەنگاو دەنێم، ئەگەر تۆش ئەم گۆیە لەلای خۆت بپارێزی لەوباوەڕەدام کە کەسێکی خۆشبەختت لێدەردەچێت و منیش لەم کاتەدا سود لەخۆشبەختی تۆ وەردەگرم. لەکاتێکدا ئەم گۆیەت هەیە پۆشاکەکانی خۆت بگۆڕە و پۆشاکێکی وەك دانیشتوانی سوریا لەبەر بکە، بۆئەوەی بەو کەشتیەی کە باستکرد خۆمان دەرباز بکەین، من واهەست دەکەم کە ئەو گوتەیەی تۆ دەربارەی ئەوەی نابێت پارەی خۆم بۆ کرینی تۆ بەفیڕۆ بدەم زۆر ڕاستە، چونکە ئێمە لێرەوە تا"ئزمیر" خەرجی پێویستمان پێیە و کاتێکیش چوینە ناو ئزمیرەوە دەبێت بڕێك کانزامان هەبێت بۆئەوەی لەوێشدا خەرجی بکەین تا ئەوکاتەی من دەست بەکاری پزیشکیەکەی خۆم دەکەم، هەروەها دەبێت ئەوەشت پێڕاگەیەنم کە منیش پەلەمە بۆئەوەی زووتر لەشاری"تبس" دەربچم، لەبەرئەوەی کاتێك بەنێو شەقامەکانی "تبس"دا هەنگاو دەنێم، واهەست دەکەم هەرکەسێك چاوی پێم دەکەوێت جنێوم پێدەدات، منیش دوای ئەوەی لەم شارە ڕۆشتم، هەرگیز ناگەڕێمەوە بۆ"تبس".

"کاپتا"وتی: گەورەم، هیچکاتێك لەبارەی ئایندەوە بڕیاری یەکلایی مەدە، چونکە تۆ نازانی کە لەئایندەدا چی ڕوو دەدات و چ بەسەرهاتێك دێتەپێش، لەبەرئەوە لەمڕۆوە بڕیاری نەگەڕانەوەت بۆ شاری"تبس"مەدە، چونکە لەوانەیە لەو گەڕانەوەیەت قازانجێکی زۆر بەدەست بهێنی.

سەرەڕای ئەوەش هەر کەسێك تینویەتی خۆی بە ئاوی ڕوباری"نیل" بشکێنێت، ناتوانێت بەردەوام بەئاوەکانی تر خۆی تێرئاو بکات، بۆیە"نیل" بەلای خۆیدا دوبارە پەلکێشی دەکاتەوە. من نازانم کە تۆ لێرەدا چ کارێکت کردووە کە بەم شێوەیە ڕقت

له"تبس"ه، بەڵام بڕیاری تۆ بۆ بەجێهێشتنی"تبس" بەلای منەوە کارێکی ژیرانەیە. "سینۆهه" من ئەو دڵنیاییەت پێدەبەخشم کە ئەم کارە هەرچی بێت فەرامۆش دەکەیت، چونکە لاویت و لاویش دوای چەند ساڵێك بەسەرهاتەکانی ڕابردوو فەرامۆش دەکات، کەسە بەتەمەنەکانیش ئەگەر وەك لاوەکان تەمەنێکی درێژیان لەپێش بوایە ئەوا بەسەرهاتەکانی ڕابردوویان فەرامۆش دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی کەمیان تەمەن ماوە، هەلی فەرامۆشکردنی ڕوداوەکانی ڕابردوویان بۆ نارەخسێت. هەر کردارێك کە مرۆڤ ئەنجامی دەدات، وەك ئەو بەردە وایە کە فڕێ دەدرێتە ناو دەریاوە، ئەم بەردە، دوای ئەوەی دەکەوێتە ناو ئاوەکەوە دەنگێکی مەزن دەهێنێتە بون و شەپۆلانێك لەناو ئاوەکەدا دروست دەکات، مرۆڤ وا هەست دەکات کە هەرگیز کاریگەری ئەو وروژان و شەپۆلانە لەناو ناچێت، بەڵام دوای چەند ساتێك کە ئاو هێور دەبێتەوە، مرۆڤ بەخۆی دەڵێت هەردەڵێی بەرد فڕێ نەدراوەتە ئەو ئاوەوە، ئەگینا بەو شێوەیە ئارام نەدەبوو.

تۆش دوای چەند ساڵێك ئەو بەسەرهاتەی کە لەم شارەدا بەسەرت هاتووە فەرامۆش دەکەیت و بەسەروەت و سامانێکی زۆرەوە دەگەڕێیتەوە بۆ"تبس"، ئەگەر تا ئەوکاتە من لەلیستی بەندە هەڵهاتووەکاندا مابێتم، تۆ دەتوانی پارێزگاریم لێ بکەیت و نەهێڵێت ئازارم بدەن.

وتم: من هەرکاتێك دەستەڵات و سامانم هەبێت ئامادەم پارێزگاری لەتۆ بکەم، بەڵام من بەشێوەیەك له"تبس" دەڕۆم کە چیتر نەگەڕێمەوە بۆئێرە.

لەوکاتەدا دایکی خاوەنەکەی"کاپتا"ی بانگ کرد و ئەویش ڕۆشت، بەڵام لەکاتی ڕۆشتنیدا وتی: لەسەر سوچی ئەو کۆڵانەدا چاوەڕێم بکە هەر ئێستا دەگەڕێمەوە.

من لەدەرگای ئەو ماڵە دور کەوتمەوە و لەسوچی کۆڵانەکەدا چاوەڕێی "کاپتا"م دەکرد.

زۆری نەخایاند کە"کاپتا"لەحاڵێکدا کە سەبەتەیەکی بەدەستەوە و کڵاوێکی بەسەرەوە بوو هات و بینیم کە لەدەستەکەی تریدا چەند ئەنگوستیلەیەکی مس دەبینرێت و ئەویش هەمان ئەوئەنگوستیلانەی پێنیشان دام و وتی: ئەم ژنە کە دایکی تەواوی تیمساحەکانە، منی بۆ کڕینی هەندێك شت ناردووە بۆ بازاڕ، بەڵام هیچ شتێکی بۆ ناکڕم، چونکە من هەموو شتە تایبەتییەکانی خۆم کە شایەنی هەڵگرتن بن

و پێویست بن لەگەڵ خۆمدا هێناومە و خستومەتە ناو ئەم سەبەتەیەوە، بۆئەوەی لێرە بڕۆین و ئەم ئەنگوستیلە مسەش بە سەرمایەی گەشتەکەمان زیاد دەکەین.

بینیم "کاپتا" لەناو سەبەتەکەیدا پۆشاك و قژێکی دەستکردی هەڵگرتووە و کاتێك لەسنوری ماڵ دور کەوتینەوە و گەشتینە کەنار ڕوباری"نیل" لەوێدا پۆشاکەکانی خۆی گۆڕی و قژە دەستکردەکەشی کردە سەری.

منیش دارێکی تاشراوم بۆ کڕی، چونکە بینیومە کە خزمەتکاری کەسە مەزنەکان دارێك بەدەستیانەوە دەگرن و دوای ئەوە لەلەنگەرگای کەشتیە سوریەکان نزیك بوینەوە بینیم کە کەشتیەك لەحاڵی ڕۆشتندایە.

کەشتیەوانی کەشتیەکەش خەڵکی سوریا بوو، کاتێك زانی کە من پزیشکم و دەمەوێت بڕۆم بۆ"ئزمیر" بەخۆشحاڵیەوە پێشوازی لەمن و "کاپتا"کرد، لەبەرئەوەی هەندێك لە کرێکارانی کەشتیەکە نەخۆش بون و بەهیوای ئەوە بوو چارەسەریان بکەم.

دیاربوو ئەو گۆیەی کە لەپاڵ گۆڕی فیرعەوندا دۆزیبوومەوە بوو بەمایەی خۆشبەختیمان، چونکە کارەکانمان زۆر بەئاسانی ئەنجام دەدا و دەمانتوانی بەئاسانی گەشتی خۆمان بکەین، "کاپتا"ش کاتێك چاوی بەو گۆیە کەوت وەك خودایەکی ڕاستەقینە دەستی کرد بەپەرستنی.

*بەشی دەیەم*

## نەخۆشیەکی گوێزراوە و نەناسراو

کەشتی کەوتە جوڵە و بۆماوەی بیست و چوار ڕۆژ بەسەر ڕوباری نیلدا ڕۆشتین، تاکو بەدەریا گەشتین و لەماوەی ئەم بیست و چوار ڕۆژەدا بەبەردەم شار و پەرستگا و کێڵگە و ئاژەڵێکی فراواندا تێپەڕین، بەڵام من چێژم لەتەماشاکردنی سەروەت و سامانی میسر وەرنەدەگرت، چونکە پەلەی ئەوەم بوو کە زوتر لەو وڵاتە بڕۆمە دەرەوە و خۆم بگەیەنمە شوێنێك کە هیچ کەسێك نەمناسێت.

کاتێك لەڕوباری"نیل"دەرچوین کەشتی خۆی کرد بەدەریادا، کاتێك چیتر"کاپتا" نەیدەتوانی هەردوو کەناری "نیل" ببینێت زۆر شڵەژا و پێی وتم: ئایا باشترنیە کە لەم کەشتیە دابەزین و لەڕێی وشکانیەوە خۆمان بگەیەنینە "ئزمیر"؟.

منیش پێم وت: لەڕێی وشکانیشەوە چەتەی لێیە و هەرچیمان هەیە لێمان زەوت دەکەن و لەوانەیە خۆشمان بکوژن.

کرێکارانی کەشتی کاتێك دەریای بەرفراوانیان بینی بەپێی نەریتی خۆیان بەبەردێکی تیژ ڕوخساری خۆیان ڕوشاند، بۆئەوەی بەم کارەیان خوداکان بکەن بەهاوڕێی خۆیان و بە بێ هیچ کێشەیەك بگەنە مەبەستی خۆیان.

گەشتیارانی ناوکەشتیەکە کەزۆربەیان خەڵکی سوریا بون، لەتەماشاکردنی ئەم دیمەنە ترسان، هەروەها ئەو میسریانەی بەم کەشتیە کۆچیان دەکرد، بەهەمان شێوە زۆر ترسان.

میسریەکان داوای هاوکاریان لەخودای"ئامون"دەکرد و "سریانی"ەکانیش داوای هاوکاریان لە"بعل"دەکرد، (کاپتا)ش خودای خۆی هێنایە دەرەوە و لەبەرامبەریدا

دەستی کرد بەگریان، بۆئەوەی دەریا بکاتە هاوڕێی خۆی و بەم بۆنەیەوە ئەنگوستیلەیەکی مسیشی هەڵدایە ناو دەریاوە، بەڵام لەدواییدا بۆ مسەکەی زۆر بەداخ بوو.

ئەم ڕوداوانە کەمێك درێژەی کێشا تائەوەبوو سەوڵ لێدەرەکان کە تا ئەوکاتە لەڕوباری نیل و دەریادا سەوڵیان لێدەدا، دەستیان لەسەوڵ لێدان هەڵگرت و چارۆکەکانیان هەڵدا بۆئەوەی بەردەوامی بەڕۆشتنی خۆیان بدەن.

ئەوکات هەموو شتێك ئارام بویەوە و چیتر کرێکارەکانی ناو کەشتیەکە ڕوخساری خۆیان بریندار نەدەکرد و ئەوانەی سواری ئەو کەشتیەش بون هاواریان بۆ خودای خۆیان نەدەکرد، بەڵام دوای ئەوەی چارۆکەکان هەڵدران و کەشتیەکە لەڕۆشتندا خێرا بوو، ئەمجار ڕووبەڕوی شەپۆلەکانی دەریا بوونەوە.

"کاپتا"کاتێك بینی کەشتی بەوشێوەیە تەکان دەخوات ترسا و یەکێك لەگوریسەکانی کەشتیەکەی بەتوندی گرت و دوای چەند ساتێك بەدەم هاوارەوە تێیگەیاندم کە بەشێوەیەك گەدەی هەڵدەچێ وەك بڵێی خەریکە لەدەمیەوە دێتە دەرەوە و دڵنیایە دەمرێت.

"کاپتا" کە وای دەزانی خەریکە دەمرێت، بەمنی وت: گەورەم من هیچ گلەییەکم لەتۆ نیە، لەبەرئەوەی تۆ منت نەهێنا بۆ ئێرە، بەڵکو ئەوە من بوم کە بەتۆم وت دەبێت لە"تبس"بڕۆینە دەرەوە و بچین بۆشارێکی تر.

کاتێك مردم لاشەکەم فڕێبدەرە ناو دەریاوە، لەبەرئەوەی ئاوی دەریا سوێرە و وەك هەسێرە سوێراوەکانی مردووخانە، ناهێڵێت لاشەکەم هەڵبوەشێت.

کرێکارانی کەشتی لەبەرئەوەی لەزمانی میسری تێدەگەیشتن کاتێك گوێیان لەم قسەیە بوو بەپێکەنینەوە پێیان وت: پیاوی یەك چاو، لەناو ئەم دەریایەدا گیانەوەری وای تێدایە کە ددانەکانیان لەددانی تیمساح گەورەتر و تیژترە و پێش ئەوەی لاشەت بگاتە بنی دەریاکە، پارچە پارچەت دەکەن و قوتت دەدەن.

"کاپتا"کاتێك ئاگاداری ئەوە بوو کە لاشەکەی لەناو ئاوی سوێری دەریادا نامێنێت و گیانەوەرە دڕندەکانی دەریا دەیخۆن و لەت و پەیتی دەکەن، دەستی کرد بەگریان.

دوای ماوەیەك بەندە كۆنەكەم دەستی كرد بەڕشانەوە، دوای ئەویش كۆچەرە میسری و سریانیەكانیش دەستیان كرد بەڕشانەوە و ئەوەی لەناو گەدەیاندا بوو هەڵیانهێنجایەوە و ڕەنگی ڕوخساریان ڕەشداگەڕا، دوای ئەوە ڕەنگێكی سەوزباویان لەخۆگرت.

من سەرم لەبینینی نەخۆشكەوتنی بەكۆمەڵی ئەمانە زۆر سوڕما، چونكە لە"ماڵی ژیان"دا مامۆستاكانی ئێمە، باسی ئەم جۆرە نەخۆشیەیان بۆ نەكردبوین و نەمدەزانی ئەوە چ جۆرە نەخۆشیەكە. نەخۆشییە گوێزراوەكان كە لەناكاو كۆمەڵێكی زۆر نەخۆش دەخات، ناسراوە، تەواوی پزیشكانی دەرچوی"تبس"زانیاریان لەبارەیەوە هەیە.

هەزاران ساڵە كە ئەم نەخۆشیە دەستینشان و ئاشكرا كراوە و كەرەستەی چارەسەركردنیشیان فەراهەم كراوە و هێماكانی ئەم نەخۆشیەش ئاشكرا و دیارن، بەڵام ئەم نەخۆشیە گوێزراوە لەنەخۆشیە گوێزراوەكانی تر نەدەچوو، من لەوباوەڕەدام ئەگەر تەواوی پزیشكانی فەرمانڕەوای میسر كۆ ببنەوە ناتوانن ئەو نەخۆشیە زوو گوێزراوە كە لەماوەیەكی كورتدا بەسەر هەموو گەشتیارانی ئەم كەشتیەدا زاڵ بووە دەستنیشان بكەن.

ئەم نەخۆشیە نە"كۆلێرا"بوو نە"تاعون"و نە"ئاوڵە" ، چونكە لەم سێ نەخۆشیەدا، كەسی نەخۆش سەرەتا "تا" دەیگرێت، بەڵام ئەوانەی دەڕشانەوە "تا"یان نەبوو و سەریشیان ژانی نەدەكرد.

من بۆنی دەمیانم كرد بۆئەوەی بزانم ئایا وەك نەخۆشی"تاعون" بۆنێكی ناخۆش لەدەمیانەوە نایەتە دەرەوە، بەڵام لەواندا هەستم بەو بۆنە ناخۆشە نەكرد، تەماشایەكی ڕانیشیانم كرد بۆئەوەی بزانم ئایا وەك نەخۆشی "تاعون" لەلا ڕانیاندا دومەڵ پەیدا نەبووە، بەڵام ئەو دومەڵەشم بەرچاو نەكەوت و لەسەر جەستەشیان تلۆقی ئاوڵە بەدی نەدەكرا، لەنێو تەواوی ئەوانەی دەڕشانەوە، تەنها تاكە كەسێكیشم نەبینی كە "تا"ی هەبێت.

سەرم لەوە سوڕمابوو كە ئایا ئەمە چ نەخۆشیەكە كە هێماكانی لەهیچ یەك لەكتێبە كۆنەكاندا نەنوسراوە، بۆیە بەترسەوە ڕۆشتم بۆ لای كەشتیەوانەكە و پێم وت: لەناو كەشتیەكەی تۆدا نەخۆشیەكی ترسناك بڵاو بووەتەوە كە تا ئەمڕۆ پێشینەی

نەخۆشیەکی ئاوا لەمێژوودا بەدی نەکراوە، چونکە من پزیشکی میسرم و دەرچوی قوتابخانەی"ماڵی ژیان"م ، هیچ زانیاریەکم لەبارەی ئەم نەخۆشیەوە نیە، بۆیە پێت دەڵێم دەبێت یەکسەر بەرەو کەنار دەریا بڕۆیت، بۆئەوەی کەسە نەخۆشەکان بگوازینەوە بۆ وشکانی.

کەشتیەوانەکە وتی: مەگەر تۆ تا ئێستا بەکەشتی سەفەرت نەکردووە؟

وتم: نەخێر.

کەشتیەوانەکەش وتی: ئەم نەخۆشیە کە پزیشکێکی میسری وەك تۆ هیچ زانیاریەکی لەبارەوە نیە، نەخۆشی دەریای پێدەڵێن و هۆکارەکەی زۆر خواردنە، لەم کەشتیەدا کۆچەرەکان گەر حەزبکەن لەسەر ئەرکی کۆمپانیای سریانی کە خاوەنی ئەم کەشتیەیە، خواردن دەخۆن، خواردنی ئەوان بەبەشێك لە کرێی کەشتیەکە لەقەڵەم دەدرێت. بەڵام"سینۆهە"تۆ کاتێك سواری ئەم کەشتیە بویت وتت کە لەسەر ئەرکی خۆت خواردن دەخۆیت، هەر لەبەرئەوەش لەزۆر خۆری خۆت پاراستووە، هەر لەبەرئەوەشە کە هەموویان نەخۆشن، بەڵام تۆ تەندورستیت باشە، بەڵام ئەمانە کە دەزانن لەسەر ئەرکی کۆمپانیا نان دەخۆن، تا دەتوانن ورگی خۆیان پڕ دەکەن لەخواردن، بۆئەوەی بەبۆچونی خۆیان لەمامەڵەی سواربونیان بۆ سەر ئەم کەشتیە فریو نەخۆن و تا ئەوکاتەی لەسەر ڕوباری نیل دەڕۆشتین پڕخۆری ئەمانە هیچ زیانێکی نەبوو، چونکە ڕوباری"نیل"ڕوبارە و شەپۆلی نیە، بەڵام ئێستا کاتێك چوینە ناو دەریاوە، ئەمانە لەدوای هەر ژەمێك زۆر خۆری گرفتاری هەمان نەخۆشی دەبن، ئەوەی لەگەدەیاندا کۆیان کردووەتەوە بەهۆی ڕشانەوەوە هەڵی دەهێنجنەوە و ئەم هەڵهێنجانە لە تەکانی خواردنی کەشتیەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەویش هۆکارەکەی بۆ شەپۆلی دەریا دەگەڕێتەوە.

وتم: بۆچی لەم کاتی شەپۆلانەدا کەشتیەوانی دەکەن، کە دڵنیان لەوەی سەرنشینانی ئەم کەشتیە بەو شێوەیە نەخۆش دەکەون؟

کەشتیەوانەکە وتی: ئەم کەش و هەواو و شەپۆلانە باشترین کەشە بۆ کەشتیەوانی، چونکە تاکو"با"هەڵنەکات ئێمە ناتوانین سود لەچارۆکەکان وەربگرین،

سەرەڕای ئەوەی تۆ پزیشکێکی میسریت، ئەم زانستی پزیشکیە لەمنەوە فێربە کە چارەسەری نەخۆشەکانی دەریا تەنها نان نەخواردنە و ئەگەر سەرنشینانی کەشتی نان نەخۆن، دوچاری ئەم نەخۆشیە نابن.

وتم: ئایا ئەوانەی کە نەخۆش کەوتوون دەمرن؟

کەشتیەوانەکە وتی: کاتێك کەشتی دەگاتە کەنار دەریا و ئەوانە لەکەشتی دابەزین، لەتەواوی ئەو کەسانەی کەنار دەریا تەندروستتر دەبن، چونکە قورسی گەدەیان بەهۆی ڕشانەوەی یەك لەدوای یەکەوە لەناو چووە و نەخۆشی دەریا کاتێك بەردەوام دەبێت کە کەشتی لەناو دەریادا لەحاڵی ڕۆشتندا بێت و هەر ئەوەی گەشتە کەنار دەریاکان ئەم نەخۆشیەش لەناو دەچێت.

لەم گفتوگۆیەدا بوین... شەو داهات، لەکاتێکدا کەلەهیچ شوێنێکەوە کەناری دەریا بەدی نەدەکرا، بەکەشتیەوانەکەم وت: ئایا تۆ لەم شەوە تاریکەدا ڕێگای خۆت ون ناکەیت، ئایا لەباتی ئەوەی بەرەو"ئزمیر" بکەویتە ڕێی وڵاتی مرۆڤ خۆران ناگریتەبەر؟[38].

کەشتیەوانەکە وتی: من داوای هاوکاری لەخوداکان دەکەم و هەر لەبەرئەوەش ڕێگا ونناکەم، لە ڕۆژدا خودای خۆر هاوکاریم دەکات و کاتێکیش شەودادێت خودای مانگ و خودای ئەستێرەکان هاوکاریم دەکەن و ناهێڵن بەرەو وڵاتی مرۆڤ خۆران بڕۆم. منیش دوای ئەوەی کابرای کەشتیەوانم بەجێ هێشت و خزامە گۆشەیەکی ئەو کەشتیەوە بۆئەوەی بخەوم، بەڵام تا بەیانی بەهۆی جوڵەی ئەملاولای کەشتیەکە و دەنگی چارۆکە و شەپۆلی دەریاوە خەوم لێ نەکەوت.

ڕۆژی دوایی کەمێك خواردنم دا بە"کاپتا"بەڵام نەیخوارد، ئەوکات من لەوە دڵنیا بوم کە ئەو دەمرێت، چونکە هەرگیز ئەوە ڕوینەداوە کە"کاپتا"هەلی خواردنی بۆ بڕەخسێت و نەیقۆزێتەوە.

حەوت شەو و ڕۆژ، ئێمە لەدەریادا بوین و ڕۆژی هەشتەم شاری"ئزمیر"مان لێ دەرکەوت، کاتێك گەشتینە لەنگەرگا چارۆکەکان داگیرانە خوارەوە و کرێکارانی

---

[38] چوار هەزار ساڵ لەوەوپێش، دانیشتوانی خەڵکی باکوری دەریای میدیترانە نیوە درندە بون و میسریەکان وایان دەزانی مرۆڤ خۆرن.

کەشتی سەوڵەکانیان گرتەوە دەست، بۆئەوەی گەشتیەکە بگەیەننەوە کەنار دەریا و منیش بەسەرسوڕمانەوە بینیم کە بەندەکەم، و تەواوی ئەو سەرنشینانەی کە بێگیان بون، هەرئەوەی کەشتی خۆی کرد بەناو لەنگەرگادا، هەستانە سەرپێ و کەوتنە ڕێ و هەموویان دەیانوت کە برسیانە و داوای خواردنیان دەکرد. من هەرگیز ئەوەم بەچاوی خۆم نەبینیبوو کە کۆمەڵێك نەخۆش کەوا چاوەڕوان دەکرا دوای ماوەیەکی کورت بمرن، لەناکاو هەموویان چاك ببنەوە و بکەونە ڕێ و قسە لەگەڵ یەکتردا بکەن و پێبکەنن، ئەوکات تێگەشتم کە زانست، کۆتایی نیە و مرۆڤ هەرچەنێك بخوێنێت، هێشتا هەر پێویستی بەفێربونە، چونکە سەرەڕای ئەوەی ئێمەی پزیشکانی مسری مەزنترین پزیشکانی جیهانین، بەڵام هێشتا بەئەندازەی کەشتیەوانێکی نەخوێندەوار زانیاری و ئەزمونمان نیە و هاوکارانی من لە"تبس"دا ئاگایان لەبونی ئەم جۆرە نەخۆشیە نیە کە یەکسەر چارەسەر دەکرێت.

سوریا بەناوی وڵاتی سور و میسریشیان بەناوی شانشینی ڕەش بانگ دەکرد[39] و هەروەك چۆن ڕەنگی خاکی ئەم دوو وڵاتە جیاوازی هەیە، بەهەمان شێوە هەموو شتێکی سریانی و میسری جیاوازە.

میسر وڵاتێکی تەخت و بێشاخ و گرد و بەرزاییە، بەڵام سوریا وڵاتێکە کە هەڵگری شاخە و لەنێوان دوو کێودا دەشتاییەکی پان و بەرینیش بەدی دەکرێت و لەناو هەر دەشتێك لەم دەشتانەدا میلەتێك دەژیت و هەریەك لەم میلەتانە پادشایەکیان هەیە و تەواوی ئەم دەستەڵاتدارانەش باج و سەرانە بە فیرعەون دەدەن.

لەکەنار دەریاکانی سوریادا، خەڵکی بەهۆی ڕاوە ماسی و دەریاوانیەوە ژیانی ڕۆژانەی خۆیان دابین دەکەن و لەناو وشکانیشدا کەرەستەی ژیانیان کشتوکاڵ و چەتەگەریە و هێزی سەربازی فیرعەون هەرگیز نەیتوانیوە چەتەکانی سوریا لەناو ببات.

لەمیسردا خەڵکی ڕوتن، بەڵام خەڵکی سوریا سەر تا پێیان جل لەبەر دەکەن، جلوبەرگەکانیان لەخوری دروست دەکەن، بەڵام هەمان ئەم خەڵکە کە سەرتاپایان پۆشاکە، کاتێك بیانەوێت خۆیان لەپاشەڕۆکانیان خاڵی بکەنەوە، بێئەوەی بڕۆن بۆ

---

[39] بەهۆی ڕەنگی خاکی وڵاتەکەیانەوە بەوشێوەیە بانگیان دەکردن.

شوێنێکی تایبەت دەست بەئەنجامدانی ئەم کارە دەکەن. لەهەموو شوێنێکدا بێئەوەی گوێ بدەن بە خەڵکی کەهاتوو چۆ دەکەن و دەیانبینن، کاری خۆیان ئەنجام دەدەن.

پیاوانی سوریا ڕیش و سمێڵێکی درێژیان هەیە و هەر شارێکی ئەو وڵاتە خودایەکی تایبەت بەخۆی هەیە و بۆ خوداکانیان مرۆڤ دەکەن بەقوربانی.

هەندێك کار کەلەمیسردا دزێوە لە سوریادا ڕێپێدراوە، بۆنمونە هاوخەوی ژن و پیاو کە لەهەندێك ئاهەنگدا ژن و پیاوەکان بەشێوەیەکی ئاشکرا کاری سێکسی خۆیان دەکەن.

هەرجارێك فیرعەون پایەدارێك بنێرێت بۆئەوەی باج لەفەرمانڕەوایانی سوریا وەرگرێت، ئەو کەسە پلەوپایەدارە ئەم کارە وەك فەرمانێکی دورخستنەوەی لەوڵات لەقەڵەم دەدات، چونکە بڕێکی زۆر لەمیسریەکان ناتوانن لەگەڵ بارودۆخی دانیشتوانی سوریادا خۆیان بگونجێنن.

سەرەڕای ئەوەش لە"ئزمیر"دا پەرستگایەك بەناوی"ئامون"هەیە و ئەو میسریانەی لەوێ نیشتەجێ بون دیاری پێشکەشی ئەو پەرستگایە دەکەن.

ماوەی دوو ساڵ لە"ئزمیر"مامەوە و لەم ماوەیەدا فێری زمان و نوسینی"بابل"ی بوم، چونکە پێیان وتم هەرکەسێك زمان و نوسینی بابلی بزانێت دەتوانێت بڕوات بۆ تەواوی شارە بەناوبانگەکانی جیهان و لەهەموو شوێنێکدا دەتوانێت لەگەڵ پیاوانی دەرچوی بوارە زانیستیەکاندا گفتوگۆ بکات.

نوسینی"بابلی"لەسەر تەختە قوڕێکی خۆشەکراو لەڕێی قەڵەمێك کەلەشێوەی نوکە ڕمدایە دەنوسن، دوای ئەوە دەیانخەنە ناو ئاگرەوە بۆئەوەی وەك خشت ڕەق و وشك بێتەوە.

من لەسەرەتادا سەیرم لەوە دەهات کە بۆچی نوسینی"بابلی"ش وەك نوسینی میسری لەسەر"پاپیرۆس"نایانوسن، دوای ئەوە ئاگاداری ئەوە بوم کە پاپیرۆس لەناو دەچێت بەڵام ئەم تەختە قوڕە سورکراوانە بۆ هەمیشە دەمێننەوە، ئەمەش ئەوەمان پێنیشان دەدات کە فەرمانڕەوا و پادشاکان بەچ خێراییەك بەڵێن و پەیمانەکانی خۆیان فەرامۆش دەکەن.

یەکێك لەو شتانەی لەسوریادا هەیە و لەمیسردا نیە ئەوەیە کە لەسوریادا پزیشك دەبێت بڕوات بۆ لای نەخۆش و هەرگیز نابینیت نەخۆشێك بڕوات بۆ لای پزیشکێك.

کاتێك پزیشك دەڕوات بۆ ماڵی نەخۆشێك، وا هەست دەکات کە خوداکان ئەویان ناردووە، بۆیە یەکسەر کرێی ئەرکەکەی پێش ئەوەی نەخۆشەکە چارەسەر بکات پێی دەدەن، ئەم کارەش لەقازانجی پزیشکدایە، چونکە نەخۆش کاتێك چارەسەر دەکرێت، کرێی پزیشکەکەی لەبیر دەچێت.

هەریەك لەکەسە دەوڵەمەندەکانی سوریا پزیشکێکی تایبەتیان هەیە و تائەوکاتەی تەندروستن، دیاری پێدەدەن، بەڵام دوای ئەوەی نەخۆش کەوتن، ئەو دیاریەی کە دەبێت بەپزیشك بدرێت دەبڕدرێت تا ئەوکاتەی چارەسەر دەکرێت و تەندروستی باش دەبێتەوە.

بەندەکەم لەو ڕۆژەوەی ئێمە گەشتوینەتە"ئزمیر"هانی ئەوەم دەدات کە بەشێك لەو پارەیەی لەڕێی کاری پزیشکیەوە بەدەستم هێناوە، بدەین بەکەسانێك بۆئەوەی بڕۆن بۆشارەکانی تر و لێهاتویی من لەبواری پزیشکیدا بەخەڵکی شارەکانی تر بگەیەنن.

"کاپتا"دەیوت ئەگەر تۆ لەم شارەدا ناوبانگی دەربکەیت چیتر ناچار نیت بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشەکان سەردانی ماڵەکانیان بکەیت، بەڵکو ئەوان سەردانی ماڵی تۆ دەکەن.

هەرچی من پێم دەوت کە لەسوریادا نەخۆش ناڕوات بۆ ماڵی پزیشك، بەڵکو پزیشك دەبێت بڕوات بۆماڵی نەخۆش، ئەو ئەم قسەیەی منی لا پەسەند نەبوو و دەیوت: لەسەرتادا وایە، بەڵام دوای ئەوەی خەڵکی بەم کارە ڕاهاتن سەردانی ماڵەکەت دەکەن، چونکە خەڵکی گەمژەن و زۆر زوو ملکەچی مۆدێلی ڕۆژ دەبن، بەتایبەت ئەگەر ئەو مۆدێلە لەوڵاتێکی بیانیەوە بێت، ئەوان هەرئەوەی زانیان کە ڕۆشتن بۆ ماڵی پزیشك مۆدێلی ئەو سەردەمەیە، نەریتی خۆیان پشتگوێ دەخەن و نەریتی میسر بەڕێوە دەبەن.

یەکێك لەو کارانەی"کاپتا"هانی دام ئەنجامی بدەم ئەوە بوو کە لەکۆڵان و شەقامەکانی سوریادا سەردانی پزیشکەکان بکەم (لەبەرئەوەی پزیشکان ناچاربون سەردانی کەسە نەخۆشەکانیان بکەن و هەمیشە لە کۆڵان و شەقامەکاندا دەبینرن) و پێیان بڵێم کە:

-من"سینۆهە"پزیشکی بەناوبانگی میسرم و خوێندنم لە"ماڵی ژیان"تەواو کردووە و لەسەرتاسەری جیهاندا ناسراوم و ئەوەندە زانیاریم لەبواری پزیشکیدا

هەیە ئەگەر خوداکان لەگەڵ مندا هاوڕا بن مردوش زیندوو دەکەمەوە و کوێرەکانیش بینا دەکەم، بەڵام زانست لەهەموو شوێن و وڵاتێکدا بەیەك شێوە نیە، هەر وڵاتێك جۆرێك نەخۆشی تایبەت بەخۆیان هەیە.

لەبەرئەوە هاتوم بۆ شاری ئێوە، بۆئەوەی ئاشنایەتی لەگەڵ نەخۆشیەکانی ئێرەدا پەیدا بکەم و چارەسەریان بکەم و زانیاریەکی تەواو لەزانستی پزیشکی ئێوەدا بەدەست بهێنم. من نامەوێت ڕکابەری ئێوە بکەم، چونکە نەهاتوم بۆئەوەی زێڕ و زیو بەدەست بهێنم، زێڕ و زیو بۆ من وەك ئەو خاکە وایە کە لەژێر پێمدایە.

لەبەرئەوە هەرکاتێك بینیتان خواداکانی ئێوە، لەکەسێکی ئێوە توڕە بوو و دوچاری نەخۆشیەکی چارەسەرنەکراوی کرد، بینێرن بۆ لای من لەوانەیە بەهۆی چەقۆ پزیشکیەکانمەوە بتوانم چارەسەری بکەم، چونکە دەزانم ئێوە هەرگیز بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەك چەقۆ بەکار ناهێنن و هەمیشە بۆچارەسەر کردنیان پشت بەدەرمان دەبەستن.

ئەگەر توانیم ئەو نەخۆشانەی ئێوە دەیاننێرنە لای من لەڕێی چەقۆکانمەوە چارەسەر بکەم، لەبەرامبەر ئەو چارەسەریەدا ئەو زێڕ و زیوەی دەیدەن بەمن لەگەڵ ئێوەدا دەیکەم بەدوو بەشەوە، ئەگەر نەشمتوانی ئەوا دەیانگەڕێنمەوە بۆ لای ئێوە و ئەگەر دیاریەکیشیان پێدام، ئەو دیاریەشتان لەگەڵدا دەکەم بەدوو بەشەوە.

کاتێك من بەوشێوەیە لەگەڵ پزیشکێکی سوریادا قسەم دەکرد، ئەو خەریکی خوراندنی ڕیشی بوو و دەیوت هیچ گومانێك لەوەدا نیە کە خوداکان زانستیان بەتۆ داوە، چونکە قسەکانی تۆ، بەتایبەت ئەو بەشەی کە بە دابەشکردنی زێڕ و زیوەوە پەیوەست دەکرێت بەرگویم کەوت، بەلای منەوە زۆر مایەی خۆشحاڵیە.

بەڵام لەبەرئەوەی تۆ لەڕێی چەقۆوە چارەسەری نەخۆشەکان دەکەیت، ئەگەر بشتەوێت ناتوانی ڕکابەری لەگەڵ ئێمەدا بکەیت چونکە ئێمە نەخۆشەکانمان لەڕێی دەرمانەوە چارەسەر دەکەین.

ئێمە لەوباوەڕەداین نەخۆش بە چەقۆ چارەسەر ناکرێت، بەڵکو دەمرێت، تەنها شتێکت پێ ڕادەسپێرم ئەویش ئەوەیە کە هەرگیز لەڕێی جادوگەریەوە چارەسەری کەسێك نەکەیت، چونکە ئەگەر بتەوێت لەڕێی جادوگەریەوە چارەسەری خەڵکی بکەیت، لەو کەسانە دواکەوتوو تر دەبیت کە لەتۆ فێڵبازترن.

من باوەڕم بەو قسەیە بوو و دەمزانی کە لە سوریادا جادوگەرەکان لەشەقام و کۆلانەکاندا وەك پزیشکەکان لەحاڵی گەڕاندان و لەڕێی جادووگەریەوە کەسانی گەمژە چارەسەر دەکەن.

ئەوانیش یان دەمرن یان بەتێپەڕوبونی کات چاك دەبنەوە.

لەمیسری ئێمەشدا جادوگەر هەیە، بەلام جادوگەری لە ولاتی ئێمەدا هونەرێکی تایبەت بە کاهینەکانە. کاهینەکانیش تەنها لەناو پەرستگاکاندا کاری جادوگەری ئەنجام دەدەن. ئەگەر کەسێك لەدەرەوەی پەرستگادا جادوگەری بکات، سزایەکی سەختی بەسەردا دەسەپێنن.

ئەو دەرئەنجامەی کە من لەچارەسەریەکانم لە"ئزمیر"دا بەدەستم هێنا، زۆر مایەی سەرسوڕمان بوو و زۆری نەخایاند کە ناوبانگی من لەشارو و دەرەوەی شاردا بلاو بویەوە.

من لەبەرامبەر ئەو کەسە نەخۆشانەی کە هیچ چارەسەریەکیان نەبوو و دەیانناردە لای من بەڕێك و پێکی ڕەفتارم لەگەڵدا دەکردن و هەرچیم لەکەسە نەخۆشەکان وەرگرتایە دەمکرد بەدوو بەشەوە و بەشێکیم دەدا بەو پزیشکە سریانیەی کە ئەو نەخۆشەی ناردوەتە لام و بەخودی کەسە نەخۆشەکەشم دەوت کە بڕوات بۆ لای پزیشکەکە و پیێ بڵێت چیم پێداوە.

ڕێگا چارەسەریەکانی من چەقۆ بوو و هەرجارێك پێش ئەوەی ئەو چەقۆیە بەکار بهێنم بەجوانی بەئاگر پاکم دەکردەوە دەقاودەق بەپێی نەریتی ماڵی ژیان .

ڕۆژێکیان پیاوێکی کوێر هات بۆلام، ئاشکرا بوو کە ماوەیەکە لەلای پزیشکە سوریەکان چارەسەردەکرێت، بەلام تا دەهات نەخۆشیەکەی خراپتر دەبوو.

ئەو کەرەستە چارەسەریەی بۆ کوێری ئەویان بەکار دەهێنا بریتی بوو لەوەی کەئاوی دەمیان تێکەڵی قوڕ دەکرد و دەیانخستە سەر چاوی.

بەلام من بۆ چارەسەرکردنی ئەو پیاوە، دەرزیم بەکارهێنا و سەرەتا ئەو دەرزیەم خستە ناو ئاگرەوە و دوای ئەوەی جوان پاك بویەوە، بەو دەرزیە چاویم چاك کردەوە و بەهۆی ئەم چارەسەریەوە دوبارە بینایی بۆ گەڕایەوە.

ئەم بابەتە بەڕادەیەك لەڕوی ناوبانگەوە هاوکاری کردم کە لەتەواوی شاری"ئزمیر"دا منیان بە نوێنەری خوداکان لەقەڵەم دەدا، دەیانوت هەروەك چۆن

خوداکان دەتوانن بینایی بەچاو ببەخشن، "سینۆهە"ش دەتوانێت چاویان پێ ببەخشێت.

بازرگانان و کەسە دەوڵەمەندەکانی سوریا، لەبازرگانان و کەسە دەوڵەمەندەکانی ئێمە پڕخۆرترن و ڕۆژی چەند ژەمێك خواردنی کوڵێنراو دەخۆن، خواردنی کوڵێنراویش جەستەیان قەڵەو دەکات و دوچاری گرفتەکانی گەدە و تەنگە نەفەسی دەبن.

دوای ئەوەی من ناوبانگیم دەرکرد، نەخۆشەکان بێئەوەی سەرەتا سەردانی پزیشکەکانی تر بکەن، ڕاستەوخۆ سەردانی منیان دەکرد و منیش بەهۆی چەقۆوە چارەسەرم دەکردن و خوێنی ئەوانم وەك خوێنی ئەو بەرازەی کە سەری دەبڕن دەڕژاند.

من دەرمانم بەپێی توانای دارایی نەخۆش دەفرۆشت، ئەگەر بمزانیایە کە کەسی نەخۆش دەوڵەمەندە، دەرمانەکەم بەگران پێ دەفرۆشت، بەڵام کاتێك بمزانیایە کە نەخۆش کەسێکی هەژارە، دەرمانەکەم زۆر هەرزان پێ دەفرۆشت و لەوباوەڕەدا بووم کە دەبێت لەدەوڵەمەند زۆر وەرگریت و بیدەیت بەکەسی هەژار، بەتایبەت ئەگەر کەسی هەژار لەچینی بەندە و کرێکاران بێت.

"کاپتا"ی بەندەکەی منیش دیاری لەکەسە نەخۆشکان وەردەگرت و زۆرێك لەنەخۆشەکان پێش ئەوەی بێن بۆ لای من دڕۆشتن بۆ لای ئەو بۆئەوەی لەڕێی ئەوەوە زیاتر هاوکاری و وردبینیەکی زیاتر لەنەخۆشیەکەیاندا بکەم.

"کاپتا"هەموو ڕۆژێك لەماڵەکەماندا نانی بەبڕێك سواڵکەر دەدا، بۆئەوەی بڕۆن لەچواردەوری شاردا باسی چارەسەریە سەیرەکانی من بۆ خەڵکی بکەن و بڵێن ئەم پزیشکە میسریە لەسەرتاسەری جیهاندا وێنەی نیە.

من زێڕ و زیوێکی زۆرم بەدەست دەهێنا و ئەو زێڕ و زیوەی کە لەبژێوی ژیانی من زیاتر بوو، لەکۆمپانیای کەشتیەوانی سوریادا دەمخستە گەڕ.

لەسوریادا، کۆمپانیاگەلێکی تێدابوو کە سەرمایەکانیان دابەشی چەند بەشێکی بچوك کراوە و ئەم بەشە بچوکانەش خەڵکی دەیانکڕی.

ئەم بەشە بچوکانەش دابەشی چەند بەشێکی بچوکتر دەکران و ناوی یەك لەسەر دە-یەك لەسەر سەد-یەك لەسەر هەزار-یان لێدەنا.

تەواوی دانیشتوانی"ئزمیر"بگرە گەداکانیش ئەم بەشە بچوکانەیان دەکڕی و لەئەنجامدا دەبونە هاوبەشی سەرمایەی کەشتیەوانیەکان.

هەندێکات دوای ئەوەی دەست بەگەشتەکانی دەکات دیار نامێنێت و چیتر ناگەڕێتەوە، بەڵام کاتێك گەڕایەوە سودێکی زۆر بەخاوەنی سەرمایەکان دەگەیەنێت.

من تا ئەوەندەی دەمتوانی لەمجۆرە پشکانەم دەکڕی بۆئەوەی لەقازانجی کۆمپانیاکانی گەشتیەوانیدا هاوبەش بم.

لەمیسردا ئەم جۆرە ڕەوشە باو نیە و هەر لەبەرئەوەش لەوێ کەشتیگەلێکی مەزنی وەك کەشتیەکانی سوریای تێدا بەدی ناکرێت.

لەوڵاتی ئێمەدا کاتێك خاوەنی کەشتیەك کۆچی دوایی دەکات یەکسەر کەشتیەکەی لەناو دەبەن، بەڵام لەسوریادا لەبەرئەوەی کەشتی بەکۆمپانیاوە پەیوەست دەکرێت و سەرمایەی ئەو کۆمپانیایەش خەڵکی دەیدەن، مەرگی یەك یان چەند کەسێك هیچ کارێك لەهەلومەرجی کەشتیەوانی ناکات، لە"ئزمیر" کۆمپانیاگەلێکم بینیوە کە پێنج سەد ساڵ تەمەنی تێپەڕاندووە.

یەکێك لەسودەکانی بەگەڕ خستنی سەرمایەکانم لەکۆمپانیاکاندا ئەوە بوو کە هەرگیز لەماڵەکەمدا زێڕ و زیوێکی فراوان بەدی نەدەکرا، بۆئەوەی دزەکان تەماعم تێبکەن و بەمەبەستی دزینی بێن بمکوژن.

لەکاتێکدا من وردە وردە خەریك بوو دەوڵەمەند دەبوم"کاپتا"تادەهات قەڵەوتر دەبوو و پۆشاکگەلێکی جوانتریشی لەبەر دەکرد و جەستەی بەعەترگەلێکی خۆشبۆن دەماڵی، سەرەڕای ئەوەی بەتەمەن بوو ژنگەلێکی لاوی لەباوەشی خۆیدا دەخەواند و هەندێکات جۆرێك لەخۆبایی بەسەریدا زاڵ دەبوو کە بگرە لەبەرامبەر منیشدا بێشەرم دەبوو، ئەوکات من گۆچانەکەی خۆمم بۆ دەردەهێنا و چەند دانەیەکی بەهێزم لەشان و پشتی دەدا.

بەڕادەیەك زێڕ و زیوم بەدەست دەهێنا کەبۆ وەگەڕخستنیان لەکۆمپانیاکاندا دوچاری دەردیسەری دەکرم و نەمدەزانی چی لەو هەموو کانزایانە بکەم.

سەرکەوتنی من لەدوو شتەوە سەرچاوەی دەگرت، یەکەم ئەویکە ڕکابەریم لەگەڵ پزیشکانی سوریادا نەدەکرد چونکە بەشێوەیەکی گشتی نەخۆشگەلێکم چارەسەر دەکرد کە ئەوان بەدەستیەوە دەستەپاچە بوبون.

دووەم: ئەوەیکە هیچ ترسێکم لەبەکارهێنانی چەقۆدا نەبوو.

کاتێك پزیشکێکی سریانی نەیدەتوانی کەسێکی نەخۆش چارەسەر بکات پێی دەوت ئەو دەمرێت، لەم حاڵەتەدا خەڵکیش ئەویان بەمردوو لەقەڵەم دەدا.

ئەگەر من دوای بەکارهێنانی چەقۆ، سەرکەوتم لەچارەسەرکردنی ئەو نەخۆشدا بهێنایە لەم حاڵەتەدا هەموان دەستخۆشیان لەم زانستەی من دەکرد، ئەگەر کەسی نەخۆشیش بمردایە، هیچ کەسێك سکاڵای لیٚ نەدەکردم، چونکە دەیانزانی کە کەسی نەخۆش لەهەموو حاڵەتێکدا مردووە.

لەبەرئەوە بەئاسودە خەیاڵی بێئەوەی هیچ ترسێکم لەمەرگی کەسی نەخۆش هەبێت، چەقۆکەم لەچارەسەرکردنیدا بەکار دەهێنا.

هەندێکاتیش سودم لەزانستی پزیشکی سوریا وەردەگرت، چونکە هەندێك لەزانستەکانی ئەوان، بەتایبەت لەبارەی گەرمکردنی کانزاکان بۆ چارەسەر کردنی برینەکان، شایستەی بەکارهێنان بوو.

کاتێك بەوڕادەیە زێڕم کۆکردبویەوە، هەستم بەوە کرد کە چیتر پێویستم بەزێڕ نیە، چونکە لەبەرچاوم بەهای خۆی لەدەست دابوو و هەر بۆیە چیتر دوای ئەوە هەندێکات نەخۆشە هەژارەکانم لەبەرئەوە چارەسەر دەکرد کە تەنها زانیاری پزیشکی خۆم زیاتر بکەم.

لەماوەی ئەم دوو ساڵەی کە لە"ئزمیر"دا بوم، بەهۆی تەنهاییمەوە ئازاری زۆرم دەکێشا، چونکە ژنێکم بەپێی خواستی خۆم بەدەست نەدەهێنا و زۆریش لە ژنە سۆزانیەکان بێزار بوم، چونکە"نفر نفر نفر" بەشێوەیەك منی لەو جۆرە ژنانەی کە تەنها لەپێناو زێڕ و مس دا پیاوان لەئامێزی خۆیاندا دەخەوێنن بێزار کردبوو کە بگرە ئەوکاتانەش کە دەڕۆشتمە ناو پەرستگای سوریاوە بۆئەوەی لەگەڵ ژنێکدا هاوخەون بم، ئەم نەفرەتە سەرتاپامی لێوانلێو دەکرد.

لە"ئزمیر"دا ئەگەر پیاوێك بیەوێت بۆماوەیەکی دیاری کراو لەگەڵ ژنێکدا ڕابوێرێت، دەڕوات بۆ پەرستگا و بۆماوەی کاتژمێرێك یان ڕۆژێك یان شەوێك یەکێك لەژنەکانی پەرستگا دەکاتە خوشکی خۆی.

سوریا خوداگەلێکی زۆری تێدایە کە بەناوبانگترینیان "بەعل"ە.

"بەعل"خودایەکی خوێنمژە کە پێویستی بەقوربانی هەیە و ئەم خودایە دزی ئاسایی قەدەغە کردووە و لەبەرامبەردا ئەو دزیەی کە بەفێڵ دەکرێت ئازاد کردووە.

لە"ئزمیر"دا ئەگەر کەسێك بۆ تێرکردنی سکی منداڵەکانی خۆی ماسیەك بدزێت، ئەوا دەیبەن بۆ پەرستگای"بەعل"و لەبەرامبەر ئەو خودایەدا پارچە پارچەی دەکەن.

بەڵام ئەگەر کەسێك زیو ئاوێتەی ئاڵتون بکات و دوای ئەوە ئەو ئەنگوستیلە کانزایە بەناونیشانی ئاڵتونێکی پاك بەکەسانی تری بفرۆشێت، هیچ ڕەخنەیەکی لێناگرن، چونکە لەڕێی فێڵەوە ئەم مامەڵەیەی کردووە و فێڵیش یەکێکە لەو هونەرانەی کە شایستەی دەستخۆشیە.

هەرلەبەرئەوەش لەم وڵاتەدا هەموو کەسێك لەناسینەوەی زێڕ و زیودا زۆر شارەزان و هەر ئەوەی ئەنگوستیلەی زێر یان زیویان گرت بەدەستیانەوە دەزانن پاکە یان ئالۆدەیە.

خودای مێیینەی دانیشتوی"ئزمیر"، خودایەکە بەناوی"عەشتار"کە هەموو ڕۆژێك پۆشاکی بەری دەگۆڕن. ئەم خودایە لە پەرستگایەکی مەزندا نیشتەجێیە و لەناو ئەو پەرستگایەدا سەدان کچ کەبەڕوکەش"هێشتا پەردەی کچێنیان لەدەست نەداوە"بەڵێنیان داوە تەنها خزمەتی ئەو بکەن، بەڵام ئەمانە تەنها بەڕوکەش وا خۆیان نیشان دەدەن کە هێشتا پەردەی کچێنیان لەدەست نەداوە و بەپێچەوانەی ئەو ناونیشانەی هەیانە ئەرکی ئەوان ئەوەیە کە خۆیان فێری نەریت و هونەری دڵڕفێنی بکەن، بۆئەوەی بتوانن لەگەڵ ئەو پیاوانەی کە سەردانی پەرستگا دەکەن ڕابوێرن.

لە"ئزمیر"دا پەرستگای"عەشتار"دەقاودەق وەك ماڵە سۆزانیەکانی میسر وایە و ژنان لەوێدا پێشوازی لەپیاوان دەکەن و پیاوان هەرچیان پێ بدەن لەپارێزگاری کردنی"عەشتار"دا خەرجی دەکەن.

لەمیسردا ئەگەر پیاوێك لەناو پەرستگادا کاری سێکسی لەگەڵ ژنێکدا بکات، ئەوا ئەو پیاوە بەسزای ئەو کارەی دەینێرن بۆ کانە کانزاکان بۆئەوەی لەوێ وەك بەندەکان کاری پێبکەن و ژنەکەش لەپەرستگا دەردەکەن، بەڵام لە"ئزمیر"دا ئەم جۆرە پەیوەندیانە لەناو پەرستگای"عەشتار"دا ئازادە و سریانیەکان دەڵێن لەبەرئەوە خودی"عەشتار"ئەم کارەی لەناو پەرستگادا ئازاد کردووە چونکە دەزانێت لەمڕێیەوە دەرامەتێکی زۆری دەست دەکەوێت.

ئەگەر پیاوێك نەیەوێت بڕوات بۆ پەرستگای"عەشتار"و لەگەڵ ژنانی ئەوێدا ڕانەبوێرێت یان دەبێت ژن بهێنێت یان دەبێت کەنیزەکێك بۆ خۆی بکڕێت.

لەوانەیە لەهیچ شوێنێکی جیهاندا بەئەندازەی سوریا کەنیزە و کۆیلە بۆ فرۆشتن بونی نەبێت، لەبەرئەوەی هەموو ڕۆژێك کەشتیەکان لەشوێنە دورەکانەوە دێن و ئەو کۆیلە و کەنیزانەی کە لەگەڵ خۆیاندا هێناویانە بۆ فرۆشتن دەیانهێننە ناو بازاڕەوە.

لەنێو ژنە کەنیزەکاندا هەموو جۆرێك بەپێی خواستی پیاو بەدی دەکرێت و نرخیشیان بەو شێوەیەش گران نیە و هەموو کەسێك دەتوانێت کەنیزەیەك بەپێی خواستی خۆی بکڕێت و بیباتەوە بۆماڵی خۆی و لەگەڵیدا ڕابوێرێت.

خودی حکومەتی"ئزمیر"یش بەندە و کەنیزە کەمئەندامەکان دەکڕێت.

ئەم جۆرە کۆیلانە بەنرخێکی زۆر کەم دەکڕدرێن و حکومەتیش کار یان جوانیان لێ ناوێن، چونکە مەبەستیان ئەوەیە بیانبەن بۆ پەرستگای"بەعل"و لەبەرامبەر ئەو خودایەدا بیانکەن بەقوربانی.

حکومەت لەو باوەڕەدایە"بەعل"ناتوانێت لەوە تێبگات کە فریوی دەدەن و ژن یان پیاوێکی کەمئەندامیان بۆ کردووە بەقوربانی.

هەندێکاتیش ئەو جۆرە کەنیز و بەندەانە زۆر پیرن و ددانیان لەدەمدا نەماوە، کاتێك کە دەیانەوێت لەپەرستگای"بەعل"دا بیانکەن بەقوربانی، پارچەیەك قوماشێك بەڕوخساری"بەعل"ە وە دەپێچن بۆئەوەی چاوی بەقوربانیەکانی خۆی نەکەوێت.

منیش بۆئەوەی لەنێو دانیشتوانی"ئزمیر"دا شایەنی ڕێز بم، قوربانیم پێشکەشی خودای"بەعل"دەکرد، بەڵام من لەباتی کوشتنی کۆیلەیەك یان کەنیزەیەك، بەهای کۆیلە یان کەنیزەیەك کە دەبوو بکرێتە قوربانی دەدا بە پەرستگاکە، بۆیە زۆر لەو زێڕ و زیوەی کە دەمدا بە پەرستگا بۆئەوەی کۆیلەیەك یان کەنیزەیەك بکەن بەقوربانی ناوبانگیم دەردەکرد.

ئەو ژنانەی کە لەپەرستگای"عەشتار"دا بون، زۆر جوان بون، چونکە نەریت وابوو کە جوانترین کچانی سوریا بۆ خزمەتکردنی پەرستگای"عەشتار"هەڵبژێردرێن و کاتێك دەگەشتنە تەمەنی باڵغی، ئاشنای هونەری دڵڕفێنیان دەکردن بۆئەوەی بزانن بەچ شێوەیەك بتوانن پیاوان شەیدا خۆیان بکەن، بۆئەوەی بتوانن زێڕ و زیوێکی زیاتریان بۆ پەرستگا لێوەرگرن.

هەموو شەوێك من دەڕۆشتم بۆ پەرستگای عەشتار-لەبەرئەوەی پیاوان لەشەودا دوای ئەوەی دەستیان لەکارەکانی ڕۆژیان هەڵدەگرت دەڕۆشتن بۆ ئەوێ و لەگەڵ یەکێك لەکچانی پەرستگا کە ناونیشانی"کچ"یان هەبوو کاتیان بەسەر دەبرد.

من چیتر ئەو"سینۆهە"سادە و شەرمنەی کە شەوانە دەڕۆشت بۆ ماڵی سۆزانیەکان نیم، بەڵکو بۆ چێژ وەرگرتن لە ژنان چاوم کرابویەوە و دەمزانی کاتێك پیاوێك بیەوێت لەگەڵ ژنێکدا ڕابوێرێت، بەچ شێوەیەك دەبێت سودی لێوەرگرێت.

دوای ئەوەی چەند جارێك ڕۆشتم بۆ پەرستگای"عەشتار"بینیم ئەو ژنانەی کە دڕۆن بۆ ئەوێ هەریەکێکیان جۆرێکی تایبەت بەهونەری دڵڕفێنی و ڕابواردن دەزانێت و ئەمەش یەکێکە لەسود و نەریتەکانی ئەم پەرستگایە، کەتەنها مەبەست بەدەست هێنانی دەرامەتە.

هەربۆیــە ئەوپیاوانــەی ســەردانی ئــەم پەرســتگایە دەکــەن، هــەرجارەو لــە ڕابواردنەکانیاندا فێری شتگەلێکی تازە دەبن، و ئەم جۆرایەتیەش دەبێتە هۆی ئەوەی پیاوان بێزار نەبن لەڕۆشتنیان بۆ پەرستگای"عەشتار".

من شتگەلێکی زۆر لەو ژنانەی ئەوێ فێربوم و وردە وردە لەڕابواردن لەگەڵ ژناندا شارەزاییەکی تەواوم پەیدا کرد، سەرەڕای ئەوەی لەهەر جارێك ڕابواردندا هەستم بەخۆشیەك دەکرد، بەڵام لەدڵەوە لەو ژنانەی ئەوێ بێزاربوم، چونکە دەمزانی کە هیچ جیاوازیەکیان لەگەڵ ژنی ماڵە سۆزانیەکانی میسردا نیە.

"کاپتا"ڕۆژێکیان زۆر بەوردی لەمنی ڕوانی و وتی: گەورەم من لەڕوخساری تۆدا سەرەڕای ئەوەی لاویت، بەڵام چەند چرچ و لۆچیەك دەبینم.

وتم: وانیە.

ئەویش وتی: بەڵێ وایە و هۆکاری ئەوەی ئەم چرچ و لۆچیە لەڕوخساری تۆدا دروست بووە ئەوەیە کە ئەو ژنانەی لەئامێزیان دەگریت لەکانگای دڵتەوە خۆشت ناوێن، ئەگەر پیاوێك ئەو ژنەی خۆش بوێت کە لەگەڵیدا ڕادەبوێرێت ئەوا هیچ کات پیر نابێت.

من لەدوو شت دەترسم، یەکێکیان ڕابواردنتە لەگەڵ ئەو ژنانەی کە خۆشت ناوێن، چونکە دەزانی ئەمانە کاتین و بەم هۆیەوە پیر ببیت، دووەم ئەویکە بەسەرهاتی"نفر

نفر نفر"دوباره ببێتەوە و ژنێکی بێبەزەیی، تۆ بکاتە دیلی خۆی و دوبارە شکستمان پێ بهێنێت.

وتم: دڵنیابە کە چیتر من ناکەومە داوی"نفر نفر نفر"و هاوشێوەکانیەوە.

"کاپتا"وتی:ئەگەر پیاوێك تا دواین ڕۆژی ژیانی توانای پیاوەتی تێدا بمێنێ، ئەگەری ئەوە هەیە بکەوێتە داوی ژنێکی بێبەزەیی و تەماعەوە و هەموو شتێکی خۆی لەدەست بدات، منیش هەوڵی ئەوە دەدەم تۆ لەهەڕەشەی ژنانی زێڕ و زیو پەرست ڕزگار بکەم، دەبێت کەنیزەیەکت بۆ بکڕم کە بتوانی شەوانە لەماڵی خۆتدا لەگەڵیدا ڕابوێری.

پێنج ڕۆژ دوای ئەوە، شەوێکیان کاتێك خۆم کرد بەژورەکەی خۆمدا بینیم"کاپتا"لەگەڵ ژنێکدا خۆی کرد بەژورەکەمدا.

ئەو ژنە، نە خەڵکی میسر بوو نە خەڵکی سوریا و شێوەی زۆر لەخێڵە مرۆڤ خۆرەکان دەچوو، چونکە قژی زەرد و ڕوخساری سپی و چاوێکی شینی هەبوو.

ئەو ژنە نە باڵابەرز بوو و نە لاواز، هەروەها سینەیەکی بچوکی هەبوو، من لەوباوەڕەدا بوم ئەگەر تەواوی ژنە مرۆڤ خۆرەکان بەو شێوەیە بن، ئەوا وڵاتی مرۆڤ خۆرەکان لەماڵی خوداکان باشترە.

"کاپتا"کاتێك ئەو ژنەی کرد بەژوردا جلەکانی بەری داکەند، بۆئەوەی وەك خۆمان"وەك میسریەکان" ڕوت بێت و دوای ئەوە دەستی کرد بەپیاهەڵدان بەسەر جوانی ئەو ژنەدا و وتی: ئەم ژنە کەنیزەیە کە دەریاوانەکانی ئێمە لەکەنار دەریای نەتەوە مرۆڤ خۆرەکان فڕاندویانە و من ئەمڕۆ لەبازاڕی کۆیلە فرۆشەکاندا لەو جوانترم دەست نەکەوت. لەڕوخساری ژندا هیچ هێمایەکی ترس بەدی نەدەکرا و پێدەکەنی و ددانە سپی و درەوشاوەکانی پێنیشان دەدام و دەستی بەسەر هەندێك بەشی ئەندامی دەهێنا کە دەست بردن بۆ ئەو بەشە ئەندامانە مایەی نەنگ بوو و منیش لەوە تێگەشتم ئەگەر ژنێك لەخێڵی مرۆڤ خۆران نەبێت بەوشێوەیە بێشەرم نابێت.

ئەم ژنە، بەزووی بەشێوەیەك خووی بەمنەوە گرت کە بونی دەبووە هۆی مایەی سەرئێشەی من، چونکە ئەو ژنە بەردەوام دەیویست لەگەڵیدا ڕابوێرم، بەڵام من لەپێداگیریەکانی ئەو بەتەنگ هاتبوم، بۆیە ئەو ژنەم بەخشی بە"کاپتا".

بەڵام ئەو ژنە لەگەڵ ئەودا نەدەسازا و لە"کاپتا"ی دەدا و لەدەستی ئەو هەڵدەهاتو دەهاتەوە بۆ لای من، کاتێك من لەوم دەدا خۆشحاڵ دەبوو و دەیوت، لەبەرئەوەی تۆ بەهێزی، لەو باشتر دەتوانی لەگەڵ مندا ڕابوێری.

پەیوەندی ئێمە و ئەو ژنە بەو شێوەیە بەردەوام بوو، تائەوەی ڕۆژێکیان یەکێك لەفەرمانڕەوایانی سوریا هەربەوشێوەیەی پێم وتن کە ژمارەیان زۆرە سەردانی "ئزمیر"ی کرد و بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکەی هات بۆ لام و کاتێك چاوی بەکەنیزەکەی من کەوت زۆر سەیری لێهات، منیش لەوکاتەدا تێگەشتم کە ئەندامی کەنیزەکەم زیاتر سەرنجی ئەو بەلای خۆیدا ڕاکێشاوە، چونکە کەنیزەکەم، وەك ژنە میسریەکان لەماڵدا بەڕوتی دەگەڕا و ئەو فەرمانڕەوایەش هەرگیز ژنێکی بێگانەی بەڕوتی نەبینیوە.

من کە بینیم چاو لەو کەنیزەیەم هەڵنابڕێت، پێم ناساند و بەکەنیزەکەم وت: خواردنەوە بۆ فەرمانڕەوا بهێنە، دوای ئەوەی فەرماڕەوا زانی کە ئەو کەنیزی منە، وتی:"سینۆهە" من دەمەوێت ئەم کەنیزەیەت لێ بکڕم، هەرچەنێکیش زێڕ و زیوم لێ داوا بکەیت پێتی دەدەم.

تا ئەو ڕۆژە لەپێداگری کەنیزەکەی خۆم کە دەیویست بەردەوام لەگەڵیدا ڕابوێرم زۆر بێزار بوبوم، بەڵام کاتێك بینیم ئەو فەرمانڕەوایە داوای ئەو کەنیزەیەم لێدەکات، پێم حەیف بوو کەنیزە جوانەکەی خۆمی پێ بفرۆشم.

چونکە دەمزانی هەرچی بێت هەندێك شەو پێویستم پێی دەبێت، ئەگەر ئەم کەنیزەیەم نەبێت، ئەوا ناچار دەبم بڕۆم بۆ پەرستگای"عەشتار"و لەگەڵ ژنانی ئەوێدا ڕابوێرم.

سەرەڕای ئەوەش، هەرئەوەی فەرمانڕەوا خوازیاری کەنیزەکەی من بوو، بەهای لەبەرچاوم زیاتر بوو، چونکە کاتێك دەبینین کاڵاکانمان کڕیاریان نیە، بەبێ نرخ دێنە بەرچاومان، بەڵام کاتێك کڕیاریان بۆ پەیدا بوو، لەبەرچاومان بەهادار دەبن.

ئێستا کاتی ئەوە هاتووە باسی داهێنانەکانی خۆمتان بۆ بکەم. کاتێك لەمردووخانە کارم دەکرد، ئەوەم هات بەمێشکدا ئەگەر بتوانرێت ددانەکان بەهۆی جۆرێك ڕوکەشەوە بپارێزین، ئەوا ئەو ددانە لەهەموو زیانێك بەدور دەبێت.

لەمردووخانەدا کاتێك مردووە دەوڵەمەندەکانیان مۆمیا دەکرد، ددانەکانیان بەتوێژێکی ئاڵتونی دادەپۆشی و ئەم ڕوپۆشە ئاڵتونیە دەچەسپێنرا بەگۆشتی پوکی ئەو مردووەوە. لەئەنجامدا کاتێك هێماکانی هەڵوەشان لەجەستەی مردوودا پەیدا دەبێت، ددانەکان لەپوك جیانەدەبونەوە و دوای هەزار ساڵ ددانەکانی وەك خۆیان دەمانەوە.

ددانی مردووەکان، دوای مۆمیاکردنیان لەناو ناچن، چونکە ددانەکان دوای مەرگ بۆگەن ناکەن و هەڵناوەشێن، بەڵام لەپوك جیادەبنەوە، بۆیە بەهۆی ئەو زێڕەوە بەپوکەوە دەیانبەستنەوە بۆئەوەی لێی جیا نەبنەوە.

من لەوباوەڕەدا بوم ئەگەر بتوانرێت ددانی مرۆڤە زیندووەکان بەڕوپۆشێکی ئاڵتونی داپۆشین، لەوانەیە ڕێ لەناوچون و هەڵوەشانی ددان بگرێت، تا ئەوکاتەی لە"تبس"دا بوم، کەمدەرامەتیم ڕێی پێنەدەدام دەست لەو کارەوە بدەم، بەڵام دوای ئەوەی ڕۆشتم بۆ"ئزمیر"و زێڕ و زیو لەبەرچاوم ئەو بەهایەی خۆیان لەدەست دا، بڕیارم دا ئەو بابەتە تاقی بکەمەوە و تێگەشتم کە ڕوپۆشکردنی ددان بەئاڵتون، دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی کە ددانی مرۆڤە زیندووەکان خراپ و کلۆر بن.

ئەو فەرمانڕەوایەش کە بۆ چارەسەرکردنی خۆی سەردانی کردبوم، دەیویست چارەسەری ددانەکانی بۆ بکەم، ڕازی بوو بەوەی من بەڕوپۆشێکی ئاڵتون ددانەکانی بۆ داپۆشم، بۆئەوەی لەئایندەدا خراپ نەبێت، دوای ئەوەی ددانەکانی سەرەوە و ددانەکانی خوارەوەم بەڕوپۆشی زێڕ ڕازاندەوە، پێی وتم:"سینۆهە" تۆ ئەرکێکی زۆرت بۆ من کێشا و ددانەکانی منت لەهەڕەشەی هەڵوەشان و پوکانەوە پاراست و ئەو برە پارەیەی پێمداویت گەرچی زۆرە بەڵام سەرەڕای ئەوەش لەئاستی ئەو زانستەی تۆدا نیە.

سەرەڕای ئەوەی پیاوەتیت بەسەر منەوە هەیە، لەبەرئەوەی من پیاوێکی ڕاستگۆم پێت دەڵێم کە خوازیاری ئەم کەنیزەیەی تۆم، ئەگەر ئەم کەنیزەیەم پێ بفرۆشی، نرخێکی باشت پێدەدەم و ئەگەر پێم نەفرۆشی، دڵنیابە لێتی دەفڕێنم و ئەگەر بەرگریش بکەیت ئەوا ناچارم بتکوژم.

من تائێستا لەگەڵ کەنیزەی مرۆڤ خۆرەکاندا ڕامنەبواردووە و دەبێت پێم بفرۆشی بۆئەوەی لەگەڵیدا ڕابوێرم و بزانم ئایا چێژی لەژنە چاو ڕەشەکانی ئێمە کە قژێکی ڕەشیان هەیە زیاترە.

کاتێك فەرمانڕەوا ئەم قسەیەی کرد بەندەکەم"کاپتا"-دوای ئەوەی پێی ناوەتە سوریاوە، لەسەوداگەرانی سوریاوە ئەوە فێر بوبو کە بەچ شێوەیەك بازاڕ گەرم بکات- لەوێ ئامادەبوو و بۆئەوەی بازاڕی مامەڵەکە گەرمتر بکات و پادشا هانی ئەوە بدات لەبەرامبەر ئەم کەنیزەیەدا بەهایەکی زۆرمان پێ بدات، بەدەم هاوارەوە دەیوت: ئەمرۆ شومترین ڕۆژی ژیانی خاوەنەکەمە، خۆزگە هەر لەدایك نەبومایە و ئەم ڕۆژەم بەچاوی خۆم نەبینیایە، چونکە لەم ڕۆژەدا تۆ دەتەوێت خاوەنەکەم لەتاکە کەرەستەی خۆشی بێبەش بکەیت و ئەو کەنیزەی کە هەموو شەوێك لەباوەشیدا دەخەوێت لێی زەوت بکەیت، من دەزانم هەرگیز هیچ ژنێکی تر ناتوانێت وەك ئەم ژنە دڵی خاوەنەکەم ئەوەندە خۆشحاڵ بکات، چونکە ژنێکی تر بەو جوانیەوە بەدی ناکەیت، تەماشای بکە ڕوخساری لە مانگی چواردە جوانترە و دوو مەمانی لە میوەی ترنجی"ئزمیر" بچوکترن، ئایا ورگی ڕێکی ئەوت بینیوە کە هیچ دەرپەڕینێکی تێدا بەدی ناکرێت، ئایا لەناوەڕاستی ئەم وەرگەدا چاڵی ناوکی دەبینی، تەماشاکە لەسەرتاپای جەستەی ئەم ژنەدا تاکە مویەك بەدی ناکرێت و باڵای ئەم کەنیزەیە لە شیری مانگا سپی ترە و لەپاقلەی کوڵاویش نەرمترە، من دڵنیام کە خوداکان تەواوی ڕەنگە جوانیەکانیان کۆکردووەتە و لەڕوخسار و جەستەی ئەم ژنەدا بەکاریان هێناوە، چونکە قژی زەرد و چاوی سەوز و لێوی سور و ناخونی خەنەیی و ئەندامی سپیە و دوو گۆی مەمانی ئەرخەوانیە.

کاتێك بەندەکەم بەوشێوەیە بازاڕەکەی گەرمدەکرد، پادشا بەڕادەیەکی زۆر وروژابوو، هەروەها بەهۆی ئەو پەیوەست بونەی بەکەنیزەکەی منەوە هەیبوو بەدەم هەناسە بڕکێوە وتی:"سینۆهە"من دەزانم کە کەنیزەکەت زۆر جوانە بەڵام هەرچەنێکم لێ داوا بکەیت پێتی دەدەم، ئەگەر ڕازیش نەبیت ئەم کەنیزەیەم پێ بفرۆشی ئەوا بەدڵنیاییەوە دەتکوژم.

من دەستم بەرز کردەوە کەبەندەکەم بێدەنگ بکەم، ئەویش ناڵە و گریانی خۆی بڕی و منیش ڕوم کردە پادشای"ئامورو"کە یەکێك بوو لەفەرمانڕەوایانی وڵاتی سوریا و پێم وت:

ئەم ژنە بەلامەوە زۆر خۆشەویستە و ئەگەر ئەو لەبەرامبەر زێڕدا بفرۆشم، دڵنیابە خیانەتم لەخۆم کردووە، لەبەرئەوەش حەزناکەم ئەم ژنە لەلایەن منەوە بفرۆشرێت، بەڵام ئامادەم بێبەرامبەر کەنیزەکەی خۆمت پێشکەش بکەم، بۆئەوەی تۆ بەیادی هاوڕێیەتی ئێمەوە بتوانی بیکەیت بەخوشکی خۆت و لەخۆشیەکانی بەرهەرەمەند بیت.

پادشای"ئامورو"کاتێك زانی من ئامادەم کەنیزەکەی خۆمی پێشکەش بکەم، بەجۆرێك خۆشحاڵ بوو و هاواری کرد:ئەی"سینۆهە"من لەوباوەڕەدا نەبوم کە میسریەك ئەوەندە دەستکراوە و لێبوردە بێت، لەبەرئەوەی لەسەردەمی منداڵیەوە تا ئێستا هەرچی میسریم بینیوە کاربەدەستانی فیرعەون بون و دەهاتن بۆئەوەی باجمان لێ وەرگرن و بەردەوام دەستیان بۆ وەرگرتن کراوە بوو و هەرگیز دەستیان بۆ ئەوە درێژ نەکردوە شتێك بەکەسانی تر بدەن.

تۆ یەکەمین میسرێت کە بۆت سەلماندم ئەکرێت لەمیسردا کەسانێك بەدی بکرێت کە دەستی بەخشینیان هەبێت، ئەگەر ڕۆژێك بێیت بۆ وڵاتی"ئامورو"بەڵێنت پێ دەدەم کە تۆ لەلای ڕاست خۆم دادەنیشێنم.

ئەوکات بەندەکەم پۆشاکی بۆ کەنیزەکەم هێنا و ئەویش لەبەری کرد و لەگەڵ پادشای"ئامورو" کە پیاوێکی لاو و بەهێز و کەتە و ڕیشێکی ڕەش و درێژی هەبوو چووە دەرەوە، کاتێك دەرۆشتە دەرەوە بینیم تەماشای ئەو پیاوە بەهێزە دەکات کە خاوەنی تازەیەتی و زۆر خۆشحاڵ دیارە.

دوای ئەوەی پادشا ڕۆشت"کاپتا"دەستی کرد بەبۆڵە بەسەرمدا و وتی: بۆچی هیچ شتێکت لەپادشای"ئامورو"وەرنەگرت، لەکاتێك ئەو ئامادە بوو داوای هەرچی بکەیت پێت بدات.

وتم: من لەبەرئەوە ئەو کەنیزەیەم بێ بەرامبەر بەو دا چونکە لەئایندەدا هیچ کەسێك نازانێت چی ڕوو دەدات و چی بەسەر ئەم جیهانەدا دێت، بۆنی هاوڕێیەکی مەزن بۆ ڕۆژە ڕەشەکان زۆر بەسودە و لەوانەیە ڕۆژێك پێویستم بەوە بێت بڕۆم بۆ وڵاتی ئەو پیاوە و لەوێ لەهەڕەشەی دژمنان ئاسودە خەیاڵ بم، گەرچی ئەم پیاوە وڵاتێکی بچوکی هەیە و لەداراییەکانیدا جگە لە مەڕ و وڵاخ هیچ شتێکی تری تێدا

بەدی ناکرێت، بەڵام سەرەڕای ئەوەش دۆستایەتی ئەو بۆ من لەکاتی دەرکەوتنی هەر هەڕەشەیەکدا خۆی بۆ خۆی دەستکەوتێکە.

پادشای"ئامورو" بۆماوەی سێ ڕۆژی تر لە"ئزمیر"دا مایەوە وکاتێکیش ویستی بڕوات، بۆ ماڵئاوایی هاتەوە بۆ لام و وتی: "سینۆهە" ئەگەر تۆ تەواوی زێڕ و زیوی میسرت پێ بدایەم ، بەئەندازەی ئەوەی ئەم کەنیزەیەت پێدام خۆشحاڵ نەدەبوم، چونکە ئەم کەنیزەیە خۆشەویستترین ژنە کە من تائێستا بینیبێتم و دڵنیام کە هەرگیزیش تێری لێناخۆم.

ئەگەر تۆ ڕۆژێك سەردانی وڵاتەکەی من بکەیت، داوای هەرچیم لێ بکەیت پێتی دەدەم، جگە لە دوو شت یەکێکیان ئەم کەنیزەیە و ئەویتریان ئەسپە، چونکە لەوڵاتەکەی ئێمەدا ئەسپ زۆر کەمە و بڕێکی کەم لەوێدا بەدی دەکرێت و بۆ کالیسکە جەنگیەکانی من زۆر پێویستە.

بێ لەو دوانە داوای هەرچیم لێ بکەیت پێتی دەدەم و هەرکەسێکیشت بوێت بۆتی دەکوژم، ئەگەر لە"ئزمیردا" کەسانێك دژمنایەتی تۆ دەکەن، پێم بڵێ، من لەڕێی کەسە هەڵبژاردەکانی خۆمەوە لەهەمان ئەم شارەدا بۆتی دەکوژم و دڵنیاش بە کە ناوی تۆ ناهێنرێت.

دوای ئەم قسەیە پادشای"ئامورو"ماچی کردم و ڕۆشت، بەڵام من چەند شەوێك بەهۆی ئەوەی لەکەنیزەکەی خۆمەوە دور بوم هەستم بەبێزاری کرد، چونکە بەو ڕاهاتبوم و هەندێك شەویش بۆ قەرەبوی شەوە لەدەست چووەکانم دەڕۆشتم بۆ پەرستگای"عەشتار"، بەڵام ئەو ژنانەی کە لەوێ بون نەیاندەتوانی وەك کەنیزەکەی خۆم ببنە مایەی خۆشحاڵیم.

ئەوکات ئاو و هەوا گەرم بوو و وەرزی نیوە بەهار گەشت و گوڵەکان شکۆفەیان کرد و پەڕەسێلەکەکان دەستیان بەسەما و فڕین کرد و کەشتیەکان لە لەنگەرگای"ئزمیر"دا کەوتنە جوڵە بۆئەوەی بڕۆن بۆ وڵاتانی تر و لەوێوە کاڵا و کۆیلە و کەنیزەك لەگەڵ خۆیاندا بهێنن.

شاری"ئزمیر"لەنیوە بەهاردا دەوروژێت، چونکە کاتی جەژنی دەرهێنانی خودای"تەموز"ە لەژێر خۆڵدا .

کەشیشەکانی سوریا هەموو ساڵێك لەوەرزی پایزدا خودای"تەموز"بەخاك دەسپێرن و لەنیوە بەهاردا لەڕۆژێکی گەرمدا، لەژێر خۆڵ دەردەهێننەوە.

کاتێك ڕۆژی دەرهێنانی پەیکەری خودای"تەموز" دێتە پێشێ، ڕۆژی شادمانی گشت خەڵکی"ئزمیر" بوو، لەو ڕۆژەدا ژن و پیاو لەشار دەردەچن و دەڕۆن بۆ بیابان و تەواوی ژن و پیاوەکان لەم ڕۆژەدا لەبیاباندا، بەئاشکرا لەگەڵ یەکتردا ڕادەبوێرن.

مـن ئـەو ڕۆژە ڕۆشـتم بـۆ بیابـان بۆئـەوەی بـزانم خـەڵکی چـی دەکـەن و بینـیم کەشیشەکان پەیکەری خودای"تەموز"یان لەژێر خۆڵدا دەرهێنا و خەڵکی خۆشحاڵی خۆیـان دەربڕی و کەوتنە سەماکردن و دەیانوت خودای"تەموز"زیندوو بووەتـەوە و ئەو خودایەش کەخودای گەرمایە هەروەك چۆن زەوی و ئاو و هەوای دەوروبەر گەرم دەکـات، گەرمیـەکیش بەجەسـتەی مـرۆڤ دەبەخـشێت و وا لـەژن و پیـاو دەکـات کـە پێویستیان بەیەکتر بێت.

ئەوکاتەی کە خودای"تەموز"یان لەژێر خاکدا دەردەهێنا، من بینیم کە کۆمەڵێك ژن گالیـسکەیەك بـەدوای خۆیانـدا ڕادەکێـشن و لەسـەر ئـەو گالیـسەکەیەدا پەیکـەری "کێری"پیاویان داناوە، ئەو پەیکەرەشیان لەدار تاشی بوو.

من سەرم سوڕما لەوەی کە مەبەست لەم کارە چیە، تائەوەیکە لەناکاو بینیم ژنان و پیاوان تێکەڵی یەکتر بون و بێئەوەی شەرم لەیەکتری بکـەن لـەئامێزی یەکتریـدا خـەوتن و ئەم کردارە ئاژەڵیە تا شەو بەردەوام بوو.

دڕندەیی هەندێك لەخێڵەکان دەبێت لەم جۆرە ڕەفتارانەیانەوە هەڵێنجێنی، چونکە لەمیسردا کە میلەتێکی شارستانی هەیە، هەرگیز ئەم جۆرە ڕەفتارانەیان لێ ناوەشێتەوە.

ئەندێك لەژنە پیرەکان کە نەیاندەتوانی کەسێك بۆ خۆیان پەیدا بکەن، تکایان لەپیاوان دەکرد کە لەو پەیوەندیانە بێبەشیان نەکەن، لەبەرئەوەی من لەو ئاهەنگەدا تەنها تەماشاچی بووم، زیاتر تکا لەمن دەکرا، بەڵام من ژنە پیرەکانم بەنەفرەتەوە لەخۆ دور دەکردەوە و پێم دەوتن کە خوداکان سنورێکیان بۆ ژنان داناوە و کاتێك ژنێك ئەو قۆناخە تەمەنەی تێپەڕاند، چیتر نابێت بیر لەوە بکاتەوە پەیوەندی سێکسی لەگەڵ پیاواندا بکەن، چونکە ئەگەر خوداکان بیانویستایە ژنیش وەك پیاوان تا دوا تەمەنیان لەگەڵ ڕەگەزی بەرامبەردا پەیوەندی سێکسی بکەن، سنورێکیان بۆ خواست و ئارەزووەکانیان دانەدەنان.

*بەشی یازدەیەم*

## (هورم هب) ئاشنای پێشین

دوای ئەم جەژنە، لەسنوری سوریاوە هەواڵ هات کەخێڵەکانی"خبیری" دوبارە دەستیان کردووەتەوە بەهێرش بردن.

هێرشی خێڵەکانی"خبیری"شتێکی تازە نەبوو، لەبەرئەوەی هەموو ساڵێك لەوەرزی بەهاردا دەستیان دەکرد بە هێرش بردن، بەڵام لەو ساڵەدا زۆر بێشەرم بون و بگەشتنایەتە هەر شوێنێکەوە پاسەوانە میسریەکانیان دەکوشت و لەهەندێك شوێنیشدا سەرۆکی ناوچەکانیان دەکوشت و لەشارێکی بچوکیشدا، تەواوی پادشا و تەواوی دانیشتوانەکەی، بگرە ژن و منداڵەکانیشیان دەکوشتن.

کاتێك ئەم هەواڵە گەشت بە فیرعەون، بۆ ڕوبەڕوبونەوەی خێڵەکانی"خبیری" لەمیسرەوە لەشکرێکی بۆ ناردن، منیش تێگەشتم کە جەنگێکی مەزن لەنێوان هێزی سەربازی میسری و خێڵەکانی"خبیری"بەرپا دەبێت.

من هەرگیز گۆڕەپانی جەنگم نەبینیوە و هیچ زانیاریەکەم لەبارەی بریندارانی گۆڕەپانی ئەو جەنگەوە نەبوو و نەمدەزانی کە گورز و شمشێر و ڕم چ جۆر برینێك لەجەستەی مرۆڤدا دروست دەکات.

پێویستی بەدەستی هێنانی زانیاری تەواو دەربارەی برینداران گۆڕەپانی جەنگ منی هان دا کە ئەو گۆڕەپانە ببینم و هەر بەو هۆیەشەوە لە"ئزمیر"دەرچوم و بەرەو باشوری ئەو وڵاتە کەوتمە ڕێ و لەشارێکی بچوك بەناوی"ئورشەلیم"گەشتم بەهێزی سەربازی میسر کە لە کەنار ڕوباری"نیل"ەوە هاتبون. ئەم هێزە بەپێچەوانەی ئەوەی

ناوبانگیان پێدەرکردووە، زۆر بەهێز نەبون و لەکۆمەڵێك گالیسکەی جەنگی و دوو هەزار تیروکەوان هاوێژ و ڕم بەدەست پێکدەهاتن.

کاتێك چومە ناو ئۆردوگاوە، ویستم چاوم بەفەرمانڕەوای هێزی سەربازی بکەوێت‌و پرسیم فەرمانڕەوای هێزی سەربازی کێیە، بۆئەوەی مۆڵەتی لێ وەرگرم لەگۆڕەپانی جەنگدا کاری پزیشکی خۆم ئەنجام بدەم.

پێیان وتم کە فەرماندەی هێزی سەربازی کەسێکی لاو و جوانە بەناوی"هورم هوب"، من داوام لێکردن بمبەن بۆ لای ئەو و هەر ئەوەی ئەوم لەدورەوە بینی ئاگادار ئەوە بووم کە زۆر ئاشنا دێتە بەرچاوم، دوای ئەوەی لێی نزیك بومەوە، یەکسەر هاتەوە یادم کە"هورم هب"هەمان ئەو لاوەیە کە ڕۆژێك من لەگەڵ جێنشینی میسردا ڕۆشتم بۆ بیابان، لەبەرەبەیاندا ئەو لەگەڵ شەهێنەکەیدا دەرکەوتن و دوای ئەوە چووە ژێر باری خزمەتی جێنشینی میسر بەواتا فیرعەونی تازەوە.

"هورم هب"یش منی ناسیەوە و وتی: ئاه...."سینۆهە" تۆ لێرە چی دەکەیت؟ هەموو خەڵکی میسر باسی ئەوە دەکەن کە تۆ مردویت و نەفرەتی دایك و باوکت تۆیان لەناو بردووە لەبەر ئەوەی تۆ گۆڕەکەیانت فرۆشت.

دوای ئەوەی پرسیاری ئەوەی لێکردم کە چیم بەسەر هاتووە، منیش تا ئەو شوێنەی پێویست بوو باسی سەرگوزەشتی خۆمم بۆ کرد و وتم: کە بومە قوربانی ژنێك بەناوی"نفر نفر نفر".

(هورم هب)یش وتی: منیش لەگەڵ ئەو ژنەدا خەوتوم و ئەو دەیویست دەست بەسەر هەموو شتێکی مندا بگرێت، بەڵام بەپێچەوانەی تۆ ماڵ و گۆڕی دایك و باوکمم پێ نەفرۆشت، بەڵکو بەم شیلاقەی بەدەستمەوەیە تەمێیەکی باشم دا، چونکە"سینۆهە"دەبێت ئەوەت پێ بڵێم کە ژن تا ئەوشوێنە شایەنی ڕێزە کە نەگۆڕابێت بەتیمساحێك، بەڵام کاتێك وەك تیمساح کەسێکی تەماعکاری لێ دەرچوو، لەم کاتەدا دەبێت وەك ڕسواترین کۆیلە مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت.

دوای ئەوە منیش پرسیاری کاروباری میسرم لێکرد و"هورم هب"یش لەوەڵامدا وتی: نازانم نەتەوەی میسر چ گوناهێکیان کردووە کەخوداکان ئەم فیرعەونەیان کردووە بە پادشای ئەوان، چونکە ئەم فیرعەونە کەسێکی بێمێشك و شێتە.

خودای ئەم فیرعەونە، کە ئەو ناوی خۆی لەوەوە بەدەست هێناوە خودایەکە وەك خۆدی ئەو شێتە و شتگەلێك دەڵێت کە شێتەکانیش نایڵێن.

ئایا لەبیرتە کاتێك ئەم فیرعەونی پادشایە تەواوی ئەو بەندەانەی کە لەکانە کانزاکاندا کاریان دەکرد ئازاد کرد؟

ئایا بیستت یان بینیت کە ئازادی ئەم بەندەانە چ ئاژاوەیەکی لەگەڵ خۆیدا هێنا و بە چ شێوەیەك ئێمە بۆئەوەی هێمنی و ئاسایش بۆ شاری"تبس"بگەڕێنینەوە، ناچار بوین هەموویان بکوژین.

وتم: بەڵێ، کاتێك بەندەکان لە کانە کانزاکان ئازاد کران، خودی من لە"تبس"دا بوم و بینیم بەچ شێوەیەك هێرشی فەرهودیان بۆ"شاری مردووەکان"هێنا و هەموو شتێکیان تالان کرد.

(هورم هب)وتی:فیرعەون سەرەڕای ئەوەی بینی کە ئازاد کردنی کۆیلەی کانە کانزاکان چ ئاژاوەیەکی ناوەتەوە، هێشتا لەقسەکانی خۆی پاشگەز نەدەبویەوە و دەیوت هیچ جیاوازیەك لەنێوان کۆیلەیەك و شازادەیەکدا نیە و خودا بەندە و کۆیلە و کەسە وەجاخزادەکان بەیەك چاو تەماشا دەکات و نابێت کۆیلەکان ناچار بکرێن لەکانە کانزاکاندا کار بکەن.

من دڵنیام کە فیرعەونە کۆنەکانی میسر، کاتێك لە قوچەکەکاندا گوێیان لەم قسانە دەبێت، لەرز دایان دەگرێت و لەسەرەتای جیهان تا ئەمرۆ، هیچ پادشایەك نەهاتووە و بڵێت هیچ جیاوازیەك لەنێوان کەسە وەجاخزادەکان و کۆیلەکاندا نیە و ئەمەش وەك ئەوە وایە کە بڵێت:هیچ جیاوازیەك لەنێوان ئاوجۆ و هەنگویندا نیە.

یەکێك لەقسە سەیرەکانی ئەم فیرعەونە ئەوەیە کە پێی وتم: دەبێت بەشێوەیەك خێڵەکانی "خبیری"لەسەر بەرەی خۆیان دانیشێنم کە هیچ خوێنێك لەنێوانماندا نەڕژێت.

ئایا ئەکرێت بێئەوەی خوێن بڕێژیت بتوانیت کەسە دڕەندەکان ئارام بکەیتەوە؟ تۆ"سینۆهە" کە پزیشکیت، ئایا دەتوانی بێ خوێنڕشتن ورگێك هەڵدڕی و ڕیخۆڵە کوێرەی لەورگیدا دەربهێنی، بۆئەوەی نەبێتە هۆی مەرگی ئەو کەسە؟

فیرعەون دەنگی جەنگی ئەم خێڵانە کە لەدەنگی دڕندەکان خراپترە نەبیستووە ، بۆئەوەی بزانێت کە ناتوانرێت بەنەرم و نیانی ڕفتاریان لەگەڵدا بکرێت.

"هورم هب"دوای ئەم قسانەی پێکەنی و وتی: بەڵام من پشت بەقسەی فیرعەون نابەستم و بەشێوەیەك خوێنیان دەڕێژم کە هەموویان لەوە پەشیمان ببنەوە کە بۆچی هەر لەسەرەتاوە لەدایك بون.

من بڕیارم داوە بەشێوەیەك ڕیشکی ئەم خێڵانە لەبنەوە هەڵکێشم، بۆئەوەی لەئایندەدا لەوەرزی بەهاردا خێڵەکانی"خەبیری"جارێکی تر هێرش نەبەنە سەر هیچ کەسێك.

بەڵام"سینۆهە"من قەرزای تۆم، چونکە من هیچکاتێك ئەوە فەرامۆش ناکەم کاتێك ئێمە لەگەڵ جێنشینی میسردا پێکەوە لەبیابانەوە گەڕاینەوە، ویستیان بمکوژن، بەڵام تۆ قسەیەکت کرد کەبووە ڕێگر لەبەردەم کوشتنی مندا و لەو ڕۆژەدا تۆ بەهزر و مێشکی خۆت منت لەمەرگ ڕزگار کرد.

هەرلەبەرئەوەش من ئێستا لەناو ئەم هێزی سەربازیەی خۆمدا ڕێزت لێدەگرم و ڕێت پێدەدەم تۆش لەگەڵ ئێمەدا لەجەنگدا ئامادە بیت و چارەسەری سەربازەکان بکەیت و کرێکەشت لەسەر ئەرکی فیرعەون پێدەدەم، هەرکاتێکیش من بێکار بم تۆ لەگەڵ مندا دەبیت و لەگەڵ منیشدا نان دەخۆیت.

ئەوکات"هورم هب"پێکێکی لەشەراب نۆشی، دوای ئەوە وتی:کاتێك هەواڵی هێرشی خێڵەکانی"خبیری" گەشتە"تبس"و فیرعەون ویستی هێزێك بنێرێت بۆ سوریا، هیچ یەك لەفەرمانڕەوایانی سەربازی میسر ئامادە نەبون فەرماندەیی ئەم هێزە سەربازیە لەئەستۆ بگرن، لەبەرئەوەی دەیانزانی خێڵەکانی"خبیری"کەسانێکی خوێنمژ و جەنگاوەرن و هەریەك لەوانە بەبیانوی شتێکەوە فەرماندەیی ئەم هێزەیان ڕەتکردەوە.

چونکە سەرەڕای ئەوەی دەترسان لەوەی کە بکوژرێن، دەیشیانزانی کە لەزێڕ و زیوو مس بەدور دەبن، چونکە لەبیابانی سوریادا زێڕ و زیو نیە، لەکاتێکدا لەچواردەوری فیرعەوندا زێڕ و زیوێکی فراوان بەدی دەکرێت.

بەڵام من سەرەڕای ئەوەی لەتەواوی فەرمانڕەوایانی فیرعەون لاوترم، ئەم ئەرکەم لەئەستۆگرت، بۆئەوەی هەڕەشەی"خبیری"ەکان لەناو ببەم و کارێك بکەم کە چیتر ئەمانە نەتوانن هێرش بۆ سوریا ببەن.

فەرمانڕەوایانی فیرعەون کە سەروەت و سامانێکی زۆریان هەیە لەگەڵ کاهینەکانی "ئامون"دا هاودەستن و هەوڵی ئەوە دەدەن کە کاریگەری خودای"ئامون" لەناو نەچێت و وەك خۆی بمێنێتەوە.

ئەمڕۆ لەمیسردا، لەنێوان خودای فیرعەون"ئاتون" و خودای کۆنی میسر "ئامون"دا جەنگێکی مەزن هەڵگیرساوە و هێشتا دیار نیە کە کێ لەم شەڕەدا سەرکەوتن بەدەست دەهێنێت.

بەو شێوەی من لێی تێگەشتوم"ئامی"دادوەری مەزنی میسر و کاهنی خودای"ئاتون" دەیەوێت "ئامون" لەمیسردا لەناو ببات و لەمکارەشدا فیرعەون پشتیوانی دەکات.

فیرعەون دەزانێت کە خودای"ئامون" بەڕادەیەك لەمیسردا بەهێز بووە کە کاهینەکانی "ئامون"فەرمانڕەوایی فیرعەون پەسەند ناکەن و لەهەموو بابەتێکدا کە بەرژەوەندیان لەگەڵ فەرمانەکانی فیرعەوندا نەگونجێت، فەرمانێك لەلایەن"ئامون"ەوە دەردەکەن بۆئەوەی لەو ڕێیەوە ئەو فەرمانەی فیرعەون ڕەت بکەنەوە.

فیرعەون و دادوەری مەزن لەوە زیاتر ناتوانن بەرگەی فەرمانڕەوایی خودای "ئامون"و کاهینەکانی بگرن، لەبەرئەوەش هەوڵی ئەوە دەدەن خودای"ئاتون"ئەوەندە مەزن بکەن کە خودی"ئامون"لەناو بچێت، بەمشێوەیەش فەرمانیان بەمن داوە لەم گەشتەمدا بڕۆمە هەر شارێك پەیکەرێك بۆ خودای"ئاتون"دروست بکەم و من یەکەمین پەرستگا لێرە لە"ئۆرشەلیم"دا دروست دەکەم.

من باوەڕم بەخودای"ئامون"هەیە نەك بە"ئاتون" بەڵام لەوباوەڕەدام کە فیرعەون لەم بەشەدا بەهەڵەدا نەچووە و ئەو بواری ڕامیاریەی کە گرتویەتە بەر دروستە، چونکە جێی پەسەند نیە کە وڵاتێکی وەك میسر فیرعەونی هەبێت، بەڵام کاهینەکانی"ئامون"لەباتی ئەو فەرمانڕەوایی وڵات بگرنە دەست.

مەبەستم ئەوەیە لەبەرئەوەی فەرمانڕەوایانی میسر لەگەڵ کاهینەکانی"ئامون"دا هاودەستن، لەئێستاشدا بەرژەوەندیەکانیان لەژێرباری هەڕەشەدا دەبینن، ناتوانن لەمکاتەدا لەمیسر دوربکەونەوە و بەرگری لەبەرژەوەندیەکانی خۆیان نەکەن، ئەگەر لەگۆڕانکاریە کتوپڕەکانی میسر نەترسابان، لەوانەبوو یەکێك لەوان فەرماندەیی ئەم هێزە سەربازیەی لەئەستۆ بگرتایە و لەمیسرەوە بهاتبا بۆ سوریا.

وتم: منیش هیچ نکوڵیەکم لە بوارە ڕامیاریەکانی فیرعەون نیە، بەڵکو هەموو مافێکی پێدەدەم کە بەهەموو شێوەیەك لەدەستەڵاتی کاهینەکانی"ئامون"کەم بکاتەوەو ئەوەی جێی باوەڕ و پەسەندکردنی من نەبێت ئەوەیە کە فیرعەون دەڵێت من حەز دەکەم ڕاستگۆیانە فەرمانڕەوایی خۆم بخەمە ڕوو و منیش ئەم بابەتە بەهەڕەشە ئامێز دەزانم، لەبەرئەوەی ڕاستی و ڕاستگۆیی وەك شمشێر تیژ وایە کە هەرگیز نابێت بدرێت بەدەست منداڵێکەوە، چ بگات بەوەی بدرێتە دەستی پیاوێکی شێتی وەك فیرعەون.

کاتێك شەو داهات من لەیەکێك لەدەوارەکانی نزیك دەواری"هورم هب"دا کەمێك حەوامەوە و کاتێك سەربازەکان زانیان من پزیشکم، هەوڵی ئەوەیان دەدا لەگەڵ مندا ببنە هاوڕێ، چونکە هەموو سەربازێك هەوڵی ئەوە دەدات ئەو پزیشکەی لەگۆڕەپانی جەنگدا تیماری برینەکانی دەکات سەرنجی هاوڕێیەتی بەلای خۆیدا ڕاکێشێت.

بەرەبەیانی ڕۆژی دوایی، بوقەکان هاتنە دەنگ و سەربازەکانی لەخەو هەستاند و سەرکردەکان لەشوێنی خۆیاندا ڕاوەستان.

کاتێك سەربازەکان ڕیزیان بەست و لەشوێنی خۆیاندا ڕاوەستان"هورم هب"قامچی بەدەست لەدەوارەکەی خۆی هاتە دەرەوە و بەندەیێکیش چەترێکی بەلاسەرەوە ڕاگرتبوو و بەندەیێکی تریش باوەشێنی دەکرد بۆئەوەی مێشەکانی لێ درو بکاتەوە.

"هورم هب" لەبەرامبەر سەربازەکاندا بەم شێوەیە دەستی کرد بە قسە کردن:

-((ئەی سەربازانی میسر، کە لەنێو ئێوەدا ڕەشتپێستگەلێکی پیس و سەربازانی تەمەڵی سوریاشتان تێدا بەدی دەکرێت و هەمووتان بەشێکن لە هێزی سەربازی میسرو وەك ڕانە مانگا دەبۆڕێنن و هاوار دەکەن، من ئەمرۆ دەمەوێت ئێوە ڕەوانەی گۆڕەپانی جەنگ بکەم، بۆئەوەی بزانم ئایا دەتوانن لەگەڵ"خبیری"یەکاندا بجەنگێن یان نە، کاتێك بزانم ناتوانن لەگەڵیاندا بجەنگێن، بەهیوای ئەوە دەبم هەمووتان لەو جەنگەدا بکوژرێن، بۆئەوەی من ناچار نەبم بەتەنهایی پەیکەری دزێوی ئێوە لەگەڵ خۆمدا بگەڕێنمەوە بۆ میسر و بەکۆمەڵێك سەربازی ڕاستەقینە و ئازا لەمیسرەوە بێمەوە بۆ ئەم جەنگە.

– ئۆهۆی.....تۆ دەڵێم"سەرتیپ"کە لوتت شەقی بردووە، لەقەیەکی باش لەو سەربازە بدە چونکە کاتێك من قسە دەکەم قنگی دەخورێنێت، چیتر کاتێك قسەت بۆ دەکەم نەبینم قنگت بخورێنیت–

ئەمرۆ کاتێك ئێمە هێرش دەکەینە سەر "خەبیری"یەکان، خۆم لەپێش هەمووتانەوە دەڕۆم و شان بەشانی ئێوە لەگەڵ "خەبیری"یەکاندا دەجەنگێم، من ئاگام لەدانە دانەی ئێوە دەبێت بۆئەوەی بزانم کامتنان لەگۆڕەپانی جەنگدا پاشەکشە دەکات یان ڕێك و پێك ناجەنگێت.

ئێوە لەوە دڵنیا دەکەمەوە کە ئەم قامچییەی من ئەمرۆ خوێنی لێ دەتکێت و ئەم خوێنە هی ئەو کەسانەیە کە لەگۆڕەپانی جەنگدا ڕێك و پێك نەجەنگیون، لەوەش دڵنیاتان دەکەمەوە کە ئەم قامچییەی من لە ڕمی "خەبیری"یەکان هەڕەشەئامێزترە، چونکە ڕمی ئەوان نوکێکی مسینی هەیە هەروەها زۆر زوش دەشکێت.

"خەبیریەکان" لەپشت ئەم شاخەوەن کە لەبەرچاوتاندایە و ئەمشەو سەربازانی پشکێنەر ڕۆشتن بۆئەوەی بزانن ژمارەیان چەندە، بەڵام ترسان و هەڵهاتن و نەیانتوانی دەقاودەق بزانن چەند کەس دەبن.

"خبیری"ەکان تەنها شتێکی ترسناکیان هەیە، ئەوشتەش دەنگیانە، بەڵام ئەگەر لەدەنگیان دەترسن ئەوا قوڕی خۆشەکرا"قوڕی سەناعە"بکەنە گوێتانەوە بۆئەوەی گوێتان لەدەنگیان نەبێت، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم قوڕە خۆشەکراوە ناهێڵێت گوێتان لەفەرمانی فەرماندەکەتان بێت، باشتر وایە ئەوکارەش نەکەن.

قوڕ بەسەری ئەو کەسەی بێ وردبون و قەرەوڵ گرتن تیرێك بهاوێژێت، هەروەها قوڕ بەسەری ئەو کەسەش کە دەقاودەق بەپێی فەرمانی بەرپرسەکەی تیر نەهاوێژێت.

سەرکەوتن لەجەنگدا تەنها لەئازایەتیەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو لەوەشەوە سەرچاوە دەگرێت کە سەربازەکان وەك ئەوەی تاکە کەسێك بن، بەیەك شێوە گوێڕایەڵی فەرمانی بەرپرسەکەیان بن.

ئەگەر ئەمرۆ سەرکەوتن بەدەست بهێنن تەواوی دارایی و مانگا و مەڕی"خبیری"یەکان دەبێت بەهی ئێوە و من نە دانەیەك بازنە زێڕ و زیو هەڵدەگرم و نە مانگا و مەڕێك.

"خبیری"ەکانی ئەمڕۆ زۆر دەوڵەمەندن، چونکە شار و لادێگەلێکی زۆریان داگیرکردووە و دەستیان بەسەر تەواوی سامانەکانیاندا گرتووە، لەبەرئەوەش گەر سەرکەوتن بەدەست بهێنن ئەو هەموو سامانە دەبێت بەهی ئێوە.

لەکاتی سەرکەوتندا نەك تەنها سامانەکانیان بەڵکو ئەمشەو ژنەکانیشیان دەبێت بەهی ئێوە، بەڵام ئەگەر شکست بخۆن قامچی خوێنمێژی من، پێشوازیتان لێدەکات.

کاتێك سەربازەکان گوێیان لەم قسانە بوو، شمشێر و ڕمەکانیان دەدا لەپشت قەڵخانەکانیان و کەواندارەکانیش دەستیان بەڕاتەکاندنی کەوانەکانیان کرد و لەم ڕێیەوە وروژانی خۆیان پیشان دا.

"هورم هب" وتی: واهەست دەکەم ئێوە حەز دەکەن هەرچی زووترە لەگەڵ خێڵەکانی"خبیری"دا بجەنگێن، بەڵام پێش ئەوەی بڕۆین بۆ گۆڕەپانی جەنگ، دەبێت لێرەدا پەرستگایەك بۆ خودای فیرعەون دروست بکەین.

خودای فیرعەون بەناوی"ئاتون"خودای جەنگ نیە و بەکەڵکی ئێوە ناخوات، چونکە هیچ هاوکاریەکتان ناکات.

لەبەرئەوە پێویست بەوە ناکات هەمووتان بۆ مەراسیمی بەرپاکردنی ئەم پەرستگایە لێرە بن، هێڵی دواوەی لەشکری سەربازی بمێننەوە و ئەوانی تر بکەونە ڕێ.

ئەمڕۆ ئێوە دەبێت سەرقاڵی ڕێپێوانی سەربازی خۆتان بن، بۆئەوەی خۆتان بگەیەننە خێڵەکانی"خبیری"، بەڵام بزانن کاتێك بەوان گەشتن، من مۆڵەتی حەوانەوەتان پێنادەم و دەبێت لەهەمان ئەوکاتەی کە ماندون، لەگەڵ ئەواندا بەردەوام بجەنگێن بۆئەوەی تواناى هەڵهاتننتان نەمێنێت.

دوای ئەوە"هورم هب" قامچیەکەی خۆی ڕاوەشاند و سەربازەکانیش لەدوای هێما تایبەتەکانیانەوە کەوتنە ڕێ.

هێمای کەوتنە ڕێی هەندێك لەگروپە سەربازیەکان دەمی شێر بوو و گروپەکانی تریش دوای بەرزکردنەوەی سەری تیمساح دەکەوتنە ڕێ.

لەپێش و دواوەی گروپی سەربازەکان، کالیسکە سەربازیەکان ڕێیان دەکرد، بۆئەوەی داپۆشەری ئەوان بن و نەهێڵن هێرشی لەناوکاویان بۆ ببرێت.

کاتێك سەربازەکان ڕۆشتن هێزەکانی دواوەی سەربازی لەگەڵ"هورم هب"دا و هەندێك لە پلەوپایەداران بەرەو ئەو شوێنەی کە پەرستگای"ئاتون"ی تێدا دروست دەکرا کەوتنە ڕێ و منیش لەگەڵیاندا ڕۆشتم.

بیستم کە خاوەن پلەوپایەکان لەگەڵ یەکتردا قسەیان دەکرد و دەیانوت ئەم بانگەشەیە کە ئەمرۆ"هورم هب" کردی جێ پەسەندکردن نیە، چونکە تا ئەو شوێنەی ئێمە لەبیرمان بێت لەکاتی جەنگدا سەرکردەی هێزە سەربازیەکان لەدوای هێزی سەربازیەکانەوە ڕادەوەستن و لەسەر کەژاوەیەك چاودێری لەسەربازەکانیان دەکەن بۆئەوەی هەڵنەیەن، بەڵام ئێستا"هورم هب"دەڵێت کە ئەو لەپێش سەربازەکانەوە هەنگاو دەنێت و لەگەڵ دژمندا دەجەنگێت و ئێمەش دەبێت پەیڕەوی لەم فەرمانەی بکەین و پێشڕەوی سەربازەکانمان بین.

لەمحاڵەتەدا چ کەسێك ڕێ لەهەڵهاتووەکان دەگرێت و چ کەسێك کرداری سەربازەکان یاداشت دەکات؟

چونکە خودی سەربازەکان خوێندەواریان نیە بۆئەوەی ڕەفتار و کرداری سەربازە هاوشانەکانیان یاداشت بکەن، لەم کاتەدا تەنها خاوەن پلەوپایەدارەکان خوێندەواریان هەیە و دەتوانن ئەوە یاداشت بکەن کە کام سەرباز بوێر بووە و کامیان ترسنۆك یان هەڵهاتووە.

"هورم هب" کە بەرەوپێش دەڕۆشت گوێ لەم ڕاوبۆچونانەبوو و جارناجارێکیش قامچیەکەی خۆی ڕادەوەشاندو زەردەخەنەی دەکرد، تائەوکاتەی گەشتینە لای پەرستگاکە.

*بەشی دوانزەیەم*

## خودایەکی نائاسایی(بۆ میسریەکان)

پەرستگاکە بچوك بوو، بەهۆی کەمی کاتەوە هەلی ئەوەیان بۆ نەڕەخسا بنمیچ"سەقف"ی بۆ دروست بکەن، بڕێك دار و قوڕی خۆشەکراویان وەك کەرەستەی ماڵ دروست کرد تێدا بەکارهێنا.

کاتێك گەشتینە بەردەم پەرستگاکەوە بینیمان لەناو خانووەکەدا پەیکەری خودای تێدا نیە و سەربازەکانی هێزی دواوە لەئێمە زیاتر لە نەبینینی خودا سەریان سوڕما و بەیەکتریان دەوت ئەمە چ جۆر پەرستگایەکە کە خودای نیە، منیش وەك سەربازەکان سەیرم لێدەهات، چونکە تائەو ڕۆژە پەرستگایەکی بێ خودام نەبینیوە و هەرجارێك کە دەچومە ناو هەر پەرستگایەکەوە خودایەکم تێدا دەبینی.

"هورم هب"کە ئاگاداری سەرسوڕمانی هەموویان بوو وتی: ئەو خودایەی کە فیرعەونی ئێمە دەیپەرستێت خودایەکی سەیرە کە ناتوانم پێناسەکەیتان بۆ بکەم، لەبەرئەوەی خۆشم نازانم ئەو خودایە بەچ شێوەیەکە.

ئەو خودا سەیرە نە چاو و نە دەم و نە ورگ و نە دەست و نەپێ و نان ناخوات و شەراب و ئاوجۆش ناخواتەوە و فیرعەون دەڵێت کە خودای ئەو لەشێوەی مرۆڤدا نیەو نابینرێت، بەڵام ئەگەر ئێوە بتانەوێت بیناسن لەوانەیە شتێکی خڕی وەك خۆر بێتە بەرچاوتان[40].

[40] مەبەستی خودای تاك و تەنهایە و مێژوو ئەوە پیشان دەدات کە ئەم فیرعەونە بۆ یەکەمینجار لەمیسردا بانگەوازی بۆ پەرستنی خودای تاك و تەنها کردووە.

سەربازەکان گەڕانەوەو تەماشایەکی خۆریان کردو بەناڕەزاییەکەوە لەبەر خۆیانەوە دەستیان کرد بە قسەکردن و من تێگەشتم کە لەبەرخۆیانەوە دەیانوت فیرعەون شێت بووە، چونکە ئەگەر کەسێك شێت نەبوبێت خودایەکی بێ چاو و دەم و سك و دەستو پێ ناپەرستێت.

"هورم هب"یش وەك سەربازەکانی خۆی لێکی دەدایەوە و فیرعەونی بەشێت لەقەڵەم دەدا.

دوای ئەوە کاهینێکی لاو کە قژی نەتاشیبوو و نیوە پۆشاکێکی کەتانی لەبەردابوو هات و بینیم گۆزەیەك شەراب و قاپێك ڕۆنی زەیتون و چەپکێك گیای تازەی بەهاری لەپەرستگادا دانا، دوای ئەوە دەستی بەخوێندنەوەی سرودێك کرد کە دەیوت خودی فیرعەون ئەمەی بۆ خودای خۆی داڕشتووە و ئێمە لەو سرودە تێنەگەشتین و سەربازەکانیش کە نەخوێندەوار بون، وەکو جاران لەهیچ شتێك تێنەگەشتن.

ئەم سرودە باسی ئەوەی دەکرد کە "ئاتون"خودایەکە کە نابینرێت، بەڵام لەهەموو شوێنێکدا هەیە و بەڕوناکی و گەرمی خۆی زەوی ڕوناك دەکاتەوە و تەواوی خۆشی و نیعمەتەکانی زەوی و ڕوباری نیل لەوەوە سەرچاوە دەگرێت. هەروەها وتی ئەگەر"ئاتون"نەبێت شێر ناتوانێت لەشەودا ڕاوبکات و مار لەکون بێتە دەر و بەچکە لەهێلکەدا هەڵبێت. ئەگەر "ئاتون" نەبێت عیشق نایەتە بون و هیچ پیاوێك ناتوانێت ژنێك بکاتە خوشکی خۆی و هیچ منداڵێك لەسکی دایکیەوە پێ نانێتە ئەم زەویەوە.

کاهینی لاو دوای ئەم ڕونکردنەوانە وتی:پادشای میسر کوڕی خودایە و وەك باوکی بەهێزە و فەرمانڕەوایی وڵاتی میسر و ئەو وڵاتانەی کە لەژێر فەرمانڕەوایی و پارێزگاری میسردایە دەکات.

کاتێك سەربازەکان گوێیان لەم ناوەڕۆکە بوو، شمشێر و ڕمەکانیان کوتا بە قەڵخانەکانیاندا و بەمشێوەیە شادی و خۆشحاڵی خۆیان دەربڕی، چونکە تەنها بەباش لەدوایین برگەی ئەو سرودە تێگەشتن، دەیانزانی هیچ گومانێك لەوەدا نیە کە پادشای میسر کوڕی خودایە، هەمیشە وابووە و لەئایندەشدا بەوشێوەیە پادشای میسر کوڕی خودا دەبێت.

بەمشێوەیە مەراسیمی کردنەوەی پەرەستگای"ئاتون"خۆتایی پێهات و دوای ئەوە ئێمە کەوتینە ڕێ و مەبەستم لەئێمە، هێزی دواوەی سەربازی و پایەدارانی فەرماندەی لەشکری"هورم هب"ە.

"هورم هب"سواری گالیسکە جەنگیەکەی خۆی بوو و لەپێش هێزە سەربازیەکەیەوە بەرەوپێش دەڕۆشت ولەدوای ئەویشەوە کۆمەڵێك فەرماندەی سەربازی ڕێیان دەکرد و دوای ئەوانیش سەربازەکان و جارێکی تر دوای ئەوانیش کۆمەڵێك پایەدارانی سوپا ڕێیان دەکرد.

هەندێك لەپایەدارانی سەربازی سواری گالیسکە سەربازیەکان بوبون و هەندێکی تریان لەسەر کەژاوەیەك دانیشتبوو، بەڵام من سواری ولاخێك بوم و جانتاکەم کە پێویستی پزیشکی تێدابوو، بۆنمونە دەرمان و کەرەستەی نەشتەرگەریەکانیشم تێکردبوو.

ئێمە تا ئەوکاتەی سێبەرەکان بەرزبونەوە ڕێمان کرد و تەنها نیوەڕۆ، بۆماوەیەك بەمەبەستی خواردنی نان ڕاوەستاین و پاقلەی کولاو کە بەسەریشیدا ڕۆنی زەیتونمان بەسەردا ڕشتبوو خوارد و هەندێکات هەندێك لەسەربازی ماندوو یان نەخۆشەکان لەڕێکردندا دوا دەکەوتن و لەقەراخ ڕێدا دادەنیشتن، ئەوکات پایەدارانی سەربازی کە لەدواوە بون بەقامچی دەکەوتنە گیانیان.

جارێکیان بینیم کە گالیسکەی جەنگی پایەدارێکی سەربازی لەپاڵ سەربازێکی ماندوودا کە لەقەراخ ڕێدا لەسەر زەوی دانیشتبوو ڕاوەستا و پایەدارەکە لەگالیسکەکەی خۆی دابەزی و بەجووتە پێ خۆی هەڵدایە سەر ورگی سەربازەکە، ئەو سەربازەش بەهۆی ئەو لێدانە بەهێز و لەناکاوە مرد، بەڵام هیچ کەسێك نارەزایی خۆی لەبەرامبەر ئەم کارەدا نەخستە ڕوو، لەبەرئەوەی ئەو سەربازەی کە بۆڕۆشتن بۆ جەنگ بەکرێ دەگیرێت، نابێت تەمەڵی لەخۆی نیشان بدات.

کاتێك سێبەرەکان بەرزبونەوە ئێمە گەشتینە سەر تەپۆڵکەگەلێك کە سەرەتا ناوچە کوێستانیەکان بوو، لەناکاو لێزمەی بارانێك بەسەر سەربازەکاندا باری و ئاشکرا بوو کە بڕێك لە"خبیری"ەکان لەو تەپۆڵکەیەدا بۆسەیان دانبوو و سەربازەکانی ئێمەیان بەدیلی گرت.

بەهۆی بەلێشاو بارینی تیرەوە ئەو سەربازانەی کە سەرقاڵی سرود وتن بون، لەسرود خوێندن کەوتن، بەڵام"هورم هب" گوێ بەم تیر هاوێشتنە نەدا و کاتێك خۆمان گەیاندە بەشی پێشەوەی هێزی سەربازی، هێزی سەربازانی پێش و دوا و ناوەڕەستی سوپا یەکیان گرت "هورم هب" فەرمانی دا کە سەربازەکان بەپەلە لەوێ دور کەونەوە، بۆئەوەی بتوانن خۆیان بگەیەننە بەشی سەرەکی هێزی سەربازی "خبیری"یەکان و هێرشیان بۆ ببەن، بۆئەوەی کاتی ئەوەیان بۆ نەڕەخسێت تیرهاوێژمان بکەن.

گالیسکە جەنگیەکانمان بەهێرشێك تیرهاوێژانی کەنار ڕێگاکانیان پەرتەوازە کرد و ئێمە بەردەوامیمان دا بە ڕێکردنمان.

لەپاڵ مندا پایەدارێکی سەربازی کە بەرپرسی ئازوقەی سەربازی بوو، بەسواری وڵاخێك بەرەوپێش دەڕۆشت و لەبەرئەوەی لەبەیانیەوە تا ئێوارە لەتەنیشت یەکەوە ڕێمان دەکرد بوو بەهاوڕێم و داوای لێکردم ئەگەر کوژرا من کارێك بکەم کە لاشەکەی لەناو نەچێت و تەرمەکەی بگەیەنمەوە دەست کەسوکاری خۆی، بۆئەوەی مۆمیای بکەن، هەروەها دەیوت کە"خبیری"ەکان خەڵکێکی ئازاو و بێبەزەیین و تا ئەوکاتەی شەو دادێت هەمووومان دەکوژن.

هێشتا یەك لەسەر چواری ڕۆژ مابوو، دەشتێکی فراوان لەناوەڕاستی کێوەکاندا دەرکەوت و ئاشکرا بوو کە ئێرە ئوردوگای"خبیری"ەکانە، تا چاو کاری دەکرد دەواری ڕەشی یەك لەدوای یەکی هەڵدراو دەبینرا و لەبەرامبەر دەوارەکاندا "خەبیری"ەکان بەقەڵخان و ڕمە درەوشاوەکانیان بەشێوەیەك هاواریان کرد کە لەبیاباندا دەنگی دەدایەوە و ترسی لەدڵەکاندا دەورووژاند.

"هورم هب"سەربازەکانی خۆی ڕێك خست و ڕمبەدەستەکانی لەناوەڕاست و تیرهاوێژەکانیش لەوهەردوو لای هێزی سەربازیدا دانا، ئەوکات بەهەموو هێزی بەگالیسکە جەنگیەکانی وت، هەرئەوەی من فەرمانم پێدان دەست بەهێرش کردن بکەن و ئێمەش لەدوای ئەوەوە دێین.

هەروەها چەند گالیسکەیەکی قورسیشی لەلای خۆیدا ڕاگرت و فەرمانی دا کە بەردەوام لەگەڵ ئەودا بن و لەو دور نەکەونەوە.

"هورم هب"کاتێك ئاگاداری ئەوەبوو کە سەربازەکانی لەهەراوهوریای "خبیری"ەکان و بریسکەی قەلخان و ڕمەکانیان ترساون، هاواری کرد، هەی پیاوانی میسر و سوریا، هەی ڕەشپێستەکان کە ئێوەش بەشێکن لەهێزی سەربازی میسر، لەو هەراوهوریایە نەترسن، چونکە هاوار و هەراو هوریا هەرچەنێك بەهێز بێت بەبەشێك لەبا لەقەڵەم دەدرێت و ناتوانێت هیچ زیانێکمان پێ بگەیەنێت، هەروەها ئەوەش بزانن کە ژمارەی سەربازانی "خبیری"یەکان زۆر نیە و ئەو دەوارانەش کەدەیبینن شوێنی ژنان و منداڵەکانیانە و ئەو دوکەڵەش نیشانەی ئەوەیە کە خەریکی چێشت لێنانن و ئێوە ئەگەر بێوێری و ئازایەتی خۆتان نیشان بدەن، ئەمشەو خواردنەکەی ئەوان دەخۆن و ژنەکانیشیان چەورەیی و قسەی خۆشتان بۆ دەکەن و منیش بەئەندازەی تیمساحێك برسیمە و حەز دەکەم لەبەرژەوەندی ئێمەدا کۆتایی بەم جەنگە بێت، بۆئەوەی بتوانم ئەو نانە بخۆم.

پێش ئەوەی"هورم هب"فەرمانی هێرش بردن دەربکات، سەربازەکانی "خەبیری" لەکاتێکدا هاواری گوێ هەژێنیان لێ بەرز دەبویەوە هێرشیان بۆ بردین و بینیم کە ژمارەی سەربازەکانیان لەوەی ئێمە زیاترە.

کاتێك ڕم بەدەستەکانی ئێمە بینیان ئەو سەربازە ترسناکانە لێیان نزیك دەبنەوە تەماشایەکی دوای خۆیان کرد و منیش وەك ئەوان، تەماشای دوای خۆمم دەکرد بۆئەوەی بزانم لەچ ڕێگایەکەوە دەتوانین هەڵبێین، بەڵام لەدوامانەوە ئەفسەرانی بەش قامچیە ترسناکەکانیان کە بەردێکیان پێوە بەستبوو، بەدەستیانەوە ڕایاندەوەشاندن و شمشێرەکانیان دەدرەوشایەوە، سەربازەکانی ئێمەش تێگەشتن لەوەی ڕێگای هەڵهاتنیان نیە.

سەرەڕای ئەوەش هەمویان ماندو و برسی بون و بیریان لەوە دەکردەوە ئەگەر هەڵبێن، سەربازەکانی"خبیری" زۆر بەخێرا خۆیانیان پێ دەگەیەنن و دەیانکوژن. ئەوە بووە هۆی ئەوەی بیری هەڵهاتن لەمێشکی خۆیان پاك بکەنەوە، بۆیە لەیەکتر نزیك بونەوە لەنێو سەربازەکاندا هیچ مەودایەك بەدی نەدەکرا، بۆئەوەی دژمن نەتوانێت بەنێویاندا تێپەڕێت.

کاتێك لێمان نزیك بونەوە تیرهاوێژانی"خەبیری"تیرەکانی خۆیان هاویشت، بەڵام سەرەڕای ئەوەی دەنگی...ویزە...ویزی... تیرەکان زۆر ترسانك بوو و لەهەموو

ساتێکدا هەڕەشەی مەرگی لەمرۆڤەکان دەکرد، من بەهۆی ئەم دەنگەدەنگانەوە وروژابووم، لەبەرئەوەی دیمەنێکم دەبینی و دەنگگەلێکم دەبیست کە تا ئەو کاتە نە بستبوم و نەبینیبوم.

"هورم هوب" لەمکاتەدا قامچیەکەی خۆی بەرزکردەوەو دەستی کرد بە ڕاتەکاندانی، بوقەکانیش هاتنە دەنگو دوای ماوەیەکی تر گالیسکە جەنگیەکانیش کەوتنە ڕێ و لەدوای ئەوانیشەوە تەواوی سەربازەکانی ئێمە ڕێیان دەکرد و بەشێوەیەك هاواریان دەکرد کە من ئاگاداری ئەوە بووم کە دەنگی ئەوان زاڵ بوو بەسەر دەنگ و هاواری"خبیری"ەکاندا.

من دەمزانی کە سەربازەکانی ئێمە لەبەرئەوە هاواریان دەکرد بۆئەوەی ترس لەخۆیان دور بکەنەوە و منیش وەك ئەوان هاوارم دەکرد و لەکاتی هاوارکردندا هەستم بەوە کرد کە ناترسم.

سەربازەکانی خەبیری سەرەڕای ئەوەی ئازا بوون، بەڵام گالیسکەی جەنگیان نەبوو گالیسکەکانی ئێمە درز و بڵاوەی خستە نێویانەوە و بەوهۆیەوە ڕێی بۆ ڕم بەدەستەکانی ئێمە کردەوە و هەرئەوکاتەی ڕم بەدەستەکانی ئێمە خۆیان کرد بەو درزو بەینانەدا، بەپێی فەرمانی"هورم هب" تیرهاوێژەکانیشمان دژمنیان تیرباران کرد.

دوای ئەوە سەربازانی هەردوو بەرەکە ڕژانە نێویەکترەوە، بەڵام لەدورەوە کڵاوی"مەفرەغی"و پەرە درێژەکانی نەعامە کە"هروم هب" بەکڵاوەکەی سەریەوە بەستبووی دەبینرا و ئەویش لەپێش هەموو سەربازەکانی خۆیەوە دەجەنگی.

وڵاخەکەی منیش بەهۆی دەنگەدەنگی ئەو جەنگەوە زۆر ترسا و بۆ ناوەڕاستی جەنگەکە غاری دا هەرچی ویستم ڕێی لێبگرم نەمتوانی و دەمبینی کە سەربازانی "خەبیری" ئازایانە دەجەنگێن و کاتێکیش کە دەکەون هەوڵی ئەوە دەدەن لەڕێی شمشێر یان نێزەکانیانەوە، ئەسپ یان سەربازەکانمان بکوژن، هەروەها تەماشای هەر لایەکی خۆم دەکرد خوێنم دەبینی و بەڕادەیەکش کوژراو و بریندار کەتبونە سەر زەوی کە نەمدەتوانی بیشیان ژمێرم.

لەناکاو سەربازەکانی"خەبیری"پێکەوە بەدەم هاوارەوە دەستیان کرد بە پاشەکشەکردن و هۆکاری ئەم پاشەکشەشیان بۆئەوە دەگەڕێتەوە کە گالیسکە جەنگیەکانی ئێمە توانی ترز بخاتە ڕیزەکانیانەوە و بڵاوەیان پێبکەن و خۆیان

بگەیەننە دەوارە هەڵدراوەکانیان بۆئەوەی ئاگری تێبەربدەن، سەربازەکانی "خبیری"یش کاتێك بینیان ژن و منداڵ و مانگا و مەڕەکانیان لەژێر باری هەڕەشەی لەناوچوندان، ناچار بۆ ڕزگارکردنیان بەرەو ڕوی دەوارەکانیان ڕایانکرد، هەرئەمەش بووە هۆی لەناوچونیان، چونکە گالیسکە جەنگیەکانمان گەڕانەوە بۆیان و سەربازەکانیشمان لەدواوە خۆیانیان پێ گەیاندن و"خەبیری"ەکانش لەنێوان دوو دەستە هێرش بەردا هەمویان بەکوشت دران، بەهەموو ئەو ئازایەتیەی کە هەیانبوو، ئەوانەیان کەمان هەڵهاتن بۆئەوەی خۆیان لەمەرگ ڕزگار بکەن.

هەر سەربازێکی"خبیری" کە دەکوژرا یەکسەر دەیانپشکنی و سەربازەکانی ئێمەش، ئەوەی سودی لێ دەبینرا لێیان دەفڕاند و دەستێکیشیان دەبڕیەوە، بۆئەوەی دوای کۆتایی هاتنی جەنگ لەئوردوگای میسردا لەبەرامبەر شوێنی دانیشتنی فەرماندەدا لەسەریەك هەڵیانچنن.

دوای ئەوەی دەرکەوت کە"خەبیری"یەکان شکستیان خواردووە و توانای بەرگریکردنیان نیە، تورەیی پیاوکوشتن بەسەر سەربازەکانی ئێمەدا زاڵبوو، هەرکەسێك بجوڵایەتەوە دەیانکوشت، بگرە مێشکی منداڵەکانیشیان بەگورزەکانیان پارچە پارچە دەکرد و مانگا و مەڕەکانیشیان لەزیان پێگەیاندنی ئەمانە بێبەش نەبوون.

تائەوەی"هورمٌ هب"فەرمانی دا کۆتایی بەجەنگ بهێنن و خۆیان لەکوشتنی کەسانێك کە بەزیندوویی ماونەتەوە بپارێزن، و تەنها بەدیلی بیانگرن بۆئەوەی لەدواییدا بتوانن بیانفرۆشن.

تا کۆتایی جەنگ وڵاخەکەی من ئەملا و لا غاری دەدا و جوتەی دەوەشاند و منیش زۆر بەزەحمەت توانیم خۆمی لەسەر ڕاگرم بۆئەوەی نەکەوم، دواجار یەکێك لەسەربازەکانی ئێمە بەداری نێزەکەی دای لەپۆزەی وڵاخەکەم و هێوری کردەوە و توانیم پێ بنێمە سەر زەوی، لەبەرئەوەی سەربازەکان بینیبویان ئەم وڵاخە بەچ شێوەیەك ئازاری منی داوە، چیتر لەو ساتە بەدواوە منیان بە کوڕی کەر"ابن حمار" بانگ دەکرد.

لەکاتێکدا سەربازەکانی ئێمە سەرقاڵی کۆکردنەوەی مانگا و مەڕ و ژنەکان و فەرهودکردنی سامانی "خبیری"ەکان بون، من لەگۆڕەپانی جەنگدا بەهاوکاری

کۆمەڵێك لەسەربازان خەریکی چارەسەرکردنی برینی هەندێك لە بریندارەکان بوم و کاتێك شەو داهات، لەبەردەم ڕوناکی ئەو ئاگرانەی کە لەبەرامبەر ڕێگاکەدا دایانگیرساندبوو، بەردەوامیم بەچارەسەرکردنی برینی برینداران دەکرد.

لەکاتێکدا کە بیرندارەکانم لەئازاراندا هاواریان دەکرد، دەنگە دەنگێکیش لەچواردەوری ئوردوگاوە دەبیسترا، ئەو دەنگە دەنگەش، دەنگی ئەو ژنانە بوو کە سەربازەکانی ئێمە لەنێوان خۆیاندا دابەشیان دەکردن و لێیان بەهرەمەند دەبون، هەندێکاتیش ناچار دەبوم پێستی سەرێك کە کەوتبوو بەسەرچاوی سەربازێکدا هەڵدەمەوە و بیگەڕێنمەوە شوێن خۆی و بیدورمەوە یان ڕیخۆڵەی سەربازێکی تر بخمەوە ورگی و سکی بدورمەوە.

کاتێکیش کەدەمزانی هیچ ئومێدێك لەچارەسەرکردنی سەربازێکدا نیە، بڕێکی زۆر تریاکم ڕۆ دەکردە ناو خوێنبەرەکانیەوە و دوای ئەوە ئاوجۆم پێدەدا، بۆئەوەی گیانی بسپێرێت بێئەوەی هەست بەهیچ ئازارێك بکات.

من تەنها سەربازە میسریەکانم چارەسەر نەدەکرد، بەڵکو بریندارانی"خبیری"شم تیمار دەکرد، لەبەرئەوەی بەزەییم پێیاندا دەهاتەوە، بەڵام دوای ئەوەی چارەسەری چەند بریندارێکی"خبیری"م کرد و برینەکانیانم بەست، دەنگی ئەو ژنانەیانم بیست کە کەوتبونە ژێردەستی سەربازەکانی ئێمەوە و ئەوانیش ئەو پارچە پێچراوانەی کە بەسەر برینەکانیانەوە بەستبوم کردەوە و فڕێیان دا و بەهۆی خوێنڕێژیانەوە مردن و منیش زۆر بەزەییم بەسەربازەکانی"خبیری"دا دەهاتەوە، لەبەرئەوەی دەمزانی کە سەرکەوتنی هێزی سەربازی میسری بەسەر ئەواندا، مایەی شانازی نیە، چونکە"خبیری"ەکان هێزێکی سەربازی تۆکمە نەبون، بەڵکو بەبەشێك لە خێڵەکان لەقەڵەم دەدران و برسێتی ئەوانی هانی فەرهودی دەدا و وەك تەواوی دانیشتوانی سوریا، بەژێردەستەی فیرعەونی میسر لەقەڵەم دەدران.

یەکێك لەو شتە دڵتەزێنانەی کە بەچاوی خۆم بینیم ئەوە بوو کە تەواوی سەربازەکانی"خبیری"چاوێکی عەیبداریان هەیە و من لەنێویاندا بگرە کەسێکم نەبینی کە خاوەنی چاوێکی تەواو بێت، دیار بوو کە نەخۆشی چاو لەنێو ئەواندا نەخۆشیەکی گشتگیر بووە.

ئەو شەوە تەواوی سەربازەکان حەوانەوە و تەنها پاسەوانەکان بەبێداری مانەوە، چونکە ترسی ئەوە هەبوو ئەو بەشە"خبیری"انەی کە هەڵهاتون، شەو هەڵکوتنە سەرمان.

بەڵام لەشەودا هیچ شتێك ڕوی نەدا و من تا بەیانی سەرقاڵی چارەسەرکردنی بریندارەکان بوم و بەرەبەیان کاتێك"هورم هب" لەخەو هەستا و ئاگاداری ئەوە بوو کە تابەیانی بەبێداری ماومەتەوە، منی بانگکردە لای خۆی و وتی من دوێنێ بینیم بێئەوەی چەکت بەدەستەوە بێت، بەچ بوێریەکەوە خۆت خستە ناو جەنگاوەرەکانەوە، بەڵام دەبێت پێت بڵێم کە ئەرکی پزیشکێك لەگۆڕەپانی جەنگدا، دوای کۆتایی هاتنی جەنگ دەست پێدەکات، پێویست بەوە ناکات خۆی بخەیتە نێو ئەو شەڕ و پێکدادانەوە، دوای ئەوە هەرکاتێك بڕۆین بۆ هەر جەنگێك، تۆ دانیشە بحەوێرەوە، تا ئەو کاتەی کۆتایی بەجەنگ دێت، دوای ئەوە خۆت سەرقاڵی چارەسەرکردنی سەربازەکان بکە.

من لەبەرئەوەی ماندوو و شەکەت بوم"هورم هب"ملیوانکەیەکی زێڕی پێدام و وتی: ئەمەش پاداشتی ئازایەتی دوێنێ و بێخەوی ئەمشەوتە. ئێستاش بڕۆ بخەوە، بەڵام من سەرەڕای ئەوەی ماندوو بوم واهەستم دەکرد کە ناتوانم بخەوم، چونکە کاتێك ڕوناکی خۆر هەڵدێت خەو لەچاوی مرۆڤدا نامێنێت.

وتم:"هورم هب"من دوێنێ تۆم بینی بەبەردەوامی لەپێش سەربازەکانەوە خەریکی شەڕکردن بویت و سەرەڕای ئەوەی هەموو تیرەکان بەئاڕاستەی تۆ دەهاتن- لەبەرئەوەی دەیانزانی کە تۆ فەرماندەی هێزی سەربازی میسریت - بگرە یەك تیریش بەری تۆ نەکەوت.

"هورم هب"وتی: لەبەرئەوەی شەهێنەکەم بەردەوام بەلاسەرمەوە سەمای دەکرد و من لەهەموو هەڕەشەیەك دەپارێزێت و هەرگیز هیچ تیرێك بەر من ناکەوێت، هیچ تیر و شمشێر و گورزێك نەیدەتوانی خۆی بەمندا بکێشێت، هەر بەو هۆیەوە من لەوەیکە لەبەرچاوی کەسانی تردا بەپیاوێکی ئازا لەقەڵەم دەدرێم هەست بە خۆشی و لەخۆبایی ناکەم، چونکە دەزانم بەوشێوەی خەڵکانی تر لێکی دەدەنەوە من کەسێکی ئازا نیم.

هەرکەسێکی تریش لەجێی مندا بوایە دەیتوانی ئازایەتی خۆی نیشان بدات، منیش لەبەرئەوە لەپێش هەموو کەسێکەوە شەڕ دەکەم بۆئەوەی سەربازە میسریەکان لەسەر جەنگ ڕابهێنم، چونکە تائێستا نزیکەی چل ساڵە میسریەکان لەگەڵ هیچ کەسێکدا نەجەنگاون و ئاشتیەکی بەردەوام نەریتی جەنگاوەریانی لەناو بردووە و هەرئەوەی سەربازەکانم دوبارە لەسەر جەنگ و شەڕ کردن پەروەردە کرانەوە و خۆیان پێوە گرتەوە، چیتر لەدژمن نەترسان، ئەوکات منیش وەك فەرماڕەوایانی میسر لەسەر کەژاوەیەك دادەنیشم و لەدوای گۆڕەپانی جەنگەوە ڕادەوەستم و لەوێوە جەنگەکان بەڕێوە دەبەم.

وتم: "هورم هب"بەچ شێوەیەك ئەکرێت شەهێنێك کە بەلاسەرتەوە سەمادەکات، دەتوانێت تۆ لە گەزندەیی تیر و شمشێر و نێزە و گورزەکان بپارێزێت؟

"هورم هب" وتی: من لەوباوەڕەدا نیم کە پارێزەری من ئەو شەهێنە بێت، بەڵکو ئەم شەهێنە تەنها هێمایەکە کە پێم نیشان دەدرێت بۆئەوەی پێم بڵێت تا ئەو ڕۆژەی نۆرەم نەیەت بەکوشت نادرێم، لەبەرئەوەش هیچ بەڵگەیەك نیە بۆئەوەی من بترسم و دەزانم مرۆڤ تەنها جارێك زیاتر ناکوژرێت و هیچ کەسێك ناتوانرێت بەدی بکرێت کە دوو جار بەکوشت درابێت، هەرلەبەرئەوەش نابێت بۆ ڕوداوێك کە تەنها جارێك ڕوو دەدات، ببێتە هۆی ئەوەی لەسەرتاپای تەمەنتدا بترسیت، هەرلەبەرئەوەش ڕێ بەترس نادەم ڕۆبچێتە ناو دەرونمەوە و لەبەرئەوەی ناترسم مەرگیش بەرەوڕوم نایەت تا ئەو ڕۆژەی نۆرەم نەیەت، لەو ڕۆژەشدا چ کەسێکی بوێر و ئازا یان ترسنۆك بم ، لەکۆتاییدا هەر دەمرم.

تێگەشتم کە"هورم هب"ڕاست دەکات و هۆکارەی ئەوەیکە مەرگ بەرۆکی ناگرێت ئەوەیە کە چاو نەترسە و سەربازانی خۆش"بەخت"یش ئەو سەربازانەن کە چاونەترس و بوێرن و بەختی ئەوانیش هەمان ئەو بوێری و ئازایەتیەیانە.

ئەو سەربازەش کە ترسنۆك بێت بەختیشی نیە و لەجەنگدا یەکەمین کەس بەکوشت دەدرێت و ئاوات و ئارەزوی فەرهود و ملوانکەی زێڕ و ژنە جوانەکان لەگەڵ خۆیدا دەباتە جیهانێکی ترەوە.

لەهەمان ئەو کاتەدا من لە"هورم هب"جیابومەوە و بۆماوەیەك خەوتم و پێش نیوەڕۆش، لەخەو هەستام و بینیم کە سەربازەکانی ئێمە سەرقاڵی ئاهەنگ و

خۆشگوزەرانین و بەپەنجەکانیان هێما بۆ شوێنێك دەکەن و دەستنیشانەکانیشیان ئەو سەربازە بریندارانەن کە هیچ چارەسەرێکیان نیە، چونکە دەیانزانی ئەو سەربازانە هیچ چارەسەرێك بەدەردیان ناخوات و بەکەڵکی کۆیلایەتیش نایەن و ناشتوانن بیانفرۆشن.

ئەو ڕۆژە و شەوی دوای ئەویش سەربازەکان ئێمە لەگەڵ ژنانی"خبیری"دا ڕایاندەبوارد و چەند کەسێك لەو ژنانە بۆئەوەی گرفتاری سەربازەکانی ئێمە نەبن بە قژە درێژەکانیان خۆیان خنکاند. شەوی سێیەمیش بۆنی لاشەی سەربازە میسری و"خبیری"یەکان کە لەبیاباندا کەوتبون بەشێوەیەك ئاوێتەی هەوا بوو کە نەت دەتوانی هەناسە بدەیت، تا بەیانی ئێمە نەمانتوانی لەقوژەی چەقەڵ و کەمتیارەکان کە سەرقاڵی خواردنی لاشەی مردووەکان بون بخەوین.

بە"هورم هب"م وت:ئەگەر لەم بیابانەدا بمێنینەوە، هەموو سەربازەکان بەهۆی بونی ئەم لاشانەوە توشی نەخۆشی دەبن و"هورم هب"یش لایەنگری ئەوەی کرد کە هێزەکەی لەم بیابانە دور بخاتەوە و برینداره سەختەکانیش بەگالیسکە سەربازیەکان بنێرێت بۆ"ئۆرشەلیم".

ئەو دەیوت: لەبەرئەوەی"خبیری"یەکان لەکاتی هەڵهاتنندا خودای خۆیان لەگەڵ خۆیاندا بردووە و بەرپرسانی پشکنینی سەربازیەکانیشمان دەڵێن کە ئەوانە لەم نزیکانەدان، منیش دەبێت بڕۆم و ئەو خودایەیان لێ زەوت بکەم.

ڕۆژی دوایی، دوای ئەوەی برینداره سەختەکانمان گواستەوە بۆ"ئۆرشەلیم" (هۆرم هب) بەکۆمەڵێك گالیسکەی سەربازیەوە بەخێرایەکی زۆر کەوتە ڕێ و منیشی سواری گالیسکەکەی خۆی کرد و وتی: دەمەوێت تۆ هاوبەشی جەنگەکانی خۆم بکەم بۆئەوەی بزانی بەچ شێوەیەك مێشکی پاشماوەکانی"خبیری"دەسووم بەزەویدا.

کاتێك ئێمە لەناکاو و بێئەوەی"خبیری"یەکان ئاگایان لێ بێت هێرشمان بۆ بردن، ئەوان سەرقاڵی گۆرانی وتن بون و ئەو مانگا و مەڕەی کە بەدەستیان هێنابوو-و ئێمەش دەمانزانی ئەو هەموو ئاژەڵە لە جوتیارە سوریەکانیان زەوت کردووە- لەبەرخۆیانەوە لێیان دەخوڕین و ئێمەش وەك زریانێك بەسەریاندا داباڕین و پێش ئەوەی بتوانن بەرگری لەخۆیان بکەن گالیسکەکانمان پیر و لاوی کرد بەژێرەوە و

ئێسقانەکانی لەژێر چەرخی گالیسکەکاندا ورد و هان کرد و سەربازە میسریەکانیش هەرکەسێکیان بگرتایە دەیانکوشت.

لەکاتێکدا ئەوانی تر لەترسی گیانی خۆیان، مەڕ و مالآت و دەستکەوتەکانی خۆیان بەجێ هێشت و هەڵهاتن.

"هورم هب"فەرمانی دا مانگا و مەڕەکان کە لەبیاباندا پڕ و بڵاو بوبون کۆبکەنەوەو دوای ئەوە خودای"خبیری"یەکانمان لەسەرزەوی هەڵگرت و گەڕاینەوەو ڕێگای "ئۆرشەلیم"مان لەگەڵ تەواوی سەربازاندا گرتە بەر.

"هـورم هـب"لەیەکـەمین ڕاوەسـتانیان بۆئـەوەی کـەمێك بحەوێنـە خـودای "خبیری"ەکانی لەبەرچاوی سەربازەکانیدا پارچە پارچە کرد و دوای ئەوە فڕێی دا و بەم بۆنەیـەوە سـەربازەکانی شـادی و خۆشـحاڵی خۆیـان دەربڕی، چونکە دەیـانزانی کە"خبیری"ەکان چیتر خودایان نیە، لەبەرئەوە لەهەر کاتێکی تر هەژارتر کەوتون و تا ئـەو شـوێنەی لـەبیرم مابێـت خـودای"خـەبیری"ەکـان کـە پەیکـەرێکی دارینـی هـەبوو بەناو"یهود"یان"یەهوە"بانگ دەکرد.

کاتێك چومە ناو"ئۆرشەلیم"ەوە سەرم لەوە سوڕما کە بۆچی ڕێژەیەکی زۆر لەو بریندارانەی کە من چارەسەرم کردبون مردون، لەکاتێکدا دەمزانی کە برینەکەیان بەو ڕادەیەش هەڕەشە ئامێز نەبووە و بەدڵنیاییەوە چارەسەر دەکران تا لەدواییدا نهێنی ئەم بابەتەشم بۆ ئاشکرا بوو.

بەوشـێوەیە کاتێـك بـەپێی فـەرمانی"هـورم هـب" تـەواوی سـامانە بەدەسـت هاتووەکـانی ئـەو جەنگـەیان هێنـا بـۆ "ئۆرشـەلیم"و لەگـەڵ کۆیلـە و کەنیزەکانـدا فرۆشـتنیان و هەرچـی زێـڕ و زیـو و مـسی بەدەسـت هـاتوو لەفرۆشـتنی سامانی"خبیری"یەکان بەدەست هات لەنێو سەربازەکاندا دابەش کرا و بەهۆی ئەوەی بڕێك لەبریندارەکان مردبون، بۆیە سەربازەکانی تر بڕێکی زیاتریان لـەو دەستکەوتەدا بەدەسـت هێنـا و بەرپرسـی"ئازوقـەی"هێـزی سـەربازی کـە هـاوڕێی مـن بـوو وتـی: لەهەموو جەنگێکدا ئەمە ڕوو دەدات و هیچ خواردن و خواردنەوەیەکیان بە سەربازە بریندارەکانی خۆیـان نـەدەدا، بۆئـەوەی بمرن، چونکە دەزانن هەرچی ڕێژەیان کەمتر بێت، دەستکەوتێکی زیاتری جەنگەکانیان دەست دەکەوێت.

ڕێژەیەکی زۆری سەوداگەران و بازرگانانی سوریا لە"ئۆرشەلیم"دا کۆبونەوە و دەستکەوتی جەنگیان دەکڕی و هەریەك لەوانەش کۆمەڵێك لەو ژنانەی کە خۆیان بەهەرزان دەفرۆشت لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو و سەربازەکانی ئێمەش زێڕ و زیو و مسیان دەدا بۆئەوەی بتوانن بۆماوەی کاتژمێرێك لەگەڵ یەکێك لەو ژنانەدا ڕابوێرن و کاتی خۆش بەسەر ببەن و ئەم زێڕ و مسەش، لەمڕێیەوە دەبووە بەشی سەوداگەرانی سوریا.

لەبەیانیەوە تا ئێوارە و لەشەوەوە تا بەیانی، لە"ئۆرشەلیم"دا دەنگی"تەمورە و شمشاڵ و سەنتور و تەپڵ و عود"دەهات و شەراب و ئاوجۆ، بەردەوام لەگۆزەکانەوە دەڕژانە ناو پێکەکانەوە و سەربازە میسریەکانیش هەڵیان دەقوڕان و لەگەڵ ئەو ژنانەی-خۆیان هەڕاج فرۆش دەکرد- ڕایان دەبوارد.

هەندێ جاریش لەنێو سەربازە سەرخۆشەکاندا شەڕێکی ترسناك دروست دەبوو و چەقۆکانیان ڕویان دەکردە سینە یان ورگی یەکتریەوە یان گورزەکانیان هەندێجار دەچەقاندە نێوچەوانی یەکتری، ئەوکات"هورم هب" فەرماندەی لەشکری میسر، چەند کەسێکی بەسەرنگونی لەسێدارە دا، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم گێرە و کێشەیە ڕۆژانە دوبارە دەبوویەوە، ڕۆژ نەبوو کۆمەڵێك بەسەرنگونی لەسێدارە نەدرێت.

سەربازەکان سەرەڕای ئەوەی بەچاوی خۆیان دەیانبینی سەربازە هاوشانە جەنگاوەرەکانیان لەسێدارە دراون، بەڵام پەندیان لەم ڕووداوە وەرنەدەگرت، چونکە تا ئەوکاتەی لەجیهاندا شەراب و زێڕ و زیو و ژن بونی هەبێت، بڕێکی مەست، لەسەر زێڕ و زیو یان ژن، ناکۆکیان لەگەڵ یەکدا دەبێت، لەئەنجامدا شەڕ لەنێوانیاندا دروست دەبێت و هەندێکیشیان لەم جۆرە جەنگانەدا دەکوژرێن و بکوژەکانیش لەسێدارە دەدرێن.

ئەو دەستکەوتانەی کە سەربازەکان لەڕێی جەنگەکانەوە بەدەستیان دەهێنا، دەیاندا بەشەراب یان ئەو ژنانەی خۆیان هەڕاج فرۆش دەکرد و پلەوپایەدارانی میسریش وەك سەربازەکان، بەشە دەستکەوتەکانی خۆیان دەدا بەشەراب و ژنەکان، هەڵبەت بەو جیاوازیەی کە پلەوپایەدارەکان حەزیان لەو جۆرە ژنانە نەبوو کە خۆیان هەڕاج فرۆش دەکرد و ئەو ژنانەیان بۆ خۆیان هەڵدەبژارد کە خۆیان گران دەفرۆشت، چونکە دەیانزانی، ژن هەرچەنێك جوانتر بێت گرانترە.

لەنێو پلەوپایەدارانی لەشکری سەربازیدا تەنها"هورم هب"گرنگی بەژنان نەدەدا و من لەو خۆڕاگری و خۆپارێزیەی ئەو سەرم سوڕمابوو. لەکاتێکدا"هورم هب"لاو و جوان بوو و هەموو ژنێك ئیتر گران بێت یان هەرزان فرۆش، بەتامەزرۆوە ئامادە بوو خۆی بکاتە خوشکی ئەو.

"هورم هب"سودی لەسەروەت و سامانی کۆیلە دەست بەسەردا گیراوەکان وەردەنەگرت و لەبەرامبەردا سودی لەسامانی سەوداگەرەکان وەردەگرت. ئەویش کاتێك کۆتاییان بەمامەڵەکانیان هێنا، بۆیە ئەوکاتەی سەوداگەرەکان ویستیان سامان و کۆیلەکانی خۆیان بگوازنەوە بۆ شوێنی خۆیان،"هورم هب" وتی: هەموو سەوداگەرێك دەبێت لەسەدا دەی ئەو دەرامەتەی لەم کڕین و فرۆشتنەدا بەدەستی هێناوە بەناونیشانی مافی پاراستنی ئاسایش بدەن بەو.

"هورم هب" بەسەوداگەرانی وت: لەتەواوی ئەو ماوەیەی کە ئێوە سەرقاڵی مامەڵە بون، یەك کەس لەسەربازان و دانیشتوانی شار نەیانوێراوە دەست بۆ سەروەت و سامانەکانی ئێوە درێژ بکەن، چونکە من شەو ڕۆژ چاودێری ئەوەم کردووە کەسێك سەروەت و سامان و زێڕ و زیو و میسەکانی ئێوە نەدزێت. ئەگەر من نەبوایەم ئێوە نەك تەنها نەتاندەتوانی سەروەت و سامان و کۆیلە و کانزاکانتان لێرە ببەن بۆ شوێنی خۆتان، بەڵکو سەربازانی مەست و خوێنخوارەکانم ئێوەشیان وەك ئەوانی تر بەکوشت دەدا.

ئەم گوتەیەی دروست بوو و"هورم هب"بەشێوەیەك ئاسایشی ئەو ناوچەیەی پاراستبوو کە یەك ئەنگوستیلەی مسیش لەهیچ سەوداگەرێك نەدزرا.

سەوداگەرانیش زانیان ئەگەر بەخواستی خۆیان باجی لەسەدا دەی خۆیان نەدەن، لەوانەیە.هەموو شتێکی خۆیان لەدەست بدەن، بۆیە باجی خۆیان دا بە"هورم هب"و ماڵ و گیانیان بە بێوەیی لە"ئۆرشەلیم" بردەوە بۆشوێنی خۆیان. منیش بەبۆنەی کۆتایی هاتنی جەنگ، هیچ کارێکم بەدەستەوە نەمابوو، بۆیە ڕۆشتم بۆلای"هورم هب" بۆئەوەی ماڵئاوایی لێ بکەم و بگەڕێمەوە بۆ "ئزمیر".

لەکاتی ماڵئاواییدا"هورم هب"پێی وتم:دوێنی نامەبەرێك نامەیەکی لەلایەن فیرعەونەوە بۆ هێنابوم و فیرعەونیش لەم نامەیەدا، گلەیی ئەوەی لێدەکردم کە بۆچی خوێنڕێژی و کوشت و کوشتارم خستووەتە نێو"خەبیری"ەکان، منیش دەمەوێت ئەوە

بەفیرعەون بڵێم ئەو کە سرود بۆ خوداکەی خۆی دەخوێنێت و وادەزانێ دەتوانێت میسر و سوریا بەئاشتی خوازی و ئیشق و خۆشەویستی کردن لەگەڵ هاوڕەگەزەکانی خۆیدا، بەڕێوە ببات، هێشتا دیمەنی هێرشی خێلی"خەبیری"ەکانی بۆشارێك یان ناوچەیەك بەچاوی خۆی نەبینیوە و ئەگەر دەبینێت کە بەچ شێوەیەك ئەم خێڵانە هێرش دەکەنە سەر شار و ناحیە و لادێکان و پیاو و منداڵی ئەو خێڵە بەکوشت دەدەن و لەگەڵ ژنەکانیشیان- وەك ژنە لەش فرۆشەکان- ڕادەبوێرن و دوای ئەوەش وەك کەنیزەیەك دەیانخەنە ڕوو بۆئەوەی لەبازاڕدا بیانفرۆشن بە سەوداگەرەکان، لەوکاتەدا بۆی دەردەکەوێت کە ناتوانێت زەوی بەئاشتی خوازی و ئیشق و خۆشەویستی بەڕێوە ببات، چونکە زۆر مەحاڵە کەسێك کەتوانای کوشتن و فەرهود و تالآنی هەبێت و سود لەو توانایەی وەرنەگرێت. تەنها لەیەك حاڵەتدا پیاوێکی بەتوانا کە دەتوانێت تالآنی و کەسانی تر بەکوشت بدات و دەست بەسەر ژن و سەروەت و سامانیاندا بگرێت، سود لەو توانایەی وەرنەگرێت، ئەو حاڵەتەش ئەوەیە کە پێویستی بەدارایی و ژنانی جوان نەبێت.

ئێستا من لەگەڵ سەربازەکانی خۆمدا دەگەڕێمەوە بۆ میسر و دڵنیام کە فیرعەون دەڵێت: سەربازەکان ئازاد و پرژوبڵاو پێ بکە، بەڵام من پرژوبڵاوەیان پێناکەم ، لەبەرئەوەی لەتەواوی میسردا، تەنها یەك لەشکری سەربازی کە ئەزمونی جەنگیان بەچاوی خۆیان بینیوە لەشکرەکەی منە.

وتم:"هورم هب" ئایا لەوباوەڕەدایت میسر پێویستی بەم هێزە سەربازیە بێت؟ چونکە میسر بەڕادەیەك بەهێز و دەوڵەمەندە کە دوژمنی نیە، بۆئەوەی ناچار بێت، چاودێری لەم هێزە سەربازیە بکات کە ئەزمونی جەنگیان بەچاوی خۆیان بنیوە.

"هورم هب" وتی: وڵاتێکی وەك میسر کە دەیان پادشای سوریا لەژێر پارێزگاری ئەودایە و هەرلەبەرئەوەش پێویستی بە لەشکرێکی بەهێز هەیە بۆئەوەی ئاشتی لەنێوا فەرمانڕەویاندا بپارێزێت، من بەم تازەییانە بیستومە کە پادشای وڵاتی "ئامورو" لەسوریادا سەرقاڵی کۆکردنەوەی ئەسپ و دروست کردنی گالیسکەی جەنگیە و ئاشکرایە کە نیازی وایە یاخی بێت.

وتم: من ئەم پادشایە دەناسم، لەبەرئەوەی لەڕابردوودا چارەسەری ددانیم کردووەو ئەویش لەوکاتەدا کەنیزە جوانەکەی منی بینی و زۆر حەزی لێکرد و پێیەوە

پەیوەست بوو، بۆیە منیش ناچاربوم کەنیزەکەی خۆمی پێبدەم و منیش بێژن مامەوە.

"هورم هب"وتی:"سینۆهە" ئایا تۆ ئامادەیت هاوکاری من بکەیت، بەواتا گەشتێکی مەزن بۆ من ئەنجام بدەیت و لەبەرامبەردا هەرچەنێك زێڕ و زیوت بوێت پێتی دەدەم.

وتم: بۆچی دەتەوێت من ئەم گەشتە بکەم؟

"هورم هب"وتی: تۆ پزیشکێکی ئازادی و دەتوانی بڕۆیت بۆ هەموو شوێنێك، لەبەرئەوەی پزیشکی هەموویان متمانەت پێدەکەن و من دەزانم کە وڵاتی"هاتی و بابل"زۆر ڕێز لە پزیشکە میسریەکان دەگرن.

هەواڵێکی ترسناکم لەبارەی چەکە جەنگیەکانی"هاتی و بابل"یەکانەوە بیستووە، بۆنمونە بیستومە "هاتی"یەکان نێزە و شمشێرەکانیان بە کانزایەکی ڕەش دروست دەکەن کە ناوی ئەو کانزایە "ئاسن"ە و هیچ کەسێکیش نازانێت ئەم کانزایەیان لەکوێوە بەدەست هێناوە، بەڵام لەشمشێر و نێزەکانیان هەڕەشەئامێزتر گالیسکە جەنگیەکانیانە و بیستومە کە گالیسکە جەنگیەکانیشیان بەم ئاسنە ڕەشە دروست دەکەن و بەڕادەیەك ئەم گالیسکانەیان پتەون"محکم" کاتێك بەر گالیسکە مسینەکانی ئێمە بکەون وەك دار تێك و پێکیان دەشکێنێت، بۆیە بەدەست هێنانی زانیاری پێویست لەبارەی ئەو کانزایە و چەکی میلەتەکانی تر و گالیسکەکانیان لەتۆ شایستەترم بەدی نەکرد، چونکە تۆ پزیشکی و دەتوانی بڕۆیت بۆ هەموو شوێنێك و لەهەموو گرنگتر شارەزای زمانی نێونەتەوەیی"بابل"یت، هەر لەمڕێیەوە دەتوانی قسە لەگەڵ هەموو کەسێکدا بکەیت و هیچ کەسێکیش گومانی سیخوڕیت لێناکات، لەبەرئەوەی هیچ کەسێك هزری بۆ ئەوە ناڕوات کە پزیشکێك زانیاری لەبارەی سیستەمە سەربازیەکانەوە هەبێت، سەرەڕای ئەمانەش تۆ کەسێکی هۆشیار و ژیریت و دەزانی چ جۆر زانیاریەك سود بەمن دەگەیەنێت، لەکاتێك کەسانی تر بێهەستن و کاتێك فیرعەون کەسانێك بۆ بەدەستهێنانی زانیاری دەنێرێت، کاتێك دەگەڕێنەوە تەنها زانیاری ڕیشی پادشای"بابل"و ژنەکانی بۆ فیرعەون دەهێنن.

بەڵام تۆ دەتوانی لەوڵاتانی تردا زانیاری پێویست کۆ بکەیتەوە، بۆنمونە چەند سەربازیان هەیە و چەکی سەربازەکانیان چیە و ئاسن چیە و بەچ شێوەیەك بەدەست

دێت، ئایا دروست کراوه یان وەك مس لەزەوی دەردەهێنرێت، هەروەها دەتوانیت لەوە تێبگەیت کە توانای میلەتەکانی تر تا چ ڕادەیەکە، دوای ئەوەی ئەم زانیاریانەت بەدەست هێنا دێیت بۆ لام بۆ میسر و ئەوەی دەیزانیت بۆم دەگێڕیتەوە.

وتم:"هورم هب" من چیتر ناگەڕێمەوە بۆ میسر.

"هورم هب" وتی: هەڵەیت، کەسێك ئاوی"نیل"ی خواردبێت ناتوانێت دڵی لەمیسر هەڵکەنێت، ئەم قسەیەی تۆ لەگوێی مندا وەك وزە وزی مێش بێسودە، چونکە دەزانم ڕۆژێك دێت بەیەکجاری دەگەڕێیتەوە بۆ میسر و من لەوباوەڕەدام ئەگەر تۆ ڕازی بیت لەسەر ئەوەی زانیاریم لەبارەی سیستەمی فەرمانڕەوایی و هێزی سەربازی و چەك و جۆری مەشقەکانی میللەتانی ترم بۆ بهێنی، من سودێکی زۆر لەو زانیاریانەی تۆ وەردەگرم، چونکە من هیوادارم لەئایندەدا بتوانم بەهۆی ئەم زانیاریانەوە سنوری دەستەڵاتی میسر بەرفراوانتر بکەم و پادشاکانیان لەپێناو بەرژەوەندی وڵاتەکەماندا ملکەچ بکەم، لەمڕۆدا میسر ئەو پلەوپایەی کە دەبێت هەیبێت، نیەتی. لەکاتێکدا میللەتی میسر هەڵبژاردەترین میللەتی جیهانە و خوداکان میللەتی میسریان لەبەرئەوە لەپێش هەموو میللەتانی ترەوە دادەنێن، بۆئەوەی فەرمانڕەوایی میللەتانی تر بکەن، بەڵام خودی میسریەکان، بەهۆی تەمەڵیانەوە نایانەوێت سود لەم تایبەتمەندیەیان وەرگرن و فیرعەونی ئێمەش لەباتی ئەوەی هێزە سەربازیەکان بۆ وڵاتانی تر بنێرێت، بەهۆی دودڵی و گومان و هزریەوە، جۆرێك خودای خەیاڵپلاوی لەهزری خۆیدا چەسپاندووە کە بەردەوام باسی ئاشتی و ئیشق و خۆشەویستی کردن لەبەرامبەر هاوڕەگەزەکاندا دەکات.

کاتێك "هروم هب" ئەم قسانەی بۆ دەکردم، بەوردبونەوەیەکەوە بۆم دەڕوانی و هەستم کرد کە ئەو لەبەرچاوم مەزن بووە.

چونکە تا ئەوکاتەی کەسێك هەڵگری ئەو ئامادەکاریە نەبێت، نابێتە هەڵگری ئەم جۆرە بیرۆکانە و هەموو شتێکمان لەئەندێشەکانمانەوە سەرچاوە دەگرێت و ئەو کەسەش کە ئەندێشە و هزرێکی مەزنی هەیە و ئامادەیە بیر و هزری خۆی کرداری بکات، ئەوا کەسێکی مەزنی لێ دەردەچێت.

بۆیە پێم وت:"هورم هب"تا ئەمڕۆ من تۆم بەپیاوێکی جەنگاوەری شایستە لەقەڵەم داوە و لەوباوەڕەدا نەبوم هەڵگری ئامادەیی بەڕێوبردنی وڵاتت تێدا بێت، بەڵام ئەمڕۆ لەتۆدا ئامادەییەك بەدی دەکەم کە لەوانەیە فیرعەونیش هەڵگری ئەو ئامادەییە نەبێت.

"هورم هب"وتی: ئایا ئامادەیت من بەسەرکردەی خۆت لەقەڵەم بدەیت؟ توانا ژیانیەکانی خۆت بە تواناکانی منەوە پەیوەست بکەیت؟

وتم: بەڵێ ئامادەم. ...

"هورم هب" وتی:"سینۆهە" تۆ لەمڕۆ بەدواوە لەوڵاتانی تردا دەبیتە چاو و گوێی من و منیش بەبۆنەی تۆوە زانیاری لەبارەی دەستەڵاتی پاشایەتی وڵاتانی بێگانە بەدەست دەهێنم، ئەگەر پلەوپایەم بەرزبویەوە و گەشتمە شوێنێکی بەرزتر لەمەی کە هەمە، ئەوا تۆ لەخۆشی و سەرکەوتنەکانی خۆمدا هاوبەش دەکەم و ئەگەر بەرزیش نەبومەوە و بەپێچەوانەوە پلەم نزم بویەوە، تۆ هیچ زیانێك نابینی، چونکە وەك ڕابردوو هەر بەپزیشکی دەمێنیتەوە و دەتوانی بەهۆی کاری پزیشکیتەوە زێڕ و زیو بەدەست بهێنیت و سەرکردایەتی من و بەندەی تۆ، لەوانەیە بۆ تۆ سودێکی زۆری هەبێت، بەڵام هیچ زیانێکت پێ ناگەیەنێت.

ئەوکات"هروم هب"بڕێکی زۆر ئاڵتون، زۆر لەوە زیاتر کە من چاوەڕێم دەکرد پێدامو کۆمەڵێك سەربازی ڕاسپارد کە من بگەیەننەوە"ئزمیر"بۆئەوەی هیچ کەسێك لەڕێدا نەتوانێت ئەم سامانەم لێ زەوت بکات.

کاتێك خۆم کرد بە"ئزمیر"دا، ئاڵتونی خۆمم دا بەچەند کۆمپانیایەك و لەبەرامبەردا تەختە قوڕی خۆشەکراو کە لەناو ئاگردا سور کراوەتەوە وەرگرت و لەسەر ئەو تەختە قوڕە سورکراوەیە بڕی ئەو ئاڵتونەی من دابوم بەو کۆمپانیایە نوسرابوو و جگە لەخۆم هیچ کەسێکی تر ناتوانێت ئەو بڕە ئاڵتونە لە بابل یان وڵاتی"هاتی"یەکان وەرگرێتەوە، لەبەرئەوە ئەگەر دزەکانیش ئەم تەختە قوڕینانەم لەڕێدا لێ بدزن، ئەوا هیچ سودێکی لێ وەرناگرن و منیش هیچ زیانێکم لێ ناکەوێت، چونکە لەم حاڵەتەدا دەتوانم بگەڕێمەوە و تەختە قوڕینەی تریان لێ وەرگرمەوە.

لەوباوەڕەدام یەکێك لەتایبەتمەندیە مەزنەکانی ئەم سەردەمە لەبەرامبەر سەردەمە درندەکانی تردا ئەوەیە کە ئێمە دەتوانین بڕێکی زۆر ئاڵتون لەشێوە تەختە قوڕێکدا هەڵگرین و ناچار نین خودی ئاڵتونەکە هەڵگرین، بۆئەوەی دز و چەتەکان تەماعی ئەوە بیانگرێت ئەوەی هەمانە و بەگشتی بەرهەمی تەمەنێك کۆکردنەوەی سامانمانە لێ بدزن.

*بەشی سێزدەیەم*

# گەشتە درێژخایەنەکەم

ئێستا پێش ئەوەی بڵێم لە وڵاتانی تردا چیم بینی، حەز دەکەم ئەوەتان بهێنمەوە یاد کەسەردەمی گەشتە درێژخایەنەکەم، یەکێك لەباشترین ڕۆژەکانی تەمەنمە و دەزانم کە چیتر ئەو ڕۆژانە نابینمەوە.

چونکە لەوکاتەدا لاو و بەهێز بوم و خۆر لەبەرچاومدا ڕوناکیەکی زیاتری هەبوو و شنەی باش بۆنێکی خۆشی بەلوتمدا دەدا و ژنەکانیش جوانتر دەهاتنە بەرچاوم. .

هیچ جیاوازیەك لەنێوان خۆر و شنەی"با"و ژنەکاندا نیە، بەڵام مرۆڤ لەسەردەمی پیریدا بەشێوەیەکی تر تەماشایان دەکات.

کاتێك دەستم کرد بە گەشتەکەم، ماوەی چل ساڵ جیهان لەحاڵی ئاشتی و ئارامی تێپەڕاندبوو لەهەموو شوێنێك کاروانەکان، بەئازادی هاتوچۆیان دەکرد و کەشتیەکان بەنێو ڕوبار و دەریاکاندا بێ هیچ هەستکردن بەهەڕەشەی چەتەکان. دەریاوانی خۆیان دەکرد.

لەناو ئەو وڵاتانەدا، جوتیارەکان بەهۆی بەردەوامی ئاشتی، بەرهەمێکی زۆریان لە کێڵگەکانیان کۆ دەکردەوە و دەیاندا بەخاوەنەکانیان و لەهەموو شوێنێکدا "نیل" ئاسمانی لەباتی "نیل"ی زەمینی میسر کێڵگەکانی تێرئاو دەکرد.

مانگا و مەڕەکان لە دەشتەکاندا دەلەوڕین و شوانەکانیش پاڵیان بە دارێکی درێژەوە دەدا، بۆئەوەی شمشاڵ بۆ مەڕەکانیان بژەنن و ئەوانیش بەوردی گوێیان لێ دەگرت.

بەرێکی زۆریان لە درەختی هەنگور بەدەست دەهێنا و درەختی میوەکانی تر لەژێر باری بەرەکانیاندا دەچەمانەوە و بەسەر تەواوی پەرستگاکاندا دوکەڵ بەرز دەبویەوە، چونکە لەتەواوی پەرستگاکاندا مانگا و مەڕیان دەکرد بەقوربانی و لێیان دەنا.

هەموو شتێك ڕەوتی ئاسایی خۆی بەڕێوە دەبرد، بەواتا دەوڵەمەندەکانساڵ لەدوای ساڵ دۆڵەمەنتر و هەژارەکانیش ساڵ لەدوای ساڵ هەژارتر، چونکە خوداکان کارێکیان دەکرد کە هەموو ساڵێك سەروەت و سامانی دەوڵەمەندەکان زیاتر بێت و هەژارەکانیش ساڵ لەدوای ساڵ خۆیان هەژارتر لەساڵی پێشوو ببینن.

لەوباوەڕەدام لەوکاتەدا خوداکانیش وەك دەوڵەمەند و کاهینەکان تەندروست و قەڵەو بون و هەموو ڕۆژێکیان بەخۆشی بەڕێوە دەبرد، چونکە کاتێك ئاشتی لەسەر زەویدا بەرقەرار بێت، ئەوا کاری خوداکانیش لەسەر زەویدا کەم دەبێتەوە، لەمکاتەدا زیاتر دەتوانن بحەوێنەوە و کاتی خۆش بەسەر بەرن.

ئەمرۆ، ئاوات بۆ ئەو ڕۆژانە ناخۆم، چونکە"خۆزگە"کاری پیاوێکی ژیر و جیهان دیدە نیە و بەئاوات و خواردن و خۆزگە کردن ناتوانێت ڕابردوو بگەڕێنیتەوە بۆ دواوە، بەتایبەت ئەگەر بگەڕێنرێتەوە، چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت تەمەنی لاویەتی خۆی بگەڕێنێتەوە.

پێش ئەوەی دەست بەگەشتەکەم بکەم، هەر بەوشێوەی کە وتم گەڕامەوە بۆ "ئزمیر"و "کاپتا"ی کارەکەرم، هەرئەوەی چاوی پێم کەوت بەرەو ڕووم ڕایکرد و فرمێسکی شادی لەتاکە چاوەکەیەوە چۆڕایە خوارەوە و وتی: ئەمڕۆ پیرۆزترین ڕۆژەکانی ژیانی منە، لەبەرئەوەی دەبینم تۆ گەڕایتەوە بۆ ماڵ.

من وام دەزانی لەو جەنگەدا کوژراویت و چیتر چاوم پێت ناکەوێت و خەمی ئەوەم دەخوارد کە چی بەسەر لاشەکەتدا دێت و کێ مۆیای دەکات، بەڵام بەخۆمم دەوت لەبەرئەوەی تۆ مردویت تەواوی سامانەکەت لە کۆمپانیاکاندا دەبێت بەهی من.

بەم گەڕانەوەیەت زۆر خۆشحاڵ بوم، چونکە بێ تۆ سەرەڕای ئەوەی دەوڵەمەند دەبوم، وەك مەڕێك وابوم کە شوانەکەی خۆی ون کردبێت، لەکاتێکدا لەمڕۆدا وەك مەڕێك وام کە خاوەنی هەیە.

کاتێك تۆ لێرە نەبویت، زیادتر لەوەی لەکاتی ئامادە بونی تۆ لێرە دزیم نەکردووەو زۆریش هەوڵم داوە ماڵەکەت بێ کەمو کورتی بهێڵمەوەو پەرتەوازەیی بەسامانەکەتەوە

بەدی نەکرێت، گەڕانەوەی تۆ بۆ ئێرە دەقاودەق وەك ئەوڕۆژە وایە کە لێرە ڕۆشتی، خاوەنی ماڵێکی ڕێك و پێکی.

دوای ئەوە ئاوی هێنا و پێی شۆردم و ئاوی کرد بەسەر دەست و ڕوخساریشمدا و هەر بەوشێوەیە بەردەوام قسەی دەکرد. من پێم وت: ئەوەندە قسە مەکە، لەباتی ئەوە کەلوپەلی گەشتەکەم ئامادە بکە، چونکە من دەمەوێت گەشتێکی درێژخایەن دەست پێبکەم.

کاتێك"کاپتا"بیستی من دەمەوێت گەشتێکی درێژخایەن بگرمە بەر دەستی کرد بەگریان و گلەیی لەخوداکان کرد کە ئەویان هێناوەتە بون و وتی: من بۆچی لەم جیهانەدا هاتومەتە بون، کە نابێت بەهیچ شێوەیەك هیچ کات بۆ ماوەیەکی درێژ خایەن خۆشبەخت بم.

من ئەرکێکی زۆرم کێشاوە تا خۆم قەڵەو کردووە و ئێستاش تۆ دەتەوێت دەست لەم ژیانە خۆشە هەڵگریت و بڕۆی و منیش کە ناچارم لەگەڵ تۆدا بێم و دوبارە لەکاتی ئەم گەڕانەمدا لاواز دەبمەوە.

وتم: تۆ ناچار نیت لەگەڵ مندا بێیت و دەتوانی لێرەدا بمێنیتەوە.

"کاپتا"وتی:ئەگەر ئەم گەشتەی تۆ یەك دوو مانگێك دەخایەنێت، من لێرە دەمامەوە، بەڵام لەبەرئەوەی دەتەوێت گەشتێکی درێژخایەن ئەنجام بدەیت، ناچارم لەگەڵتدا بێم، چونکە ئەگەر من لەگەڵ تۆدا نەبم و ڕێنماییت نەکەم، تۆ وەك گوێرەکەیەکت لێ دێت کە دزێك هەردوو پێی بەستبێتەوە و خستبێتیە سەرشانی بۆئەوەی بیبات، لەم حاڵەتەدا گوێرەکەکەش ناتوانێت بەرگری لەخۆی بکات، یان وەك ئەو کەسە وایت کە چاویان بەستبێت و توانای ڕێکردنی نەبێت و لەهەموو هەنگاوێکیدا دەکەوێت، ئەگەر من لەگەڵ تۆدا نەبم هەموو کەسێك بەئەندازەی توانای خۆی زێڕ و زیو و سامانی ترت لێ دەدزێت، لەکاتێکدا ئەگەر من لەگەڵ تۆدا بم تەنها من دزیت لێدەکەم و دزینی من باشترە لەدزی کەسانی تر، چونکە کەسانی تر لەکاتی دزییاندا، گوێ بەهیچ شتێك نادەن، لەکاتێکدا من بەڕێژەیەکی کەم دزیت لێدەکەم و بەردەوام بەشی هەرە زۆری سامانەکەت بۆ تۆ دەهێڵمەوە، ئایا باشتر نیە هەر لێرەدا لە"ئزمیر" لەماڵەکەی خۆتدا بمێنینەوە و خواردنی خۆش بخۆین و سود لەزێڕ و زیوی خۆت وەرگریت و گرفتاری هەڕەشە و گرفتەکانی گەشتکردن نەبین.

"کاپتا"بە تێپەڕبونی کات ئەوەندە بێشەرم بوبو کە لەدڵی خۆیدا وای لێك دەدایەوە کە لەگەڵ مندا هاوبەشە و دەیوت"ماڵی ئێمە"و"خواردنی ئێمە"و"زێڕ و زیوی ئێمە".

منیش بۆئەوەی بەبیری بهێنمەوە کە ئەو بەندەی منە، نەك لەسەروەت و سامانی مندا هاوبەش بێت، هەروەها بۆئەوەی گریانی ئەو هۆکارێکی ڕاستەقینەی لەخۆ بگرێت گاڵۆکەکەی خۆمم بۆ هەڵگرت و چەند دانەیەکم کێشا بەپشت و ناودەستیدا و پێم وت: "کاپتا" تۆ ئەوەندە تامەزرۆی دزی کردن بویت ڕۆژێك دێت بەهۆی ئەم دزیەتەوە لەسێدارە دەدرێیت و ڕۆژێك دێت دەتبینم سەرەوژێر هەڵیانواسیوی.

دواجار"کاپتا"ڕازی بوو بەم گەشتە و کەرەستەی گەشتەکەمانی ئامادە کرد و کەوتینە ڕێ. ئەگەر"کاپتا"م لەگەڵدا نەبوایە لە ڕێی دەریاوە لە"ئزمیر"ەوە خۆم دەگەیاندە"لوبنان"، بەڵام"کاپتا"دەیوت بیکوژم باشترە لەوەی سواری کەشتی ببێت.

من سواری کەژاوەیەك بوم، بەڵام وڵاخێکم بۆ"کاپتا"کڕی، لەبەرئەوەی "کاپتا" لەبەشی خوارەوەی جەستەی برینی هەبوو، بەسوار بونی ئەو وڵاخە ئازاری پێدەگەشت، بۆیە بەشێك لەو ڕێگایەی بە پێ دەبڕی و دەیوت ڕێکردن بەپێی خۆی باشتر لەوەی سواری ئەو وڵاخە ببێت.

کاتێك گەشتینە"لوبنان"من درەختە بەرزەکانی "سدر"م بینی و ئەو درەختانە بەڕادەیەك بەرزبون ئەگەر باسی بەرزیم بکردایە هیچ کەسێك لەمیسردا باوەڕی پێ نەدەکردم، هەر لەبەرئەوەش باسکردنی بەرزاییم پشتگوێ خست، لەشەخڵ و چڕی دارستانی"سەدر"بۆنێکی خۆش دەهات و ئاوی پاك بەجۆگەلەی ئەو دارستانەدا تێدەپەڕی و منیش بەخۆمم وت: لەوڵاتێکدا کە ئەوەندە جوان و خۆشبونە هیچ کەسێك تێیدا بەدبەخت نیە.

تاگەشتینە شوێنێك کە بەندەکان خەریکی بڕینی درەختی"سەدر"بون و بەشانیان دەیانگواستەوە و لەڕێگە شاخاویەکانەوە بەرەو خوار دەیانبردن بۆئەوەی بیانگەیەننە قەراخ دەریا و باری کەشتیان بکەن.

کاتێك من چاوم بە برینی بەندەکان کەوت کە مێشی لێ ئاڵابوو، ئاگاداری ئەوە بووم کە لەو وڵاتە جوان و بۆنخۆشەشدا خەڵکانێکی بەدبەختی زۆر بەدی دەکرێن.

دوای ئەوە لە"لوبنان" تێپەڕین و ڕێگای شاری"میتانی"مان گرتە بەر.

له"میتانی"دا"کاپتا"خۆشحاڵی خۆی دەردەبڕی، چونکە لەوکاتەوەی خۆمان کرد بەو شارەدا، خەڵکی زۆر بەجوانی پێشوازیان لێ دەکردین و لەبەرئەوەی دەیانزانی کە"کاپتا" بەندەی منە، خواردنی خۆشیان پێدەدا و "کاپتا"دەیوت زۆرباشە گەر هەرگیز ئەم شارە بەجێ نەهێڵین و بەردەوام لێرە بمێنینەوە، بەڵام من بۆ کۆکردنەوەی زانیاری سەربازی هاتبوم و نەمدەتوانی لەوێدا بمێنمەوە و دەبێت دوای بەدەست هێنانی ئەو زانیاریانە بڕۆم بۆ "بابل".

له"میتانی"دا شتێك كە زیاد لەهەر شتێکی تر سەرنجی ئێمە ڕاکێشا جوانی ژنەکانیان بوو، ژنەکان، هەموویان باڵابەرز و بەهێز و جوان بون، هەرئەوەی زانیان من پزیشکێکی میسریم هاتن بۆ لام و سکاڵایان لە ساردی مێردەکانیان دەکرد و دەیانوت کە هاوسەرەکانمان ناتوانن هەموو شەوێك لەگەڵماندا ڕابوێرن و ئەم بابەتەش بووەتە مایە خەمی ئێمە.

من بینیم کە پێستی ئەو ژنانە ئەوەندە سپیە کە تێپەڕبونی خوێن بەنێو ڕەگی شینباوی ژێرپێستیاندا دەبینرێت.

پزیشکانی میسر، لەکۆنەوە، ئاشنای چارەسەرکردنی ساردی پەیوەندی سێکسی هاوسەران بون و لەهیچ وڵاتێکی تردا، بەئەندازەیی میسر، لێهاتوییان لەچارەسەر کردنی ئەم نەخۆشیەدا نیەو منیش هەرجارەو دەرمانێکم دەدا بەژنەکان کە دەرخواردی مێردەکانیان بدەن، بەڕوخساریاندا دەمزانی کە دەرئەنجامێکی باشیان بەدەست هێناوە. ئەو ژنانەش دوای چەند ڕۆژێك دەهاتن بۆ لام و سوپاسیان دەکردمو دەیانوت: ئێستا هاوسەرەکەی دەتوانێت هەموو شەوێك لەگەڵیدا هاوخەو ببێت، بەڵام ناتوانم بڵێم ئایا ئەو ژنانە ئەو دەرمانەیان لەمن وەردەگرت دەیاندا بەهاوسەرەکانیان یان بەخۆشەویستەکانیان. لەبەرئەوەی لە"میتانی"دا ژنەکان ڕاهاتبون بێ لەهاوسەرەکانیان، لەگەڵ پیاوانی تریشدا ڕابوێرن، سەرەڕای ئەوەی ژنەکانیان باڵا بەرز و جوانن، بەڵام بەدەگمەن دەبینی منداڵیان هەبێت و تێگەشتم کە خوداکان نەفرەتیان لە میلەتی"میتانی" کردووە، چونکە کاتێك منداڵی تازە لەدایك نەبن، زۆربەی ئەو میللەتە لەپیرمێرد و پیرەژن پێك دێت و ئەوکات وردە وردە بەرەو لەناوچون دەچن. سەرەڕای ئەوەی بەڕێژەیەکی زۆر چارەسەرکردنی ساردی پەیوەندی سێکسی هاوسەران بو بە مایەی ناوبانگی من، هەروەها چارەسەرکردنی یەکێك

لەکەسە دەوڵەمەندە بەتەمەنەکانی"میتانی"سەرکەوتنی منی بەتەواوی لەو وڵاتەدا ئاشکرا کرد.

ئەو پیاوە پیرەمێردێك بوو کە سەرئێشە هەراسانی کردبوو و دەیوت کە بەردەوام لەگوێکانیدا دەنگێك لەشێوەی دەنگی هەورەگرمە دەبیستێ و دەیوت سەردانی تەواوی پزیشکانی "میتانی"کردووە، بەڵام نەیانتوانیوە چارەسەری ئەم سەرئێشەیەی بکەن.

ڕۆژێکیان من پێم وت: بێت بۆ ماڵی من، بۆئەوەی پشکنینێك بۆ سەری بکەم و دوای ئەوەی هات، دامنیشان و بەپەنجەی دەستم دام لەچەند شوێنێکی جیاوازی سەری و وتی: هیچ شوێنێکی سەرم ئێش ناکات.

دوای ئەوە چەکوشێکم بەدەستەوە گرت و بەو چەکوشە، دامەوە لەچەند شوێنێکی جیاوازی سەری و دەیوت هەست بەئازاری تازە ناکات، بەڵام وەك پێشوو ناو سەری ئازاری دەکرد.

لەکاتێکدا بەچەکوشەکەم دەمدا لەچەند شوێنێکی جیاوازی سەری، لەناکاو ئەو پیاوە هاواری کرد و بورایەوە و من تێگەشتم کە گرفتی سەری لەهەمان ئەو شوێنەدا بێت کە چەکوشەکەی بەرکەوتووە. منیش ئەو شوێنەم بەشتێك دیاری کرد، دوای ئەوە بەپزیشکە"میتانی"یەکانم وت دەمەوێت کون بکەمە سەریەوە.

پزیشکەکانیش وتیان: ئەگەر کون بکەیتە سەریەوە دەمرێت.

وتم: منیش بەڵێنی ئەوەتان پێنادەم کە چارەسەری بکەم، بەڵام دەتوانم بڵێم ئەگەر ئەو دومەڵە لەسەریدا دەربهێنم لەوانەیە بەزیندویی بمێنێتەوە، بەڵام ئەگەر کون نەکەینە سەریەوە و ئەو دومەڵە دەرنەهێنرێت، بەدڵنیاییەوە دەمرێت.

پزیشکەکان نکوڵیان لەوەدا دەکرد کە دومەڵێك لەسەریدا هەبێت، دوای ئەوە خۆم قسەم لەگەڵ نەخۆشەکەدا کرد و وتی: بەم سەرئێشە بەردەوامەمەوە، من هەموو ڕۆژێك دەجار دەمرم، ئەگەر کون بکەیتە سەرمەوە، بۆ یەکجار دەمرم و ڕزگارم دەبێت.

ڕۆژێکم بۆ نەشتەرگەری سەری دیاری کرد و بڕیاربوو کۆمەڵێك پزیشکی ئەو ناوچەیە بێن و تەماشای ئەم شێوە چارەسەریەی من بکەن، بەمەرجێك هیچ دەست تێوەردانێك لەکارەکەمدا نەکەن.

لەوڕۆژەدا، من بەپێی ئاینی "ماڵی ژیان"ی "تبس" کەرەستەی نەشتەرگەریەکانم پاککردەوە، هەروەها خودی کەسی نەخۆشیشم پاککردەوە و بڕێك زیوم ئامادە کرد، بۆئەوەی دوای ئەوەی بڕێك لەئێسقانی سەری لا دەبرێت لەباتی ئەو پارچە ئێسقانەدا دایبنێم.

ئەوکات"تلیاکم"ڕۆکردە ڕەگی نەخۆشەوە، بۆئەوەی هەست بەئازار نەکات و لەهەمان ئەو شوێنەدا کە دەمزانی ئەو دومەڵە لەوێدایە، پارچە ئێسقانێکی کاسەی سەریم دوای هەڵدڕینی پێستی سەری دەرهێنا و دوای ئەوە مێشکی کەسی نەخۆش دەرکەوت.

کەسی نەخۆش هەستی بەهیچ جۆرە ئازارێك نەدەکرد، بگرە چاوەکانیشی کرابونەوە و هەرئەوەی مێشکی سەری دەرکەوت بەپزیشەکانم وت وەرنە پێشەوە و هەموویان بینیان کە لەسەر مێشکی کەسی نەخۆش دومەڵێك بەئەندازەی هێلکەی پەڕەسێلکەیەك بەدی دەکرێت، پێم وتن لەوانەیە بەهۆی ئەم دومەڵەوە بێت کە ئەو هەموو سەرئێشەیەی بۆ دروست بوبێت و ئێستاش من ئەم دومەڵە لەمێشکی جیادەکەمەوە.

کاتێك خەریکی جیاکردنەوەی ئەو دومەڵە بوم"کاپتا"کە هەندێك کەرەستەی نەشتەرگەری و قاڵبگیری بۆ هەڵگرتبوم، ئەندازەی ئێسقانی هەڵکنراوی گرت و تواوەی زیوی تێکرد و پارچە زیوێکی لەشێوەی ئێسقاندا لەقاڵبەکەدا دەرهێنا.

منیش ئەو پارچە زیوەم دوای ئەوەی سارد بویەوە، خستمە سەر جێگە کونی سەری کابرای نەخۆش و پێستی سەریم داپۆشیەوە و دوریمەوە، مەڵهەمێکم بەسەر شوێنی دورینەکەدا ڕێژا و لەنەخۆشم پرسی، ئێستا تەندروستیت چۆنە، کەسی نەخۆشیش هەستایە سەرپێ و پێی وتم هەست بەهیچ ئازارێك ناکات و دوای چەند ساڵێك، ئەوە بۆ یەکەمجارە خۆی بەئاسودەیی ببینێت، منیش پێم وت: تا ئەوکاتەی ئەو برینەی سەرت بەتەواوی سارێژ نەبێتەوە نابێت تەکانی بدەیت و باشترین ڕەوشیش ئەوەیە کە ڕابکشێت و چەند ڕۆژێك لەجێگەدا بحەوێیتەوە.

برینی ئەو پیاوە سارێژ بوو و بەشێوەیەکی تەواو چاك بویەوە و دوای ئەوەی چارەسەرکرا، بڕیاری دا قەرەبوی ئەوە بداتەوە کە لەڕابردوودا بەهۆی ئەم سەرئێشەوە نەیدەتوانی بەئارەزوی خۆی ڕابوێرێت و سەرئێشەکەی نەیدەهێڵا خۆی سەرقاڵی ئەم

جۆرە خۆشگوزەرانیانە بکات، بۆیە شەویکیان بەبۆنەی گەرمی ئاو و هەواوە لەسەربانددا شەرابی دەخواردەوە، بەهۆی مەستیەوە کەوتە سەر زەوی و سەری شکا و مرد، بەلام هەموو خەلکی بەتایبەت پزیشکانی ئەو ولاتە لایەنگری ئەوەیان کرد کە مەرگی ئەو بەهۆی سەرخۆشیەوە بووە و بەهیچ شێوەیەك بەمنەوە پەیوەست ناکرێت، چونکە من ئەوم لەچنگی مەرگ و ئازار رزگارم کردبوو، ئەم چارەسەریەم بەشێوەیەك لە ولاتی"میتانی"دا ناوبانگی دەکرد کە ناوبانگی گەشتە"بابل".

ئەو ولاتەی لەژێر دەستەلاتی "بابل"دایە چەند ناوێکی هەیە و هەندێجار بە"کلدە"بانگی دەکەن و هەندێك کاتیش بە"خوسە"بانگی دەکەن، بەلام من بە"بابل"بانگی دەکەم، لەبەرئەوەی کاتێك ناوی"بابل"دەهێنرایە زمان هەموو کەسێك دەیزانی باسی کوێ دەکرێت؟ و "بابل"یش ولاتێکە کە زەویەکی بەپیت و تەختی هەیە و تا چاوت کار دەکات زەوی دەبینی و کێوی تێدا نابینرێت.

لە میسردا، ژنە میسریەکان، کاتێك ئاشەوانی دەکەن لەسەر ئەژنۆ رادەوستن و یەکێك لەبەرداشەکان بەدەستیان دەسورێننەوە، بەلام لە"بابل"دا ژنە بابلیەکان لەکاتی هاڕینی گەنمدا لەسەر پێیان رادەوستن و هەردوو بەردی بەرداشەکە بەئاراستەی پێچەوانەی یەکتری دەسورێننەوە و ئەمەش لەکاری ژنە میسریەکان دژوارترە.

لە"بابل"دا درەخت بەرادەیەك کەمە، ئەگەر کەسێك درەختێك ببڕێتەوە گرفتاری توڕەیی خوداکان دەبێت و تەواوی دانیشتوانی"بابل"قەلەون و خواردنی چەور و ئاردین دەخۆن، هەروەها لە"بابل"دا بالندەیەکی سەیرم بینی کە نەیدەتوانی بفڕێت و هەر ئەم بالندەیەش لەزۆربەی مالەکاندا هەبوو و بەناوی"مریشکی مالی" بانگیان دەکرد.

سەرەڕای ئەوەی مریشکی مالی ئەوەندەش گەورە نیە، هێلکە دەکات کەهەر یەك لەو هێلکانە بەئەندازەی هێلکە تیمساحێك دەبێت و دانیشتوانی"بابل" هێلکەی ئەم مریشکەیان دەخوارد و سەیر لەوەدا بوو ئەم مریشکە هەموو ڕۆژێك هێلکەیەك دەکات، لەکاتێکدا تیمساح یان بالندەکانی تر لەکات و وەرزی تایبەتتدا هێلکە دەکەن.

دانیشتوانی بابل بەهێلکەی ئەم مریشکە خواردنگەلێکی جۆراوجۆری پێ دروست دەکەن، بەڵام من ئەو جۆرە خواردنەم نەدەخوارد، بەڵکو خۆم بەو جۆرە خواردنانەی کە دەمناسین ڕازی دەکرد.

"بابل"یەکان دەڵێن شارەکەیان کۆنترین و مەزنترین شاری جیهانە، بەڵام من باوەڕ بەم قسەیە ناکەم، چونکە"تبس" لە"بابل"مەزنتر و کۆنترە، بەڵام دەتوانم بڵێم کە شکۆمەندی"بابل" لە"تبس" زیاترە و ئەو دیوار و تەلارانەی کە لە"بابل"دا هەیە لە"تبس"دا بەدی ناکرێت.

لە"بابل"دا دیوارەکان بەڕادەیەك بەرزن کە زیاتر لەکێو دەچن وماڵەکانیشان چوار نهۆم یان پێنج نهۆم دەبێت و لەهیچ شوێنێکدا بگرە لە"تبس"ی منیشدا بازرگانیخانەیەکم بەئەندازەی مەزنی بازرگانیخانەی"بابل"نەبینیوە.

خودای خەڵکی"بابل" بەناوی"مردوك" بانگ دەکرێت، بەڵام"عەشتار"یش دەپەرستن و دەروازەیەکی مەزنیان بۆ دروست کردووە کە بەدەروازەی"عەشتار"بانگی دەکەن و ئەم دەرەوازەیە لە دەروازەی پەرستگای"ئامون"یش بەرزترە.

لەم دەروازەیەوە، شەقامێك بە منارەی"مردوك" کۆتایی دێت و ئەم منارەیەش بەشێوەیەك دروستیان کردووە کە جادەیەك بەچواردەوری ئەو منارەیەدا سەردەکەوێت تا دەگاتە ترۆپکی ئەو منارەیە، بەڕادەیەکشی ئەو جادەیە پانە کەچەند گالیسکەیەك لەتەنیشت یەکەوە تێدەپەڕن.

لەسەرەوەی ئەم منارە بەرزەیشەوە، ئەستێرەناسەکانی تێدا نیشتەجێ بون بۆئەوەی پێوەری جوڵەی ئەستێرەکان بگرن و ڕۆژە خۆش و ناخۆشەکان دەستنیشان بکەن و هەمویان بەپێی ئەو ڕۆژنامانە کار دەکەن.

دەڵێن ئەستێرە ناسەکان دەتوانن لەڕێی ئەستێرەکانەوە پێشبینی ڕوداوی کەسەکانیش بکەن، بەڵام بەمەرجێك ئەو کەسەی دەیەوێت لەبەرامبەر ڕوداوەکانی ئایندەدا ڕابوەستێت، دەبێت بزانێت لەچ کاتژمێر و ڕۆژێکدا لەدایك بووە، من لەبەرئەوەی نازانم لە چ ڕۆژ و کاتژمێرێکدا لەدایك بوم، نەمدەتوانی سەردانیان بکەم.

من دوای ئەوەی خۆم کرد بە"بابل"دا، بەهۆی ئەو تەختە قوڕە سورکراوانەی کە لەگەڵ خۆمدا هێنابوم هەرچەنێك ئاڵتونم ویست لەبازرگانیخانەکانی"بابل"دا

وەرمگرت و دوای ئەوە لەمیوانخانەیەکی چەند نهۆمی مەزندا لەنزیک "عەشتار"دا ڕاوەستام.

لەم میوانخانەیە شوێنی نیشتەجێ بونی ئەو کەسە دەوڵەمەندانەیە کە دێن بۆ"بابل"، بەڵام لەو شارەدا ماڵیان نیە، بۆ نمونە "باڵوێز"ەکان کاتێك لەوڵاتێکی ترەوە خۆیان دەکەن بە"بابل"دا، لەم میوانخانەیەدا نیشتەجێ دەبن و بە کەژاوەیەکی مەزنی میوانخانە کە چل بەندە لەسەر شانیان هەڵی دەگرن دەڕۆن بۆ لای پادشای "بابل"

تەواوی بەشەکانی ئەم میوانخانەیە دیوارێکیان هەیە کە خشتەکانی هەڵکۆڵراو و وەك شوشە وان، کاتێك مرۆڤ دەست بەسەر خشتەکاندا دەهێنێت، وەك ئەوە وایە کە دەست بەسەر ئاوی مەنگدا بخشێنێت و هیچ جۆرە هەستێکی زبر و ناڕێك لەو دیوارەدا بەدی ناکرێت.

بە بنمیچی"سقف"ئەو میوانخانەیە کەزۆر لەزەویەوە بەرزە، گوڵیان ناشتووە و تا کەسێك ئەوەی من باسی دەکەم بەچاوی خۆی نەیبینێت، واهەست دەکات من باسی ئەفسانەیان بۆ دەکەم.

ئەم میوانخانانە چەند نهۆمیە کە بە"کۆشکی عەشتار"بانگ دەکرێت، بە گەشتیاران و خزمەتکارانیانەوە ئەوندە قەرەباڵخە کە بەئەندازەی ناوچەیەکی شاری "تبس"خەڵکی تێدا کۆ بووەتەوە.

کاتێك ئێمە لە"تبس"دا بوین پێیان دەوتین"بابل"دەکوێتە کۆتایی جیهانەوە و دوای ئەویش چیتر هیچ جیهانێك بونی نیە.

دوای ئەوەی خۆم کرد بەناو"بابل"دا و لەگەڵ دانیشتوانی ئەو ناوچەیەدا قسەم کرد، بیستم دەڵێن"بابل" چەقی جیهانە و لەبەشی ڕۆژهەڵاتی"بابل"دا ئەوەندە زەویو میللەت بەدی دەکرێن ئەگەر شەش مانگی یەك لەدوای یەك بەشەو ڕۆژ ڕێ بکەن ناگەنە کۆتایی ئەو زەویە.

منیش باوەڕم بەم قسەیە کرد، چونکە لە"بابل"دا میللەتگەلێکم بینی کە هیچ یەك لەو کەسانە لەمیسردا نەدەبینران و بگرە چاوم بەکەسانێك کەوت کە ڕەنگیان زەرد بوو، بێئەوەی ڕۆخساریان بەشتێك ڕەنگ کردبێت و هەمووشیان بازرگانبون و کەلوپەلەکانیان جۆرێك قوماشی ناسك بوو کەلە"بابل"دا دەیانفرۆشت و من

لە"بابل"یەکانم بیستووە، کە دەیانوت ئەو پارچە قوماشە ناسەکە نەلە خوری مەڕ و نە لەڕیشکی"شاهدانە"[41]دروست دەکرێت، بەڵکو جۆرێك کرمی تایبەت ئەم پارچەیە دروست دەکات و من زۆر سەرم لەو قسەیەیان سوڕما، چونکە تا ئەو ڕۆژە نەمبیستبوو کە کرمی قوماش چنیش هەبێت.

"بابل"یەکان میللەتێکی بازرگانین و هەموویان خۆیان بەبازرگانیەوە سەقاڵ کردووە، بگرە خوداکانیشیان سەرقاڵی بازرگانین.

ئەمانە زۆر ڕقیان لەجەنگە، لەبەرئەوەی جەنگەکان ڕێگای بازرگانی دەبڕن و کاروانی هەڵگری کاڵاکان دەگەڕێننەوە.

"بابل"یەکان دەڵێن دەبێت بەردەوام هەموو ڕێگاکان بۆ بازرگانی بەڕوی هەموو جیهاندا بکرێنەوە و لەهەموو شوێنێکەوە ئازادانە بێن و لەوێوە بڕۆن بۆ هەموو شوێنێك.

بەڵام بۆ بەرگری کردن لە"بابل"سەربازگەلێکی بەکرێگیراویان بەکرێ گرتووە، ئەم سەربازانە بەسەر منارە و دیواری چواردەوری "بابل"دا پاسەوانی خۆیان دەکەن.

دیمەنی شێوازی پۆشتنی سەربازی ئەم هێزانە خودەیەکی زێڕ و زیوی سەیریان هەیە.

من لەسەرەتادا وام دەزانی ئەم خودەیەی ئەوان یەك پارچە زێڕ و زیوە، بەڵام لەدواییدا بۆم ئاشکرا بوو کە خودەکانیان لە"مەفرەغ"دروست دەکەن و بەسەریدا ڕوپۆشێکی زێڕ یان زیو دەکێشن.

سەربازەکان دەسکی شمشێرەکانیان لە ئاڵتون دروست دەکەن، بۆئەوەی نیشانی بدەن کە دەوڵەمەندن.

گالیسکەیەکی جەنگی جوانیشیان هەیە کە من هاوشێوەی ئەم گالیسکانەم لەوڵاتانی تردا بگرە لەمیسریشدا نەبینیوە، و "بابل"یەکانیش پێیان وتم: کابرای میسری ئایا لەهیچ شوێنێکدا گالیسکەیەکت بەو جوانیە بینیوە؟ منیش لەوەڵامدا پێم دەوتن: نەخێر؟

---

[41] شاهدانە:گیایەکی یەك ساڵەیە لەشێوەی گیای"گەزنە"کە بەرزاییەکەی دەگاتە دوو مەتر. گەڵاکەی درێژە و تۆوەکەشی بەئەندازەی فستقێك دەبێت کە چەور و بۆنێکی ناخۆشی هەیە. لەو تۆوەشی ڕۆنێکی لێ دەگرنەوە کە بۆ ئامادە کردنی سابۆن سودی لێ وەردەگرن.. وەرگێڕ سەرچاوە "فەرهەنگی عەمید".

پادشای"بابل" کوڕێکی لاوە کە هێشتا ڕیش و سمێڵی دەرنەکردووە و هەر لەبەرئەوەش کاتێك دەستی بەفەرمانڕەوایی خۆی کرد، ڕیشێکی دەستکردی بەپەتێك بەچەناکەیەوە دەبەست، بۆئەوەی نیشانی بدات پیاوێکی باڵخە و کاتێك چومە ناو "بابل" بیستم کە حەزیان لەنوکتە و داستانی پێکەناویە.

لەوڵاتی میسردا، قوتابخانەی پزیشکی ماڵی ژیانە و ئەو ڕێکخراوە هەڵگری نێوەندێکی زانستیە.

بەڵام لە"بابل"دا نێوەندی زانستی شار منارەی بەرزی"مردوك"ە و تەواوی پزیشکە مەزن و ئەستێرەناسانی پلەوپایە بەرز لەوێن و من بەزوویی پەیوەندیم بەهەندێك ئەستێرەناس و پزیشکانی ئەو منارەیەوە کرد و ئەوەم بۆ ئاشکرابوو کە لە"بابل"دا ئەوەندەی گرنگی بە ئەستێرەناسی دەدرێت، بەو ڕادەیە گرنگی بەزانستی پزیشکی نادەن.

بۆیە لە"بابل"دا زانستی پزیشکی تیۆری بوو نەك کرداری و من دوای ئەوەی چومە ناو منارەی"مردوك" بینیم کە پزیشکەکان لەبارەی چارەسەرکردنی نەخۆشەکان گفتوگۆ لەگەڵ یەکتریدا دەکەن، بێئەوەی لەسەر لاشەی کەسە نەخۆشەکان زانستی پزیشکی خۆیان کرداری بکەن، لەکاتێکدا لە"ماڵی ژیان"دا لەتکردنی جەستەی مرۆڤ گرنگیەکی زۆری پێدەدرا و پزیشك تا ئەوکاتەی بەدەستی خۆی لاشەی مردووەکان لەت نەکات، زانستە پزیشکیەکانی بەدەست ناهێنێت.

من دەمویست لەمبارەیەوە گفتوگۆ لەگەڵ پزیشکانی ئەم"منارەیە"بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی تاز چوبومە ناو شاری"بابل"ەوە، بیرم لەوە کردەوە کە دەبمە مایەی ئازاری ئەمانە و وا لێکی دەدەنەوە کە من دەمەوێت خۆم بەسەریاندا بسەپێنم، یان هاتوم بۆ لایان بۆئەوەی سوکایەتیان پێ بکەم.

*بەشی چواردەیەم*

## چاوپێکەوتن لەگەڵ پادشای"بابل"دا

کاتێك لەوڵاتی"میتانی"بوم نابانگی من گەشتبووە"بابل"و لەوێش گەشتە گوێی پادشای"بابل"و دوای ئەوەی من لە میوانخانەی"بابل"دا نیشتەجێ بوم و گفتوگۆم لەگەڵ پزیشك و پسپۆڕانی منارەی"مردوك"کرد، ڕۆژێکیان لەلایەن پادشای"بابل"ەوە پیاوێك هات بەدوامدا و وتی پادشای دەیەوێت چاوی پێت بکەوێت.

"کاپتا"بەندەکەم کاتێك ئەمەی بیست کە لەلایەن فەرمانڕەوای بابلەوە بانگێشت کراوم ترسا و وتی: نەڕۆیت....چونکە ڕۆشتن بۆ لای فەرمانڕەوایەك هەڕەشەئامێزە.

پرسیم: بۆچی؟

"کاپتا"وتی: ئەم فەرمانڕەوایە جیاوازە لە فیرعەون و ئێمە نایناسین و نازانین خودای ئەو بەچ شێوەیەك بیر دەکاتەوە و چی پێ دەڵێت، لەوانەیە دوای ئەوەی چاوی پێت کەوت، بەکوشتت بدات.

وتم:"کاپتا"من پیاوێکی پزیشکم و کارێکم نەکردووە کە شایستەی مەرگ بم و فەرمانڕەوای "بابل"بەکوشتم بدات.

"کاپتا"وتی: ئەگەر دەتەوێت بڕۆیت بۆ لای منیش لەگەڵ خۆتدا ببە، بۆئەوەی ئەگەر بەکوشت درایت منیش لەگەڵتدا بکوژرێم، چونکە دوای کوشتنی تۆ ژیان بۆ پیاوێکی وەك من کە بەندەیەکی پیرم شایستەی بەردەوام بونی نیە و من پێش تۆ شایستەی ئەوەم بمرم، چیتر ئەگەر دەتەوێت بڕۆیت بۆ لای پادشا بڕۆ و پێیان بڵێ کە کەژاوەیەکت بۆ بهێنن، بۆئەوەی بەڕێزەوە بڕۆیت بۆ بارەگاکەی، چونکە پزیشکی خەڵکی میسر کە خوێندنی لە"ماڵی ژیان"دا تەواو کردووە، پیاوێکی مەزنە و

شایستەی ئەوەیە بەڕێزەوە پێشوازی لیٚ بکەن و سێیەمیش ئەمڕۆ مەڕۆ بۆ لای فەرمانڕەوا.

پرسیم: بۆچی ئەمڕۆ نەڕۆم بۆ لای؟

"کاپتا"وتی:لەبەرئەوەی ئەمڕۆ پشوی تەواوی بازرگانیخانە و فرۆشگا و کرێکارانی"بابل"ە، چونکە ئەستێرەناسەکان دەڵێن کە ئەمڕۆ کارکردن و لەماڵ چونە دەر بەدبەختیان بۆ دەهێنێت، چونکە ئەمڕۆ حەوتەمین ڕۆژە.

منیش بەسەرسوڕمانەوە پرسیم: هەفتە چیە؟

بەندەکەم وتی:کاتێك ڕۆشتیت بۆ منارەی"مردوك"بۆئەوەی گفتوگۆ لەگەڵ پزیشکانی ئەوێدا بکەیت، بەپێی قسەی خزمەتکارانی میوانخانەکە تێگەشتم کە لێرەدا مانگێکیان کردووە بەچوار بەشەوە و هەر بەشێکی بەهەفتەیەك بانگ دەکەن و هەر هەفتەیەکیش لەحەوت ڕۆژ پێك دێت و شەش ڕۆژی ئەو هەفتەیە خۆیان بەکارکردنەوە سەرقاڵ دەکەن و ڕۆژی هەفتەمیشی دەست لەکارکردن دەکێشنەوە، چونکە ئەستێرەناسەکان کە پەیوەستن بە ئەستێرە و خوداکانەوە، خوداکان پێیان ڕاگەیاندون کە کارکردن لەڕۆژی حەوتەمدا بەدبەختیان بۆ دەهێنێت و نابێت لەو ڕۆژەدا لەماڵ بڕۆنە دەرەوە و بێن بۆ بازاڕ، هەروەها نابێت دۆست و خزمانیشیان لەماڵەکانی خۆیاندا ببینن.

منیش دوای ماوەیەك بیرکردنەوە بە"کاپتا"م وت: تۆ ڕاست دەکەیت و لەبەرئەوەی لێرەدا کارکردن و لەماڵ دەرچون لەڕۆژی هەوتەمدا بەهەڕەشە ئامێزی دەزانن، ئێمەش کە بیانین دەبێت ڕەچاوی نەریتەکانی ئەوان بکەین، چونکە لەوانەیە خوداکانی "بابل" لەبەر هۆکار و بەرژەوەندیەك ئەم ڕۆژەیان بۆ کارکردن بەزیانبەخش دەزانن و ئێمە ئەگەر لەم ڕۆژەدا بڕۆین بۆ لای فەرمانڕەوا دوچاری گرفتێك ببین.

ئەوەبوو بەنێردراوی فەرمانڕەوام وت: من سەیرم لەوە دێت کە تۆ بەچ شێوەیەك ئەمڕۆ، کە ڕۆژی حەوتەمە، من بانگێشتی لای فەرماڕەوا دەکەیت، لەکاتێکدا دەزانی کە ئەمڕۆ ڕۆژی کارکردن نیە.

برۆ و بەفەرمانڕەوا بڵێ کە سبەی خۆم دێم بۆ لای، بەمەرجێك کەژاوەیەکم بۆ بنێرێت، بۆئەوەی بەسواری ئەو کەژاوەیە بڕۆم بۆلای، چونکە من پیاوێکی ئەوەندەش بچوك نیم و شایستەی ئەوەم کە بەڕێزەوە پێشوازیم لیٚ بکرێت.

ئەو پیاوە ڕۆشت و ڕۆژی دوایی گەڕایەوە و بینیم کەژاوەیەکی بچوك، لەو جۆرە کەژاوانەی کە سەوداگەرەکان بۆ خستنە ڕوی کاڵاکانیان تا بەردەم بارەگای فەرمانڕەوا سواری دەبن ، لەگەڵ خۆیدا هێناوە.

"کاپتا"کاتێك ئەوەی بینی بەتوڕەییەوە وتی: من داوا لەخودای"مەردوك"دەکەم بەقامچیەکەی خۆی کە لە دوپشکی مەزن دروست کراوە تەمێی ئێوە بکات...ئێوە چۆن نەتازانیوە کە خاوەنەکەی من پیاوێك نیە کە سواری ئەم جۆرە کەژاوانە ببێت، زۆر زوو ئەمە ببەنەوە و چاوم بەناوچاوتان نەکەوێت.

ئەو بەندەانەی کە کەژاوەکەیان هێنابوو و دەیانویست منی پێ ببەن، زۆر سەیریان لەم قسانە هات و بەهۆی ئەم قسانەوە کۆمەڵێك خەڵك لەبەردەم میوانخانەکەدا کۆبونەوەو بەدەم پێکەنینەوە بە"کاپتا"یان وت ئێمە دەمانەوێت چاومان بە خاوەنەکەت بکەوێت، بەچ شێوەیەك ئەم کەژاوەیە بچوکە بۆ ئەو.

"کاپتا"کەژاوەیەکی لەخاوەنی میوانخانەکە کە چل بەندە لەسەرشانیان هەڵیان دەگرن بەکرێ گرت، بۆئەوەی پێی بڕوین بۆ بارەگای فەرمانڕەوای"بابل"و منیش لەو کاتەدا لەمیوانخانەکە هاتمە خوار.

کاتێك خەڵکی منیان بەجلوبەرگی میسری و ملیوانکەیەکی زێڕەوە بینی بێدەنگ بون و چیتر نەیانتوانی بەزمانی گاڵتەئامێزەوە ڕوی تێبکەن، چونکە زانیان پیاوی بیانی لەوڵاتی خۆیدا کەسێکی بەوشێوەیەش کەم نیە، کە دەیەوێت بڕوات بۆ کۆشکی پادشای"بابل".

یەکێك لەوبەندانی میوانخانەش لەدوای کەژاوەکەوە کەرەستەی پزیشکی منی لەجانتایەکی تایبەتدا هەڵگرتبوو و"کاپتا"بەندەکەی منیش، لەپێش کەژاوەکەوە سواری وڵاخێك بووبوو.

ئێمە بەم حاڵەوە گەشتینە کۆشکی فەرمانڕەوایی و کۆمەڵێك لەدانیشتوانی شاریش تا نزیك کۆشك دوامان کەوتبون.

لەوێ من لەکەژاوەکە دابەزیم و لەبەردەم کۆشکەکەدا کۆمەڵێك پاسەوان، قەڵخانی سپی و زەردی خۆیان بەیەکەوە چەسپاندبوو و بەجۆرێك بەقەڵخانەکانیان شێوە دیوارێکیان دروست کردبوو و کاتێك منیان بینی قەڵخانەکانیان لەیەکتر جیا کردەوە و من بەنێویاندا چومە ناو کۆشکەکەوە.

پیاوێکی پیر کەڕوخساری پاك و تاشراوی نیشانی دەدا کە یەکێکە لەزاناکانی ئەو وڵاتە و گوارەیەکی زردی لەگوێ کردبوو و کوڵمەکانیشی چرچ و لۆچی تێکەوتبوو لێم نزیك بویەوە و وتی: من ئاگاداری ئەو دەنگ و هەراو هوریایە بووم کە لەنێو شاردا دروستت کردووە و خاوەنی چوار وڵات-مەبەستی پادشای"بابل"ە- دەپرسێت ئەو پیاوە کێیە کە هەرکاتێك خۆی ئارەزوی لێ بێت دێت بۆ لام و کاتێکیش من بانگی دەکەم سەرپێچی لەداواکەم دەکات.

منیش لەوەڵامدا وتم: ئەی پیاوی پیر، تۆ کێیت کە بەوشێوەیە قسەم لەگەڵدا دەکەیت؟

ئەویش وتی:منیش پزیشکی تایبەتی خاوەنی چوار وڵاتم و لەناو"بابل"یشدا خاوەنی ناوبانگ و ڕێزم، بەڵام تۆ کێیت کە بە تەماعی زێڕ و زیو بەم هەموو دەنگە دەنگەوە هاتویت بۆ ئێرە و کاتێك خاوەنی چوار وڵات داوای هاتنی تۆ دەکات بانگێشتەکەی ڕەت دەکەیتەوە، من هێشتا بەتەواوی تۆ ناناسم، بەڵام ئەوەش بزانە ئەگەر فەرمانڕەوای"بابل"زێڕ و زیوت پێ بدات، دەبێت نیوەی ئەو زێڕ و زیوەم پێبدەیت، ئەگینا ناهێڵم لێرە کاری پزیشکی خۆت ئەنجام بدەیت.

وتم:هەی پیرەمێرد، من هیچ کاتێك دەربارەی زێڕ و زیو لەگەڵ کەسانێك کە پرسیار دەکەن و داوای کانزام لێدەکەن قسە ناکەم. ئەم کارە لەئەستۆی بەندەکەمدایە و ئەو ئەم جۆرە کارانەم بۆ جێبەجێ دەکات، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ دەڵێیت من پزیشکم و کەسێکی بەتەمەنیشی، من هاوڕێیەتیت لە دژمنایەتیت بەباشتر دەزانم و حەز دەکەم لەگەڵ تۆدا ببمە هاوڕێ و دەبێت ئەوەش بزانی کە من بۆ بەدەست هێنانی زێڕ و زیو نەهاتوم بۆ "بابل"، بەڵکو تەنها بۆ کۆکردنەوەی زانیاری لەبواری پیشەکەی خۆمدا هاتوم بۆ ئێرە، دوای ئەوە هەردوو بازنەی دەستم کە لەزێڕ دروست کراوە، دەبەخشم بەتۆ.

دوای ئەم قسەیە هەردوو بازنەکەم لەمەچەکم دەرهێنا و دام بەو، بەهۆی ئەم ڕەفتارەی من بەشێوەیەك خۆشحاڵ و سەرسوڕماو بوبو کە چیتر دوای ئەوە هیچ شتێکی نەوت و ڕازی بوو کە بەندەکەم"کاپتا"ش لەگەڵ مندا بڕواتە لای فەرمانڕەوا.

پادشای"بابل" کە بەناوی"بورابوریاش"بانگ دەکرێت کاتێك ڕۆشتم بۆ لای، وام دەزانی منداڵە، چونکە پێیان وتبوم کاتێك گەشتە پلەی فەرمانڕەوایەتی هێشتا

سمێڵ و ڕیشی لێ دەرنەهاتبوو و ڕیشێکی دەستکردی بەڕوخساری خۆیەوە دەچەسپاند. بەڵام بینیم کەسێکی لاوە و ئەوەم بۆ ئاشکرا بوو، ئەو کەسانەی زانیاری ئەمیان پێدابوم لەڕابردوودا چاویان پێ کەوتووە، هەر بەوشێوەی لەنێو کەسانی نەخوێندەوار و نەزاندا باوە، تێپەڕبونی کات لەکاتی گێڕانەوەدا فەرامۆش دەکەن و ئەوە ناهێننەوە یاد خۆیان کە هەموو منداڵێك گەورە دەبێت و دەگاتە قۆناخی هەرزەکاری و لاویەتی.

لەپاڵ"بورابوریاش"دا شێرێکی بچوك هەبوو کاتێك چاوی بەئێمە کەوت نەڕاندی.

ئەو پیرەمێردەی کە دەیوت پزیشکی فەرمانڕەوایە، کاتێك چووە ژورەوە کڕنوشێکی بۆ برد و"کاپتا"بەندەکەی منیش لاسایی ئەو کابرایەی کردەوە، بەڵام بۆ جارێکی تر شێرەکەی نەڕاندی و بەندەکەم بەشێوەیەك ترسا کە لەجێی خۆی هەستایە سەرپێ و هاواری کرد.

بەڕاپەڕین و هاوارەکەی فەرمانڕەوای هێنایە پێکەنین و ...."کاپتا"ش وتی: ئەم گیانەوەرە تورەیە لێرە ببەرە دەرەوە، چونکە من لەهەموو تەمەنمدا گیانەوەرێکی لەوە ترسناکترم نەبینیوە و دەنگی ئەم گیانەوەرە لەدەنگی گالیسکە جەنگیەکانی سەربازی"تبس"دەچێت کاتێك دوای ئاوابونی خۆر دەگەڕێنەوە ناو سەربازخانەکەیان.

"کاپتا"ئەم وشانەی بەزمانی"بابلی"هێنایە زمان و فەرمانڕەواش بەشێوەیەك پێدەکەنی کە فرمێسك لەچاوانی دەتکانە خوارەوە.

لەدواییدا ئەوەی هێنایەوە یاد خۆی کە منی بۆ چارەسەرکردنی نەخۆشیەکەی بانگێشتی ئێرەی کردوم و دەستی خستە سەر ڕوخساری و هاواری کرد و بینیم کە لە ڕوخساریدا ئاوسانێکی مەزن دەرکەوتووە و بەهۆی گەورەیی ئەو ئاوسانەوە چاوێکی بەباشی نابینرێت.

ئەو پیرەمێردەی کە دوو بازنەکەی لێ وەرگرتبوم، بەفەرمانڕەوای وت:ئەمە هەمان ئەو پزیشکە خۆپەسەندە میسریەیە کە تۆ دوێنێ بانگێشت کرد و نەهات و وتی ئەمڕۆ دێت، بۆیە باشتر وایە هەرئێستا بەسەربازەکانی خۆت بڵێی بەنێزەکانیان ورگی کون کون بکەن.

فەرمانڕەواش وتی:من ئێستا نایکوژم، لەبەرئەوەی بانگێشتی ئێرەم کردووە بۆئەوەی ئەم ئازارەم لەناو ببات و چەند شەوێکە نەمتوانیوە بخەوم و لەم ماوەیەدا جگە لەخواردنە شلەمەنیەکان هیچ شتێکی ترم نەخواردووە.

پیرەمێردیش وەك ئەو کەسەی کە دەستی بەگریان کردبێت وتی: ئەی خاوەنی چوار وڵات، ئێمە لەم چەند ڕۆژەدا لە پەرستگای"مردوك"دا قوربانیمان بۆ دایت و پۆشاکی سورمان لەبەر کرد و تەپڵمان لێدا و سەمامان کرد، بۆئەوەی ئەو ئازارەی کە لەدەمی تۆدا جێگیر بووە لەجێی خۆی دەربکەین.

بەڵام تۆ ڕێت پێنەدایین ئێمە دەست لەدەمی تۆوە بدەین، ئەگەر ڕێت پێبدایەین دەمانتوانی چارەسەرت بکەین و لەوباوەڕەدا نیم ئەم پیاوە بیانیە بتوانێت چارەسەرت بکات.

فەرمانڕەواش ڕوی لەمن کرد و وتی: تۆ کێیت و ئایا دەتوانی بزانی کە ئەم ئازارەی من لەچییەوە دروست بووە؟

وتم: من"سینۆهە"م پزیشکی میسریم و بەکوڕی کەر ناسراوم، لەبەرئەوەی تا ئێستا چاوم بەدەمت نەکەوتووە، ناتوانم بڵێم کەئازارەکەی لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە یەکێك لەددانەکانی هاروت کێم و برینی تێدایە و ئەم برین و کێمەش لەبنی ددانەکانتدا جێگیر بووە و ئەم ئاوسانەی بۆ دروست کردویت و ئاوسانی ڕوخساریشت هەر لەوەوە سەرچاوەی گرتووە.

هۆکاری دروست بونی ئەم کێم و برینە ئەوەیە کە تۆ ددانەکانی خۆت لەکاتی خۆیدا پاك ناکەیتەوە و کاتێك ڕیشکی ددانەکانیش بەتەواوی دەگەنێت، هەڵت نەکێشاوە، چونکە کاتێك ڕیشکی ددان دەگەنێت، دەبێت هەڵیکێشیت.

فەرمانڕوا وتی: من دەمزانی کاتێك ڕیشکی ددانەکان دەگەنن دەبێت هەڵبکێشرێت، بەڵام کێشانی ددان ئەوەندە ئازاربەخشە کە ناتوانرێت بەرگەی بگیرێت.

وتم: ئازاری کێشانی ددان لەمیسردا ئەوەندەش ئازار بەخش نیە، ئەگەر تۆ بتەوێت من ئەو ددانەت بەبێ هیچ ئازارێك دەکێشم، بەڵام ئەمرۆ ناتوانم ئەم کارە بکەم، لەبەرئەوەی ددانەکەت ئاوساوە و سەرەتا دەبێت ئەم ئاوسانە لەناو ببەین و

هەموو کێم و برینێکی نێو ددانەکانت پاك بکەینەوە، دوای ئەوە دوای چەند ڕۆژێك، دەست بەکێشانی دەکەین.

فەرمانڕەواش پرسی: ئایا دەتوانی برینی بنی ددانم دەربهێنین و پاکی بکەیتەوە؟

وتم: بەڵێ، من بۆ دەرکردنی برین و کێمی ناو دەمت، ناچارم ئاوسانی دەمت بەچەقۆ لەت بکەم، سەرەڕای ئەوەش بەپێی شێوازی"تبس"کاردەکەم بۆئەوەی زۆر ئازارت پێ نەگات، بەڵات سەرەڕای ئەوەش پێت دەڵێم کە لەتکردنی ئەو ئاوسانە، بۆ دەرهێنانی برین و کێمەکەی بەڕادەیەکی کەم ئازارت پێ دەگەیەنێت، چونکە خودی خوداکان ئازارەکانیان هێناوەتە بون و بگرە فەرمانڕەوایانیش لەم ئازارە یەزدانیانە جیا ناکرێنەوە و ئەوانیش وەك کەسە ئاساییەکان دوچاری ئازارەکان دەبن.

من بە"کاپتا"م وت:یەکسرە ئاگرێك ئامادە بکات بۆئەوەی من چەقۆکان لەناو ئاگردا پاك بکەمەوە، لەکاتێکا ئەو خەریکی ئامادەکردنی ئاگرەکە بوو، بڕێك شەراب لەگەڵ کەمێك تلیاکم دەرخواردی فەرمانڕەوای"بابل" دا.

کاتێك ئەو شەرابەکەی خواردەوە و ماوەیەکی بەسەردا تێپەڕی وتی: واهەست دەکەم چیتر پێویستم بەتۆ نەبێت، چونکە ئێستا هەست بەهیچ ئازارێك ناکەم.

وتم: ئەم هێوریە کاتیە و دوای ماوەیەکی تر دوبارە ئازارەکانت سەر هەڵدەدەنەوە.

ئەویش وتی: تۆ دەبێت هەندێکی تر لەو دەرمانەم پێ بدەیت بۆ ئەوەی ئەم ئازارەم بەتەواوی لەناو بچێت.

وتم: ئەو دەرمانەی من ئاوێتەی ئەم شەرابەی دەکەم و دەرخواردی تۆی دەدەم، تەنها بۆ یەك جار بێزیان دەتوانیت سودی لێ وەرگریت، ئەگەر بۆ جاری سێیەم و چوارەم، سودی لێ وەرگریت خوی پێوە دەگریت و هۆگری دەبیت، ئەوکات تۆ بۆ زیندوو مانەوەت پێویستت بەم دەرمانە دەبێت، بێئەوەی بتوانێت ئەم ئازارەت بۆ هەمیشە لەناو ببات.

کەواتە بهێڵە ئێستا کە هەست بەئازار ناکەیت، من ئاوسانی بن ددانت شەقار بکەم و برین و کێمەکەی دەربهێنم.

فەرمانڕەوای"بابل"ڕازی بو بەوەی ئەو نەشتەرگەریە بچوکەی بۆ ئەنجام بدەم و منیش دوای ئەوەی چەقۆکانم لەناو ئاگردا پاك کردەوە و ساردم کردەوە، لێی نزیك بومەوە و سەریم خستە باوەشمەوە و دەمیم کردەوە، سەرەڕای ئەوەی بەخواردنی

کەمێك تلیاك کەمێك لەئازارەکانی کەم کردبووەوە، بەڵام دوای ئەوەی ئاوسانی ناو دەمیم هەڵدڕی، لەئازاردا هاواری کرد و شێرەکەی ڕاپەڕی و نەڕاندی بەڵام پەلاماری نەدا.

دوای ئەوە پادشای بابل چیتر هاواری نەکرد، چونکە ئازارەکانی لەناو چوبو و دەرکردنی کێم و برینی ناو دەمی، ڕێی ئەوەی لێگرتبوو کە قسە بکات.

کاتێك برین و کێمی ناو دەمیم هێنایە دەرەوە، وتی: هەی پزیشکی میسری تۆ پیاوێکی گرانبەهایت، لەبەرئەوەی ئێستا هەست بەهیچ ئازارێك ناکەم.

پزیشکی پیریش کە لەوێ ئامادە بوو وتی: ئەگەر ڕێت پێبدایەم ئاوسانی ناو دەمت لەت بکەم، وەك ئەم پیاوە میسریە دەمتوانی برین و کێمی ناو ئاوسانەکە دەربهێنم و هەموو ئازارەکانت لەکۆڵ بکەمەوە.

منیش وتم: ئەو پیاوە ڕاست دەکات، ئەگەر فەرمانڕەوای ڕازی بوایە ئەو پیاوە ئاوسانی ناو دەمی لەت بکات، هەمان ئەم دەرئەنجامەی بەدەست دەهێنا، بەڵام ئەم پیاوە بەتەمەنە نەیوێرا پێداگری لەسەر ئەنجامدانی ئەو کارە بکات و ئەم ئاوسانەی ناو دەمت لەت بکات، چونکە دەترسا ببێتە مایەی توڕەیی تۆ.

لەم کاتێکدا پزیشك دەبێت کەسێکی بوێر و ئازا بێت و پێداگری لەسەر کارەکانی خۆی بکات و لەترسی کەسی نەخۆش نابێت بتۆقێت ئیتر ئەو نەخۆشە پادشاش بێت یان نە، من لە"تیس"دا هەرگیز لەهیچ نەخۆشێك نەترساوم.

پادشای"بابل"کە بەتەواوی لەهەموو ئازارێك ڕزگاری بوبو وتی: "سینۆهە" سەرەڕای ئەوەی تۆ پیاوێکی بوێری و بێ هیچ ترسێك قسەی خۆت دەکەیت، من چاوپۆشی لەم بێشەرمیەت دەکەم، چونکە تۆ پیاوێکی شایستەی.

لیرەدا نابێت هیچ کەسێك فەرمانڕەوا لەحاڵی هاوارکردن و ئازار کێشاندا ببینێت، بەڵام بەندەکەت منی لەحاڵی هاوارکردندا بینی، بەڵام من چاوپۆشی لەم حاڵەتەش دەکەم.

لەبەرئەوەی بەندەکەت منی هێنایە پێکەنین و بوبە مایەی خۆشحاڵی من، دوای ئەوە ڕوی کردە"کاپتا"و وتی: جارێکی تر هەستەرە سەر پێ و من بهێنەرە پێکەنین.

"کاپتا" وتی: من ئەم کارە ناکەم، چونکە ئەمە پێچەوانەی شەرف و کەسایەتی تەمەن پیری منە.

فەرمانڕواش وتی: من ئێستا کارێك دەکەم کە تۆ شەرف و کاسایەتی بەتەمەنی خۆت فەرامۆش بکەیت.

فەرمانڕەوا هێمایەکی بۆ شێرەکەی خۆی کرد و شێریش هەستایە سەر پێ،لەو کاتەدا فەرمانڕەوا"کاپتا"ی پیشانی شێرەکەی دا و گیانەوەریش سەرە گەورەکەی خۆی بەڕوی"کاپتا"دا وەرگەڕاند، ئەوکات بەهەنگاوێکی لەسەر خۆ بەرەوڕوی ڕۆشت.

هەرچی شێر لە"کاپتا"نزیکتر ببوایەتەوە، بەندەکەم بۆ دواوە پاشەکشەی دەکرد، تائەوەی گەشتە لای پایەیەکی ئەو کۆشکە و لەمکاتەدا شێر دەمی کردەوە و نەڕاندی‌و "کاپتا"ش لەترساندا باوەشی بە پایەکەدا کرد و وەك ئەو مەیمونەی کەلەمیسردا بەسەر درەختەکاندا سەردەکەون زۆر بەخێرایی بەسەر پایەکەدا سەرکەوت.

فەرمانڕەوا بەشێوەیەك پێدەکەنی کە بەلای ڕاست و چەپ و پێش و دوادا دەکەوت‌و کاتێك تێری خوارد لەپێکەنین، وتی: بریسمە خواردنم بۆ بهێنن.

پزیشکی بەتەمەنیش بەو قسەیە زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە ئارەزوی خواردنی فەرمانڕەوا ئەوەی دەسەلماند کە حاڵی چاك بووەتەوە و ئێستا بەتەواوی تەندروستەو تامەزرۆیی خواردنی بۆ گەڕاوەتەوە و دوای چەند ساتێك خواردنیان بۆ هێنا.

کاتێك فەرمانڕەوا سەرقاڵی نان خواردن بوو، چیتر گوێی بەبەندەکەم نەدەدا و شێریش لەبینی ئەو پایەدا هەستا و گەڕایەوە بۆ لای فەرمانڕەوا و بەندەکەشم دوای ئەوە توانی لەو پایەوە پێ بنێتە سەر زەوی ئەو کۆشکە.

منیش بەفەرمانڕەوام وت: ئێستا ئازاری ددانت، لەناو چووە، بەڵام لەبەرئەوەی ددانەکەت خراپ بووە، دوبارە دوچاری ئازار دەبیت و هیچ ڕێگە چارەیەکی ترت بەدەستەوە نیە جگە لەوەی ئەو ددانە خراپەت بکێشین و لەوباوەڕەدام کە تۆ حەزت لەخواردنی شیرینیە و خواردنی شیرینیش ئەم ددانەتی خراپ تر کردووە، چونکە لێرەدا شیرینی بە شیلەی خورما دروست دەکەن و ئەم شیلەیەش زیان بە ددان دەگەیەنێت، بەڵام لەمیسردا، شیرینی بەشەکرێك دروست دەکرێت کە جۆرێك مێرولە دەیهێنێتە بون و هەمان ئەو شەکرەش زیان بە ددان دەگەیەنێت.

فەرمانڕەوا وتی: مەگەر مێرولەکان دەتوانن شەکر دروست بکەن؟

وتم: بەڵێ جۆرێك مێروله لەمیسردا هەیە کە لەشێوەی ئەو زەردەواڵانەیە کە لەم وڵاتەدا بەخورماکانەوە دەنیشنەوە و دەیخون، بەڵام کەمێك لەو زەردەواڵانەش بچوکترەو ئەم جۆرە مێرولەیە، شەکرێکی شیرین دروست دەکات کە ئەویش زیان بەددان دەگەیەنێت و بۆ بەهێزکردنی جەستە زۆر پێویستە.

فەرمانڕەوا وتی:تۆ خۆشباوەڕی ئێمەت قۆستووەتەوە و درۆمان لەگەڵدا دەکەیت، چونکە ئەو جۆرە زەردەواڵەیە ناتوانێت شەکر دروست بکات.

وتم: پیاوێکی ڕاستگۆ، هەمیشە دوچاری گرفت دەبێت، چونکە ئەگەر ڕاستگۆ بێت، کەسانی تر باوەڕی پێناکەن و هەروەك چۆن ئێستا باوەڕ بەوە ناکەیت کە لەمیسردا ئەو جۆرە زەردەواڵانە شەکر دروست دەکەن، ئەگەر من بەمیسریەکان بڵێم کە لە"بابل"دا باڵندەیەك هەیە نافڕێت و بەردەوام لەگەڵ مرۆڤدا دەژیت، و هەموو ڕۆژێك هێلکەیەك بەئەندازەی هێلکەی تیمساحێکیان بۆ دەکات، هیچ کەسێك باوەڕ بەم قسەیەم ناکات، بەڵام ئەگەر بتوانم ئەم جۆرە باڵندانە لەگەڵ خۆمدا ببەم بۆ میسر، بۆئەوەی خەڵکی بەچاوی خۆیان بیبینن و بگەنە ئەو باوەڕەی کە درۆیان لەگەڵدا ناکەم.....

لەم کاتەدا فەرمانڕەوا وتی: ئێستا وەرە و لەگەڵ مندا نان بخۆ....

وتم: من بەیەك مەرج نانت لەگەڵدا دەخۆم، ئەو مەرجەشم ئەوەیە کە فەرمان بدەیت خواردن بدەن بەو بەندەانەی کە منیان لەمیوانخانەوە هێنا بۆ ئێرە، چونکە ئێستا ئەوانیش برسیانە.

فەرمانڕەوا فەرمانی دا خواردن بدەن بەو بەندەانەی کە منیان بەکەژاوەیەك هێنا بۆ ئێرە و شەراب و خورماشیان پێبدەن، چونکە لە"بابل"دا شەراب لەخۆرما دروست دەکەن.

*بەشی پانزەیەم*

## پێشبینی کردنی ڕوداوەکانی ئاینده

کاتێك ویستم لەکۆشکی فەرمانڕەوا بێمە دەرەوە، فەرمانڕەوا وتی: "سینۆهە" ئێمە جەژنێکمان لەپێشە و ئەو جەژنەش "پادشای درۆینە"یە و لەم ڕۆژەدا دەبێت بێت و تەماشای ئەم ئاهەنگەمان بکەیت، چونکە دڵنیام لە وڵاتی میسردا ئەم جۆرە جەژنە نیە.

وتم: زۆرباشە دێم.....

فەرمانڕەواش بەدەم پێکەنینەوە وتی: لەو ڕۆژەدا، بەندەکەت سەیری زۆر خۆش دەبێت.

پرسیم: بۆچی؟....

فەرمانڕەواش وتی: لەبەرئەوەی زۆرێك لەخەڵکی دەهێنێتە پێکەنین.

لەکاتی گەڕانەوەم بۆ میوانخانە، بەندەکانی ژێر کەژاوەکە تێر خواردن و شەرابیان خواردبوو و گۆرانیان دەوت و باسی چاکەی منیان بۆیەکتری دەکرد و خەڵکیش لەدوای ئەمانەوە ڕێیان دەکرد، حەزیان دەکرد وەك ئەوان گۆرانی بڵێن و باسی چاکەی من بکەن.

ئەم بابەتە بو بەهۆی ئەوەی ناوبانگیم لەناو"بابل"دا بڵاو ببێتەوە و خەڵکی دەیانوت "سینۆهە"پزیشکی میسر پیاوێکە کە بەندانی ژێر کەژاوەکەی تێر دەکات.

پێش ئەوەی جەژنی پادشای درۆینە-کە من لەوباوەڕەدا نیم چ لە "بابل"دا یان لەهەر وڵاتێکی تردا بونی هەبێت- دەست پێبکات(من باسی ئەم جەژنە دەکەم) چونکە بڕیاربوو ددانی پادشای بابل بکێشن"بورابوریاش" بانگی کردم و من پێش کێشانی

ددانەکەی بڕێك تلیاکم ڕۆکردە ناو خوێنبەرەکانیەوە و بەلایەنی کەم بێ هیچ ئازارێك ددانەکەیم کێشا و پزیشکانی بابل کە لەوێ ئامادە بون و وایان دەزانی فەرمانڕەوا بەبۆنەی ئازاری ددان کێشانەکەیەوە فەرمانی کوشتنم بۆ دەردەکات، زۆر سەیریان لێهات و لێیان پرسیم چیت کرد کە پادشا هەستی بەهیچ ئازارێك نەکرد؟

وتم: ئەو دەرمانەی کەمن ڕۆم کردە ناو خوێنبەرەکانیەوە، هەڵگری تایبەتمەندی لەناوبردنی ئازارە و یەکێکە لەدەرمانە پلە یەکەکانی میسر، ئەم دەرمانە لەپێستی گیایەك کۆدەکرێتەوە و ئەو جۆرە گیایەش تەنها کاهینە میسریەکان دەیچێنن و ئەرکی ئامادەکردنی ئەم دەرمانەش لەپێستی ئەو گیایە لەئەستۆی ئەواندایە و هەرگیز شێوازی کۆکردنەوە و ئامادەکردنی ئەم جۆرە دەرمانە فێری خەڵکانی ئاسایی ناکەن، چونکە ئەم دەرمانە هەموو جۆرە ئازارێك لەناو دەبات، ئەگەر بکەوێتە دەستی خەڵکیەوە، چیتر خەڵکی لەهیچ ئازارێك ناترسن و بەو هۆیەشەوە سیستەمی کۆمەڵگا هەڵدەوەشێت، چونکە چیتر هیچ کەسێك لەسزا و ئازارە جەستەییەکان ناترسێت.

فەرمانڕەوا وتی: من حەز دەکەم بڕێك لەو دەرمانەم هەبێت.

وتم: من بڕێك لەو دەرمانەت دەدەمێ، بەمەرجێك بێ لەو ڕێنماییەی من پێتی دەڵێم نابێت بەکاری بهێنی، چونکە بەپێچەوانەی ڕێنماییەکان بەکار بهێنرێت، وەك زەهر دەبێتە هۆی لەناو بردنت....

پادشاش پرسی: ئێستاش لەبەرئەوەی ددانەکەمت بێ هیچ ئازارێك هەڵکێشا، چ پاداشتێکت لەمن دەوێت؟

وتم: من پێویستم بە زێڕ و زیو نیە، چونکە دەتوانم بەهۆی ئەم زانستەمەوە زێڕ و زیو بەدەست بهێنم، بەڵام حەز دەکەم دەستەڵات و هێزی تۆ ببینم و بزانم لەشکری سەربازیت تا چ ڕادەیەکە، بۆئەوەی کاتێك گەڕامەوە بۆ میسر باسی چاکە و هێزی تۆ بکەم، ئەوکات هەموویان لەباسکردنی ئەو دەستەڵاتەی کە هەتە سەریان سوڕ دەمێنێ.

ئەوەی لێتی داوا دەکەم فەرمان بدەیت لەشکرەکەت بەشێوەیەکی سەربازی ڕێ بکەن، بۆئەوەی من چاوم بەسەرباز و کالیسکە جەنگیەکانت بکەوێت.

پادشاش داواکەی منی پەسەند کرد و منیش بەو هۆیەوە زۆر خۆشحاڵ بوم، چونکە دەمتوانی پەی بەهێزی سەربازی "پادشا" ببەم.

ڕۆژێك پێش ڕێکردنی سەربازی بە"کاپتا"م وت: سەرباز و گالیسکەکانی پادشام بۆ بژمێرە و بزانە لەشکری پادشا"بورابوریاش" لە چەند سەرباز و گالیسکەی جەنگی پێك دێت.

"کاپتا"ش وتی: من ئەو ژمارەیە لەکێوە بهێنم کە بەهۆیانەوە سەربازانی"بابل"یان پیێ بژمێرم، چونکە دەڵێن کە ژمارە سەربازانی"بابل"لەژمارەی خۆڵی بیابان زیاترە.

وتم: گەمژە پێویست بەوە ناکات کە دانە دانەی سەربازەکان بژمێری، چونکە هەردەستەیەك لەسەربازەکان لەدوای هێمایەکەوە ڕێ دەکەن، ئەگەر تەنها هێماکان بژمێری ژمارەی خودی سەربازەکان بەدەست دەهێنین.

لەڕۆژی ڕێکردنی سەربازیدا، پادشا ڕیشێکی دەستکردی بەچەناکەیەوە چەسپاندو بینیم تەنها ئەو سەربازانەی کە لەخودی"بابل"دا بون چەکیان بەدەستەوەیە و ئەوانەش کە لەولایەتەکانی ترەوە بۆ ئەم ڕێکردنە سەربازیە ئامادە بون، زۆربەیان نێزەیان نەبوو و کەموکورتی لەچاوی هەموویاندا بەدی دەکرا.

من شەست جار، تێپەڕبونی شەست سەرباز کە هەر یەکێکیان هەڵگری هێمایەك بون ژماردو تێگەشتم کە هەردەستەیەك لەو دەستە سەربازانە، شەست کەڕەت شەست سەربازە.

چونکە لە"بابل"دا ژمارەی شەست زۆر پیرۆزە، گروپە گالیسکەکانیش شەست کەڕەت شەست بون.

گالیسکەکانیان بە کانزایەکی سەیر و تازە بەناوی ئاسن دروست کردبوو و لەژێر هەر گالیسکەیەکەوە دوو نوکە ڕمی ئاسنینی مەزن دەرپەڕیبوو کە لەجەنگدا زۆر هەڕەشەئامێزە، بەڵام بینیم کە نوکی هەندێك لەڕمەکان ژەنگیان هێنابوو و چەرخی هەندێك لە گالیسکەکانیش لەکاتی ڕێکردنی سەربازیدا لەژێر گالیسکەکان دەردەچوو.

سەربازەکان بەڕیزی شەست کەسی ڕێیان دەکرد بۆئەوەی ئەم ڕێکردنە سەربازیە زووتر تەواو ببێت، هەر ڕیزە گالیسکەیەکیش لەپانزە گالیسکە پێك دەهاتن و بەدەستە دەستە ڕێیان دەکرد.

لەنێو سەربازانی پادشادا تەنها سەربازی پاسەوانە تایبەتەکان سەرنج ڕاکێش بون، بەڵام هەندێك لەوانیش ئەوەندە قەڵەو بون کە نەیاندەتوانی بەئاسانی ڕێ بکەن و ڕێکردنی هەمان ئەم سەربازانەش دەبووە هۆی ئەوەی تەماشا چیان پێبکەنن.

کاتێك شەو داهات، فەرمانڕەوا بانگی کردم و وتی:"سینۆهە" ئایا ئەمرۆ لەشکری سەربازی منت بینی....

وتم: بینینی ئەم لەشکەرەت ئەمرۆ چاوانی منی ڕەش کرد، چونکە سەربازەکانی تۆ لەلمی کەنار دەریا و ئەستێرەکانی ئاسمان زیاترن و من دوای بینینی ئەم لەشکرەت، تێگشەتم کە تۆ بەهێزترین پادشای سەرزەویت.

پادشای"بابل"یش وتی: "سینۆهە" پەسەند کردنی ئەم داواکاریەی تۆ، ئەرکێکی زۆری خستە سەرمن، چونکە من ئەم ڕێکردنە سەربازیەم ڕێکخستووە و دەبێت بۆماوەی چەند ڕۆژێك تا ئەو کاتەی سەربازەکان لێرەوە دەگەڕێنەوە بۆ شوێنی خۆیان، خواردنیان پێبدەم و بوجەی خواردنی ئەمانەش، بەئەندازەی بوجەی یەکساڵی میرنشینێك دەبێت.

لەم چەند ڕۆژەدا کە سەربازەکان لێرەدا دەمێننەوە، دەردیسەریەکی زۆر دێتەپێش، لەبەرئەوەی دەستدرێژی دەکەنە سەر ژنەکانی ئەم شارە و ناشتوانرێت ڕێیان لێ بگیرێت، دوای ئەوەی ڕۆشتیشن، بۆ ماوەی مانگێك شەقامەکان بەنائارامی دەمێننەوە، چونکە ئەم سەربازانە تا ئەو کاتەی بگەڕێنەوە میرنشینی خۆیان، لەڕێدا، هەرکەسێك ببینن ڕوتی دەکەنەوە.

بەڵام سەرەڕای ئەو هەموو شتەش من زۆر خۆشحاڵم کە توانیم لەشکری سەربازی خۆم پیشانی تۆ بدەم و تۆش هێز و توانای سەربازی منت ببینی. ئێستا پێم بڵێ ئایا فیرعەونی میسر کچی هەیە.

پرسیم: چ کارێکت بەکچی فیرعەونەوە هەیە؟

پادشای"بابل" وتی: من حەز دەکەم کچەکەی ببێت بەهاوسەرەم، گەرچی ئێستا چوارسەد ژنم هەیە، بەڵام هیچ یەك لەمانە نابنە کچی فەرمانڕەوای میسر و من زۆر حەز دەکەم هاوسەرێکم هەبێت کە کچی فیرعەونی میسر بێت!

وتم:"بورا بوریاش"ئاگات لەخۆت بێت لەو ڕۆژەوەی ئەم جیهانە دروست بووە، کچی فیرعەونی میسر، بەردەوام دەبێتە هاوسەری براکەی خۆی و ئەگەر براشی نەبێت، ئەوا بەهیچ شێوەیەك شوو ناکات، بەڵکو دەڕواتە پەرستگاوە و دەبێتە کاهینەیەك و ئەم قسەیەی کە تۆ کردت لەلای خوداکانی میسری کفرە، بەڵام من لەم قسەیەت دڵگران نابم، چونکە تۆ خودای میسر ناناسیت.

پادشای"بابل"وتی: من بڕیارم داوه تامی کچی فیرعەون بکەم و بزانم هاوخەوی لەگەڵ ئەودا چ چێژێکی هەیە و ئەگەر فیرعەون کچی خۆیم پێ نەدات، من ئەم لەشکرەی خۆم ڕەوانەی وڵاتەکەی دەکەم و میسری بۆ وێران دەکەم و بەزۆر دەست بەسەر کچەکەیدا دەگرم.

وتم: "بورابوریاش" فیرعەونی میسر، هێشتا زۆر لاوە و بەم تازەییانە ژنی هێناوە، و هێشتا کچی نەبووە و گریمان خوداکانی میسر پێدانی کچی فیرعەونیان بەبێگانە قەدەغە نەکردووە، ئەو هێشتا کچی نیە و ناتوانێت لەئێستادا کچی خۆیت پێ بدات، دان بەخۆتدا بگرە تا ئەو کاتەی دەبێتە خاوەنی کچێك و دوای ئەوە بیر لەسود وەرگرتنی کچی فیرعەون بکەرەوە.

فەرمانڕەواش وتی:"سینۆهە"من ئەمڕۆ، ماوەیەکی درێژخایەنە لەگۆڕەپاندا دانیشتوم و تەماشای ڕەوتی سەربازی سەربازەکانی خۆمم کردووە بۆیە ماندوو بووم، لەبەرئەوە حەز دەکەم بگەڕێمەوە بۆ شوێنەکەی خۆم و لەگەڵ ژناندا ڕابوێرم و تۆش کە پزیشکی دەتوانی بڕۆیت بۆ هەموو شوێنێك،بۆیە لەگەڵ مندا وەرە بۆئەوەی چاوت بەژنەکانی من بکەوێت و من یەکێك لەو ژنانە بەشێوەیەکی کاتی بەتۆ دەدەم بۆئەوەی لەگەڵیدا ڕابوێری، بەڵام ئاگادار بە سکی پڕ نەکەیت، چونکە گەر سکی پڕ بێت، لەدایك بونی ئەو منداڵە گرفتم بۆ دروست دەکات، لەبەرئەوەی هەموویان وا دەزانن کە ئەو لەمن سکی پڕ بووە.

وتم: "بورا بوریاش" قسەی وا مەکە، چونکە ئەوە پەسەند کراو نیە کە پیاوێك ژنی خۆی بەشێوەیەکی کاتی بدات بەکەسێکی تر بۆئەوەی لەگەڵیدا ڕابوێرێت.

"بورا بوریاش"وتی: بۆچی شایەنی پەسەند کردن نیە، ژنەکانی من ئەگەر بزانن کە من ئامادەم بەشێوەیەکی کاتی بیاندەم بەکەسانی تر بۆئەوەی لەگەڵیاندا ڕابوێرن، زۆریش خۆشحاڵ دەبن، چونکە من بەتەنهایی، ناتوانم لەگەڵ چوارسەد ژندا ڕابوێرم.

دوای ئەوە لێی پرسیم: تۆ چەند ژنت هەیە؟

وتم: من ژنم نیە.

"بورا بوریاش" بەسەرسوڕمانەوە پرسی: مەگەر تۆ سەڵتی؟

وتم: نەخێر.

پادشای بابلیش پرسی: ئەگەر سەڵت نیت بەچ شێوەیەك دەتوانی بیّ ژن بژیت، و خۆت سەرقاڵی بواری پزیشکی بکەیت، چونکە تا ئەوکاتەی پیاو لەگەڵ ژندا ڕانەبوێرێت، بیر و هەستی بەتەواوی کۆنابێتەوە و ناتوانێت خۆی بەکارێکەوە سەرقاڵ بکات. ئەگەر دەتەوێت لەژیاندا خۆشبەخت بیت، وەك من ژنگەلێك لەمیللەتە جۆراوجۆرەکان بهێنە، بۆئەوەی هەریەك لەم ژنانە، بەپێی نەریتی میللەتی خۆیان جۆرێك پەیوەندی سێکسیت لەگەڵدا ئەنجام بدن و تۆ هەرجارە و جۆرێك چێژیان لیّ وەردەگریت.

سەرەڕای ئەوەی من نەمویست بڕۆم بۆ ماڵی فەرمانڕەوا، بەڵام پادشای"بابل"منی لەگەڵ خۆیدا بردە ژورەوە و بینیم ژنەکانی لەمیللەتە جۆراوجۆرەکان پێك دێن و زۆر لاو و جوانن و هەریەك لەوانە پۆشاکی میللی خۆیانیان لەبەرکردووە.

هەندێك لەو ژنانە لەبەرئەوەی تازە لەوڵاتانی دورەدەستەوە لەڕێی فرۆشیارانی کۆیلەوە هێنرابون، ناتوانن بەزمانی"بابل"ی بدوێن، بەڵام هەموویان پێدەکەنین و هەریەك لەو ژنانە هەوڵی ئەوەیان دەدا سەرنجی پادشا بەلای خۆیاندا ڕاکێشن.

کاتێك بیستیان فەرمانڕوا دەیەوێت یەکێك لە ژنەکانی خۆی بەشێوەیەکی کاتی بەمن بدات بۆئەوەی لەگەڵیدا ڕابوێرم، ئەوکات هەریەك لەو ژنانە هەوڵی ئەوەیان دەدا سەرنجی من بەلای خۆیاندا ڕاکێشن.

فەرمانڕەواش پێی وتم:حەزت لەکامیان بۆخۆتی هەڵبژێرە، بەڵام من خوازیاری هەمویان بوم، لەبەرئەوە نەمدەتوانی تەنها یەکێکیان هەڵبژێرم، سەرەڕای ئەوەش لەتوڕەیی و گۆڕینی ڕای پادشا زۆر دەترسام، چونکە کاتێك مرۆڤێك لەگەڵ پادشایەکی هەوەس بازاد دا بژیت، دەبێت ئاگای لەخۆشی بێت، چونکە لەوانەیە لەناکاو گۆڕانکاری بەسەر ڕاوبۆچونی پادشاشدا بێت.

ئەوەبوو وتم: لەبەرئەوەی لەحاڵی گەشتکردندام و بۆ بەدەست هێنانی زانستی جۆراوجۆر هاتوم، ناتوانم ژنێك بۆ خۆم هەڵبژێرم، چونکە خوداکانی ئێمە وتویانە کاتێك سەرقاڵی بەدەستی هێنانی زانستن، خۆتان لەژن هێنان بپارێزن.

ئەی خوداکانی میسر داوای لێبوردنتان لێدەکەم کە ئەم درۆیەم بەزمانی ئێوەوە کردووە، بۆئەوەی پادشای"بابل"بهێنمە ئەو باوەڕەی چیتر دەستبەردارم بێت، جگە لەو ڕێگەیە ڕێگەچارەی ترم بەدەستەوە نەبوو.

کاتێك ژنەکان بینیان من ئامادە نیم هیچ کام لەوان هەڵبژێرم، سوکایەتی و گاڵتەیان پێدەکردم و دەیانوت دیارە تۆش وەك ئەو کۆیلانە وایت کە لەماڵی پادشادا سەرقاڵی خزمەت کردنی خاوەنەکەیانن و ناتوانی لەگەڵ ژناندا ڕابوێرن.

پادشای"بابل"یش کەوای دەزانی بەپێدانی یەکێك لەژنەکانی بەمن، خۆشحاڵم دەکات، زۆر دڵگران بوو و وتی:ئەگەر تۆ منت لەئازاری ددان ڕزگار نەکردبایە، ئێستا فەرمانی کوشتنم دەدایت.

دوای ئەوە ڕێی پێدام بڕۆم و پێش ئەوەی بڕۆم، دوبارە باسی جەژنی پادشای درۆینەی بۆکردمەوە و وتی: بەهار وا خەریکە دێت و کاتی جەژنی پادشای درۆینە نزیك دەبێتەوە، بۆیە خۆت بۆ چێژ وەرگرتن لەم ئاهەنگە ئامادە بکە.

پێش ئەوەی باسی جەژنی پادشای درۆینەتان بۆ بکەم، دەبێت باسی ئەو بابەتەتان بۆ بکەم کە بەمنەوە پەیوەست دەکرێت.

ڕۆژێکیان بۆ تەماشاکردنی شوشەی گەورەکەر ڕۆشتم بۆ"مردوك". باوەڕ ناکەم ئەم شوشەیە لەهیچ شوێنێکی ئەم جیهانە هەبێت، لە"بابل"دا دروست دەکرێت و جۆرە شوشەیەکی ئەستور و ناسکی وەك پارچە سەهۆڵێکی درەوشاوە وایە و هیچ پەڵەیەکی تاریکی تێدا بەدی ناکرێت.

بەڵام کاتێك مرۆڤ لەپشتی ئەم شوشەوە، تەماشای شتێك دەکات، بەڕادەیەك ئەوشتە بەگەورەیی دەبینێت کە ڕایدەوەشێنێت و دەیترسێنێت، ئەوڕۆژەی من ڕۆشتبوم بۆئەوەی تەماشای ئەو شوشەیە بکەم مرۆچەیەکیان هێنا و من ئەو شوشەیەم گرت بەدەستەوە و لەپشتی ئەو شوشەوە تەماشای ئەو مرۆچەیەم کرد خەریك بوو لەترساندا هەڵبێم، چونکە ئەو مرۆچەیە ئەوەندە گەورە بوو بوو کە لەڕوی گەورەییەوە لاشەی بەئەندازەی لاشەی ئەسپێکی لێهاتبوو.

دوای ئەوەی چاوم کەوت بەو شوشە گەورەکەرە، ڕۆشتم بۆ نهۆمی سەرەوە کە شوێنی ئەستێرەناسەکانە و داوام لێکردن پێشبینی ئایندەم بکەن. لەبەرئەوەی نەمدەزانی لەچ بەروار و لەکوێ لەدایك بوم نەیانتوانی پێشبینی ئایندەم بکەن، بەڵام پێیان وتم کە تۆ لەبنەچەدا میسری نیت.

وتم: هیچ گومانێك لەوەدا نیە کە من لەناو سەبەتەیەکدا بوم کە بەدەم ڕوباری نیلەوە ئاو دەیبردم و ژنێك منی کرد بەکوڕی خۆی و ئەو سەبەتەیەی گرتەوە.

ئەستێرەناسەکان وتیان، سەرەڕای ئەوەی تۆیان لەسەر ڕوباری نیل دۆزیوەتەوە، تۆ نە میسریتو نە خەڵکی وڵاتێکی تری، بڕۆیت بۆ هەر شوێنێکی ئەم جیهانە، بەبێگانە لەقەڵەم دەدرێیت.

وتم: ئەم گوتەیەت شایەنی پەسەند کردن نیە، چونکە لەم جیهانەدا هیچ نەبێت شوێنێك هەیە کە منی تێدا لەدایك بوم و هەمان ئەو شوێنەش نیشتمانی منە و من لەو نیشتمانەدا، بەپیاوێکی بێگانە لەقەڵەم نادرێم.

ئەستێرەناسەکان وتیان لەجیهاندا ئەوشوێنەی کە تۆی تێدا لەدایك بوە بونی نیە.

وتم: کەواتە من لەکوێ لەدایك بوم؟

یەکێك لەئەستێرەناسەکان وتی: لەوانەیە تۆ کوڕی خوداکان بیت و لەئاسمانەوە دابەزیبیتە سەرزەوی.

وتم: لەوڵاتی ئێمەدا، تەنها یەك کەس کوڕی خوداکانە و ئەو کەسەش فیرعەونە.

ئەستێرەناسەکان وتیان: بەهەرحاڵ چارەنوسی تۆ وامان پێدەڵێت کە بڕۆیت بۆ هەر شوێنێکی ئەم جیهانە بەبێگانە لەقەڵەم دەدرێیت و شوێنێك نیە کە نیشتمانی تۆ بێت و لەبەرئەوەی وایە، کەواتە تۆ لەئاسمانەوە هاتویت و کوڕی خوداکانی.

ئەوکات من بەسەرسوڕمانەوە بینیم کە ئەستێرەناسەکان لەبەرامبەر مندا سەریان دانەواند و لێم پرسین: بۆچی ئەم کارە دەکەن.

ئەوانیش لەوەڵامدا وتیان: ئێمە دڵنیانین کە تۆ کوڕی خوداکانیت، بەڵام دەزانین کە لەم جیهانەدا لەدایك نەبویت، لەبەرئەوە مەرجی خۆپارێزی ئەوەیە کە ڕێزت لێ بگرین، بۆئەوەی ئەگەر بەڕاستی کوڕی خوداکانیت، لەڕوی ڕێز و مامەڵەکردنمانەوە لەگەڵ تۆدا هیچ کەموکورتیەکمان نەبێت و لەلای خوداکان تاوانبار نەکرێین.

من کە دەمزانی کوڕی خوداکان نیم، لەو قسانەیان زۆر سەرم سوڕما و ئەوانم بەهۆی بێمێشکیانەوە بەئەفسانە پەرست لەقەڵەم دا.

*بەشی شانزەیەم*

## جەژنی ڕۆژی درۆکردن

کاتێك وەرزی بەهار دەست پێدەکات، دانیشتوانی"بابل"بۆماوەی دوانزە ڕۆژ ئاهەنگ دەگێڕن. لەڕۆژی سیانزەیەمدا مەراسیمی ئەم جەژنە، لەڕێی درۆیەکی مەزن بەواتا"پادشای درۆینە" کۆتایی پێدێت.

لەماوەی ئەم دوانزە ڕۆژەدا خەڵکی لە"بابل"دا جوانترین جل لەبەر دەکەن و کچانی لاویش دەڕۆن بۆ پەرستگا"عەشتار"و لەوێ خۆیان دەدەن بەدەست پیاوانەوە، بۆئەوەی لەگەڵیاندا ڕابوێرن و هەر پیاوێك دوای ئەوەی لەگەڵ ژنێکدا ڕایبوارد، دیاریەك دەدات بەو ژنە و ژنانیش ئەم دیارەیە کۆ دەکەنەوە، بۆئەوەی کاتێك شویان کرد داراییەکی تەواویان لەدەستدا بێت[42].

هیچ کەس سەری لەم نەریتە سوڕ نامێنێت و هیچ پیاوێك کاتێك ژن دەهێنێت چاوەڕێی ئەوە ناکات ژنەکەی پەردەی کچێنی پاراستبێت.

لەم دوانزە ڕۆژەدا، هەموویان سەرقاڵی ڕابواردن و خۆشی خۆیانن و خۆیان بۆ جەژنی ڕۆژی سیانزەیەمی بەهار ئامادە دەکەن.

بەیانی ڕۆژی سیانزەیەم من لەمیوانخانە دانیشتبوم و لەناکاو ئەوەم بیست کە کۆمەڵێك سەرباز ڕژانە ناو میوانخانەکەوە و هاواریان کرد پادشای ئێمە لەکوێیە؟ پادشامان پێ بدەنەوە ئەگینا هەمووتا دەکوژین.

---

[42] جهیز، وشەیەکی عەرەبیە و بەواتای کەلوپەل و ئەو شتومەکانەی بوك دەیبات لەگەڵ خۆیدا بۆ ماڵی هاسەرەکەی، دێت. لەهەندێك وڵاتدا نەریتێك باوە، ئەو نەریتەش ئەوەیە کاتێك ژنێك شودەکات ئەرکی پێکهێنانی بەشێکی ئەو خێزانەی لەئەستۆدایە، بۆنمونە هەموو پێداویستیەکی ناو ماڵ لەئەستۆی کەسوکاری ژندایە، بۆنمونە یەکێك لەو وڵاتانە"ئێرانە"..... وەرگێڕ.

ئەم کۆمەڵە سەربازانە بەتوڕەییەوە هاواریان دەکرد و هەموو نهۆمەکان گەڕان تا گەشتنە ئەو نهۆمەی منی تێدا نیشتەجێ بوم و هاواریان دەکرد پادشای خۆمان پێ بدەنەوە....پادشاکەمان نەشارنەوە.

سەربازەکان لەبەردەم ژورەکەمدا دەستیان کرد بەهەراوهوریا و "کاپتا"ی بەندەم لەترساندا، خۆی کرد بەژێر چوارپاکەمدا و پێی وتم: وابزانم لە"بابل"دا شۆڕشێك بەرپا بووە و پادشاش بەهۆی ئەو شۆڕشەوە هەڵهاتبێت و لایەنگرانی وایان زانیبێت کە ئەو لەم میوانخانەیەدا بێت، بۆیە هاتون بۆ ئێرە.

منیش دەرگای ژورەکەم کردەوە و بەسەربازەکانم وت: ئایا من دەناسن؟

من"سینۆهەم"بەکوڕی کەر ناسراوم، پزیشکی میسریم و ددانی پادشای ئێوەم هەڵکێشا و ئەو تەنها بۆئەوەی من خۆشحاڵ بکات، لەم شارەدا ڕێی سەربازی "مەسیرە" بەلەشکرەکەی ئەنجام دا و ئەگەر دەتانەوێت ئازاری من بدەن، دەڕۆم بۆ لای پادشاکەتان و سکاڵاتان لێ دەکەم.

سەربازەکانیش وتیان:ئەگەر تۆ"سینۆهە"یت ئێمە بەدوای تۆدا دەگەڕێین و مەبەستمان لەم کارە تەنها دۆزینەوەی تۆ بوو.

پرسیم: چ کارێکتان بەمن هەیە؟

وتیان: بەندەکەی تۆمان دەوێت.

لێم پرسین: چ کارێکتان بە بەندەکەی من هەیە؟

سەربازەکانی وتیان: ئەمڕۆ، ڕۆژی جەژنی پادشای درۆینەیە و پادشا فەرمانی بەئێمە داوە کە بەندەکەی تۆی بۆ ببەین.

وتم: پادشای ئێوە چ کارێکی بە بەندەکەی من هەیە؟

وتیان: هیچ شتێك لەمبارەیەوە نازانین، ئەگەر بەندەکەتمان پێ نەدەیت، ڕوتت دەکەینەوە و بێ جل و بەرگ دەتبەین بۆ کۆشکی پادشا و بۆئەوەی بیسەلمێنن بەڕاستی هەڕەشە دەکەن، بەجوڵەیەك جلوبەرگەکەمیان لەبەرمدا هەڵدڕی و ڕوتیان کردمەوە، ئەوکات بەسەرسورمانەوە تەماشایان کردم، چونکە تا ئەوکاتە نەیانبینیبوو کە پیاوێك"ئەندامی نێرینەی" خەتەنە کرابێت.

یەکێك لەسەربازەکان وتی: پەنا بە"مردوك"ئەم پیاوە بۆچی وایە؟

ئەوی تریان پرسی: ئایا تەواوی پیاوانی میسر بەوشێوەیەن؟

وتم: بەڵێ لەمیسردا، پیاوان هەر لەسەردەمی منداڵیدا خەتەنە دەکرێن.

یەکێك لەوانە وتی: ئەم بابەتە بەلای ئێمە هیچ گرنگیەکی نیە.

ئەوی تریان هاواری کرد و وتی: ئێمە کەسێکمان لەتۆ دەوێت و تۆش دەبێت پێمان بدەیت، ئەگینا....

وتم: لەکورتی بیبڕنەوە و بڵێن چیتان دەوێت؟

سەربازەکان پێکەوە وتیان: یان بەندەکەی خۆتمان پێ نیشان بدە، یان تۆ بەڕوتی بەشەقامەکانی "بابل"دا دەتگێڕین و دەتبەین بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی.

"کاپتا" کە لەژێر تەختە خەوەکەدا لەترساندا دەلەرزی، هاتە دەرەوە و وتی: خاوەنەکەم بەڕوتی نەبەن بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی، چونکە ڕێزی ئەم پزیشکە بەناوبانگە لەناو دەچێت و من ئامادەم لەگەڵ ئێوەدا بۆ هەرکوێ بڵێن دێم.

کاتێك سەربازەکان "کاپتا"یان بینی، لەخۆشیاندا هاواریان کرد و وتیان پەنا بۆ"مردوك"... پادشای ئێمە پەیدابوو..... ئێمە پادشای خۆمان دۆزییەوە و ئێستا دەیبەین بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی.

"کاپتا"بەسەرسوڕمانەوە تەماشای سەربازەکانی دەکرد و کاتێکیش سەربازەکانی سەرسوڕمانی ئەویان بینی بەدەم هاوار و خۆشیەوە وتیان:تۆ پادشای چوار وڵاتی؟ تۆ فەرمانڕوای ئێمەیت و ئێمە هەر بەقەد و باڵت دەتناسینەوە.

هەندێك لەسەربازەکان لەبەرامبەر"کاپتا"دا سەریان دادەنەواند و هەندێکی تریان بەلەقە کەتبونە گیانی بۆئەوەی خێراتر بکەوێتە ڕێ.

"کاپتا" وتی: خاوەنەکەم، لەوباوەڕەدام من لەوڵاتێکدا دژیم کە هەموو خەڵکەکەی شێت بێتو لەئێستاشدا نازانم ئایا لەسەر هەردوو پێی خۆم ڕێ دەکەم یان لەسەر سەرم؟ لەوانەشە خەو ببینم و ئەوەی دەیبینم دیمەنی خەو بینین بێت، ئەگەر لەم وڵاتەدا منیان سەرەوخوار هەڵواسی، تۆ مەهێڵە گیانەوەرەکان لاشەم بخۆن و تەرمەکەم مۆمیا بکە و لەمیسردا بمنێژە.

یەکێك لەسەربازەکان بەدەم پێکەنینەوە وتی: لێرەدا تەرمی مردووەکان گیانەورەکان نایخۆن، لەبەرئەوەی ئێمە تەرمەکەیان فڕێ دەدەینە ناو ڕوبارەوە و ئاویش لاشەیان بەرەو دەریا دەبات.

"کاپتا"وتی:گەورەم مەهێڵە تەرمەکەم فڕێ بدەنە ناو ڕووبارەوە، چونکە لەم حاڵەتەدا من ناتوانم لەجیهانێکی تر بژیم.

سەربازەکان بەدەم پێکەنینەوە وتیان توانیمان پادشایەکی باش پەیدا بکەین، لەبەرئەوەی لەکاتی قسەکردندا ترەتری تێناکەوێت، لەبەرئەوەی"کاپتا" نەیدەویست لەو میوانخانەیە بێتە دەرەوە، بەلەقە ئەویان بەڕێ خست و لەگەڵ خۆیاندا بردیان.

دوای ئەوەی"کاپتا"بەزۆر ڕۆشت، من بەپەلە جلم لەبەرکرد و لەدوای ئەو ڕۆشتم بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی و لەوێ دەیانزانی کە تێکەڵاویەکی تەواوم لەگەڵ پادشادا هەیە، هیچ کەسێك ڕێی چونە ژورەوەی لێ نەگرتم.

کاتێك چومە ناو کۆشکەوە بینیم کۆمەڵێك خەڵکی زۆر لەناو کۆشکی فەرمانڕەواییدا کۆ بونەتەوە و هەمویان هاواریان دەکرد و سەربازەکانیش بەوروژانەوە، نێزەکانی دەستیان ڕادەوەشاند.

من دڵنیابوم لەوەی لە"بابل"دا شۆڕشێك بەرپا بووە و ئەگەر لەمیرنشینەکاندا سەربازەکان کۆنەکەنەوە و ئامادەیان نەکەن، لەوانەیە"بورا بوریاش"ی پادشای"بابل"لەفەرمانڕەوایی لا ببرێت، چونکە لەهاواری ئەو کۆمەڵە خەڵکەوە دیار بوو کە ڕای خۆیان دژی"بورا بوریاش" دەردەبڕن.

بێئەوەی کەسێك ڕێم لێ بگرێت خۆم کرد بەناو تەلارەکەدا و دەمزانی کە پادشای"بابل" لەوێیە و بینیم کاهینی مەزنی پەرستگای"مردوك"و بڕێکی تر لەکاهینەکانی تر لەو تەلارەدا ئامادە بوون.

کاتێك"کاپتا"خۆی کرد بەنێو ئەو تەلارەدا، لەناکاو کاهنی مەزنی پەرستگای"مردوك" لەحاڵێکدا کە بەپەنجەی دەستی هێمای بۆ پادشای"بابل"دەکرد وتی: ئەم کوڕە کە هێشتا ڕیشی دەرنەکردووە لێرە بکەنە دەرەوە.... ئێمە ئامادە نین ئەو بەپادشای خۆمان لەقەڵەم بدەین.

ئەوانیتر بۆ لایەنگری ڕای ئەم پیاوە وتیان، ئەم پیاوە لێرە دەربکەن و ئێمە ئامادە نین لەوە زیاتر منداڵێك فەرمانڕەواییمان بکات...یەڵا دەری بکەن.

کاهینی مەزنی پەرستگای"مردوك" بەپەنجەی دەستی هێمای بۆ"کاپتا"ی بەندەی من کردو وتی: ئێستا ئێمە توانیومانە پادشایەکی باڵغ و ژیر بۆ خۆمان پەیدا بکەین و

وەك فەرمانڕەوایەك هەڵیبژێرین، بۆئەوەی لەڕوی ژیری و ئەندێشەوە فەرمانڕەواییمان بكات.

هەرئەوەی ئەم قسەیە لەدەمی كاهینی مەزنەوە هاتە دەرەوە، ئەو كەسانی لەوێدا ئامادە بون هێرشیان بۆ پادشای لاوی"بابل"برد و بەدەم پێكەنین و گاڵتەوە هێماكانی فەرمانڕەواییان لەسەر و سینەی لابرد و جلیان لەبەردا نەهێشت و دەستیان بۆ دەست و پێی دەبرد و دەیانوت تەماشا بكەن كە دەست و پێی چەنێك لاوازە و هێشتا بۆنی شیر لەدەمی دێت، و ناتوانێت ببێتە مایەی چێژی ژنەكانی خۆی، بۆیە لەباتی ئەو ئەم پیاوە–دەستیان بۆ بەندەكەی من ڕاكێشا–دەنێرینەماڵەكەی، بۆ ئەوەی بتوانێت بۆماوەیەكی كورت ببێتە كەرەستەی خۆشی ژنەكانی.

"بورا بوریاش" كاتێك هێماكانی فەرمانڕەواییان بەسینەوە دارنی بگرە بچوكترین بەرگری لەخۆی نیشان نەدا و من بینیم لەگەڵ شێرەكەی خۆیدا، كە كلكی لەناوگەڵیدا ڕاگرتبوو ڕۆشتە گۆشەیەكی ئەو تەلارەوە.

كاتێك بینیم پۆشاكی فەرمانڕەواییان كردووەتە بەری بەندەكەم و هێماكانی فەرمانڕەواییان بەسەر و سینەیەوە هەڵواسیوە، نەم دەزانی ئایا لەسەر هەردوو پێی خۆی ڕێ دەكات یان لەسەر سەری دەڕوات.

"كاپتا" لەسەر ئەو تەختەی كە پێشتر پادشا لەسەری دادەنیشت، دانیشاند و لەبەرامبەریدا كڕنوشیان بۆ برد و ماچی زەویان كرد، بگرە خودی"بورا بوریاش"كە ڕوت و قوت بوو لەبەرامبەر"كاپتا"دا كڕنوشی برد و وتی: ئەو دەبێت ببێتە پادشای ئێمە، چونكە لەم وڵاتەدا لەو ژیرتر و دادپەروەرترمان دەست ناكەوێت.

بەندەكەم، بەشێوەیەك سەری سورمابوو كە نەیدەتوانی قسە بكات، بەڵام من بینیم كە قژەكانی لەژێر هێمای فەرمانڕەوایی كە بەنێوچەوانیەوە هەڵیانواسیبوو وەك سیخ قیت ڕاوەستابون.

كاتێك ئەو كەسانەی لەناو ئەو ژورەدا بون دەستیان كرد بەڕەخنە گرتن لێی"كاپتا"هاواری كرد بێدەنگ بن و هەموویان لەوكاتەدا بێدەنگ بون، ئەویش وتی:

من لەوباوەڕەدام جادوگەرێك جادوی لەمن كردووە، و شتگەلێك دەهێنێتە بەرچاوم كە ڕاستەقینە نین، چونكە مەحاڵە بتوانی شتێك پەسەند بكەیت كە لەناكاو پیاوێكی وەك من كە بەم وڵاتە بێگانەم، بكەنە پادشای خۆیان.

ئامادەبوانیش زمانی ناڕەزاییان بەرزکردەوە و بەدەم گاڵتە و پێکەنینەوە وتیان وا نیە، تۆ پادشای ئێمەیت و هیچ کەسێك جادوی لەتۆ نەکردووە و ئێمە لەکانگای دڵمانەوە تۆمان وەك پادشای خۆمان هەڵبژاردووە.

"کاپتا" وتی: من سەرەڕای ئەوەی حەز ناکەم ببمە پادشای ئێوە بەڵام ناشتوانم بەپێچەوانەی ڕاوبۆچونی ئێوە ڕەفتار بکەم، چونکە ڕێژەی ئێوە زیاترە، بەڵام پرسیارێك لەئێوە دەکەم و داواتان لێدەکەم کە وڵامێکی تەواو و دروستم بدەنەوە....ئایا من پادشای ئێوەم؟

هەمویان بەیەك دەنگ هاواریان کرد: بەڵێ.....بەڵێ...تۆ پادشای ئێمەی و دوبارە لەبەرامبەریدا کڕنوشیان بۆ برد و یەکێك لە ئامادە بوان کە پێستی شێرێکی لەبەرکردبوو و لەبەردەم تەختی"کاپتا"لەسەر زەویدا دانیشت و نەڕاندی.

"کاپتا" جارێکی تر هاواری کرد بێدەنگ بن و هەموویان بێدەنگ بون.

بەندەکەی من وتی: ئەگەر من پادشای ئێوە بم، دەبێت گوێڕایەڵی فەرمانەکانم بن.

هەموویان هاواریان کرد: هەرچی تۆ بیڵێی ئەنجامی دەدەین

"کاپتا" وتی: لەبەرئەوەی من بومەتە پادشای ئێوە، ئەمڕۆ دەبێت ئاهەنگ بگێڕین و بەندەکانیش بۆ ئەم ئاهەنگە بانگ بکەن.

کۆمەڵێك لە بەندەکان کە لەوێ ئامادەبون لە"کاپتا"نزیك بونەوە و وتی: هەرئێستا شەراب و خواردن بهێنن، بۆئەوەی من بیخۆم و لەڕێی شەرابەوە خۆم شادمان و خۆشحاڵ بکەم و کەسانی تریش وەك من سکیان تێر و سەریان گەرم بکەن.

بەندەکان وتیان خواردن و شەراب لەژورەکەی تردا ئامادەیە و دوای ئەوە ئەویان بەرز کردەوە و بەدەنگە دەنگ و هاوار و پێکەنین بردیان بۆ ژورەکەی تر، منیش لەگەڵ ئەواندا ڕۆشتم و بینیم لەو تەلارەدا جۆرەها خواردن و خواردنەوەیان داناوە و هەموو کەسێك، بەئارەزوی خۆیان جۆری خواردن و خواردنەوەیان هەڵدەبژێرن و دەیخۆن و دەیخۆنەوە.

"بورا بوریاش"ی پادشای ڕابردوو وەك بەندەکان شەرواڵێکی بەکەمەریەوە بەستبوو، لەناوەڕاستی ئەو ئاپۆرەیەدا بەهەموو لایەکدا ڕایدەکردو پێکی شەرابەکانی لەبەر خۆیەوە هەڵدەڕشت و چێشتی بەجلوبەرگی ئامادە بواندا دەپڕژاندو بەم کارەی هانی دەدان جنێو بدەن، لەهەیوانی کۆشکی فەرمانڕەواییدا، هەسیرەکانیان پڕ

کردبوو له ئاوجۆ و شەراب و هەموو کەسێك دەیتوانی بەو پێکانەی کە لەتەنیشت هەسێرەکاندا دەبینران، ئاوجۆ یان شەراب بخۆنەوە و لەگەڵ خورما و ماست و جۆرێك چەوری کە لەشیر دروستی دەکەن و زۆر خۆشتامە[43] سکی خۆیان تێر بکەن.

کاتێك سکەکان تێر و سەرەکان بە ئاوجۆ و شەراب گەرم بوون، هەراوهوریایەکی سەیر لەناو کۆشك و هەیواندا بەرپا بوو کە من تا ئەو ڕۆژە هاوشێوەی ئەوم بەچاوی خۆم نەبینیوە.

جیاوازی پلەوپایە و چینەکان لەناو چوبون و هەموو کەسێك لەگەڵ ئەوی تردا گاڵتە و گەپی دەکرد و ئەو کەسانەی تا دوێنێ لەبەرامبەر"بورا بوریاش"دا کڕنوشیان دەبرد، ئێستا ئێسقانی پاشماوەی خواردنەکانی تێدەگرن و ئەویش بەدەم پێکەنینەوە ئێسقانی دەگرتە ئەوانەی ئێسقانیان تێگرتبوو.

لەنێو ئەم هەراوهوریایەدا خۆم گەیاندە لای بەندەکەم و پێم وت: "کاپتا" ئێستا هەموویان سەرخۆشن و هیچ کەسێك ئاگای لەتۆ نیە، هەستە بێئەوەی هیچ کەسێك ئاگای لێمان بێت لێرە بڕۆین، چونکە من واهەست دەکەم دەرئەنجامی ئەم کارە بەباش کۆتایی نایەت.

"کاپتا" کە سەرقاڵی خواردنی پارچە گۆشتی سورکراوەی وڵاخ بوو وتی: ئەوەی تۆ دەیڵێیت لەگوێ مندا وەك وزە وزی مێش وایە و من ئەم قسەیەی تۆ پەسەند ناکەم و دەست لەم خۆشحاڵیە هەڵناگرم و بەجێی ناهێڵم، مەگەر نابینی ئەم میللەتە بەچ سۆز و خۆشەویستیەکەوە منیان بەپادشای خۆیان هەڵبژاردووە؟ ئایا من دەتوانم لەبەرامبەر ئەو هەموو خۆشەویستی و پەیوەستبونەدا خۆم بەکەسێکی"نمەك سوڵ" پیشانی ئەم میللەتە بدەم و دەستیان لێ هەڵگرم و بڕۆم؟ چیتر لەئێستا بەدواوە تۆ نابێت من بەناوی"کاپتا"بانگ بکەیت، چونکە من پادشای چوار وڵاتم و تۆ هەرجارێك کە ویستت قسەم لەگەڵدا بکەیت، دەبێت پێم بڵێی هەی پادشای چوار وڵات و وەك ئەوانی تر لەبەرامبەرمدا کڕنوشم بۆ ببەیت.

وتم: "کاپتا"....ئەم پادشاییەی تۆ جگە لە گاڵتە و درۆیەکی مەزن هیچی تر نیە، چونکە مەحاڵە ئەم میللەتە تۆ کە بەندەیەکی بیانیت بەپادشای خۆیان هەڵبژێرن و من

---

[43] سینۆهە لێرەدا مەبەستی "کەرێ"یە. کە بەژەنینی ماست دروست دەبێت.

دەترسم سەرئەنجامی ئەم گاڵتەیە بۆ ئێمە هەڕەشەئامێز بێت و تا کاتمان بەدەستەوە ماوە هەستە بۆئەوەی خۆمان لەشوێنێکدا بشارینەوە، یان ئەوەی لێرە بڕۆین و ئەگەر هەستیت و لەگەڵمدا بێیت من لەبەرامبەر ئەو بێشەرمیەی لەبەرامبەر مندا نواندوتە دەبەخشم و بە گاڵۆکەکەی دەستم تەمێت ناکەم.

"کاپتا"دەمی کە ئالودەی چەوری بوو پاك کردەوە و بەو پارچە ئێسقانەی کە بەدەستیەوە بوو هەڕەشەی لێکردم و هاواری کرد ئەم میسریە پیسکەیە لێرەدا دور بکەنەوە، ئەگینا ناچار دەبم بەدارێك هەرچی ئێسقانیەتی بیشکێنم.

هەر ئەوەی"کاپتا"ئەم قسەیەی کرد ئەو پیاوەی ڕۆشتبووە ناو پێستی شێرەوە، هێرشی بۆ کردم و دامی بەزەویدا و بەچڕنوکەکانی جەستەمی ڕوشاند و خەریك بوو سەرتاپای جەستەم بریندار بکات، بەڵام خۆشبەختانە، بوقەکان هاتنە دەنگ و بانگەوازی ئەوەیان کرد کە پادشای تازە دەبێت بڕوات کاروباری دادگا بەڕێوە بەرێت و شێرە درۆینەکەش لەوکاتەدا وازی لێهێنام.

دادگای"بابل" لەنزیك کۆشکی فەرمانڕەواییدا بوو، کاتێك"کاپتا"یان برد بۆ ئەوێ، بۆئەوەی دەست بەئەنجامدانی دادپەروەری بکات ویستی خۆی لەجێبەجێکردنی ئەم ئەرکە بدزێتەوەو وتی: من متمانەیەکی تەواوم بە دادگای"بابل"هەیە و باشتر وایە خودی دادوەرانی ئەو دادگایە کاروبارەکان بەڕێوە ببەن.

بەڵام خەڵکی ئەم قسەیەی ئەویان پەسەند نەکرد و وتیان ئێمە دەمانەوێت خودی پادشای تازەمان دادپەروەری دادگا بەڕێوە ببات، بۆئەوەی بزانین ئایا مێشکی هەیە و ژیرە و دەتوانێت بەپێی نەریت و شێوازەکان بەشێوەیەکی دادپەروەرانە بڕیارەکانی خۆی دەربکات یان نە؟

"کاپتا"یش ناچار بوو کاری دادگا بەڕێوە بەرێت و خەڵکی ئەویان لەسەر کورسی دادوەری"بابل"دا دانیشاند و قامچی و دەستبەند کە هێمای جێبەجێکردنی دادوەرین لەبەردەمیدا دایاننا و یەکەم کەس کە بۆ سکاڵاکردن لەدادوەر نزیك بویەوە، پیاوێك بوو کە جلوبەرگێکی شڕی لەبەردابوو و من بینیم کە موی سەری بەتەواوی سپی بوو.

دوای ئەوە تێگەشتم کە سپێیەتی قژی لەو خۆڵەمێشەوە سەرچاوە دەگرێت کە بەسەری خۆیدا ڕشتووە و جلەکانی خۆی بەئەنقەست دڕیوە، بۆئەوەی بتوانێت بەو حاڵە شڕەوە بچێتە بەردەم پادشای دادوەر.

چونکه له"بابل"دا ئەوکەسانەی خۆیان زۆر بەستەم لێکراو دەزانن هەوڵ دەدەن لەڕوی ڕوکەشەوە بارودۆخێکی خراپ و شڕیان هەبێت، بۆئەوەی سۆزی دادوەر بەلای خۆیان ڕاکێشن.

پیاو لەبەرامبەر بەندەکەمدا زەوی ماچ کرد و وتی: ئەی فەرمانڕەوای چوار وڵات، لەمرۆدا هیچ کەسێك بەئەندازەی تۆ دادپەروەر و ژیر نیە، بۆیە من هاتوم داوای جێبەجێ کردنی دادپەروەریت لێبکەم، من ژنێکم هەیە کە چوارساڵە لەگەڵ مندا ژیان بەسەر دەبات و لەماوەی ئەم چوارساڵەدا سکی پڕ نەبوو، بەڵام بەم تازەییانە سکی پڕ بوو، سەرەڕای ئەوەی هەندێك خەڵك پێم دەڵێن ژنەکەت منداڵێکی زۆڵی لەسکدایە، من ئەو گوتەیەیانم پەسەند نەکرد، تا ئەوەی دوێنێ خۆم ژنەکەم لەگەڵ سەربازێکدا بینی ڕایدەبوارد.

من لەو کاتەدا نەمتوانی ئەو سەربازە دەستگیر بکەم، چونکە ئەو لەمن بەهێزتر بوو و هەرئەوکاتەی خۆم کرد بەماڵدا هەڵهات، بەڵام ئێستا جەرگی ڕەشم پڕبوو لەخەم و گومان و نازانم ئەو منداڵەی کە لەسکی ژنەکەمدایە ئایا منداڵی منە یان منداڵی ئەو سەربازەیە، منیش ئێستا هاتوم بۆ لای تۆ بۆئەوەی داوات لێ بکەم، ئەم گرفتەم بۆ چارەسەر بکەیت و من لەم گومانە بهێنیتە دەرەوە، بۆئەوەی من بزانم لەبەرامبەر ئەم منداڵەدا چ ئەرکێکم لەسەر شانە.

"کاپتا"بەنیگەرانیەوە تەماشای ئەوانەی دەوروبەری خۆی کرد، چونکە نەیدەزانی چ وەڵامێکی بداتەوە کە هاوشانی دادپەروەری بێت و لەناکاو داوای لە بەندەکان کرد یەکی دارێك هەڵگرن و لەم کابرایە بدەن.

بەندەکانیش بەتێلا کەوتنە گیانی ئەو پیاوە و دوای ئەوەی باشیان لێدا، ئەو پیاوە بەئامادەبوانی وت: ئایا بڕیاری پادشا لەبەرامبەر مندا دادپەروەرانە بووە و من کە بۆ سکاڵاکردن هاتوم، دەبێت دارکاری بکرێم.

خەڵکی دوای بیستنی قسەی ئەم پیاوە داوایان لە"کاپتا"کرد بۆیان ڕونبکاتەوە و لێیان پرسی: بۆچی فەرمانڕەوای چوار وڵات فەرمانی دا دارکاری ئەم پیاوە بکەن.

"کاپتا" وتی: پیاوێك کە ئەوەندە گەمژە بێت، شایستەی ئەم دارکاریەیە، چونکە ئایا دەتوانرێت ئەوە پەسەند بکرێت کە پیاوێك خاوەنی کێڵگەیەکی بەپیت بێت و کێڵگەکەی خۆی بەبێ هیچ بەرهەمێك بهێڵێتەوە و هیچ تۆوێکی تێدا نەچێنێت و

کاتێك کەسانی تر بێن و لەڕوی سۆز و چاکەکاریانەوە، لەو کێڵگەیەدا تۆو بچێنن، ئەو بێت و سکاڵا دژیان بەرز بکاتەوە کە بۆچی کەسانی تر تۆویان لەزەویەکەی ئەودا وەشاندووە.

بەڵام ئەگەر ئەو کێڵگەیەی هیچ شتێکی تێدا نەچێنراوە و بەرەڵاکراوە، داوا لەکەسانی تر بکات توی تێدا بچێنن، ئایا دەبێت گلەیی و سکاڵا لەخودی ئەو کێڵگەیە بکەین کە دوای لەکەسێکی تر کردووە تۆوی تێدا بچێنێت؟ هەڵبەت نەخێر، هەرلەبەرئەوەش ئەو ژنە مافی خۆیەتی پەیوەندی لەگەڵ پیاوێکی تردا ببەستێت، چونکە ئەم پیاوە نەیتوانیوە داواکانی جێبەجێ بکات و ئەوی وەك کێڵگەیەك بەرەڵاکردووە. ....خەڵکی دوای بیستنی ئەم قسانە هاواری دەستخۆشیان لێ بەرزبویەوە و ستایشی ژیری و دادپەروەری"کاپتا"یان کرد.

ئەوکات پیرەمێردێك لەکاپتا نیزیك بویەوە و و وتی: ئەی فەرمانڕەوای چوار وڵات، من لەبەرامبەری تۆ و ئەم پایەدا کە یاساکانی"بابل"ی لەسەر نوسراوە، داوای جێبجێکردنی دادپەروەریت لێدەکەم و سکاڵای منیش ئەوەیە.

لەمدواییانەدا لەکۆڵانێکداماڵێکم دروست کرد، بەڵام ئەو ئەندازیارەی کە ماڵەکەی منی بەتەندەرێك دروست کردبوو، منی فریو دا و کەرەستەی خراپی لەدروست کردنی ماڵەکەمدا بەکارهێنابوو و بەهیچ شێوەیەك بیری لەبتەوی و جێگری ماڵەکە نەکردبویەوە، بۆیە لەناکاو ماڵەکەم ڕوخا و وێران بوو و کەسێك کە لەوکۆڵانەوە تێدەپەڕی لەکاتی ڕوخانەکەدا بەکوشت دا و ئێستا کەسوکاری کەسی مردوو داوای قەربوی زیانی مردنی کەسی مردوی خۆیان لەمن دەکەن، لەکاتێکدا من هیچ تاوانێکم نیە و ئێستا دەبێت چی بکەم و چی بەکەسوکاری مردوو بڵێم؟

"کاپتا"بیری لێکردەوە و وتی: ئەو شتەی تۆ بۆت باسکردم بابەتێکی زۆر ئاڵۆزە و لەوکاتەدا لەدادوەرانی "بابل" کە لەوێ ئامادەبون پرسی، لەمبارەیەوە یاسا چی دەڵێت؟

دادوەرانیش ئەو پایەی کە یاساکانی لەسەر نوسرابوو پیشانی"کاپتا"یان دا و وتیان: ئەگەر ماڵ بەهۆی کەمتەرخەمی یان فێڵی تەندەرەوە بڕوخێت و خاوەن ماڵی تێدا بمرێت، خودی ئەو تەندەرەی ئەم ماڵەی دروست کردووە لەسزای ئەو تاوانەیدا بەکوشت دەدرێت.

لەکاتی ڕوخانی ئەوماڵەدا کوڕی خاوەن ماڵ بکوژێت، کوڕی ئەو تەندەرەی کە ئەم ماڵەی دروست کردووە بەسزای کوشتنی خاوەن ماڵ بەکوشت دەدرێت.

بەڵام یاسا لەبارەی کوشتنی کەسانی ترەوە هیچی نەوتووە، بەڵام ئێمە بەمشێوەیە شیکردنەوەی بۆ دەکەین کە هەرجۆرە زیانێك کەلەکاتی وێران بونی ماڵێکدا بکەوێت لەهەر کەسێك، دەبێت خودی تەندەری ئەو ماڵە قەرەبوی ئەو زیانە بداتەوە، لەکاتێکدا ئەگەر کابرای تەندەر نەیەوێت قەرەبوی ئەم زیانە بداتەوە، دەبێت بەهەمان ئەندازە زیانی پێ بگەیەنن.

"کاپتا"وتی:من نەمدەزانی کە لەم وڵاتەدا تەندەرانی دروستکردنی خانوو، ئەوەندە فێڵباز بن، نیوەی کەرەستەی دروستکردنی خانوی خەڵکی دەدزن و نیوەکەی تری لەخانوی کابرادا بەکاردەهێنن، یان بەو کەمتەرخەمیەوە ماڵی خەڵکی دروست دەکەن کە بەوشێوەیە بڕوخێت و من چیتر دوای ئەوە ئاگاداری خۆم دەبم کە گرفتاری ئەم جۆرە تەندەرە فێڵبازانە نەبم.

بەڵام بیرو بۆچونی من لەبارەی سکاڵای ئەم پیاوە، ئەوەیکە خزمانی کەسی مردوو داوای قەرەبوی زیانی لێدەکەن ئەمەیە:

خزمانی کەسی مردوو دەبێت بڕۆنە بەردەم ماڵی ئەو ئەندازیارەی کە دروست کردنی ئەم ماڵەی لەئەستۆگرتووە و یەکەم ڕێبوار کە لەوێوە تێدەپەڕێت بەکوشت بدەن، بۆئەوەی بەپێی یاسا مامەڵەی لەگەڵدا بکرێت، بەڵام ئەگەر خزمانی کابرای ڕێبواری کوژراو وەك خزمانی ڕێبواری مردووی یەکەم داوای قەرەبوی زیان ڕێبواری دووەم بکەن. ئەوا لەمحاڵەتەدا ئەو کەسانەی کە ڕێبواری دووەمیان لەبەردەم ماڵی تەندەردا کوشتووە، دەبێت قەرەبوی ئەو زیانە لەئەستۆ بگرن.

بۆچونی من لەبارەی تاوانباری سەرەکی ئەوەیە کە لەم ڕوداوەدا هیچ کەسێك بەئەندازەی ئەو کەسەی کە لەبەردەم ماڵێك کە بەسستی بنیات نراوە و تێپەڕیوە تاوانبار نیە، چونکە هیچ پیاوێکی ژیر لەبەردەم خانوویەك کە لەوانەیە لەهەرکاتێکدا بڕوخێت تێناپەڕێت.

یان بەلایەنی کەم، دوای ئەوەی دروستکردنی ماڵێك دەدات بە تەندەرێك، دەبێت بەبەردەوامی چاودێری لێ بکەیت، بۆئەوەی ساختە و فێڵ لەدروست کردنی ئەو ماڵەدا نەکات.

لەبەرئەوەی هەڵنەستاوە بەئەنجامدانی ئەو کارە، بەواتا چاودێری لێنەکردووە، کابرای تەندەر لەم کاتەدا مافی خۆیەتی فیڵی لێبکات و ماڵەکەی بەشێوەیەك بۆ دروست بکات کە دوای ماوەیەکی کورت بڕۆخێت، چونکە تا ئەوکاتەی کەسە گەمژەکان فریو نەدەیت و زیانیان پێ نەگەیەنیت ژیر نابن.

بۆجارێکی تر خەڵکی ستایشی دادپەروەری"کاپتا"یان کرد و ئەو پیاوەی کە بۆ سکاڵاکردن هاتبوو، بەدڵتەنگیەکەوە لەو شوێنە دور کەوتەوە.

ئەوکات سەوداگەرێکی قەڵەو کە کراسێکی گرانبەها لەبەردابوو، لە"کاپتا"نزیك بویەوە و وتی: سەروماقلەیەکی وەك منیش ڕۆشت بۆ پەرستگای"عەشتار" بۆئەوەی بتوانێت لەگەڵ کچێکدا ڕابوێرێت.

منیش یەکێك لەو کچانەم دەستنیشان کرد کە بۆ ئامادەکردنی پێویستی ژیانی هاوسەری لەیەکەمین ڕۆژەکانی بەهاردا دێن بۆ پەرستگای"عەشتار" و لەگەڵیدا ڕێکەوتم کە بڕێك زیوی پێبدەم و لەبەرامبەردا لەگەڵمدا ڕابوێرێت.

دوای ئەوەی برە زیوەکەم پێدا پێویستی بەوەکرد لەبەر شتێکی ئاسایی بۆ ماوەیەکی کورت لێی دور بکەومەوە، دوای گەڕانەوەم بەسەرسوڕمانەوە بینیم کە ئەو لەگەڵ پیاوێکی تردا لەحاڵی ڕابواردندایە، لەکاتێکدا بڕێك زیوی لەمن وەرگرتووە و بەڵێنی پێدابوم کە چاوەڕێی گەڕانەوەم بکات.

کاتێك پێم وت: ئەو برە زیوەی پێم دابوو بۆم بگەڕێنێتەوە. لەوەڵامدا وتی: تۆ بڕیارت دابوو لەگەڵ مندا ڕابوێری، ئێستا کە ئەو پیاوە لێرە نیە دەتوانی لەگەڵمدا ڕابوێری.

وتم: من کاتێك دەمویست لەگەڵ تۆدا ڕابوێرم کە تۆ هێشتا پەردەی کچێنیت لەدەست نەدابوو، بەڵام ئێستا ئەو پەردەی کچێنیەت لەدەست داوە.

بەڵام ئەو کچە ئەم قسەیەی منی پەسەند نەکرد و وتی: من ئەو برە زیوەت بۆ ناگەڕێنمەوە، چونکە ئەوەی تۆ دەتویست لێم بکڕیت هەمە و دەتوانی هەرئێستا بیکڕیت.

منیش پێم وت:من قاپێکی قوڕی سورکراوی بێعەیبم لەتۆ کڕی و نرخەکەیشم پێدایت و بۆ کارێکی تایبەت بۆماوەیەك لێت دور کەوتمەوە، بەڵام بەهەرحاڵ ئەم قاپە هی منە و تۆ ئەم قاپەت بەمن فرۆشتبوو، مافی ئەوەت نەبوو، بەهیچ کەسێکی تری

بفرۆشی یان بیدەیت بەزەویدا و بیشکێنی، کاتێکیش گەڕامەوە، پارچەی قاپە شکاوەکەت پێنیشان دام و وتت ئەو هەمان ئەو شتەیە کە تۆ لەمنت کڕی.

کاتێك "کاپتا" گوێی لەم قسانە بوو، قامچیەکەی خۆی هەڵگرت و بەتوڕەییەوە ڕایتەکاند و تی:

من لەهیچ شوێنێکدا، بەئەندازەی دانیشتوانی ئەم شارە کەسانی نەزان و گەمژەم نەبینیوە کە سکاڵا لەشتگەلێکی منداڵانە بکەن.

ئەی کابرای بازرگان، ئەگەر تۆ بۆ کڕینی میوەیەکی تازە بڕۆیت بۆ بازاڕ، دوای ئەوەی ئەو میوەیەت کڕی یەکسەر دەیخۆت یان جێی دەهێڵیت چەند ڕۆژێکی بەسەردا بڕوات و دوای تێپەڕبونی ماوەیەك، ئەگەڕێیتەوە و ئەڵێیت بۆچی ئەو میوەیەی کە کڕیومە بەوشێوەیە سیس و شڵەقاوە؟

کچێکی لاویش کە هێشتا پەردەی کچێنی لەدەست نەداوە وەك ئەو میوە تازەیە وایە، کڕیار هەر ئەوکاتەی میوەکەی کڕی دەبێت بیخوات، ئەگەر کچی لاویش بەهەمان شێوەی میوەکە بەجێ بهێڵێت و بڕوات، لەکاتی گەڕانەوەیدا ببینێت کە میوەکەی سیس و شڵەقاو بووە یان بەگوتەی خۆت وەك ئەو قاپە ورد بوبێت نابێت سکاڵای لێ بکەیت.

تۆ لەباتی ئەوەی سکاڵا لەم کچە بکەیت، دەبێت سوپاسی بکەیت کە هاوکاری کردویت، چونکە پێش گەڕانەوەت، ئاستەنگێکی لەبەردەم تۆدا لابرد، ئەو ئاستەنگەش ئەگەر بمایەتەوە بۆ تۆ دەبووە مایەی گرفت و دەردیسەری، بۆیە ئەرکی ئەو زەحمەتەی خستە ئەستۆی کەسێکی ترەوە، بۆئەوەی تۆ بێ هیچ گرفتێك لەگەڵیدا ڕابوێریت و لەبەرئەوەی دیارە کە تۆ پیاوێکی نەزانی و نازانی بەها و ڕێزی میوەی تازە چەنێکە، من تۆ بەوە تاوانبار دەکەم کە چیتر لەمەودوا دەبێت لەگەڵ قاپە شکاوەکاندا ڕاببوێری.

دوبارە خەڵکی هاواری دەستخۆشیان لێ بەرز بویەوە و ستایشی ژیری و دانایی"کاپتا"یان کرد، بەندەکەم لەشێوەی وتارخوێنندا بە دادوەرانی وت:

من ئەمڕۆ بەشێوەیەکی پێویست دادوەریم ئەنجام دا و ئێستا ماندوم و دەبێت کەمێك بحەوێمەوە، ئەگەر سکاڵاکارانی تریش پەیدا بون، ئێوەی دادوەر دەبێت لێکۆڵینەوە لەسەر سکاڵاکانیان بکەن.

سکاڵای پیاوی بازرگان منی لەوە ئاگادار کردەوە کە من ئێستا فەرمانڕەوام و لەماڵەکەمدا چوارسەد ژنم هەیە و دەبێت بڕۆم و لەگەڵیان ڕاببوێرم و من خۆم بۆ ئەم ڕابواردنە ئامادە دەبینم، چونکە نەك تەنها خواردن توانای پێبەخشیوم، بەڵکو لەو کاتەوەی بومەتە فەرمانڕەوای چوار وڵات توانایەکی لەڕادەبەدەر لەخۆمدا هەست پێدەکەم کە لەسەردەمی لاویەتیشدا هەڵگری ئەو هێز و توانایە نەبوم.

خەڵکی بەهەراوهوریا و شادی"کاپتا"یان بەرەو ماڵ برد، بەڵام لەنێو خەڵکیدا یەکێك خۆشحاڵی خۆی دەرنەدەبڕی و پێنەدەکەنی ئەوکەسەش"بورابوریاش"بو و لەهەمان ئەو کاتەدا خۆی گەیاندە من و وتی:"سینۆهە" تۆ پزیشکیت و دەتوانی خۆت بکەی بەماڵەکەمدا و بڕۆ و مەهێڵە بەندەکەت، دەست لەژنەکانی منەوە بدات، چونکە ئەگەر ئەو کارە بکات، هەر ئەم ئێوارەیە پێستی دەکەنم و بەسەر دیواردا هەڵی دەواسم بۆئەوەی وشك ببێتەوە.

با خۆی لەدەستدرێژی ژنەکانم بپارێزێت، من بڕیاری مەرگێکی ئاسانی بەسەردا دەدەم و پیان دەڵێم بەشێوەیەك بیکوژن کە هەست بەهیچ ئازارێك نەکات.

وتم:"بورا بوریاش"هەرچی تۆ بڵێیت من ئەنجامی دەدەم، بەڵام من دڵگرانم بەوەی تۆ بەم جلی کۆیلایەتیەوە دەبینم و جەرگی ڕەشی من ئاوێتەی خەم بووە، چونکە ناتوانم بەرگەی ئەوە بگرم کە خەڵکی تۆ بکەنە مایەی گاڵتەجاڕی خۆیان.

"بورا بوریاش"وتی: ئەمڕۆ، ڕۆژی درۆی مەزنە، بەواتا فەرمانڕەوای درۆینەیە و لەم ڕۆژەدا، کەسێك بەناونیشانی پادشای"بابل"هەڵدەبژێرن، بەڵام فەرمانڕەوایی ئەو لەڕۆژێك زیاتر درێژە ناکێشێت و تەواوی دانیشتوانی"بابل"ئاگاداری ئەم بابەتەن، بەڵام لەهەمان ئەم کاتەی کە من و تۆ قسە لەگەڵ یەکتردا دەکەین بەندەکەت بەرەو ڕوی ماڵەکەی من دەڕوات و من ترسی ئەوەم هەیە کە دەستدرێژی بکاتە سەر ژنەکانم، لەبەر ئەوە تۆ بڕۆ و مەهێڵە ئەمە ڕوو بدات.

من و "بورا بوریاش" بەرەو ڕوی ماڵەکەی ڕۆشتین و من لەکاتی ڕێکردندا دەربارەی نەریتی ڕۆژی درۆی مەزن، داوای ڕونکردنەوەم لێکرد و ئەویش وتی: هەموو ساڵێك میللەتی"بابل"سەیرخۆشترین و گەمژەترین کەس بۆ ماوەی ڕۆژێك، بۆ فەرمانڕەوایی هەڵدەبژێرن و فەرمانڕەوایی ئەو پیاوە گەمژەیە لەبەرەبەیانەوە دەست پێدەکات و خودی پادشاش وەك بەندەیێك خزمەتی دەکات.

لەمڕۆژەدا، ئەم فەرمانڕەوا کاتیە، هەرچی بویێت دەتوانێت ئەنجامی بدات، لەبەرئەوەی من بینیم کە بەندەکەت زۆر سەیرخۆش و گەمژەیە، بۆیە خۆم پێم وتن ئەو بۆڕۆژێك فەرمانڕەوایی هەڵبژێرن.

من پرسیم: دوای ئەوەی ئەمڕۆ، کۆتایی پێهات، چی لەم فەرمانڕەوا یەکڕۆژەیە دەکەن؟

"بورا بوریاش"وتی:کاتێك ئەمڕۆ کۆتایی پێدێت، هەروەك چۆن ئەویان لەبەربەیاندا کردیان بەفەرمانڕەوای"بابل"چەند ساتێك دوای ئاوابونی خۆر دەیکوژنو بڕیاری کوشتنی ئەو لەلایەن پادشاوە بەواتا منەوە دەردەچێت.

ئەگەر ئەو کەسەی کە بۆماوەی ڕۆژێك فەرمانڕەوایی کردووە، لەماوەی فەرمانڕەواییەکەیدا هەوڵی کوشتنی خەڵکی و دەستدرێژی کردنی ژنانی خەڵکی نەکات، ئەوا لەکاتی ئاوا بوندا، زەهر دەڕێژنە ناو شەرابەوە و دەرخواردی دەدەن و ئەویش بێ هیچ ئازارێك گیان لەدەست دەدات.

بەڵام ئەگەر لەماوەی ئەو ڕۆژەدا، دەستەڵاتی خۆی بۆ شتی نەشیاو بەکارهێنا، لەمحاڵەتەدا من بەئەشکەنجەوە بڕیاری کوشتنی دەدەم.

لەڕابردوودا، جارێکیان، لەهەمان ئەم ڕۆژەدا، فەرمانڕەوای ڕاستەقینەی"بابل"کە وەك خەڵکانی تر سەرقاڵی خۆشگوزەرانی بوو، بەهۆی خواردنی ئاوگۆشتێکی زۆر گەرم کە هەندێك دەڵێن زهریان کردبووە ئەو خواردنەوەوە گیان لەدەست دەدات.......

هەروەها وتی: ئەو پیاوە گاڵتەجاڕ و گەمژەیەی کە تەنها بۆ ماوەی یەك ڕۆژ بۆ فەرمانڕەوایی هەڵبژێردرابوو، دوای مەرگی فەمانڕەوای ڕاستەقینە، بۆماوەی سی و شەش ساڵ لە"بابل"دا فەرمانڕەوایی کرد و هەرلەبەرئەوەش ئەمڕۆ خۆم لەخواردن و خواردنەوە پاراست، بۆئەوەی گرفتاری چارەنوسی فەرمانڕەوای پێشوو نەبمەوە.

کاتێك من و "بورا بوریاش" گەشتینە بەردەرگای ماڵی پادشا بینیم خوێن لەدەم و لوتی"کاپتا"وە دەچۆڕێت و بەتاکە چاوە هەڵئاوساوەکەیەوە بەرەو دەروە دێت.

وتم:"کاپتا" ئەوە چیت بەسەردا هاتووە، بۆچی بەوشێوەیە بریندار بویت؟

"کاپتا" وتی: تەماشاکە لەو ماڵەدا چیان بەمن کردووە؟ کاتێك خۆم کرد بەم ماڵەدا ویستیان ژنە پیر و کەنیزە ڕەش و قەڵەوەکانم پێبدەن و منیش وتم: ڕقم لەم جۆرە ژنانەیە و بەرەوڕووی ژنێکی لاو و جوان ڕۆشتم، بەڵام ئەو ژنە، وەك شێری مێینە

پەلاماری دام و بەشێوەیەك بەپێڵاوەکەی سەر و چاومی پێ کوتا کە بووە هۆی ئەوەی چاوم بەو شێوەیە بئاوسێت و ئاواش خوێن لەلوتمەوە بێت.

"بورا بوریاش" کاتێك گوێی لەقسەی بەندەکەم بوو، پێکەنینێکی زۆر گرتی و بۆئەوەی نەکەوێتە سەرزەوی، خۆی بەبازوی منەوە ڕاگرتبوو...."کاپتا" وتی: "سینۆهە" من ناوێرم جارێکی تر بڕۆمە ئەوماڵەوە، چونکە ئەو شێت بووە، ئەگەر جارێکی تر پێ بنێمە ئەو ماڵەوە بەدڵنیاییەوە دەمکوژێت، بۆیە تۆ بڕۆ و کاسەی سەری ئەو ژنە لەت بکە، بۆئەوەی ئەو ڕۆحە شەڕەنگێزەی کە لەمێشکی ئەودایە بێتەدەرەوە و من بتوانم لەئامێزی بگرم، چونکە ئەگەر ئەم ژنە شێت نەبوایە، بەوشێوەیە هێرشی بۆ نەدەکردم و سەروچاومی بەوشێوەیە خوێناوی نەدەکرد، لەکاتێکدا من پادشای ئەوم و مافی ئەوەم هەیە بیکەمە خوشکی خۆم.

"بورا بوریاش" پێی وتم:"سینۆهە" بڕۆ و بزانە بارودۆخی ناوماڵەکەم بەچ شێوەیەکە و ئەو ژنەی پەلاماری ئەم گەمژەیەی داوە کێیە. ئەمڕۆ، لەبەرئەوەی ڕۆژی پادشای درۆینەیە، من ناتوانم بچمە ناو ماڵەکەی خۆمەوە، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ پزیشکی دەتوانی بڕۆیتە هەموو شوێنێك، بگر دەتوانی بڕۆیتە ماڵەکەی منیشەوە و لەوباوەڕەدام، ئەو ژنەی کە پەلاماری بەندەکەی تۆی داوە کچێکی لاوە و بەم تازەییانە بۆیان هێناوم و دەمویست بیکەمە هی خۆم، بەڵام هێشتا وەك گیانەوەرە دڕەندەکان وایە و من چاوەڕێی ئەوە دەکەم کەمێك هێور ببێتەوە.

من نەمدەویست بچمە ئەو ماڵە، بەڵام"بورا بوریاش"زۆر تکای لێکردم ئەم داوایەی پەسەند بکەم، بۆیە خۆم کرد بەماڵەکەیدا، بەندانی ئەو ماڵە لەبەرئەوەی دەیانزانی من پزیشکم ڕێیان لێ نەدەگرتم.

بنیم بێسەروبەرەییەك فەرمانڕەوایی ئەو ماڵە دەکات و هەندێك ژنی پیر خۆیان ڕازاندووەتەوە، بۆئەوەی لەڕۆژی جەژنی پادشای درۆینەدا ڕابوێرن و هەر ئەوەی چاویان بەمن کەوت هەواڵی"کاپتا"یان لێ دەپرسیم و دەیانوت بزنە چاخەکەی ئێمە بۆ کوێ ڕۆشتووە و بۆچی ڕانەوەستا بۆئەوەی لەگەڵ ئێمەدا کاتی خۆش بەسەر بەرێت.

ژنێکی ڕەشپێست هەبوو کە وەك بەندەکەی من قەڵەو و مەمکێکی زل و بەسەر ورگیدا شۆڕ بوبویەوە، بەرەوڕووم هات و پرسی: بزنە چاخەکەم بۆ بگەڕێنەرەوە،

بۆئەوەی بتوانم لەنێو مەمانمدا بیگوشم...ئەو فیلەی خۆمم بۆ بگەڕێننەرەوە بۆئەوەی بەشفرەکانی لەئامێزم بگرێت.

بەندەکان چواردەوریان گرتم و وتیان: هیچ خەمی ئەم پیرەژنانەت نەبێت، لەبەرئەوەی هیچ کام لەمانە شێت نەبون، و ئەم ڕەفتارانەش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە ئەمڕۆ خۆیان بۆ ڕابواردن و کاتی خۆش بەسەر بردن ئامادەکردووە، بەڵام لەنێو ژنانی ئەو ماڵەدا تەنها کچێکی لاو هەیە کە هەر لەسەرتای هاتنی بۆ ئەم ماڵە، لەهەموو کەسێك توڕەیە و ئەمڕۆش شێت بووە و نەك تەنها پادشای درۆینەی بەسەختی بریندار و ڕاوناوە، بەڵکو چەقۆیەکی بەدەستەوەیە، هەرئەوەی ئێمە بمانەوێت لێی نزیك ببینەوە، پەلامارمان دەدات، تۆ دەبێت بڕۆیت و شێتی ئەم ژنە چارەسەر بکەیت.

بەندەکان، ڕێنمایان کردم و منیان بردە هەیوانی گەورەی ئەو ماڵەی کە خشتگەڵکی ساف و درەوشاوەی هەبوو. لەناوەڕاستی ئەو هەیوانەدا هەسێرێك هەبوو، کە پەیکەری گیانەوەرانی دەریایی کە لەبەرد دروست کرابوو لەوێدا دەبینران و لەدەیان دەمی ئەم پەیکەرانەوە ئاو فوارەی دەکردە ناو هەسێرەکە.

لەکەنار ئەو هەسێرەدا ژنێکی لاو بەجلێکی شڕ و دڕاوەوە پاڵی بەیەکێك بەپەیکەرەکانەوە دابوو، کاتێك چاوی بەمن کەوت هەستایە سەرپێ، لەقژ و جلەکانیەوە ئاو دەچۆڕا و دیاربوو تازە لەو هەسێرە هاتووەتە دەرەوە و چەقۆیەکی بەدەستەوە بوو، کە بەتیشکی خۆی دەدرەوشایەوە.

کاتێك من لێی نزیك بومەوە، ئەو کچە لاوە کە بەندەکان کاتێك شەڕیان لەگەڵدا کردووە جلەکانی بەریان دڕاندبوو، شتێکی وت، بەڵام هەراوهوریای بەندەکان و هاژەی فوارەی ئاوەکان نەیانهێڵا بزانم ئەو کچە چی وت.

بۆیە بەبەندەکانم وت: لێرە بڕۆن و ئەم هەیوانەم بۆ چۆڵ بکەن و ئاوی فوارەکانیش ببڕن، بۆئەوەی بتوانم گوێم لەقسەی ئەم کچە بێت.

بەندەکان ڕۆشتن و ئاوی فوارەکانیش بڕان، ئەوکات من توانیم گوێم لەدەنگی ئەو ژنە بێت و بیستم کە ئەو سەرقاڵی خوێندنی ئاوازێکە و کوڵمەکانیشی لەوروژاندا سور وەرگەڕاون.

پێم وت: ئەی ژن بێدەنگ بە و ئەم چەقۆیەی دەستت فڕێ بدە و وەرە بۆ ئێرە بۆئەوەی چارەسەرت بکەم، چونکە بێگومان تۆ شێت بویت.

ئەو ژنەش لەباتی ئەوەی گوێڕایەڵیم بکات، وتی: هەی مەیمون، ئەگەر بێیتە پێشەوە من ئەم چەقۆیەم ڕۆ دەکەمە ناو جەرگی ڕەشتەوە، لەبەرئەوەی من زۆر توڕەم.

منیش وتم: هەی ژن، چەقۆکەت فڕێ بدە، چونکە هیچ ڕقەبەرایەتیەکم لەگەڵ تۆدا نیە و نامەوێت هیچ زیانێکت پێ بگەیەنم.

ژنیش وتی: چەند پیاوێك هەمان ئەو قسەیەی تۆیان کرد و وتیان هیچ نیازێکی خراپیان لەبەرامبەر مندا نیە، بەڵام من تێگەشتم ئەمانە دەیانەوێت فریوم بدەن، بۆئەوەی سودم لێوەرگرن هەر لەبەرئەوەش ئەم چەقۆیەم بەدەستەوەیە، بۆئەوەی هەر پیاوێك لێم نیزك بویەوە بیکوژم، بەتایبەت ئەو پیرەمێردە یەك چاوەی کە وەك مەشکە ئاوسابوو، دەکوژم.

وتم: ئایا ئەوە تۆ بویت کە پادشای"بابل"ت بەو شێوەیە بریندار کردووە؟

ژنەکە وتی: بەڵێ من بووم و خۆشحاڵم کە توانیومە لوتی خوێناوی بکەم، چونکە بگرە پادشای"بابل"یش نابێت دەستم لێوە بدات، چونکە منیان پێشکەشی خودای خۆمان کردووە و من دەبێت لەبەرامبەر خودا خۆماندا سەما بکەم.

وتم: هەرچەنێك خۆت حەزت لێیەتی لەبەرامبەر خودای خۆتدا سەما بکە، ئەم بابەتە پەیوەندی بەمنەوە نیە و من پزیشکم و ئەرکم ئەوەیە نەهێڵم تۆ کە ئێستا شێت بویت، بەم چەقۆیەی دەستت خۆت بریندار بکەیت، ئەگەر تۆ بریندار بکرێیت پادشای"بابل" زیانمەند دەبێت، چونکە بەندەکانی پێیان وتووم کە ئەو تۆی بەنرخێکی گران لەبازاڕی کۆیلە فرۆشاندا کڕیوە.

ژنەکەیش وتی: من کۆیلە نیم، بۆئەوەی نرخم لەسەر دابنێن و لەبازاڕی کۆیلە فرۆشەکاندا بمفرۆشن. من کچێکم کە بەزۆر فڕاندومیان، گەر بەڕادەیەکی کەم هەستت هەبوایە، تێدەگەشتی من چی دەڵێم.

لەمکاتەدا، ژنە تەماشایەکی دوای خۆی کرد و وتی: بەندەکان ڕۆشتونەتە سەر درەختەکان بۆئەوەی گوێ لەقسەی من و تۆ بگرن، ئایا ناتوانی بەزمانێکی تر قسەبکەیت، بۆئەوەی ئەوان تێنەگەن ئێمە باسی چی دەکەین.

من بەزمانی میسری دەستم کرد بەقسەکردن و وتم: من خەڵکی میسرم و ناوم "سینۆهە"یە بە کوڕی کەرە ناسراوم، لەبەرئەوەی پزیشکم، نابێت لێم بترسی.

هەر ئەوەی گوێی لێبوو کە بەزمانی میسری دەدوێم، بەرەوڕوم هات و وتی: من نەمدەزانی کە تۆ میسریت، ئەگینا زووتر لێت نزیك دەبومەوە، چونکە دەزانم کە پیاوانی میسری لەکاتی مامەڵەکردندا زۆر لەگەڵ ژناندا بەکار ناهێنن، سەرەڕای ئەوەی متمانەیەکی تەواوم بەتۆ هەیە بەڵام ناتوانم چەقۆکەت پێ بدەم، لەبەرئەوەی من پێویستم بەم چەقۆیە هەیە و دەمەوێت ئەمشەو کاتێك پادشای"بابل"یان هەرکەسێکی تر بێت و بیەوێت لەگەڵ مندا ڕابوێرێت، ڕەگی ملم بەم چەقۆیە دەبڕم بۆئەوەی بمرم، بۆئەوەی لەبەرامبەر خودای خۆمدا بێ ئابڕوو نەبم، ئەگەر تۆ دەتەوێت من بەزیندووی بمێنمەوە و لەخوداکان دەترسی، من لەم وڵاتە دەربکە، بەڵام بزانە هەرکاتێك منت لێرە دەرکرد، من ناتوانم پاداشتی تۆ، هەروەك چۆن ژنانی تر پاداشتی پیاوان دەدەنەوە، بدەمەوە، لەبەرئەوەی من خۆم تەرخانی خودای خۆمم کردووە و هیچ پیاوێك نابێت سود لەمن وەرگرێت، مەگەر ئەوکاتەی کە خودای من پێم بڵێت، خوازیاری ببە و چێژ لەهاوخەوی ئەو پیاوە وەرگرە.

وتم: من هیچ مەبەستێکی خراپم نیە و تۆش دەبێت لەمڕووەوە ئاسودە خەیاڵ بیت، بەڵام ڕۆشتنی تۆ لەماڵی پادشای"بابل"کارێکی بێ مێشکیە، چونکە لێرەدا هەموو کەرەستەیەکی ژیانی تۆ فەراهەمە و خواردن و پۆشاك و هەموو شتێکی ترت بوێت پێتی دەدەن.

ژنەکە وتی: من لەوڵاتی خۆشمدا نان و پۆشاکم هەبوو، پۆشاکی ئێرە بەلای منەوە سەرنج ڕاکێش نیە، بەڵام ئەوەی کە وتت هیچ مەبەستێکی خراپت لەبەرامبەر مندا نیە، ئەوەیان بابەتێکە کە هەرکاتێك منت لە"بابل" دەرکرد، دەتوانین پێکەوە قسەی لەسەر بکەین، چونکە گەرچی من خۆم تەرخانی خودای خۆمان کردووە، بەڵام ئەگەر خودای من بڵێت پیاوێك بۆ خۆم هەڵبژێرم، ئەوکات دەتوانم ڕازی بم بەوەی سودم لێ وەرگرێت.

وتم: هەی ژن، من مەبەستی ئەوەم نیە تۆ لە"بابل"دەربکەم و لێرە بتبەمە دەرەوە، لەبەرئەوەی پادشای"بابل" هاوڕێی منە و هەرکاتێك تۆ لە ماڵی ئەودا بفڕێنم، ئەوا لەم حاڵەتەدا بەپێچەوانەی نەریتی هاوڕێیەتی ڕەفتارم لەگەڵدا کردووە.

دەبێت ئەوەش بزانی ئەو پیاوەی کە یەك چاوی هەبوو و وەك مەشکە ئاوسابوو، پادشای هەمیشەیی"بابل" نیە، بەڵکو پادشای درۆینەی ئەو وڵاتەیە و تەنها بۆ ماوەی یەك ڕۆژ و تەنها "ئەمڕۆ" فەرمانڕەوایی دەکات، لەڕۆژی دواییدا پادشای هەمیشەی"بابل"ئەوەی کە تۆی کڕیوە، فەرمانڕەوایی دەکات و ئەو کەسێکی لاو و باڵایەکی جوانی هەیە و بەهیوای ئەوەیە کە چێژ لەهاوخەویەکانی تۆ وەرگرێت و لەوباوەڕەشدام تۆش چێژ لەهاوخەویەکانی وەرگریت.

هەرلەبەرئەوەش داوات لێدەکەم ئەم بیرە منداڵانەت بخەرە لاوە و ئەو چەقۆیە بدە بەمن.

ژنەکە وتی: ئەگەر ئەم چەقۆیەی خۆمت پێبدەم، ئەوا تۆ دەبێت پارێزگاریم لێ بکەیت.

منیش وتم:بەڵێ پارێزگاریت لێ دەکەم، بۆئەوەی هیچ کەسێك نەتوانێت زیانت پێ بگەیەنێت.

ئەوکات ژنەکە وتی:ناوم"مینا"یە و لەبەرئەوەی تۆ بەڵێن دەدەیت پارێزگاریم لێ بکەیت، بۆئەوەی هیچ کەسێك نەتوانێت زیانم پێ بگەیەنێت، ئەم چەقۆیەت پێ دەدەم، هەروەها لەبەرئەوەی میسریت، دەزانم کە درۆم لەگەڵدا ناکەیت و هەوڵی فریودانم نادەیت.

ئەوکات بەدەم زەردەخەنەوە چەقۆکەی پێدام و منیش لێم وەرگرت و بەڕێکەوتم، بەڵام کاتێك ڕێم دەکرد تێگەشتم کە"مینا"بەپێدانی ئەو چەقۆیە پێم منی لەبەرامبەر ئەرکێکی مەزندا ڕاگرتووە، چونکە چیتر دوای ئەوە دەبێت پارێزگاری لێ بکەم، لەکاتێکدا بەچ شێوەیەك دەتوانرێت پارێزگاری لەژنێکی جوان و لاو لەماڵی کەسێکی مەزندا کە ئەوماڵەش ماڵی"بورا بوریاش"ە بکرێت؟ لەهەمان کاتدا ویستم بگەڕێمەوەو چەقۆکەی بۆ بگەڕێنمەوە، بۆئەوەی هیچ بەڵێنێك لەنێوان من و ئەودا نەمێنێت، بەڵام بەندەکەکان چواردەوریان گرتم و لەوەیکە توانیومە چەقۆکەی لێ وەرگرم، ستایشیان دەکردم و دەیانوت، ئەم ژنە ئەگەر ئەم چەقۆیەی لەلای خۆی بپاراستایە خۆی یان کەسانی تری بەکوشت دەدا، بەڵام ئێستا دڵنیاین لەوەی نە لەبەرامبەر خۆیدا مەبەستێکی خراپی هەیە نە لەبەرامبەر کەسانی تردا.

کاتێك لەو ماڵە هاتمە دەرەوە"بورا بوریاش" بەرەو ڕوم هات و بەدەم پێکەنینەوە پرسی: چی بوو؟ ئایا گومانەکەم لەجێ خۆیدا بوو؟ئەو ژنەی کە بەندەکەی تۆی بریندار کرد، هەمان ئەو کەنیزە لاوەیە کە بەم تازەییانە بۆیان کڕیوم.

وتم: بەڵێ و ئەم ژنەش بەهۆی بەدڕەفتاری نۆکرەکانت بەوشێوەیە توڕە بووە و بڕیاری داوە خۆی نەدات بەدەست هیچ پیاوێکەوە و باشتر وایە، بۆماوەیەك لێی نزیك نەبیتەوە، با هەر بۆ خۆی تەنها بێت، تا ئەوکاتەی وردە وردە توڕەییەکەی هێور دەبێتەوە و ڕازی دەبێت کە تۆ لەگەڵیدا هاوخەو ببیت.

"بورا بوریاش" وتی: تۆ بۆ دڵنییکردنی ئەم ژنە ئاسودە خەیاڵ بە، چونکە من ژنانی لاو زۆر باش دەناسم و دەزانم بەچ شێوەیەك دەبێت ڕاو و دڵنییان بکەیت، ئەمە یەکەمجارم نیە کە ژنێکی لاو و توڕە پێ بنێتە ماڵی من و داوای لێ بکەم لەگەڵ مندا ڕابوێرێت و ڕەنجم بکاتەوە.

ئەو کچە جوانانەی کە هێشتا لەگەڵ مندا هاوخەو نەبون لێم دەترسن و وا هەست دەکەن دوچاری هەڕەشەیەکی مەزن بونەتەوە، بەڵام کاتێك دێن بۆ لام و چاویان بەلاویەتی من دەکەوێت بەڕادەیەك پێمەوە پەیوەست دەبن کە چیتر دوای ئەوە گلەیی ئەوەم لێدەکەن کە بۆچی تەواوی کاتی خۆمیان بۆ تەرخان ناکەم و ئەگەر لەگەڵ ژنانەکانی ترم ڕابوێرم ئیرەییم پێدەبەن، هەرکاتێکیش لاویەتی و جوانی من کاریان تێنەکات، بێ لەم حاڵەتەش ڕێگایەکی ترم بۆ ماڵی کردنیان بەدەستەوەیە، ئەو ڕێگایەش دارکاریە. من فەرمان دەدەم ئەو کچە لاوە سەرکەشە بەدەمدا بخەن و بەندەکان بەداری باریك ئەوەندەی لێبدەن تا خوێن لەگشت گیانیەوە دەچۆڕێت و کاتێکیش شەو بێت نەتوانێت بخەوێت، ئەم ژنە دوای ئەوەی جارێك یان دوجار دارکاری کرا، بەشێوەیەك گوێڕایەڵ دەبێت کە هەرگیز سەرپێچی لەفەرمانەکانم نەکات.

"بورا بوریاش"دوای ئەم قسانەی بەپێکەنینێکی تر لێم دور کەوتەوە و منیش بەرەو ڕوی تەلای میوانداری ڕۆشتم.

"کاپتا"ی بەندەیشم، سەرەڕای ئەوەی بەدەستی"مینا"بریندار کرابوو، دوای ئەوەی گەڕایەوە بۆ ناو تەلای میوانداری، بەهۆی خواردنەوەوە ئازارەکانی خۆی فەرامۆش کرد.

خەڵکێکی زۆر چواردەوریان گرتبوو و هانی ئەوەیان دەدا کە ڕەفتار و قسەی گاڵتەئامێزیان بۆ بکات، لەوباوەڕەدام بەندەکەی من لەو بوارەدا ئامادەکاریەکی سروشتی تێدا بەدی دەکرا، بۆیە قسە و ڕەفتارگەلێکی لەخۆی نیشان دەدا کە خەڵکی دەوروبەری دەهێنایە پێکەنین.

لەتەلاری میوانداریدا خەڵکی بەشێوەیەك سەرگەرمی خۆشگوزەرانی خۆیان بون کە هیچ کەسێکیان هیچ گرنگیەکی بەمن نەدەدا. لەوکاتەدا ویستم خۆم بگەیەنمە "کاپتا"و پێی بڵێم کە هەستێت و لێرە هەڵبێت، بەڵام ئاگاداری ئەوەبوم کە ئەوانی تر بەشێوەیەك چواردەوری بەندەکەی منیان گرتبوو کە من نەتوانم بەچپە و نهێنیەوە قسەی لەگەڵدا بکەم، سەرەڕای ئەوەش"کاپتا"بەڕادەیەك گەشتبووە ئەو باوەڕەی کە بووە بە پادشا کە لەوانەبوو فەرمان بدات خەڵکانی تر سوکایەتیم پێ بکەن و لێم بدەن.

من نەمدەویست بەندەکەم لە"بابل"دا بەکوشت بدرێت و ڕزگارکردنی لەمەرگ بەئەرکی خۆم دەزانی، گەرچی ئەو بەهۆی مەستیەوە خۆی ون کردبوو، بەڵام هەر بەندەیەکی تر لەباتی"کاپتا"ئەگەر لەناکاو ببێتە پادشا خۆی ون دەکات.

سەرەڕای"کاپتا"، من بەڵێنم بە"مینا" داوە و دەبێت ئەو بەڵێنەی خۆم بەجێ بهێنم. پادشای"بابل"وتبوی ئەو کچە ئەگەر جوانی من ببینێت، لەو توڕەییەی هێور دەبێتەوە و خۆی دەهاوێژێتە باوەشمەوە، بەڵام ئەم گوتەیە پەسەند ناکەم، چونکە ئەگەر"مینا"بیویستایە خۆی بدات بەدەست"بورا بوریاش"ەوە ئێستا خۆی بەدەستەوە دابوو.

من هیچ گومانێکم لەوەدا نەبوو کە"بورا بوریاش"فەرمان بەبەندەکانی خۆی دەدات دارکاری ئەو کچە بکەن، منیش نەمدەویست"مینا"بەدەستی بەندەکان دارکاری بکرێت و جەستەی بریندار بکەن، لەبەرئەوەی میسریم "مینا"پشتی بەبەڵێنەکەی من بەستووە و متمانەیەکی تەواوی بەمن هەیە و چەقۆکەی دەستی خۆی پێدام، ئێمەی میسریش ڕێ نادەین ژنێکی جوان دارکاری بکرێت.

من دوو ئەرکم لەئەستۆدابوو، یەکێك لەئەرکەکانم ڕزگارکردنی بەندەکەم و ئەویتریان ئەرکێکی دۆستانە بوو لەبەرامبەر ڕزگار کردنی"مینا"دا.

لەبەرامبەر ئەنجامدانی ئەرکی یەکەم، هیچ گومانێکم لەئەنجام دانیدا نەبوو، ئەگەر "بورا بوریاش"یش لێم تورە ببێت، چونکە بەندەکەی من هیچ تاوانێکی نەکردووە بۆئەوەی بەدەستی دانیشتوانی"بابل"بکوژرێت.

بەڵام لەبەرامبەر ئەرکی دووەممدا زۆر دودڵ بوم، چونکە"بورا بوریاش"بەهۆی ئەوەی متمانەیەکی تەواوی بەمن هەبوو، منی نارده ناوماڵەکەی خۆی، ئەگەر "مینا" لەم ماڵەدا بفڕێنم و لەگەڵ خۆمدا بیبەم، ئەوا لەم حاڵەتەدا خیانەتم لە متمانەی هاوڕێیەتی کردووە.

بەڵام"مینا"ش متمانەیەکی تەواوی پێکردبوم، چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکردم کە من ئەو لە"بابل" دەربکەم یان نەهێڵم دارکاری بکەن.

ئەگەر بمتوانیایە لە"بابل"دا بمێنمەوە، داوام لێ دەکرد کە دارکاری"مینا" نەکەن، ئەویش لەمحاڵەتەدا داواکەی منی پەسەند دەکرد، بەڵام لەبەرئەوەی من ناچاربوم بەندەکەم لەمەرگ ڕزگار بکەم، نەمدەتوانی لە"بابل"دا بمێنمەوە و دەبێت"کاپتا"ڕزگار بکەم و ئێمە هەردوکمان لەوێ هەڵبێین.

لەبەرئەوەی لەگەڵ"کاپتا"دا هەڵدێم لەم حاڵەتەدا"مینا"بەتەنهایی دەمێنێتەوە و دارکاری دەکرێت، بۆئەوەی ئەو دوچاری ئەم ستەمە نەبێت، ناچار دەبم ئەویش لەگەڵ خۆمدا بفڕێنم، سەرەڕای ئەوەی پادشای"بابل" فڕاندنی"مینا" بەکردارێکی پێچەوانەی هاوڕێیەتی بزانێت و وا هەست بکات کە من خیانەتم لێکردووە.

مرۆڤ لەجیهاندا، لەهەموو کاتێکدا لەکار و ڕەفتارەکانی خۆیدا ئازاد نیە، لەبەرئەوەی چارەنوسی مرۆڤ ئەستێرەکان دەستنیشانی دەکەن و هەندێکات ناچار دەبن، کارگەلێك ئەنجام بدەن کە خۆیان حەز بەئەنجامدانی ئەو کارە نەکەن.

ئەوەبوو کە هەموو گومان و دودڵیەکی خۆم وەلا نا و بڕیارم دا هەم"کاپتا"لەمەرگ ڕزگار بکەم و هەم"مینا" لەو ستەمانەی کە چاوەڕێی دەکەن ڕزگار بکەم.

*بەشی هەڤدەیەم*

## لەپێناو ڕزگار کردنی دوو کەسدا

دوای نیوەڕۆ ڕۆشتم بۆ قەراخ ڕوبار و لەکەشتیەك نزیك بومەوە کە دە سەوڵ لێدەری هەبوو و بەسەوڵ لێدەرەکانم وت: من دەزانم کە ئەمڕۆ ڕۆژی جەژنی پادشای درۆینەیە و ئێوەش ئاوجۆتان خواردووەتەوە و حەز دەکەن ئەمڕۆ تا شەو کاتی خۆش بەسەر بەرن، بەڵام ڕۆژەکانی جەژن زوو تێدەپەڕێت، دوای ئەوە ڕۆژانی برسیەتی و ئەرك کێشان دەست پێدەکاتەوە، بۆیە ژیر ئەو کەسەیە کە فریوی خۆشیەکانی ڕۆژی جەژن نەخوات و بیر لەڕۆژانی تر بکاتەوە، ئێوە ئەمڕۆ دەتوانن کار بکەن و موچەیەکی باش لەبەرامبەر ئەم کارەتاندا وەرگرن و بەم موچەتان، دەتوانن لەبەیانیەوە تا دوو هەفتەی تر بخۆن و بخۆنەوە و لەگەڵ ژناندا ڕابوێرن.

سەوڵ لێدەرەکان پرسیان: ئێمە دەبێت چی بکەین؟

وەتم:سەرەڕای ئەوەی ئەمڕۆ ڕۆژی جەژنە، مامم کۆچی دوایی کردووە، چونکە کاتێك خوداکان بیانەوێت کەسێك بمرێنن، هیچ گرنگیەك بەوە نادەن کە ئەو لەڕۆژی جەژن و خۆشی یان لەڕۆژی خەم و ناخۆشەکاندا بمرێت و منیش ناچارم بەپێی ڕاسپاردەی مامم، ئەمشەو تەرمەکەی لێرە ببەم و بیگەیەنمە شوێنێك کە باوباپیرانی تێدا نێژراوە کە دەکەوێتە نزیك سنوری وڵاتی"میتانی"، بێ لەو تەرمە کەنیزەکەشم لەگەڵدا دێت، چونکە پیاوێکی وەك من ناتوانێت بەتەنهایی کارەکانی خۆی بەئەنجام بگەیەنێت، بۆیە دەبێت ژنێك خواردنی بۆ دروست بکات و ئێمە ئەمشەو لێرە دەڕۆین و من لەبەرامبەر ئەم کارەدا دوو ئەوەندەی کرێی ئاساییتان پێ دەدەم.

سەوڵ لێدەرەکان وتیان ئێمە ئامادەین بەوەی تۆ بگەیەنینە شوێنی مەبەستت، بەڵام لەکاتی شەودا ئێمە لەسەر ئەم ڕوبارە سەوڵ لێنادەین، چونکە لەکاتی شەودا ڕۆحە ئازاردەر و هەڕەشەئامێزەکان لەهەردوولای ڕوبارەکەوەن یان لەسەر ئاوەکەدان و هاوار دەکەن و ئێمەش لەهاوارەکانیان دەترسین و لەوانەشە کەشتیەکەمان وەرگێڕن.

وتم: من هەرئێستا دەڕۆم و مەڕێك لەپەرستگادا دەکەم بەقوربانی، بۆئەوەی ئەم ڕۆحە ئازاربەخشانە هیچ زیانێکمان پێ نەگەیەنن و کاتێکیش بەمەبەستی خۆمان گەشتین دەنگی ئەو ئەنگوستیلە زیوانەی کە من پێتانی دەدەم ئەوەندە بەهێز دەکەوێتە بەرگوێتان کە ئێوە بەهیچ شێوەیەك دەنگی ڕۆحە ئازاربەخشەکان نەبیستن.

سەوڵ لێدەرەکان پرسیان: تۆ چ کاتێك دێیت؟.

وتم: ناتوانم پێتان بڵێم لەچ کاتێکدا دێم، بەڵام بەدڵنیاییەوە لەچارەکی یەکەمی ئەمشەودا خۆم دەگەیەنمە لای ئێوە، بەڵام ئێوە لەهەموو حاڵەتەکاندا بەکەشتیەکەی خۆتان لەهەمان ئەم شوێنەدا چاوەڕێی من بن و لێرە تەکان نەخۆن، ئەگەر وا هاتە پێش کە من درەنگم کەوتم، هەر لێرەدا لەناو گەشتیەکەتاندا بخەون، بەڵام کەشتیەکە نەبەن بۆ هیچ شوێنێکی تر، چونکە لەوانەیە من لەچارەکی دووەمی شەودا یان نزیکی بەرەبەیاندا بەتەرمەکەی مامم و کەنیزەکەم بێم بۆ ئێرە، ئەگەر کەشتیەکە ببەن بۆ شوێنێکی تر، لەم حاڵەتەدا ناتوانم بتاندۆزمەوە.

دوای ئەوە ئەنگوستیلەیەکی زیویم دا بەهەر سەوڵ لێدەرێك و پێم وتم: ئەم ئەنگوستیلە وەك پێشەکی پێتان دەدەم بۆئەوەی دڵنیابن و بزانن ئەمشەو دێم و ئەم کشەتیەتان بەکرێ بەکەسی تر مەدەن و کاتێك گەشتینە مەبەستی خۆمان، چوار ئەنگوستیلەی تر دەدەم بەهەریەك لەئێوە و بەهۆی ئەوەی ئێوە لەبەر تەماعی زێڕ و زیو نەمکوژن، وەك خۆتان دەزانن کە لە"بابل"دا کۆچەر و گەشتیارەکان هەرگیز زێڕ و زیو لەگەڵ خۆیاندا هەڵناگرن، بەڵکو حەواڵە لەگەڵ خۆیاندا هەڵدەگرن و کاتێکیش گەشتنە مەبەستی خۆیان، ئەو حەواڵەیان دەگۆڕن بە کانزاکان و منیش دوای ئەوەی گەشتینە شوێنی خۆمان، حەواڵەکەم دەگۆڕم بە کانزا و پاشماوەی کرێکەتان لەوێ دەدەمێ.

سەوڵ لێدەرەکان دوای ئەوەی ئەنگوستیلە زیویەکەیان وەرگرت دڵنیا بون لەوەی ئەگەر من بگەیەننە شوێنی خۆم، سودێکی زۆرم لێ وەردەگرن و هەریەك لەوانە دەبێتە خاوەنی پێنج ئەنگوستیلە و دڵنیا دەبن لەوەی شەو تا بەیانی چاوەڕێم بکەن.

من دوای گەڕانەوەم لەکەنار ڕوبار،"خیگە"[44] یەکی بچوکم کڕی، دوای ئەوە ڕۆشتم بۆ پەرستگا و لەوێ مەڕێکم کرد بەقوربانی و خوێنی مەڕەکەم ڕشتە ناو"خیگە"کەوەو بەو چەقۆیەی"مینا"بەمنی دابوو بەرەوماڵی"بۆرابۆریاش" ڕۆشتم.

کاتێك دەمویست بڕۆمە ناو ماڵەکەوە، "خیگە"ی پڕ لەخوێنم خستە ناو جانتای کەرەستەی پزیشکیەکەم بۆ ئەوەی هیچ کەسێك چاوی پێی نەکەوێت و هەرئەوەی خزمەتکارەکان چاویان پێم کەوت چواردەوریان لێگرتم و و منیش پێم وتن: ڕۆشتبوم بۆئەوەی دەرمان بۆ ئەم ژنە شێتە بهێنم و ئێوە دەبێت ژورەکەی ئەوم پێ نیشان بدەن.

خزمەتکارەکانیش، منیان بردە لای ژوری ئەو ژنە و منیش بەوانم وت: من لەگەڵ ئەم ژنەدا بەتەنهایی بەجێ بهێڵن، بۆئەوەی لەڕێی ئەم دەرمانانەوە ئەو ڕۆحە زیانبەخشانەی کە لەدەرونی ئەودا جێگیر بون و ئەویان شێت کردووە، لەجەستە و بونایەتی ئەودا دەربکەم.

خزمەتکارەکانی ڕۆشتن و من بە"مینا"م وت: ئەمشەو دەمەوێت تۆ لەم ماڵە بفڕێنمو لەگەڵ خۆمدا لەم وڵاتە دەرتبکەم، بەڵام بەمەرجێك تۆ ملکەچی فەرمانەکانی من بیت.

"مینا" پرسی: دەبێت چی بکەم؟

"خیگە"بچوك و چەقۆکەم پێنیشان دا و پێم وت: من ئەم شەو ئەم چەقۆیەت لا بەجێ دەهێڵم و دەڕۆم و بەخزمەتکارەکانیش دەڵێم دوای ڕۆشتنی من نابێت هیچ کەس خۆی بکات بەم ژورەی تۆدا.

---

[44] خیگە: وەك مەشکە وایە، بەڵام مەشکە لە پێستی بزن دروست دەکرێت، و خیگەش لەپێستی کارە بزن دروستی دەکەن و شێوەی ئامادەکردن و دروست کردنی لەگەڵ مەشکە جیاوازە، چونکە خیگە بە"توو" خۆشەی دەکەن، دوای ئەوەش دۆشاوی توو دەکوڵێنن و تێی دەکەن تا وای لێدێت بەکەڵکی ئەوە بێت کە ڕۆنی تێبکەیت، بەڵام مەشکە بەجەوت خۆشەی دەکەن.هەروەها شێوازی بەکارهێنانیشی لەگەڵ مەشکەدا جیاوازە، چونکە مەشکە زیاتر بۆ ئاو بەکاری دەهێنن، بەڵام خیگە، بۆ هەڵگرتنی ڕۆن ئاژەڵ بەکار دەهێنرێت

وەرگێڕ.

هەرئەوەی شەو داهات تۆ دەبێت دەمی ئەم"خیگە"یە بکەیتەوە و بڕێك خوێن بەڕوخسار و دەست و سینەتدا بڕێژی و چەقۆکەش دەبێت لەتەنیشت خۆتەوە دانێیت.

من لەسەرەتای شەودا دێم و کاتێك خۆم دەکەم بەژورەکەی تۆدا دەڵێم: تۆ بەم چەقۆیە خۆت کوشتووە و تۆش لەوکاتەدا خۆت بکە بەمردوو، بۆ ئەوەی هەمویان لەوە دڵنیابن کە تۆ گیانت تێدا نەماوە.

ئەوکات من خزمەتکارەکان دەهێنمە ئەو باوەڕەی کە دەبێت تۆ لێرە ببەمە دەرەوەو لەوکاتەدا تۆ لەشتێك دەپێچم و لەویٚ دەرتدەکەم و لەدەرەوە دەست و ڕوخسار و سینەت دەشۆرم و لەگەڵ خۆمدا دەتبەم.

"مینا"ڕازی بوو کە بەپێی فەرمانەکانی ئەو ڕەفتار بکات و منیش لەژورەکەی هاتمە دەرەوە و بە خزمەتکارەکانم وت کە هیچ کەسێك ئیتر خزمەتکاری ئەم ماڵە یان ژنی ئەم ماڵە بێت نابێت خۆی بکات بەژوری"مینا"دا، چونکە ئەگەر کەسێك دەرگای ئەو ژورەی بکاتەوە و خۆی بکات بەژوردا، ڕۆحە زیانبەخشەکان کە بەهۆی ئەو دەرمانەوە لەجەستەی"مینا" دێنە دەرەوە، لەکاتی چونە ژورەوەیاندا دەچنە جەستەی ئەوان و دواجار ئەوان وەك ئەو کچە شێت دەکەن و خۆشم لەسەرەتای شەودا سەردانێکی تری دەکەمەوە و خۆم دەکەم بەژورەکەی ئەودا.

خزمەتکارەکان بەترسەوە وتیان: دڵنیابە کە ناهێڵین هیچ کەسێك خۆی بکات بەژورەکەی ئەودا و ئێمەش خۆمانی لیٚ نزیك ناکەینەوە.

دوای ئەوە ڕۆشتم بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی و بینیم بەندەکەم هێشتا لەتەلاری میواندارییە.

بەڵام کۆمەڵێك لەوکەسانەی کە سەرقاڵی خواردنەوە بون، بەهۆی مەستیانەوە لەو تەلارەدا خەویان لێکەوتبوو و ئەوانیتر کەم تا زۆریان مەستبون، بەڵام"بۆرا بۆریاش" هۆش و هەستی لەسەر خۆی بوو.

خۆر بەڕادەیەك هاتبووە خوار کە تیشکە ئەرخەوانیەکانی لەناو ژوری تەلاردا دەدرەوشانەوە و منیش لە"بورابوریاش"م پرسی: چ ڕۆژێك جەژنی پادشای درۆینە کۆتایی پێدێت.

ئەویش وتی: کاتێك خۆر لەپشت ئەو ڕووبارەوە ون بێت، کۆتایی بەم جەژنە دێت و بەندەکەی تۆش بەو ژەهرەی کە بۆی دەڕێژنە ناو شەرابەوە دەرخواردی دەدەن و دەمرێت، دوای ئەوە لاشەی دەکەنە ناو کاسەیەکی گڵێنەوە و دەیبەنە ناو ژێرزەمینەکەم و لەپاڵ ئەو کەسانەی کە لەهەمان ئەم ڕۆژەدا بەکوشت دراون دادەنرێت.

وتم: "بورابوریاش" بەندەی من، وەك خۆم خەڵکی میسرە و خەتەنەشیان کردووە و خوداکانی ئێمە دەڵێن، کاتێك مرۆڤ دەمرێت، دەبێت لاشەی مۆمیا بکەن، بۆئەوەی لەجیهانێکی تردا بەزیندوویی بمێنێتەوە.

"بورابوریاش"وتی:کاتێك لاشەی مۆمیاکرا، چی لێ دەکەن؟.

وتم: دوای ئەوەی لاشەیمان مۆمیاکرد، دەینێژین.

"بورا بوریاش"وتی: من ڕازیم کە بەندەکەی خۆت بەپێی نەریتی خۆتان مۆمیا بکەیت، بەڵام دوای ئەوە دەبێت لاشەکە بدەیتەوە بەخۆمان، بۆئەوەی بیخەینە ناو ئەم کاسە گڵێنەوە و لەژێر زەمینذا داینێین.

وتم: مۆمیاکردنی لاشەی کەسە وەجاخزادەکان شەست تا حەفتا ڕۆژ درێژە دەکێشێت، بەڵام لاشەی بەندەکان دەتوانرێت لەماوەی سێ ڕۆژدا مۆمیا بکەین.

"بورابوریاش"وتی: زۆرباشە لاشەکەی لەماوەی سێ ڕۆژدا مۆمیا بکە.

منیش وەڵامم دایەوە: ناتوانم ئەم کارە لێرەدا ئەنجام بدەم، لەبەرئەوەی ئەگەر لاشەی بەندەکەی خۆم لەم کۆشکەدا مۆمیا بکەم، هەموو ئەو کەسانەی کە لێرە دانیشتوون، بۆ نموونە تۆ، بەهۆی بۆنی هەڕەشەئامێزی ئەم تەرمەوە دەمریت و دەبێت ئەوەت پێ بڵێم ئەم لاشەیە، یەکسەر دەبێت مۆمیا بکرێت، ئەگینا هەوای گەرمی "بابل" هەر ئەمشەو لاشەکەی دەگەنێنێ و ئەوکات ناتوانین مۆمیای بکەین، هەر لەبەرئەوەش تۆ ڕێم پێ بدە ئەمشەو هەر ئەوکاتەی بەندەکەی من دەمرێت، من لاشەکەی لەم کۆشکە ببەمە دەرەوە بۆئەوەی لەکەنار ڕووباردا لەشوێنێکی دووردا، مۆمیای بکەم و لەم شەوەوە کە من لەم کۆشکە دەڕۆمە دەرەوە تا سێ ڕۆژی تر تۆ من نابینی و نابێت بیشبینی، چونکە لەم سێ ڕۆژەدا لەتۆ نزیك ببمەوە بۆنی ئەم لاشەیە دەبێتە هۆی مەرگی تۆ.

"بورا بوریاش" وتی: منیش تا ئەم سێ ڕۆژە هیچ کارێکم پێت نیە، تا ئەو کاتەی خۆت دێیت بۆ لام.

لاو تەماشایەکی خۆری کرد و ئەویش وتی: لەبەرئەوەی خۆر لەپشت ڕوبارەوە ون بووە کەواتە جەژن کۆتایی پێهاتووە و تا چەند ساتێکی تر زەهرەکە دەرخواردی بەندەکەتی دەدەن و بڕۆ خۆت چاوێری لەم کارە بکە کە بەئامادەبونی تۆ کە پزیشکی ئەو زەهرە دەرخواردی ئەو پیاوە بدەن... لەکاتێکدا ئێمە سەرقاڵی ئەم گفتوگۆ بوین، من بەهۆی هەلومەرجی خزمەتکارانی کۆشکی فەرمانڕەواییەوە تێگەشتم کە جەژنی پادشای درۆینە کۆتایی پێهاتووە، چونکە هەموویان بەیەکەوە لەچواردەوری "کاپتا" دور کەوتنەوە، بەڵام"کاپتا"کە بەهۆی خواردنەوەی شەراب مەست بوبو، نەیدەتوانی پەیی بەگۆڕانی ڕەفتاری خزمەتکارەکان ببات.

من خۆم گەیاندە لای پزیشکی"بورابوریاش" و پێم وت:کە پادشا فەرمانی بەمن داوە خوم زەهر دەرخواردی ئەو پیاوە بدەم کە ئەمڕۆ پادشای درۆینەی "بابل" بووە.

ئەو پزیشکەش قسەکانی منی لا پەسەندبوو، چونکە سەرەڕای ئەوەی وای دەزانی من درۆی لەگەڵدا ناکەم، لەڕۆژی پادشای درۆینەدا ئەوندە شەرابی خواردبویەوە کە نەیدەتوانی لەسەر هەردوو پێی خۆی ڕاوەستێت و هەرئەوەی زانی کاری دەرخواردانی ژەهر بە"کاپتا" من لەئەستۆی دەگرم، زۆر خۆشحاڵ بوو و وتی: ئایا دەزانی دەبێت بەکام ژەهر بیکوژیت؟

وتم: بەڵێ من لەڕێی پزیشکە"بابل"یەکانەوە ئاشنای هەموو ژەهرەکانی تر بوم.

پزیشکی پادشاش بەهۆی مەستی لەڕادەبەدەریەوە کە بەچەپ و ڕاستدا دەکەوت وتی: بەڵێ دوای ئەوەی بەندەکەت مرد، من دەبێت پشکنینێکی تەواوی بۆ بکەم، بۆئەوەی دڵنیابم لەوەی کە مردووە.

وتم: هەر ئەو کاتەی مرد، من دێم ئاگادارت دەکەمەوە، بۆئەوەی بێیت و پشکنینی بۆ بکەیت.

پزیشکی پادشای "بابل"یش وتی: کەواتە من دەڕۆم دەخەوم و کاتێك بەندەکەت مرد، وەرە و ئاگادارم بکەرەوە، ئەگەر خەوتبوم، هەڵمسێنە.

وتم: هەمان کار دەکەم بۆئەوەی بزانی بەندەکەی من مردووە یان نا.

کاتێك لەپزیشکی پادشای جیا بومەوە، برێك تلیاکم ڕشتە ناو شەرابەوە، بەڵام ئەوەندە تلیاکم تێکردبوو کە بەندەکەم دوای خواردنەوەی ئەو شەرابە بەشێوەیەك لەهۆش خۆی بچێت کە چیتر واهەست بکەن کە مردووە.

دوای ئەوەی بەو شەرابە ئاوێتە بەتلیاکەوە ڕۆشتم بۆ لای"کاپتا"و پێم وت: تۆ ئەمڕۆ پادشای چوار وڵاتیت و هەموویان لەم ڕووەوە تۆ باش دەناسن و منیش لایەنگری ئەوە دەکەم کە تۆ پادشای"بابل"یت.

بەڵام هەربەوشێوەی دەزانی من نەهاتوم کە بۆ هەمیشە لە"بابل"دا بمێنمەوە و ئێستا دەمەوێت بڕۆم، بەڵام پێش ئەوەی بڕۆم یەك ئارەزوم هەیە کە دەبێت بێتە دی.

"کاپتا"پرسی: چ ئارەزویەکت هەیە؟

وتم: ئارەزوی ئەوە دەکەم کە بەدەستی خۆم یەك پێك شەرابت پێبدەم، بۆئەوەی دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆ میسر بتوانم بەهەموو خەڵکی بڵێم کە من"سینۆهە"ی ناسراو بە کوڕی کەر، کەسێکم کە بەدەستی خۆم شەرابم دەرخواردی پادشای "بابل"داوە، بۆئەوەی لەوکاتەدا خەڵکی بەمەزنیەکەوە تەماشام بکەن و پشتگیری ئەو مەزنیەتیەم بکەن.

"کاپتا"وتی:من ئەمڕۆ بەپێی پێویست شەرابم خواردووەتەوە و چیتر حەز لەخواردنەوە ناکەم، بەڵام لەبەرئەوی تۆ دەڵێی ئارەزوی ئەوە دەکەیت بەدەستی خۆت شەرابم پێ بدەیت و منیش ئەمڕۆ کەسێك نەبوم کە پێکی شەرابی هیچ کەسێك ڕەت بکەمەوە، ئەو پێکەش بەدەستی تۆ دەخۆمەوە، وەك بڵێی دەزانم لەوانەیە بەشێوەیەك مەست ببم کە نەتوانم لەجێی خۆم هەستم.

ئەوکات پێکی شەرابی لەدەست وەرگرتم و بەیەك قوم هەڵیدایەوە دوای ئەوە پێکە خاڵیەکەی فڕێ دا.

لەمکاتەدا چراکان داگیرسان و بێدەنگی باڵی بەسەر کۆشکی فەرمانڕەواییدا کێشا، چونکە هەموویان زانیان چیتر کاتی خۆشی وشادی کردن تەواو بوو و ئەگەر کەسێکیش هەوڵی ئەوە بدات خۆشی و شادی لەخۆی نیشان بدات بەکوشت دەدرێت.

دوای چەند ساتێك بەندەکەم، تاجی فەرمانڕەوایی لەسەر داکەند و وتی: ئەم کڵاوە بۆ سەری من زۆر تەنگە و فشاری بۆ سەرم هێناوە بۆیە ئێسقانی سەرم ئازار دەدات،

هەست بەشلیەك لەپێكانمدا دەكەم و پێڵوەكانیشم وردە وردە خەریكە قورس دەبن و واهەست دەكەم خەریكە خەوم لێدەكەوێت.

"كاپتا"لەهەمان ئەو شوێنەی كە دانیشتبوو ڕاكشا و دوای چەند ساتێك خەوی لێكەوت و من دەمزانی كە خەوی ئەو لەو تلیاكەوە سەرچاوەی گرتووە، دوای چەند خولەكێكی تر، وردە وردە قورس دەبێت و وای پێدێت كە هەركەسێك چاوی بە"كاپتا" بكەوێت، وا دەزانێت گیانی دەرچووە.

خزمەتكاری كۆشكی فەرمانڕەوایی ئەو تاجەی كە"كاپتا"لەسەری داكەند خستیە سەری"بورابوریاش"و جلی پادشایی لەبەركرد و پادشای ڕاستەقینەی"بابل" لەسەر تەختی پادشایی دانیشت و دوای ئەوە وتی: سەرەڕای ئەوەی ئەمڕۆ ڕۆژی جەژن و خۆشی بوو، من زۆر ماندووم و دەبێت بخەوم و زۆر زووش ئەو كەسانەی كە بەهۆی مەستیانەوە لێرە خەویان لێكەوتووە، بەزۆری گورز لەكۆشكی فەرمانڕەوایی بیانكەنە دەرەوە و ئەم گەمژەیەش-دەستی بۆ كاپتا ڕاكێشا- كاتێك بەتەواوی گیانی دەرچوو بیخەنە ناو كاسە گڵێنەیەكەوە.

خزمەتكاری كۆشكی پادشای"بابل"بەشێوەیەك بەگورزی دەستی كەوتە گیانی مەستەكان و ئەوانەی خەویان لێ كەوتبوو، كە لەماوەی چەند ساتێكدا مەستەكان هاتنەوە هۆش خۆیان و خەوتووەكانیش لەخەو هەستان و هەموویان پێكەوە هەڵهاتن.

منیش لە"كاپتا"نزیك بومەوە و تەماشام كرد كە تەواوی هێما وێنەییەكانی مەرگ لەڕوخساریدا پەیدا بووە، دوای ئەوە بەبەندەكانم وت:بڕۆن و بەپزیشكی پادشا بڵێن بێت بۆ ئێرە و پشكنینێك بۆ ئەم پیاوە بكات، بۆئەوەی لەوە دڵنیا بێت كە مردووە، لەوكاتەدا بەندەكان ڕۆشتن و پزیشكی پادشای"بابل"یان لەگەڵ خۆیاندا هێنا كە لەكاتی مەستیدا خەوی لێكەوتبوو و زیاد لەنیو كاتژمێر نەخەوتبوو و هێشتا مەستی لەسەری دەرنەپەڕیبوو و بەچاوەی نیوە كراوەوە هات.

من دەمزانی لەو حاڵەدا تاقەتی ئەوەی نیە پشكنینێكی تەواوی بۆ بەندەكەم بكاتو ئەگەر پشكنینی تەواویشی بۆ بكات، دەگاتە ئەو باوەڕەی كە مردووە.

بەڵام پزیشکی پادشای"بابل" کە دەیویست هەرچی زووتر بگەڕێتەوە و بخەوێت، بۆیە هەڕەمەکی تەماشایەکی بەندەکەمی کرد و وتی، بێگومان مردووە، هەرئێستا بیخەنە ناو گۆزەیەکی گڵینەوە و دەمی گۆزەکە بەقوڕی خۆشەکراو ببەستن.

بەندەکانی"بۆرابوریاش"بەندەکەی منیان خستە ناو گۆزەیەکی گڵینەوە و کاتێك سەرقاڵی ئامادەکردنی قوڕە خۆشەکراوەکە بوون من بەڵێنی پادشام هێنایەوە یاد"بورابوریاش" و وتم: دەبێت تەرمی"کاپتا"م پێ بدەیت بۆئەوەی ببەم و مۆمیای بکەم.

"بورابوریاش"بە بەندە و خزمەتکارەکانی وت: "سینۆهە"ی پزیشکی میسر ڕێگای پێدراوە تەرمی ئەم پیاوە لەم کۆشکەی من بباتە دەرەوە و مۆمیای بکات و هیچ کەس نابێت ڕێی لێ بگرێت و ببێتە مایەی دەردیسەری ئەو و ئاگاتان لەخۆتان بێت کە دوای ئەوەی لێرە ڕۆشتە دەرەوە، بۆماوەی سێ ڕۆژ و شەو پێ نەنێتە ئەم کۆشکەوە و ئەگەر ویستی بێتە ناو ئەم کۆشکەوە دارکاری بکەن، چونکە سەرقاڵی مۆمیاکردنی تەرمی ئەو پیاوەیە و لەوانەیە بۆنی هەڕەشەئامێز لەگەڵ خۆیدا بهێنێتە ناو ئەم کۆشکەوە و ببێتە مایەی لەناو چونی من.

منیش کە پێش وەخت گەڕاوەیەکم ئامادەکردبوو، ئەو گۆزە گەورەیە کە تەرمی"کاپتا"ی تێدا بوو لێ وەرگرتن و خستەمە سەر ئەو گەڕاوەوە و لەڕێدا پێش ئەوەی لە کەڕاوەکە نزیك ببمەوە، چەند کونێکم کردە ئەو قوڕە خۆشەکراوەی کە دەمی گۆزەکەیان پێگرتبوو، بۆئەوەی بەندەکەم نەخنکێت.

کاتێك دڵنیابوم کە"کاپتا"لەکۆشکی پادشای بابل"هاتووەتە دەرەوە و لەناو ئەو گۆزەیەدایە و خراوەتە سەر گەڕاوەکەوە، دوای ئەوە یەکسەر ڕۆشتم بۆ ماڵی"بورابوریاش" و بەخزمەتکارەکانم وت:دەڕۆم بۆ ئەوەی تەماشای کاریگەری دەرمانەکەم لەسەر"مینا"ببینم.

کاتێك خۆم کرد بەژورەکەی"مینا"دا تێگەشتم کە فەرمانەکانی منی جێبەجێ کردووە و دەست و سینە و ڕوخساری خوێناوی کردووە و چەقۆ خوێنینەکەشی لەتەنیشتیەوە داناوە.

بەترس و تۆقانێکی درۆینەوە لەو ژوورە هاتمە دەرەوە و بانکی خزمەتکارەکانم کردو پێم وتن: مەگەر ئێوە شێت بون کە دوبارە ڕێتان پێداوە چەقۆیەکی تر بەدەست بهێنێت، بۆئەوەی خۆیی پێ بکوژێت.

کاتێك خزمەتکارەکانی چاویان بەخوێن کەوت، لەرزیان لێ هات و هیچ کەسێك نەیوێرا لەو کچە نزیك ببێتەوە و بزانێت ئایا"مینا"بەڕاستی مردووە یان هێشتا گیانی تێدا ماوە، چونکە خزمەتکارەکان زۆر لەخوێن دەترسن و بەهیچ شێوەیەك ئامادە نین لەجەستەیەکی خوێنینەوە نزیك ببنەوە.

هەموویان بەلەرز و شێواویەکەوە تەماشایان دەکردم و چاوی تۆقاویان پرسیاری ئەوەی لێ دەکردم کە ئێستا چی بکەین؟ بەوانم وت: لەم ڕوداوەدا ئێوە بەئەندازەی من یان لەمن زیاتر بەرپرسیارەتیتان لەئەستۆدایە، چونکە من پزیشکم و هاتوم چارەسەری ئەم ژنە شێتە بکەم، جاریی یەکەم لەبەرچاوی ئێوە ئەم چەقۆیەم لەدەست سەند، بەڵام نازانم ئەو بەچ شێوەیەك توانیویەتی چەقۆیەکی تر بەدەست بهێنێت و خۆیی پێ بکوژێت.

ئێستا تاکە ڕێگەچارە ئەوەیە کە من ئەم ژنە لەبەرەیەك بپێچم و لێرە بیبەمە دەرەوەو ئێوەش هەر ئەمشەو یان سبەی بەیانیەکەی کەنیزەیەکی تر بکڕن و لەباتی ئەودا داینێن، ئەگەر"بورابوریاش"پرسی بۆچی سەر و ڕوخساری ئەم کەنیزەیە گۆڕاوە، پێی بڵێن لەبەرئەوەی ئەو شێت بووە و ڕۆحە ئازار بەخشەکان ئاوێتەی جەستەی بون و گۆڕانکاریان بەسەر و ڕوخساریدا هێناوە.

خزمەتکارەکان تەماشای یەکتریان کرد و پرسیان ئێمە لەکوێوە کانزا بەدەست بهێنین بۆئەوەی کەنیزەیەکی پێ بکڕین.

وتم:من نرخی کەنیزەیەکتان پێدەدەم و کاتێك کەنیزەیەکی تازەتان کڕی و هێناتان بۆئەم ماڵە جوان بیڕازێننەوە و فێری نەریتی پەسەندکردنی لەلایەن"بورا بوریاش"ەوە بکەن. و من دڵنیام کاتێك پادشای"بابل" چاوی پێی بکەوێت کە کەنیزەکەی ماڵی بووە بەڕادەیەك خۆشحاڵ دەبێت کە ئاگای لەگۆڕینی ڕوخساری نابێت. دوای ئەوە پارچە زێڕێکم دا بە خزمەتکارەکان کە زیاتر لەنرخی کەنیزەیەکی جوانە و ئەوانیش بەرەیەکیان بۆ هێنام و منیش"مینا"م لەو بەرەیە پێچا و بێئەوەی خۆم بە ڕونکردنەوەکانەوە دوا بخەم"مینا"م خستە سەر شانم و لەو ماڵە چومە دەرەوە،

چونکە دەمزانی کاتێک دەبێت کارێک بەخێرایی ئەنجام بدرێت هەرچەنێک کەمتر لەبارەیەوە بدوێیت باشترە، چونکە بەهۆی قسەی درێژخایەنەوە چەند گرفتێکت لەکارەکەدا بۆ دێتە پێشەوە کە دەبێتە هۆی ترس و گومانی کەسە لاوازەکان و تەواوی خزمەتکارەکانیش کەسانی لاواز و ترسنۆك بون.

"مینا"شم گواستەوە بۆ کەژاوەکە و خۆشم سواری گەژاوەکە بوم و کەوتینە ڕێ تائەوەی لەڕوبارەکە نزیك بوینەوە.

پێش ئەوەی بگەینە نزیك ڕوبارەکەوە، بەکۆڵبەرەکانم وت: کەژاوەکە لەسەر زەوی دانێن و سەرەتا ئەو گۆزە گڵینەی کە"کاپتا"ی تێدایە لەڕێی کۆڵبەرەکانەوە گواستمەوە بۆ ناو گەشتیەکە.

ئەوکات بەکۆڵبەرەکانم وت: ئێوە کەژاوەکە دور بخەنەوە بۆئەوەی منیش ڕۆحی بەندەکەی خۆم لێرە دور بخەمەوە و کاتێك دەگەڕێنەوە من نابینن، چونکە چیتر من ڕۆشتوم، بەڵام کەژاوەکەتان لەجێی خۆیدا دەمێنێتەوە و دەتوانن هەڵیگرن و بگەڕێنەوە بۆ کۆشك.

دوای ڕۆشتن و دور کەوتنەوەی کۆڵبەرەکان من"مینا"م لەکەژاوەکە هێنایە دەرەوەو بردمە کەنار ڕوبارەکەوە و لەناو بەڕەکە دەرم هێنا بۆئەوەی دەست و ڕوخساری خۆی بشۆرێت.

دوای ئەوەی لەگەڵ "مینا"دا سواری کەشتیەکە بوم و لەتاریکی شەودا کەشتیەکەمان کەوتە ڕێ و لەکەنار دور کەوتەوە.

سەوڵ لێدەرەکان بەبینینی"مینا" سەریان سوڕ نەما، چونکە من بەوانم وتبوو لەگەڵ کەنیزەکەی خۆمدا کۆچ دەکەم و ئەوانیش وایان دەزانی کە ئەو کەنیزەی منە.

بەم شێوەیە، من لەشەوێکدا"بابل"م لەدوای خۆمەوە بەجێ هێشت و خۆم لە وڵاتێك دور خستەوە کە لەوانەبوو لەوێدا لەڕێی پیشەی پزیشکیەوە سەروەت و سامانێکی زۆر ببێتە بەشم.

*بەشی هەژدەیەم*

## مینا و هاتنەوەی هۆشی کاپتا

کاتێك ئەوەندە لەشار دور کەوتینەوە کە چیتر ڕۆشنایی شاری"بابل"مان نەدەبینی،"مینا" بەزمانی میسری کە سەوڵ لێدەرەکان لێی تێنەدەگەشتن دەستی کرد بەقسەکردن و وتی: من ئەمشەو بەهۆی جێبەجێ کردنی فەرمانەکانی تۆ بۆگەنم کرد.

پرسیم: بۆچی بۆگەنت کردووە؟

"مینا" وتی: لەبەرئەوەی تۆ پێت وتم دەست و پێ و ڕوخسارم خوێناوی بکەم، هەرلەبەر ئەو خوێنە هەرچەنێك خۆم بشۆرم بۆنی ئەو خوێنەم لێنابێتەوە.

وتم: مەبەستت لەم قسەیە چیە.

"مینا"وتی: مەبەستم ئەوەیە کە تۆ منت فریوداوە و منت هانی ئەوە دا بەهۆی خوێناوی کردنی خۆمەوە بۆگەن بکەم.

وتم: کورە هەی ژنی نەفرەتی، من بەڕادەیەك ماندوم کە تاقەتی ئەوەم نیە قسەت لەگەڵدا بکەم، بهێڵە کەمێك بخەوم، چونکە ئەو زەحمەتەی ئەمڕۆ و ئەم شەو لەپێناو ڕزگار کردنی تۆدا داومە، یەکێکە بوو لەئەرکە قورسەکانی ژیانم و دوای دەرچونم لەقوتابخانەی"ماڵی ژیان"ی میسر هەرگیز گرفتاری وام بەخۆمەوە نەبینیوە، چونکە ئەگەر ئەو زەحمەتەی ئێمە دەیکێشین تەنها یەك جەستە بێت بەڕادەیەش قورس نیە، بەڵام کاتێك مرۆڤ سەرەڕای ئەوەی گرفتاری ئەرکی جەستەیەك ببێت، ئەرکی ڕۆحیشی لەئەستۆ بگرێت زۆر ماندوو دەبێت، بۆیە لەمڕۆدا من هەم گرفتاری ئەرکی

جەستەیی و هەم ڕۆحی بوم. سەرەڕای ئەو دوانەش، بۆ ڕزگار کردنی تۆ، من زیانێکی دارایی و سامانیی مەزنیشم لێکەوتووە.

چونکە ئەگەر تۆ نەبوایەیت و ئەو داوایەت لەمن نەکردایە بۆئەوەی ڕزگارت بکەم و لەماڵ بتفرێنم، من دوای چەند ڕۆژێکی تر، بەناونیشانی پزیشکی مەزن و پلە یەکی "بابل" لەلای ڕاستی پادشای ئەو وڵاتەدا ڕادەوەستام و ئەوەندە زێڕ و زیو دەبووە بەشم کە کەشتیەکی وەك ئەم کەشتیە ئێستای ئێمە سواری بوین توانای هەڵگرتنی باری زێڕ و زیوی منی نەبوو.

بەڵام تۆ منت ناچارکرد کە چاوپۆشی لەم سودە مەزنە بکەم و تۆ لە"بابل"بفرێنم، لەئایندەدا هەموو ساڵێك لەهەمان ئەم ڕۆژەدا کیسەیەك خۆڵەمێش بەسەرمدا دەڕێژم، بۆئەوەی ئەوە بهێنمەوە یاد خۆم کە ئەمڕۆ یەکێکە لەڕۆژە نەگبەتبارەکانی تەمەنم.

"مینا" وتی: ئەگەر تۆ ئەوەندە من بەهۆکاری نەگبەتیەکانی خۆت دەزانی، کەواتە باشتر وایە خۆم هەڵدەمە ناو ئەم ڕۆبارەوە بۆ ئەوەی لەدەستم ڕزگارت بێت. دوای ئەوە"مینا"جوڵەیەکی کرد بۆئەوەی خۆی لە کەشتیەکەوە هەڵداتە ناو ڕوبارەکەوە.

بەڵام گرتم و وتم:"مینا"من ئەمڕۆ زەحمەت و ئەرکێکی زۆرم کێشاوە، بەڵام سەرەڕای ئەوەش دڵم خۆشە لەبەرئەوەی تۆم ڕزگار کردووە و ئەگەر تۆش خۆت هەڵدەیتە ئەم ئاوەوە و نوقم ببیت، ئەکات بەدبەختیەکانم مەزنتر دەبن، چونکە تێدەگەم دوای ئەو هەموو زەحمەتەی کە کێشاومە، نەمتوانی ڕێ لەمەرگی تۆ بگرم. بە تەواوی خوداکانی بابل و میسر و سوریە سوێندت دەدەم، ئەو بیرە لەمێشکتدا لابە و بخەوە، ئەگەر حەزیش ناکەیت بخەویت، لەگۆشەیەکدا بێدەنگ دانیشە، بۆئەوەی من بتوانم بخەوم.

ژن بێدەنگ بوو و لەگۆشەیەکی کەشتیەکەدا دانیشت و منیش بەو بەڕەی کە"مینا"م پێ پێچابوو خۆمم پێداپۆشی بۆئەوەی بخەوم.

چونکە سەرەڕای شەوی چواردەیەمی وەرزی بەهار بوو و بولبولەکان لەهەردوو لای ڕوبارەدا دەستیان کردبوو بەچڕین. لەقلەقەکان لەناو چڕە نەیجەکانی قەراخ ڕوباردا دەنگەدەنگیان نابویەوە، هەواش لەشەودا زۆر فێنك و خۆش بوو.

دوای چەند ساتێک"مینا"ش هاتە ژێر بەرەکەوە و وتی: لەبەرئەوەی دەزانم هەوا ساردە حەز دەکەم خۆم بەتۆوە بچەسپێنم، بۆئەوەی بەگەرمای جەستەم گەرمت بکاتەوە.

من بەهۆی دەنگی"مینا"وە خەوم لێکەوت و لەبەرەبەیاندا لەخەو هەستام و هەستم کرد کە کەشتیەکە ناجولێت، بۆیە هەستامە سەرپێ و بینیم کە سەوڵلێدەرەکان دەستیان لەسەوڵ لێدان هەڵگرتووە، و منیش پێم وتن: بۆچی سەوڵ لێنادەن.

ئەوانیش وتیان: ئێمە لەشەوەوە تا بەیانی سەوڵمان لێداوە و ئێستاش دەستمان وەك داری سەوڵەکەمان وشك هەڵهاتووە و کەمەرمان ئێش دەکات و ناتوانین سەوڵ لێبدەین، دەبێت نان بخۆین لەبەرئەوەی لادێیەك لەقەراخ ئەو ڕوبارەدا بەدی دەکرێت برۆ لەو لادێیە گۆشت و ماستمان بۆ بهێنە، بۆئەوەی تێر نان بخۆین. وتم ئێستا کاتی نان خواردن نیە و من کاتێك نیوەڕۆ بگەینە هەر ئاواییەك خواردنتان بۆ دەکڕم بۆئەوەی تێر نان بخۆن. من پێم وتن دەبێت زۆر زوو خۆم بگەیەنمە شوێن باوباپیرانی خۆم و ئەگەر ئێوە لێرەدا نان بخۆن ئەوا دوا دەکەوین و ئەوەش بزانن ئەگەر بتانەوێت سەرپێچی لەفەرمانەکانم بکەن، من جادوگەرێکی زۆر بەتوانام و دەتوانم فەرمانڕەوایی تەواوی ڕۆحە ئازار بەخشەکان بکەم بۆئەوەی هێرشتان بۆ بهێنن و گۆشتی جەستەتان پارچە پارچە بکەن و بیخۆن.

سەرەڕای ئەوەی"بابل"یەکان لەجادوو دەترسن، بەڵام ئەمانە لەم هەڕەشەیەی من نەترسان، چونکە دەیانزانی ڕۆژ بووەتەوە و خۆر بەلاسەریانەوە دەدرەخشێتەوە و لەڕۆناکی ڕۆژدا ڕۆحە زیانبەخشە ترسناکەکان نامێنن.

دوای ئەوە بینیم یەکێك لەوانە وتی: ئەو یەك کەسە و ئێمە دە کەس، بۆیە دەتوانین هەرچیمان بوێت لێی بکەین. سەوڵ لێدەرێکی تر کاتێك گوێ لەم قسەیە بوو سەوڵەکەی خۆی بەرز کردەوە بۆئەوەی بیکێشێت بەناوچاومدا، بەڵام لەمکاتەدا هاواری"کاپتا"ی بەندەم لەناو گۆزە گڵێنەکەدا بەرز بویەوە.

سەوڵ لێدەرەکان دڵنیابون لەوەی تەرمی مامم لەناو ئەو گۆزە گڵێنەدایە، کاتێك پەییان بەوە برد کە کابرای مردوو زیندوو بووەتەوە زۆر ترسان، یەك لەدوای یەك خۆیان هەڵدایە ناو ئاوەکەوە و کەشتی بێ سەوڵ لێدەر مایەوە، بەڵام من توانیم ئەو

کەشتیە بگەیەنمە کەنار ڕوبار و لەویٚ لەنگری کەشتیەکەم هەڵدایە ناو ئاوەکەوە بۆئەوەی خوڕەی ئاو نەیبات.

"مینا"لەخەو هەستابوو و خەریکی ڕێکخستنی قژی بوو و من بەبینینی ئەو زۆر خۆشحاڵ بوم، چونکە بینیم کە"مینا"زۆر لەوە جوانترە کە من لەماڵی"بورابوریاش"دا چاوم پێی کەوتبو.

"کاپتا"لەناو گۆزە گڵینەکەدا هاواری دەکرد و بەدەست و پێی دەیدا لە گۆزەکە و من لێی نزیك بومەوە و سەری گۆزەکەم شکاند، چونکە قوڕە خۆشەکراوەکە هێشتا بەتەواوی وشك نەبوبو.

"کاپتا"سەری لەگۆزەکەوە دەرهێنا و بەسەرسوڕمانەوە تەماشایەکی چواردەوری خۆی کرد و پرسی: ئێرە کوێیە و من لەکوێم و تاجی فەرمانڕەواییەکەم کوانیٚ؟ بۆچی پۆشاکی پادشاییم لەبەردا نیە؟ واهەست دەکەم ڕوتم و سەرمامە و هەردوو پێم بەشێوەیەك سڕ بون، وەك بڵێی مارێکی ژەهراوی پێکانی گەستبم....سینۆهە...ئاگات لەخۆت بێت ئازار و فریوم نەدەیت، لەبەرئەوەی من پادشای"بابل"م و پادشاش ئەو جۆرە کەسانە نیە کە گاڵتەی پیٚ بکرێت و فریو بدرێت.

منیش بۆئەوەی تەمێی"کاپتا"بکەم، بۆئەوەی قەرەبوی ئەو بێشەرمیانەی دوێنێی بداتەوە وتم: ئەوەت لەبیر چووە کە دوێنیٚ کاتێك لە"بابل"دەردەچوین تۆ ئەوەندە شەرابت خواردبویەوە و مەست بویت ویستت لەناو ئەم کەشتیەدا ئازاری سەوڵ لێدەرەکان بدەیت و بەردەوام باسی ئەوەت دەکرد کە پادشای"بابل"یت و دادپەروەری بەرپا دەکەیت و سەوڵ لێدەرەکانیش کاتێك لەتۆ بێزار بون ناچاربون تۆ لەناو ئەم گۆزە گڵینەدا زیندانی بکەن، بۆئەوەی ئەوەند نەبیتەی مایەی بریندار کردنیان.

"کاپتا"چاوی داخست و ڕۆچووە هزری خۆیەوە و کاتێك چاوەکانی کردەوە وتی: من چیتر شەراب ناخۆمەوە، لەبەرئەوەی خواردنەوەی شەراب، منی دوچاری خەوێکی سەر سوڕهێنەر کرد و وا هەستم دەکرد کە پادشای"بابل"م و لەنێو خەڵکیدا دادپەروەری بەرپا دەکەم و دوای ئەوەش واهەستم کرد کە ڕۆشتبێتمە ماڵی "بورابوریاش"ی پادشای" بابل" و ویستم لەگەڵ ژنێکی نەزاندا چەند وشەیەك قسەی لەگەڵدا بکەم، بەڵام ئەو ژنە هێرشی بۆ بردم و بریندداری کردم و چەند شتێکی ترم بەسەر هات کە ئێستا لەبیرم نایەت، لەبەرئەوەی سەرم زۆر ئێش دەکات حەز دەکەم تۆ

لەو دەرمانەی کە دەیدەیت بەکەسە مەستەکان بۆ ئەوەی بێنەوە هۆش خۆیان، دەرخواردی منی بدەیت، بۆئەوەی ئەم مەستیەم لەناو بچێت و ئەم سەرئێشەیەم نەمێنێت.

کاتێك بەندەکەم ئەم قسەیەی دەکرد، لەناکاو لەسەر کەشتیەکەدا چاوی بە"مینا" کەوت و سەری کە لە گۆزەکەوە هێنابویە دەرەوە کردەوە ناو گۆزەکەوە و هاواری کرد و وتی: گەورەم من هێشتا خەو دەبینم، چونکە ئەو ژنەی کە من لەماڵی "بورابوریاش"دا بینیم، ئێستاش هەر دەیبینمەوە....ئەی خودای میسر... فریام کەوە، چونکە خەریکە شێت دەبم.

"کاپتا" لەناو گۆزە گڵێنەکەدا دەستی کرد بەگریان و سات لەدوای سات دەیوت: من خەریکە شێت دەبم، چیتر دوای ئەوەی بێمێشك دەبم و وەك کەسە شێتەکانی تر شاربەدەرم دەکەن.

"مینا"لەگۆزەکە نزیك بویەوە و قژی"کاپتا"ی گرت و سەری لەگۆزەکە هێنایە دەرەوە و وتی: جوان تەماشام بکە، ئایا من دەناسی یان نە؟

"کاپتا" بەدەم گریانەوە وتی: تۆ هەمان ئەو کەسەیت کە لەخەومدا پەلامارت دام و لوت و لێومت بریندار کرد....ئەی خوداکانی میسر بەزەییتان پێمدا بێتەوە.....من لەم ژنە ڕزگار بکەن، ئەی خوداکانی میسر من دەزانم ئێوە لەمن توڕە بون، هەربۆیە ئەم ژنەتان هێنایە خەوم، چونکە دوای ئەوەی چومە ناو"بابل"ەوە، پەرستنی ئێوەم فەرامۆش کردووە و لەباتی ئێوە خوداکانی"بابل"م دەپەرست، بەڵام چیتر لەمەودوا، تەنها ئێوە دەپەرستم.

"مینا"پێڵاوەکانی لەپێ داکەند و دوو جار، بەڵام لەسەر خۆ کێشای بەڕوخساری"کاپتا"دا و وتی: لەبەرئەوەی تۆ لەخەوتدا سوکایەتیت پێکردم، کەواتە ئەم لێدانە سزای ئەو خەوە ناپەسەندەی تۆ دەبێت، بۆئەوەی بزانی ئێستا بێداریت و نەخەوتویت.

بەڵام"کاپتا"زیاتر دەستی کرد بەگریان و وتی: ئێستاش من هەر لەحاڵی خەودام لەبەرئەوەی لەخەویشمدا، بەم پێڵاوانە لێی دەدام، ئێستاش هەر بەو پێڵاوانەی پەلامارم دەدات.

منیش بە"کاپتا"م وت: ئێستا بەڕاستی هاتویتەتە هۆش خۆت، لەبەرئەوەش نابێت بگریت و لەم گۆزەیەش وەرە دەرەوە بۆئەوەی چارەسەری ئەم مەستیەت بکەم.

بەڵام"کاپتا"نەیدەتوانی لەوگۆزە گڵینەیەی کە تەڕ و شێدار بوو بێتە دەرەوە، من هاوکاریم کرد ئەوسا توانی لەو گۆزەیە بێتە دەرەوە و بۆئەوەی شەرابەکە بڕشێنێتەوە دەرمانێکی لینجاویم پێدا، چونکە ئەو دەرمانە دوای ئەوەی شەراب خۆر لەخەوێکی درێژخایەن هەڵدەستێت گاریگەری لە لەناوبردنی مەستی دەکات، هەروەها سەرەڕای مەستی شەراب، گرفتاری خوماری"تلیاك"یش بوبو و بۆئەوەی لەکاریگەری تلیاکیش ڕزگاری بکەم، پەتێکم بەورگیەوە بەست و هەڵمدایە ناو ئاوی ڕوبارەوە.

بەندەکەم، دوای ئەوەی تایبەتمەندیەکانی دەرمان تێدا دەرکەوت، زووتر لە مەستی شەرابەکە ڕزگاری بوو و وتی: چیتر هەست بەسەرئێشە ناکەم، بەڵام وەك بڵێی هێشتا بەتەواوی خەوم نەڕەوابێت، چونکە هێشتا حەز بەخەوتن دەکەم.

تێگەشتم کە ئارەزوی ئەو بۆ خەوتن، بەهۆی خوماری"تلیاك"ەوەیە کە زۆر زوو لەناو ناچێت و بۆ ماوەیەك بەردەوام دەبێت، بۆیە پێم وت: لەڕۆژی ئایندەدا هەست بەهیچ یەك لەم ئازارانە ناکەیت و بەتەواوی چاك دەبیتەوە چونکە بەهۆی تەمێکردنی ئەم ژنە و ئەو دەرمانانەی کە پێم داویت بەڕادەیەکی باش تەمێ کراویت و من لەقەرەبوکردنەوەی هەموو ئەو بێشەرمیانەی کە لەبەرامبەر مندا کردت دەتبەخشم.

"کاپتا" وتی: مەگەر من هیچ سوکایەتیەکم بەتۆ کردووە؟

وتم: بەڵێ، دوێنێ تۆ بەهۆی خواردنەوەی شەراب و گاڵتەجاڕی کەسانی تر، کەتۆیان کردبووە ئامێرێکی گاڵتەجاڕی خۆیان بەڕادەیەك بێشەرم ببویت کە دوو جاریش بێشەرمیت لەبەرامبەر مندا کرد، بەڵام بۆئەوەی بزانی جیاوازی نێوان خاوەندار و بەندەیەك چیە، دەتبەخشم، بەڵام ئەوەش بزانە دوێنێ شەو لەئاوابونی خۆردا، تۆم لەمەرگ ڕزگار نەکردایە، ئێستا تۆ، لەناو ئەم گۆزە گڵینەیەدا لەکەنار گۆزە گڵینەکانی تردا، لەژێر زەمینی کۆشکی پادشای" بابل"دا بویت، بەڵام ئەم گیانەی ئێستات تێدا نەبوو، چونکە"بورابوریاش" تۆی دەکوشت.

ئەوکات ڕوداوی دوێنێم بۆ بەڕونی بۆ گێڕایەوە و"کاپتا"باوەڕی نەدەکرد و وای دەزانی کەمن درۆی لەگەڵدا دەکەم، بەڵام ئامادە بونی"مینا"هانی ئەوی دا ئەوەی من بۆم گێڕایەوە باوەڕی پێبکات.

دوای ئەوەی تێمگەیاند دوێنێ ڕوبەڕوی چ هەڕەشەیەك بووەتەوە، پێم وت: سەرەڕای ئەوەی ئێمە لە"بابل" هەڵهاتوین، بەڵام هێشتا بەو ڕادەیەش لەو شارە دور نەکەوتوینەتەوە تا وا هەست بکەین لەهێمنی و ئارامیدا دەژین و ئەگەر پادشای"بابل"دەستگیرمان بکات، سەرەوخوار هەڵمان دەواسێ.

سەوڵ لێدەرەکانی ئەم کەشتیەش هەڵهاتن و ئێمە نەمانتوانی ئەم کەشتیە لێخوڕین و خۆمان بگەیەنینە وڵاتی"میتانی"و تۆ کە بەندەی منی، ئێستا دەبێت بیر لەڕێگە چارەیەك بکەیتەوە بۆئەوەی زووتر و زیاتر لە"بابل"دور بکەوینەوە و لەدوێنێ ئێوارەوە تا ئێستا هیچمان نەخواردووە، پێویستمان بەخواردنە، بۆیە بڕۆ لەو گوندەی کە زۆر لێمانەوە دورە خواردنمان بۆ بکڕە و بۆمان بهێنە و لەکاتی ڕۆشتن و گەڕانەوەتدا مێشکت بخەرەکار و بیر بکەرەوە کە ئێمە بەچ شێوەیەك دەتوانین هەڵبێین و گیانی خۆمان لەتوڕەیی"بورابوریاش" ڕزگار بکەین.

"کاپتا"بەدوو ئەنگوستیلەی مسینەوە ڕۆشت و بەکۆڵە بارێکەوە گەڕایەوە و بینیم دوو گۆزە خواردنەوە و بڕێك خواردن لەکۆڵەکەیدایەتی.

وتم:"کاپتا"ئایا بەبۆچونی تۆ دەبێت چی بکەین؟

"کاپتا"وتی:بەڵێ گەورەم، کاتێك من لێرەوە دەڕۆشتم بۆئەوەی خواردن بکڕم بیرم لێکردەوە و لەکاتی گەڕانەوەشمدا بیرم لێکردەوە و تێگەشتم دوێنێ من خەوم نەدەبینی و ئەوەی چاوم پێی کەوت لەبێداریدا ڕویداوە، بۆیە شەرابەکە هیچ تاوانێکی نەبووە، چونکە ئەوەی من بینیم لەمەستیەوە سەرچاوە ناگرێت و من هەڵە بوم کە ئەمڕۆ تۆبەی ئەوەم کرد کە چیتر شەراب نەخۆمەوە.

"کاپتا"ئەمەی وت و بێئەوەی چاوەڕوانی مۆڵەتی من بێت، یەکێك لەگۆزەکانی هەڵگرت و دەستی کرد بەخواردنەوە و سڵاو و درودی نارد بۆ خوداکانی میسر هەروەها درودی بۆ خوداکانی"بابل"یش نارد و دوای ئەوەی ئەوەندەی نۆشی کە چیتر نەیدەتوانی جێگەی شەرابی تر لەورگیدا بکاتەوە، گۆزەی نیوە خاڵی خستە ژێر بەرەی کەشتیەکەوە کە شوێنێکی فێنك بوو و لەناو کەشتیەکەدا ڕاکشا و خەوت.

من بەڕادەیەك لەم ڕەفتارەی توڕە بووم، بۆیە ویستم بەیەکێك لەسەوڵەکانی ئەو کەشتیە لێی بدەم و بەسزای خۆی بگەیەنم، بەڵام"مینا"ناڕازی بوو و وتی: بەندەکەی تۆ، کارێکی ژیرانەی کردووە و ئێمەش دەبێت ئەو بکەینە سەرمەشقی خۆمان و

دەست بکەین بەشەراب خواردنەوە بۆئەوەی کەمێك هێز و توانا بەدەست بهێنین، چونکە ئەمڕۆ ڕۆژێکی خۆشە و"بورابوریاش" گەر ئەمڕۆش بیەوێت، ناتوانێت ئێمە دەستگیر بکات و ئێمەش دەبێت سود لەم ڕۆژە بەهاریە وەرگرین کە گەنمی کەنار ڕوبارەکە سەوز بووە و لەقلەقەکانیش ئاوازی خۆیان دەخوێنن و مراویەکان بەملە درێژەکەیانەوە لەئاسماندا دەفڕن بۆئەوەی بڕۆن لەشوێنێکدا هێلانەیەك دروست بکەن و هێلکەی تێدا بکەن، لەوانەیە ڕۆژێکی وا کە بەو ڕادەیە خۆشە نەبێتە بەشمان.

ئەم قسانەی زۆر کاریان تێکردم و وتم:"مینا"کاتێك لە"بابل"دا بووم بۆ چاوپێکەوتنی ئەستێرەناسەکان ڕۆشتمە سەر منارەکەیان، پێیان وتم چارەنوسی مرۆڤ لەلایەن ئەستێرەکانەوە دیاری دەکرێت و ئێمە ناتوانین چارەنوسی خۆمان بگۆڕین، لەبەرئەوە پێشنیارەکەی تۆ پەسەند دەکەم و ئەمڕۆ لێرە بەخۆشی تێدەپەڕێنین و لەبەرئەوەی ئاو و هەوا گەرمە، زۆرباشە گەر بڕۆینە ناو ئاوی ڕوبار و کەمێك خۆمان فێنك بکەینەوە.

جلەکانی بەرمان داکەند و لەڕوباردا دەستمان بەمەلەکردن کرد، دوای ئەوەی فێنکمان بویەوە، گەڕاینەوە ناو گەشتیەکە و نانمان خوارد و شەرابمان نۆشی و "مینا" بۆئەوەی پێم نیشان بدات کە بۆ خودای خۆی بەچ شێوەیەك سەما دەکات، لەسەر کەشتیەکە دەستی کرد بەسەما کردن و من پێم وت:"مینا" لەوە زیاتر سەما مەکە.

ژن پرسی: بۆچی لەوە زیاتر سەما نەکەم؟

وتم: تۆ جوانی و لەکاتی سەماکردندا جوانتر دەبیت و کاتێك بەنیگاکانت کە وەك تیشکی ئەو مانگە وایە کە بەر ئاوی ئەم ڕوبارە دەکەوێت[45]، تەماشام دەکەیت، من هەست بەبێتاقەتی دەکەم.

---

[45] لێرەدا شێوازی نیگای ئەو ژنەی بە تیشکی مانگ شوبهاندووە......بەڵام شوبهاندنەکانی ئەم کتێبە هەمووی میسری کۆنە و نوسەری سەرەکی ئەم کتێبە تەواوی ڕودا و بابەتەکانی لەمێژووەوە وەرگرتووە لەبەرئەوەش خوێنەر نابێت ڕەخنەی ئەوە بگرێت کە بۆچی ئەم جۆرە دەربڕینە نامۆیە لەئەدەب و نوسینی کوردیدا بەکار دەهێنێت، ئێمە لێرەدا دەمانەوێت دەقاودەق بەپێی نەریت و شێوازی دەربڕینی میسری کۆن ڕوداوەکان بگێڕینەوە هەروەك چۆن"سینۆهە" لێرەدا باسی دەکات

بەڵام نەمدەویست بەژنێك بڵێم خوشکی منیت، چونکە جارێکیان ژنێکم کردە خوشکی خۆم و بەشێوەیەك منی بەدبەخت کرد کە هیچ پزیشکێکی میسری تا ئەمڕۆ ئەوەندە بەدبەخت نەبووە.

"مینا"وتی: ئاشکرایە لەوڵاتەکەی تۆدا ژنەکان پیاوان فریو دەدەن و دواجار بەدبەختیان دەکەن، بەڵام مەبەستی ئەوەم نیە تۆ فریو و بەدبەختت بکەم، خودای منیش وتویەتی کە نابێت خۆم بدەم بەدەست پیاوانەوە، جگە لەوکاتەی خۆم پیاوێکم لا پەسەند بێت و من هێشتا ئەو پیاوەی کە دەبێت لەگەڵیدا ڕابوێرم پەسەند و دەستنیشان نەکردووە، بەڵام پێم بڵێ ئەو ژنەی تۆی بەدبەخت کرد خەڵکی چ وڵاتێك بوو و بەچ شێوەیەك تۆی بەدبەخت کرد.

وتم: ئەو بۆئەوەی ببێتە خوشکم، تەواوی بونایەتیمی لێ سەندم، بگرە ناچاری کردم کە گۆڕی دایك و باوکیشمی پێ بفرۆشم و چیتر نەمتوانی دایك و باوکم لەو گۆڕدا بنێژم.

"مینا" وتی: ئایا مەبەستت لەخوشك ئەوەیە کە دەتویست لەگەڵ ئەو ژنەدا ڕابوێری؟

وتم: بەڵێ.

"مینا"وتی: ئایا ئەو لەبەرامبەر ئەوەی لەگەڵتدا ڕابوێرێت، ئەوەی هەتبوو لێی سەندی و تۆشی هانی ئەوە دا کە گۆڕی دایك و باوکیشت بفرۆشی.

وتم: بەڵێ.

"مینا" وتی: ئەو ڕەوشە، تەنها تایبەت بوو بەو ژنە، یان ئەوەی لەوڵاتی تۆدا تەواوی ژنەکان وان و بۆئەوەی بهێڵن پیاوێك لێیان بەهرەمەند بێت هەرچی هەیە لێی دەسێنن؟

وتم: ژنەکانی تر بۆئەوەی پیاوێك لێیان بەهرەمەند بێت، لەبەرامبەردا شتێك لەو پیاوە وەردەگرن، لەمیسردا هیچ ژنێك بێئەوەی لەبەرامبەردا شتێك وەرنەگرێت، نابێتە هاوسەری[46] هیچ پیاوێك.

---

[46] بەهرەمەند بون و خوشك و هاوسەر، ئەم سێ وشەیە بەمەبەستی واتای"ڕابواردن" لەزمانی میسری کۆندا بەکار دێت......وەرگێڕ.

"مینا"وتی: ئەمە نەریتێکی دڕەندانەیە و ئەگەر من باش لەمەبەستت تێگەشتبم، لەمیسردا، هەر پیاوێك بیەوێت ژن بهێنێت، دەبێت زێڕ و زیو بدات و ئەو وەك کەنیزەیەك بکڕێت، ئەگینا بەهیچ شێوەیەك لەو ژنە بەهرەمەند نابێت.

وتم: وایە، بەڵام ڕێژەی زێڕ و زیوەکان جیاوازیان هەیە و ئەو پیاوانەی کە دەوڵەمەندترن، بۆ کڕینی ژنێك، زێڕ و زیوێکی زیاتر دەدەن.....

"مینا"وتی: لەمحاڵەتەدا نابێت سەرمان لەوە سوڕ بمێنێ، بۆچی ژنانی لەشفرۆش لەمیسرەوە دێن، چونکە لەشوێنێکدا کە ژن و مێردایەتی بە کانزاکانەوە پەیوەست بکرێت و تا ئەوکاتەی پیاوێك کانزا نەبەخشێت، ناتوانێت ژن بهێنێت و تا ژنێکیش کانزای خۆی وەرنەگرێت ناتوانێت هاوسەرێك بۆ خۆی هەڵبژێرێت، چیتر لەم حاڵەتەدا ژن و مێرد بەیەکەوە پەیوەست نابن و تەنها بەسامان و کانزاوە پەیوەست دەبن و هەرکەسێك کانزایەکی زیاتر بدات جەرگی خۆی پێ دەبەخشێت، بەڵام من خەڵکی وڵاتێکم کە لەوێدا ژن و پیاو لەبەر کانزا و سامان لەگەڵ یەکتردا هاوخەوی ناکەن و ئەوشتانەی کە خوداکان بەخۆڕایی پێی بەخشیون نایخەنە بازاڕی هەڕاجەوە، لەوڵاتی ئێمەدا هەرگیز ئەوە بەرگوێ نەکەوتووە کە ژنێك بۆئەوەی پیاوێك لێی بەهرەمەند بێت، بونایەتی لێی زەوت بکات، چ بگات بەوەی گۆڕی دایك و باوکیشی پێ بفرۆشێت.

لەوێ هەرئەوەی ژن و پیاو یەکتریان پەسەند کرد، دەبنە ژن و مێردی یەکتر و نە ژن شتێك لەپیاو وەردەگرێت و نە پیاویش شتێك بەژن دەبەخشێت، من ئەگەر خۆم تەرخانی خودای خۆم نەکردایە، هەر پیاوێك کە خۆم پەسەندم بکردایە وەك هاوسەرێك بۆخۆم هەڵمدەبژارد و ئەمڕۆش کە خۆم تەرخانی خودای خۆم کردووە، سەرەڕای ئەوەش دەتوانم ئەو پیاوەی کە خۆم پەسەندی دەکەم وەك هاوسەرێك بۆخۆم هەڵیبژێرم، بەمەرجێك پەردەی کچێنی خۆم سەرەتا بەخودای خۆم ببەخشم، دوای ئەوە پێشکەشی هاوسەرەکەمی بکەم.

وتم:"مینا"جیهان فراوانە و لەم جیهانەدا خوداگەلێکی زۆر هەیە، ئەوەندەش خوداکان زۆرن، هێشتا کەسێك پەیدا نەبووە کە بتوانێت ناوی هەمویان لەبەر بکات و لەهەموو قۆناخێکدا خەڵکی لەترساندا، خوداگەلێکی تر دەهێننە بون و دەیانپەرستن، لەبەرئەوە تۆ دەتوانی چاوپۆشی لەخودای خۆت بکەیت و لەگەڵ مندا بێیت بۆ وڵاتێك

کە لەوێدا خودای تۆ هیچ هێز و توانایەکی نیە و خوداکانی تر لەوێن کە تۆ ناچاری ئەوە ناکەن پەردەی کچێنی خۆتیان پێشکەش بکەیت و لەوێدا تۆ دەبیتەی خوشکی من بەواتا دەبیتە هاوسەرم.

"مینا"وتی: بۆ هەر ولاتێك بڕۆم، توانای خودای خۆم لەوێدا بەدی دەکەم و مەحاڵە بتوانم بڕۆمە شوێنێك کە لەوێدا توانای خوداکەی منی لیّ نەبێت.

دوای ئەوە"مینا"لیّم نزیك بویەوە و دەستی گرتم و وتی: من تۆ پەسەند دەکەم و ئامادەم ببمە هاوسەرت، بەڵام ناتوانم پەردەی کچێنی خۆمت پیّ ببەخشم، چونکە کچێنی من بەخوداکانەوە پەیوەست دەکرێت.

وتم: "مینا"ئەم قسەیەی ئێستا کردت، وەك ئەو قسە وایە کە تەواوی ژنە لاو و جوانەکان دەیکەن و هەریەك لەمانە بۆئەوەی ئەو پیاوەی کە خوازیاری ئەوانە ئازاریان بدەن بیانویەکیان بۆ دەهێننەوە، بۆنمونە یەکێکیان دەڵێت من تۆم خۆش دەوێت بەڵام زێڕ و زیوت نیە، ژنانی تریش دەڵێن من تۆم خۆش دەوێت، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ خودای من ناپەرستی ناتوانم ببمە خوشکت، بەهەمان شێوە تۆش دەڵێیت ئامادەم ببمە خوشکت، بەڵام کچێنی خۆم پێشکەشی خودای خۆم دەکەم.

"مینا"وتی:من ژنێکی نەزان نیم و سەرەڕای زمانەکەی خۆم زمانی میسری و زمانی "بابل"یش دەزانم و دەتوانم ناوی خۆم بەسیّ زمان بنوسم. من دەزانم کە خەڵکی لەولاتانی جۆراوجۆردا خوداگەلێکی جۆراوجۆر دەپەرستن و ئاگاداری ئەوەم کە لەتەواوی ولاتاندا، ئەوانەی کە دەوڵەمەندن باوەڕیان بەخودای خۆیان هەیە، بەڵام بۆ دوو مەبەست، خۆیان بەباوەڕدار لەقەڵەم دەدەن، یەکێکیان ئەوەیە کە داب و نەریت وا دەخوازێت و ئەویتریان دەبێت وا خۆیان نیشان بدەن کە باوەڕیان بەخودای خۆیانە، بۆئەوەی بتوانن چینە هەژار و بەندەکان کە ئەمانیش بەهەمان شێوە باوەڕیان بەهەمان خودایە، هانی کارگەلێك بدەن و لەڕێ کارکردنی ئەمانەوە زیاتر دەوڵەمەند بن، چونکە ئەگەر چینە هەژار و بەندەکان بزانن کە دەوڵەمەندەکان باوەڕیان بەخوداکان نیە، دژیان ڕادەپەڕن.

بیروباوەڕی چینە هەژار و بەندەکانی میسر و"بابل"و ولاتانی تر بەخوداکان، باشترین ڕێگایە بۆ ملکەچ کردنی ئەو جۆرە چینە و بەڕادەیەکیش لەڕێی بیروباوەڕەوە

ئەم هەژار و بەندەانە گوێڕایەڵی کەسە دەوڵەمەندەکان دەکەن، کە ترسی قامچی و مەرگ ئەوەندە گوێڕایەڵی فەرمانەکانیان ناکات.

من تەوای ئەمانە دەزانم، بەڵام لەبەرئەوەی لەمنداڵیەوە منیان بەبیروباوەڕی خودای خۆم پەروەردە کردووە، بەردەوام سەرقاڵی سەماکردن بوم بۆ خودای خۆم، بۆیە هیچ هێزێك ناتوانێت بیروباوەڕی من لەبەرامبەر خودای خۆمدا سست بکات، ئەگەر تۆش وەك من لەبەرامبەر گاکاندا سەمات بکردایە و بەسەر شاخە نوکتیژەکانیاندا بازت بدایە و لەکاتی بۆرە بۆڕیاندا لەقەت لەدەمیان بدایە، تێدەگەشتی کە من چی دەڵێم، کەسێك بەو شێوەیە باوەڕی بەخودای خۆی بێت، چیتر هەوڵی ئەوە نادات بیروباوەڕی هیچ کەسێك سست بکات، بەڵام دڵنیام کە تۆ هەرگیز سەمای کچان و کوڕانی لاو لەبەرامبە گا تورەکاندا نەبینیوە.

وتم: من بیستومە لەهەندێك لە وڵاتاندا یاری بەگای نێر دەکەن و لەبەرامبەر گاکەدا سەما دەکەن و تورەییان دەوروژێنن، بەڵام وام دەزانی ئەم کارە تەنها بۆ ئەوە ئەنجام دەدەن تا خۆشیەك بەتەماشاچیان ببەخشن، لەگوتەکانی تۆدا ئەوە دەردەکەوێت کە ئەم کارە هۆکارێکی ئاینی لەپشتەوەیە و لەبەرئەوە لەبەرامبەر گاکاندا سەما دەکەن تا ئەرکە ئاینیەکانیان بەجێ بهێنن و ئێمەش لەمیسردا گا دەپەرستین.

بەڵام ئەو"گا"یەی ئێمە دەیپەرستین جیاوازە لە"گا"کانی ئێوە، چونکە ئێمە تەنها یەك"گا" دەپەرستین و ئەم "گا"یەش لەهەر وەچەیەکی مرۆڤدا هەڵگری چەند هێمایەکی تایبەتە، بەواتا هەر بیست ساڵ جارێك دەردەکەوێت و کاتێك ئەم"گا"یە هاتە بون و هەڵگری هەموو هێماکان بێت، ئەوکات ئێمە تێدەگەین کە هەڵگری هێماکانی یەزدانیە و ئێمەش دەست بەپەرستنی دەکەین تا ئەو کاتەی دەمرێت.

بەڵام ئێمە هەرگیز لەبەرامبەر"گا"کاندا سەما ناکەین و پەردەی کچێنی کچە میسریەکان پێشکەشی گاکان ناکەین، لەکاتێکدا تۆ دەتەوێت کچێنی خۆت پێشکەشی"گا"کان بکەیت، باشە کاتێك دەبێت گیانەوەرێك ببێتە خاوەنی کچێنی تۆ ، ئەو گیانەوەرە بۆ سەگێك یان ئەسپێك نەبێت؟

"مینا"بەشێوەیەك لەم قسەیە تورە بوو کە دوو زلەی توندی لەڕوخسارم دا و ڕەنگی ڕوخسارم لەتورەییاندا سور وەرگەڕا و وتی: هەی کاکی پزیشکی نەزانی میسر، قسە لەبارەی شتێك کە هیچ زانیاریەکت لەبارەیەوە نیە مەکە، چونکە زانیاریەکانی تۆ لەبارەی خودای من، لەزانیاری مێشێك بۆ زێڕ و زیو زیاتر نیە.

لەکاتێکدا ڕوخسارم لەزلەکانی"مینا"دەسوتا، زانیم کە پێداگری کردن بێسودەو"مینا"ڕازی نابێت ببێتە خۆشکم، تا ئەوکاتەی سەرەتا کچێنی خۆی پێشکەشی خودای خۆی و بەئەگەرێکی زۆر بەهێز بەگاکان بکات، بۆیە ڕۆشتمە بەشی پشتەوەی کەشتیەکە و بۆ سەرگەرمی خۆم بەچاوپیاخشاندنی دەرمانەکانمەوە سەرقاڵ کرد.

"مینا"ش لەبەشی پێشەوەی کەشتیەکە دەستی کرد بەسەماکردن و من ئاگاداری ئەوە بووم کە ئەم سەمایە تەنها بۆ پەرستنی خودای خۆی ناکات، بەڵکو مەشق دەکات بۆئەوەی ماسولکەکانی بەردەوام لەژێر فەرمانیدا بن.

"مینا"بەجۆرێك سەمای دەکرد، کە مەحاڵ بوو سەماکەرێکی ئاسایی بتوانێت بەوشێوەیەی ئەو سەما بکات، چونکە هەندێکات هەردوو دەستی دەخستە سەر لێواری کەشتیەکە و هەردوو پێی بەڕادەیەك بەرز دەکردەوە کە وەك بڵێی جەستەی پارچە تەختەیەك بێت و هەندێجاریش بەشێوەیەك کەمەری بۆ دواوە دەچەماندەوە و بێئەوەی پێکانی لەزەوی جیا ببنەوە سەری دەدا لەزەوی.

کاتێك ئەو سەما سەیرەی ئەوم بینی– کەبۆ خودای خۆی دەکرد –زانیم پێداگری من لەبەرامبەر"مینا"دا بێسودە و کەسێك کە بەرگەی ئەو هەموو زەحمەتە لەپێناو خودای خۆیدا بگرێت، ئامادە نیە ببێتە خوشکم، مەگەر ئەوەیکە کچێنی خۆی سەرەتا ببەخشێت بەخودای خۆی.

کەسێك بەو ڕادەیە باوەڕی بەخودای خۆی بێت، داواکردنی شتێك کە لەگەڵ بیروباوەڕیدا جیاواز بێت دور لەڕەفتاری پیاوانە. ئەوەبوو بڕیارم دا چیتر داوای لێ نەکەم ببێتە خوشکم.

"مینا"دوای ئەوەی سەمای کرد، جەستەی خۆی شێلا و دوبارە جلەکانی لەبەرکردەوە و ئەوکات لەپێشی کەشتیەکەدا دانیشت و دەستی کرد بەگریان، منیش لەوکاتەدا کەرستە پزیشکەیەکانی خۆمم بەجێ هێشت و ڕۆشتم بۆلای و بەنەرم و نیانیەکی لەڕادەبەدەر پێم وت:"مینا" نەخۆشیت؟

"مینا"ش وەڵامی نەدامەوە و دەستی کێشامە دواوە و گریانەکەی زیاتر کرد.

وتم: "مینا"سەرەڕای ئەوەی زۆر ئارەزوی تۆ دەکەم، بەڵام دڵنیابە، بۆئەوەی دوچاری خەم و خەفەت نەبیت، هەرگیز داوای ئەوەت لێناکەم ببیتە خوشکم و چیتر لەمن مەترسە.

"مینا"سەری بەرز کردەوە و بەیەك جوڵە فرمێسکی چاوەکانی سڕی و وتی: تۆ چەنێك گەمژەیت کە وا هەست دەکەیت من لەتۆ دەترسم. من هیچ ترسێکم لەتۆ نیە و لەبەرتۆ ناگریم، بەڵکو بۆ چارەنوسی خۆم دەگریم کە منی لەخودای خۆم جیاکردەوەو من ئەگەر لەخودای خۆم جیا نەبومایەتەوە، بەوڕادەیە لاواز نەدەبوم کە نیگای پیاوێکی وەك تۆ لەخشتەم بەرێت.

دەستیم گرت، بەڵام ئەمجارەیان دەستی لێ دور نەخستمەوە و ڕوی تێکردم و وتی:سینۆهە" لەبەرئەوەی تۆ منت لەپادشای"بابل"ڕزگار کرد، دەبوو بەناونیشانی پاداشتی ئەو خزمەتەی بەمنت کرد، ببوایەم بەهاوبەشی ژیانت، بەڵام ئەگەر تۆ بزانی خودای من کێیە، لەوەیکە ناتوانم پاداشتت بدەمەوە، بەو شێوەیە سەرت لێم سوڕ نەدەما، ئێمە نابێت باسی خودای خۆمان بۆ بێگانەکان بکەین و ئەوەی دەیزانین بەوانی بڵێین، بەڵام من دەتوانم پێت بڵێم کە خودای ئێمە خودای دەریایە و لەئەشکەوتێکدا کە دەکەوێتە شاخێکەوە دەژیت و هەرکەسێك خۆی بکات بەو ئەشکەوتەدا، گەرچی دەتوانێت لەوێ بێتە دەرەوە، بەڵام ئەوەندە هەست بەخۆشی دەکات کە هەرگیز لەو ئەشکەوتە نایەتە دەرەوە و هەرلەبەرئەوەش تائێستا هیچ کەسێك لەو ئەشکەوتە نەهاتووەتە دەرەوە.

هەندێك دەڵێن خودای ئێمە سەرەڕای ئەوەی خودای دەریایە، بەڵام لە"گا"یەك دەچێت و هەندێکی تریش دەڵێت کە لە مرۆڤ دەچێت، بەڵام سەری لە"گا"دەچێت.

هەموو ساڵێك لەنێو ئەو کچانەی کە پێشتر خۆیان فێری سەماکردن کردووە دوانزە کەس بەقورعە هەڵدەبژێرن و هەریەك لەم دوانزە کەسە مانگی جارێك، کاتێك کە مانگ چواردە بێت خۆیان دەکەن بەئەشکەوتی خودادا، منیش یەکێك بوم لەو دوانزە کەسە کە دەبوو لەشەوە مانگێکی درەوشاوەدا خۆم بکردایە بەو ئەشکەوتەدا، بەڵام بەهۆی ئەوەی منیان فڕاند و وەك کەنیزەکێك فرۆشتمیان بەپادشای"بابل"، نەمتوانی خۆم بگەیەنمە ئەو خۆشبەختیە مەزنە.

لەتەواوی ئەو ماوەیەی کە لەدیلیەتیدا بوم بیرم لەو ئەشکەوتە دەکردەوە و ئێستاش بیری لەو ئەشکەوتەی خودا دەکەمەوە و هیچ ئارەزویەکی ترم نیە جگەلەوەی بڕۆم و کچێنی خۆم لەناو ئەو ئەشکەوتەدا پێشکەشی خودای خۆم بکەم، بەڵام ئەگەر لەو ئەشکەوتە هاتمە دەرەوە، دەبمە هاوسەری تۆ،بەڵام وەك پێم وتی ئەو

کەسانەی خۆیان دەکەن بەئەشکەوتی خودای ئێمەدا، بەڕادەیەك هەست بەخۆشی دەکەن کە هەرگیز پێنانێنە دەرەوەی ئەو ئەشکەوتە.

وتم: "مینا"ئێستا من تێگەشتم کە تۆ خەڵکی دورگەی"کریت"[47]ی.

چونکە کاتێك لەسوریادا بووم ئەو دەریاوانانەی کە لەدورگەی"کریت"ەوە دەهاتن، دەیانوت خودای دورگەی"کریت" لەناو ئەشکەوتێکدا دەژیت و لە"گا"دەچێت و من ئامادەم تۆ ببەمەوە بۆ دورگەی"کریت" بۆئەوەی بەو شێوەیەی خۆت دەتەوێت لەگەڵ خودای خۆتدا ڕەفتار بکەیت.

"مینا"وتی:"سینۆهە"لەنێو تەواوی ئەو پیاوانەی کە من تا ئێستا بینیومە تۆ تاکە پیاوێکیت کە من پەسەندم کردبێت، چونکە سەرەرای ئەوەی منت ڕزگار کرد، شتگەلێك من بەلای تۆدا پەلکێش دەکات، بەڵام نازانم ئەو شتە چیە؟

من حەز دەکەم لەئێستاوە تا ئەو کاتەی کە دەگەینە"کریت"من و تۆ بەخۆشی بژین‌و دوبارەی دەکەمەوە دوای ئەوەی کچێنی خۆم پێشکەشی خودای خۆم کرد، ئەگەر لەو ئەشکەوتە هاتمە دەرەوە دەبمە ژنی تۆ.

ئەوکات"مینا"بەپەنجەکانی ڕوخسارمی نەوازش کرد و ڕوخساری لەڕوخسارم نزیك کردەوە و لێوەکانی بەڕوخسارمدا خشاند و منیش ڕوخساری ئەوم ماچ دەکرد و بەڕادەیەك چێژم لەو ماچە وەرگرت کە لەوانەیە ئەگەر ببوایە بەخوشکم بە ڕادەی ئەو ساتە خۆشحاڵ نەبومایە.

کاتێك شەو داهات بەندەکەم لەخەو هەستا و دەستی کرد بەباوێشك دان و چاوەکانی سڕی و وتی: ئەی"ئامون"خودای مەزنی میسر سوپاسگوزاری تۆم کە ئەم سەرئێشەیەت لەکۆڵ کردمەوە و چیتر سەرم وەك پارچە مسێك کەلەنێوان پێك و پایە ئاسنێکدا گیری خواردبوو، ئازار ناکێشێت، بەڵام ورگم بەڕادەیەك برسیەتی، وەك بڵێی چەند شێرێکی لاوی برسی لەناو ورگی مندان و داوای خواردن دەکەن.

دوای ئەوە بێئەوەی داوای یارمەتی لەئێمە بکات، هەستایە سەرپێ و برێك لەو نانەی کە خۆی کڕیبوی خوارد و لەکاتی خواردنی باڵندەکاندا ئێسقانەکانی فڕێ دەدایە ناو ڕوبارەکەوە.

47 دورگەی کریت، دورگەیەکی مەزنی دەریای میدیترانەیە کە لەرابردوودا خاوەنی شارستانیەتێکی مەزنە.

*بەشی نۆزدەیەم*

## هەرسێکمان بوینە گاڵتەجاڕ

کاتێك برسیەتی نیشتەوە وتم:"کاپتا" بڕیاربوو تۆ ئامۆژگاریمان بکەیت و پێمان بڵێیت دەبێت چی بکەین بۆئەوەی خۆمان ڕزگار بکەین، چونکە لەوانەیە ساربازانی پادشا بەدوامانەوە بن و بیانەوێت دەستگیرمان بکەن.

"کاپتا"وتی: ئەگەر من باش تێگەشتبم، تۆ وتت کە پادشای"بابل" بۆماوەی سێ ڕۆژ بەدوای تۆدا ناگەڕێت و قەدەغەشی کردووە کە تا سێ ڕۆژ تۆ پێ بنێیتە کۆشکی فەرمانڕەواییەوە، لەمحاڵەتەدا خودی ئەو تۆی نایەتەوە یاد و وادەزانێ کە لەشوێنێکی دوردا خەریکی مۆمیاکردنی لاشەی منی، بەڵام لەوانەیە ئەو سەوڵ لێدەرانی ئەم کەشتیە کە هەڵهاتن، یان خزمەتکارانی ماڵی پادشا ئەم بابەتە بەپادشای"بابل" بگەیەنن، لەم حاڵەتەدا دەبێت بترسین و هەڵبێین، چونکە ئەگەر"بورابوریاش"دەستگیرم بکات دەمکات بەقوڕگی شێرەکەیدا و تۆ و ئەم ژنەش سەرەوژێ بەسەر دیواری حەساری "بابل"دا هەڵتان دەواسێ تا ئەو کاتەی گیانتا دەردەچێت و ئەگەر تۆ بەهۆی تلیاکەوە منت بێهۆش نەکردبایە و منیش هەست و هۆشی خۆم لەدەست نەدایە، ڕێنماییم دەکردی، بەڵام ئەم تلیاکەی تۆ بەڕادەیەك زیانبەخشە سەرەڕای ئەوەی سەرئێشەکەم نەماوە، بەڵام هێشتا کەمێك هەست بەگێژی دەکەم. سەرەڕای ئەوەش بەبۆنەی ئەوەی تلیاکت دەرخوارد داوم و خستوتمە ناو گۆزەیەکەوە-ئەم بابەتەش پێچەوانەی کەسایەتی منە- دەتبەخشم.

وتم: "کاپتا" واز لەم قسانە بهێنە و ڕێگەچارەیەکمان پێنیشان بدە کە بتوانین گیانی خۆمان ڕزگار بکەین.

"کاپتا" وتی: من دەزانم تۆ بێ من، وەك ئەوە مەڕە وایت کە دایکی خۆی ون کردووە و بەردەوام باڕە باڕ دەکات. ئەگەر من نەبوایەم تائێستا بەهۆی ئەوەی ناتوانی خۆت لەنەهامەتیەکان ڕزگار بکەیت ئێستا لەناوچوبویت.

وتم: دەپێمان بڵێ ئێستا دەبێت چی بکەین و بەچ شێوەیەك هەڵبێین.

"کاپتا"وتی: ئەم کەشتیە کە هەڵگری دە سەوڵ لێدەر بوو، زۆر گەورەیە و ئێمە ناتوانین بەدوو کەسی"چونکە ئەم ژنە ناتوانێت سەوڵ لێبدات"ئەم کەشتیە بەڕێ بخەین و بەپێچەوانەی ڕەوتی ڕوبار گەشتی خۆمان دەست پێ بکەین. بۆیە دەبێت گەشتکردنمان بەکەشتی لەبیر و هزری خۆمان دەرکەین، لەباتی ئەوە هەوڵی ئەوە بدەین دوو وڵاخ بدزین و لەڕێی وشکانیەوە بەردەوامی بەگەشتەکەی خۆمان بدەین. لەماوەی ئەم گەشتەماندا خۆمان وەك گاڵتەجاڕە گەڕۆکە سەیرخۆشەکان دەڕازێنینەوەو جلێکی شڕ لەبەردەکەین وبەڕۆژدا ڕێ دەکەین و شەویش لەئاواییەکاندا لەڕێی فاڵگرتنەوە و گاڵتەکردن و قسەی خۆش و سەماکردن، خەڵکی لادێکان سەرقاڵ دەکەین و لەبەرامبەر ئەم کارەشماندا بڕێك مسیان لێ وەردەگرین. تۆ دەبێت پیشەی پزیشکی خۆت بشاریتەوە و لەبەرامبەردا وەك ئەستێرەناسێکی"بابل"پێشبینی چارەنوسی خەڵك بکەیت و منیش بەهۆی چیرۆکە پێکەناویەکانەوە دەیانهێمە پێکەنین و"مینا"ش بەسەماکانی سەرقاڵیان بکات. چیتر دەبێت لێرە بڕۆین، چونکە سەوڵ لێدەرەکان لەبەرئەوەی دە کەسن بەزوویی بەسەر ترسەکانیاندا زاڵ دەبن و هەوڵی ئەوە دەدەن دەست بەسەر کەشتیەکەی خۆیاندا بگرنەوە.

من ئاگاداری ئەوە بوم کە"کاپتا"ڕاست دەکات و لەوانەیە سەوڵ لێدەرەکان هەوڵی ئەوە بدەن هێرشمان بۆ ببەن، بۆئەوەی گەشتیەکەی خۆیان بەدەست بهێننەوە. ئێمە جلوبەرگانمان ئالودەی قوڕ و چڵپاوی ڕوبار کرد و زێڕ و زیوەکانمان لەنێوان خۆماندا دابەشکرد و هەموياننمان لەناو پشتێنی کەمەربەندی جلەکانماندا شاردەوە.

"کاپتا"پێی وتم: من دەبێت کەرەستەی پزیشکی و نەشتەرگەری خۆم فڕێ بدەمە ناو ڕوبارەکەوە، بەڵام من نەمدەتوانی چاوپۆشی لە کەرەستە پزیشکیەکانی خۆم بکەم، بۆیە لەناو ئەو بەڕەی"مینا"م تێدا پێچابوو، خستمە سەرکۆڵی"کاپتا"و هەرئەوەی خۆر ئاوابوو و تاریك بوو. لەنێو کێڵگەکاندا کەوتینە ڕێ و خۆمان گەیاندە جادەی کاروان.

ئەو شەوە تابەیانی ڕێمان کرد و لەبەرەبەیاندا گەشتینە لادێیەك کە دانیشتوانی ئەو لادێیە تا ئەوکاتە جگە لەهەندێ کاتی دەگمەن بەهیچ شێوەیەك چاویان بە کانزکان نەکەوتبوو و لەناو ماڵی گڵیندا دەژیان و زەویان بە دار و ئاسنی تیژ دەکێڵا.

من بە"کاپتا"م وت: دزینی دوو وڵاخ باش نیە، لەبەرئەوەی دانیشتوانی ئەم ناوچەیە دەکەینە دوژمنی خۆمان، بۆیە باشتر وایە دوو وڵاخیان بەنرخی مس لێ بکڕین.

ئێمە بەپێدانی بڕێك مس بوینە خاوەنی دوو وڵاخ و"کاپتا" لەکۆڵبەری ڕزگاری بوو و چیتر دوای ئەوە لەجادە دور و درێژەکانی"بابل"دا بەردەوامیمان بەڕێکردن و هەموو ڕۆژێك، دوای ئەوەی شەو دەهات، لەلادێیەکدا لامان دەدا و لەگۆڕەپانی لادێدا، یان لەکەنار ڕوباردا هونەرەکانی خۆمان بۆ لادێییەکان نمایش دەکرد.

بەو شێوەیەی کە لەمنارەی"بابل"دا بینیبوم، فاڵم بۆ لادێییەکان دەگرتەوە و مژدەی ئەوەم پێدەدان کە بەروبومێکی زۆر بەدەست دەهێنن و ئاوی ڕوبار بۆ ئاودێری کردنی زەویەکانیان زۆر دەبێت و ژنەکانیان کوڕیان دەبێت، گەر لاوەکانیش داوای ئەوەیان لێ بکردمایە فاڵیان بۆ بخوێنمەوە، مژدەی ئەوەم پێدەدان کە کچێکی جوان دەبێتە هاوسەریان.

من نەمدەویست ڕاستیەکانیان پێ بڵێم، چونکە ئەگەر بموتایە بەرپرسانی باج و خەراج بەزۆر دەست بەسەر دانەوێڵە و چوارپێکاندا دەگرن و بەشێوەیەك دارکاری پشتیان دەکەن کە تەواوی پشتیان ڕەش دادەگەڕێت و ڕوبار هەڵدەستێت و نیوەی کێڵگەکانیان ئاو دەیبات و نیوەکەی تری دەبێتەی خوراکی سون و کولە، ئەوانیش کە خەڵکێکی سادە بون، بەبیستنی ئەم جۆرە قسانە توشی نائومێدی دەبون.

هەرچی زۆرتر ڕێمان بکردایە و خۆریش زیاتر لێی بدایەین زیاتر لە سێ کەسی گاڵتەجاڕی گەڕۆك دەچوین و دوای گەشتنمان بەلادێیەك، لەکاتێك من فاڵم بۆ خەڵکی دەگرتەوە. "کاپتا" بەچیرۆکی سەیر و پێکەناوی سەری دەسوڕماندن یان دەیهێنانە پێکەنین.

کاتێك"کاپتا"چیرۆکی ئەوەی بۆ دەگێڕانەوە کە لەجیهاندا میللەتگەلێك هەن کاتێك ڕێ دەکەن، سەریان لە لەشیان جیادەکەنەوە و وەك شوتی دەیخەنە بنباڵیان، بۆئەوەی کەمێك قورسایی لەسەر جەستەیان کەم بکەنەوە، یان ئەوەی خۆیان دەکرد بەگورگ

یان مەڕێك. خەڵكی سادە و ساكاریش باوەڕیان بەو قسانە دەكرد و هیچ كەسێك نەیدەپرسی كاتێك سەر لەجەستە جیادەبێتەوە بەچ شێوەیەك خاوەنی سەر بەزیندویی دەمێنێت.

ئێمە لەم گەشتەماندا لەبەرامبەر بەهای خواردندا هیچ كانزایەكی خۆمان خەرج نەدەكرد، بگەشتینایە هەر شوێنێك و دەستمان بەفاڵی من و چیرۆكە خۆشەكانی "كاپتا"و سەمای"مینا" بكردایە، خەڵكی زیاد لەڕادەی پێویستمان خواردنیان بۆ دەهێنایین.

لەم گەشتەماندا سەرەڕای ئەوەی نەمدەویست كاری پزیشكی خۆم بكەم، كاتێك خۆمان بكردایە بەهەر لادێیەكدا، من چاوم بەجەستەی توكنی پیاوان و ژنانم بكەوتایە، یەكسەر پێم دەوتن كە بەچ شێوەیەك بە"زەڕنیخ"[48] و قسڵ توكی جەستەیان لا ببەن، بۆئەوەی لەخورین و ناشیرنی جەستەیان خۆیان ڕزگار بكەن و كاتێكیش هەستم دەكرد كە چاوی لادێییەكان نەخۆش دیارە و ئەگەر چارەسەر نەكرێن كوێر دەبن، بەخۆڕایی چارەسەرم دەكردن و ژنەكانیش كاتێك"زەرنیخ و قسڵ"یان بەكاردەهێنا لەناكاو وەك كچە چواردەساڵەكان دەبونە خاوەنی جەستەیەكی ساف و پاك و بێ موو، بەشێوەیەك خۆشحاڵ دەبون كە چێژبەخشترین خواردنی خۆیانیان پێ دەدایین.

من سەرەڕای ئەوەی لەڕێی چارەسەركردنی لادێیەكان خۆشحاڵم دەكردن، لەڕێی چارەسەركردنەكانمەوە مەشقم لەسەر كارەكەی خۆم دەكرد، بۆئەوەی زانیاری پزیشكیەكانم لەبیر نەچێتەوە و لێهاتویی دەستم لەبواری نەشتەگەریدا لەناو نەچێت.

بەهۆی ئەم گەشتەمەوە، لەوڵاتی گەرمی"بابل"دا پێكانم دمەڵیان دەركرد و دەستەكانم ئاوڵەی زەرد و ڕەنگی پێستی ڕوخسار و جەستەم ڕەش داگەڕا، بەڵام بەردەوام خۆشحاڵ بوم و لەكانگای دڵمەوە خۆم بەخۆشحاڵی دەبینی، لەبەرئەوەی "مینا" لەتەنیشتەمەوە بوو و هەرجارێك كە تەماشای ئەوم دەكرد زەردەخەنەیەكی دەكرد.

---

[48] زەڕنیخ: پێكهاتەیەكی كانزاییە كە ناوێتەیەكە لە گۆگرد و ئەرسنیك بەڕەنگی سور یان زەرد یان سپی كە لەبواری پزیشكی و پیشەسازیەكاندا بەكار دەهێنرێت.....سەرچاوە ﴿فەرهەنگی عەمید﴾

هەرشەوێك كە دەخەوتم"مینا" لەتەنیشتمەوە دەحەوایەوە و كاتێكیش بەیانی هەڵدەستام پێش ئەوەی كەشتی ئاڵتونی خۆر لەئاسماندا ببینم تەماشای ڕوخسار و جەستەی"مینا"م دەكرد و لەبەرچاوی مندا لەخۆر جوانتر بوو، سەرەڕای"مینا"لەو گەشتەمدا بەشێوەیەكی تەواو خۆم لەكۆتەكانی ژیان ئازاد دەبینی. هیچ خەمێكم بۆ ساتی هەنوكە و ئاینده لەخۆمدا شك نەدەبرد و كارێكی كتوپڕنەبوو كە خۆم بۆئەنجامدانی مەلول بكەم.

ئێمە زیاتر لەكاتی شەودا، بەواتا نیوەشەو، دەكەوتینە ڕێ، بۆئەوەی لەگەرمی خۆر پارێزراوبین و هەرئەوەی خۆر هەڵدەهات، بێئەوەی خۆمان ماندوو بكەین لەیەكەمین ئاواییدا لامان دەدا و دەحەواینەوە. نزیكە نیوەڕۆ لەخەو هەڵدەستاین و خەڵكی لادێمان لەچواردەوری خۆمان كۆدەكردەوە ئەوكات تائێوار خۆمان بەوانەوە سەرقاڵ دەكرد و ئەم كارەش بۆئێمە وەك كاتی خۆشگوزەراندن وابوو، چونكە خۆمان لەوان زیاتر چێژمان لەكارەكانمان وەردەگرت.

كاتێك شەو دەهات و خەڵكی لادێ دەخەوتن، ئێمەش لەگەڵیاندا دەخەوتین و ڕۆژی دوایی دەكەوتینەوە ڕێ و ئەم ڕەوشە، تا ئەو ڕۆژەی گەشتینە سنوری وڵاتی "میتانی" بەردەوامیمان پێدا.

دوای ئەوەی گەشتینە سەرسنوری وڵاتی"میتانی"دوو شوان بینیان كە ئێمە خەڵكێكی هەژارین. لەڕوی سۆز و بەزەییەوە، بێئەوەی پاسەوانی سنورەكانمان لێ ئاگادار بكەن، ڕێنماییان كردین و ئێمەیان بردە ناو ئەو وڵاتەوە و ئێمەش خۆمان كرد بەشاری"میتانی"دا و لەوێ جل و بەرگی شایستەمان كڕی و لەبەرمان كرد و لەیەكێك لەمیوانخانەكاندا نیشتەجێ بوین.

لەبەرئەوەی زێڕو زیوەكەم كەم بوبویەوە، دوای ئەوەی خۆمان كرد بەشاری "میتانی"دا بڕیارم دا ماوەیەك لەوێدا بمێنمەوە و لەڕێی كاری پزیشكیمەوە كەمێك زێڕ و زیو بەدەست بهێنم.

بەزوویی ژمارەی ئەو كەسانەی كە سەردانی منیان دەكرد بەڕادەیەك زۆر بوو كە من ناچار بوم داوا لەهەندێك نەخۆش بكەم ڕۆژێكی تر بۆ چارەسەركردنی نەخۆشیەكەی سەردانم بكات.

"مینا"زۆر سەرنجی خەڵکی"میتانی"بەلای خۆیدا ڕادەکێشا و هەر پیاوێکی دەوڵەمەند کاتێك چاوی بەو دەکەوت داوای لێ دەکردم پێی بفرۆشم، بەڵام من ئامادە نەبوم"مینا"بفرۆشم، چونکە بونی ئەو بۆمن، وەك خۆر و خواردن پێویست بوو.

بەندەکەم"کاپتا"کە بەهۆی ڕێکردنی لاواز بوبو، دوبارە قەڵەو بویەوە و هەندێك ژنی لاو و جوان چواردەوریان گرت و کاتێك گوێیان لەچیرۆکە خۆشەکانی دەبوو، خۆشحاڵ دەبون.

یـــەکێك لەچـــیرۆکەکانی"کاپتـــا"زۆر ســـەرنج ڕاکـــێش بـــوو، داســـتانی ڕۆژی فەرمانڕەوایی ئەو بوو لەڕۆژی سیانزەیەمی بەهاری"بابل"دا و"کاپتا"بۆ گێڕانەوەی ئـەم داسـتانە توانایـەکی گێڕانـەوەی باشـی هـەبوو و ژنـانیش ئەوەنـدە پێدەکـەنین تـا لەناوکاو دەتبینـین لەسـەر زەوی خۆیـان دەگـەوزێنن و دەیـانوت زمـانی ئـەم پیـاوە وەك ڕوبارێکی درێژ خێرایە.

لە"میتانی"دا کاتەکانم زۆر بەخۆشی تێدەپەڕی، تائەوەی بینیم"مینا"شەوانە دەگریت، منیش دەمزانی کە هۆکاری گریانی ئەو ئەوەیە کە لەخودای خۆی دورە و پێم وت:"مینا" من دەزانم تۆ بۆچی دەگریت، چونکە پێم وتی دەتبەم بۆ"کریت" و هێشتا تۆم نەبردووەتەوە بۆ نیشتمانی خۆت.

بەداخەوە لەئێستادا ناتوانم بڕۆم بۆ"کریت"، چونکە ناچارم بۆئەنجامدانی کارێك بڕۆم بۆ وڵاتی"هاتی"، بەڵام لەبەرئەوەی کەشتیەکانی"کریت"زۆر هاتوچۆی"هاتی" دەکەن، دەتوانم بەهۆی یەکێك لەم کەشتیانە بتگەڕێنمەوە"کریت".

ئەوەی من باسم کرد بۆ"مینـا"زۆر لەڕاستیەوە دور نـەبوو، چونکە هەربەوشێوەی کـــە لەســـەرەتای سەرگوزەشـــتەکەمدا وتم فەرمانـــدەی لەشـــکری میـــسر، منـــی دەستنیـشانکرد بۆئـەوەی سـەردانی وڵاتـان بکـەم و زانیـاری لـەبارەی سیـستەمی سیاسیو سەربازیانەوە بەدەست بهێنم و لەکاتی گەڕانەوەم بۆ میسر بۆی باس بکەم. بۆنمونـە دەبێـت بـڕۆم بـۆ وڵاتـی"هـاتی"و بـزانم پادشـای ئـەو وڵاتـە چـەنێك سـەربازی هەیـەو کەرەسـتەی جەنگیـەکانی بـەچ شـێوەیەکە، بـەڵام سـەرەڕای ئـەم بابەتـە، مـن نەمدەویست"مینا"ڕاستەوخۆ ببەم بۆ"کریت" و بەخودای خۆی بسپێرم، بەڵکو حەزم دەکرد بەناونیشانی گەشتێك بۆ"هاتی" بۆماوەیەکی تر لەگەڵ مندا بێت.

پێم وت:"مینا"ساڵی یەکجار لەم وڵاتەوە، دەستەیەك نوێنەری ئەم وڵاتە دەڕۆن بۆ وڵاتی"هاتی" بۆئەوەی باجی وڵاتی"میتانی" بگەیەننە دەستی پادشای"هاتی".

کاتێك ئەم دەستەیە، هەڵگری باج و خەراجن و دەکەونە ڕێ، ڕێگا زۆر ئاسودە و بێترسە و لەم کاتانەدا دزەکان ناتوانن هێرش بۆ کۆچەر و گەشتیارەکان ببەن.

ئێستا کاتی ڕۆشتنی ئەو دەستەیە و من دەبێت ئەم هەلە بقۆزمەوە و بڕۆم بۆ وڵاتی"هاتی"ئەگینا ناچاردەبم بۆساڵی ئاینده کاتی گەشتی هەڵگرانی باج دەست پێدەکاتەوە دوا بخەم.

من زۆرت لێناکەم کە لەگەڵ مندا بێیت بۆ"هاتی"چونکە نامەوێت لەوە زیاتر تۆ لەخودای خۆتت دور بکەمەوە، ئەگەر حەز بکەیت من لێرەوە دەتبەم بۆ سوریا، بۆئەوەی لەوێوە بڕۆیت بۆ کرت و ئەگەر نەمتوانی لەکاتی خۆیدا بگەڕێمەوە، ئەوا لەگەڵ دەستەی هەڵگرانی باج و خەراج دەڕۆم بۆ وڵاتی"هاتی"، بەپێچەوانەشەوە ناچارم گەشتەکەم بۆ ساڵێکی تر دوا بخەم.

"مینا"وتی:"سینۆهە"من حەز ناکەم بەهۆی بردنی من لێرەوە بۆ سوریا، گەشتەکەی تۆ بۆ"هاتی"دوا بخەم، چونکە بەدڵنیاییەوە گەشتی تۆ بۆ ئەوێ، زۆر گرنگترە لەگەشتەکەی من بۆ"کریت".

من بیستومە لە لەکەنارەکانی وڵاتی"هاتی"کچانی لاو لەبەرامبەر"گا"دا سەما دەکەن، منیش لەوێدا دەتوانم لەبەردەم"گا"کاندا مەشق لەسەر سەماکەم بکەم، چونکە ماوەیەکە ئەم سەمایەم نەکردووە و دەترسم توانای من لەم سەمایەدا بەتەواوەتی لەناو بچێت.

منیش وتم: من هیچ زانیاریەکم دەربارەی سەماکردن لەبەردەم"گا"ن لەوڵاتی "هاتی"دا نیە، بەڵام دەزانم کە لەوێوە بەهۆی کەشتیەوە دەتوانیت بڕۆیت بۆ"کریت".

"مینا"وتی: تۆ بۆ هەرکوێ بڕۆیت منیش لەگەڵت دێم، ئەگەر بۆ وڵاتی"هاتی"ش بێت. بەڵام بەندەکەم"کاپتا" کاتێك بیستی کە ئێمە دەمانەوێت بڕۆین بۆ "هاتی" خەمگین و تورە بوو و وتی: ئێمە هێشتا تازە خۆمان لەهەڕەشەیەك ڕزگار کردووە، تۆ دەتەوێت گرفتاری هەڕەشەیەکی ترمان بکەیت. ئەو خەڵکەی لەوڵاتی"هاتی"دەژین، وەك دڕەندە وان و کەسە بێگانەکان دەکوژن، بۆئەوەی گۆشتەکەیان بخۆن، ئەگەر نەشیانکوژن ئەوا چاویان کوێر دەکەن، بۆئەوەی بیانبەستنەوە بەئاشەکەیانەوە و ئاشەکەیان بەهۆی ئەمانەوە بسوڕێننەوە و دانەوێڵەکانیان بکەن بە"ئارد".

دوای ئەوە"کاپتا"لەشێوەی وتارئامێزدا پێی وتین:خاوەنەکەم شێتە، بەڵام تۆش لایەنگری ڕۆشتنی بۆ"هاتی"دەکەیت، کەواتە تۆش شێت بویت. من ئەگەر پزیشك

بومایه، ئێسقانی سەری"سینۆهە"م کون دەکرد، بۆئەوەی هەڵمی زیانبەخشی سەری دەربهێنم تا چیتر بیری هەڕەشەئامێز بەمێشکیدا نەیەت، بەڵام من پزیشك نیم، خۆ دەتوانم هەروەك چۆن ئەو منی خستە ناو گۆزەیەکی گڵینەوە، منیش ئەو بخەمە ناو گۆزەیەکەوەو چەند "زالو"یەك بەسەریدا بڕێژم، بۆئەوەی مێشك و ژیری بۆ بگەڕێتەوە.

ئەوکات"کاپتا"هاواری کرد و وتی: نەفرەت لەو ڕۆژەی منی تێدا لەدایك بووم، چونکە بەم شێوەیە گرفتاری خاوەنێکی ئاوا بووم.

تازە من قەڵەو بوم و ورگم ئەوەندە بەرز بووەتەوە، بەڵام دوبارە دەبێت گرفتاری بەدبەختیەکانی کۆچ ببم، ئەویش بۆ وڵاتی مرۆڤ خۆران.

کاتێك بینیم"کاپتا"بێدەنگ نابێت، گۆچانەکەی خۆم هەڵگرت و چەند گۆچانێکم دا لەپشت و شانی، بۆئەوەی بێدەنگ بێت و وتم:"کاپتا" هەر بەندەیەکی تری وەك تۆ دەمدرێژی لەبەرامبەر مندا بکردایە، یەکسەر دەمفرۆشت بەڵام تۆ لەبەرئەوەی پیریت و ماوەیەکە لەگەڵ مندا دەژیت ئامادەم بتنێرم بۆ"ئزمیر"بۆئەوەی چاودێری لەماڵەکەم بکەیت، تا ئەوکاتەی لەم گەشتەم دەگەڕێمەوە.

"کاپتا"وتی:سەرەڕای ئەوە نەمدەویست بڕۆم بۆ"هاتی"، بەڵام ناتوانم بهێڵم تۆ بەتەنهایی بڕۆیت بۆ ئەو وڵاتە، چونکە بەتەنها ڕۆشتنی تۆ بۆ ئەوێ، وەك ئەوە وایە منداڵێکی تازە لەدایك بوو هەڵدەیتە ناوەڕاستی گەلە گورگێك، بەڵام پێم بڵێ ئایا بۆئەوەی بڕۆین بۆ وڵاتی"هاتی" دەبێت بەکەشتی لەڕێی دەریاوە بڕۆین؟

وتم: نەخێر، ئەوانەی لێرەوە دەڕۆن بۆ وڵاتی"هاتی"لەڕێی وشکانیەوە گەشتی خۆیان دەکەن.

بەندەکەم وتی: دوبارە درود و سڵاو لە"ئامون"ی خودای مەزنی میسر، چونکە من سوێندم خواردووە کە هەرگیز پێ نەنێمە ناو کەشتیەوە و لەڕێی دەریاوە گەشتەکانم بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی لەم گەشتەماندا پێویست بەسوار بونی کەشتی ناکات، لەگەڵت دێم.

ئەوکات"کاپتا"سەرقاڵی ئامادەکردنی کەرەستە و تۆشەبەرەی گەشتەکەمان بوو و لەبەرئەوەی لەم کارەدا شارەزاییەکی تەواوی هەبوو، لەمن باشتر ئەو کارەی ئەنجام دەدا.

*بەشی بیستەم*

## لە وڵاتی "هاتی"دا

خەڵکی بەشێوەیەك لەناوی"هاتی" ترساون، ئەگەر من بڵێم "هاتی" وڵاتێکی ئارامو هێمنە، هیچ کەسێك باوەڕم پێناکات.

گەرچی دانیشتوانی"هاتی"خەڵکێکی زبرن و لەجەنگدا بێبەزەیین، بەڵام وڵاتەکەیان زیاتر ناوچەیەکی شاخاویە و هێمنی و ئارامی باڵی بەسەردا کێشاوە.

لەوڵاتی"هاتی"دا ئەگەر سامان و پارەی کەسێك لەشەقامدا بدزن، پادشای وڵات دوئەوەندە ئەوە پارەیەی کە لێی دەزراوە پێی دەداتەوە و هەرکاتێکیش کەسێك بەهۆی هێرشی چەتەکانەوە بکوژرێت، ئەوا ئەوەی کەسی کوژراو لەسەردەمی ژیانی ڕۆژانەیدا بەدەستی هێناوە، پادشا دەیدات بە کەسوکاری کوژراوەکە، هەڵبەت بەجۆرێك پێیان دەدات کە لەڕوی ژیانی ڕۆژانەیانەوە هیچ گرفتێکی داراییان نەبێت.

بۆیە گەشتەکەی ئێمە لەجادەکانی وڵاتی"هاتی" بێ هیچ گرفتێك تێپەڕی و گالیسکە جەنگیەکانی پادشا لەپێش و لەدوامانەوە ڕێیان دەکرد و هەموو ڕۆژێك کەلوپەلی خواردنیان بۆ ئامادە دەکردین، تائەوەی گەشتینە شاری"ختوشە"ی پایتەختی وڵاتی"هاتی"

کاتێك باسی شارە مەزنەکانی جیهان دەکرێت، خەڵکی باسی"تبس و بابل و نەینەوا"دەکەن. من "نەینەوام" نەبینیوە و نازانم چۆنە، بەڵام دەتوانم بڵێم شاری"ختوشە"ی پایتەختی وڵاتی"هاتی"لەهەندێك ڕووەوە لەپێش"تبس"یشەوەیە.

لەمشارەدا پادشایەك فەرمانڕەوایی دەكات كە هەم سەرۆكی وڵاتە و هەم سەرۆكی ئاینی و هەم دادوەری مەزنی ئەو وڵاتەشە و لەوباوەڕەدام لەهیچ شوێنێكی ئەم جیهانەدا هیچ پادشایەك بەئەندازەی ئەم پادشایە دەسەڵاتی نییە.

كاتێك مرۆڤ خۆی دەكات بەوڵاتی"هاتی"دا و چاوی بەكێوە وشكەكانی دەكەوێت سەری سوڕ دەمێنێت كە بەچ شێوەیەك ئەكرێت وڵاتێك بەوشێوەیە خۆری گەرم و سوتێنەری هاوین بدات لەو كێوە وشكانەی و خاوەنی ئەوەندە سەروەت و سامان و دارایی بێت. بگرە لەخۆشیان دەپرسن، ئەریٚ بەچ شێوەیەك خەڵكی لەم شاخانەدا دەژین و چۆن لەبێناویدا نامرن.

بەڵام لەم وڵاتە سەیرەدا، لەو وەرزەی ڕوباری نیل لەمیسردا هەڵدەستێت"وەرزی پایز". ئاو و هەوا سارد دەبێت و لەئاسمانەوە "پەڕ"گەلێكی سپی ڕەنگ دێنە خوارەوە و ئەم "پەڕ"انە تەواوی كێوەكان دادەپۆشن دوای ئەوە، لە وەرزی گەرمادا، دەگۆڕێن بۆ ئاو و دەزانم كە ئێوە باوەڕ بەم بابەتە ناكەن، بەڵام من بەچاوی خۆم كێوە بەرزەكانی"هاتی"م بینیوە كە بەو پەڕە سپیانە داپۆشرابوو.

ئەم پەڕانە لەتەواوی ساڵدا، ئاوی ئەو وڵاتە دابین دەكەن، هەڵبەت بەشێوەیەك كە خەڵكەكەی نەك تەنها خۆیان و ئاژەڵەكانیان پیٚ تێر دەكەن، بەڵكو بەهەمان ئەم ئاوە، كێڵگەكانیشیان پیٚ دەدێرن و تێراویشی دەكەن.

بەهەمان ئەو ئەندازەیەی كە دانیشتوانی"هاتی"لەناو وڵاتەكەیاندا ئارامن، بەردەوام بیانو بۆ دراوسێكانیان دەتاشن و هێڵی سنوریان دەبەنە دواوە بۆئەوەی بتوانن خاكی كەسانی تر داگیر بكەن.

لەسنوری سوریادا قەڵایەكی مەزنیان دروست كردووە، كە دیوارەكانی بە بەردی مەزن هەڵچنراوە و ئەم قەڵایە فەرمانڕەوایی ناوچەیەكی فراوان دەكات و تەواوی ئەو كاروانانەی كە لەسوریاوە دێن بۆ وڵاتی"هاتی"و لەوێوە تێدەپەڕن، دەبێت باج بدەن بەم قەڵایە.

هیچ كاروانێك دوای ئەوەی دەچێتە ناو خاكی"هاتی"یەوە نابێت لە شاڕیٚ لا بدات، ئەگەر لەشاڕێش لا بدەن ئەوا ماڵ و سامانیان بەتەڵان دەبەن، لەم حاڵەتەدا ئەگەر كاروانچییەكان بەرگری لەخۆیان نیشان بدەن، بەكوشتیان دەدەن، لەكاتێكیشدا

ئەگەر بەرگری لەخۆیان نیشان نەدەن، ئەوا بەدیلی دەیانگرن و دەیانکەنە کۆیلەی خۆیان.

سەروەت و سامانی دانیشتوانی"هاتی"لەسێ سەرچاوەوەیە، یەکەم ئەو باجەی کە لەکاروان و گەشتیارەکان وەریدەگرن، دووەم هێرش بردنە سەر وڵاتە دراوسێکان، سێیەم: دەرکردنی ئاڵتون و مس و جۆرێك کانزای تایبەت، کە ڕەنگی خۆڵەمێشیەکی شین باوەو بە"ئاسن" بانگی دەکەن . بەڵام نازانم خەڵکی"هاتی"بەچ شێوەیەك ئەم کانزایە دەردەهێنن و چەکی پێ دروست دەکەن، چونکە"ئاسن"وەك"مس" ناتوێتەوەو من لەیەکێك لەکانە کانزاکانیاندا بینیم کە"ئاسن"یان دەردەهێنا، بەڵام نەمتوانی لەوە تێبگەم بەچ شێوەیەك سود لەبەردە کانزاکان وەردەگرن بۆ دەرهێنانی ئاسن.

شـاری"ختوشـە" لەناوەڕسـتی زنجـیرە شـاخێکدا هاتووەتـە بـون، چـونکە کۆشکەکانیان بەبەردی مەزن دروست دەکەن و هەندێك لەو تەلارانە ئەوەنـدە بەرزن کە ترسم لا دروست دەکەن. هیچ بیانیەك ناتوانێت بچێتە نـاو شـاری"ختوشە" مەگەر ئەوەی ئەندامی ئەو دەستانە بێت کە ساڵی جارێك باج دەهێنن بۆ پادشای"هـاتی"و هەر لەبەرئەوەش شاری"ختوشە" وەك "تبس" و "بابل" ناوبانگی نیە.

دانیشتوانی ئەم شارە، لەگەڵ بیانیەکاندا قسە ناکەن، ئەگەر یەکێك لەبیانیەکان پرسیاریان لێ بکات و ئەوان شارەزای زمانی بیانی بن، دەڵێن تێناگەین یان نازانین، سەرەڕای ئەوەش خەڵکێکی نەرم و نیانن و ڕقەبەرایەتی لەگەڵ بیانیەکاندا ناکەن.

جل و بەرگی کەسە مەزنەکانی ئەم شارە شایەنی تەماشاکردنە، چونکە جل و بەرگێکی درێژ دەپۆشن و قۆڵی کراسەکانیان بەڕادەیەك پان و پۆڕە کە سەری قۆڵی کراسەکەیان بەزەویدا دەخشێت، لەسەر سینەی کراسەکانیان وێنەی بازنەگەلێکی باڵدار دروست دەکەن و کڵاوێکی درێژ و نوك تیژ لەسەر دەکەن و ڕوخساریان وەك میسریەکان دەتاشن، بگرە هەندێك لە وەجاخزادەکان سەریشیان وەك ڕیشیان دەتاشن، بەڵام لەناوەڕساتی سەریاندا، کاکۆڵێکی درێژ دەبینرێت.

کەسە وەجاخزادە و دەوڵەمەندەکانی"هاتی"وەك تەواوی وەجاخزادەکانی وڵاتانی جیهان قەڵەون و ڕوخسارێکی قەڵەو و درەوشاوەیان هەیە و ئاشکرایە خواردنێکی زۆر دەخۆن.

"ختوشە" پایتەختی پادشای"هاتی" بەپێچەوانەی "تبس و بابل" شارێکی بازرگانی نیە و کڕین و فرۆشتنی تێدا ناکرێت و لەبەرامبەردا شارێکی پیشەسازیە، لەم شارەدا لەبەیانیەوە تا ئێوارە دەنگی کوتانی کانزاکان دێت و بەردەوام چەکی تێدا دروست دەکەن.

دانیشتوانی"هاتی"بەپێچەوانەی میللەتە شارستانیەکانەوە، سەربازی بەکرێگیراوی بیانیان نیەو تەواوی سەربازەکانیان خەڵکی ئەو ناوچەیەن و لەوباوەڕەدام هۆکاری ئەوەی سەربازی بەکرێگیراوی بیانیان نیە ئەوەیە کە یەکەم بیانیەکان وەك خۆیان بەئازا نازانن و دووەم والێکی دەدەنەوە سەربازی بەکرێگیراوی بیانی هەرچەنێکیش ئازا و بوێر بێت هەر بەکرێگیراوە و بەئەندازەی سەربازێکی ناوچەکەی خۆیان دڵسۆز و خاوەن ویست"ئیرادە" نیە.

"هاتی"خاوەنی سەرکردەی ناوچەیین و هەریەك لەسەرکردەکانیان، لەناوچەکەی خۆیدا سەربەخۆیەکی ناوەکی هەیە، بەڵام لەژێر فەرمانی پادشای"هاتی"دان.

شێوازی جێبەجێکردنی دادپەروەری لەوڵاتی"هاتی"دا ئەوەندە سەرسوڕهێنەرە کە میللەتە شارستانیەکان ناتوانن باوەڕی پێ بکەن. لەم وڵاتەدا ئەگەر یەکێك لەپادشا ناوچەییەکان دژی پادشای"هاتی"ڕاپەڕێت و هەوڵی ڕوخانی بدات نایکوژێت، بەڵکو دەینێرێتە سەر سنورەکان، بۆئەوەی فێری ئەزمونی جەنگ لەگەڵ میللەتانی تردا ببێت و ببێتە هەڵگری کەسایەتیەکی جەنگی. لە"هاتی"دا ئەگەر کەسێك، کەسێکی تر بکوژێت، لەسێدارەی نادەن، بەڵکو بکوژ دەبێت پارەی خوێنی ئەو کەسە بداتە بەکەسوکاری کوژراو.

لەم وڵاتەدا ئەگەر ژنێك کە هاوسەری هەیە، حەزی لەپیاوێکی تر بکات، نە ژن و نە خۆشەویستەکەی مەحکوم دەکەن، بەڵکو ژن مافی ئەوەی هەیە لەماڵی هاوسەرەکەیەوە بڕواتە ماڵی خۆشەویستە تازەکەی و لەوێ بۆ هەمیشە نیشتەجێ ببێت، بەڵام خۆشەویستەکەی دەبێت قەرەبوی زیانی هاوسەری ڕابردوی بداتەوە.

ئەگەر ژن و مێرد دوای پێکهێنانی ژیانی هاوسەریان منداڵیان نەبێت، ئەو ژن و مێردایەتیەیان هەڵدەوشێتەوە و ژن یان پیاو ناچار دەبن بۆئەوەی منداڵیان ببێت، هاوسەرێکی تر بۆ خۆیان پەیدا بکەن، چونکە پادشای"هاتی"داوای منداڵێکی زۆر لەهاوڵاتیانی خۆی دەکات.

یەکێك لەنەریتە سەرسوڕهێنەرەکانی ئەم نەتەوەیە ئەوەیە ئەگەر کەسێك لەبیابانێکی چۆڵدا یان لەناوچەیەکدا کە دانیشتوانی کەمی لێ بێت کەسێك بکوژێت، ئەو پارە خوێنەی کە دەیدات زۆر کەمترە لەچاو ئەوپارە خوێنەی کە ئەگەر بێت و لەناو شارە قەرەباڵخەکاندا ئەو کەسە بکوژێت، چونکە لەوباوەڕەدان ئەو کەسەی دەڕواتە شوێنە چۆڵەکان، بەئەنقەست کەسانی تر هانی ئەوە دەدا کە هەوڵی کوشتنی بدەن.

کاتێك من ڕۆشتمە ولاتی"هاتی"یەوە بەخۆمم وت، لەبەرئەوەی دانیشتوانی ئەم ولاتە خەڵکێکی زەحمەتکێشن و ڕاهاتون بەوەی لەئاو و هەوایەکی سارددا بژین، منداڵی ئیفلیج و ناتەواو و لاوازەکانیان دەکوشت، بۆئەوەی لەئایندەدا کەسانێکی ناتەواویان نەبێت و بەردەوام پێویستیان بە پزیشك نەبێت، من بیستبوم کاتێك کەسێك نەخۆش دەکەوێت ئارەزوی ئەوە دەکات بمرێت، بەلام چارەسەر نەکرێت، چونکە ناتوانێت دان بەوەدا بنێت کە نەخۆشە. من دەمزانی کە دانیشتوانی "هاتی" لەمەرگ ناترسن، بەلام لەبێتوانایی و بێدەرەتانی دەترسن، بەلام ئاگاداری ئەوە نەبوم کە لەم ولاتەشدا کۆمەڵێك دەوڵەمەند و وەجاخزادە هەن و کەسە دەوڵەمەند و وەجاخزادەکانی تەواوی جیهان، تەماڵ و خۆپەرستن و لەمەرگ دەترسن و چارسەری خۆیان دەکەن بۆ ئەوەی نەمرن.

ئەوەبوو کۆمەڵێك لەوەجاخزادەکان شەو جلوبەرگی خۆیان دەگۆڕی و دەهاتن بۆماڵی من و منیش چارەسەرم دەکردن، زۆربەیان دەردەکەیان زیادەڕۆیی لەخواردن و خواردنەوەدا بوو، وەجاخزادەکانی"ختوشە" شەرابێکی زۆریان دەخواردەوە و دەستیان بەهۆی زۆر خواردنەوەی شەرابەوە توشی لەرز دەبوو، کەسە نەخۆشەکانیش داوایان لێ دەکردم کە چارەسەری دەستە لەرزۆکەکانیان بکەم و منیش لەڕێی دەرمانە هێورکەرەکان و خۆشۆردنەوە، چارەسەرم دەکردن.

یەکێك لەو شتانەی بووە هۆی ئەوەی وەجاخزادەکانی شار بێنە هاوڕێم ئەوەبوو کە"مینا"لەبەرامبەریاندا سەمای بۆ دەکردن و هەرجارێك ئەوانە بهاتایەن بۆ لام، من بە"مینا"م دەوت کەسەما بۆ وەجاخزادەکان بکات و ئەوانیش لەبەرامبەردا دیاریگەلێکی گرانبەهایان پێشکەش دەکرد و خوشم زێڕ و زیوم لەکەسە نەخۆشەکان

وەردەگرت و لەماوەیەکی کەمدا دەوڵەمەند بوم، لەکاتێکدا، کاتێك چوینە ناو وڵاتی"هاتی"یەوە وام دەزانی بەدەستی خاڵی لەو وڵاتە دەگەڕێمەوە.

یەکێك لەوکەسانەی بووە هاوڕێم نامەنوسی پادشای"هاتی"بوو کە چەند زمانێکی دەزانی و نامەی پادشای بیانی بۆ دەخوێندەوە و وەڵامەکانی بۆ دەنوسیەوە.

ڕۆژێکیان ئەو لەماڵی مندا خواردیەوە و چێژی لەسەماکانی"مینا"وەردەگرت. لێم پرسی: بۆچی پادشاکەی ئێوە دەرگای شاری"ختوشە"بەڕوی بیانیەکاندا داخستووەو ناهێڵێت بێنە ناو ئەم شارەوە؟ بۆچی لەم وڵاتەدا کاروانچیەکان مافی ئەوەیان نیە لەشەقام و شارێکان لابدەن؟ ئایا ئەوە باشتر نیە کە نەتەوەکانی تر بێن بۆ ئەم شارە و چاویان بەهێز و توانای پادشای"هاتی"بکەوێت و بۆ خەڵکانی تری باس بکەن؟

نامەنوس وتی: ئەو ڕۆژەی "شوبیلو لیوما"بو بە پادشای ئەم وڵاتە وتی:(ماوەی سی ساڵ ڕێم پێبدەن، بۆئەوەی وڵاتی"هاتی"تان بۆ بکەم بە بەهێزترین وڵاتی ئەم جیهانە)، لەبەرئەوەی ئەم ماوەیە زۆر بەزوویی تەواو دەبێت و وابزانم لەئایندەدا نەتەوەکانی تر ناوی وڵاتی ئێمەشیان بەرگوێ دەکەوێت.

وتم:ئەوکاتەی من لە"بابل"بووم، شەست کەڕەتی شەست سەربازم بینی کە لەبەرامبەر پادشای "بابل"ەوە تێپەڕین و کاتێك هەنگاویان دەنا، وەك ئەوە وابوو کە گوێت لەدەنگی شەپۆلی دەریا بێت، بەڵام لێرەدا دە کەڕەتی دە سەربازم نەبینی پێکەوە ڕێ بکەن، لەمحاڵەتەدا ئێوە بۆچی ئەو هەموو گالیسکەی جەنگی و چەکانە دروست دەکەن، چونکە ناتوانن سود لەم جۆرە چەکانە وەرگرن.

نامە نوسی پادشا پێکەنی و وتی: ئێمە لەبەرئەوە چەك دروست دەکەین بۆئەوەی بەوانی تری بفرۆشین و لەڕێی پارەی ئەم چەکانەوە خواردن بەدەست بهێنین.

بەدەم پێکەنینەوە وتم: گورگ کەڵبە و چنگە تیژەکانی نافرۆشێت بەکەروێشك.

نامەنوسی پادشا بەو قسەیەی من زۆر پێکەنی و وتی: ئەم گوتەیە بۆ پادشا دەگێڕمەوە و دڵنیام کە ئەویش لەم گوتەیە زۆر خۆشی بێت، هەروەها وڵاتی ئێمە، بەپێچەوانەی وڵاتانی ترەوە دەوڵەمەندەکان فەرمانڕەوایی هەژاران ناکەن، بەڵکو بەهێزەکان فەرمانڕەوایی لاوازەکان دەکەن، چونکە گورگ بۆ ئەوە لەدایك بووە کە فەرمانڕەوایی کەروێشك بکات و من دڵنیام پێش ئەوەی ئەم قڕانەت"مەبەستی

سینۆهەیە" سپی بن، بۆت دەردەکەوێت کە بەچ شێوەیەك دەوڵەتێکی بەهێز بۆ فەرمانڕەوایی هاتووەتە بون و فەرمانڕەوایی تەواوی نەتەوە لاوازەکان دەکات.

خۆم بەنەزان و نەدیوو نیشان دا و وتم: هەروەك چۆن تۆ خودایەکت هەیە کە خوازیاری ئەوەیە فەرمانڕەوایی نەتەوە هەژارەکان بکات، لەوڵاتی میسریشدا، فیرعەون خودایەکی تازەی بەدەست هێناوە.

نامەنوس وتی:لەبەرئەوەی من نامەی فەرمانڕەوا بیانیەکان دەخوێنمەوە، نامەی پادشای میسریشم خوێندوەتەوە و دەزانم کە خودای ئاشتی خوازی زۆر خۆش دەوێت و دەڵێت هیچ ناکۆکیەکی نێوان نەتەوەکان نیە کە نەتوانرێت ئاشتی خوازانە چارەسەر بکرێت و بگرە فیرعەونی ئێوە چڵە ئاڵتونێکی بۆ ناردوین کە لەشێوەی "بازافە"[٤٩] دایە و دەڵێت ئەمە شێوەی ژیانی ئاشتی خوازانەیە.

نامەنوس کاتێك ئەم قەسەیەکی کرد پەنجەی خۆی لەشێوە دوو ئاڕاستەی یەکتر بڕدا نیشان دەدا، بۆئەوەی تێمگەیەنێت کە چڵە ئاڵتونەکەی ئەو چ شێوەیەکی هەبووە.

دوای ئەوە وتی:ئەگەر فیرعەونی ئێوە ئاڵتونمان بۆ بنێرێت، بۆئەوەی ئێمە بتوانین بەئاڵتونی ئەو کرێی پیشەگەرەکانمان بدەین کە چەکمان بۆ دروست دەکەن ، تا چەند ساڵێکی تر دەتوانێت ئاشتی بەدەست بهێنێت، بەڵام ماوەی قۆناخی ئاشتی خوازی ئەو کورت دەبێت، چونکە ئەو ڕۆژەی پادشای ئێمە پەیی بەوە برد کە بەڕادەی پێویست چەکی دروست کردووە و خورد و خۆراکی بەپێی پێویست ئامادە کردووە، لەو ڕۆژەدا فیرعەونی ئێوەش وەك پادشای وڵاتانی تر دەبێت گوێڕایەڵی فەرمانەکانی پادشاکەی ئێمە بێت، ئەگینا ئەو تەواوی خەڵکی وڵاتەکەی بۆ قات و قڕ دەکات، بەڵام ئەمانە بابەتگەلێکن کە هزری پزیشکێك ناتوانێت پەییان پی ببات، چونکە پزیشك ناتوانێت پەی بەڕووداوەکانی ئاینده ببات.

---

[49] ئەو بابەتانەی کە خوێنەران دەربارەی بارودۆخی ژیانی نەتەوە و نەریت و ناوی فەرمانڕەواکانیان بۆ نمونە ئەم "بازافە"یە کە واتای "خاچ" دەگەیەنێت دەخوێننەوە هەموو ئەم ناوانە لەبەڵگە مێژووییەکانەوە وەرگیراوە و هەڵگری بەڵگەی تایبەت بەخۆیانن و بەهای کتێبی ئەم نوسەرە فنلەندیەش لەبەڵگە مێژوویەکانیدایەتی و خاچیش هێمایەك بووە کە چوار هەزار ساڵ لەوەوپێش، بەواتا دوو هەزار ساڵ پێش پەیامبەر"مەسیح"وەك هێمای ئاشتی بەکار هێنراوە.

وتم: لەبەرئەوەی پزیشك وەك خەڵكانی تر مێشكی هەیە، ئەگەر نەتوانێت پەی بەتەواوی ڕوداوەكانی ئایندە ببات، هیچ نەبێت بەنەدە پەی بەهەندێكیان دەبات و من پێشبینی ئەوە دەكەم كە لەساڵەكانی ئایندەدا قۆناخی تێركردنی سكی داڵەكەرخۆرەو كەمتیارەكان دەبێت، چونكە خەڵكێكی زۆر بەكوشت دەدرێن و هیچ كەسێك لاشەكان بۆ مۆمیاكردن یان بۆ خستنە ناو گۆزەیەكی گڵینەوە وناشتنیان كۆناكاتەوە.

نامەنوس پێكەنی و منیش وتم: پێش ئەوەی بێین بۆ وڵاتی"هاتی"بیستبوم كە ئێوە ئەو كەسانەی بەدیلیان دەگرن كوێریان دەكەن و دەیانبەستنەوە بەئاشەكانتانەوە، بۆئەوەی بەرداشەكەتان بۆ بسوڕێننەوە، من كاتێك گوێم لەم قسەیە بوو باوەڕم پێنەكرد، بەڵام لەم وڵاتەدا بەچاوی خۆم بینیم و ئەم ڕەفتارە لە نەتەوەیەكی شارستانی ناوەشێتەوە، هەروەها ئەوەشم بیست كە ئێوە لەسەر سنورەكانتاندا كاتێك سنوری وڵاتە دراوسێكانتان دەبەزێنن، تاوانگەلێكی بێبەزەییانە ئەنجام دەدەن و دەستی خەڵكی دەبڕنەوە و پێستی سەریان دەدەنەوە بەڕوخساریانداو هەندێ كەسیش لەزمە هەڵدەكێشن، ئەم جۆرە ڕەفتار و كردارە دڕندانە شایستەی ئاژەڵە دڕندەكانە نەك مرۆڤێكی شارستانی.

نامەنوس وتی: ئێمە لەبەرئەوەی نەتەوەیەكی شارستانین، چاوی دیلەكان كوێر دەكەینو دەیانبەستینەوە بە بەرداشەكانمانەوە، چونكە ئەگەر چاویان ببینێت، زەویو ئاسمان و باڵندەكان دەبینن و لەبەرئەوەی ئازاد نین، بەداخ دەبن بۆ خۆیان و هەوڵی ئەوە دەدەن هەڵبێن، لەمكاتەدا بەردەوام دوچاری گرفتگەلێكی زۆرمان دەكەن، بەڵام لەبەرئەوەی كوێرن، بیر لەهەڵهاتن ناكەنەوە و ئێمە ناچار نابین بڕێك لەسەربازەكانمان بكەینە پاسەوانی ئەوان، بەڵام بابەتی بڕینی دەستی دانیشتوانی سەرسنوری وڵاتانی تر و پێست كەندنی سەریان و شۆڕكردنەوەی هەمان پێست بەڕوخساریاندا و لەزمە هەڵكێشانیان بەهەمان شێوەی دیلە كوێرەكان بەرژەوەندیەك لەخۆ دەگرێت كە ئەمیش لەشارستانی ئێمەوە سەرچاوە دەگرێت، چونكە ئێمە نامانەوێت لەوڵاتانی تر كوشت و كوشتار بكەین، بۆئەوەی دانیشتوانی ئەو مێرنشینەی كە دەتوانن كارمان بۆ بكەن و باجمان بدەنێ لەناو بچن، هەروەها نامانەوێت بەهۆی جەنگەوە شارەكەیان وێران بكرێت و كێڵگە و باخەكانیان لەناو

بچێت، بۆئەوەی نەوەك دوای داگیرکردنی وڵاتانی دراوسێ هیچمان دەست نەکەوێت. ئێمە ئاگاداری ئەوە بوین کە باشترین کەرەستە بۆ ملکەچ کردنی نەتەوە دراوسێکانمان ترساندن و تۆقاندنیانە، چونکە ئەو میلەتەی دوچاری ترس دەبێت وەك ئەو لەشکرە وایە کە پێش دەستپێکردنی جەنگ شکستی خواردبێت و ئەو نەتەوەیەش چیتر ناتوانێت دەستی بێگانەکان ڕەت بکاتەوە و خۆی لەهێز و دەستەڵاتیان ڕزگار بکات.

هەرلەبەرئەوەش ئێمە لەسەر سنورەکانمان لەگەڵ وڵاتانی تردا بەو شێوەیە ڕەفتار دەکەین بۆئەوەی چاوترسێنی خەڵکی بکەین و پێشوەخت دەژمنانمان سەرکوت بکەین.

وتم: مەگەر هەموو نەتەوەکانی جیهان دوژمنی ئێوەن و ئایا لەنێو نەتەوەکانی تردا دۆست و هاوڕێتان نیە.

نامەنوسی پادشای"هاتی"ش وتی: دۆستانی ئێمە بریتین لەو کەسانەی ملکەچی ئێمە دەبن و باجمان دەدەنێ و ئەوکات ئێمەش دەست وەرنادەینە کاروباریانەوە و با پارێزگاری لە نەریتی خۆیان بکەن و خوداکانی خۆیان بپەرستن.

دۆستەکانی ترمان ئەو نەتەوانەن کە هێشتا نەبونەتە دراوسێی ئێمە، چونکە هەرئەوەی بونە دراوسێمان، ئێمە ئەوەندە بیانویان پێدەگرین تا لەنێوانماندا جەنگ دروست دەبێت و وڵاتەکەیان ئەخەینە ژێر ڕکێفی خۆمانەوە، بۆئەوەی وایان لێ بکەین باجمان پێبدەن.

لەو ڕۆژەوەی"هاتی"دروست بووە، ئەم نەریتە لەنێو ئێمە و کەسانی تردا دەست بەدەستی پێکراوە و ئێستاش هەر دەست بەدەستی پێدەکرێت.

وتم: ئایا خوداکانی ئێوە لەم بابەتەدا دەست وەرنادەنە کاروبارەکانتانەوە، چونکە لەوڵاتانی تردا دروست لەنادروست و حەق لە ناحەق جیا دەکەنەوە.

نامەنوس وتی: ئێمە بیروباوەڕێکی سادە و ڕونمان لەبارەی دروست و نادروست و حەق و ناحەقدا هەیە.

دروستو حەق، بریتیە لەشتێك کە دەقاودەق لەگەڵ ئارەزووەکانماندا دەگونجێت، نادروستو ناحەقیش، بریتیە لەو شتەی کە پێچەوانەی ئارەزوەکانی ئێمەیە، "سینۆهە" لایەنگری ئەوەبکە کە لەنێوان ئاینی ئێمەو ئاینی ئێوەو تەواوی

نەتەوەکانی تردا جیاوازیەك بەدی ناکرێت، چونکە لەلای ئێوە و تەواوی نەتەوەکانی تر دروست و حەق بریتیە لەو شتەی کە دەوڵەمەندەکان دەیانەوێت و نادروست و ناحەقیش بریتیە لەو شتەی کە خواستی کەسە هەژارەکانە."سینۆهە" چونکە تۆ پزیشکی، هزرت زۆر لەوە بچوکترە کە پەی بەم بابەتە ببەیت و بزانی کە لەسەرتای دروست بونی ئەم جیهانە تا ئەمڕۆ، هەرچی کەسە دەوڵەمەندەکان وتویانە ڕاستیان کردووە، هەرچی کەسە هەژارەکانیش وتویانە، پوچەڵکراوەتەوە. تا کۆتایی جیهانیش هەر وا دەمێنێتەوە و بەردەوام حەق لەگەڵ کەسە دەوڵەمەندەکاندایە و کەسە هەژارەکانیش مەحکوم بەپوچەڵکردنەوەی بانگەشەکانیان دەکرێن. تەنها جیاوازی لەڕوخساری دەرەوەی کەسە دەوڵەمەندەکاندا بەدی دەکرێت و لەهەر سەردەم و قۆناخێکدا شتێك دەبێتە هێمای دەوڵەمەندی. ڕۆژێك مەڕ و گا دەبێتە هێمای دەوڵەمەندی و ڕۆژێکی تر زێڕ و زیو و ڕۆژێکی تریش ئەوەی پلەوپایەیەکی تایبەتت هەبێت یان ڕۆژی دوایی ئەوەی هەڵگری ناونیشانێك بیت، بۆ نمونە ناونیشانی "پزیشك" یان"جادوگەر" یان"نامەنوس"ی پادشا، تا ئەم جیهانە مابێت قسەی هەژاران بێنرخ دەبێت و هەرچی بڵێن پوچەڵ دەکرێتەوە. ئەگەر دەوڵەمەندەکان چاویان کوێر نەکەن بۆئەوەی بیانبەستنەوە بەبەرداشەکانەوە، ئەوا بەشێوەیەکی تر کاریان هەر پێدەکەن، چونکە جیهان بەوشێوەیە هاتووەتە بون و دەبێت هەر بەوشێوەیە بمێنێتەوە، کەسی هەژاریش لەبەرئەوە هاتووەتە بون کە بتوانێت کەرەستەی خۆشی و حەوانەوەی دەوڵەمەندەکان فەراهەم بکات و خۆشی بەردەوام برسی و بەردەوام لەزەحمەتدا بێت و جیاوازیەکی تری تایبەتمەندی شارستانی ئێمە لەگەڵ شارستانیەکانی تردا ئەوەیە کە ئێمە هەموومان دەوڵەمەندین و نەتەوەکانی تر گوێڕایەڵ و هەژار دەکەین، بۆئەوەی بەبەردەوامی کارمان بۆ بکەن و زەحمەتمان بۆ بکێشن و دەستکەوتی کارەکەشیان بەناونیشانی "باج" بدەن بەئێمە، بۆئەوەی ئێمە بەئاسودەی و خۆشی بژین، بەڵام خودای ئێمە، چینی تایبەتی وڵات دۆستان، یەکێك ئاسمان و ئەویتریان زەویە و هەموو ساڵێك لەوەرزی بەهاردا بەخۆشی ئەو دوانەوە جەژن دەگێڕین و ڕێ بەنەتەوەکانی تریش دەدەین بۆئەوەی ئەوانیش بتوانن ئاهەنگ بگێڕن.

چونکه ساڵی جارێك دەبێت ڕێی بەنەتەوەکان بدرێت، بۆئەوەی ڕۆژێك بەخۆشی تێپەڕێنن و باشترین وەرز بۆ ئازادکردنی خەڵکی وەرزی بەهارە، چونکە لەم وەرزەدایە کە زەوی سکی لەئاسمان پڕ دەبێت و ژیانیش خۆی دوبارە لەسەرەتاوە دەست پێدەکاتەوە و مرۆڤیش وەك زەوی وایە.

ئێمەش گرنگیەکی زۆر بە سکپڕکردنی ژنان دەدەین، چونکە ئەو نەتەوەیەی دەبێت فەرمانڕەوایی جیهان بکات دەبێت منداڵێکی زۆری ببێت، بۆئەوەی دەستەڵاتی خۆی لەسەر زەویدا فراوانتر بکات. هەموو خەڵکیش وەك تەواوی چینی نەتەوەکانی تره، خاوەنی خوداگەلێکی زۆرن، بەڵام ئێمە نەهیچ گرنگیەك بەبیروباوەڕی ئەوان دەدەین و نە دەبینە ڕێگریشیان و نە هانیشیان دەدەین، چونکە بیروباوەڕی ئەوان لەڕوی سیاسیەوە نە سودمان پێ دەگەیەنن و نە زیان. ئێمە لایەنگری خوداگەلێك دەکەین و هانی خەڵکی دەدەین بیانپەرستن کە پشتیوانی لە زۆر و ترساندن بکات. چونکە دەبێت بەزۆر فەرمانڕەوایی کەسانی تر بکەیت و بە تۆقانیش دەبێت نەتەوەکانی تر بترسێنی، بۆئەوەی گوێڕایەڵ بن، گەر ڕۆژێك بێت ئێمە پەرستگایەك بۆ خوداکانی"زۆر و ترس"دروست بکەین، ئەوا ئەو پەرستگایانە بەئێسقانی مرۆڤەکان بەرپا دەکەین.

بەڵام ئەگەر تۆ دوای ئەوەی لەم وڵاتە دەرچویت، ئەم قسانە بۆ خەڵکانی تر باس بکەیت، هیچ کەسێك باوەڕت پێناکات، چونکە هەموو نەتەوە دورەدەستەکان لەوباوەڕەدان ئێمە نەتەوەیەکی ئاژەڵدار و شوانین کە بەردەوام بەهەژاریەوە لەکێوەکاندا دەژین و نە ئامادەیی ئاغایەتیمان هەیە بەسەر کەسانی تردا و نە توانای فەرمانڕەوایی کەسانی ترمان هەیە.

نامەنوسی پادشای"هاتی"دوای ئەم قسانە لەماڵەکەم ڕۆشتە دەرەوە و دوای ڕۆشتنی ئەویش بە"مینا"م وت: من بێزار بوم لەمانەوەم لەم وڵاتەدا، چونکە ئەوەی دەبوو بیزانم، زانیم و چیتر دوای ئەوە، هەرکاتێك لەم وڵاتەدا و بەتایبەت لەم مانگەدا بمێنمەوە، دور نیە بکوژرێم و ئەگەر منیان بەشێوەیەکی ئاسایی بکوشتایە ئەوا هیچ ترسێکم نەبوو، بەڵام کاتێك بیانەوێت لەم وڵاتەدا کەسە بیانیەکان بکوژن پێستیان دەکەنن یان لەزمەیان دەدەن. هەرلەبەرئەوەش هەرچی زووترە دەبێت لەم وڵاتە بڕۆم و گیانی خۆم ڕزگار بکەم.

لەڕۆژەکانی دواییدا، من لەو نەخۆشانەی سەردانی ماڵەکەمیان دەکرد شتێکی ترم بیست و ئەویش ئەوەیکە لە وڵاتی"هاتی" هەرکەسێك بیروباوەڕێکی جیاواز لەبیروباوەڕی سەرەکی وڵات بڵاو بکاتەوە بەسزای"جادوگەری" دەیدەن لەزمە، بەداخەوە من چەند جارێك شتگەلێکم وتبوو کە پێچەوانەی بیروباوەڕی دەوڵەتی "هاتی"بوە و لەهەر ساتێکدا ئەگەری ئەوە هەبوو دەستگیرم بکەن و بمدەن لەسیخ.

ئەوەبوو کە بەنەخۆشەکانی خۆمم وت: دەمەوێت بگەڕێمەوە، لەبەرئەوەی ئەوان دەستەڵاتیان لەدەزگای دەوڵەتدا هەبوو، مۆڵەتی پەڕینەویان بۆ وەرگرتم و بڕیاربوو لەجادەیەکی تایبەتەوە بپەڕێمەوە و خۆم بگەیەنمە کەنار دەریا.

*بەشی بیست و یەکەم*

# بـــەرەو وڵاتی "کـــریت"

من و "مینا"و"کاپتا"کەوتینە ڕێ و شاری ترسناکی"ختوشە"ی پایتەختی "هاتی" کە خوێن لەدیوارەکانیەوە دەچۆڕا و چارەنوسی ئایندەی جیهانی تێدا ئامادە دەکرا، لەپشت خۆمانەوە بەجێ هێشت و لەتەنیشت ئەو "ئاش"انەوە تێپەڕین کە دیلە کوێرەکان بەرداشەکەیان دەسوڕاندەوە و لەتەنیشت ئەو کەسانەشەوە تێپەڕین کە لەسیخیان هەڵکێشابون، دیاربوو ئەوانە جادوگەر بون.

دوای ئەوەی گەشتینە کەنار دەریا و پێمان نایە لەنگەرگای کەنار ئەو دەریاوە کە تاکە لەنگەرگای وڵاتی"هاتی"یە کە بیانیەکان دەتوانن ئازادانە سەردانی ئەو ناوچانە بکەن، بەڵام مافی ئەوەیان نیە بڕۆنە ناو ئەو وڵاتەوە. ئەو لەنگەرگایەش وەك تەواوی لەنگەرگاکانی تر، مەیخانە وماڵێکی زۆر و سۆزانیخانەیەکی زۆری تێدابوو و لە ماڵ‌و مەیخانەکانەوە بەردەوام دەنگی مۆزیکی سریانی بەرگوێ دەکەوت.

کەشتیەوانان و کرێکارانی کەشتی کاتێك پێدەنێنە ئەم لەنگەرگایەوە، خۆیان بەخۆشبەخت دەبینی، لەبەرئەوەی خواردن و خواردنەوە و ژن، لەوێدا زۆر بوو و ئەم گروپە، بێ لەو سیانە هیچی تریان نەدەویست و لەهەر شوێنێکدا ئەم سیانەی تێدا بێت، خۆیان بەخۆشبەخت دەزانن.

ئێمە بۆماوەیەکی زۆر لەو لەنگەرگایەدا ماینەوە و هەرکاتێك کەشتیەك بەرەو دورگەی"کریت"بکەوتایەتە ڕێ من بە"مینا"م دەوت: بەو کەشتیە بڕوین؟ بەڵام ئەو وەڵامی دەدایەوە ئەم کەشتیە بچوکە و لەوانەیە نوقمی دەریا ببێت. یان دەیوت ئەم کەشتیە یەکێکە لەکەشتیە مەزنەکانی سوریا و من ئامادە نیم بەو کەشتیە بڕۆم. یان

دەیوت کەشتیەوانی ئەم کەشتیە پیاوێکی کەمتەرخەمە و دەترسم لەڕێدا من بفرۆشێت بەچەتەکانی دەریا.

من لەهەمان ئەو لەنگەرگایەدا کاری پزیشکی خۆم ئەنجام دەدا، دوبارە کەسە نەخۆشەکان سەردانیان دەکردم، چونکە ناوبانگی پزیشکی میسری گەشتبووە ئەوێش.

یەکێك لەو کەسانەی کە سەردانی کردم، فەرماندەی پاسەوانانی لەنگەرگا بوو. ئەو پیاوە بەهۆی ڕابواردنی لەگەڵ ئەو ژنانەی کە لە سۆزانیخانەی لەنگەرگادا نیشتەجێن، دوچاری نەخۆشیەك بوبو کە من لەکاتی مانەوەم لەسوریادا لە"ئزمیر"ئەو نەخۆشیەم ناسی و لەپزیشکە سریانیەکانەوە فێری شێوازی چارەسەرکردنەکەی بوم.

فەرماندەی پاسەوانی لەنگەرگا بەهۆی توشبونی بەو نەخۆشیە، ناتوانێت لەگەڵ ژناندا ڕابوێرێت و دەیوت: ژنێك ئەم نەخۆشیەی بۆ من گواستەوە و منیش ئەوم لەزمە هەڵکێشا و کوشتم. ئەو پیاوەش ئەو نەخۆشیە زۆر کاری تێکردبوو، چونکە لەو لەنگەرگایەدا، نەریت وابوو ئەو ژنانەی کە لە مەیخانەکان و سۆزانیخانەکاندا شاردا سەرقاڵی کارکردنن، دەبێت بێ بەرامبەر لەگەڵ فەرماندەی پاسەوانانی لەنەگەرگادا ڕابوێرن و هەر لەبەرئەوەش ئەو پیاوە دڵگران بوو لەوەی ناتوانێت سود لەم ڕابواردنە خۆڕایە وەرگرێت.

کاتێك چارەسەرم کرد و جارێکی تر توانی لەگەڵ ژناندا ڕابوێرێت، بەجۆرێك خۆشحاڵ بوو کە پێی وتم: ئامادەم بەئەندازەی کێشی ئەندامی نێرینەم کە ئێستا چاك بووەتەوە زێڕت پێ بدەم.

منیش وتم: من خوازیاری ئاڵتونی تۆ نیم و ئەگەر دەتەوێت شتێك بەمن بدەیت، ئەو چەقۆیەی کە بەکەمەرتەوە هەڵتواسیوە بدە بەمن. فەرماندەی پاسەوانیش پێکەنیو وتی: ئەم چەقۆیە چ سودێکت پێدەگەیەنێت، چونکە نە لەزیو دروست کراوەو نە لە ئاڵتون.

بەڵام من دەمزانی ئەو چەقۆیە بەهەمان ئەو کانزا سەیرەی کە بە"ئاسن" بانگ دەکرێت دروست کراوە، و نرخی لەدەرەوەی وڵاتی"هاتی" بەڕادەیەك زۆرە کە چەقۆی ئاسنین لەبەرامبەر کێشی ئاڵتوندا نرخی هەیە.

کاتێك من لە"ختوشە"بوم دەمویست یەکێك لەو چەقۆیانە بکڕم، بەڵام تێگەشتم ئەو چەقۆیە نافرۆشن بەبیانیەکان. ئەگەر پێداگریشم لێ بکردایە لەوانە بوو گومانی ئەوەم لێ بکەن و ئەوەیان بۆ ئاشکرا ببێت کە من دەمەوێت ئەو جۆرە کانزایە ببەمە دەرەوەی"هاتی"، بەڵام ئەم چەقۆ گرانبەهایە، بۆ خودی دانیشتوانی"هاتی" ئەو نرخەی نەبوو، چونکە دەتوانن هاوشێوەی ئەم جۆرە چەقۆیانە بکڕن. کاتێك فەرماندەی لەنگەرگا زانی من بەڕاستی خوازیاری ئەم چەقۆیەم لەبەرئەوەی بەم زوانە لە"هاتی"دەردەچم، ئامادە بوو پێمی بدات. چەقۆی ئاسنین بەڕادەیەك تیژە کە لەچەقۆی بەردی"سماق"باشتر ڕیش دەتاشێت و دەتوانرێت بە چەقۆی ئاسنین چەقۆی مسین و زیوین و ئاڵتونین بقرتێنێ.

لەو لەنگەرگایەدا لەوەڕگایەك هەبوو کە دانیشتوانی"هاتی"گاکانیان لەوێدا دەلەوەڕاند و لاوەکانیش یاریان لەگەڵ گاکاندا دەکرد و لەبەرامبەریاندا سەمایان دەکرد و جارناجارێك ڕمیان دەچەقاندە پشتیانەوە.

کاتێك"مینا"چاوی بە"گا"نێرەکان کەوت زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە زانی دەتوانێت لەبەرامبەر"گا"نێرەکاندا سەما بکات و مەشەق لەسەر سەماکەی خۆی بکات.

کاتێك من بۆ یەکەمجار سەمای"مینا"م لەبەرامبەر"گا"کاندا بینی، بەڕادەیەك ترسام کە زمان لەپێناسەکردنیدا لاڵ دەبێت، چونکە گایەکی نێر لەو جۆرە"گا"یانەی کە لەو جۆرە لەوەڕگانەدا پەروەردە دەکرێن، لە"فیل"ی کێوی ئەو دارستانانەی کە دەکەونە باشوری میسرەوە هەڕەشەئامێز و ترسناکترن، ئەگەر کەسێك کاری بەفیل نەبێت، ئەوا ئەویش پەلاماری مرۆڤ نادات و هەوڵی ئازاردانی نادات، بەڵام گای نێر ئازاربەخشە و هەرئەوەی چاوی بەمرۆڤێك بکەوێت پەلاماری دەدات و شاخەکانیشی وەك چەقۆ و نێزە تیژن و بەیەك قۆچ، شاخەکانی دەچەقێنێتە ورگی مرۆڤەوە و بەرزی دەکاتەوە و دوبارە فڕێی دەداتەوە سەرزەوی و پێماڵی دەکات.

"مینا"بەپۆشکاکێکی ناسکەوە لەبەرامبەر ئەو"گا" نێرەدا دەستی کرد بەسەما کردن و بەلێهاتوییەکی سەرسوڕهێنەرەوە خۆی لەشاخەکانی ڕزگار دەکرد و ئەوەندە بەخێرا دەجوڵایەوە کە چاو نەیدەتوانی دوای جوڵەی سەماکانی بکەوێت و هەندێکات بوێری دەگەیاندە ئاستێك کە بەیەك باز بەسەر سەری"گا"کەدا ڕادەوەستا و هەردوو

شاخی بەدەستی دەگرت و پێی دەنایە سەر سەری و تاقلەیەکی بۆ دواوە لێدەدا و لەسەر پشتی"گا"کەدا دادەنیشت و دوای ئەوەی دادەبەزیەوە.

کاتێك سەمای مینا تەواو بوو، لاوەکان چەپکە گوڵیان لەملی دەئالاند و ئەو کەشتیەوانانەی کە لەوێ ئامادە بون وتیان هیچ کەسێك تائێستا نەیوێراوە بە بوێریەوە سەما بکات.

کاتێك لەلەوەرگاکە گەڕاینەوە من زۆر خەمگین بوم، چونکە دەمزانی هەمان ئەو"گا"یەی کە ئەو لەبەرامبەریدا سەمای دەکرد، ژنی لاو دەکاتە قوربانی خۆی، چونکە"مینا" بڕیاری ئەوەی دابوو خۆی بکات بەقوربانی خودای خۆی. ئەو خودایەش "گا"یەکە یان لە"گا"یەك دەچێت.

دوای ئەوە، کەشتیەك لەکەشتیەکانی دورگەی"کریت"هاتە ناو لەنگەرگاکەوە و ئەو کەشتیەش نە گەورە بوو و نە بچوك و کەشتیەوانی ئەو کەشتیەش پیاوێکی چاك دەهاتە بەرچاو.

"مینا"وتی: من بەم کەشتیە دەڕۆم بۆ"کریت"، بۆئەوەی خۆم بدەم بەدەست خودای خۆمەوە و تۆش دوای ڕۆشتنی من، باشتر دەتوانی بژیت و کارەکانی خۆشت باشتر ئەنجام بدەیت، دەزانم بەهۆی ڕزگار کردنی منەوە لە"بابل"دا زیانێکی زۆرت پێکەشت و دوای ئەوەش نەتویست من لە"هاتی"دا بەتەنها بەجێ بهێڵیت و بگەڕێیتەوە.

وتم:"مینا"من ناتوانم بهێڵم تۆ بەتەنهایی بڕۆیت بۆ دورگەی"کریت".

"مینا"ش لەوکاتەدا پرسی:بۆچی حەزناکەیت من بەتەنهایی بڕۆم بۆ دورگەی"کریت"؟ ئەگەر لەکەشتیەوانی کەشتیەکە دەترسی، ئەوە بزانە کە پیاوێکی چاکە و من بە چەتە دەریاییەکان نافرۆشێت و منیش بە بێوەیی دەگەمە دورگەی"کریت".

وتم: "مینا"من دەزانم کە کەشتیەوانی ئەم کەشتیە کابرایەکی باشە و ناتفرۆشێت بەهیچ کەسێك، بەڵام تۆ دەزانی کە من بۆچی دەمەوێت لەگەڵ تۆدا بێم بۆ دورگەی"کریت" و دەشزانی کە من زۆر بەتۆوە پەیوەست بوم.

"مینا"دەستی خستە سەر دەستم و وتی:"سینۆهە"من لەگەڵ تۆدا چێژم لەژیان وەرگرت، چونکە منت بردە چەند وڵاتێك و میرنشینی ئەو وڵاتانەت پێنیشان دام و من

بەشێوەیەك سەرقاڵی تەماشاکردنی ئەم وڵاتانە بوم، کە نیشتمانی خۆمی"کریت"لەبیر بردبومەوە. هەرلەبەرئەوەش هەرجارێك کە دەتوت بڕۆمەوە بۆ"کریت" منیش ئەم گەشتەی خۆم بەبیانویەك دوا دەخست. چونکە نەمدەویست لەتۆ جیا ببمەوە، بەڵام دوای ئەوەی لەبەرامبەر"گا"کاندا سەمام کرد، ئەوەم هاتەوە یاد کە خودای من چاوەڕێم دەکات، بۆئەوەی بڕۆم و کچێنی خۆمی پێشکەش بکەم، ئەگەر خودای من چاوەڕێی وەرگرتنی کچێنی من نەبوایە، ئەوکاتت من بەتۆم دەبەخشی.

وتم:"مینا" ئێمە جارێك لەمبارەیەوە دواین و من وتم کە ئەم بابەتەم پشتگوێ خستووە. ئەوە پەیوەست بونەی من بەتۆوە هەمە لەپێناو ئەو شتەدا نیە کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە، چونکە ئەوەی تۆ هەتە هەموو ژنەکانی تریش هەیانە و هەرکاتێك هەر پیاوێك داوایان لێ بکات ببێتە خوشکیان، ڕازی دەبن.

توڕەیی زاڵ بوو بەسەر"مینا"دا و دەستی گوشیم و وتی: ئەگەر تۆ خوازیاری ژنانی مەیخانە و ماڵە گشتیەکانی بڕۆ و لەگەڵیاندا ڕابوێرە، بەڵام ئەوە بزانە لەوانەیە بەشێوەیەك توڕە ببم کە تۆ بریندار بکەم و خوێنت بڕێژم، حەز دەکەم تۆش وەك من بیت و هەروەك چۆن من لەگەڵ هیچ پیاوێکدا ڕانابوێرم، تۆش لەگەڵ هیچ ژنێکدا ڕانەبوێری.

وتم: خودای تۆ ئەوەی قەدەغە کردووە کە لەگەڵ پیاواندا ڕابوێری، بەڵام هیچ یەك لەخوداکانی من ئەم شتەی لەمن قەدەغە نەکردووە.

"مینا"وتی: بەڵام ئەگەر تۆ لەگەڵ ژنێکدا ڕابوێری و دوای ئەوەی بتەوێت دەستەکانت لەسەر سەرم دانێیت....ئەوا لەم حاڵەتەدا هەر بەو شێوەی پێم وتی بریندارت دەکەم.

وتم:"مینا" لەمبارەیەوە خەیاڵت ئاسودە بێت، چونکە لەگەڵ ژندا ڕابواردن، کارێکە هەموو پیاوێك ئارەزوی دەکات، من جارێکیان لەپێناو ڕابواردن لەگەڵ ژنێکدا، هەموو شتێکی خۆم لەدەست دا و هەژار کەوتم و ئەم بابەتەش بەشێوەیەك منی لەڕابواردن زویر و بێزار کرد کە بەڕاستی حەزناکەم ئەو جۆرە ژنانە بکەم بەخوشکی خۆم.

"مینا"ش وتی: لەبەرئەوەی من ژنم، بەجۆرێك لەجۆرەکان بەم جۆرە قسانە تێکدەچم، چونکە حەزناکەم پیاوێك بڵێت ڕقم لەوەیە لەگەڵ ژناندا ڕابوێرم.

کاتێك شەو داهات و من خەوم لێکەوت بینیم"مینا" کە شەوەکانی تر دەهاتە ژورەکەمەوە، بەڵام ئەمشەو نەهاتە لامەوە، بۆیە بانگم کرد و وتم: تۆ هەموو شەوێك بەگەرمی جەستەت منت گەرم دەکردەوە، بۆچی ئەمشەو نایەیت بۆئەوەی گەرمم بکەیتەوە، ئایا بەهۆی قسەکانی ئەمڕۆم لێم زیز بویت؟

"مینا" وتی: نەخێر"سینۆهە" من لەتۆ زیز نەبوم، بەڵام ئەمشەو جەستەم بەڕادەیەك گەرمە ئەگەر بێم بۆ لات و خۆم پێتەوە بچەسپێنم، لەوانەیە بەهۆی ئەم گەرما لەڕادەبەدەرەمەوە بتسوتێنم.

من هەستام و ڕۆشتمە لای و دەستم دا لەجەستەی و پەیم بەوە برد کە"تا"ی هەیەو پێم وت:"مینا" وابزانم نەخۆش کەوتویت، بهێڵە با چارەسەرت بکەم.

"مینا"سەرەتا نەیدەویست یەکسەر چارەسەری بۆ بکرێت و دەیوت کە خوداکەم چارەسەرم دەکات.....بەڵام من پێم وت: سەرەڕای ئەوەی خوداکەی دەتوانێت تینویەتی و برسیەتی بشکێنێ بۆئەوەی ئاو نەخواتەوە و خواردن نەخوات، بەڵام بێ خواردن و خواردنەوەی ئاو خودا ناتوانێت تینویەتی و برسیەتی بشکێنێ و نەخۆشیش بەهەمان شێوەیە، بۆیە دەبێت دەرمانی پزیشك بەکار بهێنرێت، بۆئەوەی کەسی نەخۆش چارەسەر بکرێت.

"مینا" ڕازی بوو بەوەی دەرمانی پێ بدەم، منیش دەرمانێکی هێورکەرم پێ بەخشی و وتم: ئێستا بخەوە، چونکە دوای خواردنی ئەم دەرمانە، دەبێت بخەویت، بۆئەوەی ئەم نەخۆشیەت لەناو بچێت.

"مینا" خەوی لێکەوت بەڵام من تا بەیانی بەلاسەریەوە بەبێداری مامەوە و کاتێك گزنگی بەیان هەڵهات، ڕۆشتمە ژورەکەی خۆم بۆئەوەی بخەوم.

بەڵام نەخۆشی"مینا" درێژی نەخایاند و زوو چاك بویەوە و ئەو ڕۆژە گەشت کە بڕیاربوو ئێمە بەکەشتی بڕۆین بۆ"کریت"و وتم بە"کاپتا"ی بەندەم دەڵێم کە کەلوپەلی گەشتەکەمان ئامادە بکات، بۆئەوەی سواری کەشتی ببین و بڕۆین بۆ دورگەی"کریت" کە نیشتمان "مینا"یە.

"کاپتا" وتی: من پێشبینی ئەوەم دەکرد کە تۆ بەهۆی ئەم کچەوە دوبارە سواری کەشتیم دەکەیتەوە، لەکاتێکدا تۆ پێت وتم چیتر دوای ئەوە هەرگیز سواری کەشتی نابین و من دەبوو لەداخی ئەم بەدبەختیەم جلەکانی بەرم هەڵدڕیایە، بەڵام نایدڕم،

چونکە دوای ئەوە ناچار دەبم دوبارە بیدورمەوە، هەروەها ناشگریم، چونکە دەترسم تاکە چاوی خۆم لەدەست بدەم و تەنها بەیەك شت دڵنەوایی خۆم دەدەمەوە ئەویش ئەوەیە کە ئەم گەشتە دەریاییەم، هەر بەوشێوەی پێشبینی دەکەم دواین کۆچی منە بەکەشتی و چیتر دوای ئەوەی سواری هیچ کەشتیەك نابم، بەهەرحاڵ لەبەرئەوەی دڵنیام تۆ لەگەڵ ئەم کچەدا دەڕۆیت بۆ دورگەی"کریت" کەلوپەلی ئەم گەشتەم ئامادە کردووە.

من کە چاوەڕێی ناڕەزایی توند و شیوەن و شەپۆڕی"کاپتا"بوم، سەرم لەوە سوڕما کە زوو خۆی دا بەدەستەوە، بەڵام لەدواییدا ئاگاداری ئەوە بووم کە ئەو دوسێ ڕۆژ لەوەوپێش لەگەڵ چەند کرێکارێکی کەشتی و کەشتیەوانانی لەنگەرگا گفتوگۆکردووەو بۆ ڕێگرتن لە نەخۆسی دەریا کە لەشەپۆلەکانەوە سەرچاوە دەگرێت، ناوی دەرمانێکی لەوان پرسیوە و ئامۆژگاری ئەوەیان کردووە کە ڕۆژێك پێش ئەوەی سواری کەشتی ببێت، بەشێوەیەکی تەواو خۆی لەهەموو جۆرە خواردنێك بپارێزێت و پشتێنەکەی خۆی بەتوندی لەکەمەری ببەستێت، بۆئەوەی ورگی کۆ ببێتەوە و دوای ئەوەی سواری کەشتی ببێت و کاتێکیش سواری کەشتی بوو، یەکسەر بڕوات بخەوێت، بەم شێوەیە توشی نەخۆشی دەریا نابێت.

"کاپتا"ڕۆژێك پێش ئەوەی گەشتەکەمان دەست پێبکەین، خۆی لەهەموو جۆرە خواردنێك پاراست و کاتێکیش سواری کەشتیەکە بوین پشتێنەکەی خۆی لەکەمەریدا توند کرد.

فەرماندەی پاسەوانانی لەنگەرگا بۆ ڕەوانەکردنمان تا سەر کەشتیەکە هات و منی بە کەشتیەوانەکە سپارد، ئەوکات کرێکارانی کەشتیەکە سەوڵەکانی خۆیان هەڵگرت و بەسەوڵ لێدان لە لەنگەرگاکە چونە دەرەوە.

دوای دەرچونمان لە لەنگەرگا کەشتیەوانی کەشتیەکە، قوربانی پێشکەشی خودای دەریا و خودای"کریت"کرد و دوای ئەوە فەرمانی دا چارۆکەکان هەڵبدەن.

هەرئەوەی چارۆکەکان کرانەوە و کەشتی بەسەر ئاوی دەریادا چەمایەوە شەپۆلی دەریا دەستی کرد بەڕاتەکاندنی کەشتیەکە و من هەستم بە ناڕەحەتی و تێکچونی گەدەی خۆم کرد و خەوتم.

ڕۆژی دەوایی لەخەو هەستام و بینیم لەناوەڕاستی دەریادام و لەهیچ لایەکەوە وشکانی بەچاو نابینرێت. ئاسمانی شین و خۆری گەرم و شنەی بای دەریا بەهێز بوو، کەشتیەکەشمان زۆر بەخێرایی دەڕۆشت.

کەشتیەکی جەنگی لەکەشتیەکانی"کریت" بەگومانی ئەوەی ئێمە چەتەکانی دەریاین، لێمان نزیك بونەوە، بەڵام دوای ئەوەی تێگەشتن کە یەکێك لەکەشتیەکانی "کریت"ین بەئاڵاکەیان سڵاویان لێکردین و لێمان دور کەوتەوە.

"کاپتا"کە چیتر لەنەخۆشی دەریا نەدەترسا هاتە سەر سەکۆی کشەتیەکە و لەگەڵ کرێکارانی ناو کەشتیەکە دەستی کرد بەقسەکردن و وتی:ئەو شتگەلێکی سەیری لەجیهاندا بینیوە و لەگەشتێکیدا لەمیسرەوە بۆ سوریا دەڕۆشت، گرفتاری شەپۆلانی دەریا بووە و ئەوەندەی نەمابوو بخنکێت.

ئەوکات باسی گیانەوەرە سەیرەکانی ڕوباری"نیل"ی بۆ کردن و ویستی لەڕێی ئەوشتە سەیرانەی کە بینیبونی، کرێکارانی کەشتی سەرسورماو بکات.

ئەوکات کرێکارانی کەشتی دەستیان کرد بەقسەکردن و باسی گیانەوەرە ترسناکەکانی دەریایان لەجۆری ماسی"عەنبەر"و ئەو ماسیانەیان کرد کە نیوەی سەرەوەی جەستەیان وەك مرۆڤە و دەنگێکی نەرمونیانیان هەیە ،"کاپتا" بەڕادەیەك لەقسەکانی ئەوان تۆقاو و سەرسوڕماو بوو، کە بڕیاری دا چیتر کرێکارانی دەریان بەقسە سەیرەکانی سەرسوڕماو نەکات.

هەرچی زیاتر لەکریتەوە نزیکتر ببوینایەتەوە"مینا" گەش و کراوە و خۆشحاڵتر دەبوو و شنەی دەریاش قژی پەرێشان دەکرد و جوانتر دەبوو، بەڵام من بەداخ بوم بۆئەوەی دەبێت لەدەستی بدەم و بەخۆمم دەوت، ئەگەر بێ"مینا"لە"کریت"ەوە بگەڕێمەوە بۆ میسر، لەم حاڵەتەدا ئەم گەڕانەوەیەم بۆ میسر هیچ تامێکی نابێت. چونکە بێ "مینا" ژیان بە تاریك و تاڵ دێتە بەرچاوم.

من زۆر خەمگین بوم کە چیتر دوای ئەوە ناتوانم دەستەکانی"مینا"بەدەستەکانی خۆم بگرم و بەجەستەم هەستی بەگەرمی جەستەی بکەم.

کەشتیوانی کەشتی و کرێکارەکانی ئەو کەشتیە خەڵکی دورگەی"کریت"بون و ڕێزیان لە"مینا"دەگرت، لەبەرئەوەی دەیانزانی کە یەکێکە لەو کچانەی کە دەبێت

کچێنی خۆی پێشکەشی خودای کریت بکات، هەروەها دەشیانزانی کە زۆر جوان لەبەرامبەری "گا"دا سەما دەکات.

کاتێک من دەمویست لەبارەی خودای "کریت" پرسیار لە کەشتیەوان و کرێکارەکانی بکەم، ئەوان وەلامیان نەدەدامەوە و لێم دور دەکەوتنەوە، یان دەیانوت لەبەرئەوەی تۆ کەسێکی بیانیت لەزمانی تۆ تێناگەین.

*بەشی بست و دووەم*

## چیم لە"کریت"دا بینی

ڕۆژێك هات کە دورگەی"کریت"سەری لەدەریاوە دەرهێنا و کرێکارانی کەشتیەکە لە خۆشیان هاواریان دەکرد. لەبەر بەسەلامەت گەیشتنەوەیان بە نیشتمانی خۆیان، کەشتیەوانی کەشتی و کرێکارەکان بەشوکرانەی ئەوەیکە بە بێوەیی لەم گەشتەیان گەڕاونەتەوە، قوربانیەکیان پێشکەشی خودای دەریا کرد کە هەمان خودای"کریت"ە. بەهەمان ئەو ڕادەیەی کرێکارانی کەشتی و کەشتیەوان و"مینا" لەتەماشاکردنی دورگەی "کریت"و درەختی زەیتون و کێوەکانی خۆشحاڵ بون، من بەو ئەندازەیە خەمگین بوم. لەبەرئەوەی دەمزانی دەبێت"مینا" لەوێ بەجێ بهێڵم و بێ ئەو بگەڕێمەوە.

"مینا" لەخۆشیاندا بەهۆی چاوپێکەوتنی نیشتمانەکەی دەگریا، بەڵام"کاپتا"بەسەرسوڕمان و بەهۆی چاوپێکەوتنی دەریای بەرامبەر دورگەی کریت دەمی داچەقابوو و ئەو کەشتیانەی لەوێ بون دەژمارد و دوای ئەوەی دە کەڕەت شەست کەشتی ژمارد و تێگەشت هێشتا بەهەمان ئەو ڕێژەیەی کە ژماردویەتی کەشتی ماوە بیانژمێرێ و وتی: هەموو جیهان بەئەندازەی ئێرە کەشتی تێدا نیە.

"کریت"ئەوەندە باوەڕی بەتوانای خودای خۆی بوو کە لە لەنگەرگای ئەو وڵاتەدا نە منارەیەك هەبوو، نە ڕاگریەکی بەهێزی دەریا و خانووەکانی لەنگەرگاش لەقەراخ دەریاوە دەستی پێ دەکرد.

کاتێك چومە ناو"کریت"ەوە شتگەلێکم بەرچاو کەوت کە لەهەموو گەشتەکانی ژیانم چاوم پێیان نەکەوتبوو[50].

ئاشکرایە کە پزیشکێکی وەك من، کاتێك دەچێتە ناو وڵاتێکەوە، لەیەکەم چاوپێکەوتندا تەماشای باڵاو و سەروچاویان دەکات بۆئەوەی بزانێت جەستەیەکی تەندروستیان هەیە؟ من خەڵکگەلێکی جوان و تەندروستم بینی و دوای ماوەیەکی کەم تێگەشتم کە لەزمانی خەڵکی"کریت"دا وشەیەك نیە کە تێیدا بتوانی لەواتای مردوو تێبگەیت و خەڵکی بەشێوەیەك هەوەسبازن و هۆگری خۆشگوزەرانین کە هەرگیز بیر لەمەرگ ناکەنەوە و ئەگەر کەسێکیش بمرێت، بۆ بردنی لاشەی ئەو مردووە پەنا بۆ جۆرەها فڕوفێڵ دەبەن، بۆئەوەی هیچ کەسێك ئاگاداری ئەوە نەبێت کە ژنێك یان پیاوێك مردووە.

من بیستومە کە مردووەکان دەسوتێنن و لەناوی دەبەن و بەو شێوەی کە باوە مردووەکان نانێژن، چونکە من لە"کریت"دا چاوم بەگۆڕ نەکەوت و تەنها گۆڕی چەند فەرمانڕەوایەکی کۆنی"کریت"م بینی کە بەردێکی مەزنیان لەسەر گۆڕەکانیان دانابوو.

بەڵام کاتێك لەبەردەم گۆڕەکانەوە تێدەپەڕن، بەشێوەیەك ڕویان وەردەگێڕن کە وەك بڵێی هەر نەیانبینیوە و وا دەزانن بەمشێوەیە دەتوانن نکوڵی لەبونی مەرگ بکەن.

هونەرمەندتر لە هونەرمەندان و پیشەگەرانی"کریت"لەجیهاندا بەدی ناکرێت. گۆزە و کاسەی گڵینی ئەوان زیاتر لەگەوهەرێك دەچێت تا گۆزەیەك و کاتێك مرۆڤ کاسەیەکی گڵینی"کریت"بەدەستەکانی هەڵگرێت بۆ ئەوەی پێ بخواتەوە، بەیەکجار تەماشاکردنی تێر ناخوات و لەسەر کاسەکە، جۆرەها ماسیگەلی دەریا و پەپولەی لەئاسماندا فڕیو و لەسەر گوڵەکان بەرچاو دەکەون، هەر دەستەیەك لەگیانەوەرەکان هەڵگری ڕەنگێکی تایبەت بەخۆیانن، هەڵبەت بەشێوەیەك کە مرۆڤ وا هەست دەکات کەگۆزەگەر لەباتی ڕەنگە گڵینەکان، گەوهەری بە گۆزەکەوە نوساندووە.

---

[50] خوێنەری بەڕێز دەبێت ئاگاداری ئەوە بیت ئەم بەشە لەسەرگوزشتەی"سینۆهە" کەبەدورگەی "کریت"ەوە پەیوەست دەکرێت یەکێك بووە لەنێوەندە مەزنەکانی جیهانی پزیشکی میسری"چوار هەزار ساڵ لەوەو پێش" ، لەدیدی مێژووەوە یەکێکە لەبەشە سەیر و سەرنج ڕاکێشەکانی ئەم سەرگوزشتەیە، چونکە مێژووی دورگەی"کرت" بەپێچەوانەی مێژوی "میسر و ئێران و یۆنان و ڕۆم"ەوە زۆر بەناوبانگە و لەوانەیە هێشتا هەندێك خەڵك نەزانن کە"کریت" لەشارستانی جیهاندا چ ڕۆڵێکی کاریگەری بینیوە.

هەر گۆزەگەرێك وێنەی گۆزەكانی خۆی بەشێوەیەكی تایبەت دەكێشێت و ڕەنكاری تێدا دەكات و لەسەر كاسەیەكی گڵێن وێنەی گیانەوەرانی دەریا و لەسەر كاسەیەكی تریشدا وێنەی گیانەوەرە وشكانیەكان و لەسەر كاسەی سێیەمدا وێنە باڵندەكان دەبینرێت.

یەكێك لەوشتانەی من نەلە"تبس"نەلە"بابل"دا نەمبینیوە، هەروەها یەكێكە لەتایبەتمەندیە مەزنەكانی شارستانی جیهان و تەنها دانیشتوانی كریت هەڵگری ئەم تایبەتمەندیەن، جۆری دروستكردنی ئاودەستەكانی دورگەی"كریت"ە، ئاودەستەكانی"بابل"بەڕادەیەك پیسە كە مرۆڤێكی شارستانی حەزناكات بچێتە ناویەوە، لە"تبس"دا سەرەڕای ئەوەی خوداكانی ئێمە وتویانە هەمیشە ئاودەستەكان بەپاكی ڕابگرین، بەڵام سەرەڕای ئەوەش بەو شێوەی كە پێویستە پاك نیە، بەڵام لە"كریت"دا هەموو ئاودەستێك نمونەی هونەر و سەلیقەی پاكوخاوێنیە. چونكە شەوو ڕۆژ بەردەوام ئاوی نیوە گەرم بەئاودەستەكاندا دەڕێژن و ئەوەندە پاك و خاوێنە كە هیچ جۆرە بۆنێكی ناخۆش لەئاودەستەكانیاندا بەدی ناكرێت.

ماڵەكانی كریت وەك كۆشكەكانی"بابل"پێك نایەن لە چەند نهۆمێك و بەو ڕادەیەش بەرز نین، بەڵام لەبەرامبەردا بۆ ژیان زۆر پاكترە و خۆشترە لەماڵەكانی"بابل".

لەبەرئەوەی ژورەكان گەورە و پەنجەرەكان فراوان دروست دەكەن و هەرماڵێك خاوەنی ژورێكی خۆشۆردنە و هەر ژورێكی خۆشۆردنیش تەشتێكی گەورەی بۆ خۆشۆردن تێدایە، بەهۆی بەلوعەكانەوە ئاوی سارد و گەرم دەڕژێتە ناو ئەو تەشتە گەرمەوە و من لەسەرەتادا وام دەزانی ئەم ئاودەست و ژوری خۆشۆردنە بێوێنانە تایبەتە بەكەسە دەوڵەمەندەكان، بەڵام لەدواییدا بینیم، بگرە لەماڵی هەژارترین كەسانی شاریشدا ئاودەستێكی پاكی بەئاوی سارد و گەرمەوە تێدایە، هەروەها حەمامێكی جوانیش بەئاوی سارد و گەرمەوە تێدا بەدی دەكرێت، ئەوكات تێگەشتم بۆچی خەڵكی ئەوەندە جوانن، چونكە ئاودەستی پاك و ژوری خۆشۆردن بەئاوی سارد و گەرمەوە، مرۆڤ جوان دەكات.

ژنەكانی"كریت"هەندێكات ئەو ڕۆژەیان بە هەڵكەندنی موی جەستەیان و شۆردن و ئارایشتی ڕۆخساریانەوە تێدەپەڕێنن و ئەوەندە وردبینی لەئارایشت كردنیاندا دەكەن كە هەرگیز لەكاتی خۆیدا ئامادەی كۆڕ و مێوانداریەكان نابن و هیچ كەسێكیش

لەکاتی میوانداریدا سەیری بەم دواکەوتنە نایەت، پۆشاکی ژنەکان لە"کریت"دا جۆرە جلێکە کە تەواوی جەستەیان بێ لەدەست و پێ و سینەیان دادەپۆشن ، چونکە زۆر شانازی بەجوانی دەست و سینەیانەوە دەکەن و حەز دەکەن خەڵکی چاویان بەجوانیان بکەوێت و ژنانی "کریت" بەشێوەیەکی سەرسوڕهێنەر ئاڕایشت دەکەن، لەکاتێکدا لە"تبس"ی پایتەختی میسردا، قژیان دەتاشن و من لەوباوەڕەدام کە لەڕوی جوانیەوە ژنانی کریت پێشەنگی ژنانی جیهانن و جەستەیان باریکە و بەهۆی جوانی جەستەیانەوە زۆر بەزحمەت منداڵیان دەبێت، ژنانی"کریت"بەگشتی زیاد لەیەك یان دوو منداڵیان نابێت و کەمی لەدایك بون لەنێو دانیشتوانی"کریت"دا نابێتە مایەی نەنگی.

پیاوانی"کریت"وەك ژنەکانیان جەستەیەکی جوانیان هەیە، بەڵام چوارشانەن و هەموو پیاوێك هەوڵ دەدات کەمەری خۆی باریکتر نیشان بدات و ئەوانیش وەك ژنەکان بەوردیەوە موی جەستەیان هەڵدەکەنن، بۆئەوەی کاتێك یاری لەگەڵ"گا"دا دەکەن جەستەیان جوان دەرکەوێت و ئەو جزمە درێژانەی لەپێی دەکەن لەسەر لای جزمەکاندا وێنەی گیانەوەرەکانی لەسەر دەکێشن.

پیاوانی کریت حەز ناکەن بڕۆن بۆ وڵاتانی تر، لەبەرئەوەی لەوڵاتانی تردا کەرەستەی حەوانەوە و پاك و خاوێنی وەك"کریت"نیە و دەڵێن ئێمە ناتوانین لەماڵی نەتەوەکانی تردا بژین کە خاوەنی ئاودەستی پاك و ژوری خۆشۆردنی تایبەت نین.

یەکێك لەو شتانەی کە من لە"کریت"دا بینیم و هاوشێوەی ئەوە لەهیچ وڵاتێکدا نیە، جۆرێك ئامێری موزیك بوو کە بێئەوەی ژەنیارەکان بیژەنن، ئاوازی موزیکی لێ دەبسترا، بەڵام دەنگێکی لێ دەهات کە پێشتر لەسەر شتگەلێك نوسیبویان و من نەمتوانی تێبگەم، بەچ شێوەیەك دەتوانرێت دەنگەکانی لەسەر شتێك بنوسن. چیتر دوای ئەوەی لەدانیشتوانی"کریت"م بیست کە ئەوان دەتوانن ئاهەنگە موزیکیەکان بنوسنەوە و دوای ئەوە لەسەرئەوەی کە نوسیویانە لەسەر ئامێرێك بژەننەوە. هەڵبەت بەجۆرێك ئەگەر کەسێك گوێ لەئاهەنگێك بێت، کاتێك نوسینی ئەو ئاوازە بەدەست بهێنێت، دەتوانێت بەهۆی ئەو نوسراوە موزیکیەوە ئاهەنگەکە بژەنێتەوە.

لەبەرئەوەی من پزیشکم و تەنها گرنگیەکی تایبەت بەزانستی پزیشکی ئەدەم، هەوڵی ئەوەم نەدا لەوە تێبگەم کە بەچ شێوەیەك دەکرێت ئاهەنگی موزیکیەکان بنوسرێنەوە و وەك بڵێی کەسانی تریش وەك من گرنگیان بەم بابەتە نەدابێت.

من لە"کریت"دا چاوم بەهیچ پەرستگایەك نەکەوت کە بۆ خودای ئەو وڵاتە دروستیان کردبێت، بەڵام لەباتی ئەوە "گا"کان دەپەرستن و لەبەرامبەریاندا سەما دەکەن، من ئاگاداری ئەوە بووم کە پەرستنی"گا"کان لەلایەن دانیشتوانی"کریت"ەوە، تەنها لەپەیوەست بونیان بەئاینەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو چێژیش لەسەماکردن لەبەرامبەر"گا"کاندا وەردەگرن و ڕۆژێك نیە کە ئەمانە بۆ تەماشای ئەم سەمایە ئامادە نەبن یان سەما نەکەن.

یەکێك لەو خاڵانەی کە شایەنی باسکردنی ژیانی ئەم میلەتەیە، ئەوەیە کە بەشێوەیەکی هاوسەنگ مەی دەخۆنەوە و من لەتەواوی ئەو ماوەیەی کە لە"کریت"دا مامەوە، کەسێکم نەبینی مەست ببێت، یان وەك دانیشتوانی"تبس"و"بابل"بەهۆی زیادەڕەوی خواردنەوەیان دوچاری ڕشانەوە ببن.

ژنەکانی"کریت"زیاتر خوازیاری لاوە جوانەکانن، هەرلەبەرئەوەش لاوەکان بەڕوتی لەبەرامبەر"گا"کاندا سەما دەکەن، بۆئەوەی جوانی جەستەیان بۆ ژنەکان نمایش بکەن.

ئەو ژن و پیاوانەی کە لەبەرامبەر گاکاندا سەما دەکەن، لە دوو دەستە پێك دێن، هەندێك لەمانە ئەگەر پیاو بن نابێت لەگەڵ ژناندا ڕابوێرن و ئەگەر ژنیش بن نابێت لەگەڵ پیاواندا ڕابوێرن، بەڵام دەستەیەکی تریان ئەوانەن کە هونەرمەندانە لەبەرامبەر"گا"کاندا سەما دەکەن، ئەمانە دەتوانن لەگەڵ ژناندا، یان ژن بن لەگەڵ پیاواندا ڕابوێرن.

تەنها یەك شت لەنەریت و لایەنی ڕۆحی نەتەوەی"کریت"دا بەلای منەوە ناپەسەند بوو، ئەویش سروشتی هەوەسبازیانە، چونکە ئەم نەتەوەیە بەڕادەیەکی زۆر خوازیاری شتگەلی تازەیە، چونکە ئەوەی ئەمڕۆ مایەی پەسەندی گشت کەسە، دوو ڕۆژی تر لەبەرچاویان دەکەوێت و هیچ بازرگانێك لەوە دڵنیا نیە ئەوەی ئەمڕۆ خەڵکی دەیکڕن، شەش مانگی تر دوبارە بیکڕنەوە یان نە؟

دوای ئەوەی چوینە ولاتی "کریت"ەوە لەمیوانخانەیەکدا نیشتەجێ بوین. ئە کاتەی ڕۆشتم بۆ"بابل"و لە میوانخانەی چەند نهۆمی ئەو شارەدا نیشتەجێ بوم، بەخۆمم دەوت کە لەجیهاندا میوانخانەیەکی لەوە باشتر دەست ناکەوێت، بەڵام کاتێك چومە ناو"کریت"ەوەو چومە ناو میوانخانە جوان و پاکەکانیانەوە کەخاوەنی خزمەتکارگەلێکی میهرەبان و بەڕێز بوون، تێگەشتم کە میوانخانەی"بابل"لەچاو ئەم میوانخانەدا هیچ نیە.

چونکە خزمەتکارانی میوانخانەی"بابل"، لە چەند بەندەیەکی ناشیرین و پیس و کرژ و مۆن پێك هاتبوون، لەکاتێك لەمیوانخانەی"کریت"دا کوڕگەل و کچگەلێکی جوان کە بەردەوام زەردەخەنەیان دەکرد پێشوازیان لەگەشتیارەکان دەکرد و لەهەرکاتێکدا بانگ بکرایەن ئامادەی خزمەتکردن بون. ئێمە دوای چونمان بۆ ئەو میوانخانەیە، چوینە ناو ئەو حەمامانەی کە ئاوی پاك و گەرمی تێدایە و تێیدا پاك خۆمان شۆرد و جلوبەرگەکانمان گۆڕی و"مینا"قژی لول کرد و پۆشاکی نوێی کڕی و من ملیوانکە و گوارەیەکم بۆ کڕی کە لەبەردگەلێکی ڕەنگاوڕەنگ دروست کرابوو.

ئەو جلەی"مینا"کڕیبوی، سینەی دانەدەپۆشی، بەشێوەیەك کە هەموو کەسێك دەیتوانی چاوی بەسینە و دەستی بکەوێت.

دوای ئەوەی جلەکەی لەبەرکرد پێی وتم:کەژاوەیەك بەکرێ بگرە بۆئەوەی لەلەنگەرگاوە بڕۆین بۆشار، تا چاوم بەمامۆستاکەم بکەوێت.

میوانخانەی ئێمە لە لەنگەرگادا بوو بەواتا سەر بەسنوری لەنگەرگابوو، بەهەرحاڵ ئێمە کەژاوەیەکمان بەکرێ گرت و سواری بوین و بەرەو ڕوی شاری"کریت"ڕۆشتین. شار لەچاو لەنگەرگادا لەناوچەیەکی بەرزتردایە و ئەوەندە باخی تێدایە کە تەلارە کورتەکان لەناو باخەکاندا ون بوبون.

"مینا"کەژاوەکەی لەبەرامبەر یەکێك لەباخەکاندا ڕاگرت و ئێمەش دوای ئەوەی خۆمان کرد بەو باخەدا "مینا"وتی:ئێرە ماڵی مامۆستاکەی منە. لە"کریت"دا هەریەك لەو کچ و کوڕانەی لەبەرامبەر"گا"کاندا سەما دەکەن مامۆستایەکی تایبەتیان هەیە، کە ڕاهێنەر و پارێزەری ئەوانن و فێری هونەری سەمایان دەکەن و بگرە پارێزگاری لەمافەکانیشیان دەکەن و ناهێڵن کەسانی تر مافی خوێندکارەکان پێشێل بکات.

ماموستای"مینا"پیرەمێردێك بوو، كاتێك خۆمان كرد بەماڵەكەیدا هەندێك "پاپیرۆس"[51]ی خستبووە بەردەمی خۆ و دەیخوێندنەوە.

من بینیم لەسەر ئەو پاپیرۆسانە شێوەی"گا"یەك كێشراوە و ئاشكرا بوو ئەم"گا"یانە ئەو گیانەوەرانەن كەسبەی كۆمەڵێك لەبەرامبەریاندا سەما دەكەن و پیرەمێرد دەیەوێت بزانێت دەتوانێت گرەو لەسەر كام یەك لەم"گایانە بكات.

كاتێك ئەو پیرەمێردە چاوی بە"مینا"كەوت زۆر خۆشحاڵ بوو و هەستا و ماچی كرد و وتی:"مینا"من وام زانیوە ڕۆشتویت بۆ لای خودا و چیتر ناگەڕێیتەوە، بەڵام لەبەرئەوەی هێشتا نەگەشتبومە ئەو باوەڕەی كە نەگەڕێیتەوە، لەباتی تۆ ڕاهێنانم بەهیچ خوێندكارێكی نوێ نەكردووە و ئەو ژورەی كە لەم ماڵەدا شوێنی نیشتەجێ بونی تۆیە، هەر وەك خۆی ماوەتەوە، بەڵام لەوانەیە ماوەیەكە پاك و خاوێن نەكرابێتو لەوانەیە ژنەكەم ژورەكەی تۆی وێران كردبێت و لەباتیدا هەسێرێكی ئاوی تێدا دروست كردبێت، بۆئەوەی ماسیەكانی خۆی لەو هەسێرەدا بەخێو بكات، چونكە ژنەكەم زۆر حەزی لەبەخێوكردنی ماسیە.

"مینا"بەسەرسوڕمانەوە وتی: لەكەیەوە ژنەكەت حەزی لەبەخێوكردنی ماسی كردووە، چونكە كاتێك من لێرە ڕۆشتم، بەهیچ شێوەیەك بیری لەماسی نەكردووەتەوە.

پیرەمێرد وتی: ئەوە ژنە تازەكەی منە و هێشتا نەتبینیوە، ئەگەر ئێستا پیاوێكی لەلا نەبوایە، دەمبردیتە لای و پێم دەناساندنی بەڵام ئێستا لاوێكی زۆرانبازی"گا"ی لەلایە كە تازە دەستی كردووە بەسەماكردن و ئەگەر تۆ ببەمە لای ئەو سەرت لێی سوڕ دەمێنێ. ئایا دەتەوێت دۆستی خۆتم پێ بناسینی، بۆئەوەی منیش ببمە دۆستی و ئەم ماڵە وەك ماڵی خۆی تەماشا بكات.

"مینا"وتی: ئەم هاوڕێیەم پزیشكی میسریە و ناوی"سینۆهە"یە و ناسراوە بە كوڕی كەر و بەتەنها دەژیت و ژنی نیە بۆئەوەی لەگەڵیدا ڕابوێرێت.

پیرەمێرد وتی:ئەگەر بۆماوەیەك لێرەدا نیشتەجێ ببێت، بەتەنهایی نامێنێتەوە، چونكە ژنانی جوان لە"كریت"دا ناهێڵن تەنها بێت، بەڵام"مینا"تۆ مەگەر نەخۆشی كە لەگەڵ پزیشكێكدا هاتویت بۆ ئێرە و ئەگەر نەخۆش بیت، دەبێتە مایەی دڵگرانی من،

---

[51] پاپیرۆس: پاپیرۆسی میسری كۆنە كە لە میسرەوە هەناردەی ئەم وڵاتە كراوە.

چونکە کاتێك تۆ هاتیتە ماڵەکەم زۆر خۆشحاڵ بوم و وام زانی دەتوانم داوات لێبکەم لەبەرامبەر"گا"کاندا سەما بکەیت و بڕێك زێڕ و زیو بکەیتە بەشم.

"مینا"وتی: من نەخۆش نیم و خۆم لەهەموو کاتێکی تر تەندروست تر دەبینم، لەبەرئەوەش لەگەڵ ئەم پزیشکە میسریەدا گەشتم کردووە، چونکە ئەو ڕزگارکەری منە و ئەگەر ئەو نەبوایە من لە"بابل"دا یا بەکوشت دەدرام یا خۆکوژیم دەکرد.

پیرەمێرد وتی: هیوادارم بەهۆی هاوڕێیەتیت لەگەڵ ئەم پزیشکە میسریەدا کچێنی خۆت لەدەست نەدابێت، چونکە هەربەوشێوەی خۆت ئاگاداری ئەگەر کچێنی خۆت لەدەست دابێت، ڕێت پێنادرێت لەبەرامبەر"گا"کاندا سەما بکەیت، هەروەها ناشتوانی بڕۆیتە لای خودا.

دوای ئەوە پیرەمێرد لەکچی لاو نزیك بویەوە و بۆماوەیەك دەستی بەسەر سینە و مەمانیدا خشاند و وتی: دەترسم کچێنیت لەدەست دابێت، چونکە کاتێك تۆ لێرە ڕۆشتی"مەمانت"زۆر بچوك بون، ئێشتاش کەمێك گەورە بووە و ئایا باشتر نیە پێش ئەوەی لەبەرامبەر"گا"کاندا سەما بکەیت، پشکنینێکت بۆ بکەم بۆئەوەی بزانم هێشتا کچیت یان نە.

کچی لاویش بەتوڕەییەوە وتی:من نامەوێت وەك بازاڕی کۆیلەفرۆشی"بابل"کە لەوێدا پشکنینیان بۆ ژنانی لاو دەکرد بۆئەوەی بزانن هێشتا کچە یان نە، لێرەدا پشکنینم بۆ بکەن و پێم وتی لەبەرئەوە ڕزگارکەری من بووە گەشتم لەگەڵ ئەو پیاوەدا کردووە، ئەگەر ئەو نەبوایە من نەمدەتوانی بگەڕێمەوە بۆ"کریت"بەڵام تۆ تەنها بیری لە"گا"کان و دەستکەوتەکانت لەدەوای سەمای"گا"کان دەکەیتەوە و هیچ گرنگیەك بەقسەکانی من نادەیت.

دوای ئەوەی"مینا"ئەم قسانەی کرد دەستیکرد بەگریان، پیاویش دوای بنینی فرمێسکی چاوانی لەقسەکانی خۆی پەشیمان بویەوە و وتی:"مینا"مەگری، من دڵنیام کە تۆ ڕاست دەکەیت و کچێنی خۆت لەدەست نەداوە و ئەم پیاوەش ڕزگارکەری تۆیە و ئەگەر ئەویش نەبوایە نەتدەتوانی بگەڕێیتەوە بۆ کریت.

ئەوکات بابەتی گفتوگۆکەی گۆڕی و وتی: هاتەوە یادم، من ئەمڕۆ دەبێت بڕۆم بۆ لای"مینوس"و لەبەرئەوەی دەرەنگە ناتوانم جلەکانم بگۆڕم، بۆیە هەر بەم جلانەوە دەڕۆم و ئێوەش لەم ماڵەدا دانیشن و بحەوێنەوە و نانی خۆتان بخۆن، ئەگەر ژنەکەشم

لێی پرسین بۆ کوێ ڕۆشتوم، پێی بڵێن ڕۆشتوم بۆ لای"مینوس"و لەبەرئەوەی ئەو لاوەی لەگەڵ دایە کە لەگەڵ "گا"کاندا یاری دەکات نەمویست کاتیان لێ تێك بدەم.

پێشی بڵێن، دوای ئەوەی لەماڵی"مینوس"گەڕامەوە سەردانێکی"گا"کانم دەکەم، چونکە سبەی یەکێك لە"گا"کانم هێشتا لەهیچ یاریەکدا بەشداری نەکردووە و دەچێتە ناو گۆڕەپانی یاریەوە، بۆیە دەبێت چاوم پێی بکەوێت.

"مینا"وتی: لەبەرئەوەی دەتەوێت بڕۆیت بۆ ماڵی"مینوس"من و"سینۆهە"ش لەگەڵتدا دێین‌و منیش لەوێدا چاوم بەهاوڕێکانم دەکەوێت و"سینۆهە"شیان پێ دەناسێنم.

لەبەرئەوەی مەودای نێوان ماڵی پیرەمێرد و ماڵی مینۆس زۆر نەبوو ئێمە بێئەوەی سود لەکەژاوەکە وەرگرین ڕۆشتین بۆ ئەو ماڵە و دوای ئەوەی خۆمان کرد بەماڵەکەیدا، من بەسەرسوڕمانەوە ئاگاداری ئەوە بووم کە لەوێدا کۆشکێکی مەزن هەیە و دوای ئەوەی زانیم "مینوس" پادشای"کریت"ە بەشێوەیەك سەرم سوڕما کە بەگوتەی بەندەکەم، وەك ئەوە وابوو لەناکاو ببینیم لەسەر سەرم ڕێ بکەم.

لەوێ زانیم پادشای"کریت"ناوی"مینۆس"ە و ئەوەندە پادشا بەناوی "مینوس"ەوە فەرمانڕەواییان کردووە کە هەندێك لەخەڵکی"کریت"لەبیریان نیە، ئەو پادشایەی کە لەم کاتەدا فەرمانڕەواییان دەکات"مینوس"ی چەندەمە.

دوای ئەوەی چوینە ناو ئەو تەلارەی کە"مینوس"ی تێدا نیشتەجێ بوبو، ژمارەیەکی زۆر ژن و پیاو لەو تەلارەدا دەبینران و ئەوەندە بەرز قسەیان لەگەڵ یەکتریدا دەکردو پێدەکەنین کە وەك بڵێی لەماڵی خۆیاندا دانیشتون. پیاوان جلوبەرگێکی ڕەنگاوڕەنگی جوانیان لەبەردا بوو و هەموویان باڵایەکی جوانیان هەبوو، ژنەکانیش لەجوانی و پۆشاکی جواندا ڕکابەریان لەگەڵ یەکتردا دەکرد.

"مینا" منی بەهاوڕێکانی ناساند و ژنەکانیش ئەویان لەئامێز گرت و ماچیان کردو پیاوانیش خۆشحاڵیان بەبینینی دەردەبڕی، هەڵبەت بێئەوەی سەرسوڕماو بن لەو ماوەی درێژی دیار نەمانی.

ئێمە لەبەردەم بڕێکی زۆر لەپیاوان و ژنان تێپەڕین تا ئەوەی گەشتینە بەردەم"مینوس"و "مینوس"وەك ئەوانەی کە لەچواردەوریدا بون قسەی دەکرد و پێدەکەنی و ئەویش خۆشحاڵی خۆی بە بینینی دوبارەی"مینا"دەربڕی و دوای

ئەوەی"مینا" منی پێناساند و کاتێك"مینوس" زانی کە من ئەو کچە لاوەم ڕزگار کردووە، بەزمانی میسری سوپاسی لێکردم و وتی"سینۆهە" تۆ خزمەتێکی مەزنت بەخودای ئێمە کردووە، چونکە ئەو کچەی دەبوو بڕواتە لای خوداوەند بۆت گەڕاندووەتەوە و"مینا"لەیەکەمین هەلدا خۆی دەکات بەماڵی خودادا.

ئەوکات"مینا"منی لەتەلاری"مینوس"بردە دەرەوە و وتی: وەرە با ژوری ئەم تەلارەت پێنیشان بدەم، ئەویش لەهەموو ژورێکدا خۆشحاڵی خۆی بەتەماشاکردنی ئەو شتانە دەردەبڕی و منیش بینیم کە خزمەتکارەکانیش بەبینینی ئەو کچە لاوە خۆشحاڵ بون، بێئەوەی سەریان لەو ونبونەی سوڕ بمێنێت.

"مینا"هۆکاری ئەم بابەتەی بۆ گێڕامەوە و وتی:هۆکاری ئەوەی لەم وڵاتەدا هیچ کەسێك لەون بونی درێژخایەنی من سەرسوڕمانی خۆیان دەرنابڕی ئەوەیە کە نایانەوێت خەم بۆ مردنی کەسانی تر بخۆن. کاتێك کەسێك دەمرێت هیچ کەس بیر لەو کەسە مردووە ناکاتەوە و هەرلەبەرئەوەش کاتێك کەسێك ون دەبێت، هیچ کەسێك بەدوایدا ناگەڕێت تا ئەو کاتەی خۆی دەگەڕێتەوە و ئەگەر نەشگەڕایەوە، وا لێکی دەدەنەوە کە مردووە، هەر لەبەرئەوەش دەبێت فەرامۆش بکرێت. چونکە بەبیرهێنانەوەی کەسەکان بەتایبەت ئەوانەی کە بەبۆچونی ئەوان مردووە، دەبێتە هۆی مایەی خەمگینیان، لەم وڵاتەدا هیچ کەسێك نایەوێت خۆی بدات بەدەست خەمەوە.

"مینا" دوای ئەوەی ژورەکانی ئەو تەلارەی پێنیشان دام، منی بردە ژورێکەوە کە لەسەروی ژورەکانی تردا بوو.

لەوێوە لەوەرگایەکی مەزن دەبینرا کە"گا"کان تێیدا دەلەوەڕان و باخی زەیتون و کێڵگە گەلێکیش لەدەرەوەی شار بون،"مینا"وتی:ئەمە ژوری منە.

وتم: مەگەر تۆ لەم ژورەدا دەژییت؟ مەگەر تۆ لەکۆشکی فەرمانڕەوایی"کریت"دا نیشتەجێ بویت؟

کچی لاویش وتی: بەڵێ ئەم پۆشاکانەش کە لێرەدا دەیانبینی هەمویان هی منن، بەڵام من ناتوانم لەبەریان بکەم، چونکە کۆن بون و باویان نەماوە، لەبەرئەوەی لەوڵاتی ئێمەدا جلوبەرگەکان زۆر زوو باویان نامێنێت.

وتم:"مینا"من زۆر سەیرم لەو قسەیەی تۆ دێت، چونکە هەرگیز بیرم لەوە نەدەکردەوە کە تۆ ژنێك بیت کە شوێنی نیشتەجیّ بونی لە کۆشکی فەرمانڕەواییدا بێت.

"مینا"وتی:ئەگەر تۆ بتزانیایە ناوی پادشای ئێمە"مینوس"ە، تێدەگەشتی کە ناوی منیش کە"مینا"یە لەوشەی"مینوس"ەوە وەرگیراوە.

وتم: کەواتە بۆچی ئەم بابەتەت بەمن نەوت، بۆئەوەی بزانم تۆ لەخێزانی فەرمانڕەوای "کریت"یت؟

"مینا"وتی: بۆچی پێت بڵێم؟ لێرەدا، هەموو خەڵکی لەبەرامبەر یەکدا یەکسانن و بەپێویستم نەدەزانی کە پێت بڵێم من لەخێزانی فەرمانڕوای"کریت"م.

تێگەشتم کە"مینا"ڕاست دەکاتو شێوازی ڕەفتاری خەڵکی لەتەلاری "مینوس" قسەکەی ئەوی دەسەلماند، چونکە خەڵکی لەوێدا بەشێوەیەك ڕەفتاریان دەکرد کە وەك بڵێی لەماڵی خۆیاندان و نازانن پادشای"کریت" لەوێدا ئامادەیە.

لەوەش تێگەشتم بۆچی لەو ڕۆژەوەی من"مینا"م ناسی، زێڕ و زیو سەرنجی ڕانەدەکێشا. چونە "مینا" لەسەردەمی منداڵیەوە ڕاهاتبوو بەوەی زێڕ و زیو و گەوهەر ببینێت و ئەوەی من پێم دەدا، لەبەرچاویدا ئەو بەهایەی نەبوو تا بەبینینی یان بەوەرگرتنی خۆی خۆشحاڵ بکات.

وتم:"مینا"تۆ کە لەخزمانی پادشای"کریت"ی، بەچ شێوەیەك، لەبەرامبەر "گا"کاندا سەما دەکەیت، ئایا ئەم بابەتە بەلای ژنێك کە لەخێزانی فەرمانڕەوای "کریتە" ناپەسەند نیە؟

"مینا"وتی: لەوڵاتی ئێمەدا، سەماکردن لەبەرامبەر"گا"کاندا کارێکە کە تەواوی کەسە مەزنەکان ئەگەر بتوانن، خۆیان پێیەوە سەرقاڵ دەکەن و هەرکەسێك لێهاتوویی لەم هونەرەدا بەدەست بهێنێت، ڕێزی لیّ دەگیرێت، لەبەرئەوەی نەك تەنها ئەو کارە نەنگ نیە، بەڵکو بەشێکە لەشانازیەکانیشمان.

ئەوکات لەگەڵ "مینا" لەکۆشکی فەرمانڕەوایی ڕۆشتینە دەرەوە و ڕۆشتین بۆ ڕێکخراوی "گا"بازی.

لەشاری"کریت"دا ڕێکخراوی"گا"بازی، شارێکی بچوکە کە لەتەنیشت شارێکی گەورەدا دروست کراوە.

لەم شارەدا چەند گۆڕەپانێك بۆ"گا"بازی و گەوڕگەلێکی گەورە، بۆ پاراستنی "گا"کانی تێدایە، لەتەنیشت گەوڕەکانیشدا لەوەڕگایەك هەیە کە چواردەوریان پەرژین کردووە.

کاتێك ئاو و هەوای دورگەی"کریت"سارد دەبێت"گا"کان دەبەنەوە گەوڕەکانیان و لەوەرزی گەرماشدا"گا"کان لە لەوەڕگاکەدا دەلەوەڕێنن. بەڵام ئەو"گا"یانەی دەبێت بەیانی یان دووبەیانی لەگۆڕەپانی"گا"بازیدا، هێرش بۆ سەماکەرەکان ببەن، لەناو گەوڕەدا دەیانهێڵنەوە.

کاتێك گەشتینە ڕێکخراوی"گا"بازی، مامۆستای"مینا"لەوێ بوو و بەئامادەبونم زۆر خۆشحاڵ بوو. هەروەها ئەو کاهینانەی کاریان بەخێوکردنی"گا"کان و فێرکردنی سەماکەرەکانە بەبینینی"مینا"زۆر خۆشحاڵ بوون، بێئەوەی سەیریان لەو ونبونە درێژ خایەنەی بێت.

دوای ئەوەی کاهینەکانی زانیان من پزیشکێکی میسریم، دەربارەی خواردنی "گا"کان و ئەوەیکە دەبێت لەچ کاتێکدا خواردنیان پێبدرێت بۆئەوەی توکیان درەوشاوە بێت و تەمەنێکی زیاتر بژین، چەند پرسیارێکیان لێکردم. لەکاتێکدا من دەمزانی کە زانیاری خودی ئەوان لەمبارەیەوە لەمن زیاترە، چونکە سەدها ساڵ لەوەوپێش باوباپیرانی سەرقاڵی پەروەردەکردنی "گا"بون و دوای هەر قوناخێك زانستی باوکان، بۆ کوڕەکانیان دەگوازرێتەوە و کوڕەکانیش شتێکیان بۆ ئەم زانستە زیاد دەکرد و دەیانگواستەوە بۆ کوڕەکانیان و ئەم کوڕانەش شتێکیان بۆ ئەم زانستە زیاد دەکرد و دەیانگواستەوە بۆ کوڕەکانیان."مینا لەکاهینەکانەوە زۆر نزیك بوو و زۆریش خۆشیان دەویست، هەر لەبەرئەوەش کاتێك چاویان پێی کەوت، ڕازی بون لەسەر ئەوەی سبەی لەبەرامبەر"گا"دا سەما بکات و"گا"یەکی نێریشیان بۆ دیاری کرد. "مینا" بەم هەڵبژاردنە زۆر خۆشحاڵ بوو، چونکە دەیزانی لەڕۆژی داهاتودا هونەری خۆی بۆ من نمایش بکات. دوای ئەوە"مینا"ڕێنمایی منی گرتە ئەستۆی خۆی و ڕۆشتین بۆ لای کاهینی مەزن کە بەرپرسی تەواوی بەخێوکەرانی"گا"بازی بوو. کاتێك چوینە ناو ژوری کاهینی مەزنەوە، بەهۆی تاریکی ژورەکەوە لەسەرتادا چاوم پێی نەکەوت، ئەکات چاوم بە مرۆڤێك کەوت کە سەری وەك"گا"ڕەنگی زەرد بوو. ئەو کەسەی کەسەری وەك"گا"یەك هاتە بەرچاومان، لەبەرامبەرماندا سەری بۆ

دانەواندین و دوای ئەوە سەری کەوەك سەری"گا"بوو لەسەری لابرد و تێگەشتم کە سەرو ڕوخساری وەك مرۆڤێکی ئاساییە.

سەرەڕای ئەوەی کاهینی مەزن هەمان ئەو پیاوە بوو، بەڵام زەردەخەنەیەکی بۆ کردین و ئەندامێکی جوانی هەبوو، من لەبالآی ترسام، لەبەرئەوەی جۆرێك گاریگەری توندوتیژی و بێبەزەیی تۆقێنەر لەجەستەیدا بەرجەستە دەکرا.

کاتێك"مینا"ویستی بڵێت بۆچی ئەو ماوە درێژە دیار نەماوە و لەکاتی دیاری کراوی خۆیدا خۆی بکاتە قوربانی خودای"کریت"، کاهینی مەزن وتی: پێویست بەوە ناکات بۆم باس بکەیت، چونکە من زانیاریم لەوبارەیەوە هەیە و دەزانم کە تۆیان فڕاندووە و بردوتیان بۆ وڵاتانی تر.

ئەوکات بەڕێزەوە پێی وتم:"سینۆهە" تۆ "مینا"ت گەڕاندەوە بۆ"کریت"بۆئەوەی بتوانێت خۆی بکاتە قوربانی خودای"کریت"، من فەرمانم داوە چەند دیاریەکت بۆ ببەن، کاتێك گەڕایتەوە بۆ میوانخانەکەی خۆت دیاریەکانت دەبینی.

وتم: من نە لەپێناو پاداشت وەرگرتندا"مینا"م ڕزگار کردووە و نە لەپێناو ئەوەی ئەو دیاریانە وەرگرم هاتوم بۆ"کریت"، بەڵکو مەبەستی من لەهاتنم بۆ ئێرە بەدەست هێنانی زانستە.

من پێش ئەوەی بێم بۆ کریت، ڕۆشتم بۆ وڵاتانی سوریا و"بابل" و "هاتی" و لەو وڵاتانەدا فێری شتگەلێکی زۆر بوم و ئێستا هاتوم بۆ"کریت"بۆئەوەی چەند زانیاریەکی تر بۆ زانستەکەم زیاد بکەم.

چەند شتێکی سەرسوڕهێنەرم لەبارەی خودای"کریت"ەوە بیست و پێیان وتم کە تۆ خودایەکی مەزنت هەیە کە کچان و کوڕانی لاوی خۆش دەوێت، بەمەرجێك دوربن لەهەموو جۆرە ئاڵودەییەکی جەستەیی و ئەمەش تایبەتمەندیەکی زۆر مەزنە کە لە خوداکانی"سوریا و بابل"دا بەدی ناکرێت، چونکە خوداکانی سوریا و بابل ڕێ دەدەن ژنان و پیاوان لە پەرەستگاکاندا لەگەڵ یەکتردا ڕابوێرن.

کاهینی مەزن وتی: لێرەدا سەرەڕای خودای مەزن چەند خودایەکی تر هەیە کە خەڵکی دەیانپەرستن و بگرە لەسنوری لەنگەرگاشدا پەرستگاگەلێك بۆ پەرستنی خوداکانی وڵاتی تر هەیە و تۆ دەتوانی لەیەکێك لەم پەرستگایانەدا، ئەگەر بتەوێت قوربانی پێشکەشی خودای"ئامون" بەواتا خودای میسر بکەیت.

بەڵام خودای مەزنی ئێمە کەسە بیانیەکان ناناسێت و ناشتوانن بیاننناسن، چونکە تەنها ئەوانەی بۆ ناسینی ئەو پەروەردە کراون و لەنێو موریدانی فێرخوازدا بەدی دەکرێن، ڕێیان پێدەدرێت چاویان پێی بکەوێت و تا ئێستا هەرکەسێك چاوی بەو کەوتبێت نەگەڕاوەتەوە، بۆئەوەی پێمان بڵێت خودای مەزنی ئێمە بەچ شێوەیەکە و هەر ئەوەشت پێ دەڵێم کە مەزنی و خۆشبەختی نەتەوەی"کریت"بەخودای مەزنیانەوە پەیوەست دەکرێت.

من وتم: ئەی کاهینی مەزن کاتێك لەوڵاتی"هاتی"بوم لەدانیشتوانی ئەوێم بیست کە خوداکانی ئەوان ئاسمان و زەویە و یەکێك لەو دوانە بەهۆی بارانەوە سکی ئەویتریان پڕ دەکات و دەیکاتە خاوەنی بەروبوم.

لەهەمان کاتدا بەشێوەیەکی نهێنی ئامێز بەرگوێم کەوت کە خودای نەتەوەی"کریت"دەریایە، چونکە ئەم نەتەوەیە توانا و خۆشبەختی خۆی لە دەریاوانیدا بەدەست هێناوە.

کاهینی مەزن وتی: بەشێك لەگوتەکانت دروستە، ئێمە زۆر لەکەرەستەی خۆشیەکانی خۆمان لەدەریاوانیەوە بەدەست هێناوە، بەڵام خودای ئێمە دەریا نیە، بەڵام خودای دەریاش هەیە.

"سینۆهە"ئەوەش بزانە کە لەنێو تەواوی نەتەوەکانی ئەم جیهانەدا، تەنها نەتەوەی کریت، تاکە نەتەوەیەکە کە یەك خودای زیندو بەخودای مەزنی خۆی دەزانێت، لەکاتێکدا نەتەوەکانی تر خودا مردووەکان دەپەرستن، یان ئەوەیکە شێوەی خوداکانیان لەبەرد یان تەختەدارێك دروست کردووە و دەیپەرستن.

خودای ئێمە نە خودایەکی مردووە و نە بەردە و نە دارە، بەڵکو زیندووە و تا ئەوڕۆژەی خودای ئێمە زیندوو بێت، هیچ نەتەوەیەك ناتوانێت لەگەڵ نەتەوەی "کریت"دا بجەنگێت، ئەگەر بیشجەنگێت شکست دەهێنێت.

وتم: ئەی کاهینی مەزن بیستومە کە خودای ئێوە لەئەشکەوتێکدا یان لەماڵێکدا دەژی کەداڵان و ڕێڕەوێکی تاریکی هەیە، من زۆر حەز دەکەم چاوم بەو ئەشکەوتە یان ئەو ماڵە بکەوێت.

بەڵام تێناگەم بۆچی ئەو کەسانەی بۆ بینینی خودای ئێوە هەڵدەبژێردرێن و دەڕۆنە ماڵی ئەوەوە، چیتر ناگەڕێنەوە، لەکاتێکدا دەستەڵاتی ئەوەیان پێ بەخشراوەو

دەتــوانن بگەڕێنــەوە و ئایــا تــۆ ناتــەوێت پــێم بڵێیــت بۆچــی هــیچ یــەك لەمانــە نەگەڕاونەتەوە.

کاهینی مەزن وتی: سەرەڕای ئەوەی دیمەنی خودای ئێمە"گا"یە بەڵام ئەو خودایە"گا"نیە، بەڵکو بونەوەرێکە کە هیچ کەسێك ناتوانێت بڵێت چیە و هەر ئەوە دەزانم کە دەژی، بەڵام ئەوەیکە بۆچی ئەوکەسانەی کە دەڕۆنە ماڵەکەی چیتر ناگەڕێنەوە، ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ توانای باڵای ئەو خودایە.

چونکە مەزنترین خۆشبەختی و شانازی کچان و لاوانی ئێمە ئەوەیە کە چاویان بەخودای خۆیان بکەوێت و لەگەڵیدا بژین و ژیان لەم جیهانەشدا لەبەرچاوی ئەوان زۆر ناپەسەندە، چونکە دەزانن ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ ئەم جیهانە دەبێت بەرگەی ئازار و گرفتەکانی بگرن،"مینا"ئایا تۆ ئارەزوی ئەوە ناکەیت بڕۆیت بۆ ماڵی خودا و پاشماوەی ژیانت لەویێ تێپەڕێنی؟

"مینا" وەڵامی نەدایەوە و من وتم: ئایا من ڕێم پێنادرێت بچمە ماڵی خوداوە، ئەکرێت چاوم بەشوێنی چونە ژورەوەی بکەوێت؟

کاهین وتی:شەوێك کە مانگ لەئاسمان، بەشێوەیەکی تەواو خڕ دەبێتەوە، لەهەمان ئەو شەوەدا دەچێتە ناو ماڵی خوداوە و لەوانەیە تۆ بتوانی شوێنی چونە ژورەوەی ببینی؟

وتم: ئەگەر"مینا"ئامادە نەبێت بڕواتە ماڵی خوداوە، چی ڕوو دەدات؟

کاهینی مەزن وتی: هێشتا ئەوە ڕوینەداوە کە کوڕی لاو یان کچێك خۆی ئامادەی ڕۆشتن بۆ ماڵی خودا نەکات،"مینا"ش دوای ئەوەی لەبەرامبەر"گا"کانی ئێمەدا سەمای کرد، بەتامەزرۆ و ئارەزووەوە خۆی دەکات بەماڵی خودادا.

دوای ئەم قسەیە کاهینی مەزن، سەرەگاکەی کردەوە سەری، بۆئەوەی تێمان گەیەنێت کە ماوەی چاوپێکەوتن کۆتایی پێهاتووە، دوای ئەوە"مینا"دەستی گرتم و منی لەو ژورە بردە دەرەوە.

دوای دەرچونمان لەژوری کاهینی مەزن"مینا"لێم جیابویەوە و وتی:لەبەرئەوەی سبەی ڕۆژی سەمایە، ئەمشەو دەبێت لەناو ڕێکخراوی"گا"بازیدا بمێنمەوە، منیش بەتەنهایی گەڕامەوە بۆ میوانخانەکەم.

"کاپتا"ی بەندەم بینی، کە خواردبویەوە و زۆر بەزەوق بوو و وتی: "سینۆهە" ...... گەورەم... ئێرە نیشتمانی خۆرئاواو و چەقی خۆشیەکانە[52] ...لێرەدا خواردنەوە هەرزان و فراوانە و هیچ کەسێك بەگاڵۆکەکەی نادات لەخزمەتکارەکەی خۆی و لێی ناپرسێت چەنێك زێڕ و زیوی لێ دزیوە، ئەگەر خاوەندارێك لە بەندەکەی خۆی تورە ببێت و لەماڵەکەی دەری بکات، بەندەکە بۆ ماوەی ڕۆژێك خۆی دەشارێتەوە و بۆ ڕۆژی دوایی دەگەڕێتەوە بۆ هەمان ماڵ، خاوەنەکەش تاوانەکەی فەرامۆش دەکات، بەڵام سەوداگەرانی ئێرە زۆر فێڵ بازن، هەروەك چۆن سەوداگەرێکی "ئزمیر" بازرگانێکی میسری فریو دەدات، ئەمانیش سەوداگەرانی "ئزمیر" فریو دەدەن.

هەروەها لەم شارەدا جۆرێك ماسی بچوك دەخەنە ناو ڕۆنی زەیتونەوە و بۆ ماوەیەك لەناو ئەو زەیتونەدا دەیهێڵنەوە و لەدواییدا ئەو ماسیە ئەوەندە خۆشتام دەبێت کە هەرگیز تێری لێ ناخۆیت[53].

بەندەکەم دوای ئەوەی ئەم قسانەی کرد دەرگای ژورەکەی بەست و دوای ئەوەی دڵنیابوو کە هیچ کەسێك گوێی لەدەنگی نابێت وتی: گەورەم، وەك بڵێی لەم وڵاتەدا ڕوداوگەلێکی سەیر ڕویداوە، چونکە من لەمەیخانەی سنوری لەنگەرگاکە ئەوەم بەرگوێ کەوت کە خودای"کریت" مردووە و ئەو کاهینانەی کە لەمەرگی خودا زۆر ترساون، هەوڵی ئەوە دەدەن خودایەکی تر پەیدا بکەن، بەڵام هەرکەسێك باسی ئەم جۆرە شتانە بکات، زۆر بەتوندی سزا دەدرێت و دوو کەس لەدەریاوانەکان کە باسی ئەمیان کردبوو، لەسەروی تاشەبەردە بەرزەکانی کەنار دەریای "کریت"ەوە هەڵیانداوەتە ناو دەریا و ناو دەمی ئەختەبوتەکانەوە.

لەبەرئەوەی دانیشتوانی "کریت"دەڵێن توانای خۆشبەختیان پەیوەستە بەخودای خۆیانەوە، ئەگەر خودای"کریت"بمرێت، ئەوا نەتەوەی"کریت"یش توانای خۆشبەختی خۆی لەدەست دەدات.

---

[52] میسریە کۆنەکان - ئەوەی نەتەوە کۆنەکان لەسەردەمەکانی دواییدا ناوی "بەهەشت"یان لێنابوو- بە وڵاتی خۆرئاوا بانگیان دەکرد.

[53] لێرەدا مەبەستی "کاپتا" ماسی"ساردین"ە کە دانیشتوانی دورگەی "کریت" لەناو ڕۆنی زەیتوندا دایدەنێن و تائێستاش ئەم نەریتە لە ئاسیا و ئەوروپادا ماوە.

کاتێک"کاپتا"باسی ئەمەی کرد هیوایەک لەدڵی مندا دروست بوو و پێم وت: ئەگەر وابێت و خودای نەتەوەی"کریت"بەوشێوەی خەڵکی باسی دەکەن مردووە و وەک بڵێی ئەم هەواڵە ڕاستە-چونکە سەرەڕای ئەوەی بەردەوام حکومەتەکان هەوڵ دەدەن هەواڵەکان لەنەتەوەکەیان بشارنەوە، بەڵام هەرچۆنێک بێت ئاگاداری هەموو هەواڵ و ڕووداوێک دەبن-دوای ئەوەی "مینا"خۆی دەکات بەماڵی خودادا، لێی دێتە دەرەوە.

*بەشی بست و سێیەم*

# لەگۆڕەپانی گابازی کریت دا

ڕۆژی دوایی بەهاوکاری"مینا"لەگۆڕەپانی"گا"بازی کە ناوبانگی هەبوو، منی لەشوێنێکدا دانیشاند تا بتوانم بەجوانی تەماشای هەموو شوێنێك بکەم.

دانە دانە"گا"نێرەکانیان هێنایە ناو گۆڕەپانەکەوە و من بینیم، سەرەڕای ئەوەی لەگۆڕەپاندا زیاد لەدە ڕیز تەماشاچی هەیە هەموویان زۆر بەباشی دەیبینن، چونکە شوێنی تەماشاچیان بەشێوەیەك دروست کرابوو کە یەکێك بەلاسەری ئەوی ترەوە دانیشتبوو، بێئەوەی یەکێکیان بەرچاوی ئەویتریانی گرتبێت.

سەمای کچان و کوڕان لەبەرامبەر"گا"کاندا لەچەند جۆرێك پێك دێت، بەڵام لەهەموویان دژوارتر سەمایەکیان بوو کە سەماکەر دەبوو باز بەسەر هەردوو شاخی "گا"کەدا بدات و لەسەر پشتی ڕاوەستێت، منیش هەربەوشێوەی باسم کرد: لەڕابردوودا جارێکیان بینیم کە"مینا"ئەم سەمایەی ئەنجام دا.

بینیم دەوڵەمەندەکانی"کریت"گرەو لەسەر"گا"کان دەکەن و وەك بڵێی دەزانن هەندێك لە"گا"کان لەوانی تر جیاوازترە، بەڵام لەبەرچاوی مندا"گا"کان بەیەك شێوە بێجیاوازی دەهاتنە بەرچاوم و نەمدەتوانی پەی بەهیچ جیاوازیەکیان ببەم.

"مینا"ش وەك ئەوانی تر لەبەرامبەر"گا"یەکی نێردا سەمای کرد و سەرەتا لەو سەمایەی ترسام، چونکە یەك قۆچی ئەو"گا"نێرە بەس بوو بۆئەوەی بیکوژێت، بەڵام دوای ئەوەی چالاکیەکانی ئەوم بینی و بینیم کە ماسولکەکانی بەچ شێوەیەك لەژێر فەرمانیدا بون، چیتر ترسەکەم لەناو چوو و وەك ئەوانی تر خۆشحاڵی خۆمم بۆ دەردەبڕی.

لە"کریت"دا پیاوان و ژنانی لاو بەڕوتی لەبەرابەر"گا"کاندا سەما دەکەن، هەر لەبەرئەوەش سەماکەیان زۆر هەڕەشە ئامێزە، ئەگەر جل لەبەر بکەن لەوانەیە بمرن، چونکە سەرەڕای ئەوەی جلەکانیشیان تەنك بێت، ڕێگر دەبێت لەوەیکە بتوانن بەجوانی فەرمانڕەوایی ماسولکەکانیان بکەن.

سەرەڕای ئەوەی کۆمەڵێك لەکچانی لاو ئەندامێکی جوانیان هەبوو، بەڵام ئەندامی"مینا"م لەهەموویان بەجوانتر دەزانی، بەڵام مامۆستای"مینا" لەوباوەڕەدا بوو لەبەرئەوەی کچی لاو ماوەیەك لە"کریت" دور کەوتووەتەوە و مەشقی نەکردووە، بۆیە بەوشێوەی کە پێویستە ناتوانێت سەما بکات.

دوای ئەوەی کۆتایی بەو سەمایە هات،"مینا" لەکاتێکدا جۆرێك ڕۆنی لەجەستەی ماڵبوو، هاتە لامەوە و وتی:"سینۆهە"دوو بەیانی"مانگ"دەبێتە بازنەیەکی تەواو و من دەبێت خۆم بکەم بەماڵی خوادادا و هەر لەبەرئەوەش هاوڕێکانم میوانداریان کردوم کە بەشداری لەو ئاهەنگەدا بکەم، لەبەرئەوە ناتوانم لەگەڵ تۆدا بێم، بەڵام لەو شەوەی دەڕۆمە ماڵی خوداوە، تۆ دەتوانی وەك هاوڕێکانی ترم تا بەر دەرگای چونە ژورەوەی ئەو ماڵە لەگەڵ مندا بێیت.

وتم:بەهەر جۆرێك تۆ حەزت لێی بێت من وا ڕەفتار دەکەم و لەو شەوەدا لەگەڵتدا دێم و لەئێستاوە تا دوو بەیانی خۆم سەرقاڵی تەماشاکردنی شتە سەیرەکانی کریت دەکەم و یەکێك لەو شتە سەیرانەی کە چێژم پێ دەبەخشێت ئەوەیە کە چەند کچێکی تری لاو کە یەکێکن لەهاوڕێکانی تۆ، بەڵام خۆیان تەرخانی خودا نەکردووە، میوانداریان کردوم سەردانی ماڵیان بکەم و لەگەڵیاندا کاتی خۆش بەسەر بەرم، گەرچی ئەوان وەك تۆ جوان نین، بەڵام ئەندامێکی قەڵەوتریان هەیە و قەڵەوی جەستەیان قەرەبوی ئەو ناشیرینیەیان دەداتەوە.

"مینا"بازوی گرتم و وتی:"سینۆهە"من ڕازی نیم ئەوکاتانەی من لەلات نیم بڕۆیت بۆ لای کچە هاوڕێکانم، بەلایەنی کەم تا ئەوکاتەی من دەڕۆمە ماڵی خودا دان بەخۆتدا بگرە و ئەوکات ئازادی هەرچی خۆت حەزت لێیەتی ئەنجامی بدە و بڕۆ بۆ لای کچان و لەگەڵیاندا ڕابوێرە.

وتم:"مینا"من بۆ گاڵتە ئەم قسەم لەگەڵدا کردیت، ئەگینا ئارەزوی ئەوەم نیە لەگەڵ ژنانی تردا ڕابوێرم و ئێستا دەگەڕێمەوە ناوچەی لەنگەرگا و سەرقاڵی کاری پزیشکی

خۆم دەبم، چونکە لەوێدا بڕێکی زۆر لەنەتەوەکانی تر نەخۆشن و پێویستیان بەچارەسەرکردنی منە.

هەمان کارم ئەنجامداو گەڕامەوە بۆناوچەی لەنگەرگاو خۆم کرد بەمیوانخانەکەداو خۆم سەرقاڵی کاری پزیشکی کرد، تائەوەی شەو داهات و مانگ لەئاسماندا دەرکەوت، ئەوکات لەسەرتاسەری ناوچەی لەنگەرگادا دەنگی موزیك و گۆرانی بەرز بویەوە، چونکە لە لەنگەرگادا سۆزانیخانەیەکی زۆر بەدی دەکرێن، بگرە ئەو کەسانەش کە لەکریتدا هەژارن و هیچیان نیە وەك کەسە دەوڵەمەندەکان هەموو شەوێك کاتەکانی خۆیان بەخۆشی تێدەپەڕێنن و بەشێوەیەك دەژین وەك بڵێی هەرگیز نامرن و بەردەوام لە جیهانێکدا دەژین کە وەك بڵێی خەم و ئازاری تێدا نەبێت.

من لەژورەکەی خۆمدا بێئەوەی چراکە داگیرسێنم، لەژێر ڕوناکی مانگدا دانیشتبووم و"کاپتا"لەژورەکەی خۆیدا، کە بەرامبەری ژورەکەی من بوو ڕاکشابوو و خەوی لێکەوتبوو، یان ئەویەکە خۆی بۆ خەوتن ئامادە دەکرد.

لەناکاو بینیم ژنێکی لاو خۆی کرد بەژورەکەمدا و بینیم یەکێکە لەو کچانەی کە لەمیوانخانەکەدا کار دەکەن و پێی وتم"سینۆهە"...ئایا حەز دەکەیت لەگەڵ مندا ڕابوێری.

وتم: نەخێر.. حەز لەڕابواردن ناکەم.

ئەویش وتی: ئەگەر واهەست دەکەیت من بەشایستەی سەلیقەی خۆت نازانی، یەکێکی تر لەخزمەتکارەکانی ئەم میوانخانەیە بانگ دەکەم بۆئەوەی بێت و لەگەڵیدا ڕابوێری.

وتم: نە...نە...نە. من حەز لەڕابواردن ناکەم و دەمەوێت تەنها بم.

ئەو کچە لاوەش وتی:سەیرە، بیانیەکان کە سەروەت و سامانێکی زۆریان هەیە بۆئەوەی هەموو تەمەنیان بەخۆشی تێپەڕێنن، بەئەنقەست خۆیان دوچاری خەم و خەفەت دەکەن و کاتەکانیان بەتەنهایی بەسەر دەبەن، لەکاتێکدا خودای"کریت"ژنی بۆ پیاو دروست کردووە و پیاویشی بۆ ژن، دوای ئەوە لێم نزیك بویەوە و وتی: "سینۆهە" لەگەڵمدا ڕابوێرە، چونکە من حەزدەکەم بزانم پزیشکێکی میسری بەچ شێوەیەك لەگەڵ ژنێکدا ڕادەبوێرێت.

وتم: وازم لێ بهێنە، چونکە تاقەتی ڕابواردنم نیە.

کچی لاویش وتی: ئەگەر تۆ وەك تەواوی بیانیەکانی تر خاوەنی توانا و چوست و چالاکی نیت، هۆکەی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خۆت لێرەدا زیندانی کردووە.

وتم: لەژورەکەم بڕۆرە دەرەوە و تا ئەوکاتەی خۆم بانگت نەکەم نەیەیتە ئێرە.

کچی لاویش وتی: سەیرم لێتدێت، لەوڵاتێکدا کە پیاوانی وڵات، هەموویان وەك ئەم پزیشکە میسریە وابن، خەڵکی بەچ ئومێدێکەوە دەژیت.

من چاوەکانم لەمانگ ڕامابون، لەهەمان کاتیشدا خەمگین بوم، چونکە دەمزانی تاکە ژنێك کە من ئامادەم بەخۆشکی خۆمی لەقەڵەم بدەم، لێم جیا دەبێتەوە، بۆئەوەی بڕوات بۆ ماڵی خودای خۆی و کچێنی خۆی پێشکەشی ئەو بکات.

بیرم لەوە دەکردەوە و لەناکاو ئاگاداری ئەوە بووم کەسێك لەژورەکەمدایە و هەستم بە بۆنی عەترێك کە ئەمرۆ لە گۆڕەپانی "گا"بازی دا بونم کردبوو، کرد. بۆیە سەرم بەرزکردەوە و بینیم کە ئەو کەسە"مینا"یە. وتم: چۆن هاتیت بۆ ئێرە.

"مینا"ش وتی: لەسەرخۆ قسە بکە، چونکە من حەز ناکەم هیچ کەسێك گوێی لەقسەکانمان بێت، دوای ئەوە لەتەنیشتمەوە دانیشت و وتی: لەبەرئەوە هاتوم بۆ ئێرە کە لەتەختە خەوی ڕێکخراوی"گا"بازیەکەم بێزارم.

من بەبیستنی ئەم قسەیە، سەرم سوڕما، چونکە جێی باوەڕ نەبوو ژنێکی وەك"مینا"بەو توندڕەویەی لەبەرامبەر"گا"بازیدا هەیەتی، بێزار بێت لەتەختە خەوی ڕێکخراوی"گا"بازیەکەی.

دوای ئەوە"مینا"وتی:خۆشم بەتەواوی نازانم، بۆچی لەمکاتەدا هاتوم بۆ ئێرە و لەوانەیە ئەو بێزاریەی کە لەبەرامبەر تەختە خەوەکەمدا هەمە منی بۆ ئێرە پەلکێش کردبێت. لەوانەشە هاتوم بۆئەوەی قسەت لەگەڵدا بکەم، ئەگەر تۆ حەزت لەخەوە، ئەوا من لێرە دەڕۆم، بەڵام ئەگەر حەزناکەیت بخەویت، من لەلات دەمێنمەوە و گوێ لەقسەکانت دەگرم و بۆنی دەرمانەکانت دەکەم و هەرکاتێك"کاپتا"قسەیەکی پێکەناوی بکات قژی ڕادەکێشم. من واهەست دەکەم لەگەڵ تۆدا گەشتکردنم بۆ وڵاتانی تر، بیر و هزری منی گۆڕیوە و چیتر وەك ڕابردوو چێژ لە بۆنی"گا"کان و تەماشاکردنی"گا"بازی و هەراوهوریای تەماشاچیان وەرناگرم. بگرە بەپێچەوانەی ڕابردوو، حەزناکەم بڕۆمە ماڵی خوداوە و ئەو قسانەی کە کەسانی دەوروبەرم لەمبارەیەوە دەیکەن، وەك قسەی منداڵانە دێنە بەرگوێم و یاری هاوڕێکانم نابێتە

مایەی سەرگەرمی من. وەك ئەوە وایە مێشکم لەجەستەم دەرکرابێت و مێشکێکی تری وەك مێشکی ئەو نەتەوانەی کە چاوم پێیان کەوتووە لەسەرمدا دانرابێت. بۆیە ئێستا پێت دەڵێم دەستم بگرە، سەرەڕای ئەوەی ئەمڕۆ دەتوت حەزت لەژنی قەڵەوە بەڵام من قەڵەو نیم، سەرەڕای ئەو هەموو قسانەش کە کردت، حەز دەکەم دەستم بگریت.

وتم:من لەسەردەمی لاویەتیدا کەسێکی سادەبوم و هیچ ژنێکم نەکردبووە خوشکی خۆم، تا ئەوکاتەی ڕۆژێك چاوم بەژنێکی تەماع و بێبەزەیی کەوت و هەرچیم هەبوو لێ سەندم. لەو ڕۆژە بەدواوە چیتر ئارەزوی خۆم بۆ هیچ ژنێك دەرنەبڕیوە، لەبەرئەوەی ڕقی ژنان لەدڵمدا جێگیر بوبو، چونکە وام دەزانی تەواوی ژنە لاوەکان وەك ئەو ژنە وان، بەڵام دوای ئەوەی چاوم بەتۆ کەوت و پەیم بەهەزری تۆ برد و بینیم کە هیچ گرنگیەك بە زێڕ و زیو نادەیت، پەیم بەوە برد کە لەم جیهانەدا دەتوانیت ئەو جۆرە ژنانە بەدەست بهێنی کە پیاو دەتوانێت بیانکات بەخوشکی خۆی، بێئەوەی داوای هیچ زێڕ و زیوێکیان لێبکات.

ئەوکات لەڕۆحمدا خۆشەویستیەك لەبەرامبەر کەسە هەژار و لاوازەکاندا لا دروست بوو و نەخۆشە هەژارەکانم چارەسەر دەکرد بێئەوەی داوای نرخی چاکردنەوەیان لێ بکەم و دانی توشبوانم بەهۆی ئازاری ددان هەڵدەکێشا بێئەوەی بڵێم کرێکەی ئەوەندەیە، چونکە کاتێك بینیم تۆ هیچ گرنگیەك بەماڵ و سامانی جیهان نادەیت، بەخۆمم وت: منیش دەبێت گوێ نەدەمە ماڵ و سامانی ئەم جیهانە، بەڵام ئێستا تۆ دەتەوێت لەمن جیا ببیتەوە و بڕۆیت بۆ ماڵی خودای"کریت"، بۆیە ئێستا من هەم ڕقم لە خوداکان کەوتووە و هەم لەمرۆڤەکانیش.

چونکە دەزانم دوای ڕۆشتنی تۆ ڕۆحم، وەك قەلەڕەشەیەك، لەبیابانێکی وشکدا بێت بەردەوام دەبمە هاوڕێی خەم. ئەوەی دەمەوێت پێت بڵێم ئەوەیە"مینا" لەجیهاندا وڵاتگەلێکی زۆر هەیە، بەڵام لەڕوبارێك زیاتری تێدا نیە و ئەو ڕوبارەش"نیل"ە. ڕوبارەکانی تر ئاویان هەیە و ئاوەکەشیان بەخوڕە، بەڵام وەك ڕوباری"نیل" ژیان بەخش نین. ئەم ڕوبارە بێ هیچ بەربەست و بەنداوێك کە ڕەوتی ڕۆشتنی بگرێت، هەموو ساڵێك بەرز دەبێتەوە و زەوی ڕەشی میسر تێرئاو دەکات و ئەگەر تەماع و شەڕەنگێزی خاوەنەکانی بهێڵێت ئەوەندە بەروبومی دەبێت کە هەرگیز خەڵکی وڵاتەکەی من، توانای ئەوەیان نابێت ئەو هەموو خواردنە بخۆن. وەرە بابڕۆین و

خۆمان بگەیەنینە قەراخ ڕووباری"نیل"و لەوێ ماڵێك بۆ خۆمان دەكڕین و گوێ لەئاوازی ئەو مراویانە دەگرین كە لەناو چڕە قامیشەكاندا نیشتونەتەوە و تەماشای كەشتی خودای"ئامون"[54]كە بەئاسماندا تێدەپەڕێت بكەین. "مینا" وەرە بابڕۆین پاشماوەی ژیانمان بێ خەم تێپەڕێنین، كاتێك گەشتینە میسر پێكەوە گۆزەیەك دەشكێنین، بۆئەوەی ببینە ژن و مێردی یەكتری، ئەوكات چیتر لەیەكتر جیا نابینەوە و دوای مەرگیشمان، تەرمی من و تۆ مۆمیا دەكەن و ئێمەش دەچینە وڵاتی خۆرئاوا[55] و بۆهەمیشە لەوێدا دەژین.

"مینا"بەدەستەكانی نەوازشی دست و چاوی كردم و وتی:"سینۆهە"من ناتوانم لەگەڵ تۆدا بڕۆم بۆ میسر یان هەر وڵاتێكی تر، لەبەرئەوەی هیچ كەشتیەك من لێرە ناباتە دەرەوەی ئەم وڵاتە، بەتایبەت دوای سەمای ئەمڕۆ هەموو دەزانن كە من دەبێت بڕۆم بۆ ماڵی خودا و هەركاتێك تۆ بتەوێت ببیتە ڕێگرم لەبەردەم ڕۆشتنم بۆ ماڵی خودا بەكوشتت دەدەن و من بەدڵنیاییەوە دەبێت خۆم بكەم بەماڵی خودادا و هیچ هێزێك لەجیهاندا نیە كە بتوانێت ڕێ لەم ڕۆشتنەم بگرێت.

وتم:"مینا"هیچ كەس ئاگاداری سبەی نیە كە چی ڕوو دەدات و لەوانەیە تۆ لەو شوێنەی كە هیچ كەس لێی نەگەڕاوەتەوە بگەڕێیتەوە و لەوانەشە دوای ئەوەی چویتە ماڵی خودا و كچێنی خۆتت پێشكەش كرد، هەست بەجۆرێك خۆشی بكەیت كە چیتر ئەم جیهانە فەرامۆش بكەیت، بەڵام تائەوشوێنەی كە من بزانم، ئەو شتانەی بەخوداكانەوە پەیوەستی دەكەن هەموی ئەفسانەیە و هێشتا من لەهیچ وڵاتێكدا شتێكم نەبینیوە كە بیروباوەڕی من لەبەرامبەر خوداكاندا پایەدار بكات، هەرلەبەرئەوەش ئەگەر تۆ لەماڵی خودا نەگەڕێیتەوە من دەچمە ناو ماڵی خودا و تۆ لەو ماڵە دەردەهێنیم، بگرە ئەگەر ئەم كارە، دواین كاری ژیانی من بێت و دوای ئەوەش بمرم.

"مینا" دەستی خستە سەر دەمم و بەترسەوە تەماشایەكی چواردەوری خۆی كردو وتی: ئەم بیرە لەهزری خۆت دەركە، لەبەرئەوەی ماڵی خودا تاریكە و هیچ كەسێك

---

[54] مەبەستی خۆرە.

[55] مەبەستی بەهەشتە.

بگرە دانیشتوانی "کریت" جگەلەوانەی وەك من هەڵبژێردراون، ناتوانن خۆیان بکەن بەماڵی خودادا و ئەگەر هەوڵیش بدەن مەرگ دەبێتە بەشیان، بەڵام من دەتوانم بەئاسودەخەیاڵی لەو ماڵە بێمە دەرەوە، لەبەرئەوەی دەزانم کە خودای ئێمە بێبەزەیی نیە. بەزۆر من لەماڵەکەی خۆیدا ڕاناگرێت، ئەگەر خوازیاری گەڕانەوە بم، ئازادم دەکات بۆئەوەی بگەڕێمەوە و ئەم خودایە، زۆر جوانە و بەردەوام هەوڵی ئەوە دەدات دانیشتوانی"کریت"بەخۆشی بژین و بەهۆی چاکەی ئەوەوەیە کە لەم وڵاتەدا گەنم بەبەرهەمی خۆی دەگات و لەزەیتونەوە ڕۆن بەرهەم دەهێنرێت و کەشتیەکانی لە لەنگەرگایەکەوە دەڕۆن بۆ لەنگەرگایەکی تر و تەم و مژە چڕەکانی دەریا، نابنە هۆی نوقم بونی گەشتیەکان. هەر کەسێك پشت بەخودای ئێمە ببەستێت بەردەوام خۆشبەخت و خۆشحاڵ دەبێت، هەر ئەم خودایەیە کە بە دڵنیاییەوە من بەدبەخت ناکات و ئەگەر بزانێت مەبەستی گەڕانەوەم هەیە نابێتە ڕێگرم.

من تێکەشتم، لەبەرئەوەی"مینا"لەمنداڵیەوە بەشێوەیەك پەروەردە کراوە کە خودای"کریت" لەهەموو کەسێك بەبەهێزتر دەزانێت و ناتوانێت بەشێوەیەکی تر بیر بکاتەوە و ئەگەر بمویستایە لەڕێی دەربڕینەوە تێیگەیەنم کە ئەو شتانەی لەبارەی خوداکانەوە باسی دەکەن هەموی ئەفسانەیە، سەرەڕای ئەوەش باوەڕی پێم نەدەکرد.

بۆیە لەباتی ئەوەی هەوڵی ئەوە بدەم لەمبارەیەوە قسەی لەگەڵدا بکەم، دەستیم گرت و"مینا"ش خۆی لێم دور نەکردەوە و دەگریا و دەیوت:"سینۆهە"من دەزانم کە تۆ باوەڕم پێناکەیت و وا دەزانی دوای ئەوەی دەچمە ماڵی خودا چیتر ناگەڕێمەوە بۆلات، هەرلەبەرئەوەش حەزناکەم تۆ لەمن بێبەش بیت، بۆیە ئەگەر حەز دەکەیت چۆنت دەوێت وا ڕەفتارم لەگەڵدا بکە.

وتم:"مینا"من پیاوێك نیم کە بەبێ ڕازی بونی تەواوی ژن، بیکەم بەخۆشکی خۆم، چونکە لەم حاڵەتەدا پەیوەندی بەدەست هێنانی چێژ یەك لایەنە دەبێت و ئەوەش بۆمن نابێتە مایەی چێژ وەرگرتن و هەرئەوە بۆمن بەسە کە تۆ ئەمشەو هاتویت بۆ ئێرەو ئەگەر دەتەوێت شتێکم پێ بدەیت، قژگیرە ئاڵتونیەکەی سەرتم پێ بدە، بۆئەوەی لێت ڕازی بم.

کاتێك"مینا"گوێی لەم قەسەیە بوو، دەستێکی بەجەستەی خۆیدا هێنا و وتی:"سینۆهە" ئایا لەبەرئەوەی جەستەیەکی لاوازم هەیە خوازیاری من نیت و

ناتەوێت لەگەڵ مندا هاوخەوبیت، ئایا حەز دەکەیت لەماوەیەکی کورتدا بەشێوەیەك خۆم قەڵەو بکەم کە تۆ بەتەماشکردنی جەستەی قەڵەوم بتۆقێیت.

وتم:"مینا"نەخێر، هیچ ژنێك بەئەندازەی تۆ جوان نیە، بەڵام من نامەوێت لەگەڵ تۆدا هاوخەو بم، لەبەرئەوەی دەزانم کە ئەم هاوخەویەمان هەڵگری چێژێکی یەك لایەنەیە، بەڵام من دەتوانم پێت بڵێم کارێك بکەین کە ببێتە مایەی خۆشحاڵی هەردوولامان.

"مینا" وتی: ئەوە چ کارێکە؟

وتم: من و تۆ گۆزەیەك بگرین بەدەستمانەوە و بیشکێنین و بەهۆی شکاندنی ئەو گۆزەیەوە من و تۆ دەبینە هاوسەری یەکتری و گەرچی لێرەدا کاهینێك نیە کە ناوی هەردوکمان لەکتێبی پەرستگادا بنوسێت، بەڵام بەپێی نەریتی میسر کاتێك ژن و مێردێك، پێکەوە بەمەبەستی پێکهێنانی ژیانی هاوسەریان گۆزەیەك بشکێنن دەبنە ژن و مێردی یەکتری.

"مینا"پێکەنی و وتی: زۆر باشە، کەواتە گۆزەیەك بهێنە بۆئەوەی بیشکێنین.....

منیش لەو ژورە چومە دەرەوە بۆئەوەی بەندەکەم کەوام دەزانی خەوی لێکەوتووە، بێدار بکەم و پێی بڵێم گۆزەیەکمان بۆ بهێنێت، بەڵام بینیم"کاپتا"لەپشت دەرگای ژورەکەمدا دانیشتووە و گوێ دەگریت.

"کاپتا" وتی: گەورەم، من لەبەرئەوە دەگریم کە دڵێکی ناسکم هەیە و کاتێك بیستم کە ئەم کچە لاوازە قسەت لەگەڵدا دەکات و تۆش بەو شێوەیە وەڵامی دەدەیتەوە دەستم کرد بەگریان.

منیش تورە بوم و لەقەیەکەم لێدا و وتم:"کاپتا"ئایا تۆ گوێت لەهەموو ئەو قسانە بوو کە ئێمە کردمان؟

"کاپتا"وتی:بەڵێ، لەبەرئەوەی ئەگەر من نەمبیستایە، کەسانی تر دەیانبیست.

پرسیم: بەچ شێوەیەك کەسانی تر گوێیان لەقسەی ئێمە دەبوو؟

"کاپتا"وتی: ئەمشەو کەسانێك هاتن بۆ ئێرە بۆئەوەی ئێرە بخەنە ژێر چاودێریەوە و سیخوڕی لەسەر بکەن، چونکە"مینا"لەبەرئەوەی بەو شێوەی بڵاو بووەتەوە دەبێت بچێتە ماڵی خوداوە، بۆیە ئێستا لەژێر چاودێریدایە بۆئەوەی هەڵنەیەت. من ئاگاداری ئەوە بووم ئەگەر من لەپشت دەرگاکەی تۆوە دانەنیشم، ئەوان

دێن لێرەدا دادەنیشتن و ئەو بابەتانەیان دەبیست کە هیچ پەیوەندیەکی بەوانەوە نیە ، بۆیە من لێرادا دانیشتم و گوێم لەقسەی هەردوکتان بوو، لەبەرئەوەی قسەکان گوتەگەلێکی منداڵانە و سادە و ڕاست بوون، منیان هێنایە گریان، هەروەك چۆن پێم وتی دڵم ناسکە و کەسێکی گرینۆکم.

من چیتر لە"کاپتا"تورە نەبوم و وتم: لەبەرئەوەی بیستت ئێمە باسی چیمان کرد، کەواتە بڕۆ و گۆزەیەکمان بۆ بهێنە.

"کاپتا"هەوڵی بەفیڕۆدانی کاتی دا و وتی: چ جۆر گۆزەیەکتان دەوێت، ئایا ئەو گۆزەیە گەورە بێت یان بچوك؟ ڕەنگاوڕەنگ بێت یان سادە؟

وتم: تۆ دەزانی هەموو جۆرە گۆزەیەك بۆ ئەو کارەی ئێمە باشە، بەمەرجێك تۆ زوو بڕۆیت و ئەو گۆزەیەمان بۆ بهێنیت، ئەگینا ناچاردەبم بەزۆری گاڵۆکەکەم بتنێرم بۆ گۆزەیەك.

"کاپتا"وتی: هەر ئەوکاتەی تۆ داوای گۆزەت لێکردم دەمتوانی بڕۆم و بۆت بهێنم، لەبەرئەوە ئەو پرسیارەم لێکردی بۆئەوەی تۆ ماوەی بیرکردنەوەت بۆ بڕەخسێت.

چونکە شکاندنی گۆزەیەك لەگەڵ ژنێکدا، کارێکی زۆر گرنگە و دەبێت بیری لێ بکەیتەوە دوای ئەوە بەئەنجامدانی ئەو کارە هەستی، بەڵام لەبەرئەوەی لەسەر بڕیاری خۆتی دەتەوێت لەگەڵ ئەم ژنەدا گۆزەیەك بشکێنی، من دەڕۆم و گۆزەیەکتان بۆ دەهێنم، چونکە ناتوانم خۆم لەم فەرمانەت بدزمەوە. کاپتا ڕۆشت و گۆزەیەك کە بۆنی ماسی دەدا و ئاشکرابوو کە ماسیان تێدا ڕشتبوو، لەگەڵ خۆیدا هێنا و لەبەردەمی مندا داینا و من و"مینا"ش هەریەکێکمان دەستەیەکیمان گرت و بەرزمان کردەوە و پێکەوە کێشمان بەزەویدا و شکاندمان.

دوای ئەوەی گۆزەکە شکا"کاپتا"لەسەر زەوی دانیشت و پێی"مینا"ی خستە سەر سەری و وتی: چیتر دوای ئەوە تۆ خانمی منی و وەك گەورەم دەتوانی فەرمانم پێ بدەیت و لەوانەیە لە"سینۆهە"ش زیاتر فەرمانم پێبدەیت، بەڵام هیوادارم لەکاتی توڕەییدا ئاوی گەرمم پێدا نەڕژێنی و پێڵاوی بێ پاژنە لەپێ بکەیت، بۆئەوەی لەکاتی توڕەییدا لەقە لەنێوچەوانم نەدەیت و سەرم بۆ بشکێنی و بۆمی بئاوسێنیت.

من لەهەموو حاڵەتێکدا، هەروەك چۆن لەبەرامبەر"سینۆهە"دا بەوەفام، لەگەڵ تۆشدا بەوەفادەبم، چونکە نازانم، تۆ سەرەڕای ئەوەی لاوازیت، بۆچی ئەوەندە

پەیوەست بوم پێتەوە، سەیرم لەوە دێت کە بەچ شێوەیەك گەورەم بڕیاری داوە تۆ بکاتە هاوسەری خۆی، چونکە ئەگەر من لەجێی ئەو بوایەم، هەرگیز کچێکی ئاوا لاوازم نەدەکردە خۆشکی خۆم، بەڵام وابزانم دوای ئەوەی منداڵت بوو، قەڵەو ببیت و من بەڵێنت پێدەدەم، هەروەك چۆن شتی کەمم لەگەورەم دەدزی، بەهەمان شێوە شتی کەمیش لەتۆ دەدزم.

کاتێك"کاپتا"قسەی دەکرد بەشێوەیەك چووە ژێر کاریگەری ئەو بارودۆخەوە، کە یەکسەر دەستی کرد بەگریان و"مینا"بۆ ماوەیەك دەستی بەسەریدا هێنا و نەوازشی کرد و پێی وت:مەگری .

منیش بە"کاپتا"م وت: پارچە شکاوی گۆزەکان کۆبکاتەوە لەگەڵ خۆیدا بیباتەوە دەرەوە.

ئەوشەوە، من و"مینا"وەك ڕابردو لەتەنیشت یەکەوە خەوتین، بەڵام من نەمویست وەك چۆن برایەك سود لەخۆشکی خۆی وەردەگرێت، سودی لێ وەرگرم، چونکە دەمزانی"مینا"چێژ لەم پەیوەندیەمان وەرناگرێت و منیش ڕقم لەچێژی یەکلایەنەیە.

ڕۆژی دوایی، وەك ڕۆژی ڕابردوو لەبەرامبەر"گا"ی نێردا سەمای کرد و هیچ ڕوداوێکی دڵتەزێنی بەسەردا نەهات، بەڵام کوڕێکی لاو کاتێك سەرقاڵی سەماکردن بوو ویستی باز بەسەر"گا"کەدا بدات بۆئەوەی سواری پشتی ئەو گیانەوەرە ببێت، بەڵام کەوت و ئەو "گا"یە، بەشاخەکانی کوشتی.

کاتێك تەماشاچیان چاویان بەم دیمەنە کەوت هەستانە سەرپێ و هاواریان کرد، منیش ئاگاداری ئەوە بوم کە هاواری ئەوان لەخۆشیەوە سەرچاوە دەگرێت، نەك لەخەمەوە، ئەوکات ئەو"گا"نێرەیان لەو لاوە دور کردەوە و دوای ئەوە خەڵکی چواردەوری لاشەی ئەو کوڕە لاوەیان دا، ژنەکان دەستیان بەخوێنی ئەو لاوە سور دەکرد و بیستم کە دەیانوت، چ دیمەنێکی جوان و سەرنجڕاکێش بوو و پیاوەکانیش دەیانوت ماوەیەکە ئێمە ڕۆژێکی وەك ئەمرۆمان نەبینیوە. دوای ئەوە ژن و پیاوەکان ڕۆشتنەوە بۆماڵی خۆیان و ئەو شەوە چراکانی لەنگەرگا و شار زیاد لە شەوانی تر ڕوناکتر بوون، چونکە هەریەك لەژن و مێردەکان دور لەیەکتری لەگەڵ ژن و مێردەکانی تردا کاتی خۆشیان بەسەر دەبرد، ئەم جۆرە خۆشگوزەرانیە لە"کریت"دا بەڕەوا لەقەڵەم دەدرا. ئەم خۆشی دەربڕینە تەنها بەبۆنەی"گا"بازی ئەو ڕۆژە و مەرگی یەکێك

لە"گا"بازەکان نەبو، بەڵکو لەبەرئەوەی ژن و مێرد دەیانزانی لەو شەوەدا، کچێکی لاو دەڕواتە ماڵی خوداوە.

من بەپێچەوانەی ئەوانی تر لەوشەوەدا وەك ئەوان نەمدەتوانی خۆشحاڵی خۆم دەرببڕم، چونکە دەمزانی"مینا"ئەوشەوە سواری گالیسکەیەکی زەرد دەبێت و دەڕوات بۆ ماڵی خودا و هاوڕێکانی بەپێ یان بەسواری گەژاوە دوای دەکەون و لەکاتی ڕێکردنیاندا پێدەکەنن و کاتی خۆش بەسەر دەبەن.

لەبەرئەوەی دەمزانی کە دەبێت دوای"مینا"بکەوم، بەیانی هەمان ئەو ڕۆژە کەژاوەیەکم بۆ ئەو مەبەستە بەکرێ گرت و "کاپتا"ش بەهۆی ئەو پەیوەست بونەی بە"مینا"وە هەیبو ویستی لەگەڵ مندا دێت، لەنێوا شار و ماڵی خودادا هەموو خۆشحاڵ بون جگە لە من، چونکە دەمزانی لەوانەیە چیتر چاوم بە"مینا"نەکەوێت.

کاتێك لەماڵی خودا نزیك بوینەوە، ئاگاداری ئەوە بووم کە هەمویان بێدەنگ بون و من لەژێر ڕوناکی مانگدا جوان وردبومەوە بۆئەوەی بزانم ماڵی خودا بەچ شێوەیەکە و جگە لەدەرگا هیچ شتێکی ترم لەماڵی خودا دا نەدەبینی، دوو دەرگای مەفرەغی قورس و زۆر گەورە، لەپشت یەکەوە بون و پێش ئەوەی دەرگا بکەنەوە، "مینا"یان بردە ناو پەرستگایەك کە لەنزیك ماڵی خوداوە بوو و کەسانی تر وتیان کە ئەم پەرستگایە شوێنی نیشتەجێ بونی پاسەوانانی ماڵی خودایە.

کاتێك"مینا"چووە ناو ئەو پەرستگایەوە، جلی لەبەردا بوو و دوای کاتژمێرێك کاتێك لەو پەرستگایە هاتە دەرەوە بینم جلی لەبەردانیە و ڕوتە، بەڵام قژی سەریان بە تۆڕێکی سپی بەستبوو.

"مینا" لەدورەوە زەردەخەنەیەکی بۆ کردم، بەڵام تێگەشتم کە ئەو زەردەخەنەیەی ناچاریە و تەنها بۆئەوەی دڵنەوایی من بداتەوە، ئەگینا بەو شێوەیە خۆشحاڵ نیە کە زەردەخەم بۆ بکات. ئەوەی دوای دەرچونی"مینا" بینیم کاهینی پەرستگا بوو کە سەری"گا"یەکی لەسەردابوو هەڵبەت بەشێوەیەك کە چاوت بە ڕوخساری نەدەکەوت و شمشێرێکی بەکەمەرەوە شۆڕ کردبویەوە و لەتەنیشت"مینا"هەنگاوی دەنا.

لەنێوەندی بێدەنگی خەڵکیدا، کاهینی مەزن و"مینا"گەشتنە بەر دەرگای ئەو ماڵەو پاسەوانەکان ئەو دەرگایەی کردەوە کە دەبوو بەزۆری بیست کەس بکرێنەوە و داخرێن و دوای ئەوە دەرگای دووەمیان کردەوە. لەوێدا یەکێك لەپاسەوانەکان،

مەشخەڵێکی داگیرساند و دای بەدەستی"مینا"وە و ئەوکات"مینا"و کاهینی مەزن، خۆیان کرد بەڕێڕەوێکی تاریك و مەزندا کە بەڕوکەش زۆر درێژ دەهاتە بەرچاو و پاسەوانەکان هەردوو دەرگاکەیان بەڕوویاندا داخست.

تەماشاکردنی ئەو دیمەنە و دیار نەمانی"مینا"لەماڵی خودادا، بەڕادەیەك خەمگین بوو کە نەم توانی لەسەر پێم ڕاوەستم و لەسەر ئەو گیایەی کە لەبەرامبەر ماڵی خودادا ڕوابوو کەوتمە سەر ئەژنۆ و ڕوخسارم خستە سەر گیاکە و سەرەڕای ئەوەی"مینا"بەڵێنی پێدابوم کە لەماڵی خودا دەگەڕێتەوە و لەگەڵ مندا دەژیت، من دەمزانی کە جارێکی تر چاوم پێی ناکەوێتەوە.

لەو ساتەی کە"مینا"هێشتا ون نەبوبو، من بەهیوای ئەوە بووم کە جارێکی تر دەیبینمەوە، بەڵام دوای ئەوەی بینیم دەرگا مەفرەغیەکانیان بەڕویدا داخست، زانیم کە نابێت بەهیوای ئەوە بم جارێکی تر ئەو کچە لاوە ببینمەوە.

"کاپتا"لەتەنیشت منەوە لەسەر گیاکە دانیشت و دەگریا، چونکە ئەویش هەستی بەوە کردبوو کە چیتر چاوی بە"مینا"ناکەوێتەوە، بەڵام هاوڕێکانی"مینا"کەلەگەڵیدا هاتبون تا ئەوساتە بێدەنگ بون، بەڵام هەرئەوەی دەرگای ماڵی خوداکان داخست، وەك ئەو کەسانەی کە لەناکاو دوچاری جۆرێك شێتی ببن، مەشخەڵەکانیان داگیرساندو گۆزەکانیان کردەوە و خواردیانەوە، هەر کە سەریان گەرم بوو ژن و پیاو خۆیان ڕوت کردەوە و لەژێر ڕوناکی مانگ و مەشخەڵەکانیاندا دەستیان کرد بەسەماکردن و شەرمیان لەوە نەدەکرد کە جەستەی ڕوت و ئەو ئەندامەی کە دەبێت داپۆشرێت، پیشانی ژنان و پیاوان بدەن.

کاتێك"کاپتا"بینی هەموویان سەرقاڵی سەماکردنن، هەستایە سەر پێ و ڕۆشت، دوای ماوەیەکی کورت بەگۆزەیەك خواردنەوە گەڕایەوە، من دەمزانی کە ئەو ئەم گۆزەیەی لەکەژاوەکەدا هێناوە، چونکە پێش ئەوەی لەشارەوە بکەوینە ڕێ، پێیان وتین لەماڵی خودا هیچ خواردن و خواردنەوەیەکی تێدا نیە و ئێمە دەبێت خواردن و خواردنەوە لەشارەوە لەگەڵ خۆماندا ببەین بۆ ئەوێ ،"کاپتا"چەند گۆزەیەکی خواردنەوە و بڕێك خواردنی لەشاردا کڕی بوو و خستبویە ناو کەژاوەکەوە.

کاتێك گۆزەکەی هێنا پێی وتم:"سینۆهە"، ئێستا منیش بەئەندازەی تۆ خەمگینم، چونکە وەك تۆ هەست بەوە دەکەم کە چیتر چاوم بەم کچە ناکەوێتەوە، بەڵام

لەبەرئەوەی من و تۆ، لەم ساتەدا بۆئەوەی جارێکی تر بیبینینەوە کارێکمان لێ ناوەشێتەوە، بۆیە باشتر وایە بخۆینەوە و لەڕێی ئەم خواردنەوەیەوە خەمەکانمان سارێژ بکەین.

بەڵام من نەمدەتوانی بخۆمەوە و وەك ئەو ژن و پیاوانەی وەك شێت بەچواردەورمدا سەمایان دەکرد خۆشحاڵ بم، بەڵام ڕێم لەخواردنەوەی "کاپتا"نەگرت، چونکە دەمزانی کەمێك خواردنەوە سود بەو دەگەیەنێت و توانای جەستەیی ئەو پیاوە بەهێزتر دەکات.

مەشخەڵەکان داگیرسابون و مانگیش دەدرەوشایەوە و ژن و پیاوەکانیش، بێئەوەی شەرم لەوانی تر بکەن، لەمەشخەڵەکان دور دەکەوتنەوە و تۆزێك دورتر لەگەڵ یەکتردا وەك خوشك و برا ڕەفتاریان دەکرد.

لەناکاو"کاپتا"وتی: "سینۆهە...لەبەرئەوەی من هێشتا شەرابم زۆر نەخواردووەتەوە، چاوەکانم هەڵە ناکەن بۆئەوەی بڵێم بەهۆی مەستیەوە، شتگەلێکی خەیاڵاوی دەبینم.

وتم:"کاپتا"ئەوە چی دەڵێیت؟

بەندەکەشم وتی: دەمەوێت بڵێم ئەو پیاوەی شمشێرەکەی بەلا قەدەوە بوو و شاخ لەسەری ڕوابوو و لەگەڵ "مینا"دا چووە ناو ماڵی خودا، لەو شوێنە هاتووەتە دەرەوە، بێئەوەی دەرگای ماڵی خودا بکرێتەوە، ئەم بابەتە شایەنی لێکدانەوەیە.

منیش تەماشایەکی چواردەورم کرد و چاوم بەکاهینی مەزن کەوت و بینیم وەك ئەوانی تر سەرقاڵی سەماکردنە. لە"کاپتا"م پرسی: ئایا تۆ دڵنیایت کە ئەو لەدەرگای ماڵی خوداوە نەهاتووەتە دەرەوە.

"کاپتا"وتی:کاتێك تۆ سەرت بەزەویەوە چەسپاندبوو و هاوارت دەکرد و دەگریایت، من بۆ ساتێکیش چاوم لەدەرگای ماڵی خودا هەڵنەبڕی، لەبەرئەوەی چاوەڕێی ئەوەم دەکرد"مینا"ی لێ بێتە دەرەوە، بەڵام لەناکاو بینیم کە شاخە زەردەکانی ئەم پیاوە لەژێر ڕوناکی مەشخەڵەکاندا دەدرەوشێتەوە و لەبەرئەوەی دەرگای ماڵی خودا نەکرابویەوە بەخۆمم وت، دەبێت ماڵی خودا، بێ لەم دەرگا مەزنانەی کە ئێمە دەیبینین، ڕێگایەکی تری هەبێت و ئەو پیاوەش لەو ڕێگایەوە هاتووەتە دەرەوە.

من هەستامە سەرپێ و بەرەو ڕوی کاهینی مەزن ڕۆشتم و دەستیم گرت و وتم:"مینا" لەکوێیە؟

کاهینی مەزن بەشێوەیەك لەم قسەیەی من توڕە بوو کە سەرەگاکەی لەسەری لابردو وتی:ئەگەر تۆ یەکێك بوایەیت لەخەڵکی"کریت"و لەمکاتەدا کە ئێمە سەرقاڵی سەما و شادین، ئەم پرسیارەت لێ بکردایەم و ببویتایەتە مایەی سەرئێشەی من، فەرمانم دەدا تۆ لەسەر بەردە بەرزەکانەوە هەڵدەنە ناو دەمی ئەختەبوتەکانەوە، بەڵام لەبەرئەوەی پیاوێکی بیانیت و شارەزایی نەریتی ئێرە نیت، چاوپۆشی لەسزاکەت دەکەم.

وتم:"مینا" لەکوێیە، وەڵامم بدەرەوە، ئەو لەکوێیە؟

کاهینی مەزن وتی:من "مینا"م بردە ماڵی خودا و ئەوم لەتاریکی ئەو ماڵەدا ڕەهاکرد و گەڕامەوە بۆئەوەی بەشداری ئەم سەمایە بکەم، بەڵام تۆ چ کارێکت بە"مینا"هەیە؟ و بۆچی پرسیاری ئەوم لێ دەکەیت، لەکاتێکدا من قەرەبوی ئەرکی"مینا"م بۆ کردویتەتەوە و بەو بۆنەیەوە چەند دیاریەکم ناردە ئەو میوانخانەیەی تێیدا نیشتەجێیت.

وتم: ئەی کاهینی مەزن، تۆ بەچ شێوەیەك لەماڵی خودا هاتیتە دەرەوە، بەڵام"مینا" نەهاتە دەرەوە، چونکە"مینا"ش دەیتوانی لەهەمان ئەو ڕێگایەی تۆ لێی هاتی ئەویش بێتە دەرەوە.

کاهینی مەزن وتی: هەی پیاوی میسری، تۆ قسەی زۆر دەکەیت و خۆت لەو کارانە هەڵدەقورتێنی کە پەیوەندی بەتۆوە نیە و بۆ دوایین جار پێت دەڵێم، دەست لەم کونجکاویەت هەڵگرە، ئەگینا ناچارم دەکەیت هەڵتدەمە ناو دەمی ئەختەبوتەکان.

منیش توڕە بوم و وتم: ئەوە پەیوەندی بەمنەوە نیە و دەبێت بزانم"مینا"لەکوێیە و بەچ شێوەیەك تۆ لێی جیا بویتەوە و لەکوێ ئەوت بەجێ هێشت و گەڕایتەوە.

بەڵام لەمکاتەدا"کاپتا"دەستی گرتم و منی لەکاهینی مەزن دور کردەوە و وتی: خاوەنە خەمگینەکەم، مەگەر تۆ شێت بویت کە سەرت ناوەتە سەر ئەم پیاوە و لەنێو ئەو هەموو ژن و پیاوەدا دەمەقرەی لەگەڵدا دەکەیت و سەرنجی هەموویانت بەلای خۆتدا ڕادەکێشی؟ دوای ئەوە بەگوێمدا چپاندی و وتی: تۆش وەك ئەمانە سەما و

خۆشی خۆت دەربڕە، بۆئەوەی کاهینی مەزن فریو بخوات و وەك ئەوانی تر خۆت بکە بەو نێوەندەدا و کارێك بکە کە وابزانن بەڕاستی تۆش وەك ئەوان خۆشحاڵی.

من وتم:ئەو کارە ناکەم و بەدرۆوە خۆم بەخۆشحاڵ نیشان نادەم و حەزیش ناکەم سەرنجی هیچ کەسێك بەلای خۆمدا ڕاکێشم، بەڵکو ئەگەر ئەم پیاوە پێم نەڵێت"مینا" لەکوێیە و بەچ شێوەیەك دەتوانم خۆمی پێ بگەیەنم، ئەو بەیەك چەقۆ، بەهەمان ئەو چەقۆ ئاسنینەی کە لەوڵاتی"هاتی"بەدەستم هێناوە دەیکوژم، ئەم چەقۆیە بەڕادەیەك تیژە کاتێك بیکەیت بەسکی هەرکەسێکدا تا دەسکەکەی دەچەقێتە ناو ورگیەوە.

"کاپتا"پێی وتم: بێدەنگ بە... بێدەنگ بە... وەرە بابڕۆین و کەمێك شەراب بخۆرەوە، چونکە چاوەکانت لەم شەوەدا وەك چاوی"تاقلەبوو"لەتاریکیدا دەدرەوشێتەوە و دەبێت بخۆیەتەوە، بۆئەوەی ئەم توڕەییەت هێور ببێتەوە، ئەگەر ڕازی بیت و کەمێك شەراب بخۆیتەوە، من پێت دەڵێم لەچ ڕێگایەکەوە دەتوانی خۆت بگەیەنیتە لای"مینا"، چونکە ڕێگای دەرچونی ئەو پیاوە شاخدارەم دۆزیەوە، "کاپتا"منی لەناو کۆڕی ژنان و پیاواندا هێنایە دەرەوە و لەسەر گیا ڕواوەکە دایینیشاندم و بڕێك شەرابی دەرخوارد دام، منیش هەستم کرد کە ناتوانم بێداربم، بۆیە دەبێت بخەوم و لەبەرئەوەی ئەم خەوە نائاسایی بوو پەیم بەوە برد کە بەندەکەم تلیاکی کردووەتە ناو ئەو شارابەوە و تۆڵەی بەسەرهاتی"بابل"ی لێکردومەتەوە.

بەڵام ئەگەر"کاپتا"ئەو شەوە تلیاکی نەکردایەتە ناو ئەو شەرابەوە و دەرخواردی نەدایام، بەدڵنیاییەوە کاهینی مەزنم دەکوشت و دانیشتوانی"کریت"یش منیان هەڵدەدایە ناو دەمی ئەختەبوتەکەوە یان بەشێوەیەکی تر بەکوشتیان دەدام، بەڵام"کاپتا"ئەوشەوە گیانی منی ڕزگار کرد.

کاتێك بێدار بومەوە بینیم ڕۆژە و خۆر هەڵهاتووە و منیش لەسەر ئەو گیایە ڕاکشاوم، سەرم بەرز کردەوە و تەماشایەکی چواردەورم کرد و بینیم کە ژنان و پیاوان، بەڕوتی لەسەر ئەو گیایە خەویان لێ کەوتووە، چونکە دوێنێ شەو تا بەیانی سەرقاڵی خواردنەوە و سەماکردن بون و بەهۆی ماندویەتیانەوە لەپێ کەوتون.

دوای ئەوەی خۆر بەرز بویەوە و گەرمی خۆر ژن و پیاوی لەخەو هەستاند و ژنان قژیان ئاڕایشت کرد و بەرەو ڕووی دەریا ڕۆشتن بۆئەوەی خۆیان بشۆن، بەڵام لەبەرئەوەی ڕاهاتبون بەوەی لەژوری خۆشۆردنی ماڵدا خۆیان بشۆرن، هەرئەوەی

پێیان دەنایە ناو دەریاوە دەگەڕانەوە و نەیاندەتوانی بەرگەی ئاوی ساردی دەریا بگرن.

دوای ئەوە ژنەکان، بەھاوکاری یەکتری ئارایشتی خۆیان کرد و شپرزەیی دوێنێ شەویان بەڕوخسارو جەستەیانەوە نەھێلا، پرسیان: ئێستا کێ چاوەڕێی "مینا"دەکات و کێ دەگەڕێتەوە بۆ شار؟ کۆمەلێك لەژنەکان وتیان ئێمە دەگەڕێینەوە بۆ شار و دوای ئەوە کەوتنە ڕێ، بەلام کۆمەلێکی تر لەژنەکان کە لاوتر و ھاو تەمەنی "مینا"بون، وتیان ئێمە تا ئەوکاتەی دەگەڕێتەوە چاوەڕێی دەکەین.

ھەر یەك لەو ژنە جوانانەی کە دەیانویست بمێننەوە دەیانوت چ پیاوێك ئامادەیە لەگەلێدا بمێنێتەوە؟ و یەکێك لەو پیاوانەش ڕەزامەندی خۆیان بۆ مانەوە دەردەبڕی، بۆئەوەی ھەمان ئەو ژنە بەتەنھایی نەمێنێتەوە.

لەسەرەتادا تێنەگەشتم کە بۆچی ھەریەك لەو ژنانە داوای لەیەکێك لەو پیاوانە دەکرد بمێنێتەوە، دوای ئەوەی تێگەشتم ئەگەر ژنەکان داوا لەو پیاوانە نەکەن لەگەلیاندا بمێننەوە، ھەموو پیاوەکان دەگەڕانەوە بۆشار و ژنەکانیش لەوێدا بەتەنھایی دەمانەوە.

لەنێو ئەو ولاتانەی کە من تا ئەو کات بینیومە"کریت" تاکە ولاتێکە کە ژنەکانی بۆئەوەی سەرنجی پیاوەکان بەلای خۆیاندا ڕاکێشن، دەبوو بەو شێوەیە لێیان بپاڕێنەوە.

لەگۆڕەپانی"گا"بازیشدا ئاگاداری ئەوە بوم کە ژن و پیاوەکان سەرەڕای ئەوەی بەڕوتی لەبەرامبەر"گا"کاندا سەمایان دەکرد، خەلکی زیاتر وروژانی خۆیان لەبەرامبەر ھونەری"گا"بازیدا دەردەبڕی، گەرچی کوڕێك یان کچێکی جوان، سەرنجی بەرامبەرەکانیان ڕادەکێشا، بەلام نەك وەك ولاتانی تر و ھۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە لە"کریت"دا ژنان و پیاوان ئازادن لەھەر کاتێکدا بیانەوێت لەگەل یەکتردا ھاوخەو دەبن. کاھینی مەزنیش یەکێك لەو پیاوانە بوو کە دەیویست بگەڕێتەوە بۆ شار و منیش لێم پرسی ئایا ڕێم پێ دەدرێت تا ئەوکاتەی "مینا لەمالی خودا دەگەڕێتەوە لێرە بمێنمەوە.

کاهینی مەزن وتی:هیچ کەسێك لێرەدا ڕێگری لەمانەوەت ناکات، بەڵام مانەوەی تۆ بێهودەیە، چونکە تائێستا ئەوە ڕوینەداوە کە کەسێك بڕواتە ماڵی خودا و دواجار لێی بێتە دەرەوە.

خۆم بەگەمژە نواند و وتم:ئەی کاهینی مەزن، من هیچ پەیوەندیەکم بەگەڕانەوەی"مینا"وە نیە و نامەوێت چاوم بەو بکەوێت، بەڵکو ئەم بابەتە بیانویەکە بۆئەوەی لێرەدا بمێنمەوە و لەگەڵ ئەم ژنانەدا کە هاوشێوەیان لەهیچ شوێنێکی تری ئەم وڵاتەدا بەدی ناکرێت کەمێك ڕابوێرم، چونکە تەنها ئاسمان و زەوی"کریت"ئەم جۆرە ژنانە بەرهەم دەهێنێت و چیتر لەبەرئەوەی شەوی ڕابردوو سوکایەتیم پێکردی، داوای لێبوردنت لێدەکەم، چونکە شەوی ڕابردوو مەست بووم و نەمدەزانی چی دەڵێمو چی دەکەم و قسە لەگەڵ کێدا دەکەم، بەڵام ئێستا هاتومەتە هۆش خۆم و دەزانم کە شەوی ڕابردوو من کەسێکی زۆر ناپەسەند بوم.

ئەم قسانە کاری کردە سەر کاهینی مەزن و دەستی خستە سەر سەرم و زەردەخەنەیەکی کرد و وتی: زۆرباشە، ئێستاش کە تۆ حەز دەکەیت لەگەڵ ژناندا ڕابوێری، لێرە بمێنەرەوە و منیش ڕێ لەمانەوەت ناگرم، بەڵام ئاگاداری ئەوە بە ژنەکانمان سکیان لەتۆ پڕ نەبێت، چونکە تۆ کەسێکی بیانیت و ئەمەش کارێکی باش نیە کە سکی ژنەکانمان پڕ بکەیتو ئەوەندەش چاوەڕێکە تا ئەوکاتەی "مینا"دەگەڕێتەوە.

وتم: ئەی کاهینی مەزن، من بەو ڕادەیەش لەبەرامبەر ژناندا بێئەزمون نیم، چونکە لەسوریاو"بابل" بینیم کە بە چ شێوەیەك کچەکان دەڕۆشتن بۆ پەرستگا بۆئەوەی پێویستی ژیانی هاوسەریان پێك بهێنن[56]. منیش ئەوەندە بەسادەیی قسەم دەکرد کە کاهینی مەزن وای دەزانی من بەڕاستی پیاوێکی گەمژە و گێلم و منیش مەبەستم ئەوەبوو بەکەسێکی گەمژە بکەومە بەرچاوی، بۆئەوەی هەوڵی ئەوە نەدات لەوێ دورم بخاتەوە.

سەرەڕای ئەوەش کاتێك کاهینی مەزن گەڕایەوە بۆ شار، هەستم کرد کەپاسەوانانی پەرستگای ڕاسپارد ئاگایان لەمن بێت و وەك بڵێی ژنەکانیشی لەوە

---

[56] بڕۆ بۆ پەراوێزی ژمارە ﴿٤٢﴾.

ئاگادار کردەوە کە گاڵتە و خۆشیم لەگەڵدا بکەن، چونکە کاتێك کاهینی مەزن ڕۆشت کۆمەڵێك ژن لەچواردەورم کۆبونەوە و دوایان لێکردم لێرە دور بکەوینەوە و بڕۆینە ناو دارستانەکەی بەرامبەرمان و لەوێ بخۆین و بخۆینەوە.

منیش بانگێشتی ئەوانم پەسندکردو لەگەڵیاندا چومە ناو دارستانەکەوە، لەوکاتەدا تێگەشتم کە ژنانی "کریت"چەندە گەمژە و گێلن، چونکە بەهیچ شێوەیەك شەرمیان لەمن نەدەکرد و ڕەفتارگەلێکیان لەخۆیان دەنواند کە ژنانی سۆزانیخانەکانی "تبس"یش ئەو کارانەیان بەئاشکرا ئەنجام نەدەدا.

لەکاتێك من دڵنیابوم لەوەی ئەو ژنانەی منیان پەلکێشی ناو ئەم دارستانە کردووە، هەمویان ژنانی هەڵبژاردە و بەرجەستەی "کریت"ن.

کاتێك بینیم ئەو ژنانە ئازارم دەدەن، لەبەرئەوەی نەمدەویست لەگەڵ هیچ یەك لەم ژنانەدا ڕابوێرم، بۆیە خۆم بەمەست و خەوتوو نیشاندا و ژنانیش لەوکاتەدا بەنەفرەتو ڕقەوە منیان بەجێ هێشت و وتیان ئەمە بیانیە، پیاوێکی کێوییە، ئەگینا بەوشێوەیە ئێمەی پشتگوێ نەدەخست.

"کاپتا"هات بۆئەوەی لەناو ئەو دارستانەدا دەرم بهێنێت و پێی وتم: تۆ ناتوانی بەرگەی مەستی بگریت، بۆچی ئەوەندە مەییت خواردەوە بۆئەوەی بەو شێوەیە لەپێت بخات.

ژنەکان کاتێك چاویان بەبەندەکەم و ورگە زلەکەی کەوت دەستیان کرد بەگاڵتە و پێکەنین و لێی نزیك بونەوە، بەڵام سەرەڕای ئەوەی بەندەکەم ناشیرن بو و تەنها یەك چاوی هەیە و لەبەرئەوەی بە بیانیەك لەقەڵەم دەدرا هەستی گونجکاوی ژنانی دەبزواند، چونکە ژنانی تەواوی وڵاتان کاتێك بیانیەك دەبینن، لەڕوی کونجکاویەوە هەوڵی ناسینی دەدەن.

ژنەکان بەندەکەمیان لەگەڵ خۆیاندا بردە ناو شەخەڵی دارستانەکەوە و منیش لەبەرئەوەی دەمزانی کە مانەوەم لێرەدا درێژە دەکێشێت، هەڵگرانی گەژاوەکەم ناردەوە بۆماڵ، بۆئەوەی خواردنو خواردنەوەم بۆ بکڕن و لەگەڵ خۆیاندا بیهێنن، بەتایبەت خواردنەوەیەکی زیاتر بکڕن، بۆئەوەی خۆشیان بخۆنەوە و ئێمەش سودی لێ وەرگرین.

ئەو ڕۆژە ئەوكەسانەی لەوێدا بون بەخواردن و خواردنەوە و ڕابواردن تێپەڕاند و من ئاگاداری ئەوە بووم کەچیتر بێزار بوم لەڕابواردن لەگەڵ ژناندا، لەبەرئەوەی ئەو ڕابواردنەی یاسا و سنورێکی نەبێت، زیاد لەکار و ژیانی سیستەماتیك مرۆڤ وەڕەس و ماندو دەکات.

شەوی ڕابردوو تا بەیانی ژن و پیاو سەراقاڵی سەما و گۆرانی وتن بون و من تا بەیانی گوێم لەهاوار و پێکەنینیان بوو، کاتێکیش ڕۆژ هەڵهات، هەموویان لەشەکەتیاندا خەویان لێکەوت، دوای ئەوەی لەخەو هەستان، هەندێکیان گەڕانەوە بۆشار و هەندێکیشان مانەوە، چونکە هێشتا تێریان لەڕابواردن نەخواردبوو.

بەڵام ئەم دەستەیەشیان ڕۆژی سێیەم گەڕانەوە بۆشار، هەندێکیان بەهۆی ئەوەی تا بەیانی سەرقاڵی خۆشگوزەرانی و یاری کردن و خواردنەوە و بێداری بون، نەیاندەتوانی ڕێ بکەن، منیش کەژاوەکەم پێدان بۆئەوەی بیانباتەوە بۆ شار و بەهەڵگرانی کەژاوەکەشم وت بڕۆنەوە چونکە من پێویستم بەکەژاوە نیە.

لەڕۆژی دووەمدا هەڵگرانی کەژاوەکەم، کەبڕێکی زۆر خواردنەوەیان بۆ هێنابوم، هەموو شەوێك ڕۆژی دووجار شەو و ڕۆژ خواردنەوەم دەدا بەپاسەوانانی پەرستگاکە، بۆئەوەی بیانکەمە هاوڕێی خۆم.

لەڕۆژی سێیەمدا کە هەموویان ڕۆشتن پاسەوانەکان سەریان لەمانەوەی من سوڕمابوو و سەرسوڕمانی ئەوانیش لەوەوە سەرچاوەی دەگرت کە دەیانزانی ئەو کچەی چووەتە ناو ماڵی خودا هەرگیز ناگەڕێتەوە. ئەوان ئاگاداری ئەوەبوون کە تەواوی دانیشتوانی دورگەی"کریت"ئاگاداری ئەم بابەتەن، لەبەرئەوەش بەچاوەڕێکردنی گەڕانەوەی ئەو کچە، کاتی خۆیان بەفیڕۆ نادەن، بۆیە دەگەڕێنەوە بۆ ناو شار.

بەڵام لەبەرئەوەی من کەسێکی بیانیم وا دەزانن ئاگاداری داب و نەریتی ئەم دورگەیە نیم، هەر لەبەرئەوەش دوای ڕۆشتنی ئەوانی تر مامەوە.

*بەشی بیست و چوارەم*

## چونە ژورەوە من و بەندەکەم بۆ ماڵی خودا

کاتێك شەو هات دوو گۆزەی گەورەی پڕ لەشەراب کە ئاوێتەی"تلیاك"م کردبوو، برد بۆ پەرستگا و کاتێك چاویان کەوت بەگۆزەکان لەچواردەوری گۆزەکان کۆبونەوە و دەستیان کرد بە خواردنەوەی شەراب، منیش لەوکاتەدا لەپەرستگا دور کەوتمەوە و کاپتام کێشایە کەنارەوە و پێم وتم: خوداکان ویستیان من و تۆ لەیەکتر جیا ببینەوە، لەبەرئەوەی"مینا" لەماڵی خودا نەگەڕایەوە و من دەبێت بڕۆم و بیدۆزمەوە و لەماڵی خودا بیگەڕێنمەوە، لەو کەسانەیە کە ڕۆشتون بۆ ماڵی خودا و نەگەڕاونەتەوە، من دەڕۆم بۆ ئەوەی"مینا"بهێنمەوە، ڕۆژی دوایی گەر نەگەڕاومەتەوە، بگەڕێرەوە بۆشار و بۆ دیارنەمانم هەزار بڕوبیانو بهێنەرەوە، چونکە دەزانم تۆ باشترین وەستای تاشینی بیانویت و شارەزای درۆکردنی و دەتوانی باوەڕ بەخەڵکی بهێنیت، بۆنمونە بڵێ من لەسەر ئەو کێوەوە کەتومەتە ناو دەمی"ئەختەبوتەکان"ەوە و ئەوانیش منیان خواردووە. یان بڵێ لەدەریادا نوقم بوم و ئاو لاشەکەمی بردووەتە بنی دەریاوە و ئیتر هەرشتێك بەدەمتداهات بیڵێ، من تەختە قوڕێکی نوسراو و مۆر کردووت پێت دەدەمو دوای ئەوەی گەڕایتەوە بۆ"ئزمیر"دەتوانیت زێڕ و زیوەکەم لە بازرگانەکان وەرگریتەوە یان بەناوی خۆتەوە بیانخەرە گەڕ، هەروەها دەتوانی ماڵەکەی"ئزمیر"یش بفرۆشی و بەو زێڕ و زیوەی کە بەدەستت هێناوە بڕۆیت بۆ میسر و ئەگەر دەزانی لەکاتی گەڕانەوەتدا لەمیسر تاوانی بەندەیکی هەڵهاتوت دەخەنە پاڵ و دەستگیرت دەکەن، ئەوا باشتر وایە لە"ئزمیر"بمێنیتەوە و بەقازانجی ئەو زێڕ و زیوەی کە دەبێتە هی تۆ بەئاسودەیی بژی و تۆ خەمی مۆمیاکردنی لاشەی من مەخۆ، چونکە ئەگەر من

سەرکەوتن لەبەدەست هێنانەوەی"مینا"نەهێنم، ئەوا شایستەی ئەوە نیم لە"وڵاتی خۆرئاوادا" بژیم.

"کاپتا"سەرەڕای ئەوەی تۆ بەندەیەکی چەنەباز و مایەی سەرئێشە بویت، بەڵام من بەردەوام خۆشم ویستویت، ئەگەر هەندێجار بەگاڵۆکەکەم تەمێم کردویت، ئەوا لەم تەمێکردنەمدا مەبەستم چاکی و بەرژەوەندی تۆ بووە، بۆئەوەی ئاگات لەخۆت بێت، بۆیە داوای لێبوردنت لێدەکەم کەهەندێ جار گاڵۆکم لێ داویت.

"کاپتا"بۆماوەیەك بێدەنگ بوو و دوای ئەوە وتی:خاوەنە بەڕێزەکەم، سەرەڕای ئەوەی لێدانی گاڵۆکەکەت هەندێجار زۆر توند بوو، بەڵام من لەبەرامبەر ئەم لێدانانەت هیچ لێت زویر نیم، چونکە هەر بەوشێوەی خۆت وتت، لەم لێدانەتدا مەبەستت چاکەو بەرژەوەندی من بووە، سەرەڕای ئەوەی لێت دەدام، بەڵام زۆربەی کات وەك هاوڕێیەك مامەڵەت لەگەڵدا کردوم و لەئەنجامدانی کارەکانتدا سودت لەبۆچونەکانم وەرگرتووە.

بۆیە ڕۆژی وا هەبوو هەستم بەوە نەدەکرد کە من بەندەی تۆم، بەڵکو خۆمم بەهاوڕێیەکی تۆ دەزانی، تا ئەوکاتەی گاڵۆکەکەت بەپشت و شانمدا دەکێشا و ئەوکات تێدەگەشتم کە خوداکان مەودایەکیان لەنێوان بەندە و خاوەنەکەیدا داناوە، ئێستاش تۆ دەتەوێت بۆ هێنانەوەی"مینا" کە ڕۆشتووە بۆ ماڵی خودا، بچیتە ناو ماڵی خوداوە، بەڵام ئەم"مینا"یەش کە تۆ بەدوایدا دەڕۆیت، خانمی منیشە و پێی ناوەتە سەر سەرم و منیش وەك تۆ دەبێت بەدواییدا بگەڕێم، ئەگەر"مینا"خانمی منیش نەبوایە و ئەرکی ئەوەم لەسەر نەبووایە کە بەدواییدا بگەڕێم، ئەوا لەم حاڵەتەشدا نەمدەهێڵا بەتەنهایی بچیتە ماڵی خوداوە، چونکە ماڵی خودا، ماڵێکە زۆر تاریك و لەناو ئەو تاریکستانەدا، تۆ پێویستت بە هاوڕێیەکی دڵسۆز یان بەندەیەکی دڵسۆزە.

وتم:"کاپتا"ئەوە یەکەم جارە دەبینم بێگریان قسە بکەیت و ئەم قسەیەی تۆ زۆر ژیرانە دێتەبەرچاوم، لەبەرئەوەی نابێت بەتەنهایی بڕۆمە ماڵی خودا، چونکە لەوانەیە لەو تاریکیەدا ڕێگا ون بکەم، بەڵام سەرەڕای ئەوەش بەلایەنی کەم دڵنیام لەوەی بەزیندوویی لەماڵی خودا نایەمە دەرەوە، هەر لەبەرئەوەش باشتر وایە کەسێك بمرێت نەك دوو کەس.

"کاپتا"وتی:"سینۆهە"سەرباری ئەوەی تۆ ئەتەوێت من لەخۆت دور بکەیتەوە، بەڵام من ناهێڵم بەتەنهایی بڕۆیتە ناو ئەوماڵەوە، هەرچی بێت لەبەرئەوەی من لەتۆ بەتەمەنترم و ئەزمونم لەتۆ زیاترە و لەشتگەلێك تێدەگەم کە تۆ سەرەڕای ئەوەی لە"ماڵی ژیان"خوێندوتە توانای تێگەشتنیت نیە، بەڵام ئەوەش بزانە کەمن لەتاریکی دەترسم و بێ لەم مەشخەڵە ڕێم پێبدەیت گۆزەیەك شەراب لەگەڵ خۆمدا ببمە ماڵی خوداوە، بۆئەوەی هەرکاتێك ترس بەسەرمدا زاڵ بوو، کەمێکی لێ بخۆمەوە.

وتم:زۆرباشە"کاپتا"ئەوەی دەتەوێت بیکە، لەبەرئەوەی ئەو تلیاکەی ئێمە ئاوێتە شەرابی پاسەوانانی پەرستگامان کردووە، ئێستا کاریگەری تێکردون و خەوی لێخستون، باشتروایە چیتر خۆمان دوا نەخەین و خۆمان بکەین بەماڵی خودادا.

کاتێك چوینە ناو پەرستگاوە بینیمان تەواوی پاسەوانەکان خەویان لێکەوتووە، ئێمەش چەند مەشخەڵێکمان لەگەڵ خۆماندا هەڵگرت و کلیلی دەرگای بچوکی ماڵی خوداشمان بەدەست هێنا کە"کاپتا"دەیناسیەوە، چونکە بینی بوی کە لەشەوی چونە ژورەوەی"مینا"بۆ ئەو ماڵە، کاهینی مەزن لەدەرگا بچوکەکەوە هاتە دەرەوە، دوای ئەوە کەوتینە ڕێ و دوای ماوەیەك دەرگای بچوکەکەمان کردەوە و خۆمان کرد بەماڵی خودادا و منیش دەرگاکەم داخستەوە، بەڵام کلیلەکە بەمن نەبوو.

دوای ئەوەی دەرگاکە داخرا کاپتا لەترساندا کەوتە لەرزین و وتی: گەورەم زۆر زوو یەکێك لەمەشخەڵەکان داگیرسێنە، چونکە ئێرە ئەوەندە تاریکە کە مرۆڤ لەترساندا ڕادەوەشێنێت، من بەو چڵەدارە ئاگرینانەی لەگەڵ خۆمدا هێنابوم مەشخەڵێکم پێداگیرساند و خۆمان لەناو چەند ڕێڕەوێکدا بینیەوە کە لە دە داڵان پێکهاتبوو و هەر یەکێکیشیان بەلایەکی جیاوازدا دەڕۆیشت. من بەبینینی ئەو هەموو ڕێڕەوە جیاوازانە سەرم سوڕما، لەبەرئەوەی بیستبوم کە خودای دورگەی"کریت"لەماڵێکدا دەژیت کە ڕێگاگەلێکی زۆری تێدایە و وەك"لابیرنت"[57] وایە.

بە"کاپتا"م وت: نابێت لێرەدا ڕاوەستین، بەڵکو دەبێت بکەوینە ڕێ و من لەوباوەڕەدام کە باشتر وایە لەم ڕێیەوە بڕۆین...."کاپتا" تەماشایەکی ئەو داڵانەی

---

[57] لابیرنت: بەواتا مەجازیەکەی بریتیە لە ژێرزەمینێك کە هەر چەنێك بەرەو پێش بڕۆیت، ڕووبەڕوی چوار ڕیانگەلێکی تازە دەبیتەوە و دواجاریش هەر تێیدا ون دەبیت.

کرد و وتی: "سینۆهە" هیچ گرفتێك لە کەوتنە ڕێ و خۆکردن بەم دالأنەدا نیە، بەڵام دەبێت کارێك بکەین کە بتوانین بەهەمان ڕێگا بگەڕێینەوە.

ئەوکات بینیم، لەو تۆشەبەرە گەورەیەی بەکۆڵیەوە بوو کە گۆزەی شەرابەکەی تێکردبوو، بەستەیەك پەتی بەهێزی دەرهێنا کە لەڕیشك دروستکرابوو و سەرێکی ئەو پەتەی بەدارێکەوە بەست کە بەدیواری ئەو دالأنەدا چەقێنرابوو....وتم: "کاپتا" دەتەوێت چی لەم پەتە بکەیت؟

کاپتاش وتی:ئەم بەتە لەکاتی گەڕانەوەمان سودی لێ وەردەگرین، چونکە دەتوانین دەست بەم پەتەوە بگرین و بگەڕێنەوە شوێنی سەرەتامان.

سەرەڕای ئەوەی ئەو کەرەستەیەی کە"کاپتا"بۆ گەڕانەوە بەدەستی هێنابوو زۆر سادەبوو، بەڵام من بەتەنهایی نەمدەتوانی کەرەستەیەکی ئاوا بەدەست بهێنم و وتم:"کاپتا"تۆ بیرێکی باشت بەمێشکدا هاتووە و دوای ئەوە کەوتینە ڕێ و هەرچی زیاتر بەرەو پێش برۆشتایەین، "کاپتا" گلۆڵە پەتەکەی زیاتر دەکردەوە. دوای تێپەڕبون لەهەر ڕێرەوێکەوە ڕوبەڕوی دالأنێکی تازە دەبوین و کاتێك ئەو دالأنەشمان بەپێ دەبڕی دووبارە ڕوبەڕوی دالأنێکی تر دەبوینەوە، "کاپتا" لەناکاو سەری بەرز کردەوە و بۆنی چواردەوری خۆی کرد و وتی:"سینۆهە" بۆنێکی ئەم چواردەورە دەکەیت؟

منـــیش بـــۆنی چـــواردەوری خـــۆمم کـــرد و بـــۆنی وەك بـــۆنی مردووخانەکـــەی شاری"تبس" وابوو، هەمان ئەو شوێنەی کە مۆمیامان تێدا دەکرد و"کاپتا"کە ڕەنگ لەڕویدا نەمابوو، قومێك شەرابی نۆشی و بەهێمایەکی من بەرێ کەوتینەوە.

لەناکاو پێم بەر شتێك کەوت و چەمامەوە و لەژێر ڕوناکی مەشخەڵەکەدا، ئەوەی من بینیم سەری ژنێك بوو، بەڵام ئەو سەرە بەهۆی تێپەڕبونی کاتەوە بۆگەنی کردبوو و لەحاڵی هەڵوەشاندا بوو، کاپتا کاتێك چاوی بەو سەرە کەوت، دەستی کرد بەگریان، چونکە من و ئەو تێگەشتین کە "مینا"ش گرفتاری هەمان بارودۆخی ئەم ژنەیە و کوشتویانە یان دەیکوژن و ئێمەش ناتوانین بەزیندویی بەدەستی بهێنینەوە.

مـن سـەرەڕای ئـەوەی هـیچ هیوایـەکم نـەبوو بـەوەی"مینـا"بەزینـدویی ببینمـەوە، بـە"کاپتـا"م وت: بـا بـەردەوامی بەڕێگەکـەمان بـدەین. ئـەویش وەکـو جـاران گلۆڵـە

پەتەکـــەی دەکـــردەوە و ئێمـــەش بـــەردەوام بـــەرەوپێش دەڕۆشـــتین و بینـــیم "کاپتا"ڕاوەستاو بەچاوە تۆقاوەکانیەوە تەماشای زەوی دەکرد.

منیش تەماشام کرد و بینیم کە سەنێری"گا"یەك لەسەر زەویدایە، بەڵام بەڕادەیەك گەورە بوو کە ترسی لا دروست دەکردی، بۆیە وتم:"کاپتا" ئایا دەبینی کە سەنێری ئەم "گا"یە چەنێك گەورەیە، ئایا دەتوانرێت ئەوە پەسەند بکرێت کە "گا"یەکی بەوشێوەیە بونی هەبێت.

"کاپتا"ش وتی: نەخێر گەورەم، ئەم "گا"یە بونی نیە، چونکە ئەگەر"گا"یەکی وا بونی هەبێت کە بتوانێت پاشەڕۆیەکی ئاوا فڕێ بدات، بەدڵنیاییەوە نەیدەتوانی بەم ڕێڕەوەدا بڕوات.

وتم: کەواتە بەبۆچونی تۆ ئەم پاشەڕۆیە هی چ گیانەوەرێکە؟

"کاپتا"وتی: وابزانم هی مارێکی زۆر گەورە بێت، چونکە بێ لەمارە زۆر گەورەکان، هیچ گیانەوەرێکی تر ناتوانێت بەم ڕێڕەوەدا تێپەڕێت.

دوای ئەم قسەیە، بەندەکەم قومێکی تر شەرابی خواردەوە و وتی: پەنا بۆ خودا، من نازانم دەرئەنجامی ئەم کارەمان بەچی کۆتایی دێت، بەڵام من دەمزانی دەرئەنجامی ئەم کارەمان بەچی کۆتایی دێت، چونکە مارێکی گەورە هاتوچۆی ئەم ڕێڕەوە بکات، بەدڵنیاییەوە ئێستا"مینا" بەزیندووی نەماوەتەوە و بووەتە نێچیری ئەو مارە.

کاتێك بینیم کاهینی مەزن ئەو کچە جوانەی بردە ماڵی خودا و ئاگاداری ئەوەش بوم کە هەموو مانگێك کەسێکیان دەبردە ماڵی خوداوە، من وام دەزانی مەبەستی کاهینی مەزن یان هەرکەسێکی تر ئەوەیە، ئەو کەسەی لەو ماڵەدا نیشتەجێیە ئەوەیە لەگەڵ کچاندا ڕابوێرێت و دوای ئەوەش لەناویان ببات، بەڵام دوو شت بوو بەڕێگر لەبەردەم ئەوەی ئەم بیروباوەڕە لەهزری مندا بەهێز ببێت.

یەکێکیان ئەوەیە کە تەنها کچەکان ڕەوانەی ماڵی خودا ناکەن، بگرە هەندێکات کوڕە لاوەکانیش دەبرانە ماڵی خوداوە و ئەگەر خودای دورگەی"کریت"خوازیاری ڕابواردن بێت، کوڕانی بانگێشتی ماڵی خۆی نەدەکرد. دووەم دەمزانی کە لەدورگەی"کریت"دا لەبۆنە و ئاهەنگەکاندا ژن و پیاو ئەوەندە ئازادە کە کاهینی مەزن یان خودای"کریت"بۆ ڕووبەڕوبونەوەی ئیشقی کچانی لاو، پێویستی بەوە نیە ڕوانەی ماڵێکی تاریکیان بکات و دوای ئەوەش لەناویان ببات.

بۆیە بیرم لەوەکردەوە کە بردنی"مینا"بۆماڵی خودا هۆکارێکی جیاواز لەئیشق لەخۆ دەگرێت و کاهینی مەزن نایەوێت لەئیشقی ئەو بەهرەمەند ببێت.

هەرچی زیاتر بەو ڕێڕەوەدا بەرەوپێش دەڕۆشتین، بۆنی ئەو بۆگەنەی پێشتر هەستمان پێکرد تا دەهات زیاتر دەبوو و گەشتە ڕادەیەك کە چیتر بەرگەی ئەو بۆنەت نەدەگرت. وەك ئەوە وابوو کە سەدان لاشەی مرۆڤ و ئاژەڵ بۆگەنی کردبێت و هەڵوەشابێت و هەر ئەم هەڵوەشانەش ئەم بۆنەی بەچواردەوردا بڵاو کردبێتەوە.

کاتێکمان زانی ئەو ڕێڕەوەی ئێمە بەڕوناکی مەشخەڵ پێیدا دەڕۆشتین، ڕوناك بویەوە و بینیم کە لەدەرەوە ڕوناکی دێتەوە ناو ڕێڕەوەکەوە و ڕوناکی دەکاتەوە و هەرچی زیاتر بەرەو پێشتر بڕوشتایەین، ڕێڕەوەکە ڕوناکتر دەبوو، تا ئەوەی گەشتینە کۆتایی ئەو ڕێڕەوە و چاومان بەدەریای سەوز کەوت، گوێمان لەدەنگی بەریەککەوتنی شەپۆلەکانی دەریا بوو لەگەڵ کەنارەکانی، لەسەر ئاوەکە شتێکم بینی کە لە چەند مەشکەیەك دەچوو کە لەپاڵ یەکتردا دانرابێتن.

ئێمە زانیمان کە ئەو خیگە ئاوساوانە بریتین لە پارچەی جەستەی مارێك کە لاشەکەی بۆگەنی کردووە و سەریشی چەقیوە بەناو ئاوەکەدا بۆیە نابینرێت.

ئەوکات من و"کاپتا"پەیمان بەوە برد، کەئەو هەواڵەی دەیوت کە خودای"کریت" مردووە ڕاستە، ئەو مارە گەورەیەی -کەماوەیەك بەسەر مەرگیدا تێدەپەڕێت، ئەگینا بەوشێوەیە بۆگەنی نەدەکرد- هەمان خودای دانیشتوانی"کریت"ە و ئەویان لەخەڵکی دەشاردەوە و هەموو مانگێك کچێکی لاو یان کوڕێکی لاو کە هێشتا ئیشقی ژنێکیان لەدڵیاندا بەرجەستە نەکردووە، ڕەوانەی ئەو ڕێڕەوە تاریکە دەکرد، بۆئەوەی ئەو گیانەوەرە بیکاتە نێچیری خۆی و مانگی مرۆڤێك بۆ ژەمی ئەو گیانەوەرە بەس بوو.

کچ و کوڕی لاو لەتاریکیدا، لەناکاو دەکەوتنە ناو دەمی ئەو مارەوە و پێش ئەوەی بزانن چیان بەسەردا هاتووە، نوقمی ناوسکی ئەو مارە دەبون. گیانەوەرێکی ئەوەندە مەزن لەوشکانیدا ناژیت، ئاشکرایە ئەم مارە ترسناکە لەدەریادا دەژی و بەهۆی ڕێڕەوی ئاو یان هۆکارێکی ترەوە هاتووەتە دورگەی"کریت"ەوە و ئەفسانە پەرستەکانی"کریت"یش بەگومانی ئەوەی ئەمە خودای دەریا بێت، ڕێگەی گەڕانەوەی ئەو کیانەوەرەیان گرتووە بۆئەوەی هەمیشە لە"کریت"دا بێت.

ئەوکات بۆ جوڵانەوەی ئەم هەموو داڵانە پێچاوپێچەیان بۆ دروست کرد و هەموو مانگێك کوڕ و کچێکی لاویان پێشکەش دەکرد، بۆئەوەی لەبرساندا نەمرێت یان بیر لەوە نەکاتەوە لێرە بڕواتە دەرەوە، بەڵام دوای ئەوەی ئەم مارە مرد، ناچار بون وا باسی بکەن کە ئەو هێشتا ماوە و هەر بەوشێوەیە مانگی کچێك یان کوڕێکیان دەبردە ناو ماڵی خودا، بەڵام لەبەرئەوەی چیتر ئەومارە گەورەیە زیندو نەبوو و نیە، بۆئەوەی لاوەکان بخوات، دەبێت بزانین چیان لە"مینا"کردووە؟ دوای ئەوەی ئەویان بردە ماڵی خوداوە بۆ کوێ ڕۆشتووە؟

منیش نەم دەتوانی خۆم لەنائومێدی دۆزینەوەی"مینا"بپارێزم، بۆیە بەردەوام بانگم دەکرد و دەنگم لەناو ئەو ڕێڕەوەدا پێچی دەخوارد و دەنگی دەدایەوە، تا ئەوەی"کاپتا"بەپەنجەی زەویەکەی پێنیشان دام و وتی تەماشاکە، منیش لەسەر زەوی چەند پەڵەیەك خوێنم بینی کە لەدەریاکەدا کۆتایی پێ دەهات و"کاپتا" وتی: گەورەم هەر بەوشێوەیەی خۆت دەیبینی ئەم پەلانە لەئاوەکەدا کۆتایی دێت و باشتر وایە دوای ئەم پەڵانە بکەوین.

کاتێك گەشتینە کەنار ئاوەکە بینیم لاشەی"مینا"نوقمی دەریاکە بووە و بەهۆی پاکی و زوڵاڵی ئەوەکەوە زۆر بەجوانی لاشەکەی دەبینرا و کۆمەڵێك قرژانگی دەریایی چواردەوریان گرتووە و خەریکی خواردنی گۆشتی ئەون.

من لەوکاتە هاوارم کرد و لەسەر ئەژنۆ کەوتم و ئەگەر"کاپتا"لەوێ نەبوایە منیش پەیوەندیم بە"مینا"وە دەکرد، بەڵام "کاپتا"بینی ڕۆژ هەڵهاتووە و لەوانەیە پاسەوانەکان لەخەوی تلیاکی هەستن منی لەڕێی ئەو پەتەی کە بەدوای خۆیدا ڕای دەکێشا، لەماڵی خودای"کریت"هێنایە دەرەوە و کاتێك چوینە دەرەوە و بەرەوڕووی پەرستگا ڕۆشتین، بینیمان پاسەوانانی پەرستگا کە شەوی ڕابردوو شەرابی ئاوێتە بەتلیاکی ئێمەیان خواردووەتەوە، هێشتا لەخەو هەڵنەستاون.

"کاپتا"بێنەوەی لەنزیك ماڵی خودا بوەستین و کەمێك بحەوێینەوە، گەڕاندمیەوە بۆ شار، بەڵام من بەڕادەیەك ئاگام لەخۆم نەبوو کە لەڕێدا وەك کەسە سەرخۆشەکان هەنگاوم دەنا و"کاپتا"بەخەڵکی دەوت:کە هۆکاری مەستی من ئەوەیە لەکاتی چاوەڕێکردنی"مینا"دا شەرابێکی زۆرم خواردووەتەوە و لەخەڵکانی تر زیاتر لەلای

ماڵی خودا ماوەتەوە و ئەوانیش باوەڕیان بەو قسەیە کرد، لەبەرئەوەی دەیانزانی من کەسێکی بیانیم و نازانم کە هیچ کەسێك لەماڵی خودا ناگەڕێتەوە.

دوای ئەوەی ڕۆشتینەوە بۆ میوانخانەکە، لەتوڕەیی و نائومێدیاندا خواردنەوەیەکی زۆرم خواردەوە و خەوتم، بەڵام کاتێك لەخەوێکی درێژخایەن هەستام ئاگاداری ئەوە بووم کە هیچ ڕقێکم لە کاهینی مەزن نیە کە"مینا"ی بردە ماڵی خودا و لەوێ بەکوشتی داوە-چونکە بێ لەو هیچ کەسێکی تر لەوێ نەبوو، بۆئەوەی بەکوشتی بدات- چونکە کاهینی مەزن، ناچار بوو وەك ڕابردوو، واپیشانی بدات کە خودا زیندووە و دەبێت کچانی لاو بڕۆن بۆلای و کچێنی خۆیانی پێشکەش بکەن، بەڵکو ڕقم لەداب و نەریتی دانیشتوانی کرت بوو، کەبۆچی کچان و کوڕانی لاو هەڵدەدەن قورگی ئەو مارەوە.

ویستم هەستم و لەشەقامەکانی شاردا ڕێ بکەم و بڵێم، هەی خەڵکی گەمژە، ئەو خودایەی کە ئێوە دەیپەرستن، مارێك بوو کە ماوەیەك بەسەر مەرگیدا تێدەپەڕێت و ئێوە نابێت ڕێ بدەن لاوەکانتان بڕۆن بۆماڵی خودا، چونکە لەوێ دەیانکوژن، بۆئەوەی جارێکی تر لەماڵی خوداوە نەگەڕێنەوە، بەڵام ئاگاداری ئەوە بووم کە خستنە ڕوی ڕاستیەکان کارێکی زۆر دژوارە و خەڵکی ئامادە نین گوێ لەڕاستیەکان بگرن، بگرە ئەگەر لەبەرژەوەندی ئەوانیشدا بێت و هزری خەڵکی بەشێوەیەك هۆگری ئەفسانە و خەیاڵپڵاویەکان بووە کە هەموو بیرۆکەیەك گەر گەمژانەش بێت پەسەندی دەکەن، بەڵام هیچ کات ئامادە نین ڕاستیەکی ژیرانە پەسەند بکەن، پێش ئەوەی من بتوانم ئەوان ببەم بۆماڵی تاریکی خودا و لاشەی ماری کوژراویان پێنیشان بدەم، دەمکوژن. ئەگەر خەڵکی من نەکوژن، ئەوا خزمەتکارانی ئاینی"کریت"و کاهینە مەزنەکان کە سودێکی زۆر لەم ئەفسانەیە وەردەگرن، لەسێدارەم دەدەن.

دڵم بەوە خۆش دەکرد، ئەگەرئاینی دانیشتوانی"کریت"ڕاست بێت، سەرەڕای ئەوەی خودای "کریت"مردووە"بەمزوانە توانا و شادی دانیشتوانی"کریت"لەناو دەچێت و بەڵایەکی سروشتی بەهێرشی نەتەوەکانی تر دورگەی"کریت"نابۆت دەکات و کۆڵان و شەقامەکانی"کریت"لەخوێن دادەپۆشرێت و سەدان کەشتی کە لە لەنگەرگادا ڕاوەستاوە هەمویان نوقم دەبن و دوای ئەوە نەتەوەیەکی دڕندە کە هێرشی بۆ"کریت"کردووە لەجێی دانیتشوانی"کریت"دا نیشتەجێ دەبن و کەسە دڕندەکانیش

لەبەرئەوەی تاقەتی ئەوەیان نیە لەحەمامە پاك و خاوێنەكانی ئەواندا خۆیان بشۆن. بۆیە تێك وپێكیان دەدەن و وەك هەندێك لەو شارانەی كە من بینیومن، پیسوپۆخڵی هەموو شوێنێك دادەپۆشێت.

دوای ئەوە لەدڵی خۆمدا وتم، خودای"كریت"هیچ پەیوەندیەكی بەمنەوە نیە، چونكە من لەم وڵاتەدا كەسێكی بێگانەم و دەبێت لێرە بڕۆم. و چارەنوسی"مینا"و من هەر بەوشێوەی ئەستێرەناسەكانی"بابل"باسیان كرد، لەرێی ئەستێرەكانەوە دیاری كراوە، چونكە چارەنوسی هەموو كەسێك، ئەستێرەكان دیاریان كردووە و دەنگ و هاوار و قسەی ئێمە لەگەڵ ئەوەی نوسراوە و بووەتە چارەنوسی ئێمە، ناتوانرێت گۆڕانكاری لەبڕیارەكانیدا دروست بكرێت.

ئەوكات بۆئەوەی بتوانم دوبارە بخەوم، داوای شەرابم لە"كاپتا"كرد، بەڵام بەندەكەم لەباتی شەراب خواردنی بۆ هێنام و منیش پێم وت، من داوای شەرابم كرد نەك خواردن و ئەگەر شەرابم بۆ نەهێنی، ئێسقانەكانت بەم گاڵۆكە دەشكێنم. بۆیە"كاپتا"ناچار بوو بڕوات شەرابم بۆ بهێنێت. لەو ڕۆژە بەدواوە كاتێك شەرابم دەخواردەوە، ئارامیم بەدەست دەهێنا و كاتێكیش زیادەڕەویم لەخواردنەوەدا بكردایە، هەموو شتەكانم چەند ئەوندەی خۆی دەبینی و بەڕوكەش وا دەهاتە بەرچاوم كە هەموو شتێك بەدوان ببینم، لەكاتێكدا دڵنیابوم كە وانیە.

ڕۆژێكیان ویستم لەمبارەیەوە لەگەڵ"كاپتا"دا قسە بكەم و پێی بڵێم، هەموو ڕاستیەك بەو شێوەیە كە خودی مرۆڤ چاوی پێی دەكەوێت و هیچ گومانێكیش لەبونی ناكات، لەكاتێكدا دەزانێت ئەوەی ئەو چاوی پێی كەوتووە جگە لەخەیاڵ هیچ شتێكی تر نیە.

بەڵام"كاپتا"ئامادە نەبوو لەمبارەیەوە گفتوگۆم لەگەڵدا بكات و پێم بڵێت"سینوهە"تۆ توانای خواردنەوەی شەرابی زۆرت نیە و من دەترسم بەهۆی ئەم خواردنەوە لەناو بچیت، ئەوكات چارەنوسی من لەم وڵاتەدا چی دەبێت؟ بەچ شێوەیەك لاشەكەت ببمەوە بۆ"تبس"و بەمردوخانەت بسپێرم بۆئەوەی جەستەت مۆمیا بكەن.

بەڵام سەرەڕای ئەوەی"كاپتا"ڕێی لەو زۆر خواردنەم دەگرت، ئەمڕۆ ئەوەم بۆ دەركەوت هۆكاری ئەوەی لەو ڕۆژانەدا شێت نەبوم یان بیرم لەكوشتنی كاهینی مەزن

نەکردووەتەوە، دەگەڕێتەوە بۆئەوەی کە خواردنەوە منی دوچاری جۆرێك مەنگی و سستی دەکرد کە چیتر دوای خوادرنەوە تەنها حەزم لە خەوتن بوو. ئەگەر خواردنەوە نەبوایە ئەوا بەردەوام بیرم لە"مینا"دەکردەوە یان شێت دەبوم، یان ئەوەیکە هەوڵی کوشتنی کاهینی مەزنم دەدا و دوای کوشتنی ئەویش دەیانکوشتمەوە.

چەندجارێك بە"کاپتا"م وت بڕوات و کاهینی مەزن بهێنت بۆ ئەو میوانخانەیەی کە منی لیَ نیشتەجیَ بوم، هەموو جارێك بەندەکەم سەرپێچی لەم داوایە دەکرد. دوای ئەوە تێگەشتم کە گاڵۆك و چەقۆکەمی شاردووەتەوە، بۆئەوەی نەتوانم لێی بدەم، یان بیکوژم یان خۆم بکوژم.

ڕۆژێکیان کاتێك لەخەو هەستام، بینیم"کاپتا" لەگۆشەیەکی ژورەکەدا دەگریت.

گۆزەی خواردنەوەکەم هەڵگرت و قومێکم لیَ خواردەوە و وتم: بۆچی دەگریت؟ ماوەیەك بوو قسەم لەگەڵ "کاپتا"دا نەکردبوو، چونکە بەبینینی سەروچاوی خەمگینی بریندار دەبوم و نەمدەویست گویٖم لەدەنگی بێت، بەڵام لەو ڕۆژەدا کاتێك چاوم بەگریانی کەوت، ویستم لێی بپرسم بۆچی دەگریت.

"کاپتا"وتی: کەشتیەك لەم لەنگەرگایەوە دەڕوات بۆ"سوریا"و ئەوە دوایین کەشتی دەبێت کە لێرەوە بڕوات بۆ"سوریا"و چیتر دوای ئەوە بەهۆی زریانەکانی وەرزی زستانەوە تا ساڵی ئایندە لێرەوە هیچ کەشتیەك بەرەو سوریان ناکەوێتە ڕیَ.

بەدەم هاوارەوە پێم وت: هەستە و بڕۆ بۆ لەنگەرگا و سواری ئەو کەشتیە ببە و بڕۆرەوە و منیش لەبونایەتی شومت ڕزگار بکە و چیتر نامەوێت چاوم پێت بکەوێت.

"کاپتا"وتی:"سینۆهە"سەرەڕای ئەوەی پێشبینی ئەوە دەکەم کە دوای ئەم قسەیەم، ئێسقانەکانی جەستەم ورد و هان بکەیت، پێت دەڵێم کە منیش لەم ژیانەی تۆ کە وەك ژیانی ئەو مێشانەیە کە لەچواردەوری گۆزەکان کۆبونەوەتەوە و شەراب خواردنەوە و مەستی بەردەوامی تۆ منی بەشێوەیەك بێزار کردووە کە چیتر شەراب لەدەمی مندا هیچ تامێکی نیە، منێك کە تاکە ئارەزو و دڵخۆشی من خواردنەوەی شەراب بوو، چیتر شەراب ناخۆمەوە. "سینۆهە" هەرکاتێك باسی زانست بکرێت، تۆ فشە بەوەوە دەکەیت کە لە قوتابخانەی"ماڵی ژیان" خوێندنت تەواو کردووە و کەسێکی دانایت و هەزاران مردوت بینیوە°یان بەدەستی خۆت جەستەی مردووەکانت لەت کردووە، سەرەڕای ئەوەش هێشتا نازانی ئەو کەسەی مرد چیتر لەناو چووە و

چیتر زیندوو نابێتەوە و ئەگەر تۆ هەموو ڕۆژێك دە گۆزە شەراب بخۆیتەوە یان لەبەیانیەوە تا ئێوارە بگریت، ئەو ژنەی کە لەپێناویدا ئەم ژیانەت کردووەتە پیشەت، بۆت ناگەڕێتەوە و جارێکی تر بەو چاوانەت بەزیندویی نایبینیتەوە. تۆ سەرەڕای ئەوەی کوڕێکی لاویت، ئێستا بەهۆی زۆری خواردنەوەتەوە دەستت بەشێوەیەك کەوتووەتە لەرزین کە ناتوانی کون بکەیتە سەرێك یان ورگێك بدڕیت یان ددانی کەسێك هەڵکێشی و هەرچی زێڕ و زیوت هەبوو هەمویت دا بەشەراب، بەواتا هەمویت بەخۆڕا هەڵڕشت و منیش سەرەتا کاتێك بینیم تۆ وەك گۆزەیەك کەبنی نیە شەراب دەخۆیەتەوە زۆر خۆشحاڵ بوم و ئاگاداری ئەوە بووم کە هاوڕێیەکم بۆ پەیدا بووە، بگرە لەفرۆشگاکانی لەنگەرگاشدا دەموت من خاوەنێکم هەیە کە هەموو زێڕ و زیوێکی لەپێناو شەرابدا خەرج دەکات، بەڵام کاتێك ئاگاداری ئەوە بووم وەك بڵێی ئەو ڕۆژە دواین ڕۆژی ژیانت بێت، ترسام و ڕاوەشام و بەزەییم پێتدا هاتەوە و دەزانم ئەگەر تۆ بمریت من دەتوانم بگەڕێمەوە بۆ"ئزمیر"و بەپێی ئەو ڕونکردنەوەیەی کە بۆت نوسیوم زێڕ و زیوەکەت لەبازرگانە دەریاییەکان وەرگرمەوە و دەست بەسەر ماڵەکەتدا بگرم و هیچ یەکێکیش لەم کارانەم بەدزی لەقەڵەم نادرێ، چونکە تۆ خۆت ئەمانەت پێ بەخشیوم، بەڵام ناتوانم ئەوە ببینم کە تۆ بەهۆی خواردنەوەی شەرابەوە خەریکە لەناو بچیت و زانست و زیرەکی تۆ کە سەرچاوەی زێڕ و زیوە وشك ببێت.

ئاه...خاوەنی خۆشەویستم... سوێند بەخوداکان سەرەڕای ئەوەی جنێوم پێ دەدەیت و هەندێجاریش بەگاڵۆکەکەت لێم دەدەیت، هەر خۆشم دەوێیت و ناتوانم بێ تۆ بژیم، ئەم هاوڕێیەتیەم بۆ زێڕ و زیو و ماڵ و خواردن نیە، چونکە پێشتر پێم ڕاگەیاندی کە بەرژەوەندی من لەوەدایە کە تۆ بمری و منیش لە"ئزمیر"دا دەست بەسەر کانزاکانتدا بگرم، بەڵام لەبەرئەوەی تۆم خۆش دەوێت نامەوێت خاوەنە خۆشەویستەکەم لەناو بچێت بەهۆی خواردنەوەی لەڕادەبەردەر و بێهودە بیر لەکەسێکی مردوو بکاتەوە کە بەهیچ شێوەیەك زیندوو نابێتەوە.

گوتەکانی "کاپتا"زۆر کاریان تێکردم، چونکە هەر بەوشێوەی ئەو دەیوت، بینیم دەستەکانم دەلەرزن و بەردەوام خواردنەوەی شەراب خەریکە لەناوم دەبات و لێکمدایەوە بەهۆی بەردەوامی خواردنەوەی شەرابەوە، تەواوی ئەو زانستەی من لە میسر و سوریا و"بابل" و شوێنەکانی تردا فێریان بوم و بەدەستم هێناون، بێبەرهەم

دەبن، چونکە من دەمرم و چیتر دوای ئەوە ناتوانم سود لەو زانستانەی بەدەستم هێناون وەرگرم.

تێگەشتم کە زیادەڕەوی لەهەر شتێکدا، بگرە لە شادی و خۆشیشدا زیانبەخشە و جۆرێکە لەشێتی، بەڵام نەمویست بە"کاپتا"بڵێم کەوتومەتە ژێر کاریگەری گوتەکانی، بۆئەوەی لەخۆبایی نەبێت پێم وت: گوتەکانی تۆ لەگوێی مندا وەك وزە وزی مێش وایە و ئەم گوتانەت بەلای منەوە شایەنی پەسەند کردن نیە، بەڵام چەند ڕۆژێکە خۆم بڕیاری ئەوەم داوە کە چیتر شەراب نەخۆمەوە، چونکە خواردنەوەی شەراب، دەستی هێناومەتە لەرزین و بەتەواوی تەمەڵی کردوم. لەبەرئەوە لەمڕۆوە چیتر شەراب ناخۆمەوە، لەبەرئەوەی چیتر نامەوێت لە"کریت"دا بمێنمەوە، هەر ئەمڕۆ لێرە دەڕۆم...لەبەرئەوە بڕۆ و کەلوپەلی گەڕانەوەمان کۆبکەرەوە و ئامادەیان بکە.

کاتێك"کاپتا" گوێ لەم قسانە بوو، لەخۆشیاندا وەك منداڵ دەستی کرد بەهەڵقون هەڵقون و دوای ئەوە لەو ژورە ڕۆشتە دەرەوە بۆئەوەی کەلوپەلەکان کۆ بکاتەوە.

هەمان ڕۆژ ئێمە بەو کەشتیە ڕۆشتین و سەوڵ لێدەرەکان بۆ دەرکردنی کەشتی لە لەنگەرگا، لەنێوان سەدها کەشتی مەزن و بچوکەوە، سەوڵیان لێدەدا و دوای ئەوەی گەشتینە دەریا، کەشتیەوانی کەشتیەکە، قوربانی پێشکەشی خودای دەریا کرد، ئەوکات چارۆکەی کەشتیەکانی هەڵکرد و کەشتیش بەهۆی زۆری با بەسەر ئاوەکەدا چەمایەوە و دەنگی بەرکەوتنی شەپۆلی دەریا دەبیسترا کاتێك کەبەر جەستەی کەشتیەکە دەکەوت.

کەشتیەکەی ئێمە ڕێگا ڕۆژهەڵات، بەواتا سوریای گرتە بەر، ئەوکات دورگەی "کریت" وەك دیمەنی خەونێك کە دوای بێداربونەوەی مرۆڤ لەخەو ون دەبێت، ئاوا لەبەرچاومان ون بوو و بێ لەپانتایی دەریا، هیچ شتێك لەچواردەورماندا بەدی نەدەکرا.

*بەشی بیست و پێنجەم*

## گەڕانەوە لە"کریت"و بارودۆخی تازەی"ئزمیر"

بەوشێوەیە دوای ئەوەی سێ ساڵ لە"بابل"و"هاتی"و"کریت"دا بوم، گەڕامەوە بۆ"ئزمیر"کە دەکەوێتە وڵاتی سوریاوە، بەڵام ئەم سێ ساڵەی وانەی ژیان منی- کەپێشتر وەك میوەیەکی کاڵ وابوو- بەجوانی پێ گەیاند.

"با"و دەریا و بەریەککەوتنی شەپۆلەکان، مەستی شەراب و بیرۆکە و ئەندێشەکانی ڕابردوی لەیاد بردمەوە و کاتێك پاڵم بەدیواری گەشتیەکەوە دەدا و تەماشای شەپۆلەکانم دەکرد، بەژن و باڵای"مینا"وەك خەونێکی شیرین و جوان دەهاتەوە بەرچاوم کە دڵنیام بەهیچ شێوەیەك لەبێداریدا نایبینمەوە.

من خۆشحاڵ بوم بەوەی"مینا"و سەماکانیم لەبەرامبەر"گا"کاندا بینی، هەروەها بەوەش ڕازی بوم کە بینیم ئەویان لەماڵی خودای"کریت"دا بەکوشت دا. چونکە فێری ئەزمونێکی تر بووم.

نامەوێت بڵێم مەرگی"مینا"خۆشحاڵی کردم، یان ئارەزوی ئەوەم دەکرد بەچاوی خۆم مەرگی ببینم، بەڵکو دەمەوێت بڵێم، ئاشنابونم بەو کچە بووە هۆی ئەوەی من بڕۆمە دورگەی"کریت"و چاوم بەژوری خۆشۆردن و ئاودەستەکانی ئەوێ و دابونەریت و ئەو بیروباوەڕەی کە بەخودای خۆیان هەیانبوو بکەوێت - لەکاتێکدا هێشتا چاویان بەخودای خۆیان نەکەوتبوو- قوربانیدانی سەرسوڕهێنەری ئەوان لەڕێی هەمان ئەو خودایە کە جگە لەمارێکی مەزنی دەریایی هیچی تر نەبوو، بووە هۆی ئەوەی من فێری چەند ئەزمونێك ببم، بەپێچەوانەی ئەم حاڵەتەش ئەم جۆرە ئەزمونانەم بەدەست نەدەهێنا.

مرۆڤ تا ئەوکاتەی کارێکی تازەی بەدەست نەهێناوە، خۆی بەکەسێکی تەواو دەزانێت، بەڵام دوای ئەوەی زانی بێ لەو زانست و زانیاریەی هەڵگریەتی، لەجیهاندا زانست و زانیاریگەلێکی تر هەیە، پەی بەکەمایەتی خۆیی دەبات، هەرلەبەرئەوەش کەسانی نەزان زۆر لەخۆبایی دەبن، چونکە وا دەزانن هەموو شتێك دەزانن و لەجیهاندا لەوان باشتر و مەزنتر دەست ناکەوێت، هەر لەبەرئەوەشە هەرکاتێك بینیمان ژنێك یان پیاوێکی خۆ بەزلزان بەسوکایەتیەوە تەماشامان دەکەن، دەبێت بزانین ئەوانە کەسێکی نەزان و گەمژەن و لەبەرئەوەی هیچ شتێك نازانن و ئەزمونیان نیە، *خۆیان لەکەسانی تر بەمەزنتر دەزانن.*

کاتێك گەشتمە"ئزمیر"بینیمماڵەکەمان لەهەمان ئەو شوێنەدایە کە پێشتر بووە، بەڵام دزەکان، ئەوەی لەماڵدا هەبوو هەمویان بردووە و دراوسێکانیشمان ئەم دیارنەمانەی ئێمەیان قۆستووەتەوە و حەوشەی ماڵەکەیان کردووە بەزبڵخانە و مشکگەلێکی گەورە، لەماڵەکەماندا ڕایان دەکرد.

کاتێك دراوسێکانم چاویان بەمن کەوت، لەبەر خۆیانەوە نەفرەتیان لێ دەکردم و بیستم کە دەیانوت ئەو میسریە و تەواوی نەهامەتیەکانی ئێمەش لەمیسرەوە سەرچاوە دەگرێت. منیش سەرم لەنەفرەتی دراوسێکانم سوڕما و لەمێوانخانەیەکدا نیشتەجێ بوم، تا ئەوەی کاپتا چەند کرێکارێکی بەکرێ گرت بۆئەوەی ماڵەکەمان بۆ پاك بکەنەوە.

کاتێك گەڕامەوە بۆ"ئزمیر"هیچ زێڕ و زیوێکم نەبوو، لەبەرئەوەی ماوەی سێ ساڵ ون بوبوم، بەگومان و ترسەوە بەرەو کۆمپانیا دەریاییەکان ڕۆشتم، چونکە لەوباوەڕەدا نەبووم ئەو زێڕ و زیوەی من، کە ئەوان لەکۆمپانیاکەیاندا خستبویانە گەڕ بۆم بگەڕێننەوە، بەڵام خاوەنی کۆمپانیای دەریایی، بێ هیچ گرفتێك سەرمایە و سودەکەشی بۆ گەڕاندمەوە و دەرکەوت ماوەی ئەو سێ ساڵەی من لێرە نەبوم، چەند کەشتیەك نوقم بوبون، بەڵام سەرباری ئەوەش سامانەکەی من زیادیشی کرد بوو.

یەکێك لە بەڕێوبەری کۆمپانیای دەریاوانی، منی بانگێشتی ماڵەکەی خۆی کرد و وتی: "سینۆهە" سەرەڕای ئەوە ئێمە تۆمان خۆش دەوێت، چونکە دەزانین پزیشکێکی شایستەی و دەتوانی چارەسەری نەخۆشەکانمان بکەیت، دەبێت ئەوەت پێ بڵێم خەڵکی سوریا زۆر ڕقیان لەوڵاتی میسر کەوتووە، چونکە ئەو باجەی فیرعەون

لەئێمەی دەسێنێت زۆر زۆرە، هەر لەبەرئەوەش چەند جارێك میسریەکانیان لەناو شەقامەکاندا بەردباران کردووە و لاشەی سەگ و پشیلەی تۆپیویان فڕێ داوەتە ماڵەکانیان، لەبەرئەوەی ئێمە تۆمان خۆش دەوێت، لەو بارودۆخەی ئێستا ئاگادارت ئەکەینەوە بۆئەوەی ئاگات لەخۆت بێت و بزانی لە"ئزمیر"دا بەچ شێوەیەك ڕەفتار بکەیت.

منیش سەرم لەو قسەیە سوڕما، چونکە سێ ساڵ لەوەوپێش کاتێك لە"ئزمیر" ڕۆشتمە دەرەوە لەگەڵ میسریەکاندا دۆست بون و لاسایی داب و نەریتی میسریەکانیان دەکردەوە، هەروەك چۆن ئێمە لە"تبس"ی پایتەختی میسردا لاسایی داب و نەریتی دانیشتوانی سوریامان دەکرد، بەڵام "کاپتا"گوتەی خانەخوێکەی منی پەسەند کرد و کاتێك لەماڵی سەرۆکی کۆمپانیای دەریاوانەوە گەڕاینەوە بۆ ماڵ وتی:وابزانم ڕۆحە ئازاربەخشەکان ئاوێتەی جەستەی سریانیەکان بوبێت، لەبەرئەوەی وەك شێتیان لێهاتووە و چیتر حەز ناکەن بەزمانی میسری قسە بکەن، من ئەمڕۆ بۆئەوەی تینویەتی خۆم بشکێنم، خۆم کرد بەناو فرۆشگایەکدا بۆئەوەی گۆزەیەك ئاوجۆ بخۆمەوە، بەڵام هەرئەوەی کڕیارانی ئەو فرۆشگایە زانیان من میسریم، دەریانکردم و منداڵانیش لەپشتمەوە بەرد و پاشەڕۆی ئاژەڵیان تێدەگرتم و منیش بەهۆی ئەوەوە ئاگاداری ئەوە بووم کە خەڵکی سوریا زۆر ڕقیان لەمیسریەکانە، دوای ئەوە ڕۆشتمە فرۆشگایەکی ترەوە، بەڵام ئەمجارەیان قسەیەکیشم نەکرد و قامیشێکم هەڵگرت و خستمە ناو گۆزەیەکەوە و خواردمەوە.[58]

دوای ئەوە بەندەکەم وتی:من لەبارودۆخێکی سەختدا بوم، چونکە کاتێك ئاوجۆ دەخۆمەوە و خۆم لەنێوا کۆمەڵێك خەڵکدا ببینم، هەر دەبێت زمان بەکار بهێنم و قسە بکەم و ڕاگرتنی زمان بەلای منەوە گرفتی بۆ دروست دەکردم. بەڵام سەرەڕای ئەوەی سەرم دانەواندبوو و لەڕێی قامیشەکەوە ئاوجۆکەی خۆمم دەخواردەوە، ئەوەم بیست

---

[58] هەروەك لەوەوپێش وتمان بابەتەکانی ئەم کتێبە کە بەبارودۆخ و ژیان و نەریت و ئەو بیروباوەڕانەی بە نەتەوە کۆنەکانەوە پەیوەست دەکرێت، لایەنێکی مێژووی لەخۆ دەگرێت و بەهیچ شێوەیەك ئەفسانەنیەو ئێوە لێرەدا ئەوەی دەخوێننەوە کە"کاپتا"بۆئەوەی خواردنەوەیەك بخواتەوە قامیشێکی هەڵگرت و ڕۆی کردە ناو گۆزەکەوە و خواردیەوە، ئەم بابەتەش بەهەمان شێوەی شتەکانی تر لایەنی مێژوویی لەخۆ دەگرێت. ئێمە واڵێکی دەدەینەوە کە خواردنەوەی شەربەتێك لەڕێی ساقە گەنمێکی وشك یان برنج یان قامیشەوە شتێکی تازەیە و لەئەوروپاوە گوازراوەتەوە بۆ ڕۆژهەڵات، لەکاتێکدا ئەم شێوازی خواردنەوەیە چوار هەزار ساڵ پێش ئێستا، لە ڕۆژهەڵاتدا باو بووە و لەڕۆژهەڵاتەوە بۆ ئەوروپا گواستراوەتەوە.

کە خەڵکی جنێویان بە فیرعەون و خەڵکی میسر دەدا و دەیانوت کە"ئزمیر" لەڕابردوودا شارێکی ئازاد بووە و باجی بەهیچ کەسێك نەدەدا، بەڵام ئەمڕۆ تەواوی خەڵکی ئەم شارە دەبێت باج بە فیرعەون بدەن و منداڵەکانمان هەر لەسەردەمی منداڵیەوە دەبنە بەندەی میسر.

منیش نەموێرا پێیان بڵێم کە فیرعەونی میسر لەپێناو چاکە و بەرژەوەندی خەڵك و وڵاتی "ئزمیر"ی خستوەتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە و دەستەڵاتی خۆی لەوێدا سەپاندووە، لەڕابردوودا فیرعەون"ئزمیر"ی نەخستبووە ژێر دەستەڵاتی خۆیەوە، بۆیە لەسەرتاپای ساڵدا دانیشتوانی سوریا کێشە و گرفتیان لەگەڵ یەکتردا هەبوو، وەك کۆمەڵێك پشیلە وابون کە هەموویانت پێکەوە خستبێتە ناو کیسەیەکەوە و نەتوانن خۆیان لەو کیسەیە ڕزگار بکەن، بۆیە ناچاربون لەگەڵ یەکتردا بەشەڕ بێن. سریانیەکان باسی توانای خۆیان دەکرد و دەیانوت ئەگەر ئەو فەرمانڕەوایانەی کە لەسوریادا هەیە یەك بگرن، هێز و توانایەك دێتە بون کە فیرعەون توانای ئەوەی نابێت لەگەڵیاندا بجەنگێت، بەڵام ئایا دەتوانرێت ڕۆژێکی وەها بهێنرێتە بەرچاو کە فەرمانڕەوایانی سوریان بتوانن یەکێتی لەنێوان خۆیاندا بەرپا بکەن؟ هەڵبەت نەخێر.

منیش نەمدەتوانی وەڵامیان بدەمەوە و پێیان بڵێم و بەرگەی ئەوەشم نەدەگرت گوێ لەم جۆرە قسانە بگرم. بۆیە بەپەلە ئاوجۆکەی خۆمم خوارد و خێرا لەو فرۆشگایە چومە دەرەوە.

دوای ئەوەی گوێم لەقسەکانی"کاپتا"بوو، جلی سریانیم لەبەرکرد و لەماڵ چومە دەرەوە و ئاگاداری ئەوە بوم کە بەندەکەم ڕاستی دەکرد، خەڵکی بەشێوەیەك تورەیی خۆیان لەبەرامبەر میسریەکاندا دەردەبڕن کە میسریەکان ناچاربون لەگەڵ پاسەوانەکاندا ڕێ بکەن.

سەرەڕای ئەوەش خەڵکی میوە و ماسی بۆنکردوویان تێدەگرتن، بەڵام هیچ کەسێك ئاگاداری من نەبوو، چونکە من پۆشاکی سریانیم لەبەردابوو، گوێم لێگرتن بۆئەوەی بزانم خەڵکی سکاڵای چی دەکەن و بیستم هەموویان سکاڵا لەو باجە دەکەن کە فیرعەون لێیان دەسێنێت.

بەڵام ئاگاداری ئەوە نین کە فیرعەون بەشێك لەو باج و سەرانەیە لەخودی کاروباری سوریادا خەرج دەکات. سەرەڕای ئەوەش ئەگەر گەنمی میسر نەبێت و لەوێوە گەنم ڕەوانەی"ئزمیر"و شارە کەنار دەریاییەکانی تر نەکات، ئەوا خەڵکی لەبرساندا دەمرن.

سەرەڕای ئەوەی دەمزانی لەمیسریەکان ڕەشبینن، پیشەی پزیشکی خۆم لەماڵەکەمدا کردەوە و کۆمەڵێك نەخۆش سەردانیان دەکردم، چونکە کاتێك کەسێك نەخۆش دەکەوێت و دوچاری ئازار دەبێت، کاری بە ڕەچەڵەکی کابرای پزیشکەوە نابێت و لەبەرامبەردا هەوڵی ئەوە دەدات بزانێت ئایا ئەو پزیشکە بەڕاستی زیرەکە یان نە وە ئایا دەتوانێت چارەسەری بکات؟ بەڵام هەندێك لەنەخۆشەکان سکاڵای خۆیان لەلای مندا دەکرد و دەیانوت کە میسر دەقاودەق وەك زالوی لێهاتووە و بەمژینی خوێنمان قەڵەو دەبێت، لەکاتێکدا ئێمە ساڵ لەدوای ساڵ هەژارتر دەبین. بانگەشە و بیانوی باج و سەرانە وەرگرتنی میسریەکانیش ئەوەیە کە لەشارەکانی ئێمەدا چەند بنکەیەکی سەربازیان هەیە بۆئەوەی ئاسایشی ئەو شارە بپارێزن، لەکاتێکدا بەبێ بونی هێزی سەربازی میسر دەتوانین ئاسایشی خۆمان بپارێزین. یەکێك لەو سوکایەتیە مەزنەی لەبەرامبەر ئێمەدا دەکرێت ئەوەیە ئێمە ناتوانین قەڵا و منارە دەوڵەتیەکانمان نۆژەن بکەینەوە، هەروەها قەڵاگەلێکی تازەش دروست بکەین، لەکاتێك پارەی نۆژەنکردنەوە و تازەکردنەوەی قەڵاکان خۆمان دەیدەین.

ئەگەر میسر باج و سەرانەی لەئێمە نەسەندایە، ئێمە میلەتێکی خۆشگوزەران و خۆشبەختمان لێ دەردەچوو، بەڵام میسر وەك پۆلە"کوللە"بەسەر سوریادا هەڵڕژاوە و فیرعەونی ئێوە دەیەوێت خودای خۆی بەسەر ئێمەدا بسەپێنێت، لەکاتێکدا ئێمە خوازیاری خودای ئەو نین و خودای خۆمان دەپەرستین.

وتم:میسر لەبەرئەوە ڕێتان پێنادات قەڵاکانتان نۆژەن بکەنەوە و قەڵای تازەش دروست بکەن چونکە دەزانێت ئەم قەڵایانە بۆ دژایەتی کردنی میسریەکان نۆژەن دەکەنەوە و دەتانەوێت ڕۆژێك لەڕۆژان لەگەڵ میسردا بجەنگێن. تۆ دەڵێیت لەڕابردوودا ئازاد بون، بەڵام ئەوەتان فەرامۆش کردووە پیش ئەوەی فیرعەونی میسر، سوریا بخاتە ژێر ڕکێفی خۆیەوە ئێوە بەردەوام شەڕتان لەگەڵ یەکتردا دەکرد و فەرمانڕەوایانی ئێوە لە میرنشینەکانی خۆیاندا سەربەخۆییەکی تەواویان هەبوو و هەرچیان بویستایە بەئێوەیان دەکرد و دەوڵەمەند و هەژار بەدەستیانەوە دەیناڵاند،

بەڵام ئەمڕۆ یاساکانی میسر، پارێزەری ئێوەیە و ڕێگرە لەبەردەم ئەوەی فەرمانڕەوایانی سوریا ستەمتان لێ بکات و هەژار و دەوڵەمەند، لەژێر یاساکانی میسردا پارێزراون.

نەخۆشەکان دەیانوت کە ستەمی فەرمانڕەوایانی ئێمە تاوانێکە میسریەکان بۆیان هەڵبەستووە، بۆئەوەی ئێمە هانی ئەوە بدەن ئازادی ڕابردوی خۆمان فەرامۆش بکەین و ببینە کۆیلەی ژێردەستی میسر، بەڵام گریمان فەرماڕەوایانمان ستەمکارن بەڵام پادشای ئێمە بون و هەن و ئێمە ستەمی ئەوان لەستەمی بیانیەکان بەباشتر دەزانین، بەڵام لەمڕۆدا هەمومان بوینەتە کۆیلەی میسر و ستەممان لێ دەکات بێئەوەی یەکێك بێت لەئێمە.

وتم: بەڵام من داخی کۆیلایەتی بەجەستەی تۆوە نابینم و تۆ ئازادی و لەڕابردوو قەڵەوتربویت و ئەم قەڵەویەت ئەوە نیشان دەدات کە لەڕابردوو باشتر دەژیت. ئەگەر تۆ وەك ڕابردوو بویتایە و یاساکانی میسر پارێزگاری لە تۆ نەکردایە، بەردەوام کەشتیەکان یەکتریتان دەدزی و درەختەکانتان دەبڕییەوە و یەك گەشتیار و کۆچەری میسری لەڕێگاکاندا ژیانی پارێزراو نەدەبوو، بەڵام ئەمڕۆ هیچ کەسێك کەشتیەکانتان نادزێت و درەختی میوەکانتان نابڕێت، هەروەها دەتوانن بێ هیچ ترس و هەڕەشەیەك، لەهەر شوێنێکی سوریاوە بڕۆن بۆ شوێنێکی تر.

بەڵام سریانیەکان بەڵگەکانی منیان پەسەند نەدەکرد و دوای ئەوەی چارەسەر دەکران، دیاری خۆیان بەناڕەزاییەکەوە لەبەردەممدا دادەنا و لەکاتی ڕۆشتنیشیاندا دەیانوت، سەرەڕای ئەوەی جلی سریانیت لەبەردایە، بەڵام هەر بەمیسریەك لەقەڵەم دەدرێیت. هەر میسریەك لەهەرشوێنێکی ئەم جیهانەدا بێت ستەمگەرە و میسریەکی باش بونی نیە، مەگەر ئەوەی مردوو بێت.

بەهۆی ئەم ڕەقە گشتیەی کە خەڵکی لەبەرامبەر میسریەکاندا هەیانبوو، من ئاگاداری ئەوە بووم کە ناتوانم لە"ئزمیر"دا بژیم.

چونکە سەرەڕای ئەوەی خەڵکی هەوڵی کوشتنی منیان نەدەدا، بەڵام ڕقی ئەوان ژیانی منی تاڵ کردبوو و وەك ئەوە وابوو پیاوێك میوانی ماڵێك بێت، بەڵام خاوەن ماڵەکە ڕقی لەمیوانەکە بێت، لەمحاڵەتەشدا زۆر سەختە بتوانی لەماڵێکی ئاوادا بمێنیتەوە.

من کاروبارەکانی خۆمم لە"ئزمیر"دا بەئەنجام گەیاندا و خۆم ئامادەی ڕۆشتن بۆ میسرکرد، چونکە دوای ئەوەی چەند ساڵێك ژیانم لەوڵاتی بێگانەکاندا بەسەر برد، ئێستا ناچارم بگەڕێمەوە بۆ میسر و ڕاپۆرتی خۆم بدەم بە"هورم هب"ی فەرماندەی لەشکری میسر کە ئەو ئەرکەی پێ سپاردبوم بۆئەوەی زانیاری لەسەر بارودۆخی سەربازی فەرمانڕەوایان و نەتەوەکانی تر کۆبکەمەوە.

سەرلەبەیانی ڕۆژێك کاتێك خەڵکی لە"ئزمیر"دا لەخەو هەڵدەستن، ئاگاداری ئەوە دەبن کە شەوی ڕابردوو سەری سەربازێکی میسریان بڕیوە. خەڵکی بەهۆی ئەم ڕوداوەوە بەڕادەیەك لەتوڕەیی فیرعەون ترسان کە هەمویان ڕۆشتنەو ماڵەکانی خۆیانو دەرگایان لەخۆیان داخست و لەماڵەکانیان نەهاتنە دەرەوە. ئەم ڕوداوە بووە هۆی ئەوەی جۆش و خرۆشی خەڵکی دژی فیرعەون دابمرکێتەوە، بەڵام من دەمزانی کە ئەم هێور بونەوەیە کاتیە و دوای ماوەیەکی تر توڕەیی خەڵکی لەبەرامبەر میسریەکاندا بەهێزتر دەبێت.

هەرواش بوو، بکوژی سەربازی میسر نەدۆزرایەوە و دوای دوو سێ ڕۆژ خەڵی دوبارە دەرکەوتنەوە و ئەمجارەیان بەشێوەیەك لەمیسریەکان توڕە بون کە هیچ میسریەك نەیدەوێرا، بێ چەك لەماڵ بێتە دەرەوە و بڕواتە ناو کۆڵان و شەقامەکان.

من لەبەرئەوەی پۆشاکی سریانیم لەبەرکردبوو بێ هیچ ترسێك لەماڵ دەچومە دەرەوە و هەندێك لەشەوەکانیش دەڕۆشتم بۆ پەرستگای"عەشتار"بۆ ئەوەی لەگەڵ کچێکدا ڕابوێرم، چونکە دوای گەڕانەوەم بۆ"ئزمیر"هەستم بەتینوەتی دەکرد و وەك ئەو پیاوە تینوەی کە نازانێت ئەو بیرە ئاوەی لێ دەخواتەوە هی کێیە، منیش تەنها دەمویست لێی بخۆمەوە.

شەوێکیان لە پەرستگای"عەشتار" گەڕامەوە، چاوم بە بڕێك سەرباز کەوت و یەکێك لەو سەربازانە وتی، وابزانم ئەم پیاوە میسریە، ئەگەر میسری بێت دەبێت تەمبێی بکەین، بۆئەوەی جارێکی تر سەردانی پەرستگاکانی ئێمە نەکات، چونکە ئێمە نابێت بەرگەی ئەو نەنگیە بگرین کە پیاوێکی خەتەنە کراو، لەگەڵ کچانی ئێمەدا ڕابوێرێت.

دوای ئەوە لێم نزیك بونەوەو وتیان: ئێمە دەمانەوێت پشکنینت بۆ بکەین، بۆئەوەی بزانین میسریت یان نە؟ چونکە نابێت پیاوێکی خەتەنەکراو لەگەڵ کچانی ئێمەدا ڕابوێرێت.

وتم: ئەو کچانەی هێشتا کچێنی خۆیان لەدەست نەداوە، تەنها ناوێکی بێناویان هەیە و کچ نین، کاتێک ئەوان گرنگی بەبابەتی خەتەنکردن نادەن، ئێوە بۆچی ڕەخنەی لێدەگرن.

سریانیەکان کاتێک گوێیان لەم وڵامەی من بوو، تووڕە بون و هێرشیان بۆ بردم و سەریان کێشام بەزەویدا، بەشێوەیەك کە لەدڵی خۆمدا وتم: دواین ساتی ژیانم هاتووە.

بەڵام لەناکاو یەکێك لەوانە وتی ئاه...ئەو پیاوە"سینۆهە"ی کوڕی کەرە و یەکێکە لەهاوڕێیانی فەرمانڕەوایانی سوریا. کاتێك ئەوانی تر گوێیان لەم قسەیە بوو وازیان لێ هێنام و دامێنی کراسەکەیان دا بەدەموچاویاندا بۆئەوەی چاوم بەڕوخساریان نەکەوێت و نەیانناسمەوە و بەدەم هاوارەوە هەڵهاتن و منیش توانیم لەجێی خۆم هەستمە سەر پێ و بگەڕێمەوە بۆماڵ.

*بەشی بیست و شەشەم*

# نەخــــۆشی منـــــــداڵێك

دوو ڕۆژ دوای ئەوە من سەرقاڵی خۆئامادەکردنی کەلوپەلی گەڕانەوەم بوم بۆ میسر، بەڵام هێشتا چارەسەری کەسە نەخۆشەکانم دەکرد، پیاوێك بەسوار ئەسپێك کە وەك خێرایی"با" دەهات، لەبەرامبەر ماڵەکەمدا ڕاوەستا، لەمیسردا ئەسپ سواری باو نەبوو، چونکە ئەسپ گیانەوەرێکی سەرکێش و گەورەیە. کاتێك کەسێك سواری دەبێت لەسەر هەردوو پێی ڕادەوەستێت و سوارەکە فڕێ دەداتە سەر زەوی. هەر لەبەرئەوە لەمیسر و سوریا خەڵکی بەردەوام سواری وڵاخ"کەر" دەبن کە گیانەوەرێکی بێئازار و گوێڕایەڵە و بگرە گالیسکە جەنگیەکانیش بەوڵاخ ڕادەکێشن.

کاتێك ئەسپێك بەگالیسکەیەکەوە دەبەستنەوە، هەڕەشەئامێزتر دەبێت و بەشێوەیەك سەرشێت دەبێت و دەدات لەغار کەهەم گالیسکەکەش تێکدەشکێنێت و هەم گالیسکە سوارەکانیش بەکوشت دەدات.

لێخوڕینی ئەو گالیسکانەی کە ئەسپیان پێوە بەستراوەتەوە، پێویستی بەخۆڕاگریەکی زیاترە و دەبێت یەك کەس هەمیشە سواری ئەسپەکە بێت بۆئەوەی پەنجەی بگات بەلوتی ئەسپەکەدا، تائەوکاتەی ئەسپەکە هێور دەبێتەوە[59] پەنجەی لەلوتیدا دەرناهێنێت.

کاتێك تەماشای ئەو پیاوەم کرد کە سواری ئەسپەکە بوو، لەجلەکانی بەریەوە تێگەشتم کە یەکێکە لەدانیشتوانی ناوچە شاخاویەکانی سوریا و زۆر ئەگەری

---

[59] لەسەردەمی"سینۆهە"دا هێشتا "لغاو" دا نەهێنرابوو، بۆئەوەی بەو لغاوە ئەسپەکەی پێ هێور بکەنەوە، لەباتی ئەوە بۆ هێورکردنەوە پەنجەیان دەکرد بەلوتیدا.

ئەوەش هەبوو کە چەتە بێت، کەسی سوار یان چەتەیە یان دانیشتوانی ناوچە شاخاویەکانە.

ئەوپیاوە بانگی کرد"سینۆهە"ی کوڕی کەر، من لەڕێی دورەوە لەوڵاتی "ئامورو"وەوە دێم و پادشای ئەو وڵاتە کە تۆ دەناسێت، منداڵێکی هەیە نەخۆشە و بەڕادەیەك بەهۆی نەخۆشی منداڵەکەیەوە دەستەپاچە بووە، کە وەك شێرێکی دڕندەی لێهاتووە و هیچ کەس ناوێرێت لێی نزیك ببێتەوە. زوو جانتای کەرەستەی پزیشکیەکەت هەڵگرە، بۆئەوەی لەگەڵ مندا بێیت بۆ وڵاتی "ئامورو" و کوڕی پادشامان بۆ چاك بکەیتەوە و گەر دواشمان بخەیت بەم چەقۆیە سەرت لەلاشەت دەکەمەوە و سەری بێ جەستەت لەسەر زەوی گل دەکەمەوە.

وتم: ئەگەر تۆ سەرم لەلاشەم بکەیتەوە کوڕی پادشاکەت چارەسەر ناکرێت، چونکە ئەگەر سەرم بەجەستەمەوە نەبێت، دەستەکانم ناتوانن کوڕی پادشاکەی تۆ چارەسەر بکات و منیش بۆ هاتن و چارەسەرکردنی کوڕی پادشاکەت ئامادەم، بەڵام نەك لەبەرئەوەی لەهەڕەشەی تۆ ترسابم، بەڵکو لەبەرئەوەی پادشای"ئامورو"هاوڕێمە و دەبێت کوڕەکەی چارەسەر بکەم.

پادشای"ئامورو"هەمان ئەو کەسە بوو کە من چەند ساڵێك لەوەوپێش لەسوریادا بووم ددانەکانیم بۆ چارەسەر کرد و ئەویش خوازیاری کەنیزە جوانەکەی من بوو و ویستی لێم بکڕێت، بەڵام من هەربەوشێوەی پێم وتن کەنیزەکەی خۆمم پێ نەفرۆشتن، بەڵکو وەك دیاریەك پێشکەشم کرد.

بە"کاپتا"م وت: بڕوات و کەژاوەیەکم بەکرێ بۆ بگرێت و بۆم بیهێنێتە ئێرە، دوای ئەوەی کەژاوەکەی هێنا لەگەڵ ئەسپ سوارەکەدا کەوتینە ڕێ تا ئەوکاتەی لەدەشتەکانەوە تێپەڕین و گەشتینە ناوچە شاخاویەکان.

لەوێ منی لەکەژاوەکە دابەزاند و سواری گالیسکەیەکی کردم و ئەو ئەسپانەی کە وامان دەزانی کێوین، گالیسکەکەیان بەشێوەیەك بەڕێ خست و بەدوای خۆیاندا ڕایاندەکێشا کە من دەترسام لەوەی گالیسکەکە وەك کەشتی خودای"ئامون" لەئاسماندا بفڕێت. من لەترساندا هاوارم دەکرد، بەڵام لێخوڕی گالیسکەکە، بێگوێدانە ترسی من بەخێرایی دەڕۆشت، دوای ماوەیەك کە بەو شێوەیە ڕێمان کرد، لەناکاو گالیسکەکە ڕاوەستا.

من خۆشحاڵ بوم، چونکە وام دەزانی کۆتایی بەگەشتەکەمان هاتووە. بەڵام مەی لەو گالیسکەیە دابەزاند و سواری گالیسکەیەکی تری جەنگی کردم کە ئەسپێکی تازە نەفەسی پێوە بەسترابوو، دوبارە گالیسکەکە بەزۆری ئەو ئەسپە زۆردار و کێوییە کەوتەوە ڕێ و من هاوارم دەکرد و دەموت لەسەرخۆ لێخوڕن، هەرجارێك کە خێرایی ئەو گالیسکەیە کەمتر دەبوو من دەمتوانی دەست لە لێواری گالیسکەکە بەربدەم و پشتی گالیسکەوانەکە مشت ڕێژ بکەم، بەڵام ئەو بێئەوەی گوێم پێ بدات و بڵێت بۆچی لێم دەدەیت، لەسەر ڕێی خۆی بەردەوام بوو.

من ئێستاش نازانم چۆن، لەوجادە کێویانەدا، کاتێك ئەسپە سەرکێشەکان گالیسکەکەی ئێمەیان بەدوای خۆیاندا ڕادەکێشا وەرنەدەگەڕان و تێکنەدەشکان.

پێش ئەوەی خۆر لەئاسۆی ئاوابون نزیك ببێتەوە، لەشارێك نزیك بوینەوە کە حەساری دیوار تازە بەچواردەوری ئەوشارەدا دروست کرابو، دەروازەکە داخرابوو.

بەڵام هەرئەوەی ئێمەیان بینی دەرگایان بۆکردینەوە و گالیسکەکەمان بەهەمان خێرایی جاران لەشەقامەکانی شارەوە تێپەڕی و لەڕێدا کۆمەڵێك ژن و پیاو سەبەتەی پڕ لەمیوەیان فڕێدا و لەترسی گالیسکەکان هەڵهاتن و گۆزە پڕ لەئاوەکانیش بەشانیانەوە دەیدا لەزەوی و دەشکا.

کاتێك گالیسکەکە لەبەردەم کۆشکی پادشای"ئامورو"ڕاوەستا و منیان لەگالیسکەکە دابەزاند، بەشێوەیەك ئەندامەکانی جەستەم کوترابوو کە نەمدەتوانی ڕێ بکەم، بۆیە بەندەکانی کۆشك بەدەستیان هەڵیانگرتم و بردمیانە ناو کۆشکەوە، لەڕێڕەوی ناو کۆشکدا دەیان چەك و دەمی شێر و پەڕی باڵندە بەدیوارەکانەوە هەڵواسرابون و تا ئەوکاتەی من خۆم کرد بەکۆشکدا، پادشای"ئامورو"وەك فیلێك کە بەدەستی ڕاوچی بریندار کرابێت و پەلاماری ڕاوچی بدات، ئاوا بەرەوڕوم هات.

من بینیم جلەکانی بەری دڕاوە و خۆڵەمێشی کردووە بەسەری خۆیدا و هاوار دەکات، چەتەکان بۆچی ئەوەندە دێر هاتن؟ ئایا بەئەنقەست درەنگ کەوتن، بۆئەوەی کوڕە نەخۆشەکەم بمرێت.

بەڕادەیەك پادشای"ئامورو"توڕەبوو کە نەوارە ئاڵتونیەکەی کە بەچواردەوری ڕیشە لولەکەیدا بەستبویان کرایەوە، بەڵام لێخوڕی گالیسکەکە وتی: ئەمڕۆ ئێمە ئەوەندە خێرا لەکێوەکانەوە هاتین کە باڵندەکانیش پێمان نەدەگەشتنەوە و تۆش

دەبێت سوپاسگوزاری ئەم پیاوە کە پزیشکێکی میسریە ببیت، چونکە هەرجارێك ئێمە لەسەرخۆ لێمان بخوڕیایە، موشتڕێژی پشتی دەکردین و هانی دەداین خێراتر لێخوڕین و بەشێوەیەك هاواری دەکرد کە ئەسپەکانمانی بەڕادەیەك تۆقاندبوو کە گالیسکەکەیان لەزەوی هەڵدەبڕی و بەدوای خۆیاندا ڕایان دەکێشا وهیچ یەك لەباوکانی ئێمە هیچ پیاوێکیان لەبیر نیە کە بەهەمان ئەو خێراییەی ئێمە ئەو ماوەیەی بڕی بێت.

ئەوکات پادشای"ئامورو"منی لەئامێز گرت و ماچێکی کردم و گریا و وتی:"سینۆهە"تۆ دەبێت کوڕەکەم بۆ چاك بکەیتەوە و من تەندروستی کوڕەکەمم لەتۆ دەوێت.

وتم: سەرەتا ڕێم پێبدە کوڕەکەت ببینمو بزانم نەخۆشیەکەی چیە، ئەوسا هەوڵی چارەسەرکردنی بدەم.

پادشای"ئامورو"منی لەگەڵ خۆیدا بردە ژورێکەوە و منیش مەقەڵیەکی گەورەی پڕ لەئاگرم لوێدا بینی کە لەوێدا دایاننابوو و منداڵێکیش لەناو بێشکەیەکدا ڕاکشاوە، بەڵام ئەویان بەشێویەك لەپارچە خوریەکان پێچابوو کە ڕەنگی ئەو کوڕە شین هەڵگەڕابو، بەردەوام ئارەق لەسەر و ڕوخساری دەچۆڕا و هاواری دەکرد، منیش هەر ئەوەی چاوم بەو منداڵە کەوت تێگەشتم کە نەخۆشیەکی ترسناکی وای نیە کەببێتە هۆی مەرگی، چونکە ئەگەر منداڵ بەرەو مردن بڕۆشتایە بەوشێوەیە هاواری نەدەکرد. تەماشایەکی چواردەوری خۆم کرد و بینیم ژنێکی قەڵە و سپی لەسەر تەختی ئەو ژورەدا دانیشتووە و بەدەم گریانەوە سەری بەزەویدا دەکێشێت ناسیمەوە کە ئەو هەمان ئەو کەنیزەکە سپی پێستەیە کە من پێشکەشی پادشای"ئەمورو"م کردبوو.

چەند ژنێکی تر لەچواردەوری ئەو ژورەدا بون، ئەوانش بەهەمان شێوە دەگریان و بینیم ڕوخساری هەندێك لەوانە بریندار بووە دوای ئەوە تێگەشتم کە پادشای"ئامورو"لێیداون، چونکە نەیانتوانیوە کەرەستەی هێورکردنەوەی کوڕەکەی فەراهەم بکەن.

من به پادشای"ئامورو"م وت: ئەوەندە خۆت دڵگران مەکە، لەبەرئەوەی کوڕەکەت نامرێت، بەڵام من پێش ئەوەی دەست بەچارەسەرکردنی کوڕەکەت بکەم، دەبێت خۆم پاك بکمەوە و ئەم مەقەڵی ئاگرە لێرە ببەنە دەرەوە.

دایکی مندڵ کە لەڕابردوودا کەنیزەکی من بوو سەری هەڵبڕی و وتی:ئەگەر ئەم مەقەڵیە لێرە ببەنە دەرەوە منداڵەکەمان سەرمای دەبێت.

وتم: نەخێر..... منداڵ لەم وەرزی هاوینەدا سەرمای نابێت، دەی ئەم مەقاڵیە لێرە ببەنە دەرەوەو ئەگەر سەرمای بوو من بەرپرسیار دەبم.

ئەو ژنە منی ناسیەوە و زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:ئاه...سینۆهە....ئەوە تۆی...کاتێك هاتیتە ژورەوە نەمناسیتەوە، چونکە بینیم جلی سریانیت لەبەردایە.

وتم: من بەخێراییەك بۆ چارسەرکردنی ئەم منداڵە کەوتومەتە ڕێ کە نەمتوانی ئەم جلە سریانیانەم بگۆڕم و پۆشاکی میسری لەبەر بکەم.

پادشای"ئامورو"لەحاڵێکدا کە هێشتا فرمێسك بەچاوانیەوە بوو وتی: "سینۆهە" ماوەی سێ ڕۆژە نان ناخوات و هەرچیش دەخوات دەڕشێتەوە و بەشێوەیەك هاوار دەکات کە من ناتوانم بۆساتێکیش خۆم ئارام ڕاگرم.

وتم:ئەم دایەن و بەندەانە لەم ژورە بکەرە دەرەوە، چونکە مرۆڤێکی تەندروستیش ئەگەر ئەم هەموو خەڵکە لەچواردەوریدا بەوشێوەیە هاوار بکەن و بگرین، بەدڵنیاییەوە نەخۆش دەکەوێت، چ بگات بەوەی ئەو کەسە تەندروستە ئەم منداڵە بێت.

پادشای"ئامورو"فەرمانی دا ئەوانە لەو ژورە بڕۆنە دەرەوە، ئەوکات من خۆم شۆری و دوای ئەوەی زانیم پاك بومەتەوە وتم: پەنجەرەی ژورەکە بکەنەوە و خۆشم پارچە خوریەکانم بەسەر منداڵەکەوە لا برد.

منداڵ کە تائەوکاتە هاواری دەکرد و دەگریا هێور و ئارام بویەوە و تەکانی بەپێ قەڵەوەکانی خۆی دا و بینیم سەرەڕای ئەوەی منداڵە، بەڵام وەك باوکی قژێکی ڕەش و پڕی هەیە. بۆماوەیەك تەماشای ئەو منداڵەم کرد بۆئەوەی بزانم نەخۆشیەکەی چیە و لەناکاو دەمی منداڵەکەم کەوتەوە یاد و دەمیم کردەوە و بینیم ددانێکی بچوك لەپوکی ئەو منداڵەوە دەرهاتووە و تێگەشتم کە نەخۆشی ئەو منداڵە جگە لە دان دەرکردن هیچی تری نیە.

پادشای"ئامورو"م بانگ کرد و ددانی منداڵەکەم پێنیشان دا و وتم: تەماشای کە تۆ بۆ ئەم ڕوداوە بێنرخە، بەناوبانگترین پزیشکی سوریات بەئەسپگەلێکی کێوی هێناوە بۆ ئێرە و پەنجاجار لەجادە کێویەکانی ناوچەکەتدا منت ڕوبەڕوی هەڕەشەی مەرگ کردووەتەوە، لەکاتێکدا هەرکەسێك ئەگەر کەمێك ئەزمونی هەبێت تێدەگات، کاتێك منداڵ دان دەردەکات، دەست بەبێتاقەتی دەکات و دور نیە توشی"تاش" بێت، بەڵام ئەو"تا"یەی ئەو دەیگرێت بێ هەڕەشەیە، ڕشانەوەی کوڕەکەت ، لەبەرژەوەندی سروشتی ئەو منداڵە بووە، چونکە تۆ و دایکی و دایەنەکانی، بەردەوام شیری چەورتان کردووە بەقوڕگیدا و منداڵیش نەیتوانیوە بەرگەی ئەو هەمو شیرە بگرێت، بۆیە ڕشاوەتەوە. ئێستا بەدایکی بڵێ کاتێك مەمکی دەخاتە دەمی کوڕەکەی ئاگای لەخۆی بێت، چونکە لەوانەیە ئەو منداڵە مەمکی بە ددانەکەی بریندار بکات.

دەمی ئەو منداڵەم لەبەرامبەر پادشای"ئامورو"دا کردەوە و ددانی ئەو منداڵەشم پێنیشان دا و ئەویش دوای ئەوەی پەیی بەنەخۆشی منداڵ برد و زانی نەخۆشی منداڵ بەوشێوەیەش هەڕەشە ئامێز نیە، لەناو ژورەکەدا دەستی کرد بەسەماکردن و دایکی وتی: هەرگیز ددانی بەو جوانیەم لەدەمی منداڵدا نەبینیوە. بەڵام کاتێك ویستی منداڵەکە بەپارچە خوریەکان داپۆشێتەوە، من ڕێم لێگرت و وتم: تەنها جلێکی کەتانی لەبەربکە، هەر ئەوەش بەسە بۆی.

پادشای"ئامورو"لەوەیکە منی بۆ ڕوداوێکی بێنرخ لە"ئزمیر"ەوە هێناوەتە ئێرە هیچ دڵگران نەبو و فەرمانی دا بەرپرسان و دۆستانی بێن بۆ ئێرە و تەماشای ددانی منداڵەکەی بکەن، ئەوانیش بەیەکجار هێرشیان بردە ناو ئەو ژورە و هەموویان دەیانویست پەنجەی قایم و گڵاو و پیسیان بکەن بەدەمی ئەو منداڵەدا، بۆئەوەی بەڕاستی هەست بە بوونی ئەو ددانە بەرجەستە بکەن.

بەڵام من بە پادشام وت: ئەوانە دور بخاتەوە، ئەگینا ئەمجارەیان بەڕاستی نەخۆش دەکەوێت.

دوای ئەوەی بەرپرسان و هاوڕێکانی ڕۆشتن، پادشای"ئامورو"وتی:ئەم منداڵە لەگلێنەی چاوم خۆشەویستترە و لەتەواوی ئەو شتانەی کە من هەمە گرانترە و ئێستا بۆ چەند شەوێك دەچێت من لەکەنار ئەم بێشکەیەوە نەخەوتوم، چونکە دەترسام ئەم منداڵەم بمرێت و دوای من کەسێك نەبێت فەرمانڕەوایی وڵاتی"ئامورو" بکات.

دوای ئەوەی دەستی خستە سەر سەرم، وتی:"سینۆهە" تۆ نازانی کە من بەبۆنەی ئەوەی تۆ ئەم بارە قورسەت لەسەر سنگمدا لابرد، چەنێك سوپاسگوزاری تۆم، دوای ئەوەی منداڵەکەی پێنیشان دام و وتی تۆ کە سەردانی وڵاتگەلێکت کردووە، ئایا منداڵێکت لەو تەمەندا بەو جوانیەوە بینیوە؟ موی سەری منداڵەکەم زیاتر لەیاڵی شێر دەچێت و ورگە قەڵەوەکەشی لەبەرمیلێکی بچوك دەچێت، دەست و پێی قەڵەوی ئەوە نیشان دەدات کە لەئایندەدا وەك من بەهێز و پڕزۆ دەبێت.

شەو هات، هەواش تاریك بوو، چراکانیان داگیرساند و منیش بەهۆی ئەوگەشتە خێرا و گرفتئامێزەوە پێویستم بە حەوانەوە بوو و نەمدەتوانی گوێ لەقسەی پادشا بگرم، بۆیە پێم وت:

ئەمڕۆ لەبەیانەوە تا نزیکی ئێوارە لەناو گالیسکە جەنگیەکانی تۆدا، لەسەر ڕێگا شاخاویەکاندا بەخێرایی"با" لەحاڵی ڕێکردندا بوم و ئێستا لەشەکەتیاندا تەواوی ئەندامەکانی جەستەم ئێش دەکەن، بۆیە دەبێت نان بخۆم و بحەوێمەوە.

بەڵام تۆ لەباتی ئەوەی خواردنم پێ بدەیت و بڵێیت شوێنی خەوتنم بۆ ئامادە بکەن، بەردەوام قسە دەکەیت، لەمکاتەدا پادشای"ئامورو"پێکەنی و وتی: من چەند ڕۆژێکە بەهۆی نیگەرانی ئەم کوڕەمەوە دەمم لەخواردن نەداوە، بەڵام ئەمشەو دەتوانم قەرەبوی ئەو ڕۆژانە بدەمەوە.

دوای ئەوەی فەرمانی دا خواردنمان بۆ بهێنن، بەندەکانی مەڕیان برژاندو و نانیان بۆ هێناین و دوای ئەوەی نانم خوارد، هەستم کرد جەستەم حەوایەوە و کەمێك لەماندوێتیەکەم لەناو چوو.

من چەند ڕۆژێك لەلای پادشای"ئامورو"مامەوە و ئەویش دیاریگەلێکی گرانبەهای لەزێڕ و زیو پێدام و ئاگاداری ئەوە بووم کە ئەو لەجاری پێشوو دەوڵەمەندتر بووە. بۆیە لێم پرسی ئەم هەموو سامانەی لەکوێوە هێناوە، چونکە کاتێك جاری پێشوو ئەوم بینی، بەو ڕادەیە دەوڵەمەند نەبوو؟

ئەویش وەڵامی دایەوە: "سینۆهە"ئەو ژنەی تۆ دات بەمن، بەختی بۆ هێنام و بوو بەهۆی ئەوەی من دەوڵەمەند بم.

لەو چەند ڕۆژەی من لای پادشای"ئامورو" بوم، ژنە خۆشەویستەکەی بەواتا ئەو کەنیزەی من پێمدا بەجوانی پێشوازی لێکردم و من پەییم بەوە برد کە ئەو سەرەڕای ئەوەی زۆر قەڵەو بووە، بەڵام زیاتر هەوڵی ئەوە دەدات قەڵەوتر ببێت.

چونکە لەوڵاتی"ئامورو"دا بەپێچەوانەی وڵاتی"میسر"پیاوان حەزیان لەژنی قەڵەوە و ژن هەرچی قەڵەوتر بێت، لەلای پیاو پەسەندتر دەبێت، هەر لەبەرئەوەش لەو وڵاتەدا هەموویان، بگرە منداڵەکانیش گۆرانیەکیان دەوت کە باسی جوانی ئەو ژنەی دەکرد، من بیستم کە ئەو ئاوازە دوبارەیە و تەنها چەند وشەیەکە دەیان جار دوبارەی دەکەنەوە و لەدوبارەکردنەوەی بەردەوامی ئەو وشانەش بێزار و ماندوو نابن.

پادشای"ئامورو"چەند ژنێکی تری هەبوو کە کچی سەرۆک خێڵەکان بون، بەڵام تەنها بۆ نیشاندانی پابەندبونی وەفای بۆئەوان دەرۆشتەماڵیانەوە و پێی وتم: هیچ چێژێك لەڕابواردنیان وەرناگرێت، لەبەرئەوەی ئەوان کچانی سەرۆك خێڵەکانن، هەر دەبێت لەگەڵیاندا ڕابوێرێت بۆئەوەی لەنێوان ئەوو سەرۆك خێڵەکاندا ناکۆکی دروست نەبێت.

پادشای"ئامورو"کە دەیزانی من گەشتم بۆ وڵاتگەلێکی زۆر کردووە، بەپێویستی دەزانی باسی خۆیم بۆ بکات، بۆئەوەی ئاگاداری ئەوە بم کە ئەویش لەفەرمانڕەواکانی تر کەمتر نیە و جگە لە خۆهەڵکێشان شتگەلێکی پێ وتم کە من دڵنیام دوای ئەوەی لەوڵاتەکەی ئەو دەرچم، لەو قسانەی پەشیمان دەبێتەوە.

بۆنمونە وتی: کارگوزارەکانی فەرمانی ئەوەیان پێدراوە لە"ئزمیر"دا ئازاری میسریەکان بدەن و ئەوشەوەی هێرشیان بۆ بردم، بەدەستی کارگوزارەکانی ئەو لێدانم خوارد، بەڵام ئەوان نەیاندەزانی من"سینۆهە"م، ئەگینا لێیان نەدەدام، هەروەها ئەو سەربازە میسریەی کە لەئزمیردا کوژرا، بەدەستی پیاوەکانی ئەو کوژراوە.

پادشای"ئامورو"وتی: ئازاردانی میسریەکان لەسوریادا هەر بەردەوام دەبێت تا ئەوکاتەی میسریەکان سوریا بەجێ دەهێڵن و دەگەڕێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان، هەروەها دەیوت: دانیشتوانی"ئزمیر" و تەواوی لەنگەرگای سوریا، ئەوانەی لەکەنار دەریاوە نیشتەجێن، خەڵکانێکی ترسنۆك و خۆپارێزن و جگە لەبەرژەوەندی خۆیان هیچ ئامانجێکی تریان نیە، چونکە هەموویان بازرگانن، هەرلەبەرئەوەش دەبێت پیاوێکی

بەهێز دەستەڵاتی ڕاپڕین دژی میسریەکان لەئەستۆ بگرێت و میسریەکان لەسوریادا بکاتە دەرەوە، بۆئەوەی سوریا ئازادی جارانی بۆ بگەڕێتەوە.

وتم: بۆچی تۆ ئەوەندە ڕقت لەمیسریەکان هەڵگرتووە؟ لەوباوەڕەدا نیم کە میسریەکان لەنەتەوەکانی تر خراپتر بن.

پادشای "ئامورو" بۆماوەیەك ڕیشی چرچ و لۆچی نەوازش کرد و دوای ئەوە وتی: من ڕقم لەمیسریەکان نیە، بۆنمونە تۆ میسریت، بەڵام ڕقم لێت نیە. من لەسەردەمی منداڵیدا لەکۆشکی فیرعەوندا دەژیام و لەوێ فێری زۆر شتی میسریەکان بوم، بۆنمونە توانیم فێری خوێندن و نوسین ببم و پێشینەی ژیانم بەشێوەیەکە کە هەر دەبێت میسریەکانم خۆش بوێت، نەك ڕقم لێیان بێت، بەڵام تۆ "سینۆهە" سەرەڕای ئەوەی پزیشکێکی مەزنی و سەردانی زۆرێك لەوڵاتانت کردووە، بەڵام لەبەرئەوەی فەرمانڕەواییت نەکردووە، ناتوانی تێبگەیت لەدیدی پادشا و سەرکردەی وڵاتێك کینە واتای چی دەگەیەنێت.

پادشا و سەرۆکی وڵاتێك، ڕقی لەهیچ نەتەوەیەك نیە و لەخۆیدا هەست بە هیچ ڕقێك لەبەرامبەر هیچ خێڵێکدا ناکات، بەڵام کینە لەدەستی پادشا و سەرۆکی وڵاتێکدا هۆکارێکی زۆر بەهێزە، بگرە زۆر لەچەکەکانیش بەهێزترە. پادشای "ئامورو" وتی: تا خەڵکی ڕقیان لەدڵدا نەبێت، ناتوانن دەستی خۆیان کە نێزە و شمشێریان پێ هەگرتووە سەر و خواری پێ بکەن. سەرۆکی وڵاتێك کە خۆی ڕقی لەهیچ نەتەوەیەك نیە، دەبێت ڕق لەدڵی خەڵکیدا دروست بکات، بۆئەوەی بتوانێت لەڕێی ئەو ڕق و کینەی ئەوانەوە دەستەڵاتی بەرفراوانتر بکات و منیش ڕقی خەڵکی سوریا لەمیسریەکان دەوروژێنم و ئەوەندە ئەم ڕق و کینەیە بەهێز دەکەم کە هەموو ئەوانەی خەڵکی سوریان ئەو بیروباوەڕەیان لا دروست بکەم کە لەجیهاندا لەمیسریەکان بێبەزەیی تر و ڕسواتر و فێڵبازتر نیە و دەبێت ئەم دژایەتی و ڕقەبەرایەتیە ئەوەندە بەهێز بکرێت کە هەموو ژن و پیاوێکی سریانی کاتێك ناوی میسر ببیستن، جەستەیان لەڕقاندا بلەرزێت و دڵنیابن لەوەی میسریەکان ترسناکترین و خوێنڕێژترین و بێبەزەییترین نەتەوەیەکن کە لەسەرەتای دروست بونی جیهانەوە تا ئەمڕۆ هەن و دوای ئەوانیش لەوان بێبەزەیی تر و ترسناکر نابێت و کاتێك کینەی نەتەوەی سوریا لەبەرامبەر میسردا گەشتە ئەو ڕادەیە، ئەوکات ئەم ڕقەبەرایەتیە،

ئەوەندە پڕزۆر دەبێت کە دەتوانێت کێو جێگۆڕکێ پێ بکات، چ بگات بەدەرکردنی لەشکر و دەستەڵاتی میسریەکان لەسوریادا.

وتم: تۆ دەزانیت کە وانیە و ئەوەی تۆ باسی دەکەیت ڕاست نیە.

پادشای"ئامورو"وتی: ڕاستی بریتیە لەو شتەی کە من دەیسەپێنم بەسەر مێشکی خەڵکی سوریادا و کاتێك ئەو شتەم لەڕۆحیاندا جێگیر کرد، دەگەنە ئەو باوەڕەی ئەو شتە ڕاستیەکی حاشاهەڵنەگرە، ئەم بیروباوەڕەش تادێت لەواندا بەهێزتر دەبێت، کەئەگەر کەسێك پێچەوانەی ئەم بیروباوەڕە قسە بکات دەیکوژن.

من خەڵکی سوریا بەوشێوەیە ئاڕاستە دەکەم کە وا هەست بکەن لەبەرئەوە هاتوونەتە بون کە بەئازادی بژین و ئازادی شتێکە کەبەهای لە خواردن و جل و ماڵ و گیان زیاترە و خەڵکیش بەهۆی ئەم قسانەی من ئەو ڕاستیە لەخۆیاندا پەسەند دەکەن و بەڕادەیەك باوەڕدار و پەیوەست دەبن بەئازادیەوە کە ئامادەن لەپێناویدا گیانی خۆیان بەخت بکەن و هەرکەسێکیش باوەڕی بەئازادی بێت هەوڵی ئەوە دەدات خەڵکانی تر بهێنێتە سەر باوەڕی خۆی و زۆر ناخایەنێت کە لەتەواوێ سوریادا تەنها یەك بیروباوەڕ دێتە بون و ئەو بیروباوەڕەش ئازادیە و دانیشتوانی سوریاش ئاگاداری ئەوەن نین کە باوەڕیان بەشتێکی خەیاڵپلاو و بێبنەمایە، لەبەرئەوە ئازادی شتێکە نە بۆ نەتەوەی سوریا و نەبۆ هیچ نەتەوەیەکی تر بونی نیە، بەڵکو ئەمە بیانویەکە کە من لەو ڕێیەوە خەڵکی سوریای پێ فریو و بێئاگا دەکەم، بۆئەوەی بتوانم تەنها خۆم لەسوریادا بمێنمەوە و ئێوەش کاتێك هاتن بۆئێرە و ویستتان سوریا ئازاد بکەن، بەم دورشمە کە لەبەرچاوی هەموو خەڵکیدا ڕوکارێکی درەوشاوەی هەیە، تەواوی سوریاتان ملکەچی خۆتان کرد و باج و سەرانەیان لێ وەردەگرن.

وتم: ئایا باوەڕت بەئازادی هەیە؟

پادشای"ئامورو"وتی: نەخێر. تۆ کە پزیشکێکیت ناتوانیت لەوە تێبگەیت کە فەرمانڕەوایەك بۆچی باوەڕی بەئازادی نیە، بەڵکو خەڵکی بەو دروشمە فریو دەدات، بۆئەوەی بتوانێت خۆی لەفەرمانڕەواییدا بمێنێتەوە، من خەڵکی سوریا دەهێنمە سەر ئەو باوەڕەی دەبێت ئازاد بن و ئازدیش بەدەست ناهێن، تائەو کاتەی هەمویان دەست لەناودەستی یەکتری دژی میسریەکان ڕاپەڕن و کاتێك دانیشتوانی سوریا یەکیان

گرت و گەشتنە ئەو باوەڕی کە ئازادیان بەدەست هێناوە، بێئەوەی ئاگایان لەوە بێت کە ئازادیان بۆ من هێناوە، بۆئەوەی بەسەریاندا زاڵ بم و فەرمانڕەواییان بکەم، ئەوان وەکو جاران دەبێت زەحمەتی خۆیان بکێشن و باج و سەرانە بدەن، ئەوەی لێرەدا گۆڕانکاری بەسەر دێت ئەوەیە کە لەڕابردودا میسریەکان باج و سەرانەیان لێ دەسندن، دوای ئەوان من لێیان دەسێنم و بەردەوام پێیان دەڵێم ئێوە خۆشبەختترین نەتەوەی ئەم جیهانەن، چونکە ئازادن و ئەوانیش بەهۆی ئەم خەیاڵپڵاویەوە خۆشحاڵ دەبن.

"سینۆهە"تۆ نازانی کە نەتەوەیەك وەك ڕانە مەڕێك وایە و دەبێت بەشتێکەوە سەرقاڵیان بکەیت، بۆئەوەی بتوانی فەرمانڕەواییان بکەیت، یەکێك لەباشترین کەرەستە سەرقاڵکردنەکانی نەتەوەیەك ئەوەیە کە پێیان بڵێیت تۆ ئازادی و بۆ ئەوەش هاتویتەتە ئەم جیهانە کە بەئازادی بژیت، لەبەرئەوەی خەڵکی نەزان و گەمژەن گوێیان لەهەرچییەك بێت باوەڕی پێدەکەن و بەڕاستیەکی حاشاهەڵنەگەری دەزانن. گرنگ ئەوەیە ئەوەندە بابەتێك بەگوێیاندا بچپێنی تا لەناو ڕۆحیاندا جێگیر دەبێت.

وتم: ئایا دەزانی ئەم قسانەی تۆ چەنێك هەڕەشە ئامێزە، ئەگەر میسر بزانێت تۆ چ مەبەستێکت هەیە، گالیسکە جەنگیەکانی دەنێرێت بۆ وڵاتەکەی تۆ و ئەم شارەت بۆ وێران دەکات و خودی تۆش دەستگیر دەکات و سەرەوژێر هەڵتدەواسن، یان دەتبەنە"تبس"، بۆئەوەی لەوێ لەسێدارەت بدەن.

پادشای"ئامورو" وتی: فیرعەونی میسر متمانەی بەمن هەیە، لەبەرئەوەی"خاچی ژیانی"پێداوم و منیش بۆ خوداکەی ئەو پەرستگایەکم دروست کردووە و ئەو زیاد لەبەرپرسەکانی خۆی متمانەی بەمن هەیە. ئێستا وەرە بابڕۆین بۆئەوەی شتێکت پێ نیشان بدەم، کە ببێتە مایەی خۆشحاڵیت.

لەگەڵ پادشای"ئامورو"ڕۆشتم و ئەو منی بەرەو حەساری شار برد و بینیم پیاوێکیان سەرەوژێر بەدیواری حەساری شاردا هەڵواسیوە.

پادشای"ئامورو"وتی:ئەم پیاوە دەبینی کابرایەکی میسریە و ئەگەر گومانت لەناسنامەی هەیە. ئەوا خەتەنەکەی ئەو گومانەت دەڕەوێنێتەوە.

پرسیم: بۆچی ئەم میسریە بەدبەختەیان سەرەوژێر هەڵواسیوە؟

پادشای"ئامورو"وتی:ئەم پیاوە خوێندکاری فیرعەونی میسرە و هاتووە بۆ ئێرە بۆئەوەی داوای سەرانە و باجم لیّ بکات و دەیوت، من چەند ساڵێکە باج و سەرانەم نەداوە و دەبێت سەرانەی ئەو چەند ساڵە بدەیت.

وتم: گوناحی خوێنی ئەم پیاوە بەدبەختە لەئەستۆی تۆدا دەبێت و تۆ گرفتاری سزایەکی زۆر خراپ دەبیت، چونکە لەمیسردا دەتوانی گاڵتە بەهەموو شتێك بکەیت، جگە لەخوێندکارانی فیرعەون کە نوێنەری کۆکردنەوەی باج و سەرانەن.

پادشای"ئامورو"پێکەنی و وتی:من بەشێوەیەك بەرنامەم بۆ دارێژاوە کە فیرعەون لەباتی ئەوەی لێم تورە ببێت، ڕەزامەندی خۆی لەبەرامبەر مندا دەربڕێت کە خوێندکارێکی گەندەڵم بەسزای خۆی گەیاندووە، چونکە زیاد لە دە تەختەقوڕی سورکراوەم ناردووە بۆ فەرمانڕەوایانی میسر لەسوریادا و ئەم پیاوە دوای ئەوەی پێی ناوەتە سوریا و وڵاتەکەی من دەستدرێژی کردووەتە سەر ژنان و جنێوی بەخوداکانی سوریا داوە و لەپەرستگای ئێمەدا، ڕەفتارگەلێکی ناشیرینی ئەنجام داوەو لەیاساکانی ئێمەدا نوسراوە، ئەگەر پیاوێك بێ ڕەزامەندی ژن، بەزۆر لەگەڵیدا ڕابوێرێت، یان قسەی ناشیرین و نەشیاو بەخوداکان بڵێت یان لەپەرستگادا دوچاری ڕەفتارگەلێکی پیس ببێت دەبێت بەکوشت بدرێت.

هەرچی زیاتر لەگەڵ پادشای"ئامورو"قسەم بکردایە، زیادتر "هۆرم هب"ی فەرماندەی لەشکری میسر دەکەوتەوە یاد کە منی نارد بۆئەوەی زانیاری لەوڵاتانی تردا کۆبکەمەوە، چونکە زۆر لەو دەچوو.

تەنها ئەو جیاوازیەی کە ئەم دوانە لەگەڵ یەکدا هەیانبوو ئەوەبوو کە پادشای "ئامورو" لە"هورم هب" بەتەمەنتر و فێڵبازتر بوو، چونکە پادشای "ئامورو" لەوڵاتێکدا فەرمانڕەوایی دەکات کە لەکۆندا فەرمانڕەواکانی ئەو ناوچەیە لەگەڵ پادشاکانی تردا دەجەنگان و بەکوشتیان دەدان یان خۆیان بەکوشت دەدران و ناکۆکی بەردەوامیان هەبوو لەگەڵ دراوسیّ کاندا،ئەم جۆرە پادشایانەی کە لە هونەری سیاسەتدا زۆر شارەزا بوون.

سەرەڕای ئەوەی پادشای"ئامورو"فێڵباز و ئازا و بێباك دەهاتە بەرچاو، بەڵام من وایبۆ دەچووم توانای فەرمانڕەوایی سەرتاسەری سوریای نەبێت، بۆیە پێم وت: سەرەڕای ئەوەی لەسەردەمی منداڵیدا لەوڵاتی میسردا ژیاویت، بەڵام بەهۆی منداڵی و

کاڵفامیتەوە نەتوانیوە پەی بەمەزنی و توانای فیرعەونی میسر ببەیت، چونکە فیرعەونی میسر سەروەت و سامانێکی زۆری هەیە و دەتوانێت لەشکرێکی مەزن بنێرێرێتە وڵاتەکەی تۆ و ئەم وڵاتەت بۆ وێران بکات و تۆش نابێت بەتواناکانی خۆت بنازی و لەخۆبایی ببیت و وا بزانیت کە دەتوانی لەگەڵ فیرعەونی میسردا دەستەویەخە ببیت، کاتێك کونی کیسەیەك جوان بەڕۆن دەماڵن و کونەکانی دەگرن، دوای ئەوەی فویان تێکرد کیسەکە هەڵدەئاوسێت و خاوەنی کیسەکە وا دەزانێت شتێکی مەزنی بەدەستەوەیە، بەڵام هەرئەوەی کونێکیان کردە ئەو کیسەوە و ئەو بایەی کە بووەتە هۆی هەڵئاوسانی ئەو کیسەیە دەربچێت، کیسەکە دەگەڕێتەوە حاڵی جارانی. تۆش ئێستا دەقاودەق وەك ئەو کیسەیە وایت کە فویان تێکردووە و هەرئەوەی کونێکت تێ بکەن، هەموو ئەو بایەی کە بووەتە هۆی هەڵئاوسانت خاڵی دەبێتەوە.

پادشای"ئامورو"پێکەنی و لەڕێی ئەم پێکەنینەیەوە ڕوکەشی ئاڵتونی ددانەکانی خۆی پێنیشان دام و وتی: سەرەڕای ئەوەی وەك کیسەیەکی فوتێکراویش بم، بەڵام هاودەستانێکی بەهێزم هەیە، ئەوانەش فەرمانڕەوایانی"بابل"و"هاتی"ین کە پشتگیریم دەکەن میسر لەسوریا لە دەربکەم.

وتم: فریوی پشتگیری فەرمانڕەوایانی"بابل"و"هاتی"نەخۆیت، چونکە ئەکرێت کۆمەڵێك چەقەڵ بۆ شکارکردنی گیانەوەران لەگەڵ شێرێکدا یەکبگرن، بەڵام دوای ئەوەی نێچیرەکەیان ڕاوکرد، باشترین گۆشتی ئەو گیانەوەرە شێرەکە دەیخوات و بۆ چەقەڵەکانیش جگە لەگەدە و ڕیخۆڵەی نێچیرەکە هیچی تر نامێنێتەوە.

ئەم دوو پادشایەش هاوکاری ئەوەت دەکەن کە میسر لەسوریا دەربکەیت، بەڵام مەبەستی ئەوەیان نیە تۆ بکەنە پادشای سوریا، بەڵکو دەیانەوێت دەست بەسەر وڵاتی سوریادا بگرن، بۆ تۆش بێ لەفەرمانڕەوایی"ئامورو"هیچ شتێکت بۆ نامێنێتەوە، ئەویش ئەگەر بمێنێت.

پادشای"ئامورو"زۆر پێکەنی و وتی:"سینۆهە"حەز دەکەم وەك تۆ بخوێنم بۆ ئەوەی ببمە کەسێکی دانا و وەك تۆ گەشت بۆ وڵاتانی تر بکەم، بۆئەوەی زانیاریەکی تەواو لەسەر وڵاتە بێگانەکان بەدەست بهێنم، بەڵام لەبەرئەوەی دەبێت وڵاتی خۆم بەڕێوە ببەم، هەلی ئەوەم بۆ نەڕەخساوە سەردانی وڵاتانی تر بکەم.

ئەو گفتوگۆیەی من لەگەڵ پادشای"ئامورو"دا کردم، منی لەوە ئاگادار کردەوە کە هەتا زووتر لەوڵاتەکەی ئەو دەرچم هێشتا درەنگە، چونکە فیرعەونی میسر ئەگەر بیەوێت تۆڵەی خوێنی خوێندکارەکەی بکاتەوە، ئەوا لەشکرێك بۆ وڵاتی "ئامورو" دەنێرێت و دوای هاتنی هێزی میسر بۆ"ئامورو"بونی من لەو وڵاتەدا باش نابێت و لەوانەشە پادشای"ئامورو"بەهۆی ئەو ڕقەی کە لەبەرامبەر میسریەکاندا هەیەتی منیش بەکوشت بدات.

بۆیە ڕۆژی دوایی بەپادشام وت:ئەوە ماوەیەکە من میوانی تۆم و نامەوێت لەوە زیاتر ئەم پێشوازی و میوانداریەی تۆ بۆ مەبەستی تایبەتی خۆم بقۆزمەوە، ئەگەر تۆ کەژاوەیەکم پێ بدەیت ئەوا دەگەڕێمەوە بۆ"ئزمیر"، بەڵام لوێش نامێنمەوە، بەڵکو دەگەڕێمەوە بۆ میسر، چونکە حەز دەکەم لەئاوی"نیل" بخۆمەوە.

من ڕاستم دەکرد چونکە دەمویست بگەڕێمەوە بۆ میسر و دەرەنجامی ئەو لێکۆڵینەوەیەی خۆم لەبارەی وڵاتە بێگانەکانەوە بگەیەنمە دەستی"هورم هب"ی فەرماندەی لەشکری میسر.

پادشای"ئامورو" وتی: باڵندەیەك تا هێلانەیەك بۆخۆی دروست نەکات هیچ کاتێك ئاسودە خەیاڵ نابێت، تۆ دوای ئەوەی ماوەیەك گەشتت بۆ وڵاتانی جیهان کرد، باشترین شت ئەوەیە کە دەست لەگەشت و گەڕانەکانی خۆت هەڵگری و لەم وڵاتەدا نیشتەجێ ببیت، ئەگەر حەز بکەیت لەم وڵاتەدا بمێنیتەوە من ماڵێکت بۆ دروست دەکەم و جوانترین کچی ئەم شارەت پێ دەبەخشم، بۆئەوەی بیکەیتە هاوسەری خۆت.

من بەگاڵتەوە وەڵامم دایەوە:خراپترین وڵاتی جیهان وڵاتی"ئامورو"یە و ژنەکانی ئەم شارەش بۆنی کارە بزنیان لێ دێت، من حەز ناکەم لەم وڵاتەدا بمێنمەوە و لەگەڵ ئەو ژنەی بۆنی بزنی لێدێت بژیم. دوای ئەوەش ئەوە ماوەیەکی زۆرە لەمیسر دور کەوتومەتەوە و بیری وڵاتەکەم دەکەم و دەمەوێت بگەڕێمەوە، بۆئەوەی گوێم لەدەنگی مراوی و باڵندەکانی کەناری ڕوباری"نیل" بێت و لەژێر سێبەری دارخورماکانی میسردا دانیشم و گوێ لە گۆرانی دەریاوانەکان بگرم و خۆری گەرمی میسر بدات لەجەستەم، دوای ئەوەش بچمە"ماڵی ژیان"و خوێندکارانی میسر لەزانیاریە پزیشیەکانی خۆم ئاگادار بکەمەوە، بۆئەوەی بەهای زانستی"ماڵی ژیان"کە بەردەوام مەزنترین قوتابخانەی جیهان بووە، هەروا بمێنێتەوە.

پادشای"ئامورو" وتی: سەرباری ئەوەی من حەز ناکەم تۆ لێرە بڕۆیت، بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ ناتەوێت بمێنیتەوە، بۆیە کەژاوەیەکت بۆ ئامادە دەکەم و کۆمەڵێک سەربازیشت لەگەڵدا دەنێرم، بۆئەوەی تۆ بگەیننە"ئزمیر"، چونکە تورەیی سریانیەکان بەرادەیەك لەدژی میسریەکان وروژێنراوە، لەوانەیە لەڕێدا بتکوژن.

من کە نەمدەتوانی جارێکی تر سواری گالیسکە سەربازیەکان ببم، ناچاربوم بە کەژاوەیەك لە پایتەختی "ئامورو"وە گەڕامەوە و سەربازەکانیشی ڕەوانەیان کردم.

هەرئەوەی گەشتمە"ئزمیر"بە"کاپتا"م وت: زۆر زوو ئەو خانووەی لێرە هەمانە بیفرۆشە، لەبەرئەوەی لەمەودوا سنوری"ئزمیر و سوریا"بۆئێمەی میسری زۆر هەڕەشە ئامێزە و دەبێت زوو بگەڕێینەوە بۆ میسر.

*بەشی بیست و حەوتەم*

## گەڕانەوە بۆ میسر

## بۆئەوەی چاوپێکەوتن لەگەڵ"هورم هب"دا بکەم.

من باسی بارودۆخی گەڕانەوەم بۆ میسر ناکەم، جگە لەوەی کاتێك کەشتیەکە بەڕێ کەوت، هەرچی زیاتر لەمیسر نزیکتر ببومایەتەوە، زیاتر هەستم بە بێئۆقرەیی دەکرد و نەمدەتوانی دان بەخۆمدا بگرم، بۆیە بەردەوام لەسەر سەکۆی گەشتیەکەدا پیاسەم دەکرد.

چونکە پەلەی ئەوەم بوو زووتر بگەمەوە میسر، کاتێك لەشاری کەنار دەریاکانی سوریادا لەنگەریان دەکرد، تاقەتی لێکۆڵینەوەی ژیان و نەریتی ئەو شارانەم نەبوو، چونکە چیتر لەوجۆرە کارانە بێزار بوبوم.

بگرە ڕەنگی کێوەکانی سوریا لەکاتی ئاوابونی خۆردا کەڕەنگی ئەرخەوانی لەخۆ دەگرت، منی نەدەوروژاند، لەسوریادا وەرزی بەهار بوو و پەڕەسێلکەکان لەئاسماندا سەما و جیقەجیقیان دەکرد، کاتێك لەشارە کەناریەکاندا لەنگەرمان دەکرد، دەنگی پەڕەسێلکەکانم دەبیست لەلای سەرمەوە.

کاهینەکانی خودای"بەعل"ی خودای سوریا بەبۆنەی گەشتنی وەرزی بەهار، لەپەرستگاکان هاتبونە دەر و لەکۆڵانەکاندا هاواریان دەکرد و ڕوخساریان دەڕوشاندو لەپشت ئەمانیشەوە ژنان و کچانی لاو گالیسکەیەکیان بەدوای خۆیاندا دەکێشا بۆئەوەی خەڵکی دیاری خودای"بەعل" بخەنە ناو ئەو گالیسکەکەیەوە.

بەڵام تەواوی ئەمانە لەبەرچاوی مندا، بەهۆی ئەوەی دەمویست بگەڕێمەوە بۆ میسر، هیچ گرنگیەکیان نەبوو و من حەزم نەدەکرد جارێکی تر تەماشای ئەو جۆرە دیمەنانە بکەم، چونکە لەڕابردوودا بینیبوم.

بارودۆخی من لەو کاتەدا کە دەمویست بگەڕێمەوە بۆ میسر، وەك ئەو خوێندکارە وایە کە ئاشقی ژنێك بوبێت و دەزانێت یا دەبێت بڕوات سەردانی ئەو ژنە بکات یان ئەو ژنە دێت بۆ لای، ئەم خوێندکارەش چیتر دوای ئەوە ناتوانێت ئەوەی لەلاپەڕەی پاپیرۆسەکاندا نوسراوە-پاپیرۆسی میسری ئەو سەردەمە کە لەجۆرێك گیا دروست دەکرێت- بخوێنێتەوە و ئەگەر بیشیخوێنێتەوە ناتوانێت لەو زانیاریەی کە لەسەر ئەو پاپیرۆسە نوسراوە تێبگات، تائەوەی کاتەی چاوی بەو ژنە نەکەوێت، بەڵام دوای بینینی دوبارە ئارەزوی خوێندنەوەی کتێبی بۆ دەگەڕێتەوە.

منیش بەبۆنەی ئەوەی کە دەمزانی دەگەڕێمەوە بۆ میسر و چاوم بەنیشتمانی خۆم دەکەوێتەوە، لەتەماشاکردنی دیمەن و نەریتی شارەکانی سوریا بێزار بووبووم.

دەمویست خۆم بگەیەنمە"تبس"و لەیەکەمین شەوی گەشتنم بۆ ئەوێ بەکۆڵانەکانی شاردا پیاسە بکەم و بەبەردەم ئەو ماڵانەی لەخۆڵ دروست کراون تێپەڕمو چاوم بەو مەقەڵیانە بکەوێت کەلەبەردەم ماڵەکاندا دایاننناون و ماسی لەسەر دەبرژێنن، بەهەناسەیەکی قوڵ بۆنی ماسیەکان هەڵمژم، هەروەها بادەی میسر برژێنمە ناو دەممەوە و تامی لەسەر زمانم بەرجەستە بکەم و خۆم لەئاوی نیل کە بۆنی چڵکاوی لێدێت تێر بکەم ، چونکە بۆنی ئەو چڵکاوە بەلای منەوە وەك خۆشترین بونی عەترە وایە.

دەمویست زووتر خۆم بگەیەنمە میسر، بۆئەوەی بەسەر ئەو پاپیرۆسانەی کە لەکەنار ڕوباری "نیل"دا دەڕوێن پیاسە بکەم و لەژێر پێمدا هەست بەو جۆرە گیایە بکەم و بۆنی ئەو گوڵانەی کە لەکەنار ڕوباری نیلدا دەڕێن بکەم و کاتێکیش خۆر هەڵدێت و تیشکی بەر پایە ڕەنگاوڕەنگەکانی پەرستگای"ئامون"دەکەوێت، ستایشی درەوشاوەیی ڕەنگەکانی بکەم.

سەرەڕای ئەوەی لەشاری"تبس"دا هەر بەوشێوەی لەسەرگوزەشتەکانی خۆمدا باسم کردووە چارەڕەش بوم و تێپەڕبونی کات تەمومژی فەرامۆشی بەدبەختیەکانمی داپۆشیبوو و لەوکاتەی کە بۆ میسر دەگەڕامەوە نەخۆمم بەخۆشبەخت دەزانی و نە

بەبەدبەخت، بەڵکو ئازاری نیشتمانم هەبوو و دەمویست بڕۆم و خۆم لەو ژینگەیەی چاوم تێدا کردەوە و گەورە بوم و خۆمم تێدا ناسیی ببینم.

کاتێك گەشتینە کەنارەکانی "سینا"، سەرەڕای ئەوەی وەرزی بەهاربوو، بەڵام ئەو بایەی لە وشکانیەوە بەئاڕاستەی دەریا هەڵی دەکرد، ڕوخسارمانی دەیسوتاند کاتێك کەبەری دەکەوت ، چونکە بیابانی "سینا"یەکێکە لەشوێنە گەرمەکانی جیهان.

دوای ئەوەی ماوەیەك بەدرێژایی کەنارە سورەکانی "سینا"دا تێپەڕین، گەشتینە شوێنێك کە ڕەنگی دەریا زەرد بو، دەریاوانەکان گۆزەکانیان کە بەپەتێکەوە بەستبو شۆڕ دەکردەوە بۆ ناوی ئاوی دەریا و دوای ئەوەی ئەو گۆزەیە پڕدەبوو لەئاو هەڵیان دەکێشایەوە، منیش لەهەمان ئەو ئاوەم دەخواردەوە و هەستم کرد تاڕادەیەك شیرینەو تامی چڵکاوی ئاوی "نیل"دەدات، چونکە ئاوی شیرین و چڵکاوی "نیل" کاتێك تێکەڵی ئاوی سوێری دەریا دەبێت، بۆماوەیەك هەروەك خۆی دەمێنێتەوە و ئاوێتەی ئاوی دەریا نابێت.

ئەو ڕۆژە، کاتێك لەئاوی "نیل"م خواردەوە بە "کاپتا"ی بەندەم وت:ئەم ئاوە، لەدەمی مندا لەباشترین شەرابەکانیش خۆشترە.

بەڵام کاپتا وتی: ئاو لەهەموو شوێنێکدا هەر ئاوە، ئەگەر لەناو ڕوباری نیلیشدا بێت هیچکات ناتوانێت جێی شەراب بگرێتەوە.

وەتم: من بۆیە بەخواردنەوەی ئەم ئاوە خۆشحاڵم ، چونکە دەزانم گەشتومەتە میسر.

کاپتا وتی:هەرکاتێك خۆم لەناو یەکێك لەمەیخانەکانی "تبس"دا بینی کەگۆزەیەکی پڕ لەئاوجۆیان لەبەردەممدا داناوە و ئەو ئاوجۆیەش دەخۆمەوە و تۆوی ئاوجۆ دەچێتە ناو دەممەوە، ئەو کاتە دڵنیا دەبم کە گەشتومەتە میسر، چونکە لەدەرەوەی میسر، هیچ کەسێك توانای ئامادەکردنی ئاوجۆیەکی باشی نیە و بەشێوەیەك ئەم خواردنەوەیە ئامادە دەکەن، کە مرۆڤ ناچارە پێش ئەوەی بیخواتەوە جوان بیپاڵێوێت بۆئەوەی تۆوەکەی بڕژێت، دوای ئەوە بیخواتەوە.

بەڵام هەرئەوەی خۆم لەناو میسردا بینیەوە، لەوباوەڕەدا نیم هیچ گۆڕانکاریەك لەژیانمدا ڕوو بدات، چونکە من بەندەم، ئیتر لەمیسر یان هەر شوێن و وڵاتێکی تر بم.

وتم: "كاپتا"گەشتە دوورودرێژەكانی ئێمە، تۆی بەتەواوی بێشەرم كردووە و ئەم بێشەرمیەت گەشتووەتە ڕادەیەك كەئەوە فەرامۆش بكەیت كە بەندەی منی و بەشێوەیەك وەڵامم دەدەیتەوە كە هەركەسێك گوێی لێت بێت، وا هەست دەكات مافی ئەوەت هەیە گفتوگۆم لەگەڵدا بكەیت، ئەگەر لەمیسر بومایە ئەوا دارە حەیزەرانێكم لەكەنار ڕووباری "نیل"دا هەڵدەكەند و بەهەمان ئەو حەیزەرانە چەند دانەیەكم بەپشتو شانتدا دەكێشا و ئەوكات تۆ تێدەگەشتی كە جگە لەبەندەیەك هیچی تر نیتو مافی ئەوەت نیە بەوشێوەیە لەگەڵ خاوەنەكەتدا قسە و گفتوگۆ بكەیت.

"كاپتا"ش لەوكاتەدا هەردوو دەستی خستە سەر ئەژنۆی و كڕنوشی برد و وتی: گەورەم، تۆ هەم پزیشكی و هەم وتاربێژێكی هونەرمەندی، لەبەرئەوەی دەزانی لەهەر كاتێكدا چ جۆر قسە و وشەگەلێك بەكار بهێنی و ئەوەی ئێستا وتت، گاڵۆك و دار حەیزەرانەكانی هێنامەوە یاد كە لێدانی گاڵۆك و دارحەیزەران زیاد لەتامی چڵكاوی ڕووباری"نیل"و دەنگی مراوی وقازەكان و بۆنی ماسی سووركراوە و بۆنی بخوردی پەرستگاكانی"تیس"و دیمەنە ناسراوەكانی میسر بەناوبانگترە، چونكە لەم وڵاتەدا هەزاران ساڵە، بەندەكان بە گۆچان و دار حەیزەران تەمێ دەكرێن و بەهێزی ئەوجۆرە دارانەیە كە هەموو شتێك لەجێی خۆیدا بەجێگیری ماوەتەوە و هیچ كەسێك پێ لەبەڕەكەی خۆی زیاتر ناكێشێت. سەرەڕای ئەوەی هەزاران ساڵ بەسەر دروست بونی میسردا تێدەپەڕێت، بەڵام هیچ گۆڕانكاریەكی بەسەردا نەهاتووە و ئێستاش دەزانم كە دەبێت بەگۆچان و دار خەیزەران لێم بدرێت و گەشتمە ئەو باوەڕەی كە گەشتومەتەوە میسر و قۆناخی گەشتە درێژخایەنەكانمان كەبەدرێژایی ئەو گەشتەماندا زۆر شتی سەیرم بینی، كۆتایی پێهاتووە....ئاه....ئەی داری حەیزەران.....خوداكانی میسر زۆرترتان بكات، چونكە دەتوانن هەموو كەسێك لەجێی خۆی دانیشێنن و دەبنە ئاستەنگ لەبەردەم ئەو كەسەی بیەوێت سنوری خۆی ببەزێنێت.

دوای ئەو قسانەی، دەستی كرد بەگریان و ڕۆشت لەگۆشەیەكی ئەو كەشتیەدا خەوت و تا ئەوكاتەی كەشتیەكەمان گەشتە لەنگەرگا"كاپتا"هەر خەوتبوو.

كاتێك كەشتیەكەمان خۆی كرد بە بەڕووباری"نیل"دا و لەكەنار لەنگەرگادا ڕاوەستاو چاوم بە كۆڵبەرانی میسری كەوت كە جگەلە دەستێك جل، هیچی تریان

نەبوو، بینیم کە ڕیشیان تاشیوە، لەوکاتەدا ئاگاداری ئەوە بووم کە چەنێك لە جلوبەرگی درێژ و ڕیشی لول و چرچی سریانیەکان بێزارم.

ژن و پیاوی سوریا قەڵەو بون، لەکاتێکدا دوای ئەوەی خۆم کرد بەمیسردا بینیم ژن و پیاوی ئەویٚ ئەندامێکی باریکیان هەیە و جەستەیان بەهۆی پی[60]یەوە قەڵەو نەبوون. بگرە بۆنی ئارەقی کۆڵبەرەکان لەلوتی مندا زۆر چێژ بەخش بوو و هەرئەو کاتەی ناوی من و"کاپتا"یان نوسی"کاپتا"خۆی وەك کەسێکی خەڵکی سوریا ناساند، بۆئەوەی هیچ کەسێك بیانوی پیٚ نەگرێت"لەبەرئەوەی بەندەیەکی هەڵهاتوو بوو"و ئێمەش دوای ئەوەی لەکەشتی دابەزین و جلی خوری ساریانیەکانم لەبەر داکەند و فڕێمدان و جلی کەتانی میسریم لەبەرکرد.

دوای ئەوەی دوو ڕۆژ لە لەنگەرگادا ماینەوە بۆئەوەی بحەوێینەوە، سوار کەشتیەك بوین کە بەرەو"تبس" دەڕۆشت و دوای ئەوەی گەشتەکەمان بەسەر ڕوباری"نیل"دا دەستی پێکرد، ئێمەش ماوەیەکی زۆر دیمەنەکانی میسرمان نەبینیوە، لەبەیانیەوە تا ئێوارە بەسەر سەکۆی کەشتیەکەوە تەماشای دیمەنی لای ڕاست و چەپی گەشتیەکەمان دەکرد و لەتەماشاکردنی کەسە لادێییە ڕوتەکان، کە"گا"کانی خۆیان بۆ کێڵانی زەوی دەبرد تێرمان نەدەخوارد و چێژمان لە بیستنی دەنگی قازو مراوی و لەقلەقەکان وەردەگرت.

هەرئەوەی کەشتی لە لەنگەرگایەکی ڕوباردا ڕادەوەستا، "کاپتا"یەکسەر لەکەشتیەکە دادەبەزی و خۆی دەگەیاندە مەیخانەیەك و گۆزەیەك ئاوجۆی دەخواردەوە و باسی ئەو شتانەی کە لەولاٚتانی تردا بینیبوی بۆ ئەو کرێکارانە دەکرد کە لەناو ئەو مەیخانەیەدا دانیشتبوون و ئەوانیش بەشێوەیەك سەریان لەقسەکانی"کاپتا" سوڕ دەما کە ناچار بون پەنا بۆ خوداکانی میسر ببەن.

هەرچەنێك لە"تبس" نزیکتر ببوینایەتەوە، دانیشتوانی ئەمبەراوبەری ڕوباری "نیل" زیاتر دەبوون و لەنزیك"تبس"دا بەشێوەیەك جوتیار و خوێنەر بەیەکەوە چەسپابون کە لەبەرچاوی ئێمە وەکوو ئەوە وابوو لەنێوەندی دووشاردا تێدەپەڕین کە یەکێکیان لەکەناری لای ڕاست و ئەویتریان لەکەناری لای چەپدا جێگیرە.

---

[60] پی: یان پیو- وشەیەکی پاراوی کوردیە کە بەواتا ئەو توێژە چەوریە دێت کە لەسەر گۆشت دروست دەبێت.......وەرگێڕ.

لەناکاو لەبەشی ڕۆژهەڵاتی ڕوباری"نیل"ەوە سێ کێو دەرکەوت کە وات دەزانی سێ پاسەوان بەبەردەوامی پاسەوانی میسر دەکەن، دوای ئەوە دیوارە بەرزەکانی شار و پەرستگای مەزنی"ئامون"و تەلارگەلێکی ڕێك و پێك و دەریاچەی پیرۆز دەرکەوتن.

کاتێك چاوم بە شاری مردووەکانی بەشی خۆرئاوای ڕوباری"نیل"کەوت، دڵم زۆر تەنگ بوو و وتم: شاری مردووەکان شوێنێکە کە مردووەکان دوای ئەوەی مۆمیا دەکرێن لەوێدا دەیاننێژن و ئارامگای تەواوی فیرعەونەکان و پادشاکانی میسر لەوێیەو مەزارەکانیان لەگەڵ خانووە سپیەکاندا دەدرەوشێنەوە و لەبەرامبەر هەریەك لە گۆڕی پادشاکانی میسردا درەختێکیان ناشتووە کە لەوەرزی بەهاردا"هەمان ئەو وەرزەی ئێمە گەشتینە میسر" گوڵ دەکەن.

من لەبەرئەوە بەبینینی شاری مردووەکان دڵتەنگ بوم، چونکە ئەوەی هێنامەوە یاد کە دایكو باوکم لەپێستی"گا"یەکدا لەنزیك یەکێك لەگۆڕی پادشاکاندا نێژراون، چونکە من گۆڕی ئەوانم لەپێناو ئیشقی ژنێکی تەماعکاردا فرۆشتبوو، بۆیە نەمدەتوانی لەگۆڕەکەی خۆیاندا بییانێژم یان گۆڕێکی تازەیان بۆ بکڕم، بۆئەوەی لەجیهانەکەی تردا بێماڵ نەبن.

لەبەشی باشور، لەوشوێنەی ڕوباری نیل پێچاوپێچکێکی زۆری تێدەکەوێت، کۆشکی فیرعەون لەناوەڕاستی درەختە سەوزەکاندا بەڕەنگی ئاڵتونی دەدرەوشایەوەو لەو کاتەدا لەدڵی خۆمدا دەموت ئایا"هورم هب"فەرماندەی لەشکری میسر هێشتا لەو کۆشکەدا نیشتەجێیە یان نە؟

کاتێك من لەمیسر دەرچوم ئەو پیاوێکی بەتوانا بوو و لەفیرعەونەوە زۆر نزیك بوو، بەڵام هیچ کەسێك ئاگاداری چارەنوس نیە و نازانێت ئەو پیاوەی ئەمڕۆ لە پادشاوە نزیکە، سبەینێش هەر بەوشێوەیە نزیکایەتی خۆی لەگەڵ پادشادا دەپارێزێت یان نە؟

کەشتیەکەمان لە لەنگەرگای"تبس"لەنزیك ئەو ناوچەیەی منی تێیدا گەورە بوم ڕاوەستا و لەناکاو وەك ئەوەی گەڕابێتمەوە بۆ سەردەمی منداڵیم، خۆم لەناوەڕاستی ئەو دیمەنە هەمیشەییانەدا دەبینیەوەکە لەسەردەمی منداڵیدا دەمبینین.

لەبەبیرهێنانەوەی یادگاری سەردەمی منداڵی و لاویەتیم، خۆشحاڵ و لەهەمان کاتیشدا دڵتەنگ بوم و زۆر خەمم بۆ دایك و باوکم دەخوارد، چونکە ئەو دوو کەسە

لەسەرتاپای تەمەنیاندا خۆیان گرفتاری هەموو ڕەنج و ئازارێك کرد تەنها بۆئەوەی بتوانن فێری خوێندنم بکەن و بمنێرن بۆ قوتابخانە، بەڵام من بەهۆی لاویەتی و دڵڕاوکێی ژنێکەوە خیانەتم لەوان کرد و گۆڕەکەیانم فرۆشت.

بەڕادەیەك شەرمەزار بووم کە دەمویست ڕوخساری خۆم داپۆشم، بۆئەوەی دانیشتوانی شاری"تبس"چاویان پێم نەکەوێت و نەڵێن ئەوە"سینۆهە"ی سپڵەیە کە دایك و باوکی خۆی لەجیهانەکەی تردا بێخان و ماڵ کرد.

پێش ئەوەی خۆم بکەم بەشاری"تبس"دا، هیچ بەرنامەیەکم بەدەستەوە نەبوو کە بەچ شێوەیەك لەوشارەدا بژیم، چونکە بارودۆخی ژیانی من پەیوەست بوو بە بینینی"هورم هب"ەوە و بزانم ئەو دوای ئەوەی گوزارشتەکانی وەرگرت چی دەڵێت.

بەڵام هەرئەوەی پێم نایە ناو شاری"تبس"ەوە پەییم بەوە برد کە لەوشارەدا وەك جاران دەبمە پزیشك، بەڵام نەك وەك پزیشکێکی مەزن و بەناوبانگ، بەڵکو پزیشکێك کە لەناوچەی هەژار نشینەکاندا نیشتەجێ دەبێت و نەخۆشە هەژارەکان چارەسەر دەکات.

زانیم پێویستم بەو زانیاریانەنیە کەلە وڵاتانی بێگانەدا بەدەستم هێناون، بۆئەوەی بیانکەمە کەرەستەیەك بۆ بەدەستهێنانی ناوبانگی و سەروەت و سامان، هەروەها کاتێك بڕیاری ئەوەشم دا لەناوچە هەژارنشینەکاندا نیشتەجێ ببم، هەستم بەخۆشی و ئارامیەکی زۆرکرد.

ئەگەر هەر پزیشکێکی تر لەجێی مندا بووایە و ئەو هەموو زانیاریانەی لەوڵاتانی تردا بەدەست بهێنایە، دوای ئەوەی دەگەڕایەوە لەیەکێك لە گەڕەکە دەوڵەمەندەکاندا نیشتەجێ دەبوو و ناوی خۆی لەسەر تابلۆیەکی جوان بەسەر خانوەکەیەوە هەڵدەواسی، بۆئەوەی هەموو کەسێك بزانێت ئەو پزیشکە لەهەموو پزیشکەکانی تر جیاوازەترە و ئەو کەسانەی بەمەبەستی چارەسەرکردن سەردانی دەکەن، دەبێت دیاریگەلێکی گرانبەهای پێشکەش بکەن.

بەڵام سەیر لەوەدایە سەرەڕای ئەوەی دەمویست لەناوچە هەژارەکاندا بژیم و کەسێکی گومناوبم، بەهۆی ئەم بیرکردنەوەیەم خۆمم بەخۆشحاڵ دەزانی و ئەم بابەتەش ئەوەمان پێنیشان دەدات کە ئێمە هەندێ جار لەبەرامبەر خواستەکانی خۆماندا هەڵە دەکەین و نازانین چیمان دەوێت، هەموو جیهان بەپێ دەبڕین و

لەولاتێکەوە دەڕۆین بۆ ولاتێکی تر و زانیاری یان زێڕ و زیوێکی زۆر کۆ دەکەینەوە، دوای گەڕانەوەمان بۆ نیشتمانی خۆمان، پێویستە وەك یەکێك لەکەسە دەوڵەمەندەکان بژین و مەزنی خۆمان بەڕوی خەڵکانی تردا بکێشین، بەلام دوای گەڕانەوەمان بەسەرسوڕمانەوە دەبینین ئەوەی چێژمان پێ دەبەخشێت، ژیان بەسەربردنە لەگۆشەیەکی گومناودا.

کۆڵبەرەکانی لەنگەرگا چواردەوریان گرتبوین، بۆئەوەی بارەکانمان لەکەشتی داگرن و بیانگوازنەوە بۆ یەکێك لە میوانخانەکان و کرێیەکی زۆرمان لەبەرامبەر ئەو کارەیاندا لێ وەرگرن، چونکە لەهەموو شوێنێکدا کاتێك گەشتیارێك دەچێتە ناو شارێکەوە، کۆڵبەرەکان لەکەسانی تر زیاتر کرێیان لێ وەردەگرن.

بەلام من بە"کاپتا"م وت:حەزناکەم بڕۆم بۆ میوانخانە و بەکۆڵبەرەکان بڵێ ئێمە بارەکانمان لەکەشتی داناگرین.

"کاپتا" وتی:مەگەر ناتەوێت لەم شارەدا نیشتەجێ ببیت.

وتم: دەمەوێت ئەوەت پێ بڵێم، بەپەلە خانویەکم لەناوچەی هەژار نشینەکاندا بۆ بکرێت و بەلایەنی کەم لەنزیك ئەو ماڵەدا بێت کە دایك و باوکمی تێدا دەژیا، هەروەها هەر ئەمڕۆ کرینی ئەم خانووە کۆتایی پێ بێت، بۆئەوەی لەبەیانیەوە بتوانم لەماڵەکەی خۆمدا سەرقاڵی کاری پزیشکی خۆم ببم.

"کاپتا" بەبیستنی ئەو قسەیە زۆر دڵگران بوو، چونکە وای دەزانی ئێمە لەیەکێك لەمیوانخانەکاندا نیشتەجێ دەبین و بەندەی میوانخانەکە خزمەتی دەکەن، بەلام سەرەڕای ئەوەش هیچ ڕەخنەیەکی نەگرت و سەری دانەواند و ڕۆشت.

هەمان شەو، لەماڵە تازەکەی خۆمدا، کەپێشتر هی کابرایەکی مسگەر بوو دەکەوتە ناوچەی هەژار نیشینەکانەوە، لەسەر زەوی دانیشتم.

لەماڵەکانی ئەملاولا و بەرامبەری هەیوانەکەماندا، ژنەکان بەسەر ئاگردانەکانیاندا سەرقاڵی برژاندنی ماسی بون و بۆنی ماسی برژاو، لەسەرتاسەری ئەو کۆلانەدا دەهات.

کەمێك لەشەو تێپەڕی، چرای ماڵە سۆزانیخانەکان داگیرسان و لەناو سۆزانیخانەکاندا دەنگی موزیکی سریانی و گۆرانی دەریاوانانی مەست بەرزبویەوە و کاتێك تەماشای ئاسمانم دەکرد بینیم بەهۆی چراخانی شارەوە سور وەرگەڕاوە.

دوای ئەو سالأنەی لەولأتاندا سەرقالی گەشتکردن و کۆکردنەوەی زانیاری بوم، گەڕامەوە بۆ هەمان شوێن، بەواتا گەڕامەوە بۆ مالی خۆم و سەرم لەوە سوڕ دەما، کە چۆن سەرەڕای ئەوەی لەسوریا و "بابل"و "کریت"دا ئەو هەموو دیمەنە جوانەم بینیبو و ئەو هەموو بۆنە خۆشانەم بیستووە، بەم شێوەیە چێژ لە بۆنی ناخۆشی ماسی برژاو و بینینی دیمەنی هەژاری و کەمدەستی دراوسێکانم وەردەگرم.

بەیانی ڕۆژی دوایی بە"کاپتا"م وت: تابلۆیەکی سادە و بێنەخش و نیگار، بەسەر مالەکەمەوە هەلواسە، بۆئەوەی خەلکی بزانن ئەمە مالی پزیشکە و کاتێکیش کەسە نەخۆشەکان دێن، پێیان مەلێ کە من پزیشکێکی بەناوبانگم، بەلکو تەنها ناومیان پێ بلێ و بۆیان ڕونبکەرەوە کە ئەم پزیشکە، تەنها پێشوازی لەنەخۆشە هەژارەکان دەکات و هەموو کەسێك دەتوانێت بەپێی توانای دارایی خۆی کرێی چارەسەریەکەی بدات.

"کاپتا"وتی:گەورەم، تۆ کە پزیشکێکی مەزن و بەناوبانگی و بەهۆی ئەو گەشتانەی بەجیهاندا کردوتە، زانیاریەکی زۆرت بەدەست هێناوە، بۆچی خۆت دەکەیت بە پزیشکی هەژاران؟ئایا ئاوی گۆلاوەکانت خواردووەتەوە کە سەرچاوی نەخۆشیەکانە یان ئەوەی دووپشکێك تۆی گەستووە و بووەتە هۆی ئەوەی بەوشێوەیە بیری لێ بکەیتەوە؟

وتم:"کاپتا"ئەوەی من پێت دەلێم پەسەندی بکە و فەرمانەکانم بێ ئەملاولا جێبەجێ بکە، ئەگینا لەمالەکەم بڕۆرە دەرەوە و بەوشێوەی خۆت حەزی لێدەکەیت بژی، چونکە دەزانم ئەوەندە زێڕو زیوت لەمن دزیوە کە دەتوانی هەر بەو زێڕ و زیوەی هەتە ئەمڕۆ خانوویەك بکڕیت و ژنێکیش بکەیتە هاوسەری خۆت.

"کاپتا" وتی: گەورەم ئەگەر تۆ"تا"ت نەبێت بەوشێوەیە قسە ناکەیت و وام پێ نالێیت، منیش پیاوێك نیم کە ژن بهێنم و بەردەوام لەمالدا شەڕی لەگەلدا بکەم و ژن نانی من بخوات و لەکاتی شەڕ و دەمەقڕەشدا، بەگالۆك یان خێزەرە بکەوێتە کوتانی شان و ملم، کاتێك مرۆڤ بتوانێت ئازاد بێت و بەوپەڕی ئاسودەییەوە بژیت، بەبۆچونی من ژن هێنان کارێکی شێتانەیە، بەلأم لەبەرئەوەی تۆ خاوەنی منی، ئەگەر لەسەر حەسیرێکیش بخەویت، منیش دەبێت لەسەر ئەو حەسیرە بخەوم، بەلأم ناتوانم خۆم لەداخ و خەمخواردنەکان بپارێزم، لەبەرئەوەی تۆ کارێکی شێتانەت گرتووەتە بەر،

چونکە تەنها شێتێك گەوهەر و زێڕ لەژێر پاشەڕۆی ئاژەڵێکدا دەشارێتەوە و تۆش بەهەمان شێوە زانست و زیرەکی خۆت لەژێر پۆشاکی شڕ و دڕاوی هەژاراندا دەشاریتەوە.

وتم:"کاپتا"کاتێك مرۆڤ لەدایك دەبێت، ئیتر هەژار بێت یان دەوڵەمەند، بەڕوتی پێ دەنێتە ئەم جیهانەوە و لەکاتی نەخۆشیشدا هیچ جیاوازیەك لەنێوا هەژار دەوڵەمەنددا نیە و هەردووکیان بەشێوەیەکی یەکسان ئازار دەچێژن و دەبێت هەردوکیان بەیەك شێوە چارەسەر بکرێن.

"کاپتا"وتی:بەڵام جیاوازیەکی زۆر هەیە لەنێوان ئەو دیاریەی کە دەوڵەمەندێك دوای چارەسەرکردنی پێشکەشی دەکات لەگەڵ ئەو دیاریەی کە هەژارێك پێشکەشی دەکات، ئەگەر من هەر لەبنەچە و ڕەچەڵەکەوە بەندە بومایە، ئەوا لەکاتی لەدایك بونیشدا بەبەندەیەك لەقەڵەم دەدرام و لەم حاڵەتە دەمتوانی ئەم بۆچونەی تۆ پەسەند بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی لەسەرەتادا ئازاد بوم و لەدواییدا بومەتە بەندە، ناتوانم ئەوە بهێنمە بەرچاو خۆم کە هەژار و دەوڵەمەند لەبەرچاوی مرۆڤدا یەکسان بن.

وتم:"کاپتا"من نەخۆشی هەژار و نەخۆشی دەوڵەمەندێك بەیەك چاو تەماشا دەکەمو بۆئەوەی زانیاریەکی زیاترت پێ ببەخشم دەڵێم ئەگەر منداڵێکی بێ دایك و باوك پەیدا بکەم، دەیکەم بەکوڕی خۆم.

"کاپتا"وتی:ئەوە کارێکی بێسودە، لەبەرئەوەی منداڵی بێ دایك و باوك، لەپەرستگایەکی تایبەتەدا چاودێری و پارێزگاریان لێ دەکرێت و هەندێك لەمانە دەکرێن بە کاهینی پلە نزم و هەندێکیشیان دەکەن بەخزمەتکار و دەیاننێرنە ماڵی دەوڵەمەندەکانەوە بۆئەوەی خزمەتی دەوڵەمەندەکان بکەن یان پارێزگاری لەژنی دەوڵەمەندەکان بکەن، ئەم خزمەتکارانە لەماڵی کەسە دەوڵەمەند و وەجاخزادەکاندا، بەشێوەیەکی ڕەها لەماڵی دایك و باوکیان"ئەگەر زیندو مابێتن" باشتر دەژین.

ئەگەر تۆ خوازیاری منداڵێکی، خۆت لەژن هێنان بپارێزە و لەگەڵ هیچ ژنێکدا گۆزە مەشکێنە و لەباتی ئەوە داوا لەیەکێك لەو ژنە لاوانە بکە کە بێ ئەوەی برایەکیان بوبێت سکیان پڕبووە و دوای ئەوەی منداڵەکەی بوو، منداڵەکەی خۆیت پێ بدات و ئەویش بەو بۆنەیەوە دەیانجار سوپاسی خودای"ئامون"دەکات کە تۆی هێناوەتە سەر ڕێی، بۆئەوەی منداڵەکەی لێ وەرگریت و بەخێوی بکەیت.

ئەگەر ناتەوێت منداڵی کچێکی بێهاوسەر بکەیت بەهی خۆت، کەنیزێکی لاو و جوان بکڕە، کە هەم منداڵێکت بۆ بهێنێتە ئەم جیهانەوە و هەم سودێکیش بەمن بگەیەنێت و لەکاروباری ماڵدا یارمەتیم بدات، چونکە چیتر من پیر بوم و بەسەختی دەتوانم کاروباری ناوماڵ بەڕێوە ببەم، ئەوکاتانەی دەستەکانم دەلەرزێن، دەبێت خۆم هەم بەکاروباری ماڵەوە سەرقاڵ بکەم، هەم پارەکانی خۆم بخەمە گەڕ، بۆئەوەی سودێکم پێ بگەیەنن.

وتم:من حەزناکەم کەنیزەیەك بکڕم، بەڵام تۆ دەتوانی بۆ کاروباری ناوماڵ خزمەتکارێك بەکرێ بگریت، چونکە مافی ئەوەت هەیە، لەمەودوا لەماڵی مندا بحەسێیتەوە و ئەمەش پاداشتی وەفاداری منە لەبەرامبەر ئەو خزمەتەی پێت گەیاندوم، چونکە دەزانم لەم شارەدا دەڕۆیتە ناو فرۆشگاکانەوە و لەو گفتوگۆیانەی لەناو فرۆشگاکاندا دەیانبیستی زانیاری بەدەست دەهێنی و بۆمنی دەگێڕیتەوە، چونکە هیچ شوێنێك وەك مەیفرۆشی خەڵکی بەدڵسۆزیەوە قسەی خۆی تێدا ناکات، زۆر لەو کەسانەی کە هەرگیز هەستی دەرونی خۆیان بۆ هیچ کەسێك ناگێڕنەوە، دوای ئەوەی دەست بەخواردنەوە دەکەن، دەکەونە قسەکردن و ئەوەی لەدڵیاندایە دەیهێننە سەر زمان.

دوای ئەم قسەیە لەماڵ ڕۆشتمە دەرەوە، بۆئەوەی یەکێك لەئاشنا دێرینەکانم پەیدا بکەم هەروەها بڕۆم بۆ لای"هروم هب"ی فەرماندەی لەشکری میسر.

ڕۆشتم بۆ ئەو فرۆشگایەی کە"توتمس"ی دۆستی هونەرمەندی من بۆی دەڕوشت و هەواڵم پرسی و مەیفرۆشەکە پێی وتم: ئێستا نازانێت لەکوێیە و چی دەکات، چونکە ماوەیەکە نایەت بۆ ئەم فرۆشگایە، بەڵام پێش ئەوەی بەو شێوەیە ون بێت، بینیم شێوەی پشیلەکانی دەکێشا.

منیش سەرم لەوکارەی سوڕما و لێم پرسی: بۆچی وێنەی پشیلەکان دەکێشێت؟

مەیفرۆش وتی:لەبەرئەوەی ناچاربوو بژێوی ژیانی دابین بکات وێنەی پشیلەی بۆ ئەو کتێبە دەکێشا کە منداڵەکان لەقوتابخانەدا دەیانخوێند.

منیش لەو فرۆشگایە هاتمە دەرەوە و ڕۆشتم بۆماڵی سەربازەکان"بەواتا سەربازخانە"، بۆئەوەی لەوێ چاوم بە"هورم هب"بکەوێت، بەڵام بینیم کە سەربازخانەکە کۆمەڵێکی کەمی تێدایە و وەکوو جاران، لەحەوشەی سەربازخانەکەدا

خەریکی زۆربازی نین و مەشق لەسەر تیرهاوێشتن ناکەن و لەدورەوە نیزە ناگرنە کیسەی پڕ لەکای وشك.

ئەفسەری بەشێك لەحەوشەی سەربازخانەکەدا ڕاوەستابوو و بەدەم چەقاندنی پەنجەیی پێی بەزەویدا لێی پرسیم بۆچی هاتوم بۆ ئێرە و چ کارێکم هەیە. منیش لێم پرسی ئایا "هورم هب" لێرەیە، ئەگەر لێرەش نیە، لەکوێ دەتوانم بیدۆزمەوە.

ئەفسەری بەش دوای ئەوەی ناوی "هورم هب"ی بیست سەری دانەواند و من لەم ڕێزەیەوە پەیم بەوە برد کە هێشتا "هورم هب" خاوەنی پلەوپایەی سەربازی خۆیەتی، بەلام سەرەڕای ئەوەش بۆ دڵنیایی خۆم لێم پرسی: ئایا "هورم هب" وەکوو جاران فەرماندەی لەشکرە یان نە؟

ئەفسەری بەش وتی: بەڵێ ئەو وەکوو جاران فەرماندەی لەشکری میسرە، بەلام ئێستا لێرە نیەو ڕۆشتووە بۆ ولاتی "کوش" بۆئەوەی سەربازخانەکانی ئەوێ لەناو ببات و ئەو سەربازانەی لەوێ پاسەوانی دەکەن پەرتەوازەیان بکات، دوای ئەوەش دیار نیە چ کاتێك دەگەڕێتەوە.

من ئەنگوستیلەیەکی زیوم دا بە ئەفسەری بەش و ئەو بەبینینی ئەو نگوستیلەیە زۆر سەری سوڕما و لەکۆشکی خۆ بەزلزانیەوە هاتە خوار و زەردەخەنەیەکی بۆ کردمو وتی: "هورم هب" فەرماندەیەکی مەزنە، لەبەرئەوەی دەزانێت سەربازەکان چیان دەوێت و بەچ شێوەیەك دەبێت ڕەفتاریان لەگەڵدا بکرێت، بەلام فیرعەون وەك بزنێك وایە و ئاگاداری بارودۆخی سەربازەکان نیە و هیچ گرنیگیەکیش بەبارودۆخیان نادات و هەرلەبەرئەوەی "هورم هب" لەئێستادا لێرە نیە، هەر بەوشێوەی خۆت دەبینی سەربازگاکە خاڵیە، لەبەرئەوەی سەربازەکان ڕۆشتون بۆ سواڵ کردن، بۆئەوەی سکی خۆیان تێر بکەن.

بەلام لەبەرئەوەی من ئەفسەری بەشم، ناتوانم بڕۆم بۆ سواڵکردن و داوا لە "ئامون" دەکەم بەبۆنەی ئەوەی ئەم ئەنگوستیلە زیویەت پێداوم پیرۆزت بکات، چونکە چەند مانگێکە نەمتوانیوە بڕۆم بۆ مەیخانە بۆئەوەی ئاوجۆیەك بخۆمەوە، بەلام ئەمڕۆ دەڕۆم بۆ مەیخانە و دەخۆمەوە. پێش ئەوەی بمانکەنە سەرباز، بەڵێنیان پێدابوین ئەگەر ببینە سەرباز، کانزاگەلێکی زۆر دەبێتە بەشمان و هەرکاتێك ژنمان بوێت دێتەبەردەستمان و سکمان بەبەردەوامی پڕ دەبێت لەخواردن و خواردنەوە.

لەسەربازخانەکە هاتمە دەرەوە و بەرەو"ماڵی ژیان"ڕۆشتم، بۆئەوەی سەر کونتێکەری فیرعەون لەوێ ببینم، بەڵام لەوێ پیان وتم دووساڵ لەوەوپێش سەرکونتێکەری فیرعەون مردووە و لاشەیان لەشاری مردووەکاندا ناشتووە.

لەڕێی ئەو قسانەی کە لە"ماڵی ژیان"دا لەگەڵ مندا دەیانکرد، ئاگاداری ئەوە بووم کە فیرعەون بەپەیڕەوی کردنی خودای خۆی کە ناوی"ئاتون"ە دەستی کردبوو بە دەرکردنی ئەو سەربازانەی باوکی بەکرێی گرتبون، لەبەرئەوەی دەڵێن دەیەوێت لەگەڵ هەموو کەسێکدا بەئاشتی بژی و چیتر پێویستی بەسەرباز نیە.

لەکاتی باسکردنی ئەم بەسەرهاتانەدا وتم: لە قوتابخانەی"ماڵی ژیان"دا لەپەرستگای "ئامون"دا خوێندنم تەواو کردووە و لەبەرئەوەی سەردەمانێك لەپەرستگا بوم، ویستم بێم بۆئێرە تا بارودۆخی ئەوێ ببینم و یادی سەردەمی لاویەتیم بکەمەوە.

بینیم کاهینەکان بەسەری تاشراو و بەرۆن چەورکراو و جلوبەرگی سپییەوە زۆر نیگەران دیارن و لەکاتی قسەکردندا بەترسەوە تەماشای چواردەوریان دەکەن، وەك بڵێی لەوە بترسن کەسێك گوێی لەقسەکانیان بێت، کاتێك چاویان بەمن کەوت، نیگاکانیان بەگومانەوە ئاڕاستەدەکردم و لەوانەیە وایان زانیبێت کە من سیخوڕم.

من لەبەردەم پەیکەرە مەزن و کۆنەکانی میسرەوە کە لەپەرەستگای"ئامون"دا دانرابوون تێپەڕیم و خۆم گەیاندە کۆتایی پەرستگاکەوە و لەوێ بەسەرسوڕمانەوە بینیم پەرستگایەکی تازەیان دروست کردووە.

کاتێك من لەپەرستگای ئاموندا بوم، ئەو پەرستگایە بونی نەبوو و دیار بوو دوای دەرچونم لەپەرستگای "ئامون"و شاری"تبس"دروستیان کردبێت.

کاتێك خۆم کرد بەو پەرستگایەدا بینیم دیواری نیە، بەڵکو هەیوانێکی پان و فراوانە و پایەگەلێکی بەرزیان بەچواردەوریدا دروست کردووە و لەلایەکەوە هەیوانێکی کراوەیە، بەواتا بێ پایەیە و میحرابی پەرستگاکەش لەوێیە.

لەمیحراب نزیك بومەوە و بینیم لەباتی ئەوەی دیاریە ئاساییەکان بەواتا، مەڕی قوربانی کراو و کەرەستە پاکیزەکان لەسەر میحرابەکە دابنێن، گەنم و گوڵ و میوەیان دانابوو و بەسەر میحرابەکەشەوە، وێنەیەکی هەڵکۆڵراو لەبەردیان دانابوو کە خودای"ئاتون"یان لەشێوەی بازنەیەکدا پیشان دەدا و لەم بازنەیەشەوە چەند

تیشکێکیان بەچواردەوری بازنەکەدا کێشابوو و هەر تیشکێکیش بەدەستێک کۆتایی دەهات کە"خاچێکی" بەدەستەوە بوو.

کاهینەکانی ئەم پەرستگایە جلی سپیان لەبەردابوو، بێئەوەی سەریان تاشیبێت، هەروەها هەموویان لاون و کاتێک خۆم کرد بەو پەرستگایەدا کاهینەکان چواردەوری محرابیان دا و سوردی پیرۆزیان دەخوێند.

گوێم لەو سرودە گرت و ئاگاداری ئەوە بووم کە ئاهەنگی ئەم سرودە بەلامەوە ئاشنا دیاربوو و ئەو سرودەشم لە"ئۆرشەلیم"کە دەکەوێتە ولاتی سوریاوە بیستبوو، بەلام لەهەموو شتەکانی ئەم پەرستگایە سەیرتر پەیکەری فیرعەون بوو کە بەسەر پایەکانەوە دەبینران.

من پایەکانم ژمارد و بینیم چل پایەیە و بەسەرهەر پایەیەکیشەوە پەیکەرێکی بەردینی فیرعەون کەلەجەستەی مەزنتر بوو دەبینرا. پەیکەرەکانیان بەشێوەیەک دروست کردبوو کە فیرعەون هەردوو دەستی لەسەر سینەی دانابێت، بەدەستێکیەوە قامچی و بەدەستەکەی تری گالۆکی فەرمانڕەوایی بەدەستەوە بوو و هەموو پەیکەرەکانیش تەماشای میحرابیان دەکرد و نازانم چ پەیکەرتاشێک ئەم پەیکەرانەی بەوشێوەیە داڕشتووە، ئەم پەیکەرانەش لەڕێی خوێندکارەکانی خۆیەوە دروست کردبوو، بەلام دەزانم کە پەیکەرتاش بەئەنقەست ویستویەتی کەموکورتیەکانی جەستەی فیرعەون بەپێچەوانەوە نیشان بدات.

بۆ نمونە فیرعەون خاوەنی دەست و پێیەکی لاوازە، بەلام لەپەیکەرەکاندا دەست و پێکانی بەشێوەیەک دروست کردبوو کە وەک بڵێی دەست و پێی فیرعەون وەک خیگەیەکی فوو تێکراو بێت. بەدەر لەئەندامەکانی جەستەی پەیکەرتاش ڕوخساری فیرعەونیش بەتەواوی گۆڕیبوو.

تەواوی هونەرمەندان و پەیکەرتاشانی ڕابردوو کە پەیکەری فیرعەونی کۆنیان تاشیوە، هەوڵی ئەوەیان داوە شێوەی ئەو پەیکەرە لەخودی فیرعەون بچێت و کەسێک هەزاران ساڵ دوای دروستکردنی. پەیکەری فیرعەونێک ببینێت بزانێت ڕوخسار و ئەندامەکانی جەستەی بەچ شێوەیەک بووە، بەلام ئەو هونەرمەندەی پەیکەری فیرعەنی تاشیبو، گوێی بەلێکچونەکان نەداوە و کاتێک مرۆڤێک ڕوخساری فیرعەون بەچەند گۆشەیەکی گەورە و بچوک و قۆنایەکی قیت و ڕۆخسارێکی درێژەوە ببینێت

لەترساندا ڕادەوەشێت، ئەگەر دۆستی هونەرمەندی من"توتمس"لێرە بوایە و تەماشای ئەم پەیکەرانەی بکردایە دەیوت ئەمە قوتابخانەیەکی تازەی هونەری پەیکەرتاشیە و لەهونەری تازەدا شێوەی کەس و شتەکان نابێت لەخودی شتە سەرەکیەکان بچێت، بەڵکو هونەرمەند بەو شێوەیەی کە خۆی شت و کەسەکان دەبینێت دەبێت ڕوخسار و ئەندامیان بکێشێت یان پەیکەریان بۆ بتاشێت، هەروەها شتێکی تر کەبویە مایەی سەرسوڕمانی من ئەوەبوو کە بەچ شێوەیەك فیرعەونی میسر"ئامن هوتب"ی چوارەم ڕازی بووە پەیکەرەکانی بەوشێوەیە بتاشن، ئایا خودی ئەویش بەهەمان ئەو شێوەیە خۆی دەبینی و هەر لەبەرئەوەش ڕەخنەی لەپەیکەرتاشەکان نەگرتووە، ئەگەر نا وەك ئەوکەسانەی دوچاری کوفر و بێباوەڕیەك بون لەسێدارەی دەدان.

من ئاگاداری ئەوە بووم ئەو پەرستگا تازەیە تەماشاکەرێکی زۆری نیە و تەماشاچیەکان لەدوو دەستە پێك دەهاتن، دەستەیەکیان جلی کەتان و ملوانکەی ئاڵتونیان لەملدابوو، کە ئاشکرابوو وەجاخزادە و پایەدارەکانی میسربون و لەبەرئەوەی دەیانبینی ئەم پەرستگا تازەیە فیرعەون گرنگیەکی زۆری پێدەدات، تەنها بۆ چەورەیی کردن دەهاتن بۆ ئەویٚ. دەستەکەی تریان بەخەڵکانێکی ئاسایی و نەزان لەقەڵەم دەدران و سەریان لەسرودی کاهینەکان سوڕ دەما، لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی لەواتاکەی تێبگەن، ئاهەنگی سرودەکەش زۆر بەلایانەوە سەیر بوو، چونکە ئەمانە لەسەردەمی منداڵیەوە خوویان بەسرودگەلێکەوە گرتبوو کە لەسەردەمی دروستکردنی قوچەکیەکانی میسرەوە لەپەرستگاکاندا دەخوێنران و ئەو سرودانە بەشێوەیەك لەڕۆحیاندا جێگیر بوبو، ئەگەر لەخەویشدا گوێیان لیٚ بوایە، دەیانزانی واتای چی دەگەیەنێت، بەڵام گویٚ و ڕۆحیان خوی بەم سرودە تازانەوە نەگرتبوو.

دوای ئەوەی ئەو سرودە خوێنرا، ئەو پیاوەی کە بەسەرچاویدا دیاربوو جوتیارە و لەبیابانەوە هاتووە، لەکاهینەکان نزیك بویەوە و لێیانی پرسی، ئایا ئەکرێت تەلیسم یان چاوی یەکێك لە مەڕەکان یان ئەو "گا"یانەی کە کراون بەقوربانی و لەهەموو نەهامەیتەك دەتپارێزن بەنرخێکی هەرزان بەمن بفرۆشن، بۆئەوەی لەگەڵ خۆمدا بیبەمو لەهەموو هەڕەشەیەك بیپارێزم.

کاهینەکانیش لەوەڵامی ئەو پیاوەدا وتیان:خودای"ئاتون"تەلیسم و چاوی قوربانیەکان نافرۆشێت و پێویستیشی پێیان نیە، بەڵکو هەر کەسێك باوەڕی پێ بهێنێت، بێئەوەی دیاریەکی پێشکەش بکات لەهەموو نەهامەتی و هەڕەشەیەك دەیپارێزێت.

کاتێك ئەو پیاوە ئەم قسەیەی بیست، ڕەنگی گۆڕا و گەڕایەوە و بیستم کە لەبەرخۆیەوە دەمەبۆڵە دەکات و دەڵێت کە خودای"ئاتون"خودایەکی درۆینەیە و دوای ئەوە بەرەو پەرستگاکەی تر بەواتا خودای"ئامون"ڕۆشت بۆئەوەی تەلیسمێك یان چاوێکی قوربانیەکانی لێ وەرگرێت.

ژنێکی نەزان لەکاهینە لاوەکان نزیك بویەوە و وتی: مەگەر خودای ئێوە کە ناوی"ئاتون"ە قوربانی مەڕ و"گا"ی پێشکەش نلکرێت بۆئەوەی گۆشتەکەی بخۆن و قەڵەو بن. ئەگەر خودای ئێوەش هەر بەوشێوەی باسی دەکەن بەهێز بێت، ئەوا دەبێت کاهینەکانی قەڵەو بن، نەك بەوشێوەیە لاواز و بێتوانا بن، ئەم لاوازیەی ئێوەش ئەوە نیشان دەدات کە خودایەکی لاوازتان هەیە، لەکاتێکدا خودای"ئامون"بەهێزە و گۆشت دەدات بە کاهینەکانی و هەرلەبەرئەوەش هەمویان قەڵەون.

یەکێك لەکاهینەکان کە کەمێك لەوانی تر بەتەمەنتربوو وتی:"ئاتون"ڕقی لەقوربانیەو نایەوێت خوێنی گیانەوەرەکان لەپێناو ئەودا بڕێژن، تۆ نابێت لەم پەرستگایەدا ناوی"ئامون"بهێنیت، لەبەرئەوەی"ئامون" خودایەکی درۆینەیە و بەمزوانە تەختی یەزدانی ئەو سەرنگون دەبێت و پەرستگاکەشی وێران دەبێت.

ژنە دوو هەنگاو بۆ دواوە ڕۆشت و تی: ئەی"ئامون"ئاگاداربە من ئەو قسەیەم نەکرد، بەڵکو ئەو پیاوە ئەو قسەیەی کرد و نەفرەتی تۆ دەبێت تەنها ئەو بگرێتەوە نەك من.

ژنە ڕۆیشت لەگەڵ چەند کەسێکی نەزانی تردا کە لەوێ بون، کاهینەکانیش بەگاڵتە و پێکەنینەوە پێیان وتن: بڕۆن هەی کەسانی بێباوەڕ، ئەوە بزانن کە"ئامون"خودایەکی درۆینەیە و زۆر ناخایانێت کە توانای ئەو وەك ئەو گیایەی کە بەداس درەو دەکرێت، لەناو دەچێت.

ئەوکات یەکێك لەوپیاوانە چەمایەوە و بەردێکی لەزەوی هەڵگرت و گرتیە کاهینەکان و هەمان ئەو بەردەش بەر ڕوخساری یەکێك لەوان کەوت و بریندار بوو،

لەهەمان کاتدا کاهینەکانیش پاسەوانانی پەرستگایان بانگ کرد بۆئەوەی ئەو پیاوە دەستگیر بکەن، بەلام ئەو پیاوە هەڵهات و نەیانتوانی دەستگیری بکەن.

ئەوکات لەکاهینەکان نزیك بومەوە و بەڕێزەوە پێم وتن: من میسریم و ماوەیەك لەم ولاتە دور بوم. پێش ئەوەی لەمیسر بڕۆم ناوی خودای"ئاتون"م بیستبوو، بەلام هیچ گرنگیەکم پیّ نەدەدا، دوای ئەوەش بەهۆی ئەوەی لەمیسرەوە دور بوم، نەمتوانی زانیاری تەواو لەبارەی ئەو خودایەوە بەدەست بهێنم و ئێستاش گەڕاومەتەوە و حەز دەکەم بزانم خودای"ئاتون" کێیە؟ و چی دەڵێت و چی دەویّ و بەچ شێوەیەك بیپەرستین؟

کاهینەکان بۆماوەیەك تەماشایان کردم، بۆئەوەی بزانن ئایا دەمەوێت پیان ڕابوێرم یان بەڕاستمە، دوای ئەوەی تێگەشتن کە بەڕاستمە، یەکێك لەوانە وتی:"ئاتون"تاکە خودای ڕاستەقینەیە....تەواوی ئەو خودایانەی لەپێش"ئاتون"ەوە هاتون، خودای درۆینەبون‌و هەموو ئەوانەی لەدوای ئەوەوە هاتون خودای درۆینەن، "ئاتون" ئاسمان‌و زەوی و ڕوباری"نیل"و گیانەوەرە جولاوەکانی دروست کردووە و هەمیشە هەبووە و دوای ئەوەش هەر دەبێت و ئێستاش خۆی پیشانی کوڕی فیرعەون داوە و هەموو کەسێك دەبێت بیپەرستێت. ئەم خودایە بەپێچەوانەی خوداکانی تر کە هەموویان درۆینە بون، نایەوێت خەڵکی دیاری پێشکەش بکات و حەزیش ناکات هیچ کەسێك قوربانی پێشکەش بکات، دەوڵەمەند و هەژار بەیەك چاو تەماشا دەکات و هەر کەسێك باوەڕی پیّ بهێنێت، لەپەنای خۆیدا دەیپارێزێت.

"ئاتون"بەپێچەوانەی خودا درۆینەکانەوە، هەرگیز نامرێت و لەهەموو شوێنێکدا هەیە و هیچ ڕوداوێك بەبیّ ویستی ئەو ڕوو نادات.

وتم: ئەو بەردەی هەر ئێستا ڕوخساری ئەو کاهینە لاوەی بریندار کرد، بەویستی "ئاتون"بەر ڕوخساری کەوتووە، چونکە تۆ دەڵێیت هیچ ڕوداوێك بەبیّ ویستی ئەو ڕونادات.

کاتێك کاهینەکان گوێیان لەم قسەیە بوو، بەسەرسوڕمانەوە تەماشایەکی یەکتریان کرد و وتیان، دیارە تۆ دەتەوێت پێمان ڕابوێری.

بەلام ئەو کاهینەی ئەو بەردەی بەرکەوتبوو، بەدەنگێکی بەرز وتی: بەڵیّ ئەمە بەویستی"ئاتون"ڕویداوە، چونکە من شایستەی ئەو نیم و ئەویش بۆیە ڕێیدا ئەمە

ڕوو‌بدات، بۆئەوەی من خۆم بکەمە کەسێکی شایستەی ئەو، هۆکاری ئەوەی خودای "ئاتون"ئەمەی بەسەر مندا هێنا ئەوەیە، کە من بەهۆی ئەو خۆشەویستیەی فیرعەون هەیەتی بۆ من لەخۆبایی کردبوم و خودی"ئاتون"م فەرامۆش کردبوو و هۆکاری خۆشەویستی فیرعەون ئەوەیە کە خاوەنی دەنگێکی خۆشم و دەتوانم سرود بخوێنم، کاتێك فیرعەون بینی من ئامادەم باوەڕ بەخودای ئەو بهێنم، منی نارد بۆ پەرستگا و گەشتمە ئەم پلەوپایەیە.

وتم: بەوشێوەیەی کە تۆ باسی دەکەیت خودای"ئاتون"ئەوەندە توانای هەیە کە بتوانێت فیرعەون هانی ئەوە بدات لەناکاو پیاوێك لەژێر خاکدا زیندووبکاتەوە و بینێرێتە پەرستگاوە بۆئەوەی ببێتە کاهین.

یەکێك لەکاهینەکان وتی:فیرعەونی ئێمە گوێ بەهەلومەرجی دارایی کەسەکان نادات، بەڵکو سود لەو توانایەی کە"ئاتون"پێی بەخشیوون وەردەگرێت و دڵی خەڵکی بۆ لای خۆی بانگ دەکات و تێدەگات لەوەی ئایا شایستەی ئەوەن پلەوپایەیان بەرز بکاتەوە یان نە؟

وتم: فیرعەون بەچ شێوەیەك دەتوانێت بانگی دڵی خەڵکانی تر بکات و پەی بەو شتە ببات کە لەناو دڵیاندایە، چونکە تەنها"ئوزی ریس[61]" خاوەنی ئەو توانائیەیە و دەتوانێت دڵی خەڵکانی تر بخوێنێتەوە.

کاتێك من ئەم قسەیەم کرد، کاهینەکان لەنێو خۆیاندا دەستیان کرد بەگفتوگۆکردن و ڕاوێژی ئەوەیان لەگەڵ یەکتردا دەکرد بەچ شێوەیەك وەڵامی من بدەنەوە، یەکێك لەوانە وتی:

"ئوزی ریس" خودایەکی پلە دووە بگرە پلە سێیەم و چوارەم و خەیاڵاویە، "ئوزی ریس" هەربونی نیە، بەڵکو خەیاڵپڵاوی خەڵکانی نەزان ئەو خودایەی هێناوەتە بون، بەڵام"ئاتون" بەڕاستی بونی هەیە و خودای نەبینراوە و هەمیشەییە، فیرعەون لەهەمان کاتدا مرۆڤە و هەڵگری گەوهەری"ئاتون"یشە.

---

[61]ئوزی ریس: یەکێکە لەخودا بەناوبانگەکانی میسر و لەبەرئەوەی ناوی ئەم خودایە لەو مێژوانەی کە ئەوروپاییەکان دەربارەی میسر نوسیویانە زیاتر باسکراوە و ناوی هێنراوە، لەنێو خودایانی فیرعەوندا ناوبانگیەکی زیاتری هەیە.

هەرلەبەرئەوە لەیەك كاتدا هەڵگری چەند كەسایەتیەكیە، هۆكاری ئەوەی دەتوانێت دڵی خەڵكانی تر بخوێنێتەوە ئەوەیە لەیەك كاتدا چەند كەسایەتیەكی هەیە و ئەمەش وەك ئەوە وایە كە لەیەك كاتدا چەند كەسێك بێت، هەرلەبەرئەوەش ئەو هونەرمەندەی كە پەیكەری فیرعەونی دروست كرد و تۆ ئەو پەیكەرەت بەسەر پایەكانەوە دەبینی، ئەوی بەشێوەیەك دروست كردووە كە هەم ژن بێت و هەم پیاو.

چونكە گەوهەری خودا لەفیرعەوندایە و بەبۆنەی ئەم گەوهەرەوە توانای ئەوەی هەیە هەم هەڵگری توانای نێرینە بێت و هەم مێیینەش.

من سەرم بەهەردوو دەستم گرت و وتم: من وەك ئەو ژنەی ئێستا لێرە ڕۆشت، پیاوێكی سادەم و ناتوانم لەواتای قسەكانی تۆ تێبگەم و مێشكی من ئەوە پەسەند ناكات كە كەسێك لەهەمان كاتدا هەم پیاو بێت و هەم ژن. هەروەها بیشتوانێت هەم تۆوێك دروست بكات و هەم ئەو كۆرپەیە لەناو سكیدا پەروەردە و گەورە بكات و بیگوازێتەوە بۆ ئەم جیهانە. هەروەها ئێوەش جیاوازی بیروڕاتان لەبارەی خودای "ئاتون"ەوە هەیە و وەك ئەوەی نەزانن ئەو كێیە و چی دەڵێت، چونكە كاتێك من پرسیارێك لەئێوە دەكەم ڕاوێژ لەگەڵ یەكتردا دەكەن و دوای ئەوە وەڵامم دەدەنەوە.

كاهینەكان ناڕەزایی خۆیان لەبەرامبەر ئەم گوتەیەدا دەبڕی و وتیان وا نیە و ئێمە بچوكترین گومان و ناكۆكیمان لەخودای"ئاتون"نیە، چونكە ئەو خودایەكی تەواو و بێ كەم و كورتە و هەمیشە بووە و بەبەردەوامیش دەبێت.

بەڵام ئێمە كەموكورتیمان تێدایە و هەر لەبەرئەوەش ناتوانین خودای "ئاتون"بەتەواوی بناسین، بەڵام هەرچەنێك بیری بخوێنینەوە و بیری لێ بكەینەوە، باشتر و زیاتر دەیانسین، بەدڵنیاییەوە ئێمە لەچەند ساڵێك پێش ئێستا باشتر خودای"ئاتون"دەناسین و بیست ساڵی تریش ناسینی ئێمە لەمڕۆ زیاتر دەبێت و تەنها كەسێك كە بەتەواوی"ئاتون"بناسێت فیرعەونە، چونكە ئەو گەوهەری "ئاتون"ە ، وەك ئەوە وایە ڕۆحی فیرعەون"ئاتون"بێت.

سەرەڕای ئەوەی ئەم قسەیە بەلای منەوە ڕازیكەر نەبوو، بەڵام كاری تێكردم چونكە ئاگاداری ئەوە بوم لەكانگای دڵیانەوە ئەو گوتەیەیان دەربڕی و تێگەشتم لەوەی ڕاستیەك لەم گوتەیاندا شاردراوەتەوە، هەمان ئەو ڕاستیەش ئەوەیە كە ئێمە كەسێكی

تێنەگەشتوین نەك خوداكان، لەبەرئەوەی مێشك و تێگەشتنی ئێمە كەموكورتی تێدایەو واهەست دەكەین كەسانی تریش وەك ئێمە تێنەگەشتوو و بێمێشكن.

تێگەشتم كە ئەكرێت جیهان چەند ڕاستیەك لەخۆ بگرێت كە چاوی ئێمە نایانبینێت و گوێمان نایانبیستێت و دەستەكانیشمان ناتوانێت بەرجەستەیان بكات. لەبەرئەوە كاتێك لەشتێك تێناگەین نابێت نكوڵی لێ بكەین و بڵێین بونی نیە، لەوانەیە خودی فیرعەون ڕاستیەكی بەدەست هێنابێت كە بەناوی"ئاتون"بانگی بكات، بەڵام من مێشك و تێگەشتنێكی دروستم نیە و *ناتوانم لەوە تێبگەم كە"ئاتون"كێیە و چییە؟*

لەبەرئەوەی نەمتوانی هاوڕێ و ئاشناكانی خۆم پەیدا بكەم گەڕامەوە بۆماڵ و بینیم"كاپتا"بەو پێیەی من پێم وت تابلۆیەكی بەسەر ماڵەكەوە هەڵواسیوە و خۆشی لەماڵەوە دانیشتووە و گۆزەیەك ئاوجۆی لەبەردەمی خۆیدا داناوە كە جارجارێك قومێكی لێ دەخواتەوە.

چەند نەخۆشێك لەماڵەكەی مندا دانیشتبوون و چاوەڕی گەڕانەوەی منیان دەكرد، من دایكێكم بانگكرد كە منداڵێكی لاوازی لەباوەشدا بوو پێی وتم: ڕۆژ لەدوای ڕۆژ ئەم منداڵە شیرە خۆرەم لاواز تر دەبێت. من بینیم نەدایك نەخۆشە و نە منداڵەكەی، بۆیە بەدایكەكەم وت: نەخۆشی منداڵەكەت لەوەوە سەرچاوە دەگرێت كە تۆ بەپێی پێویست خواردن ناخۆیت و ئەگەر خواردنی پێویست بخۆیت و بەپێی پێویست شیر بەمنداڵەكەت بدەیت، منداڵەكەت قەڵەو دەبێت. دوای ئەوەی منداڵەكە ڕۆشت پشكنینم بۆ بەندەیەك كرد كە دەستی كەوتبووە داوی ئاشێكی دەستگێڕەوە، تیماری برینەكەیم كرد و بەستم. ئەوكات پشكنینم بۆ پیاوی عەریزە نوس كرد و بینیم دومەڵێك بەئەندازەی مشتێك، لەناوەڕاستی قورگیدا دەرچووە، دەرمانێكم دەرخوارددا كە لەگیایەكی دەریایی دروست دەكرێت و پێم وت: دەبێت ئەم دومەڵە لەناوەڕاستی قورگتەوە بێتە دەرەوە، دوای ئەوە دەبێت بۆماوەیەك ڕاكشێیت، بۆئەوەی ئەو برینە سارێژ ببێت، ئایا ئەكرێت من بێم ماڵی تۆ و لەوێ ئەو دومەڵە لەقوڕگت دەربكەم....پیاویش وەڵامی بەڵێی دایەوە و بڕیار بوو من ڕۆژی دوایی بڕۆم بۆ ماڵی ئەو و ئەو دومەڵە لەقوڕگیدا دەربهێنم.

كاتێك ئەو پیاوە ویستی بڕواتە دەرەوە، دوو ئەنگوستیلەی مسی لەگیرفانیدا دەرهێنا بۆئەوەی لەبەرامبەر ئەو پشكنین و چارەسەركردنەدا پێم بدات، منیش پێم

وت: هێشتا بەتەواوی چارەسەرم نەکردویت بۆئەوەی شتێکت لەبەرامبەردا لێ وەرگرم.

وتی:تۆ دەرمانێکت پێدام و خواردیشمەوە، بۆیە هیچ نەبێت نرخی ئەو دەرمانەت پێ بدەم.

وتم: من بێئەوەی دیاریەك لەتۆ وەرگرم چارەسەرت دەکەم و لەبەرامبەردا ئەگەر ڕۆژێك پویوستم بەعەریزە نوسێك بوو، لەبەرامبەری ئەم چارەسەرکردنەدا سود لەو هونەرەی تۆ وەردەگرم.

دوای ئەوە ژنێکی لاو کە لەیەکێك لەسوزانی خانە دراوسێکانماندا دەژیت، چاوەکانی پێنیشان دام و وتی: چاوم ئازار دەکات و تەنها دەمەوێت ئازاری ئەم چاوەم لەکۆڵ بکەیتەوە.

منیش دەرمانێکم کردە ناو چاویەوە و ژنیش لەوکاتەدا ویستی کرێی چارەسەرکردنەکەم وەك ئەو ژنانەی خۆیان بەهەرزان دەفرۆشن پێبدات، منیش پێم وت: دڵگرانیەکم هەیە کە ناهێڵێت لەگەڵ ژناندا ڕابوێرم. بۆئەوەی خزمەتێکی زیاتری بکەم، دوو هەڵئاوسانی بچوکم بەئەندازەی قۆپچەیەك بەسەرچاویەوە دەرهێنا بۆئەوەی لەبەرچاوی مشتەریەکانیدا ناشیرن دەرنەکەوێت.

لەو ڕۆژەدا بگرە ئەنگوستیلەیەکی مسینیشم لە نەخۆشەکان وەرنەگرت، بۆیە کاتێك ئەوان ڕۆشتن و"کاپتا"خواردنی بۆ هێنام وتی: گەورەم، تۆ ئەمڕۆ، بەو ڕادەیەش سودت لەکارەکەی خۆت وەرنەگرت کە بەهای ئەو خوێیەی من کردومەتە ئەم خواردنەوە بەدەست بهێنی.

"کاپتا"ی بەندەم ئەو خوارنەی کە مراویەکی برژاو بوو، ئەو ڕۆژە لەیەکێك لەچێشتکەرەکانی "تبس"ی سەندبوو و بەگەرمی پاراستبوی بۆئەوەی لەکاتی نانخواردندا دەرخواردم بدات.

لەشاری"تبس"دا مراوی و قازبەشێوەیەك دەبرژێنن کە من هاوشێوەی ئەوم لەهیچ وڵاتێکدا نەبینیوە، لەشاری ئێمەدا دەیخەنە ناو قاپێکی کانزاییەوە و سەری قاپەکە دەگرن، دوای ئەوە ئەو قاپە دەخەنە ناو تەنورێکەوە و لەئەنجامدا مراوی و قاز بەشێوەیەك دەبرژێت و تەواوی چەوری و شلەمەنی ناو گۆشتەکە دەمێنێتەوە و لەناو

ناچێت، ئەم جۆرە خواردنە لەهیچ وڵاتێکدا باو نیە و تەنها لە"تبس"دا ئەم خواردنە خۆشە لێ دەنرێت[٦٢].

"کاپتا"لەو شەوەدا خواردنەوەیەکی پاکی دەرخوارد دام، سەرەڕای ئەوەی من کرێم لەهیچ نەخۆشێکم وەرنەگرتبوو، بەڕادەیەك خۆشحاڵ بوم کە وەك بڵێی بازرگانێکی دەوڵەمەندم چارەسەر کردبێت و لەبەرامبەردا ملوانکەیەکی ئاڵتونی پێشکەش کردبێتم.

ئەوەشی بۆ زیاد بکەم ئەو بەندەی ئەو ڕۆژە پەنجەیم چارەسەر کرد، دوای چەند ڕۆژێك کە پەنجەی بەتەواوی باش بویەوە هات بۆ لام و لێوانێك ئاردی بۆهێنام و وتی: ئەم ئاردەم لەئاشێکدا دزیوە، بۆئەوەی بەهای چارەسەکردنەکەی خۆیم پێبدات، لەبەرئەوەش کاری پزیشکی ڕۆژی یەکەمم بەئەندازەی لێوانێك ئارد سودی هەبوو، بەڵام من ئەو ئاردەم لەو بەندە وەرنەگرت وپێم وت هەڵیگرە بۆ خۆت.

ڕۆژی دوایی، بەندەکەم کە لەماڵ ڕۆشتبووە دەرەوە، گەڕایەوە و پێی وتم:"سینۆهە"وابزانم ئەمڕۆ و ڕۆژەکانی تریش، نەخۆشگەلێکی زۆر سەردانت دەکەن، چونکە کاتێك چومە دەرەوە بیستم خەڵکی دەڵێن لەدوێنێوە پزیشکێك لەماڵی کابرای مسگەردا نیشتەجێ بووە، زۆر زیرەکیشە و نەخۆشەکان چارەسەر دەکات و لەبەرابمەردا هیچیان لێ وەرناگرێت و ئەنگوستیلەی مسیش دەدات بەهەژاران. هەروەها کاپتا دەیوت: هەژارەکان یەکتریان ڕادەسپارد هەرچی زووتر سەردانی ئەو پزیشکە بکەن، بۆئەوەی هەم نەخۆشیەکانیان چارەسەر بکەن و هەم میسیشی لێ وەرگرن، چونکە ئەم پزیشکە کانزا بەسەر خەڵکیدا دەبەخشێتەوە و لەبەرامبەردا هیچیان لێ وەرناگرێت. بۆیە لەماوەیەکی کورتدا بەڕادەیەك هەژار دەکەوێت کە ناچار دەبێت ماڵی خۆی بفرۆشێت و لەو گەڕەکە بار بکات. هەندێکی دیکەش دەیانوت ئەم"سینۆهە"یە لەوانەیە شێت بێت، ئەگەر بەردەوامی بەم کارە شێتانەی بدات، ڕۆژێك دێت لەژورێکی تاریکدا زیندانی دەکەن و زالوی بەسەردا دەڕێژن، بۆئەوەی ئەو شێتیەی لەناو بچێت.

---

[62] ئەم بەشەش لەسەرگوزەشتەی سینۆهە ئەوەمان بۆ دەسەلمێنێت کە لێنانی خواردن لەناو تەنوردا کە ئێمە وامان دەزانی ڕۆمەکان دایان هێناوە و لەوانەوە بۆ ئەوروپا گواستراوەتەوە، ئەمیش میسریەکان دایانهێناوە و شاری"تبس"بەوشێوەیە خواردنی لێناوە.

من کە ئەم گوتانەم لەدەمی خەڵکی بیست، بەگەمژەییان پێکەنیم، چونکە دەمزانی تۆ کە خاوەنی منی پیاوێکی دەوڵەمەندی، بۆیە بەپێی ئەو فەرمانانەی پێتدام کانزاکانی تۆم خستە کارەوە و تۆ دەتوانی تەنها لەقازانجی ئەو ئاڵتونەی هەتە بەباشی بژیت و هەموو شەوێك وەك ئەمشەو، قازێك یان مراویەك بخۆیت.

دوای ئەوە بەندەکەم وتی: بەڵام من لەشتێکی تۆ دەترسم و ئەوەش بەلامەوە ئاسایی نەبوونی تۆیە، تۆ کەسێکی ئاسایی نیت و هەر لەبەرئەوەش لەوانەیە ڕۆژێك هەوڵی ئەوە بدەیت هەرچی زێڕت هەیە فڕێی بدەیت و ئەم خانووەش بەمن بفرۆشی کە بەندەی تۆم ، چونکە جارێکیان ئەم کارەت کردووە و من و ماڵی خۆت فرۆشت بەو ژنەی کە ئاشقی بویت، ئەگەر منیش هەڵنەهاتایام ئێستا بەندەی ئەو ژنە بووم، بۆیە سبەی دەبێت عەریزەیەکم لەڕێی عەریزە نوسێکەوە بۆ بنوسیت و لەو نوسراوەدا بڵێیت من ئازادم و دەتوانم بەئاسودەیی، بۆ هەرکوێیەك حەزی لێ بکەم بڕۆم و هیچ کەسێکیش ناتوانێت بمکڕێت، چونکە چیتر بەندەی هیچ کەسێك نیم.

منیش لەبەرئەوە ئەو نوسراوەم لەتۆ دەوێت، چونکە قسە لەناو دەچێت، بەڵام نوسراو بۆ هەمیشە دەمێنێتەوە، پاپیرۆس"پاپیرۆسی میسری ئەو سەردەمە" بەهیچ شێوەیەك لەناو ناچێت.

*بەشی بیست و هەشتەم*

# نیگەرانی خەڵکی تبس بۆ ئاینده

ئەو شەوەی"کاپتا"ئەو قسەیەی کرد، من بەبۆنەی ئەوەی لە"تبس"دا کەسە هەژارەکانم بەخۆڕایی چارەسەر کردووە زۆر خۆشحاڵ بوم و خواردن و خواردنەوەکەش خۆشحاڵی منیان زیاتر کرد.

بەهار بوو و گوڵی"ئەقاقیا"[63]ش هەوای بۆندار دەکرد و لە لەنگەرگای ڕوباری نیلیشەوە بۆنی کاڵاکانی سوریا دەهات و لەماڵە سۆزانیەکانیشەوە موزیکی سریانی دەبیسترا و کونەپەپووەکانیش دەیانخوێند و منیش ڕۆحی خۆمم بەخۆشحاڵ دەبینی، هەرلەبەرئەوەش ڕێم بە"کاپتا" دا کە لەکاسەیەکی گڵیندا خواردنەوە بۆخۆی تێبکات‌و دوای ئەوە پێم وت:"کاپتا" پێش ئەوەی تۆ داوای ئەوەم لێ بکەیت کە ئازادت بکەم، من لەناخەوە تۆم ئازاد کردبوو.

ئازادی تۆ لەو ڕۆژەوە دەستی پێکرد کە من و تۆ دەمانویست لەم شارە هەڵبێین و تۆش پاشکەوتی کۆکراوەی تەمەنێکی خۆتت بەمن دا، بۆئەوەی بتوانین پێکەوە هەڵبێین.

ئەوڕۆژە من بڕیارم دا هەر ئەوەی سامانم کەوتەوە دەست و دەوڵەمەند بوم، ئازادت بکەم و دوای ئەوە پێت بڵێم ئەگەر حەز دەکەیت وەك خزمەتکارێك"نەك بەندە" لەلای من بمێنەرەوە، ئەگینا بڕۆ بۆ هەرکوێ کە خۆت حەزت لێیەتی.

ئێستاش پێت دەڵێم ئازادی و بۆ دڵنیاییشت سبەی لەڕێی عەریزە نوسێکەوە شتێکت بۆ دەنوسم کە تۆ ئەو دڵنیاییە بەدەست بهێنی کە ئازادی، بەڵام لەبەرئەوەی

---

[63] بڕۆ بۆپەراوێزی ژمارە "٥"

وتت من لەرێی سود و قازانجی زێڕ و زیوی خۆمەوە دەتوانم بژیم، پێم بڵێ بەچ شێوەیەك زێڕ سود و قازانج بەمن دەگەیەنێت، مەگەر تۆ هەربەوشێوەی کە پێم ڕاسپاردی ئاڵتونەکانی منت وەك ئەمانەتێك نەسپاردووە بە پەرستگای"ئامون"؟

"کاپتا" بەتاکە چاوەکەی تەماشایەکی کردم و وتی:نەخێر"سینۆهە"، ئێستا کەمن ئازادم پێت دەڵێم من فەرمانەکانی تۆم جێبەجێ نەکردووە و ئاڵتونەکانی تۆشم وەك ئەمانەتێك نەسپارد بە پەرستگای"ئامون"، لەبەرئەوەی فەرمانەکانی تۆ لەهزر و مێشکەوە زۆر دورە و منیش ئەو فەرمانانەی کە پێچەوانەی مێشك بن جێبەجێ ناکەم. لەبەرئەوەی دەزانم لەوانەیە لەناکاو لێم تورە ببیت، بۆیە بۆ تەنگانە گاڵۆکەکەتم شاردووەتەوە بۆئەوەی نەوەك بەو گاڵوگەت بتەوێت شان و پشتمی پێ بکوتیت، بەڵام بۆئەوەی بزانی بۆچی فەرمانەکانی تۆم جێبەجێ نەکردووە، دەڵێم تەنها کەسە گەمژەکەکان ئاڵتونەکانیان دەسپێرن بەپەرستگاکان، چونکە وەك ئەمانەتێك ئاڵتون بە پەرستگای سپاردن دوو کەم و کورتی مەزن لەخۆ دەگرێت.

یەکەم:کاتێك کاهینەکان و دواجار فیرعەونی میسر پەی بەسەروەت و سامانی تۆ ببەن، ئاگاداری ئەوە دەبن کە تۆ چەنێك زێڕ و زیوت هەیە و یەکێك لەو کارانەی کە بەڵگەی شێتی تۆیە ئەوەیە کە نابێت مرۆڤ ئاستی دارایی خۆی بەهیچ کەسێك بڵێت.

دووەم:کاتێك تۆ ئاڵتونەکانی خۆت وەك ئەمانەتێك بەپەرستگا بسپێری، بۆئەوەی لەخەزێنەی پەرستگادا بمێنێتەوە، دەبێت هەموو ساڵێك بڕێك لەهەمان ئەو زێڕە، وەك کرێ بدەیت بەخەزنەداری پەرستگا و لەئەنجامدا ساڵ لەدوای ساڵ بڕی ئاڵتونەکەت کەم دەبێتەوە.

ئەوەبوو کاتێك تۆ لەماڵ ڕۆشتیتە دەرەوە بۆئەوەی بەنێوشاردا پیاسە بکەیت و هاوڕێ کۆنەکانی خۆت ببینی، من ڕۆشتم بۆ ناو شار بۆئەوەی بزانم بەچ شێوەیەك دەتوانرێت ئاڵتونەکان بخرێنە گەڕ، بۆئەوەی مرۆڤ بێئەوەی کارێك ئەنجام بدات و خۆی بخاتە نەهامەتیەوە لەقازانجەکانیان بەهەرمەند بێت و سودیان لێ وەرگرێت. من ئاگاداری ئەوەبووم کە هیچ کەسێك لەشاری"تبس"دا ئاڵتونی خۆی وەك ئەمانەتێك ناسپێرێتە پەرستگای"ئامون"، لەبەرئەوەی بۆ سپاردنی زێڕەکان بە شوێنێك، ناتوانرێت متمانە بە پەرستگاکان بکرێت، ناچار لەسەرتاسەری میسردا، شوێنێکی دڵنیابەخش بەدی ناکرێت کە مرۆڤ بتوانێت زێڕەکانی خۆی پێ بسپێرێت.

ئەو زانیاریانەی تر کە بەدەستم هێنا ئەوەیە کە خودای"ئامون"زەویەکانی خۆی دەفرۆشێت.

وتم: درۆ دەکەیت و خودای"ئامون"بەواتا پەرستگای"ئامون"هەرگیز زەوی نافرۆشێت، بەڵکو بەردەوام زەوی دەکڕێت و هەموو ساڵێك سەروەت و سامانی خۆی زیاتر دەکات.

"کاپتا"وتی: بەڵام ئێستا پەرستگای"ئامون"بەنهێنی زەویەکانی خۆی دەفرۆشێت و ئەو زەویانە بەزێڕ دەگۆڕێتەوە و لەخەزێنەکەی خۆیدا هەڵیاندەگرێت، بەهۆی ئەوەی پەرستگای "ئامون" زەویەکانی خۆی فرۆشتووە و زێڕ و زیوێکی زۆری کۆکردووەتەوە، ئێستا لەمیسردا زێڕ و زیو کەمبووەتەوە و بەکەمی دەست دەکەوێت.

وتم: ئایا بەزێڕی من زەویت کڕیوە؟

"کاپتا" وتی: گەورەم نەخێر، من بەزێڕی تۆ زەویم نەکڕیوە، لەبەرئەوەی نە من و نەتۆ شارەزاییمان لەبواری جوتیاریدا نیە، ئەگەر بەزێڕەکەی تۆ زەویم بکڕیایە، سەرپەرشتانی کێڵگە و ئەو بەندەانەی کە لە کێڵگەکەی تۆدا کار دەکەن، بەهەرمی کێڵگەکەی تۆیان لەمن دەدزی و ئێشتاش کە من لەشاری"تبس"دا دزی دەکەم، واتای ئەوە دەگەیەنێت کە خەڵکی فریو دەدەم.

چیتر دوای ئەوە هەستم بەوە کرد کە فرۆشتنی زەوی لەلایەن پەرستگای"ئامون" بەواتا لەلایەن پەرستگایەك کە زیاد لە سەد ساڵ دەبێت خەریکی کڕینی زەویە، بەدڵنیاییەوە هۆیەکی لەپشتەوەیە و ئەو پەرستگایە دەزانێت کە ناتوانێت لەداهاتودا لەبەرامبەر خودای تازەدا بەرنگاری لەخۆی بکات و دەبێت لەناو بچێت، هەرلەبەرئەوەش پێشوەخت زەویەکانی خۆی دەفرۆشێت، بۆئەوەی خودا تازەکەمان دەست بەسەر زەویەکانیدا نەگرێت. هەرلەبەرئەوەش کڕینی ئەو زەویانەی کە پەرستگا"ئامون"دەیانفرۆشێت زۆر هەڕەشە ئامێزە، چونکە لەوانەیە خودای تازە، بانگەشەی ئەوە بکات کە تەواوی زەویەکانی خودای ڕابردوو کە لەلایەن ئەوەوە فرۆشراوە بەخەڵکی، بەوەوە پەیوەست دەکرێت و بەهی خۆی دەزانێت و تەواوی ئەو زەویانەی خەڵکی لەپەرستگای"ئامون"یان کڕیوە، دەستیان بەسەردا بگرێتەوە، بێئەوەی بەهای کڕینی ئەو زەویانە بگەڕێنێتەوە بۆئەو کەسانەی کە کڕیویانە.

وتم: ئەوانەی ئێستا باست کردن، چەند بابەتێکی جیاواز بوو لەو شتەی کە لێم پرسیت، چونکە من لێم پرسیت، چیت لەئاڵتونەکانی من کرد لەچ بوارێکدا خستونتە گەڕ کە دەڵێیت دەتوانم قازانجێکی زۆریان لێ وەرگرم.

"کاپتا"وتی:لەبەرئەوەی پەرستگای"ئامون"زەویەکانی خۆی دەفرۆشێت و زێڕ و زیو کۆدەکاتەوە، هەربەوشێوەی بۆم باسکردکردی زێڕ و زیو لەمیسردا نەماوە و کەمی زێڕ و زیو بووەتە هۆی ئەوەی نرخی ماڵ بەگشتی و هەموو ماڵێکی نیشتەجێ بون و ناوچە بازرگانیەکان دابەزێت، کاتێك زانیم نرخی خانوو هەرزان بووە، بەئاڵتونەکانت هەندێك خانوی نیشتەجێبون و چەند ناوچەیەکی بازرگانیم کڕیوە و تۆش ئەم ماڵانە دەدەیت بەکرێ و هەموو ساڵێك کرێی ئەم خانوانە وەردەگریت و بەبەردەوامیش خانووەکانت وەك خۆی دەمێنێتەوە و سود و قازانجێکی زۆریشت پێ دەبەخشن، لەبەرئەوەی لەلایەن تۆوە دەستەڵاتی تەواوم بۆ کڕێنی ئەم خانوانە هەیە، بێ "مۆر"ی تۆ ئەو خانوانەم کڕیوە، ئەگەر فرۆشیاران وەك حەقی زەحمەتێك شتێکم پێ بدەن، ئەوا ئەم جۆرە دیاریانە بەهیچ شێوەیەك بەتۆوە پەیوەست ناکرێت، بەڵکو بەگەمژەیی خۆیانەوە پەیوەست دەکرێت، چونکە لەم کارەمدا من هیچ شتێك لەتۆ نادزم، بەڵکو لەکڕیاران شتێك وەردەگرم و ئەگەر تۆش حەز بکەیت دیاریەك بەبەندەی ڕابردوی خۆت بدەیت، لێتی وەردەگرم.

وتم:"کاپتا"من هیچ دیاریەکت پێنابەخشم، لەبەرئەوەی دەزانم کە تۆ لەمکارەدا، سەرەتا بەرژەوەندی خۆت لەبەرچاو گرتووە و پێشبینی ئەوە دەکەیت کە لەڕێی وەرگرتنی کرێی خانووەکان، هەروەها لەڕێی کڕینی شتومەکی ناوماڵ، بەناونیشانی پێویستیەکانی ماڵ، سامانێکی زۆرت لەمن دزیوە.

"کاپتا"وتی: وانیە، ئەگەر تۆ خاوەنێکی ستەمکار و پارەپەرست بویتایە، لەوکاتەدا بیرم لەوەی تۆ باستکرد دەکردەوە و پێشبینی ئەوەم دەکرد کە بەچ شێوەیەك لەئایندەدا سود لەم ماڵانەت وەرگم، بەڵام تۆ کەسێکی بەبەزەیی و بەڕێزی، بۆیە پێویست بەوە ناکات بیر لەو جۆرە شتانە بکەمەوە، چونکە ئەوەی تۆ هەتە، لەژێردەستی مندایە و منیش ماڵی تۆ بەماڵی خۆم دەزانم. کاتێك پارێزگاری لەبەرژەوەندیەکانی تۆ دەکەم، لەڕاستیدا پارێزگار لەبەرژەوەندیەکانی خۆم دەکەم و

هەرلەبەرئەوەش بەبڕێکی تری زێڕ و زیوەکەت پێشوەخت دانەوێڵەم لە جوتیارەکان کڕیوە.

وتم: "کاپتا" بۆچی دانەوێڵەت کڕیوە؟

"کاپتا"وتی: ئەو کێشمەکێشەی کە ئێستا لەنێوا ئەو دوو خودایەدا بەرپا بووە، بەدڵنیاییەوە بۆ نەتەوەی میسر نەهامەتی و بەدبەختییەکی زۆر لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، لەبەرئەوەی هەرکاتێك خوداکان لەگەڵ یەکتردا بەشەڕ بێن، دەقاودەق وەك ئەوکاتانە وایە کە شەڕ لەنێوان دوو کەسی مەزندا بەرپا دەبێت و باجی ئەو شەڕەش بەدڵنیاییەوە دەبێت خەڵکی بێدەرەتان بیدات و خەڵکیش دەبێت لەپێناو ئەم جەنگەدا قوربانی پێشکەشی خوداکان بکەن، وا هەست دەکەم بەهۆی جەنگ و کێشمەکێشی ئەم دوو خودایەوە بارودخۆی میسر بێسەر و بەرە و کەس بەکەس بێت و کێڵگە بەپیتەکانیش دەگۆڕێت بەبیابانە سوێرەکان. سەرەڕای ئەوەش، ئەمڕۆ، ئەوانەی زێڕ و زیویان هەیە لەترسی جەنگی خوداکان زەوی دەکڕن، لەبەرئەوەی دەزانن زێڕ و زیو دەدزرێن، بەڵام ناتوانرێت زەویەکان بدزرێن.

ئەوکەسانەی زەوی لەپەرستگای"ئامون"دەکڕن، هەموویان بازرگانن یان یەکێکن لەپایە بەرزەکانی ئەم وڵاتە یان کاهینەکانن، بۆئەوەی لەژێر ڕکێفی پەرستگا دەری بهێنن و بیکەنە هی خۆیان، بەڵام هیچ یەکێك لەم کەسانە جوتیارنین و ناتوانن گشتوکاڵی تێدا بکەن، لەئەنجامدا تەواوی ئەم کێڵگانە دەبنە"بەیار"و بەروبومی دانەوێڵەش زۆر کەم دەبێتەوە و لەئەنجامدا میسر گرفتاری کەمی خۆراك دەبێت، ئەوکات ئێمە دەتوانین ئەو دانەوێڵەیەی خۆمان بەنرخێکی باشتر بفرۆشین.

من دەزانم کە تۆ واهەست دەکەیت دانەوێڵە وەك بەرد نیە کە هەزاران ساڵ بمێنێتەوە، بەڵکو مشکەکان دانەوێڵە دەخۆن و بەندەکانیش دەیدزن، بەڵام تا ئەوکاتەی مرۆڤ بەرگەی زیان نەگرێت، ناتوانێت سود و قازانج بکات و من بەشێك لەم ماڵانەی کە کڕیومن بۆ هەڵگرتنی ئەو دانەوێڵانەی کە کڕیونم تەرخان کردووە و چاودێریان دەکەم، بۆئەوەی نە مشك دانەوێڵەکان بخوات و نە بەندەکانیش بیدزن. ئەوڕۆژەش کە دانەوێڵەکەمان فرۆشت و چیتر پێویستمان بەخەزێنەکان نەبوو، بەکرێ دەیاندەین بەبازرگانەکان، بۆئەوەی کاڵاکانی خۆیان تێدا هەڵگرن یان بازرگانی تێدا بکەن.

وتم: "کاپتا"من بەپێچەوانەی تۆوە، بەهیوای ئەوە نیم کە ئەم جۆرە کارانە قازانجم پێ بگەیەنێت، بەڵام لەوەیکە ئەم جۆرە مامەڵانەت ئەنجام داوە من هیچ ڕەخنەیەکت لێناگرم، بەمەرجێك لەئایندەدا بەبۆنەی بەڕێوەبردنی کاروباری ئەم ماڵانە و فرۆشتنی دانەوێڵەکان تۆشی سەرئێشەم نەکەیت.

"کاپتا"وتی:من بیرۆکەیەکی ترم لەسەردایە کە بۆ دەوڵەمەندبونی تۆ زۆر بەسودەو ئەویش کڕینی یەکێك لەبازاڕەکانی کۆیلە فرۆشیە، هەرچەند من سەرم لەکاری جوتیاری دەرناچێت، بەڵام تاحەز بکەیت لەکڕین و فرۆشتنی کۆیلەدا شارەزاییەکی تەواوم هەیە و دەزانم بەچ شێوەیەك دەبێت کۆیلەکان بەنرخێکی هەرزان بکڕیت و کەموکورتیەکانیان بشاریتەوە، بۆئەوەی کڕیاران هەست بەو کەم و کورتیانەیان نەکەن، هەروەها دەشزانم بەچ شێوەیەك دەبێت لەڕێی قامچی و دار کۆیلەکان بکەیتە کەسێکی گوێڕایەڵ، چونکە خۆم کۆیلە بوم، کەسێکیش پێشتر خۆی کۆیلە بوبێت، ئاشنای هەموو نهێنیەکی کۆیلە فرۆشیە و من ئەو دڵنیاییەت پێدەبەخشم ئەگەر ئێمە ئەم بازاڕە بکڕین، دوای چەند ساڵێك تۆ دەبیتە دەوڵەمەندترین کەسی میسر.

وتم: "کاپتا"سەرەڕای ئەوەی لەکۆیلە فرۆشتندا قازانجێکی زۆر دەکەیت بەڵام من حەزناکەم کڕین و فرۆشی کۆیلە بکەم، لەبەرئەوەی کۆیلەفرۆشی کارێکی پیس و نەفرەتئامێزە. من دەزانم کە زۆرێك لەسەوداگەرەکان ئەم کارە دەکەن و هەموویان کۆیلە دەکڕن و هەمویان پێویستیان بەکۆیلەیە و منیش لەڕابردوودا تۆ و ئەو کەنیزەکەی کە بۆت هێنام کڕیوە، بەڵام ئەمڕۆ حەزناکەم کڕین و فرۆشتن بەسەر کۆیلەوە بکەم.

"کاپتا"هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا و وتی:من نازانم تۆ بۆچی وایت و لەبەرچی ناتەوێت وەك ئەوانی تر بۆ ماوەیەکی کەم بێدەردیسەری، کەسێکی دەوڵەمەندت لێ دەربچێت، ئێمە ئەگەر بازاڕێکی کۆیلەفرۆشتن و چەند "سۆزانی خانەیەکمان بکڕیایە، کەنیزە جوانەکانمان لەبازاڕی کۆیلەفرۆشیەوە دەگواستەوە بۆ ماڵە گشتیەکان و هەموو شەوێك قازانجێکی باشمان لەو ماڵانە دەکرد. بەڵام چی بکەم کە خوداکان منیان توشی خاوەنێك کردووە کە سەلیقەیەکی جیاوازی لەوانی تر هەیە، بەڵام ئێستاش کە ناتەوێت بازاڕی کۆیلەفرۆشی و سۆزانیخانەکان بکڕیت، هیچ نەبێ ئەم داواکاریەم پەسەند بکە.

پرسیم: داوای چیم لێدەکەیت؟

"کاپتا" وتی: لەبەرئەوەی ئەمڕۆ تۆ منت ئازاد کردووە، حەز دەکەم بەم بۆنەیەوە ئاهەنگێك بگێڕین، سەرەڕای ئەوەی تۆ ئەم داوایەی من بە بێشەرمی لەقەڵەم دەدەیت، حەزدەکەم لەگەڵ مندا بێیت بۆئەوەی پێکەوە لەمەیخانەی"کلکی تیمساح"کە لەناو لەنگەرگایەکی کەنار ڕوباردایەدایە، بخۆینەوە و ئەو خواردنەوەیەی ئەوێش بەهێزە و لەخواردنەوەکانی تر نەشئەبەخشترە.

سەرەڕای ئەوەی داواکەی"کاپتا"بێشەرمی بوو، چونکە نابێت خزمەتکار یان بەندە داوای ئەوە لەخاوەنەکەی بکات کە لەگەڵیدا بڕوات بۆ مەیخانە و لەوێ شتێك بخۆنەوە، بەڵام من داواکەیم پەسەند کرد. چونکە ئەو شەوە زۆر خۆشحاڵ بوم و واهەستم دەکرد ڕۆشتن بۆ مەیخانە و لەوێدا خۆشگوزەراندن، بێ بۆنە و مەبەست نیە.

لەوکاتەدا ئەوەم هێنایەوە یاد خۆم، کاتێك ئێمە لە"کریت"دا بوین"کاپتا"ئامادە بوو لەگەڵ مندا بێتە ناو ماڵی خوداوە، لەکاتێکدا دەیزانی هیچ کەسێك لەکاتی چونە ژورەوەدا چیتر گەڕانەوەی بۆ نیە. منیش ئێستا هەر لەبەرئەوە دەبێت داواکەی پەسەند بکەم و لەگەڵیدا بڕۆم بۆ مەیخانە، چونکە ڕۆشتن بۆ مەیخانە زۆر ئاسانترە لەوەیی مرۆڤ بزانێت دەڕوات بۆ شوێنێك کە چیتر ناتوانێت بگەڕێتەوە.

کاتێك"کاپتا"بیستی من داواکەی ئەوم پەسەند کردووە، زۆر خۆشحاڵ بوو و ڕۆشت باڵاپۆش و گاڵۆکەکەم کە شاردبویەوە بۆ هێنام و باڵاپۆشەکەی خستە سەرشانم و گاڵۆکەکەشی دا بەدەستمەوە، دوای ئەوە پێکەوە ڕۆشتینە دەرەوە و بەرەو مەیخانەی"کلکی تیمساح"کەوتینە ڕێ.

فرۆشگای"کلکی تیسماح"لەناوەڕاستی ناوچەی لەنگەرگا دەکەوێتە نێوان دوو ماڵەوە، پێش ئەوەی بچینە ناو مەیخانەکەوە، من بینیم بەسەر مەیخانەکەوە، تیمساحێکی گەورەی وشك کراو هەڵواسراوە کە چاوێکی شوشەیی هەیە و بەهۆی دەمی کراوەیەوە ددانە تیژەکانی پێنیشان دەداین.

کاتێك پێمان نایە ناو مەیخانەکەوە بینیم مەیخانەکە دیوارێکی ئەستور و بەهێزی هەیە و سودی ئەم دیوارە ئەستورانەش ئەوەیە کە لەوەرزی هاویندا فێنکی و لەوەرزی زستاندا گەرمی ناو مەیخانەکە دەپارێزێت.

لەشێوازی چونە ژورەوەی"کاپتا"تێگەشتم کە ئەو جارێکی تر هاتووەتە ئەم مەیخانەوە، ئاشنای ئەو ناوچەیە و دوای ئەوەی دانیشتین، بینیم زەوی و دیواری ئەو مەیخانەیە وەك ماڵی کەسە دەوڵەمەندەکان بەتەختەدار داپۆشراوە و لەسەر تەختەداری دیوارەکاندا وێنەگەلێکی جۆراوجۆریان لەسەر کێشراوە.

کاتێك"کاپتا"بینی تەختەی زەوی و دیوارەکانی ئەو مەیخانەیە سەرنجی منیان ڕاکێشاوە، وتی: هەریەك لەتەختە دیواری ئەم مەیخانەیە، لەتەختەی هەڵوەشاوەی کەشتیە کۆنەکانەوە بەدەست هاتووە و هەریەك لەم تەختەدارانەش لە کەشتیەکی جیاوازەوە هێنراوە کە سەردەمانێك لەدەریادا دەریاوانیان دەکرد، با و باران ڕنگی تەختەکانی گۆڕیوە.

ئەو کڕیارانەی کە لەناو ئەو مەیخانەدا بون، بەکونجکاویەوە تەماشایەکیان کردم، دوای ئەوەی خۆیان سەرقاڵی کارەکانی خۆیان کرد.

"کاپتا"فەرمانی دا"کلکی تیمساح"مان بۆ بهێنن و بەخاوەنی مەیخانەکەی وت:کە خواردنەوەکانی ئێمە خودی ئەو ئامادەیان بکات و دیاربوو"کلکی تیمساح" خواردنەوەیەك بێت کە دەبێت پێشتر ئامادە بکرێت، بەواتا وەك خواردنەوەکانی تر نیە کە بێ دەردیسەری لەگۆزەوە بیرێژنە ناو پێکەکانەوە و بیانهێنن.

دوای ئەوە بینیم ژنێك دوو پێکی بەدەستەوەیە و بەرەو ڕوی ئێمە هات و لەسەروچاویدا دیاربوو کە خزمەتکاری ئەو مەیخانەیە. ئەو ژنە زۆریش لاو نەبوو و لەوڵاتێکی وەکوو میسردا کە ژنەکانی ڕوتن، بەڵام ئەو ژنە جلی لەبەردابوو و گوارەیەکی خڕی زیوی بەگوێیەوە هەڵواسیبوو هەروەها دوو بازنەی ئاڵتونی لەهەردوو مەچەکیدا بەدی دەکران. هەرچی نزیکتر ببوایە، جوانتر دەهاتە بەرچاوم و کاتێك گەشتە لامان بینیم کە ئەبرۆیەکی باریك و کەوانەیی و چاوێکی سەرنج ڕاکێشی هەیە و پێستیشی گەنم ڕەنگە. کاتێك تەماشای چاوانیم کرد، ئەو وەك هەندێك لەژنەکان کە لەو جۆرە کاتانەدا سەریان وەردەگەڕێنن، سەری وەرنەگەڕاند، بەڵکو تەماشای هەردووچاوی منی دەکرد. من یەکێك لەو پێکانەم لەدەستی ئەو ژنە سەند و پێکی دووەم"کاپتا"لێی وەرگرت و پێم وت: ژنی جوان ناوت چیە؟

ژنیش وتی: ناوم"مریت"ە و هیچ کەسێك من بەناوی ژنی جوان بانگم نەکات، بەڵام لەبەرئەوەی تۆ منت بەوناوە بانگ کرد، تێگەشتم کە تۆ پیاوێکی شەرمنی و وەك

لاوێکی تازە پێکەشتوو ئەو بوێریە بەخۆی دەدات کە ئەم جۆرە وشانە بهێنێتە زمان، تەنها بۆئەوەی بتوانێت دەستی خۆی بخاتە سەر دەستی ژنێك. تۆش بەهەمان شێوە ئەو بوێریەت بەخۆت دا کە دەستت بخەیتە سەر دەستم.

دوای ئەوە لێی پرسیم: ئایا تۆ پزیشك نیت و ناوت"سینۆهە"نیە؟

وتم: بۆچی نا.

وتی: ئەگەر حەزدەکەیت جارێکی تر لەم مەیخانەیەدا بەبینینی من خۆشحاڵ ببیت بە"ژنی جوان"بانگم مەکە و سوکایەتیشم پێ مەکە.

لێم پرسی:تۆ لەکوێوە زانیت کە من"سینۆهە"م؟

"مریت"وەتی:ناوبانگی تۆ لەخۆت زووتر گەشتە ئەم مەیخانەیە و بەشێوەیەك ناوبانگت دەرکردووە کە هەرئەوەی خۆت کرد بەم مەیخانەدا تۆم ناسیەوە و ئێستاش دەزانم کە ئەم ناوبانگەت بێهۆ نەبووە.

کاتێك"مریت"لەگەڵ مندا قسەی دەکرد زەردەخەنەی بۆ دەکردم، بەڵام دەمزانی کە زەردەخەنەکانی لەخۆشحاڵیەوە سەرچاوە ناگرێت، بەڵکو هیمای خەم و خەفەتە و لەچاوانی ئەو ژنەدا هەست بە کاریگەری ئەو خەمباریانە دەکرێت.

وتم:"مریت"ئەگەر لەدەمی"کاپتا"کە لێردایە و لەڕابردوودا بەندەی من بووە و من ئەمڕۆ ئازادم کردووە، باسی منت بیستبێت، ئەوا لەوە دڵنیابە کە نابێت متمانە بەقسەکانی ئەو بکەیت، چونکە ئەم پیاوە سروشتێکی تایبەت بەخۆی هەیە و گەوهەرو ناوەڕۆکی سروشتی ئەویش بەشێوەیەکە کە زمانی ناتوانێت ڕاست و درۆکان لەیەکتر جیابکاتەوە و زۆربەی جاریش درۆ دەکات. من سەرەڕای ئەوەی پزیشکم نەمتوانی چارەسەرێك بۆئەم نەخۆشیەی بدۆزمەوە، بەلێدانی گاڵۆکەکەشم نەمتوانی چارەسەری ئەم نەخۆشیەی بکەم.

"مریت"بەخەمێکەوە زەردەخەنەیەکی کرد و وتی:"سینۆهە"درۆ، لەزۆر کات و هەولومەجدا لەڕاست باشترە، لەبەرئەوەی درۆ مرۆڤ هیوادار و خۆشحاڵ دەکات، لەکاتێکدا قسەی ڕاست نائومێدی لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت.

بۆنمونە کاتێك بەمن دەڵێیت"ئەی ژنی جوان"سەرەڕای ئەوەی دەزانم درۆم لەگەڵدا دەکەیت، بەو درۆیەت دڵخۆش دەبم، بەڵام حەز دەکەم لەو خواردنەوەیەی"کلکی

تیمساح"کە من بۆم هێناویت بخۆیەتەوە و پێم بڵێی ئایا ئەم خواردنەوەیە بەهێزەترە لەو خواردنەوانەی کە لەدەرەوە خواردوتەتەوە؟

منیش بێئەوەی چاوم لە"مریت"هەڵبڕم قومێکم لێ خواردەوە، بەڵام دوای ئەوە نەمتوانی تەماشای بکەم، چونکە قورگ و دوای ئەوەش ورگم ئاگری تێبەربوو و لەناکاو خوێنی جەستەم دەستی کرد بەهەڵقوڵان و دوای ئەوەی هێور بومەوە و دیاردەکانی نەشئەی ئەو خواردنەوەیە دەرکەوتن، وتم: سەرەڕای ئەوەی زۆرجار "کاپتا" درۆ دەکات، بەڵام ئەوەی لەبارەی ئەم خواردنەوەیەوە باسی کرد ڕاست بوو. چونکە ئەم خواردنەوەیەی تۆ لەتەواوی ئەو خواردنەوانەی کە لەوڵاتانی دەرەوە خواردومەتەوە بەهێزترە و گەرمی ئەم خواردنەوەیەش، زۆر لەو ڕۆنە ڕەشە گەرمترە کە دانیشتوانی"بابل"لەژێر زەویدا دەری دەهێنن و لەداگیرساندنی چراکانیاندا سودی لێ وەردەگرن[٦٤]، هەروەك چۆن تیمساحێکی ڕاستەقینە بەیەك قەپ، پیاوێکی بەهێز دەدات بەزەویدا، ئەم خواردنەوەی تۆش پیاوێکی بەهێز لەخشتە دەبات.

لەقوڕگمەوە هەستم بەبۆن و تامی خۆشی چەند جۆر گیا و دەرمانێك کرد و لەناکاو خۆم بەکەسێکی چالاك بینی و حەزم دەکرد لەگەڵ"مریت"دا زیاتر قسە بکەم و پێم وت:"مریت"من نازانم ئایا ئەم خواردنەوەیە یان بونی تۆیە بەم شێوەیە منی خۆشحاڵ کردووە و ڕۆحی منی هێناوەتە پێکەنین و ئاگاداری ئەوەشم کە خۆشحاڵم و حەز دەکەم دەستم لەسەر دەستت دابنێم، ئەگەر لەم کارەی من ناڕازی بیت، ئەوا لەمن زویر مەبە، چونکە"کلکی تیمساح" ی تۆ منی بەو شێوەیە بێشەرم کردووە.

ژنەش کەمێك گەڕایەوە دواوە و وتی: من خاوەنی ئەم مەیخانە نیم، بەڵکو خزمەتکاری ئێرەم، بەڵام من ئەم جۆرە خواردنەوەیە ئامادە دەکەم و تاکە" کەرەستەیەکی خۆئامادەکردنی ژیانی هاوسەری" کە باوکم دابێتی بەمن شێوازی ئامادەکردنی ئەم جۆرە خواردنەوەیە و بەڕادەیەکیش سەرنجی خەڵکی ڕاکێشاوە کە ئەم "کاپتا" بەندەی تۆش کە دەڵێیت ئازادت کردووە، خۆی بەئاشق و شەیدای من نیشان دەدات، بۆئەوەی چۆنایەتی ئامادەکردنی ئەم خواردنەوەیە لەمنەوە فێر ببێت.

---

[64] مەبەستی نوسەر لەڕۆنی ڕەش، نەوتە.

کاتێك ئەم بەندەی تۆ ئاگاداری ئەوە بوو کە ناتوانێت وا لەمن بکات ببمە خوشکی، بۆیە بڕیاری دا ئەم مەیخانەیە بەزێڕ بکڕێت، هەروەها حەز دەکات جۆری ئامادەکردنی ئەم خواردنەوەیەشم لێ بکڕێت.

کاتێك"کاپتا"گوێی لەم قسەیە بوو، بەهێمایەك ژنی لەوە ئاگادار کردەوە کەچیتر بێدەنگ بێت، بەڵام من کە لەوپەڕی مەستی خۆمدا بوم وتم:"مریت"ئێستا کە من "دەمی تیمساح"م خواردووەتەوە و خۆم بەخۆشحاڵ دەبینم، وابزانم "کاپتا" ناحەقی نیە کە ئاشقی تۆ ببێت و بیەوێت بتکاتە خوشکی خۆی، بەڵام من لەڕوی مەستیەوە ئەم قسانە دەکەم، لەوانەیە کاتێك سبەی هاتمەوە سەرخۆم لەمقسانەی خۆم پەشیمان ببمەوە، ئایا بەڕاست "کاپتا"بەزێڕ ئەم مەیخانەیەی کڕیوە؟

پێش ئەوەی ئەم ژنە وەڵام بداتەوە"کاپتا"پێی وتم:"سینوهە"من نەمدەویست بەم شێوەیە ئاگاداری کڕینی ئەم مەیخانە بیت، بەڵکو ویستم خۆم بەتایبەتی باسی کڕینی ئەم مەیخانەیەت بۆ بکەم، بەڵام ئێشتاش کە ئەم ژنە ئەو نهێنیەی منی ئاشکرا کرد، دەبێت پێت بڵێم کە من ئەم مەیخانەیەم بەزێڕی خۆم، بەواتا ئەو زێڕانەی کە ماوەی چەند ساڵێکە لەتۆی دەدزم کڕیوە، چونکە تواناى بەڕێوبردنی مەیخانەیەك لەخۆمدا شك دەبەم و دەزانم کە ئەم کارەش بەلای منەوە ئاسانە و نابێتە مایەی دەردیسەریم و پێویستیش بەهێز و توانای لاویەتی ناکات. من لەمەیخانەکاندا بینەوەی پارەی ئەو خواردنەوانە بدەم ئاوجۆ و شەرابێکی زۆرم خواردووەتەوە، بۆیە ئێستا هەرئەوەی چاوم بەنێوچاوی هەرکەسێك بکەوێت دەزانم ئایا دەتوانێت پارەی ئەوەی خواردویەتیەوە بدات یان نە؟ یان ئایا دەتوانرێت متمانەی ئەوەی پێبکەیت خواردنەوەی بەقەرز پێبدەیت یان نە؟ کاری مەیفرۆشی کارێکی پڕ کێشە و گرفتە، بەڵام چێژ بەخشە لەبەرئەوەی مرۆڤ لەمەیخانەدا چاوی بەهەموو جۆرە خەڵکێك دەکەوێت و لەهەریەکێك لەم کەسە جیاوازانە شتێکی جیاواز دەبیستێت و بۆ کەسێکی کونجکاوی وەك من کە دەمەوێت ئاگاداری هەموو شتێك بم. زۆر بەسودە.

لەوکاتەدا"کاپتا"پێکەکەی خۆی هەڵدایەوە و بەخۆشیەکەوە وتی:گەورەم، تاکە قازانجێك کە هەرگیز بازاڕی ناشکێت مەیفرۆشیە، چونکە تا ئەم جیهانە هەبێت خەڵکی دەخۆنەوە. لەوانەیە فیرعەونەکان بونیان نەمێنێت و خوداکانی میسریش لەپلەوپایە خۆیان بکەون و لەناوبچن، بەڵام مەیفرۆشی هەرگیز لەناو ناچێت، چونکە

خەڵکی ئەوکاتە دڵخۆشن کە دەخۆنەوە و کاتێکیش خەمگین و بەدبەختن، دوبارەی بۆ سارێژکردنی ئەو خەمەیان پەنا بۆ خواردنەوە دەبەن، کاتێکیش پیاوێك ئاشق دەبێت، ئیشقی خۆی بەخواردنەوە بەهێزتر دەکات و کاتێکیش لەماڵدا لەگەڵ ژنەکەیدا بەشەڕ دێت، دوبارە بۆ سارێژکردنی ئەو ساتە سەختانەی دەڕوات بۆ مەیخانە و دەخواتەوە.

"کاپتا"بەردەوامی بەقسەکانی دا و وتی:"سینۆهە"لەوانەیە تۆ کە کەسێکی نائاساییت، شێوازی ئەم قسەکردنەی من پەسەند نەکەیت و بڵێیت مرۆڤ دەبێت ئەرك بکێشێت و لەڕێی ئەو ئەرك و هەوڵانەیەوە بژێوی ژیانی خۆی دابین بکات، بەڵام من دەڵێم پیاوانی ئازا ئەوانەن کە بێ هیچ ئەرك و هەوڵێك سود لەدەسترەنجی کەسانی تر وەردەگرێت، لەکاتێکدا کە کەسانی تر سەرەڕای ئەو ئەرك و ماندوبونەیان، بەبرسێییەتی دەمێننەوە، بەڵام ئەوانی تر زۆر بەئاسودەیی و خۆشیەوە ژیانیان بەسەر دەبەن.

من لەوباوەڕەدا نیم بێ لەکاری ژنانی لەشفرۆش، کارێك لەمەیخانە ئاسانتر دەست بکەوێت، هەڵبەت بەو جیاوازیەی ژنانی لەشفرۆش لەسەرەتای دەستپێکردنی ئەم ئیشەیاندا پێویستیان بە پیشەکی سەرمایەی دارایی نیە، چونکە سەرمایەی ئەوان لەخودی جەستەیاندایە و هەرکاتێك بیر لەکۆکردنەوەی سامان بکەنەوە، دەتوانن لەکۆتایی تەمەنیاندا لەماڵێکدا کە بەتواناکانی خۆیان دروستیان کردووە بژین و چێژ لەحەوانەوە و ئاسودەیی خۆیان وەرگرن.

بەڵام من داوای لێبوردنی ئەوەت لێدەکەم کە زۆر بڵێم و ئەم زۆر بڵێییەی منیش لەوەوە سەرچاوە دەگرێت کە هێشتا بەخواردنەوەی"کلکی تیمساح"ڕانەهاتوم و پێکێك لەم خواردنەوەیە، بەشێوەیەك من تێکدەدات کە دەستەڵاتم بەسەر زمانی خۆمدا نامێنێت.

من باسی ئەم مەیخانەیەم بۆ دەکردی و پێم وتی کە ئەم مەیخانەیە هی منە و ئێستاش دەڵێم کە من و خاوەنی کۆنی ئەم مەیخانەیە بەهاوکاری"مریت"بەڕێوەی دەبەین و من و ئەویش قازانجی ئەم مەیخانەیە بەیەکسانی لەنێوان خۆماندا دابەشە دەکەین.

خاوەنی پێشوی ئەم مەیخانەیە، چیتر دوای ئەوە دەبێتە کرێکاری من، سوێندی بەهەزاران خودای میسری خواردووە کە زیاد لەنیوەی قازانج داوای هیچ شتێکی ترم

لیٚ نەکات، هەروەها دزیم لیٚ نەکات و دڵنیام کە دزیم لێناکات، لەبەرئەوەی پیاوێکی ئایندارە و کۆمەڵێك لەکڕیارەکانیشی کاهینەکانن، هەر ئەوانەش بەکڕیارە چاکەکانی لەقەڵەم دەدرێن، لەبەرئەوەی"کلکی تیمساح"ێکی زۆر دەخۆنەوە. هۆکارەکەشی بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە خوویان بەم خولردنەوەیەوە گرتووە و بەوە ڕاهاتون لەشەرابی بەهێزی ڕەزە دەیمەکانی"ئامون"بخۆنەوە و ئەوانەی کە ئەم شەرابە دەخۆنەوە، بەیەك یان دوو پێکی"کلکی تیمساح"مەست نابن، بەڵام لەبەرئەوەی بڕێکی زۆری کڕیارەکانی ئەم مەیخانەیە لەکاهینەکان پێکدێت بۆیە مەیفرۆش بیر لەوە دەکاتەوە بەرژەوەندی قازانجەکانی بەبەرژەوەندی ئاینەوە پەیوەست بکات، یەکەم قازانج لەدووەم بکات و تائەمڕۆش بەم شێوەیە هاتووە، بەڵام وادیارە من قسەی زۆر دەکەم و ئەم زۆر بڵێیەی من لەوەوە سەرچاوە بگرێت کە تۆ لەمن توڕە و دڵگران نەبیت و من وەکوو ڕابردوو بەخزمەتکاری خۆت بزانی، لەکاتێکدا من ئەمڕۆ پیاوێکی ئازادم و دەستم بەمەیفرۆشی کردووە، سەرەڕای ئەوەی هەندیٚ کەس لەوباوەڕەدان کە مەیفرۆشی کارێکی باش نیە.

دوای ئەم قسەیە"کاپتا"لەڕوی مەستیەوە دەستی کرد بەگریان و سەری خستە سەر ئەژنۆم، بەڵام من بەزۆر توانیم سەری لەسەر ئەژنۆکانم بەرز بکەمەوە و پێم وت:هەستە و لەناو ئەم مەیخانەیەدا ئەم جۆرە ڕەفتارە ناشیرنانە مەنوێنە، چونکە ئەگەر کڕیارەکان بزانن کە خاوەنی تازەی ئەم مەیخانەیە ئەوەند سوك و سەلیمە، یەکسەر نائومێد و ڕەشبین دەبن لێت و لەوانەشە چیتر نەیەن بۆ ئێرە.

دوای ئەوەی"کاپتا"سەری بەرز کردەوە لێم پرسی: خاڵێك هەیە کە من لێی تێناگەم، ئەویش بابەتی فرۆشتنی ئەم مەیخانەیە. چونکە ئەگەر ئەم مەیخانەیە، بەوشێوەی کە تۆ باسی دەکەیت ڕەواجی هەبێت، بۆچی خاوەنەکەی ڕازی بوو پێتی بفرۆشێت، دوای ئەوەش بەناونیشان شاگردێکی ئەم مەیخانەیە کارت بۆ بکات و لەقازانجی ئەم مەیخانەدا لەگەڵتدا هاوبەش بێت.

"کاپتا" کە هێشتا فرمێسکی چاوانی وشك نەبوبونەوە وتی:"سینۆهە" تۆ ئامادەکاریەکی تایبەتت تێدایە کە لەڕێی بەڵگەکانتەوە کە لە"ئفسنتین"[٦٥] تاڵترە، خۆشیەکانم ژەهراوی دەکەیت.

ئەگەر پێت بڵێم من و ئەم مەیفرۆشە هاوڕێی سەردەمی منداڵین و لەڕابردوودا هاوبەشی خەمو خۆشی یەکتری بوین، ئایا تۆ ئەوە پەسەند دەکەیت و باوەڕ بەوە دەکەیت کە ئەو لەپێناو ئەم هاوڕێیەتیە کۆنەماندا ئامادە بووە ئەم مەیخانەم پێ بفرۆشێت.

بەڵام لەبەرئەوەی دەزانم ئەم گوتەیە تۆ ڕازی ناکات و باوەڕم پێناکەیت، ناچارم لایەنگری ئەو هەڵوێستەت بکەم کە خودی منیش بەو بەڵگەیە ڕازی نابم و ناچار دەبێت ڕاستیەکەیت پێ بڵێم کەفرۆشتنی ئەم مەیخانەیە لەلایەن مەیفرۆشەوە بەمن، نهێنیەك لەخۆ دەگرێت، وابزانم کە نهێنی ئەم فرۆشتنە، پەیوەست بکرێت بەجەنگی نێوان خودای تازەی فیرعەون میسر و"ئامون"ی خودای کۆنەوە.

چونکە لەهەر ئاژاوە و پێکدادانێکدا، یەکەمین شوێن کە هێرشی بۆ ببرێت، مەیخانەیە و خەڵکی دەڕژێنە ناو مەیخانەکانەوە و تا دەتوانن ئاوجۆ و شەراب دەخۆنەوە و کۆزەی شەراب و ئاوجۆکانیش دوای خواردنەوەیان دەشکێنن و خودی مەیفرۆشیش لەڕوباری"نیل"دا دەخنکێنن، لەبەرئەوەش خاوەنی ئەم مەیخانەیە هەر لەئێستاوە ترسی لێ نیشتووە.

چونکە ئەم مەیفرۆشە یەکێك لەلایەنگرە هەرە دڵسۆزەکانی"ئامون"ی خودای کۆنی میسرە و بەڕادەیەکیش لەو بیروباوەڕەیدا توندڕەوە کە ئەمڕۆ ناتوانێت نکوڵی لەخودای کۆن بکات و باوەڕ بەخودای تازە بێهێنێت، چونکە هیچ کەسێك ڕازی نابێت بەوەی بیروباوەڕی خۆی بگۆڕێت و پەیڕەوی لەخودای تازە بکات.

لەلایەکەوە ئەم مەیفرۆشە، ئاگاداری ئەوە بوو کە خودای"ئامون"بەسەختی گرفتاری هەڕەشەیەکی ترسناك بووەتەوە، ئەم ترسەش گەشتووەتە ڕادەیەك کە

---

[65] ئفسنتین: وشەیەکی"یۆنان"یە کە گوڵە هەنگ و گوڵە بەرزنە و گوڵەزەرد و گۆڵە ڕێزان و گوڵە ڕۆمینە و گوڵە مەشکە هەروەها گیا خاو و گوڵە مارانەی پێ دەوترێت و گیایەکی گەلاتوکنی توکزەرد و بچوکە و بۆ دەرمان بەکار دێت.......وەرگێڕ.. سەرچاوە﴿فەرهەنگی فارسی کوردی زانکۆی کوردستان﴾

پەرستگای"ئامون"زەویە کشتوکاڵیەکانی دەفرۆشێت، چونکە واهەست دەکات ڕۆژێك بێت زەویەکانی لیّ داگیر بکەن.

منیش دوای ئەوەی زانیم ئەم مەیفرۆشە ترسی لیّ نیشتووە، بەشێوەیەك قسەم بۆ کرد کە ترسەکەی زیاتر بکەم و وتم: هەرچی زووترە خۆت لەم مەیخانەیە ڕزگار بکە، چونکە ئەگەر هەرکارێکی دڵتەزێن ڕوویدات، هەرچی سەرمایەت هەیە لەم مەیخانەدا لەناو دەچێت.

ئەویش زۆر ترسابوو، دوای ئەوەش ڕازی بوو بەوەی مەیخانەکەی خۆیم پیّ بفرۆشێت، بەڵام لەبەرئەوەی دەمزانی توانای بەڕێوەبردنی ئەم مەیخانەیەی هەیە، شاگردێکی لەو باشترم دەستناکەوێت و"مریت"یش داوای کرد کە لەم مەیخانەیەدا بمێنێتەوە.

وتم:"کاپتا"من نازانم ئایا دوای ئەوە تۆ سود لەم مەیخانەیە وەردەگریت یان نە؟

بەڵام ئاگاداری ئەوە بووم کە تۆ لەڕۆژێکدا کارگەلێکت ئەنجام داوە و ئەگەر من بوایەم، نەمدەتوانی لەیەك ڕۆژدا ئەو هەموو کارانە جێبەجیّ بکەم، ئەوکات هەستامە سەر پیّ و لەو مەیخانەیە چومە دەرەوە. من هەستم بەوە کرد کە"کاپتا"بەتەواوی مەست بووە و ناتوانێت بەڕێكەو پێکی هەنگاو بنێت و"کلکە تیمساح"ێك ئەوی وێران کردبوو.

*بەشی بیست و نۆیەم*

## پیشەکی دوزمانیەکی مەزن لەمیسردا

بەوشێوەیە، من لەگەڕەکی هەژارانی شاری"تبس"و لەماڵی مسگەری پێشوو بوم بەپزیشکی خەڵکی هەژار و هەربەوشێوەی کە"کاپتا"پێشبینی کردبوو، نەخۆشێکی زۆر سەردانیان کردم.

من سودم لەو نەخۆشانە وەرنەدەگرت،بەپێچەوانەوە زیانم پێدەگەشت، چونکە نەك تەنها دەرمانی خۆڕاییم دەدا بەنەخۆشەکان، بەڵکو هەندێجار ناچار دەبوم خواردنیشیان پێبدەم، چونکە کاتێك دەمبینی هۆکاری چارەسەرکردنی نەخۆشێك تەنها خواردنە، بۆیە منیش لەوکاتەدا ناچار دەبووم لەباتی دەرمان خواردنی پێبدەم.

ئەو دیاریانەی کە هەندێك لە نەخۆشەکان لەبەرامبەر چارەسەرکردنەکەیاندا پێیان دەدام، بەو ڕادەیەش گرنگ نەبوو، بەڵام لەبەرئەوەی ئەم دیاریەیان لەنیازپاکی و دڵپاکیانەوە سەرچاوەی دەگرت، بەوەرگرتنی خۆشحاڵ دەبوم و من زۆر لەوە زیاتر خۆشبەخت بوم، چونکە خەڵکی ناوی منیان بەپیرۆز دەزانی و بەشێوەیەك باسی منیان دەکرد کە وەك بڵێی یەکێك بم لەچاکەکارانی ئەم جیهانە.

"کاپتا"بەهۆی پیری و بەتایبەت دەوڵەمەندبونیەوە نەیدەتوانی وەکو ڕابردوو خزمەتم بکات، بۆیە بۆ ئەنجامدانی کاروبارەکانی ناوماڵ ژنێکی پیری بەکرێ گرت کە هەم ڕقی لەپیاوان بوو هەم لەژیانیش بێزار بوو، بەڵام لەبەرئەوەی مرۆڤ تا ئەوکاتەی زیندووە تا توانای لەبەردا مابێت دەبێت کار بکات، ئەویش بەوشێوەیە لەماڵ ئێمەدا کاری دەکرد.

ئەم ژنە بەهۆی پیریەوە سەرنج ڕاکێش نەبوو، بەڵام لەبەرامبەر ئەوەشدا خواردنگەلێکی خۆشی لێ دەنا و هەرگیز سکاڵام لەخواردنەکانی نەکردووە، هەروەها هەمان ژن لەبۆنی ئەو نەخۆشانەی بۆ چارەسەرکردنیان دەهاتن بۆ لام بێزار نەبوو، لەکاتێکدا "کاپتا" لەبۆنیان زۆر بێزار بوو.

من ئەو ژنە کە بەردەوام لەوێ ئامادە بوو، بەڵام چاوم پێی نەدەکەوت، ڕاهاتبوم بەوەی بە"موتی"بانگی بکەم.

شەوانی شاری"تبس"بەڕوناکی چراکانی ڕۆشن دەبویەوە و مەیخانە و سۆزانیخانەکان پڕ دەبوو لەکڕیاران، بەڵام هەرکەسێك کەمێك مێشکی هەبێت، هەست دەکات کە ڕوداوگەلێك لەم شارەدا لەحاڵی ڕوداندایە، چونکە جەنگ لەنێوان خودای تازەی فیرعەون بەناوی"ئاتون"و خودای کۆن بەناوی"ئامون"تا دەهات گرژتر و توندتر دەبوو.

دوو سێ مانگ تێپەڕی و لە"تبس"دا لەدەرئەنجامی شەڕی نێوان دوو خوداکە خەڵکی توشی دڵەڕاوکێ و ترس بون و "هورم هب"ی فەرماندەی لەشکری میسریش هێشتا نەگەڕابوەوە.

لەڕۆژدا، گەرمی خۆر زیاتربوو و گەشتە ڕادەیەك کە هەندێکات لەماندویەتی و گەرمادا لەگەڵ"کاپتا"دا دەڕۆشتم بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح"، بەڵام چیتر لەو خواردنەوە بەهێز و سوتێنەرەم نەدەخواردەوە، بەڵکو خۆم بەئاوجۆیەکی سوك کەتینویەتی دەشکاندم هەروەها جەستەشمی فێنك دەکردەوە ڕازی دەکرد ، بێئەوەی مەستم بکات.

لەبەرئەوەی ناو مەیخانەکە فێنك بوو، لەوێ خۆم بەئاسودە دەبینی و چێژم لەتەماشاکردنی جوانی"مریت" وەردەگرت، کاتێك چاوەکانی تەماشای چاوانی منی دەکرد، هەستم بەگوشینی دڵم دەکرد و حەزم دەکرد دەست لەسەر دەستی دانێم.

دوای ئەوەی چەند جارێك ڕۆشتم بۆ ئەو مەیخانەیە، ئاگاداری ئەوە بووم کە کڕیارانی ئەو مەیخانەیە، کەسانێکی تایبەتن و ڕێ بەهەموو کەسێك نادەن بێنە ناو ئەو مەیخانەوە، یان بارودۆخی ئەو مەیخانەیە بەشێوەیەکە کە کەسانی نەدار ناتوانن بێنە ژورەوە و شەراب و ئاوجۆ یان"کلکی تیمساح" بخۆنەوە.

"کاپتا" لەسەرخۆ بەمنی وت: کەسانێك لەنێو کڕیارانی ئەم مەیخانەیەدا بەدی دەکرێت کە سەروەت و سامانی خۆیان لەڕێی دزین و فەرهودکردنی گۆڕی مردووەکانەوە بەدەست هێناوە، بەڵام کاتێك دێنە ناو ئەم مەیخانەیەوە، وەك کەسانێکی وەجاخزادە ڕەفتار دەکەن و بەهیچ شێوەیەك ڕەفتارگەلێکی سوکی و بێشەرم لەخۆیان نیشان نادەن.

هەروەها دەیوت کە تەواوی کڕیارانی ئەم مەیخانەیە کەسانێکن کە پێویستیان بەیەکتری دەبێت و پێویستی داراییان هانیان دەدات کە بێن بۆ ئێرە، بۆیە تەنها حەزی خواردنەوەی"کلکی تیمساح"ئەوان پەلکێشکی ئێرە ناکات.

تاکە کڕیارێك کە پێویستیان پێی نەبوو من بووم، چونکە نە شتێکم دەکڕی و نەشتێکم دەفرۆشت و نە زێڕ و زیوم بەقەرز دەدا بەهیچ کەسێك بۆئەوەی سوی لێ وەرگرم، نە لەو کەسانە بوم کە قەرزبکات، بەڵام لەبەرئەوەی هەمویان دەیانزانی هاوڕێی"کاپتا"م، بێئەوەی هیچ قسەیەکم لەگەڵدا بکەن ڕێیان پێدەدام بێمە ناو ئەو مەیخانەیەوە، چونکە ئاگاداری ئەوەبوون کە هیچ سودێکم لێ نابینن.

من لەو مەیخانەیەدا زانیاریەکی زۆرم لەبارەی بارودۆخی"تبس"و میسر و ڕوداوەکانی وڵات بەدەست دەهێنا، بۆنمونە شەوێکیان کە لەمەیخانەدا بووم، بینیم بازرگانێك کە دەمزانی فرۆشیاری بخوردە، لەحاڵێکدا کە جلەکانی خۆی دڕیبوو و خۆڵەمێشی کردبوو بەسەر خۆیدا، خۆی کرد بەنێو ئەو مەیخانەیەدا و پێکێك"کلکی تیمساح"ی خواردەوە و وتی: هیوادارم ئەم فیرعەونە بۆ هەتاهەتا نەفرەتبار بکرێت، چونکە ئەم"تیمساح"ە، حەزناکات پەیڕەوی لەمێشك بکات و هەرچی بەبیریدا بێت یەکسەر ئەنجامی دەدات.

تائەمڕۆ ژیانی من لەڕێی فرۆشتنی بخورد کە لەوڵاتە دورە دەستەکانەوە دێت بەڕێوە دەچێت و هەموو ساڵێك لە وەرزی هاوین، کۆمەڵێك کەشتی لێرەوە بەرەو دەریاکانی ڕۆژهەڵات دەڕۆشت، ساڵی دوایی بەلایەنی کەم دوو کەشتی لەدە کەشتی، بە جۆرەها کاڵای ڕۆژهەڵاتەوە بۆنمونە"بخورد"دەگەڕایەوە.

ئەمساڵ کاتێك کەشتیەکان ویستیان بەرەو دەریای ڕۆژهەڵات بکەونە ڕێ، لەناکاو بێئاگادارکردنەوەی هیچ کەسێك فیرعەون هات بۆ لەنگەرگا، منیش سەرم لەوە سوڕمابوو کە ئەم پیاوە بۆچی دەست لەهەموو کارێکەوە دەدات، لەکاتێکدا ئەم

جۆرە کارانە بەوەوە پەیوەست ناکرێن. دەی کەواتە ئەو هەموو چاودێر و نوسەرەی کە لە"تبس"دان چ کارەن؟ مەگەر ئەرکی ئەوان ئەوە نیە لەم جۆرە کارانە ورد ببنەوە، بۆئەوەی هەموو کارێك دەقاودەق بەپێی یاسا و نەریتەکان ئەنجام بدرێت؟

کاتێك فیرعەون هات بۆ لەنگەرگا، دەریاوانەکان لەناو سەکۆ کەشتیەکاندا دەستیان کردبوو بەگریان و ژن و منداڵی ئەمانەش لەکەناردا هاواریان دەکرد و فرمێسکیان دەڕشت و ڕوخساری خۆیان دەڕوشاند، چونکە دەیانزانی هەندێك لەدەریاوانەکان ناگەڕێنەوە و لەدەریادا نوقم دەبن، بەڵام ئەم بابەتە بەبەشێك لەنەریت دادەنرێت و شتێکی تازە نیە و هەرکاتێك کەشتیەکان بکەونە ڕێ، ژن و منداڵی دەریاوانەکان دەست بەگریان و شیوەن دەکەن، بەڵام ئەم فیرعەنە نەفرەتیە، کاتێك گریانی ژن و منداڵ و دەریاوانەکانی بینی، دوای ئەوە بڕیاری ئەوەی دا کەشتیەکان نابێت بڕۆن بۆ دەریاکانی ڕۆژهەڵات و ئەوکەسانەش کە بازرگانن دەزانن ئەم قەدەغەیەی فیرعەون، وەك ئەوە وایە ئەم بڕیارە بۆ لەناوبردنی بازرگانان و ژن و منداڵی دەریاوانەکانە دەرکراوە، چونکە تا کەشتیەکان نەڕۆن بەرەو دەریاکانی ڕۆژهەڵات، بازرگانەکان هیچ قازانجێك ناکەن و ژن و منداڵی کەشتیەوانەکانیش برسیان دەبێت.

هەرکەسێك کە لەمیسردا دەژی، دەزانێت نابێت خەمی ئەو دەریاوانانە بخوات کە بەکەشتی دەست بەگەشتەکانی خۆیان دەکەن، چونکە هیچ کەسێك بەئارەزوی خۆی دەریاوانی ناکات، بۆیە بەردەوام ئەو کەسانەی کە لەدادگادا بڕیاری تاوانیان بەسەر سەپێنراوە و تاوانبارن ناچاریان دەکەن کەسێکی دەریاوانیان لێ دەربچێت و لەمکاتەدا بۆچی خەم بۆ نوقم بونی ئەم جۆرە کەسانە بخۆن؟ ئایا مەرگی کەسانی تاوانبار، کە ناچارن دەریاوانی بکەن، زیاتر جێی خەمە، یان سەرمایەی ئەو بازرگانانەی کە کەشتیان دروستکردووە و ئامادەی دەریاوانیان کردووە، چونکە کەشتی لەخۆیەوە دروست نابێت، بەڵکو دەبێت سەرمایەی خۆیان بخەنەگەڕ و کەشتیەکی تایبەت بەخۆیان دروست بکەن، دوای ئەوەش کەشتیەکە ئامادە بکەن و بەپێویستی خواردن و کەرەستەی تایبەت بەو گەشتەوە ڕەوانەی دەریاکانی ڕۆژهەڵاتیان بکەن، بەڕاستی دڵم بۆ بازرگانانی میسر دەسوتێت کە ئێستا لەشوێنێکی دورەدەستدان و ژن و منداڵەکانیان لەمیسردا ژیان بەسەر دەبەن و ژن و منداڵەکان، هەرگیز چاویان بە هاوسەرانی خۆیان ناکەوێتەوە و بازرگانەکانیش لەنیشتەجێ

تازەکەیاندا ژنی تازەیان هێناوە و دەڵێن ئەو منداڵانەی کە لەمانەوە لەدایك دەبن، لەکەیەك بەسەر پێستی جەستەیانەوەیە.

بۆماوەیەك ئەو بازرگانە، هەر بەوشێوەیە سکاڵای خۆی هەڵدەڕشت و نەفرەتی لەفیرعەون دەکرد و دەیوت ئەم پیاوە، هەم بازرگانەکانی ئێرەی لەقازانج بێبەش کردووە و هەم ئەو بازرگانانەی کە لەشوێنە دورەدەستەکانەوە کاڵا بۆ میسر دەنێرن نابوت کردووە، بەڵام دوای ئەوەی سێ"کلکە تیمساح"ی خواردەوە، کەمێکی هێور بویەوە و بەهۆی هەندێك لەو قسانەی کە لەبەرامبەر فیرعەوندا کردبوی داوای لێبوردنی کرد و وتی: هەمووی لەداخاندا ئەو قسانەی کردووە. ئەوکات وتی: وامدەزانی کە"تی"دایکی فیرعەون دەتوانێت کوڕەکەی خۆی ئاڕاستەی کارە ژیر و لۆجیکەکان بکات، بەڵام ئەو بیری لەو شتە نەکردەوە، هەروەها وام دەزانی کە "ئامی" پێشەوای مەزنی پەرستگای تازەی فیرعەون دەتوانێت ئامۆژگارێکی دڵسۆزی بێت، بەڵام ئەم پیاوەش تەنها بیر لەشتێك دەکاتەوە ئەویش بەهەر شێوەیەك بووە"ئامون"ی خودای کۆن لەناو ببات.

پێش ئەوەی فیرعەون ژن بهێنێت، وام دەزانی ئەو بێمێشکیەی لەبێژنیەوە سەرچاوە دەگرێت و دوای ئەوەی"نفر تی تی"بوو بەخوشکی بێمێشکیەکەی وەکوو خۆی مایەوە و"نفر تی تی"لەوکاتەوەی بووەتە شاژنی میسر، مۆدێلگەلێکی سەرسوڕهێنەری لەجلوبەرگدا هێنایە بون کە ژنی بەرپرسەکانیش لاساییان دەکەنەوەو ئێستا ژنی کاربەدەستانی دەوڵەت بەلاسایی کردنەوەی"نفر تی تی" چواردەوری چاویان ڕەنگی سەوز دەکەن و وەك ژنەکانی سوریا جل لەبەر دەکەن، بەڵام جلوبەرگی ئەوان بەشێوەیەکە کە بەشی پێشەوەی بەتەواوی کراوەیە.

"کاپتا" وتی: من ئەو جۆرە جلانەم لەهیچ وڵاتێکدا نەبینیوە، بەڵام ئایا تۆ دڵنیایت ئەو ژنانەی کە بەپێی ئەو مۆدیلە تازەیە جل لەبەر دەکەن، ئەوەبەشەی جەستەیان کە دەبێت داپۆشراو بێت پیشانی خەڵکی بدەن؟ ئایا بەچاوی خۆت بەشە ئەندامی ئەو ژنانەت بینیوە؟

بازرگان وتی:من خوشکم هەیە و لەو خۆشکەشم چەند منداڵێکم هەیە و خۆم بەپیاوێکی پاکدامێن دەزانم و کاتێك ئەو ژنانەم بینی کە بەشی پێشەوەیان بەتەواوی ڕوتە، تەماشای خوار ناوکیانم نەدەکرد.

لەمکاتەدا"مریت"خزمەتکاری مەیخانە هاتە دەنگ و بەو بازرگانەی وت:ئەگەر تۆ پیاوێکی سەلیقە خراپی، ئەوا ئەوە نابێتە بەڵگەیەك بۆئەوەی ژنان بەخراپ بزانی، چونکە لەوەرزی هاویندا پەیڕەوی کردنی ئەو جۆرە مۆدێلە زۆرباشە و بگرە ژنەکانیش جوانتر دەردەکەون، ئەگەر ژنانت بەو مۆدێلە تازەیەوە ببینی و نەوارێکی"شریت" کەتانی ئەو شوێنەی داپۆشیبێت تۆ ڕەخنەی لێ دەگریت؟ هەڵبەت بەشێوەیەك کە تیژترین چاوی پیاوان ناتوانێت سنوری ئەو شریتە کەتانیە ببەزێنێت.

بازرگان ویستی وەڵام بداتەوە، بەڵام مەستیەکەی ڕێی لێگرت و سەری خستە سەر هەردوو مشتیەوە و بۆ مۆدێلی تازەی ژنان و قەدەغەکردنی ڕۆشتنی کەشتیەکان بۆ دەریا دورەکان و بێبەشکردنی بازرگانان لە سودی کاڵاکانی ڕۆژهەڵات دەستی کرد بەگریان.

لەمکاتەدا کاهینێك لەکاهینەکانی پەرستگای"ئامون"کە سەری تاشی بوو، ڕۆنی بۆناوەی دابوو لەسەری، بەشداری لەم گفتوگۆیەدا کرد و وتی:

من هیچ شتێك لەبارەی مۆدێلی تازەی ژنانەوە ناڵێم، لەبەرئەوەی خودای "ئامون"هیچ یاسایەکی لەبارەی مۆدێلی جلوبەرگەوە دانەناوە، بەڵام ئەوەی دەبێتەهۆی ئەوەی هەموو شتێك لەناو بچێت، قەدەغەکردنی گەشتکردنی کەشتیەکانە بەرەو ناوچە دورەدەستەکانی ڕۆژهەڵات، چونکە ئەگەر ئەم کەشتیانە نەڕۆن، ئەوا ناتوانن بخوردمان بۆ بهێنن و ئەگەر بخوردیش نەهێنن، خودای ئێمە"ئامون"ئەو کاتەی قوربانی پێشکەش دەکەین لەو بۆنە خۆشە بێبەش دەبێت، لەکاتێکدا "ئامون"زۆر حەزی لەبۆنی خۆشە و ئەو دژمنایەتیەی لەگەڵ"ئامون"دا دەکرێت، مەزنترین بەدبەختی بۆ خەڵکی میسر لەگەڵ خۆیدا دەهێنێت، لەوڕۆژەوەی قوچەکیەکان دروست کراون، هیچ کەسێك ئەوەی بەبیردا نایەت کە نەتەوەی میسر لەسەردەمانی ڕابردوودا بەوشێوەیەی ئێستا بەدبەخت بوبێت، دڵنیام دوای ئەوە هەر میسریەك کاتێك یەکێك لەپەیڕەوانی خودای تازەی فیرعەون ببینێت و تەماشابکات کە هێمای هەمان ئەو خودایە کە"خاچ"ێکە بەسەر جلەکەیەوە کێشراوە، تفی تێدەکات، ئەگەر لەنێو ئێوەدا کەسێك بەدی بکرێت کە ئەمشەو بڕوات و لەپەرستگای خودای تازەدا دانیشێت و خۆی لەپاشەڕۆکانی خاڵی بکاتەوە، من چەند پێکێك"کلکی تیمساح"ی لەسەرخۆم دەدەمێ و ئەم کارەش هیچ گرفتێك لەخۆ ناگرێت، چونکە

پەرستگای ئەم خودا نەفرەتیەی کە ناوی"ئاتون"ە دیواری نیە و ئەگەر کەسێك لێی نزیك بێتەوە دەتوانێت بەئاسانی لەپارێزەرەکانی هەڵبێت و من خۆم دەتوانم ئەم کارە بکەم، بەڵام لەبەرئەوەی کاهینی پەرستگای"ئامون"م باش نیە چاویان بەمن بکەوێتو ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی سوکایەتی بە"ئامون"بکرێت.

لەوکاتەدا پیاوێك کە کاریگەری نەخۆشی"ئاوڵە"ی پێوە دیاربوو لەشوێنێکی ئەو مەیخانەدا هەستایە سەرپێ و لەکاهین نزیك بویەوە و بۆماوەیەك بەدەنگێکی نزم قسەی لەگەڵدا کرد و کاهینیش لەلای خۆیەوە داینیشاند و"کلکی تیمساح"ی لەبەردەمدا دانا بۆئەوەی بیخواتەوە و ئەو پیاوەش دوای ئەوەی بەهۆی گەرمی ئەو خواردنەوەیەوە سەری گەرم بوو، بەدەنگێکی بەرز بەکاهینەکەی وت:من ئامادەم برۆم ئەو کارەی وتت ئەنجامی بدەم، لەبەرئەوەی من باوەڕم بە"ئامون"ە و مەحاڵە بتوانم ئەوە پەسەندبکەم کە خودایەکی تر جێگەی"ئامون"بگرێتەوە، چونکە لەو ڕۆژەوەی من لەدایك بوم"ئامون"دەپەرستم.

کاهینیش وتی: ئەگەر تۆ ئەمشەو بڕۆیت و لەپەرستگای"ئاتون"دا خۆت لەپاشەڕۆکانت خاڵی بکەیتەوە، من دەتبەخشم، بگرە ئەگەر لاشەکەشت مۆمیا نەکرێت، ئەوا دوای مەرگ دەڕۆیت بۆ وڵاتی خۆشبەختی خۆرئاوا، چونکە هەر کەسێك لەپێناو"ئامون"دا بمرێت ئەگەر وەك دەریاوانەکانیش لەدەریادا نوقم ببێت، دەنێردرێتە وڵاتی خۆرئاوا.

ئەوکات ـکاهین، لەمەستیاندا، بەشێوەیەکی وتارئامێزانە بەو کەسانەی کە لەمەیخانەکەدا بون وتی:ئەگەر ئێوە لەپێناو"ئامون"دا بکوژن یان دزی بکەن وماڵەکان بسوتێنن و هەرکارێکی تری ناپەسەندنتان لێ بوەشێتەوە، من دەتانبەخشم، بگرە ئەگەر خودی فیرعەونیش بکوژن هەر دەتانبەخشم.

کاتێك گوتاری ئەو کاهینە گەشتە ئەو ڕادەیە، مەیفرۆش بەواتا شاگردەکەی "کاپتا"کە بەڕێوبەری مەیخانەکە بوو لەکاهین نزیك بویەوە و دارێکی کێشا بەنێوچاوانی کاهیندا و کەوتە سەرزەوی و دوای ئەوە کابرای مەیفرۆش وتی: ئەمەش لەپێناو"ئامون"دا دەکەم، چونکە دەزانم"ئامون"وتویەتی نابێت هیچ کەسێك کوڕەکەی بەواتا فیرعەون بکوژێت.

هەموو کڕیارەکانی ئەو مەیخانەیە لایەنگری قسەی مەیفرۆشیان کرد، بەڵام لەبەرئەوەی کوشتنی کاهینێك لەوانە بوو دەرئەنجامێکی خراپی لێبکەوێتەوە، من و"کاپتا"وەك تەواوی کڕیارەکانی تر بەباشمان زانی لەو مەیخانەیە بڕۆینە دەرەوە.

"مریت"منی تا بەردەرگا ڕەوانە کرد و کاتێك گەشتینە ڕێڕەوی تاریکی ئەو مەیخانەیە دەستی"مریت"م گرت و پێم وت: لەچاوانتدا وا دەردەکەوێت کە تۆش وەك من تەنها بیت و برات نەبێت، بۆیە حەز دەکەم ڕۆژێك تۆ بەپۆشاکە مۆدێل تازەکانەوە ببینم و دڵنیام کە بەو جلانەوە زۆر جوان دەبیت، چونکە ورگێکی بچوك و باریك و دەرنەپەڕیوت هەیە.

"مریت"دەستی منی کە لەوکاتەدا بەسەر دەستیەوە دانامنابوو نەکێشایە دواوە و وتی: لەوانەیە ڕۆژێك بێت ئەو جلە لەبەر بکەم و داوا لەتۆ بکەم کە پزیشکیت بۆچونی خۆت لەبارەی هەندێك بەشی جەستەم بخەیتە ڕوو و بڵێیت ئایا هاوشێوەی ئەم ئەندامەت لەکاتی پیشەی پزیشکیتدا بینیوە یان نە؟

* * *

ئێستا چارەنوسی من بەشوێنێك گەشتووە کە دەبێت باسی شتگەلێك بکەم کە کاتێك چاوم بەوشتانە کەوت، لەڕقاندا دەلەرزیم، بەڵام کەرەستەیەکم بەدەستەوە نەبوو بۆئەوەی بەو کەرەستەیە ڕێ لەو ڕوداوانە بگرم.

دەبێت باسی شتگەلێك بکەم کە تۆ هەی ئەو کەسەی کە دوای مەرگی من ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە، باوەڕیان پێ بکەیت، چونکە پێشبینی ئەوە دەکەم، ئالەم جۆرە ڕوداوانە، لەسەردەمی تۆشدا ڕوودەدات، لەسەرتای نوسینی ئەم کتێبەدا وتومە، هەموو شتێك لەجیهاندا گۆڕانکاری بەسەردا دێت، بێجگە لە گەمژەیی مرۆڤ کە لەهەموو سەردەمێکدا دەقۆزرێتەوە.

لەناوەڕاستی وەرزی هاویندا"هورم هب"فەرماندەی لەشکری میسر لەوڵاتی "کوش"کە دەکەوێت باشوری میسر گەڕایەوە.

پەڕەسێلکەکان بەهۆی گەرمی ئاوو هەواوە، نەدەفڕین‌ونەدەنگیان نەدەبیستراو لەگۆماوەکانیشدا ئاو بۆگەنی دەکرد و خەڵکی لەڕۆژدا نەدەهاتنە دەرەوە. جگە لەوانەی کە ناچاربون لە لەنگەرگای "تبس"دا سەرقاڵی کارکردن بن یان نەبیت

کشتوکاڵ بکەن، بەڵام باخی کەسە دەوڵەمەندەکان هەمیشە فێنك و پڕ لەگوڵ بوو و هەمیشە ئاو لەجۆگەلەی ناوباخەکانەوە تێدەپەڕی.

لەو هاوینەدا، فیرعەون بەپێچەوانەی ساڵەکانی پێشوو، لەکۆشکەکەی خۆی نەهاتە دەرەوە، بۆئەوەی بڕوات بۆ میسری خوارو و سود لەهەوای فێنکی ئەوێ وەرگرێت، لەبەرئەوەی فیرعەون نەڕۆشت بۆ سەردەسێر، هەموویان ئاگاداری ئەوەبوون کە ڕوداوگەلێکی مەزن و سەیر ڕوو دەدات.

ڕۆژێکیان خەڵکی ئاگاداری ئەوە بوون کە"هورم هب"هاتووەتەوە، بۆیە لەماڵەکانیان هاتنە دەرەوە بۆئەوەی تەماشای سەربازەکانی فیرعەون بکەن.

بینیان کەلەتەواوی ئەو جادانەی کە لەباشورەوە بەشاری"تبس"کۆتاییان دێت، سەربازگەلێکی ڕەش پێست و تۆزاوی، بەنوکە نێزە مسینەکانیانەوە کە بەسەر داری نێزەکانیانەوە دەدرەوشایەوە، خۆیان کرد بەشاردا.

ڕەشپێستەکان کە چاو و ددانێکی سپیان هەبوو، بەسەرسوڕمانەوە تەماشای چواردەوریان دەکرد و دیار بوو کە سەریان لەتەماشاکردنی شارێك بەو مەزنی و جوانیەوە سوڕ بمێنێت.

لەهەمان ئەو کاتەی سەربازە ڕەشپێستەکان خۆیان کرد بەشاری"تبس"دا کەشتیە جەنگیەکانی فیرعەونیش گەشتنە لەنگەرگاکان و گالیسکەی جەنگ و ئەسپیان لەکەشتیەکانەوە داگرتە سەر وشکانی و خەڵکی بینیان کە لێخوڕانی گالیسکەکان و ئەو کەسانەی کە سەرپەرشتی سارێژکردنی برینی ئەسپەکان بوون، ئەوانیش یان ڕەش پێست بون یان لەدانیشتوانی وڵاتی"شردن[66]"بون.

دەبێت بڵێم لەسەرەتادا وەڵاخ"کەر"یان بەگالیسکە جەنگیەکانەوە دەبەست، بەڵام بەستنی گالیسکە بەئەسپەوە نەریتێکە کەلە"شردن"ەوە گواسترایەوە بۆ میسر و ئەوکات ڕەشپێستەکانیش وەك دانیشتوانی"شردن" تیمارکردنی برینی ئەسپیان لەئەستۆگرت.

کاتێك سەربازە ڕەشپێستەکان خۆیان کرد بەشاردا، لەکاتی شەودا لەچواڕیاندا ئاگری پاسەوانیان داگیرساند و ڕێگای ڕوباریان لەباکور و باشورەوە بەست،

---

[66] شردن: ناوچەیەکە کە لەمڕۆدا بەناوی وڵاتی"لیبیا" بانگ دەکرێت.

بەشێوەیەك كە هیچ كەس بێ مۆڵەتی فەرماندەی لەشکر، نەیدەتوانی لەڕێی "نیل"ەوە بڕوات بۆ باکور یان باشور.

لەهەمان ئەو ڕۆژەی كە سەربازە ڕەشپێستەكان خۆیان کرد بە شاری "تبس"دا خەڵكی بەشێوەیەك دڵەڕاوكێیان تێكەوت كە كاركردن لە كارخانە و ئاش و فرۆشگا و لەنگەرگاكاندا وەستا و فرۆشیارانی شاری "تبس"ئەو شتانەی هەمیشە لەبەردەم فرۆشگاكاندا دەیان دەنا، بۆئەوەی سەرنجی كڕیاران بەلای خۆیاندا ڕاكێشن، بێئەوەی هیچ شتێكی لێ بفرۆشن دەبردەوە ناو فرۆشگاكەوە و دەرگای فرۆشگایان بەتەڕ و تەلی مسین دادەخست و مەیفرۆشان و خاوەنی ماڵە سۆزانیەكان كۆمەڵێك پیاوی بەدڕەوشتیان بەكرێ گرت، بۆئەوەی ئەگەر كارەساتێكی دڵتەزێن ڕوویدا، نەهێڵن هێرش ببرێتە سەر مەیخانە و ماڵە سۆزانیەكانەوە.

خەڵكی لە"تبس"دا تەنها لەهەندێ كاتی تایبەتدا جلی سپیان لەبەردەكرد و دەڕۆشتن بۆ پەرستگا، ئەو خەوڵكە جلی سپیان لەبەركرد و بەرەو پەرستگای "ئامون" كە لەڕاستیدا شارێكە بۆ خۆی كەوتنە ڕێ، بۆ باسكردنی بەرفراوانی ئەم پەرستگایە تەنها ئەوە بەسە كە بڵێن قوتابخانەی"ماڵی ژیان"یەكێكە لەڕێكخراوەكانی ئەو پەرستگایە.

هەمان ئەو ڕۆژەی سەربازە ڕەشپێستەكان خۆیان كرد بە"تبس"دا، ئیش و كار وەستا و ئەو باسە بەنێو خەڵكیدا بڵاو بویەوە كە شەوی ڕابردوو محرابی پەرستگای"ئاتون"كە ڕكابەری پەرستگای"ئامون"بوو پیسكراوە و لاشەی سەگێكی تۆپیویان فڕێداوەتە میحرابی ئەو پەرستگایەوە و سەری پاسەوانەكانیان لەم بن گوێیانەوە بۆ ئەو بن گوێیان بڕیوە، خەڵكی بەبیستنی ئەم هەواڵە بەڕوكەش خەمی خۆیان دەربڕی، بەڵام لەناخیانەوە بەبیستنی ئەم هەواڵە زۆر خۆشحاڵ بون، چونكە هیچ كەسێك ئەو خودا سەیرەی خۆش نەدەویست كە قسەگەلێكی سەیری دەكرد، دوبارە هەمان ئەو ڕۆژە"كاپتا"پێی گوتم: گەورەم، كەرستە و ئامێرە پزیشكیەكانت ئامادە بكە، لەبەرئەوەی پێشبینی ئەوە دەكەم لەبەیانیەوە یان دوبەیانیەوە دەبێت بەشێوەیەك كار بكەیت كە بگرە ماوەی نان خواردنیشت نەبێت.

ئەو ڕۆژەی ڕەشپێستەکان خۆیان کرد بەم شارەدا، هەرئەوکاتە بیستم "هورم هب"گەڕاوەتەوە، ڕۆشتم بۆ ئەوەی چاوم پێی بکەوێت، بەڵام دیاربوو کە"هورم هب"لەدوای هەموویانەوە، بەواتا ڕۆژی دوایی دەگاتە ناو شار.

ئەوشەوەی سەربازە ڕەشپێستەکان لەناو شاری"تبس"دابون، بێئەوەی فەرماندەی لەشکریان لەوێ بێت، چەند فرۆشگایەکیان تالان کرد و هێرشیان کردە سەر چەند سۆزانی خانەیەك، بەڵام پاسەوانانی لەشکر کە سپیی پێست و خەڵکی میسر بون، لەبەرچاوی خەڵکی ئەو شارە هەموو ڕەشپێستەکانیان بەست بەدارەوە، بەڵام ئەم سزایە قەرەبوی زیانی خاوەن کاڵاکان و تورەیی خاونی سۆزانیخانەکانی نەدەدایەوە.

ڕۆژی دوایی، سەرلەئێوارەکەی"هورم هب"بەکەشتیەکی جەنگیەوە خۆیی کرد بە"تبس"دا و من بەپەلە خۆم گەیاندە لەنگەرگا بۆئەوەی چاوم پێی بکەوێت، لەوباوەڕەدا نەبوم کە بەئاسانی بتوانم چاوپێکەوتنی لەگەڵدا بکەم، بەڵام هەر ئەوەی پێیان ڕاگەیاند"سینۆهە"هاتووە بۆئەوەی چاوی پێت بکەوێت، فەرمانی دا کە بمبەنە ناو کەشتیەکەوە.

تا ئەوکاتە من ناوی کەشتیەکی جەنگی میسرم نەبینی بوو، بەڵام کاتێك چومە ناو کەشتیەکەوە بینیم جیاوازیەکی زۆر لەنێوان کەشتیەکی جەنگی و کەشتیەکی بازرگانیدا بەدی ناکرێت، جگە لەوەیکە کەشتی جەنگی چەند کەرەستەیەك لەخۆ دەگرێت کە بەو کەرەستانە دەتوانی ئاگری پێ هەڵبدەیت و چارۆکەکانیشی ڕەنگاوڕەنگ و جوان بون و پێش و دوای کەشتیش بەشێوەیەکی جوان ڕازێنرابویەوە.

کاتێك چاوم بە"هورم هب"کەوت، بینیم کە ماسولکەکانی بازوی بەرجەستەتر بون‌و سینەی هەموو فەرماندەکانی لەشکر بەشێوەیەك دەرپەڕی بوو کە وەك سینەی ژنێك وابوو.

"هورم هب"قامچیەکی بەدەستەوە بوو کە دەسکی ئەو قامچیە ئاڵتون بوو و بازنەیەکی ئاڵتونیش بەسینەیەوە دەبینرا، کاتێك گەشتمە بەردەمی، هەردوو دەستم خستە سەر ئەژنۆم و سوژدەم بۆ "هورم هب" برد، ئەویش پێکەنی و وتی: ئەی"سینۆهە"ی کوڕی کەر، لەکاتێکی باشدا هاتیت بۆلام، بەڵام لەبەرئەوەی گەورە بوبو ماچی نەکردم و منیش نەموێرا ماچی بکەم.

لەتەنیشت"هورم هب"ەوە پیاوێکی قەڵەو و باڵاکورت دەبینرا کە لەگەرماندا ئارەقی لی دەچۆڕا، نەم دەزانی ئەو کەسە کێیە، لەناکاو بەسەرسوڕمانەوە بینیم"هورم هب"قامچییەکەی خۆی کە هێمای فەرماندەییە دا بەو کەسە و ملوانکەی زێڕینی لەملی داکەند و ئاڕاستەی ئەوی کرد و وتی: ملیوانکەکە لەمل بکە و لەمڕۆوە تۆ فەرماندەی لەشکری میسر لەئەستۆ بگرە، بۆئەوەی خوێنی نەتەوەی میسر بەدەستە پێسەکانی تۆ بڕێژرێت، نەك بەدەستەکانی من.

من لەکۆنەوە ئاشنای شێوازی قسەکردنی"هورم هب"بوم و دەمزانی کە ئەوەی لەدڵیدایەتی دەیهێنێتە زمان و کەسێکی ڕوکەشپەرست نیە و دەمبیست کە لەگەڵ خودی فیرعەونیشدا بەوشێوەیە قسە دەکات و بگرە هەندێ جاریش لێی توڕە دەبێت، بەڵام من بەلای ئەوەوە جیاواز بوم و هەرگیز لێم توڕە نەدەبوو و سوکایەتی پێ نەدەکردم.

کاتێك قامچی و ملیوانکەکەی دا بەو پیاوە قەڵەو و باڵاکورتە، ڕویکردە من و وتی: "سینۆهە" لەبەرئەوە پێموتی لەکاتێکی باشدا هاتی کە من ئامادەم بێم بۆماڵی تۆ، چونکە لەم کاتژمێرە بەدواوە من فەرماندەی لەشکری میسر نیم.

ئەگەر لەماڵەکەتدا حەسیر دەست بکەوێت حەزدەکەم لەسەری بخەوم و ماندویەتی خۆم دەربکەم و بحەوێمەوە، بۆئەوەی لەوە زیاتر گفتوگۆ لەگەڵ شێتەکاندا نەکەم.

ئەوکات دەستی خستە سەر شانی ئەو کابرا قەڵەو و باڵاکورتە و وتی:"سینۆهە"بەوردی تەماشای ئەم پیاوە بکە و جوان بیناسە، چونکە ئەم پیاوە کەسێکە کە لەم کاتژمێرە بەدواوە نەك چارەنوسی"تبس"بەڵکو چارەنوسی میسریشی لەدەستدایە، لەبەرئەوەی ئەو لەئێستا بەدەواوە فەرماندەی تازەی لەشکری میسرە و فیرعەون ئەوی کردووەتە جێگری من، چونکە من بەفیرعەونم وت: شێتە، بەڵام ئەگەر تۆ جوان لەم پیاوە ورد بیتەوە، تێدەگەیت کە فیرعەون دوبارە پێویستی بەمن دەبێتەوە.

فەرماندەی تازەی لەشکر کە ئارەق بەسەروچاویدا دەچۆڕا وتی:"هورم هب"لەمن توڕە مەبە، چونکە تۆ دەزانی کە من نەمدەویست جێگای تۆ بگرمەوە، چونکە من پیاوی جەنگ نیم و واهەست دەکەم کە بێدەنگی باخ و یاریکردن لەگەڵ ئەو پیشیلانەی لەو باخەدا هەمە، لەبیستنی هەراوهوریای جەنگ بەلاوە باشتر بێت، بەڵام

دوای ئەوەی فیرعەون منی کردە فەرماندەی لەشکری تازەی میسر، نەمتوانی ڕێز لەویست و دەستەڵاتی نەگرم، بەتایبەت کاتێك وتی نەجەنگ بەرپا دەبێت و نە خوێن دەڕژێت، بەڵکو"ئامون"خۆی لەخۆیەوە سەرنگون دەبێت و لەناو دەچێت.

"هورم هب"وتی: یەکێك لە کەموکورتیە مەزنەکانی فیرعەون ئەوەیە کە کاتێك ئارەزوی شتێك دەکات، دەبینێت لەجیهانی ئەندێشەدا هاتووەتە دی، ئەو کات وا هەست دەکات ئەوەی بیری لێکردووەتەوە بەڕاستی بە کردار کراوە.

لەبارەی"ئامون"یشەوە بەهەمان هەڵەدا چووە و وا هەست دەکات کە بێ خوێنڕشتن دەتوانێت خودای ئامون سەرنگون بکات و خودای"ئاتون" لەجێی ئەودا دابنێت، لەبەرئەوەی دەزانێت کە تۆ پشیلەکانت خۆشدەوێت و ڕقت لەجەنگ و شەڕ و شۆڕە، ئەرکی لەناوبردنی خودای"ئامون"ی بەتۆ سپاردووە، بەڵام من پێت دەڵێم کە بێ خوێنڕێژی ئەم کارە بەهیچ شێوەیەك ئەنجام نادرێت و تۆ دەبێت بڕێکی زۆر لەخەڵکی بەکوشت بدەیت، بۆئەوەی سەرکەویت و خودای"ئامون"سەرنگون بکەیت، بەڵام ئەو خوێنانەی کە دەڕژێنرێن، لەبەرئەوەی هی تۆ نیە، هیچ زیانێکت پێناگەیەنێت.

دوای ئەم گوتەیە"هورم هب"چەپۆکێکی بەهێزی دا لەپشتی ئەو پیاوە کە بووە هۆی ئەوەی ئەو پیاوە کوڕ ببێت و ئەوکات بەمنی وت: باپێکەوە لەم کەشتیە بڕۆین.

کاتێك دەمانویست لەو کەشتیە دابەزین، ئەو سەربازانەی لەوێ دانیشتبوون هەستانە سەرپێ و نێزەکانیان لەلا تەنیشتیانەوە ڕاگرت و سڵاویان بۆ"هورم هب"کردو ئەویش بەسەربازەکانی وت:

من ماڵئاوایی لەئێوە دەکەم، بەڵام دەزانم ڕۆژێك دێت دەگەڕێمەوە بۆ لاتان و تا ئەو ڕۆژەی دێمەوە لاتان گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەم پیاوە بن و چاودێری لەڕێکخستنە سەربازیەکان بکەن، ئەگینا دوای گەڕانەوەم ئەوەندە دار و قامچیتان لێدەدەم کە کۆشتی جەستەتان قاژ قاژ ببێت.

سەربازەکانی پێکەنین و"هورم هب"وتی:کەلوپەلەکانی خۆم لەم کەشتیە دەرناکەم، چونکە دەزانم لێرەدا باشتر پارێزراو دەبن. دوای ئەوە دەستی لەسەر قوڕگی من دانا و وتی: "سینۆهە" ئەمشەو حەز دەکەم خۆم بەشتێکەوە سەرقاڵ بکەم.

وتم: لەمشارەدا مەیخانەیەك بەناوی"کلکی تیمساح"هەیە، جۆرێك خواردنەوەی بۆنداری هەیە کە لەهیچ شوێنێك بگرە لە"بابل"و"کریت"یشدا هاوشێوەی دەست ناکەوێت، بەڵام زۆر بەهێزە و دەبێت خۆت لەخواردنەوەی بپارێزی، ئایا حەز دەکەیت برۆین بۆ ئەوێ و تۆ لەو خواردنەوەیە بخۆیتەوە؟

"هروم هب"وتی:بەڵێ حەزدەکەم برۆم بۆئەو مەیخانەیە.

وتم: لەمحاڵەتەدا فەرمان بدە کە دەستەیەك سەرباز بۆ پارێزگاری تۆ و ڕێگرتن لە هەر ئاژاوەیەك برۆن بۆ ئەو مەیخانەیە.

سەرەڕای ئەوەی"هورم هب"چیتر فەرماندەی لەشکر نەبوو، بەشێوەیەك فەرمانی بەفەرماندەی تازە دا کە وەك بڵێی ئەو پیاوە، هێشتا لەژێردەستی ئەودا کار دەکات و پێی وت: کۆمەڵێك سەربازی شایستە و خاوەن متمانە بنێرە بۆ مەیخانەی"کلکی تیمساح"بۆئەوەی ئەمرۆ و ڕۆژەکانی تر پاسەوانی ئەو مەیخانەیە بکەن و نەهێڵن لەوێدا هیچ شەڕ و شۆڕ و ئاژاوەیەك بەرپا ببێت.

من لەدەرکردنی ئەم فەرمانە ڕازی بوم، چونکە واهەستم دەکرد ئەگەر لەمشارەدا ڕوداوی دڵتەزێن ڕوبدات، ئەوا مەیخانەی"کلکی تیمساح"یەکێك دەبێت لەو شوێنانەی کە پێش هەرشوێنێکی تر هێرشی بۆ دەبرێت، لەبەرئەوەی هەموویان دەزانن کە لەپشت ئەو مەیخانەوە چەند ژورێك هەیە کە بارەگای مامەڵەکردنی ئەو جۆرە کەسانەیە کە دەستدرێژی دەکەنە سەر گۆڕی مردووەکان یان زێڕ و زیوی دزراو لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکەن.

هەندێك خەڵك ئاگاداری ئەم نیهێنیانە بون، بۆیە لەکاتی بەرپابونی هەر ئاژاوە و ڕوداوێکی دڵتەزێندا، ئەو جۆرە کەسانە سەرەتا هێرشیان بۆ ئەم مەیخانەیە دەبرد و زیانێکی زۆریان بە"کاپتا"دەگەیاند.

بەڵام دوای ئەوەی"هورم هب"فەرمانی دا دەستەیەك سەرباز پارێزگاری لەو مەیخانەیە بکەن، چیتر ئەو ترس و هەڕەشەیە لەناو چوو.

من ڕێنمایی"هورم هب"م لەئەستۆگرت و ئەوم بردەمەیخانەی"کلکی تیمساح"ەوەو لەیەکێك لەژورەتایبەتەکانی ئەومەیخانەیەدا دانیشتین و "مریت"خواردنەوەی تایبەتی بۆ هێنا و "هورم هب"یش بەیەکجار هەمووی هەڵقوڕی و دەستی کرد بەکۆکین، بەڵام دوای چەند ساتێك، ویستی پێکێکی تر لەو خواردنەوەی بۆ بهێنن.

"مریت"جارێکی تر لەهەمان خواردنەوە پێکێکی تری بۆ"هورم هب"هێنا و ئەویش خواردیەوە و پێی وتم: ئەم ژنە، زۆر جوانە، ئایا دۆستایەتی لەگەڵ تۆدا هەیە؟.

وتم: دۆستایەتی من لەگەڵ ئەم ژنەدا دۆستایەتیەکی ئاساییە و هیچ لایەنێکی تایبەت لەخۆ ناگرێت.

من چاوەڕێی ئەوەبووم کە"هورم هب" دەستی بخاتە سەردەستی"مریت"، بەڵام ئەو بەرێزەوە ژنەکەی ڕەوانە کرد، دوای ئەوەی ئەو ڕۆشت وتی:"سینۆهە"سبەی ئەو ڕۆژەیە کە لە"تبس"دا خوێنی تێدا دەڕژێت، لەبەرئەوەی فیرعەون بڕیاری داوە خودای خۆی بکاتە جێنشینی خودای"ئامون"و لەبەرئەوەی من فیرعەنم خۆش دەوێت، نەمتوانی ڕێگری ئەم هەڵوێستەی بکەم، چونکە دەزانم ئەگەر ڕێگریم لێ بکردایە، ئەوا فیرعەون بەشێوەیەك خەمگین دەبوو کە لەوانەبوو بەهۆی دڵتەنگیەوە بمرێت. تۆ دەزانی کە من ئەو کەسەم کاتێك کە لەبیاباندا فیرعەونی جێنشین بوو، بەئامادەبونی تۆ ئەوم بەجلەکانی خۆم داپۆشی بۆئەوەی سەرمای نەبێت و لەهەمان ئەو کاتەوە خۆشەویستی ئەو پیاوە لەڕۆحی مندا جێگیر بووە.

بەڵام لەبەرئەوەی دەزانم، هەوڵی فیرعەون بۆ گۆڕینی خودا، دەبێتە هۆی ڕشتنی خوێن لەم شارەدا، دەستم لەفەرماندەیی میسر هەڵگرت، بۆئەوەی نەبمە هۆی خوێنڕشتنی خەڵکی، چونکە دەزانم ئەگەر من ئەم بەرپرسیاریەتیە لەئەستۆ بگرم، لەئایندەدا، لەلای خەڵکی میسر کەسێکی نەفرەتکراوم لێ دەردەچێت.

"سینۆهە"لەوکاتەوەی من و تۆ لەسوریا لەیەك جیابوینەوە، ئاوێکی زۆر بەسەر فەرشی ڕوباری"نیل"دا تێپەڕیوە و زۆرجار ئەم ڕوبارە هەستاوە و کەنارەکانی خۆی کردووە بەژێر ئاوەوە، بەهەمان شێوەی لافاوی ئەو ڕوبارە ڕوداوگەلێکی زۆر لەم شارەدا ڕویداوە.

بۆنمونە بەپێی فەرمانەکانی فیرعەون، ڕۆشتم بۆ باشور بۆئەوەی تەواوی سەربازگەکانی ئەو لەناو ببەم و سەربازە ڕەشپێستەکان بهێنم بۆ"تبس"بۆیە ئێستا لەهیچ یەك لەشارەکانی باشور سەربازگەیەك بەدی ناکرێت و لەئێستادا هەموو سەربازخانەکان خاڵین.

ئەم کارەش لە سوریادا دوبارە دەبێتەوە و بێگومان سوریاش ڕادەپەڕێت، ئەوکات لەوانەیە فیرعەون پەی بەم شێتیەی خۆی ببات و ئاگاداری ئەوە بێت کە بێسەرباز ناتوانێت پارێزگاری لەهیچ وڵاتێك بکات.

لەوکاتەوەی فیرعەون بڕیاری داوە بەپێی گوتەی خودای خۆی ڕەفتار بکات، چیتر لەکانە کانزاکانی میسر، شتێك کە شایەنی تێبینی بێت دەرناهێنرێت، لەبەرئەوەی دەڵێت نایەوێت بەندەکان ئازار بدات و ئەوانەش کە تەمەڵن و لەکانە کانزاکاندا کارناکەن بەقامچی لێیان نادەن. من سەرەڕای ئەوەی سەربازم و هیچ کارێکم بەخوداکانەوە نیە، نیگەرانی ئەم خودا تازەیەی فیرعەونم، چونکە دەبینم ئەم خودایە دەیەوێت لەڕێی خوێنڕێژیەوە جێگەی خودای ڕابردوو بگرێتەوە، بۆیە من سەر لەکاری خوداکان دەرناکەم، بەڵام لەوە تێدەگەم کە خوداکان بۆئەوە هاتوونەتە بون کە خەڵکی خۆشبەخت بکەن، نەك خوێنیان بڕێژن، بۆیە لەدیدی سیاسیەوە پشتگیری ئەم هەڵوێستەی فیرعەون دەکەم، بەڵام نەك بەوشێوەیەی کە دەیەوێت خودای "ئامون"سەرنگون بکات.

سودی سیاسی ئەم هەڵوێستەی فیرعەون ئەوەیە کە خودای"ئامون" بەلەبەرچاوگرتنی ئەوەی ماوەیەکی درێژخایەنە لەمیسردا خودایی خۆی کردووە، زۆر قەڵەو بووە و خاوەنی کێڵگە و ڕەز و ڕانە ئاژەڵگەل و ئاشگەلێکی زۆرە. کاتێك فیرعەون ئەم خودایەی سەرنگون کرد، تەواوی سەروەت و سامانی خودای"ئامون" دەبێت بەهی فیرعەون، بەڵام ئەم کارە، بەوشێوەیەی کە فیرعەون دەیەوێت ئەنجامی بدات، دەبێتە هۆی کوشتنی هەزاران کەس و وێران کردنی شاری"تبس".

وتم: "هورم هب"من لەدیدی بنەچە و یاساکانەوە، بەسەرنگونکردنی خودای "ئامون"ڕازیم، لەبەرئەوەی ئامون خودایەکی تەماعکار و بێبەزەیی و دژی ئازادی خەڵکیە و بەشێوەیەك لەشێوەکان لەڕێی کاهینەکانەوە خەڵکی لەنەزانیدا هێڵاوەتەوە کە لەم وڵاتەدا هیچ کەسێك ناتوانێت لەهیچ شتێك تێبگات، ئەگەر تێش بگات ناتوانێت دەری ببڕێت و ئەگەر دەریشی ببڕێت کاهینەکان لەناوی دەبەن و خەڵکی لەژیانیاندا هەمیشە ترسی"ئامون"یان لەدڵدا بووە، بەڵام "ئاتون" خودایەکە کە بێ تەماع و ئاشتی دۆست و ئازادی خوازە و دەیەوێت خەڵکی لەترس ڕزگار بکات.

"هورم هب"وتی:من لایەنگری ئەم بیروبۆچونەی تۆ ناکەم، چونکە ئەو خوایەی ترسناك نەبێت بەهەڕەشە ئامێزی دەزانم، لەبەرئەوەی ناتوانی فەرمانڕەوایی

نەتەوەیەك بێ ترس بکەیت، ئەم خودا تازەیە سەرەڕای ئەوەی میهرەبان و ئاشتی دۆست و ئازادی خوازە، بەڵام بۆ میسر لەخودای کۆن هەرەشە ئامێزترە. سەرەڕای ئەوەش من لەربارەی پێویست بونی سەرنگونکردنی خودای "ئامون" لایەنگری تۆ دەکەم و دەڵێم دەبێت ئەم خودایە لەناو ببرێت، بەڵام نەك بەوشێوەی کە فیرعەون دەیەوێت ئەنجامی بدات، ئەگەر فیرعەون جێبەجێکردنی ئەم کارەی بەمن بسپێردایە، من بەشێوەیەك خودای"ئامون"م لەناو دەبرد کە خوێنی تاکە کەسێکی ئەم نەتەوەیە نەڕێژرێت.

لێم پرسی: تۆ چیت دەکرد؟

"هورم هب"وتی: من لەشەوێکدا، لەسەرتاسەری میسر، بەشێوەیەکی نهێنی و بێئەوەی کاهینەکانی پەرستگا ئاگایان لێ بێت، تەواوی کاهینە پلە یەکەکانی "ئامون"م دەکوشت و کاهینەکانی تریشم دەنارده کانەکانەوە بۆئەوەی کانزایان پێدەربهێنن، بەشێوەیەك ئەم کارەم ئەنجام دەدا کە بەیانی ڕۆژی دوایی کاتێك خەڵکی لەماڵ دێنە دەرەوە، یەك کاهینیان لەناو پەرستگاکاندا نەبینیایە و بەمشێوەیەش خودای"ئامون" لەناو دەچوو، چونکە توانای"ئامون" بەکاهینەکانیەوە پەیوەست دەکرێت و کاتێکیش"ئامون"کاهینی نەبێت توانایشی نابێت. خەڵکیش دوای ئەوەی بینیان خوداکان نیە، هەر خودایەکیان پێنیشان بدەیت یەکسەر دەست بەپەرستنی دەکەن، چونکە هەست و ویژدانی خەڵکی توانای ئەوەی نیە جیاوازی لەنێوا دوو خودادا دروست بکات. بەڵام لەبەرئەوەی فیرعەون دەیویست ئەم کارە بەئاشکرا ئەنجام بدات، ئەمڕۆ لە"تبس"و زۆرێك لە شارەکانی میسر، هەموو منداڵێك دەزانێت کە فیرعەون دەیەوێت خودای "ئامون"لەناو ببات و هەر لەبەرئەوەش کاهینەکان خەڵکیان لەپەرستگای"تبس"و شارەکانی تردا کۆکردووەتەوە و هانی ئەوەیان داون بەرگری لەم خودایەیان بکەن، خەڵکیش بەهۆی هاندانی کاهینەکانەوە بەرگری لێدەکەن و بەم شێوەیەش خوێن لەشارەکاندا دەڕێژرێت.

دوای ئەو گوتەیە"هورم هب"داوای پێکێکی تری خواردنەوەی"کلکی" تیمساح"ی کرد و خواردیەوە، پێکی سێیەم سەرخۆشی کرد و سەری خستە سەر هەردوو دەستی و بۆ بەدبەختی و کوشت و کوشتاری خەڵکی میسر دەستی کرد بەگریان. من ویستم ڕێ لەگریانی بگرم، بەڵام ئاگاداری ئەوە بووم کە"هورم هب"خەوی لێ کەوتووە.

*بەشی سییەم*

## لە"تبس"دا کوشت و کوشتاری کردن

من ئەو شەوە، لەو ژورە تایبەتەدا، پارێزگاری"هورم هب"م لەئەستۆ گرتبوو، چونکە ئەگەر لەوێ بەجێم بهێشتایە، لەوانەبوو فەرماندەی تازەی میسر بیکوژێت.

بەڵام لەسەر سەکۆی ئەو مەیخانەیەدا تابەیانی دەنگی پێکەنین و دەنگەدەنگی ئەو سەربازانەی کە پاسەوانی ئەو مەیخانەیان دەکرد دەهات، لەبەرئەوەی"کاپتا"و شاگردەکەی دەیانزانی کە ڕوداوگەڵکی ترسناك ڕوودەدات، ئاوجۆ و خواردنێکی باشیان دابوو بەسەربازەکان بۆئەوەی لەمرێیەوە بیانکەن بەهاوڕێی خۆیان.

لەو شەوەدا نەك تەنها من نەخەوتوم، بەڵکو لەشاری"تبس"دا هیچ کەسێك بێ لەئەفسەرەکان و سەربازانی فیرعەون خەویان لێ نەکەوتووە، دوای ئەوەش بیستم کە خودی فیرعەونیش لەوشەوەدا بێدار بووە، چونکە خەڵکی دەیانزانی ڕۆژی دوایی، لەژیانی دانیشتوانی شاری"تبس"دا ڕۆژێکی مەزن دەبێت و لەوڕۆژەدا ئەگەری ئەوە هەیە کە لەنێوان لەشکری میسر و دانیشتوانی شاردا کە لەپەرستگای مەزنی "ئامون"و لەبەرامبەر پەرستگادا قەرەباڵخیەکی زۆر دروست دەکەن، شەڕێکی مەزن بەرپا دەبێت.

لەوشەوەدا کاهینەکانی پەرستگای"ئامون"قوربانیان سەربڕی و گۆشتیان دا بەو کەسانەی لەناو و دەرەوەی پەرستگادابوون و بەشێوەیەك هاواریان بەرز دەبویەوە کە من لەژوری تایبەتی مەیخانەدا گوێم لەدەنگیان بوو.

کاهینەکان سات لەدوای سات ناوی"ئامون"یان دەهێنا و دەیانوت هەرکەسێك لەپێناو ئاموندا خۆی بکات بەقوربانی، بەدڵنیاییەوە خۆشبەختیەکی هەمیشەیی

بەدەست دەهێنێت. من دڵنیام ئەگەر کاهینەکان، هانی خەڵکیان نەدایە، خوێنڕێژی بەیانی و ڕۆژەکانی تریش نەدەهاتە پێشەوە.

چونکە ئەگەر کاهینەکان خۆیان بدایە بەدەستەوە، فیرعەون کە ئاشتی دۆستە و ڕقی لەخوێنڕێژیە، ئازاری پێنەدەگەیاندن و لەوانەش بوو بەشێك لەزەوی و زێڕ و زیوی "ئامون"ی بدایە بەکاهینەکان بۆئەوەی پاشماوەی ژیانیان بەئاسودەیی تێپەڕێنن.

بەڵام کاتێك کەسانێك خوویان بەوەوە گرتووە کە خاوەنی دەسەڵات و توانا بن، بەشێوەیەك پێیەوە پەیوەست دەبن کە لەپێناو پاراستنی توانا و سەروەت و ساماندا، گیانی خۆشیان دەکەن بەقوربانی.

کاهینەکان دەیانزانی ئەگەر جەنگێك لەنێوانیاندا بەرپا ببێت، بێگومان دەبێتە هۆی ئەوەی خەڵکی زۆر ڕقیان لە فیرعەون بکەوێت، چونکە لەکاتی بەرپابونی جەنگدا، سەربازە ڕەشپێستەکان دەکەونە قەتڵ و عامکردنی خەڵکی. گەرچی بەهۆی ئەم خوێنڕێژیەوە پەیکەری "ئامون"سەرنگون دەبێت، بەڵام پەیمانی خوێن، بەشێوەیەك "ئامون"ی لەدڵی خەڵکیدا زیندوو دەکردەوە کە خەڵکی هەرگیز ئەو خودایە فەرامۆش نەکەن و بۆ هەمیشەش نەفرەتیان لە فیرعەون دەکرد کە بۆچی سەربازە ڕەشپێستەکانی خستووەتە وێزەی گیانی خەڵکەکەی خۆیەوە، بەواتا خستونیەتە وێزەی میسریە سپی پێستەکانەوە.

لەڕاستیدا، کاهینەکان، هیواداربون لەڕێی ئەم بەرگریکردن و قەتڵ و عامکردنی خەڵکیەوە،"ئامون"بکەنە خودایەکی جاویدانی، تەنانەت گەر پەیکەرەکەشی سەرنگون ببێت و پەرستگاکەشی دابخرێت.

کاتێك ڕۆژ بویەوە، لەماوەیەکی زۆر کەمدا گەرمی خۆر، پەنگی و خنکێنراوی شەوی ڕابردوی لەناو برد، ئەوکات لەچواڕێ و گۆڕەپانەکانی"تبس"دا دەنگی بوق بەرز بویەوە و چەند بانگەوازکەرێك لەگۆڕەپانێکەوە دەڕۆشتن بۆ گۆڕەپانێکی تر و ئەو فەرمانەی کە لەسەر پاپیرۆس "پاپیرۆسی ئەوسای میسری کۆن"نوسرابوو بۆ خەڵکیان دەخوێندەوە و ناوەڕۆکی ئەو فەرمانەش ئەوە بوو کە ئامون خودایەکی درۆینەیە و دەبێت سەرنگونی بکەن و بۆهەمیشە نەفرەتی لێ بکەن و تەواوی پەرستگاکانی ئەم خودا درۆینەیە، لەمیسری سەر و خوار، هەروەها تەواوی زەوی و

خەڵك و خزمەتكار و زێڕ و زیوی ئەو خودایە بكەوێتە ژێردەستی فیرعەون و خوداکەی"ئاتون"و دوای ئەوە چیتر هەژارەکان دەتوانن خۆیان لەو"هەسێر"و ئەو گۆماوانەی کە لەڕابردوودا بەخودای دڕۆینەوە پەیوەست دەکران بشۆن و لەهەمان ئەو ئاوەش بخۆنەوە، فیرعەون زەوی خودای دڕۆینە دەدات بەو کەسانەی کە زەویان نیە، بۆئەوەی بەسوپاسگوزاری خودای"ئاتون" کشتوکاڵی تێدا بکەن.

کاتێك ئەم فەرمانە لەبەرامبەر خودای"ئامون"دا خوێندرایەوە، خەڵکی لەسەرتادا بێدەنگ بون بۆئەوەی بزانن فیرعەون، لەبەرامبەر ئەم فەرمانەی خۆیدا چی دەڵێت. کاتێك ئەو فەرمانە جێبەجێ کرا کە تەواوی پەرستگا و زەوی و خەڵکی و خزمەتکاران و زێڕ و زیوی"ئامون"لەلایەن فیرعەون و خوداکەیەوە دەستی بەسەردا بگیرێت، هاواریان کرد و خەڵکی بەشێوەیەك لەگەڵیاندا هاواریان کرد کە وات دەزانی بەرد و خشتی دیوار و ماڵەکانیش لەگەڵیاندا هاتونەتە دەنگ.

سەربازە ڕەشپێستەکان کە حەزیان لەڕەنگی سپی و سور بوو، هەر لەبەرئەوەش ڕەنگی سور و سپیان لەڕوخساریان دابوو، کاتێك ئەو هاوارەیان بیست ترسا و تۆقاو بون و بەچاوە سپیەکانیان تەماشای چەپ و ڕاستی خۆیان دەکرد، چونکە دەیانزانی سەرەڕای ئەوەی ژمارەیان زۆرە گەر دانیشتوانی"تبس"پەلاماریان بدەن بەدڵنیاییەوە بەکوشت دەدرێن.

بەڕادەیەك خەڵکی هاواریان دەکرد، کە بووە هۆی ئەوەی بەشی کۆتایی فەرمانەکانی فیرعەون نەبیستن و ئاگاداری ئەوە بوون کە فیرعەون بڕیاری داوە ناوی نەفرەتی"ئامون"لەناو ببات و ناوی"ئەخناتون"یشی لەخۆی نا کە بەواتای "خۆشەویستی خودا" دێت.

کاتێك ئەو فەرمانەیان لەبەرامبەر پەرستگای"ئامون"دا خوێندەوە، من لەوێ نەبوم و لەدواییدا باسی ئەم ڕوداوەم بیست، بەڵام خەڵکی بەشێوەیەك هاواریان دەکرد کە دەنگیان دەگەشتە"کلکی تیمساح"و"هورم هب" بەهۆی دەنگی ئەو خەڵکە لەخەو هەستا و هەستایە سەرپێ و دوبارە دانیشتەوە و وتی:"سینۆهە" ئەو خواردنەوەیەی دوێنێ شەو پێتدام زۆر بەهێزبوو و بوە هۆی ئەوەی تابەیانی خەوم لێ بکەوێت.

"هورم هب"بەهۆی بیستنی هاواری خەڵکی و ئەوەیکە ناوی"ئامون"یان دەهێنایە زمان، ئەو ڕوداوەی کە دەبوو بێتەپێش، کە لەکاتی مەستی و خەوتندا فەرامۆش

كرابوو، هێنایەوە بیر خۆی و كەوتە ڕێ و منیش بەدوایدا ڕۆشتم و لەژوری تایبەتەوە خۆمان كرد بەتەلاری مەیخانەكەدا و بینیم لەسەكۆی مەیخانەكەدا، برێك لەسەربازان كە شەوی ڕابردوو زیادەڕۆییان لەخواردنەوەدا كردبوو و لەسەرخۆشیاندا لەگۆشیەكدا لێی كەوتون، هێشتا لەخەو هەڵنەتساون.

"هورم هب"سەری كرد بەتەشتێكی پڕ ئاودا، بۆئەوەی وریەتی خەوی شەوی ڕابردوو برەوێنێتەوە و دوای ئەوە گۆزەیەك ئاوجۆ و نانێكی لەمەیخانەكەدا هەڵگرت و لەكۆڵانە چۆڵەكانەوە بەرەو پەرستگا كەوتینە ڕێ.

كاتێك لەپەرستگا نزیك بوینەوە، ئەو پیاوە قەڵەو و باڵا كورتە كە فەرماندەی تازەی میسر بوو بەناو"پیپت ئامون" بانگ دەكرا، بەسەر كەژاوەكەی خۆیەوە، بەم شێوەیە لەگەڵ سەربازەكانی خۆیدا دوا:

ئەی سەربازانی وڵاتی"كوش"، ئەی نەبەردانی وڵاتی"شردن" فیرعەون فەرمانی داوە كە ئەم "ئامون"ە نەفرەتیە سەرنگون بكەن و من بەڵێنتان پێدەدەم كە پاداشتی خۆتان وەردەگرن.

دوای ئەم قسەیە فەرماندەی تازەی لەشكر، وەك ئەوەی كۆتایی بە ئەركی خۆی هێنابێت، لەسەر كەژاوەكەی خۆی دانیشت و بەهۆی گەرمای ئاو و هەواوە بەندەكانی دەستیان كرد بەباوەشێن كردنی.

سەرۆكی دەستەكان فەرمانیان دا بە سەربازەكانیان خۆیان بۆ هێرش ئامادە بكەن‌و من و"هورم هب"یش لەبەرامبەر پەرستگادا بوین و دیمەنی یەكەممان بەجوانی بینی كە پڕ لە پیاوانی سپی پۆش و ژنان و منداڵان، هەندێك لەمنداڵەكان هێشتا لەخەو هەڵنەستابون، وا دەهاتە بەرچاو كە هەمویان شەو لەبەرامبەر پەرستگا یان لەحەوشەكەیدا خەوتبێتن.

لەناكاو سەربازە ڕەشپێستەكان كە ڕوخسارێكی ڕەنگاوڕەنگیان هەبوو كەوتنە جوڵەو گالیسكە جەنگیەكانیان خستە ڕێ و ویستیان خۆیان بكەن بەپەرستگای "ئامون"دا.

سەربازەكان بەبنی نێزەكانیان خەڵكیان لەڕێگاكە دور دەخستەوە تا ئەوەی گەشتنە بەردەم دەرگای پەرستگا، بەڵام كاتێك كالیسكە جەنگیەكان ویستیان خۆیان بكەن بەپەرستگادا، خەڵكی بەیەك دەنگ هاواریان كرد"ئامون"و بەیەك جوڵە دەستیان

کرد بەهێرش بردن، لەبەرئەوەی نەیاندەتوانی لەگەڵ سەربازانی جەنگاوەر و بەئەزموندا بجەنگن، بۆیە خۆیان خستە ژێر چەرخی کالیسکەکانیان و بەشێوەیەك بەجەستەیان ڕێگاکەیان لێ بەستن کە ناچار گالیسکەکان ڕاوەستان و ئەسپەکانیش ترسان و دەستیان کرد سمکۆڵان و دەست و پێ وەشاندن و بەو هۆیەوە هاواری ژن و منداڵانیش گەشتە ئاسمان.

خەڵکی بەشێوەیەك وروژاو و توڕەبوبون کە ئەگەر سەربازە ڕەشپێستەکان تا دوایین کەسیان بکوشتایەن دەستیان لەبەرگری کردن هەڵنەدەگرت، بەڵام لەبەرئەوەی ئەفسەرەکان دەیانزانی کە فیرعەون دوپاتی کردووەتەوە کە نابێت خوێن بڕێژرێت، بۆیە فەرمانیان دا پاشەکشە بکەن.

کاتێك خەڵکی بینیان سەرباز و گالیسکەکان پاشەکشە دەکەن و هەندێکیان کوژران و هەندێکیشیان لێ بریندارا بون، هاواری خۆشیان ئەو ناوەی هێنایە لەرزە.

من و"هورم هب"کە چاودێری ئەم ڕوداوانە بوین، بینیمان کە ئەفسەرەکان لەکەژاوەی فەرماندەی لەشکر نزیك بونەوە و پێیان وت: ئەی"پپیت ئامون" ئێمە بێ خوێنرێژی ناتوانین بڕۆینە پێشەوە، لەلایەکی تریشەوە فیرعەون وتویەتی نابێت خوێنی هیچ کەسێك بڕێژرێت.....ئێستا ئێمە چی بکەین؟

فەرماندەی لەشکر ئاگاداری ئەوە بوو کە ناوی خۆی گۆڕیوە و ئەویش بەهەمان شێوە بڕیاری ئەوەی دابوو ناوی خۆی بگۆڕێت و وتی: من"پپیت ئامون" ناناسم، بەڵکو ناوم"پپیت ئاتون"ە، بەواتا ئەو بەرەکەتەی کە لە"ئاتون"ەوە بەدەست هاتووە.

یەکێك لە ئەفسەرانی لەشکر کە قامچیەکی ئاڵتونی لەدەستدا بوو و ئاشکرا بوو کە فەرماندەی هەزاران سەربازە وتی: من نە کارم بە"ئاتون"ە و نە بە"ئامون" و نە بەوانەی خێروبێریان لێ بینیوە، بەڵکو لەتۆ دەپرسم ئێستا ئێمە چی بکەین؟ ئایا ئێستا دەبێت دەست بەسەر پەرستگای"ئامون"دا بگرین یان نە؟

فەرماندەی لەشکر وتی: فیرعەون فەرمانی بەچی داوە ئێوەش هەر ئەوە بکەن، لەبەرئەوەی ئەو وتویەتی نابێت خوێنرێژی بکرێت، ئێوەش بێ هیچ خوێنرێژیەك دەست بەسەر پەرستگاکەدا بگرن و پەیکەری"ئامون" سەرنگون بکەن.

لەکاتێکدا ئەم ڕاوێژکاریە جەنگیە لەکەنار کەژاوەی فەرماندەی لەشکردا ئەنجام دەدرا، خەڵکی بەردی ناو هەیوانی پەرستگا و کۆڵانیان هەڵدەکەند و دەیانگرتە

ڕەشپێستەکان، یەکێك لەو بەردانە دەستی ئەسپی فەرماندەی لەشکری شکاند کە بە کەژاوەکەوە بەسترابویەوە و کەسێکی تریش چاوێکی ئەو ئەسپەی کوێر کرد، کاتێك"پیپت ئاتون"ئەسپەکەی بەکوێری و شەلی بینی تورە بوو، لەکەژاوەکە دابەزی‌و سواری یەکێك لەگالیسکە جەنگیەکان بوو، فەرمانیدا هێرش بۆ پەرستگاکە ببەن.

کاتێك گالیسکە جەنگیەکان کەوتنە جوڵە، ئەو لێخوڕ و سەربازانەی کە لەگالیسکەکەدا بون خەڵکیان هەڵدەستاندە سەرپێ و یەکسەر دوای ئەوە بەچواردەوری گالیسکەکاندا هەڵیاندەواسین و دەیانوت بەم شێوەیە ڕەچاوی فەرمانەکانی فیرعەون دەکەین، لەبەرئەوەی ئێمە خوێنی هیچ کەسێك ناڕێژین، چونکە ئەو کەسەی دەخنکێنرێت خوێنی ناڕێژرێت.

سەربازە ڕەشپێستەکان کەوانەکانیان هەڵگرت و بەنێو ئەو خەڵکەدا دەستیان کرد بەڕاکردن و هەرکەسێکیان بەدەست بهێنایە بەهەردوو دەستیان دەیانخنکاند و من و "هورم هب"بەقێز و نەفرەتەوە بینیمان کە بگرە منداڵ و ژنەکانیشیان دەخنکاند.

خەڵکی لەهەموو لایەکەوە ڕەشپێستەکانیان بەردباران دەکرد و ئەوانیش هەوڵیان دەدا بە قەڵخانەکانیان پارێزگاری لەخۆیان بکەن و هەرئەوەی ڕەشپێستێك بکەوتایەتە دەستی خەڵکیەوە، لەچاو تروکانێکدا پارچە پارچەیان دەکرد.

"هورم هب" کە گۆزەی خواردنەوەکەی بەدەستەوە بوو و نانەکەی بەلاقەدیەوە هەڵواسیبوو، لەسەر یەکێك لە پەیکەرەکانی بەردەمی پەرستگا ڕاوەستا، لاشەی وەك شێر و سەری وەك بەران وابوو، بۆئەوەی گۆڕەپانی ئەو جەنگە جوانتر ببینێت، دەستی کرد بەخواردنی نان و جارجارێکیش من کە گۆزەی شەرابەکەم لێ وەرگرتبوو، پێم دەدایەوە بۆئەوەی لەدوای نانەکە قومێك شەراب بخواتەوە.

"پیپت ئاتون"فەرماندەی تازە لەشکری میسر لەپێش سەربازەکانیەوە هەوڵی ئەوەی دەدا دەست بەسەر پەرستگاکەدا بگرێت، بەڵام بەبۆنەی بەرگریکردنی توندی ئەو خەڵکەوە نەیتوانی ئەو کارە ئەنجام بدات.

لەتەنیشت کەژاوەکەوە کاتژمێری ئاوی لەئاو خاڵی دەبوو و ئەو پیاوە ئاگاداری ئەوە بوو کە کات بەخێرایی تێدەپەڕێت.

لەناکاو بیستم چەند ئەفسەرێکی بانگ کردە لای کەژاوەکەیەوە و پێی وتن، من لەماڵدا پشیلەیەکی مێینەی جوانم هەیە و ئەمڕۆ کاتی"زایین"یەتی و دەبێت

بگەڕێمەوە بۆماڵ، بۆیە داواتان لێدەکەم هەرچی زووترە دەست بەسەر ئەو پەرستگایەدا بگرن و پەیکەری خودای "ئامون"سەرنگون بکەن، ئەگینا سوێند بە"ئاتون" ئەو ملوانکە ئاڵتونە لەملی هەمووتان دادەکەنم و دەستەی قامچیەکانتان دەشکێنم.

سەرۆکی سەربازەکان تێگەشتن، ئەگەر دەست بەسەر ئەو پەرستگایەدا نەگرن، لەکارکەیان لادەبرێن، بۆیە سەربازەکانی خۆیان کۆکردەوە و بەپێی تەکنیکی سەربازی فەرمانی هێرش بردنیان پێدان.

لەوکاتژمێرە بەدواوە چیتر گرنگی بە فەرمای فیرعەون نەدرا کە دروشمەکەی بریتی بوو لەوەی کە نابێت خوێنی هیچ کەسێك برێژرێت، سەربازە ڕەشپێستەکان نێزەکانی خۆیان دەرکرد بەورگ و سینەو قورگی ژن و پیاو و منداڵدا و نێزەکانیان لەخوێنی خەڵکی سور هەڵگەڕابون، بەڕادەیەك خوێن لەبەردەم پەرستگادا ڕێژرابوو کە خودی سەربازە ڕەشپێستەکان بەسەر خوێندا پێیان دەخلیسکا و دەکەوتن.

بەڵام هەرکەسێك بکەوتایەتە سەر زەوی یەکسەر بەکوشت دەدرا و کاتێك کاهینەکان بینیان ئەوان دەستیان بەهێرشێکی توند کردووە، دەرگای چونە دەرەوەی پەرستگایان کردەوە و خەڵکی بەترس و تۆقانێکەوە دەستیان کرد بەهەڵهاتن.

سەربازە ڕەشپێستەکان هەڵهاتووەکانیان تیرباران کرد و هەندێیانیان تەختی زەوی کرد و دوای ئەوە گالیسکە جەنگیەکان کەوتنە دوای هەڵهاتووەکانەوە.

هەڵهاتووەکان بەدەم گریانەوە خۆیان کرد بەپەرستگا تازەکەی"ئاتون"و لەتوڕەییاندا کاهینە تازەکانی پەرستگای خودای تازەی"ئاتون"یان کوشت و کاتێکیش سەربازەکان لەدوای ئەوانەوە خۆیان کرد بەو پەرستگایەدا، لەوێش خوێنێکی زۆر ڕژایە سەر زەوی، دوای ئەوەی جەنگ کۆتایی پێهات و کوژراوەکانیان ژمارد، دەرکەوت کە سەد کەڕەتی سەد کەس بەکوشت دراوە.

کاهینەکانی پەرستگای"ئامون"دەرگای چونە دەرەوەیان کردەوە بۆئەوەی خەڵکی هەڵبێن، بەڵام دەرگای چونە ژورەوەیان کە سەرتاپای لەمس دروست کرابوو بەست و بۆیە ناچار سەربازە ڕەشپێستەکان لەبەردەم دەرگای مسین و حەساری بەرزدا ڕاوەستان.

ئەوانە سەربازگەلێك بون كە بەردەوام لەدەشتەكاندا دەجەنگان و هێرشیان دەبردە سەر ماڵی ئەو لادێیانەی كە لەقامیش دروست كرابوو، بۆیە نەیاندەزانی بەچ شێوەیەك دەبێت هێرش بكەنە سەر قەڵایەك كە خاوەنی دیوار و حەسارێكی بەرز و دەرگایەكی زۆر توند و بەهێزە.

كاهین و تەواوی بەرگریكارەكانی پەرستگا لەسەرەوە نێزەیان بۆ سەربازەكان هەڵدەدا یان سەربازەكانیان تیرباران دەكرد و هەندێك لەڕەشپێستەكانیان لەبەردەم پەرستگاكەدا كوشت.

بەهۆی ئەوەی بڕێكی زۆر لەژن و پیاو و منداڵ كوژرابوون، زەویان بەخوێن سور ببوو، بۆیە مێشێكی زۆر لەوێدا كۆ بویەوە و "پیپیت ئاتون" فەرماندەی لەشكر بەدەم هاوارەوە وتی"بخوردم" بۆ بهێنن و دایگرسێنن، بۆئەوەی بۆنی قێزەون و هێڵنجدەری ئەم خوێنە لەناو ببات و مێشەكان دور بكاتەوە.

دوای ئەوەی بخوردیان داگیرساند فەرماندەی تازەی لەشكری فیرعەون وتی: زۆر لەوە دەترسم كە فیرعەون لێمان توڕە ببێت، چونكە ئەو بەئێوەی وتبوو كە پەیكەری "ئامون"سەرنگون بكەن و خۆتان لەڕشتنی خوێنی خەڵكی بپارێزن، بەڵام ئێوە خوێنی خەڵكیتان ڕشت بێئەوەی پەیكەری"ئامون"سەرنگون بكەن، كارێك كە ڕویداوە بێ چارەسەرە و من تەنها دەتوانم هەوڵی ئەوە بدەم توڕەیی فیرعەون ئێوە نەگرێتەوە و ئێستاش دەڕۆم بۆ لای و لەوانەشە سەردانی ماڵی خۆشم بكەم بۆئەوەی بزانم ئایا پشیلە مێینەكەم بەچكەی بووە یان نە، ئێوە لەنەبونی مندا خوردو خۆراك و خواردەمەنی بدەن بەسەربازەكان و پێیان بڵێن ئەوەندە خۆیان ماندوو نەكەن، لەبەرئەوەی هەوڵی ئەوان بێهودەیە، چونكە ئێمە بۆ زاڵ بون بەسەر ئەم پەرستگایەدا كەلەئێستادا شێوەی قەڵایەكی لەخۆگرتووە، كەرەستەی پێویستمان لەدەستدا نیە و من فەرماندەیەكی بەئەزمونم و دەزانم هەرچەنێك هەوڵی ئەوە بدەم بۆئەوەی دەست بەسەر ئەم قەڵایەدا بگرم دواجار هەوڵەكانم بێئەنجام دەبێت، بەڵام من لەم ڕوەوە هیچ تاوانێكم نیە، چونكە فیرعەون پێی وتوم چواردەوری ئەم قەڵایە بدەین و دەستی بەسەردا بگرین و منیش كەرەستەی دەست بەسەراگرتنی ئەم قەڵایەم لەگەڵ خۆمدا نەهێناوەتە ئێرە.

لەوڕۆژەدا چیتر دوای ئەوە ڕوداوێکی ئەوتۆ کە گرنگ بێت ڕوینەدا و ئەفسەرەکان فەرمانیان بە سەربازانی ڕەشپێست و سەربازەکانی"شردن"-سەربازی لیبی ئەو سەردەمە- دا کە لەو لاشانەی کە لەژێر گەرمی خۆری هاویندا زۆر زوو دەئاوسێن، دور بکەنەوە.

لەوڕۆژەدا بۆ یەکەمین جار، خەڵکی ئەوەیان بەچاوی خۆیان بینی کە قەلەڕەش و داڵەکەرخۆرە لەبیابان و کێوەکانی دەوروبەری"تبس"ەوە هاتن و هێرشیان بۆ شار برد، بۆئەوەی لاشەی کوژراوەکان بخۆن، لەکاتێکدا کە تا ئەو ڕۆژە هیچ کەسێك ئەوەی بەخەیاڵدا نەدەهات کە ڕۆژێك لەڕۆژان ئەم جۆرە باڵندانە هێرشیان بۆ شاری"تبس" بردبێت.

دوای ئەوەی سەربازەکان لەدیواری پەرستگا دور کەوتنەوە، ئەو گالیسکانەی خواردنی سەربازەکانیان هەڵگرتبوو، خواردن و خواردنەوەیان بەنێو سەربازەکاندا دابەش دەکرد.

سەربازەکانی"شردن"لەڕەشپێستەکان هۆشیارتربوو، چونکە لەباتی ئەوەی لەژێر تیشکی خۆردا دانیشن، چونە ناوماڵەکانی دەوروبەری پەرستگا کە هی کەسە دەوڵەمەندەکان بوو و لەژێر زەمینی ئەو ماڵانەدا هێرشیان بۆ ئەو خواردنەوانە برد کە لەوێدا هەڵگیرابون. ڕەشپێستەکان بۆماوەیەك لەژێر تیشکی خۆردا مانەوە، بەڵام دوای ئەوەی پەییان بەوە برد کە دەتوانن دەست بەسەر ماڵەکانی دەوروبەریاندا بگرن و لەوێدا بژین، ئەوانیش بەهەمان شێوەی سەربازەکانی"شردن"دەستیان بەسەر ماڵەکانی دەوروبەری پەرستگادا گرت بۆئەوەی تێیدا بحەوێنەوە.

ئەوشەوە لە"تبس"دا چراکان دانەگیرسان و شەقام و کۆڵان و ڕوباری"نیل"تاریك بوو، بەڵام سەربازە ڕەشپێستەکان و"شردن" مەشخەڵەکانیان داگیرساند و هێرشیان بردە سەر ماڵەکان و ئەوەی شایەنی هەڵگرتن بوو فەرهودیان کرد و ژنە لاوەکانیشیان کرد بەخوشکی خۆیان.

خەڵکیش لەترسی سەربازەکان لەماڵەکانیان هاتنە دەرەوە و بەشەقامەکاندا پرژ و بڵاو بون، ئەوکات سەربازەکان بەهەر کەسێك بگەشتنایە لێیان دەپرسی ئایا تۆ لایەنگری"ئامون"یت، یان لایەنگری"ئاتون" و ئاشکرابوو کە هیچ کەسێك نەیدەوێری بڵێت لایەنگری خودای کۆنە، بۆیە هەمویان خۆیان بەلایەنگری"ئاتون"ناساند.

بـەڵام سـەربازەکان دەیـانوت تـۆ درۆ دەکـەیت، چـونکە ئێمـە ئـەمڕۆ تۆمـان لەپەرسـتگای"ئـامون"دا بینـوە، دوای ئـەوە سـەریان دەبـڕی و جـل و ئەنگوسـتیلە کانزاییەکانیان لێ دەکردەوە و بەجێیان دەهێشت.

هەموو کەسێك دەیوست لەشاری"تبس"هەڵبێت، بەڵام نەیاندەتوانی، چونکە سەربازەکان تەواوی ڕێگاکانی چونە دەرەوەی شاریان داخستبوو، بەردەمی ڕوبارەکانیشیان بەکەشتیە جەنگیەکان گرتبوو و دەیانوت: فیرعەون وتویەتی ڕێ لەهەڵهاتن و دەرچونی خەڵکی بگرن، بۆئەوەی کاهین و پەیڕەوانی"ئامون"زێڕ و زیوی پەرستگای خودای نەفرەتی کە لەژێر زەمینەکانی پەرستگادا شاردراونەتەوە لەگەڵ خۆیاندا نەیبەنە دەرەوەی شار.

لەدوای ئەوە ئەو ڕۆژە هەوای"تبس"بەهۆی بۆگەنی ئەو لاشانەی کە لەبەردەم پەرستگا و ناو پەرستگا و کۆڵان و شەقامەکاندا کەوتبون ئاڵودە بوبو و ئاشکرانەبو دەبێت چی لەو لاشانە بکەن و بەچ شێوەیەك مۆمیایان بکەن؟

مردووخانەی"تبس" بە پێی نەریتە کۆنەکان ئامادە نەدەبوو لاشەی کوژراوەکان وەرگرێت، مەگەر ئەوەی دادوەری مەزن فەرمانی لەسەر دابێت تا ئەو لاشانە وەرگرن. چونکە لەوانەیە لاشەی ئەو کەسانەش کە خەڵکی دەکوژن بهێنرێتە ناو مردووخانەکەوە بۆئەوەی وەك کەسە بێدەرەتانەکان مۆمیایان بکەن. هەر لەبەرئەوەش دەبێت پزیشکێکی میسری پشتگیری ئەوە بکات کە لاشەی بریندار بەهۆی نەشتەرگەریەوە وای لێهاتووە، یان دادوەری مەزن فەرمان دەربکات کەسی کوژراو لەمردووخانەدا وەرگیرێت و لاشەکەی مۆمیا بکەن.

گریمان ئەم دادوەرە مەزنە دژی خودای تازە بێت و فەرمان بە مردووخانە بدات لاشەی کوژراوەکان بۆ مۆمیاکردن وەرگرن، بەڵام مردووخانەکان وەریان ناگرن، چونکە گۆم و هەسێری مردووخانەکە ئەوەندە ڕێگای نەبوو کە سەد کەڕت سەد لاشە بەیەکجار بۆ مۆمیاکردن وەرگرێت.

سەرەڕای ئەوەش کارمەندانی مردووخانەکە ئەو ڕێکخراوە دژی خودای تازە بون، چونکە ئەوە بڵاو بوبویەوە کە خودای تازە دەیەوێت نرخی مۆمیاکردنی مردووەکان هەرزانتر بکات.

چەند ساڵێك لەوەوپێش، پێش ئەوەی من گەشتە مەزنەکانی خۆم دەست پێبکەم کە پێشتر بۆم باسکردن، کاتێك بۆ مۆمیاکردنی لاشەی دایك و باوکم رۆشتم بۆ مردووخانە، کارمەندانی ئەو رێکخراوە سەرەڕای ئەوەی هەرچیەکیان دەستبکەوتایە دەیاندزی ساکاڵای ئەوەیان دەکرد کە موچەیەکی کەمیان پێدەدەن و دەبێت مۆچەیان بۆ زیاد بکەن و وەك پێشوو ئامادە نەبون ئەو موچەی خۆیان کەبەکەمی دەزانن کەمتر بکەنەوە.

ئەفسەرانی لەشکر لەترسی فیرعەون رێیان بەخزمانی مردووەکان نەدا لاشەی خزمەکانی خۆیان لەبەردەم پەرستگا و شەقام و کۆڵانەکاندا هەڵگرن و بیانگوازنەوە بۆ مردووخانە، چونکە بەپێی رەوشێکی کۆن هەموو بەرەبەیانێك مردووخانە دەبوو گوزارشتێکی بناردایە بۆ فیرعەون، بۆنمونە رۆژی رابردوو چەند مردوویان هێناوەتە ئێرە، ئەگەر فیرعەون بیبیستایە بەیەکجار ژمارەی مردوو، ئەویش بەهۆی کوشت و کوشتارێکی زۆرەوە لەناوچون، تێدەگەشت کە ئەفسەرانی لەشکر، بەپێچەوانەی فەرمانەکەی ئەو رێژەیەکی زۆریان لەخەڵکی کوشتووە و خوێنیان ڕشتون.

لەکاتێکدا کە لاشەکان بەچواردەوری پەرستگا و شەقام و کۆڵانەکاندا کەوتبون هەموو ڕۆژێك بڕێکی تازە کوژراویان بۆ زیاد دەبوو، چونکە سەربازە ڕەشپێست و جەنگاوەرانی"شردن"بەهۆی بۆنی خوێن و چێژی تالانی کردن و خواردن و خواردنەوەوە، بەشێوەیەك رێکخستنی سیستەمی سەربازیان خستە ژێر پێوە کە ئەفسەرەکانشیان نەیاندەتوانی رێیان لێ بگرن.

کۆمەڵێك مرۆڤ کوژو دز کە لەڕابردوودا لەترسی"ئامون"و پاسەوانە شەوگێڕەکانی نەیاندەوێرا گۆڕ و ئەو ماڵانەی دەستنیشانیان کردبوو تالان بکەن و دەستدرێژیش بکەنە سەر ژنەکانیان، لەشوێنە دور و ماڵە دورەکانی کەنار ڕوباری"نیل"هاتنە دەرەوە و هەریەك لەوانە وێنەی خاچێکی خودای تازەیان لەسینەی خۆیاندا کێشا بۆئەوەی بیسەلمێنن کە پەیڕەوی خودای نوێن، دەستیان کرد بە کوشتن و دەستدرێژی کردن و دزینی ماڵ و گۆڕەکان، بگرە چاپۆشیان لەگۆڕی فیرعەونەکانیش نەدەکرد.

کاهینەکانی پەرستگای"ئامون"بەسەر حەسارە بەرزەکانەوە، نەفرەتیان لە فیرعەون و خودا تازەکەی دەکرد و دەیانوت ئەم پیاوە شێتە و خوداکەی لەو شێتترە،

بارودۆخێکیان هێناوەتە بون کە تا پەنجا ساڵی تریش ناتوانرێت وێرانکاریەکانی نۆژەن بکەیتەوە، هەموو شەوێك لەماڵەکانی"تبس"ەوە کسپەی ئاگر بەرز دەبویەوە و کەسێك نەبوو ئاگرەکان بکوژێنێتەوە.

ئەو گەڕەکەی ماڵەکەی منی لێبوو بەواتا گەڕەکی هەژارەکان، بوو بەپەناگای بڕێکی زۆر لەژن و پیاو و منداڵەکان، چونکە خەڵکی دوای ئەوەی بیستیان"هورم هب" لەماڵی مندا نیشتەجێ بووە، هاتن بۆ ئەو گەڕەکە بۆئەوەی لەپەنای"هورم هب"دا خۆیان لەدزو سەربازە ڕەشپێستەکان و جەنگاوەرانی"شردن"ڕزگار بکەن، چونکە سەرەڕای ئەوەی سەربازە ڕەشپێستەکان سیستەمی ڕێکخستنی سەربازیان پێشێل کردبوو، بەڵام هەر لەفەرمانڕەوای ڕابردویان دەترسان و لەترسی ئەو نەیاندەوێرا دەست درێژی بکەنە سەر گەڕەکەکەی ئێمەوە و لەوانەیە لەبەرئەوەی ناوچەکەی ئێمە کەسانی هەژاری لێ نیشتەجێ بوبو، وایان دەزانی کە هەرکاتێك بیانەوێت لەوێدا دەست بەتاڵانی کردن بکەن، هیچیان دەست ناکەوێت.

"هورم هب" لەماڵی مندا لاواز دەبوو، سەرەڕای ئەوەی خواردنی"موتی" ژنە خزمەتکارەکەمی لا پەسەند بوو، بەڵام هیچی پێ نەدەخورا و پێی دەوتم: "سینۆهێ" ئەگەر کەسێك بتوانێت ڕێ لەبەرزبوونەوەی ڕوباری"نیل" بگرێت، ئەوا دەتوانێت ڕێ لەو سەربازانەش بگرێت کە ڕیزبەندی و ڕێکخستنی سەربیازیان پێشێل کردووە. من چەند ساڵێك چاودێریم کردن تائەوەی وایان لێهات ڕێکخستنی سەربازی لەبەرچاو بگرن و وەك گیانەوەرە دڕندەکانیان لێ نەیەت، بەڵام ئەم فەرماندە تازە و گەمژەیە کە تەنها لەبیری پشیلەکانیدایەتی، لەماوەی چەند ڕۆژێکدا سەربازەکانی منی وەك گیانەوەرە دڕەندەکان لێکرد و ئێستا من ئەگەر بمەوێت لەنێوانیاندا ڕێکخستنی سەربازی زیندو و بەرپا بکەمەوە، ناچار لەپێناو ئەم ڕێکخستنەدا سەدان سەرباز بکوژم، چونکە بەهیچ شێوەیەکی تر ناتوانرێت هانی گوێڕایەڵی و ڕێکخستنیان بدەیت.

لەوڕۆژانەی کە لە"تبس"دا کوشت و کوشتار و تاڵانی بەردەوام بوو"کاپتا" تا دەهات دەوڵەمەندتر و قەڵەوتر دەبوو و بیستم کە خۆشحاڵە بەوەی ئەم بارودۆخە بەو شێوەیە بەردەوام بێت و دەیوت: گەورەم، ئەگەر ئەم بارودۆخە تا کاتی هەستانی ڕوباری"نیل"بەردەوام بێت-بەواتا تا سەرەتا پایز-، دزەکان ئەو کەرەستە

گرانبەهایانەی کە دزیویانە دەیهێننە ئەم مەیخانەوە و لەبەرامبەر بەهای ئەو خواردنەوەیەدا دەیدەن بەمن، ئێستاش چەند ژورێك لەژورە تایبەتەکانی مەیخانەکەم پڕە لەشتە دزراوەکان و کاتێك ڕێگای چونە دەرەوە ئازاد کرا، ئەم شتانە لەڕێی کەشتیەوە دەیانگوازمەوە بۆ وڵاتانی تر و لەوێ دەیانفرۆشم.

هیچ یەك لە سەربازە ڕەشپێستەکان و جەنگاوەرانی"شردن"و دز و شڕەتەکانی میسر نەیانتوانیوە لەمەیخانەی کاپتادا دزی بکەن، یان ئەوەیکە خواردنەوەکانی بەخۆڕایی بخۆنەوە، لەبەرئەوەی دەیانزانی ئەو مەیخانەیە لەژێر پارێزگاری ئەو سەربازانەدایە کە "هورم هب" لەوێدا داینان و دز و سەربازە مەستەکان کاتێك خۆیان دەکەن بەو مەیخانەیەدا، سەرەتا بەهای خواردنەوەکەیان دەدا ئەوسا "کاپتا"و "مریت"خواردنەوەیان پێدەدان.

"کاپتا"ش باش خزمەتی ئەو سەربازانەی دەکرد کە پاسەوانی مەیخانەکە بون و بەردەوام تێر و مەستی دەکردن بۆئەوەی بەدڵسۆزیەوە پارێزگاری مەیخانەکەی لەئەستۆ بگرن.

لە سێیەمین ڕۆژی کوشتاردا، بەهۆی زۆری لاشەکانەوە، چەند نەخۆشیەك لە"تبس"دا بڵاو بویەوە و ئەوەندە نەخۆش سەردانی منیان کرد کە بووە هۆی ئەوەی دەرمانەکانم تەواو ببن و چیتر دەرمان بەدەست نەدەهات.

من ئەگەر پێنج ئەوەندەی بەهاکەی خۆی پارەم بەدەرمان بدایە، سەرەڕای ئەوەش هەر نەمدەتوانی بەپێی پێویست دەرمان بەدەست بهێنم، بۆیە بەنەخۆشەکانم دەوت: دەرمانم بۆ چارەسەرکردنتان نیە، بەڵام من چەند ڕێنماییەکتان پێ دەدەم ئەگەر دەقاودەق بەپێی ئەو ڕێنماییانە ڕەفتار بکەن لەوانەیە چارەسەر بکرێن.

لەشەوی چوارەمدا زۆر خەمگین بووم، بۆیە بۆ خواردنەوە ڕۆشتم بۆ مەیخانەکەی "کاپتا"و دوای ئەوەی خواردمەوە هەر لەوێ خەوتم و سەرلەبەیانیەکەی "مریت"منی لەخەو هەستاند و منیش پێم وت: ژیان وەك ئەو شەوە ساردە وایە کە مرۆڤ کەرەستەی ئاگری بۆ داگیرساندن نەبێت، لەو شەوە ساردەدا دوو بونەوەری تەنها و خەمگین کە لەتەنیشت یەکەوە کات بەسەر دەبەن، سەرەڕای ئەوەی بەچاوێکی درۆزنانەوە دۆستایەتی خۆیان بۆ یەکتری دەربڕن لەوانەیە بۆ گەرم کردنەوەی یەکتری سود لەجەستەی گەرمیان وەرگرن.

"مریت"وتی:"سینۆهە"تۆ لەکوێوە دەزانیت کە چاوەکانم درۆت لەگەڵدا دەکەن؟ ئەگەر درۆم لەگەڵدا بکردایەیت و بەتۆوە پەیوەست نەبومایە، ئەوا دوێنێ شەو دوای ئەوەی خەوت لێکەوت لەتەنیشت تۆوە نەدەحەوامەوە، بۆیە درۆت لەگەڵدا ناکەم، بەڵام تۆ لەبەرئەوەی جارێك درۆت لەژنێك بیستووە و فریوی داویت، ئامادە نیت ئەوە پەسەند بکەیت کە لەوانەیە بەڕاستی ژنێك تۆی خۆش بوێت، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت تۆ نکوڵی لەو ڕاستیە دەکەیت کە ڕوبەڕوی بویتەتەوە[67].

دوای ئەوە"مریت"وتی: "سینۆهە"لەو ڕۆژەوەی من تۆم بینیوە، هەست دەکەم کە لەهەموو ژنێك بەدگومان بویت و ئەم بەد گومانیەشت لەوەوە سەرچاوە دەگرێت، کە بەپێی ئەوەی خۆت باستکردووە، ژنێکی جوان و کانزا پەرست خیانەتی لێکردویت و هەرچیت هەبووە لێی زەوت کردویت و تۆی هان داوە میسر بەجێ بهێڵیت و چەند ساڵێك لەوڵاتانی تردا بژیت، ئایا ناتوانی ئەمڕۆ لەم شارەدا کە هەموو شتێك گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە و بنمیچی ماڵ جێگەی زەوی ئەو ماڵەی گرتووەتەوە و دەرگاکان بەپێچەوانەوە دەکرێنەوە، هەموو شتێکی ڕابردوو لەگەڵ ئەم ژنەدا یەکلایی بکەیتەوە، بۆئەوەی ئەم بەدبینیەی تۆ لەبەرامبەر ژناندا لەناو بچێت؟

لەوکاتەدا من هیچ وەڵامێکی"مریت"م نەدایەوە، بەڵام کاتێك لەمەیخانەکە چومە دەرەوە بۆئەوەی بگەڕێمەوە بۆماڵ و چاودێری نەخۆشە بێدەرمانەکانم بکەم، گوتەی ئەو ژنە منی بەتەواوەتی ژێرە و ژوور کرد.

من لەوکاتەدا بیرم لەسەروەت و سامان و ماڵی خۆم نەدەکردەوە، بگرە بیرم لەدارایی و میراتی دایك و باوکیشم نەدەکردەوە، بەڵام ئەو شتەی زۆر بریندار ی کردم ئەوەیە کە"نفر نفر نفر" گۆڕی دایك و باوکیشمی لێ سەندم و دایك و باوکی بەدبەختم، دوای ئەوەی تەمەنێك بەپەروەردەکردنی منەوە ئازاریان چەشت، بەڵام دواجار بێگۆڕ مانەوە، ئەم ئازارە بەلای منەوە بەهیچ شێوەیەك سارێژ نابێت و هەرچی هەوڵم دەدا کەئەم بەسەرهاتەیان فەرامۆش بکەم، بەڵام زۆرم بەسەریدا نەدەشکا.

---

[67] لەدەقە فارسیەکەدا بە"لجاجت" هاتووە کە واتای"ئینکاری" دەگەیەنێت، ئەگەر تەنها "نکوڵی"م لەبەرامبەر ئەم وشە فارسیەدا بنوسیایە کە لەبنەچەدا وشەیەکی عەرەبیە و هەمان واتای وشەی فارسی دەگەیەنێت، ئەوا خوێنەر لەوکاتەدا لەمەبەستی ئەو"نکوڵی"کردنە تێناگات، بۆیە بەپێویستم زانی ئەو مەبەستەش لەگەڵ ئەو وشەیەدا بنوسم بۆئەوەی خوێنەری بەڕێز بەهەڵەدا نەڕوات......وەرگێڕ.

من بەدەم ڕێی گەڕانەوەم بۆ ماڵ تا ئەو کاتەی گەشتمەوە ماڵ دەگریام، چونکە نەمدەزانی ئایا دەبێت تۆڵەی خۆم لە"نفر نفر نفر" بکەمەوە؟

بەلای منەوە هیچ گرفتێك لەتۆڵە سەندنەوەی ئەو ژنەدا نەبوو، هەرئەوەی چەند پارچە کانزایەکم بەچەند سەربازێك بدایە، دەڕۆشتن و ئەو ژنەیان بۆ دەکوشتم، بەڵام نەمدەویست ئەو ژنە بکوژرێت، چونکە من کوشتنی ئەو ژنە تاوانبارە زۆر بە بچوك و بێنرخ دەهاتە بەرچاوم، هەرجارێك ئەوەم بهێنایەتەوە یاد کە بۆ مۆمیاکردنی لاشەی دایك و باوکم ناچاربوم بۆماوەیەك لەو مردووخانەدا –بەتایبەت کە من کەپزیشکی دەرچوی قوتابخانەی"ماڵی ژیان"م – شاگردی بکەم و ئەرکی پیسترین و قورسترین کار لەئەستۆ بگرم خوێنی جەستەمی هەڵدەکوڵاند و دەستی بەهەڵچون دەکرد، بەرپرسیاری ئەو هەموو بەدبەختیەش"نفر نفر نفر" بوو.

من نەمدەتوانی چاوپۆشی لەو تۆڵە کردنەوەیە بکەم، بەڵام لەو حاڵەتەدا مرۆڤێکی وەك تۆ– هەی ئەو کەسەی کە ئەم کتێبە دەخوێنیتەوە– نەبوم، بەڵکو وەك خودایەکی نوێم لێدەهات و نەم دەتوانی وەك خودای تۆم لێبێت.

چونکە کەسێك کە مرۆڤە ڕۆحی هەیە و کەسێك کە هەڵگری ڕۆح بێت، ئازار لەفریو و ڕەنجی کەسانی تر وەردەگرێت و ڕقی لەم جۆرە کەسانەش دەبێتەوە و ناتوانێت ئەم کینەیە لەدڵیدا فەرامۆش بکات، ئەوە تەنها خوداکانن کەدەتوانن ڕەنج ببینن و ئازار بکێشن، بەڵام لەبەرامبەردا هیچ کینیەکیان لەدڵدا نەبێت.

لەکاتێکدا بیرم لەوە دەکردەوە کە بەچ شێوەیەك دەتوانم تۆڵە لەو ژنە بکەمەوە، هەڵبەت بەشێوەیەك کە چیتر نەتوانێت لاوەکانی تری وەك من لەسەردەمی لاویەتیاندا، فریو بدات.

سەربازەکان تا ئەو کاتە بەردەوام ڕێیان بەخەڵکی دەگرت و بێشەرمیان گەشتە ڕادەیەك کە هێرشیان بردە سەر پایەدارە سەربازیەکانیش و قامچی فەرمانڕواییان لێ دەسەندن و دەیانکێشا بەنێو چاوانیاندا و ملوانکەی ئاڵتونیان بەزۆر لەملیاندا دادەکەند.

یەکێك لەپایەدارە سەربازیەکان هەوڵی ئەوەی دا لەپێناو گەڕانەوەی ملوانکەکەیدا شەڕیان لەگەڵدا بکات، لەوکاتەدا سەربازە ڕەشپێستەکان بەنێزە هێرشیان بۆ برد و دوای چەند ساتێك لاشەی کابرای پایەداریان تەختی زەوی کرد.

لەهەمان ئەو ڕۆژەدا لەلایەن فیرعەونەوە، پیاوێك هات بۆ ماڵەکەم و بە"هورم هب"ی وت هەستە و لەگەڵ من وەرە بۆ کۆشکی فیرعەون، چونکە فیرعەون داوای تۆ دەکات.

"هورم هب"هەستایە سەرپێ و خۆی شۆرد و ڕۆشت بۆ کۆشکی فەرمانڕەوایی و من لەدوایدا کاتێك جارێکیان قسەم لەگەڵ"هورم هب"دا دەکرد ئەو گفتوگۆیەی خۆی‌و فیرعەونی بۆ گێڕامەوە.

کاتێك فیرعەون چاوی بە"هورم هب"کەوت پێی وت:دانیشتوانی"تبس"وەك مراویەکان دەکوژن و سەربازە ڕەشپێستەکانیش دەستدرێژیەکی زۆریان کردووەتە سەر ژنەکان و ئێستاش کار گەیشتووەتە ئاستێك کە سەربازەکان لەئەفسەرەکانی خۆیان دەدەن و دەیانکوژن و فەرماندەی لەشکریش بۆ ڕێگرتن لەم کارەساتە ناتوانێت هیچ شتێك بکات، من وەکوو ڕابردوو دەتکەمەوە بەفرماندەی لەشکر، بۆئەوەی هێمنی و ئاسایش لەشاردا بەرقەرار بکەیتەوە.

"هورم هب" وتی: "ئەخناتون" تۆ خۆت دەتویست وای لێبێت و واشی لێهات.

فیرعەون وتی:من نەمدەویست وای لێ بێت، من پێم نەوتبون کە خەڵکی بەکوشت بدەن و سەروەت و سامانیان تاڵان بکەن و دەستدرێژی بکەنە سەر ژنەکانیان، بەڵکو پێم وتبون بێ خوێن ڕشتن "ئامون"م بۆ سەرنگون بکەن.

"هورم هب"وتی:تۆ بەکەسێك دەڵێت شەراب بخواتەوە بەڵام نابێت سەرخۆش بێت، تۆ قسەیەکی دور لەژیری دەکەیت، چونکە ئەو دوای ئەوەی گۆزەیەك شەرابی خواردەوە سەرخۆش دەبێت، بەهەمان ئەو شێوەیەش دەتویست"ئامون"ی پێ سەرنگون بکەیت، دەرئەنجامەکەی ئەوە بوو کە دەیبینی.

"ئەخناتون"وتی:ئێستا بڕۆ و ئاشتی و ئارمی بەرقەرار بکەرەوە.

"هورم هب"وتی: من ناتوانم ئەم کارە ئەنجام بدەم، جگە لەوکاتەی کە بۆ ماوەی دە ڕۆژ دەسەڵاتێکی تەواوم پێ بدەیت، بەواتا دەسەڵاتێکی وەك دەسەڵاتی خۆتم پێ بدەیت؟

فیرعەون وتی:ئایا خودای"ئامون"م بۆ سەر نگون دەکەیت؟

"هورم هب"وتی: سەرنگون کردنی خودای"ئامون" بۆ بەردەوامی دانی فەرامانڕەوایی تۆ زۆر پێویستە، چونکە ئەگەر تۆ سەرنگونی نەکەیت، چیتر دوای ئەوە ناتوانیت لەمیسردا فەرمانڕەوایی بکەیت و ڕوداوەکانی چەند ڕۆژی ڕابردوو

بارودۆخێکی هێناوەتە بون کە یان تۆ دەبێت فەرمانڕەوایی بکەیت یان"ئامون"ی خودای کۆن.

فیرعەون وتی:دەی کەواتە ئاگات لەوە بێت کاتێك هێرش دەکەیتە سەر پەرستگای "ئامون" نەهێڵیت کاهینەکانی ئەو پەرستگایە بەکوشت بدرێن؟

"هورم هب"وتی: من پێش ئەوەی هێرش بکەمە سەر پەرستگاکە، دەبێت ئەو سەربازانەی کە وەك گیانەوەرێکی درەندەیان لێهاتووە بگەڕێنمەوە سەر حاڵی جارانی خۆیان و دوای ئەوە کاتێك نۆرەی هێرشکردنە سەر پەرستگای"ئامون" هات پێت دەڵێم دەمەوێت چی بکەم.

فیرعەون ملیوانکە و قامچی فەرماندەیی دایەوە بە"هروم هب"و فەرمانی دا کە گالیسکە تایبەتەکەی خۆی بدەنەوە.

"هورم هب"پێش ئەوەی دەست بەکاربێت، سەد کەس لەو سەربازانەی کە دەیناسین بۆ ئازاردان و کوشتار کردن هەڵبژارد و شمشێرکی دا بەدەستی هەریەك لەو سەربازانە و دوای ئەوە بەسەر ناوچەکانی شاردا دابەشی کردن کە هەر گەڕەك و ناوچەیەك پێنج جەلادی بەردەکەوت.

دوای ئەوە فەرمانی پێدان کە بوق لێبدەن و تەواوی سەربازەکان ئامادە بکەن. هەندێك لەسەربازەکان هێشتا وەفایان بۆ"هورم هب"هەبوو، کاتێك بیستیان ئەو بووەتەوە بەفەرماندەی لەشکر و دوای بیستنی دەنگی بوقی سەربازی، لەچواردەوری "هورم هب" کۆبونەوە، لەوکاتەدا ئەو بوو بە خاوەنی پێنج سەد سەرباز.

بەلام ئەم پێنج سەد سەربازە خاوەنی گالیسکەی جەنگیش بون، دوای ئەوە"هورم هب"لەگەڵ ئەم ڕێژە سەربازەدا لەناو شاردا دەستی کرد بەگەڕان و هەر سەربازێکیان لەحاڵی تالانی و دزی کردندا ببینیایە لەهەمان ئەو شوێنەدا جەلادەکان دەیانبەستەوە بەدارێکەوە و هەر سەربازێکیش دەستی لەکوشتنەوە دابێت یەکسەر لەڕێی یەکێك لەجەلادەکانەوە سەریان لەلاشەیان جیادەکردەوە.

بەهەر هۆیەك"هورم هب"بەنێو شاردا ڕێی بکردایە ئەو دەستە سەربازانەی کە دەستیان لەتالانیەوە نەدەدا پەیوەندیان پێوە دەکرد و لەدوای خۆیەوە لەشەقام و چواڕێکاندا بنکەیەکی سەربازی دادەنا و پێی دەوتن: تەواوی کەسە شەڕەنگێز و

تالآنی کەرەکانی ئەو ناوچەیە دەستگیر بکەن و بکوژەکانیش لەهەمان ساتی دەستگیرکردنیاندا بکوژنەوە.

"هورم هب"تا بەیانی بەنێو گەڕەك و ناوچەکانی"تبس"دا دەسوڕایەوە و بەهەر شێوەیەك بەرەو پێش بڕۆیشتایە هەمان ئەو ناوچەیەی کە پێی تێدەنا هێمن و ئارامی باڵی بەسەردا دەکێشا و بەرەبەیان هەرچی نزیکتر ببوایەتەوە دەستەی دز و شەڕەنگێزەکان وەك تاریکی شەو، لەکاتی بەرەبەیاندا ڕویان لەکەمی دەکرد.

لەدوای"هورم هب"ئەو سەرکردانەی کە خۆی لەناوچەکاندا هەڵیبژاردبون، هەر پیاوکوژێکیان دەستکەوتایە یەکسەر دەیانکوشتەوە و دزەکانیشیان بەدارێکەوە دەبەستەوە.

کاتێك ڕۆژ هەڵهات"هورم هب"لەڕێی بانگەوازکەرەکانەوە ئاگاداری ئەوەی دەرکرد کە شەوی ڕابردوو تەنها کەسە بکوژەکان لەسێدارە دراون، بەلآم لەم کاتژمێرە بەدواوە ئەگەر کەسێك دزی یان دەستدرێژی بکاتە سەر ژنێك، ئەویش بەکوشت دەدرێت.

تانیوەڕۆ جەلادەکان سەری ڕەشپێستەکانیان لەلاشە جیا دەکردەوە، چونکە سەربازە ڕەشپێستەکان، هێشتا ئامادە نەبون ئەوە پەسەند بکەن کە گۆڕانکاری بەسەر بارودۆخدا هاتبێت و کۆتایی بەسەردەمی هەرکەس بۆخۆی هاتووە، بەلآم دوای نیوەڕۆ، سەربازە ڕەشپێستەکان ئاگاداری ئەوە بون کە جگە لەخۆبەدەستەوە دان و گەڕانەوە بۆ سەربازخانە هیچ ڕێگەچارەیەکی تریان لەبەردەستدا نیە. سەرەڕای ئەوەش پێش چونەوە ژورەوەی هەر سەربازێك پشکنینێکی تەواویان بۆ دەکردن ئەگەر خوێنیان بەجلەکانیانەوە ببینیایە ئەوا دەیانسپاردن بەجەلادەکان، بۆئەوەی سەری لەلاشەی بکەنەوە.

من دڵنیام کە"هورم هب"تەنها بۆئەوە ڕەشپێستەکانی بەوشێوەیە نەدەکوشت تا ڕێکخستنەوەی سەربازی بەرقەرار بکاتەوە، بەڵکو لەبەرئەوەی خۆی کەسێکی میسری بوو، چونکە ڕشپێستەکان کوشت و کوشتاریان خستبووە ناو خەڵکی میسرەوە حەزی دەکرد تۆڵەیان لێبکاتەوە.

ئەو ڕۆژە کاتێك شەو داهات"تبس"هێمن و ئارام بوو، بەلآم بەڕادەیەك کوشت و کوشتار و تالآنی و وێرانی کاری لەخەڵکی کردبوو کە چراکانیان هەڵندەگیرساند و لەماڵە سۆزانیەکانەوە دەنگی موزیکی سریانی نەدەبیسترا.

بەڵام ئەو مەیخانانەی کە لەو هەراوهوریا و ئاژاوە و نائارامیەدا وێران نەبووبوون، ئەو شەوە پارەیەکی باشیان بەدەست دەهێنا، "کاپتا"ڕاستی کرد کە مەیخانە کاری و کاسپیەکە کە هەرگیز تەواو بونی بۆ نیە، چونکە خەڵکی هەم لەکاتی خۆشیدا و هەم لەکاتی دڵتەنگیدا دەخۆنەوە.

لەبەرەبەیانی ڕۆژەکەی تردا"هورم هب"کەشتی ساز و دارتاشەکانی بانگکرد و ئەو کارەی بە کرێکارەکان ڕاسپارد کە ئەو بەشە وێرانبوەی ماڵی دەوڵەمەندەکان تێکبدەن و کەشتیە شڕەکانیش پارچە پارچە بکەن، بۆئەوەی بتوانن بەداری ماڵ و کەشتیە شڕەکان "مەنجەنیق"و پەیژە و منارەی جوڵاو پی دروست بکەن.

لەبەرئەوەی"هورم هب"دەیزانی دوای ئەوەی کاهینەکانی پەرستگای "ئامون" زانیان فیرعەون شکستی خواردووە و نەیتوانیوە دەست بەسەر پەرستگاکەیاندا بگرێت بۆئەوەی خوداکەیان سەرنگون بکات، چیتر دانوستاندن لەگەڵیاندا بێسودە، چونکە بەشێوەیەك لەخۆبایی بون کە مەحاڵە ڕازی بن بەوەی خۆیان بدەن بەدەستەوەو هیچ ڕێگەچارەیەك لەبەردەستدا نیە جگەلەوەی بەپێی هونەری جەنگ هێرش بکەنە سەر پەرستگا و ئەو حەسارە.

ئەوڕۆژە تا بەرەبەیانی ڕۆژی دوایی دەنگی زەگن و کوڵەنگ و چەکوش دەهات، بەو ڕادەیەی کە کرێکاران تەختە و داریان لەکەشتی و ماڵەکان هێنابوو وە مەنجەنیق و منارەی جوڵاو و"قۆچ[68]"یان دروست دەکرد.

لەشەو و ڕۆژێکدا منارەی جەنگی و کۆمەڵێك پەیژە و چوار مەنجەنیق و چەند "قۆچ"ێك دروستکرابوو، ڕۆژی دوایی، سەربازەکانی"هورم هب" لەپێنج لاوە هێرشیان بردە سەر پەرستگای"ئامون".

کاهینەکانی پەرستگا پێشبینی ئەوەیان نەدەکرد کە پەرستگاکەیان بەوشێوەی گەمارۆ بدرێت و خۆیان بۆ ڕاونانی هێرش بەرەکان ئامادە نەکردبوو، چونکە لەمجۆرە کاتانەدا لەسەری دیواری حەساری ئەوجۆرە پەرستگایانەوە ئاوجۆ و ڕۆنی داخیان

---

[68] قوچ: بریتیە لەتیرێکی گەورە و قورس کە سەرەکەیان لەشێوەی بەران یان گا دەتاشی و دە تا بیست کەس ئەو تیرەیان بەدەستەوە دەگرت و ڕاپاندەکرد و بەهێز دەیانکێشا بەدەروازەکاندا بۆئەوەی دەروازەکەی پێ بشکێنن و بچنە ناو قەڵاکەوە..

دەکرد بەسەر هێرشبەرەکاندا، بەڵام لەوکاتەدا کاهینەکان نەئاوی کوڵاویان هەبوو و نە ڕۆنی داخکراو.

کاتێك دەرگاکانی پەرستگا بە"قۆچە"کان دەکوتران بەشێوەیەك کەوتنە لەرزین کە کاهینەکان زانیان دەروازەکانیان تێك و پەکان دەدرێت و دەشکێن، بۆیە بوقیان لێدا، بۆئەوەی چیتر خەڵکی بەرگری نەکەن، چونکە دەیانزانی"ئامون"بەپێی پێویست قوربانی بۆ دراوە و ئەو خەڵکەی کە ماوە دەبێت بژین بۆئەوەی لەداهاتوودا دووبارە بتوانن خودای"ئامون"زیندوو بکەنەوە، چونکە ئەگەر هەموو باوەڕدارانی "ئامون" لەناو بچن، چیتر کەسێك نامێنێتەوە بۆئەوەی ئەو خودایە جارێکی تر زیندوو بکاتەوە.

دوای دەستهەڵگرتن لەبەرگری کردن، دەرگای پەرستگاکانیان کردەوە و ئەو خەڵکەی کە بێزاربوبون لەڕاوەستان لەناو پەرستگادا، بەخۆشحاڵیەوە گەڕانەوە ماڵەکانی خۆیان.

بەم شێوەیە"هورم هب"بێ هیچ خوێنڕێژیەك دەستی گرت بەسەر پەرستگای "ئامون"دا و پزیشکانی"ماڵی ژیان"ی نارده ناو شارەوە بۆئەوەی نەخۆشەکان چارەسەر بکەن، بەڵام نەچونە ناو مردووخانەکەوە، چونکە نابێت کەسە زیندووەکان بچنە ئەو جۆرە شوێنانەوە، جگە لەوانەی کە کارمەندانی ئەو دەزگایەن، یان ئەو کەسانەی کە مردوەکانی خۆیان دەهێنن بۆئەوەی لەوێدا مۆمیایان بکەن، یان لاشەی مۆمیاکراوەکان بگوازنەوە.

دوای ئەوەی دەروازەکانی پەرستگا کرانەوە کاهینەکان لەگەڵ چەند پاسەوانێکی ئەو پەرستگایە بەرگریان لەچەند پەیکەرێکی"ئامون" کەلەوێ بوو کرد، ئەوئەفسەرانە مادەی بێهۆشکەریان پێ درابو بۆئەوەی هەست بەئازار نەکەن.

ئەوکات جەنگ لەنێوان پاسەوانان و کاهینەکان لەلایەکەوە و سەربازەکانی"هورم هب" لەلاکەی تریەوە دەستی پێکرد و ئەم جەنگە تا ئێوارە بەردەوام بوو.

تەواوی پاسەوانانی پەرستگایان کوشت و هەندێك لەکاهینەکانیش بەکوشت دران و تەنها کاهینە پلە یەکەکان مانەوە.

ئەوکات"هورم هب"بوقی لێدا و جەنگی ڕاوەستان و بەکاهینەکانی وت:من هیچ دوژمنایەتیەکم لەگەڵ خودای ئێوەدا نیە، چونکە پیاوێکی سەربازیم، بۆیە من

نەدۆست و نە دوژمنی خوداکانم. لەوباوەڕەدام باشتر وایە پەیکەری خودای ئێوە لەم پەرستگایەدا دەستی ئێمە نەکەوێت، باشتر وایە خودی ئێوە ئەو پەیکەر لەناو بەرن، لەمحاڵەتەدا من بەکوشتنی خودای ئێوە تاوانبار ناکرێم و یەك کاتژمێر ماوەتان پێدەدەم بۆئەوەی بیری لێبکەنەوە و بڕیاری لەسەر بدەن. دوای ئەو کاتژمێرەی ماوەم پێداون دەست بەهێرشی خۆم دەکەم، لەبەرئەوەی من سەربازم و دەبێت فەرمانی فیرعەون جێبەجێ بکەم، ئەگەر ئێوەش دوای ماوەی کاتژمێرێك پەیکەری خودای خۆتان لەناو ببەن و بتانەوێت لەم پەرستگایە بڕۆنە دەرەوە، ئەوا لەم حاڵەتەدا هیچ کەسێك ناتوانێت ڕێتان لێ بگرێت و ئازارتان بدات و تەنها ئێمە وردبینی لەوەدا دەکەین کە ئێوە ئەو زێڕ و زیوەی کە بەخودای فیرعەونەوە پەیوەست دەکرێت لەگەڵ خۆتاندا نەبەنە دەرەوە.

کاهینەکان وتیان: زۆرباشە و ئێمە بۆماوەی کاتژمێرێکی تر، وەڵامتان دەدەینەوە.

دوای ئەوەی ماوەی کاتژمێرێك تێپەڕی، کاهینەکان لەشوێنەکانی خۆیان هاتنە دەرەوەو بە"هورم هب"یان وت کە بێتە ژورەوە و ئەویش دوای ئەوەی چووە ژورەوە، خودای ئامونی نەبینیو زانی کە کاهینەکان پەیکەری خودای خۆیان تێك شکاندووەو پارچەکانی لەگەڵ خۆیاندا دەبەنە دەرەوە، بۆئەوەی بتوانن بڵێن کە"ئامون"دیار نەماوە، بەڵام لەئایندەدا خۆی ئاشکرا دەکاتەوە.

دوای ئەوە"هورم هب"دەرگای گەنجینەی پەرستگای قوفڵ کرد و بەرد هەڵکۆڵەرەکانی ڕاسپارد کە ناوی"ئامون" لەسەر ئەو بەردانە بسڕنەوە و لەباتی ئەو ناوی"ئاتون"بنوسن.

دوای ئەوە لەڕێی بانگەوازکەرەکان خەڵکیان لەوە ئاگادار کردەوە کە"ئامون"لەناو چووە و لەباتی ئەو لەمڕۆ بەدەواوە"ئاتون"خودای میسرە.

خەڵکی دوای ئەوەی زانیان کۆتایی بەجەنگ و خوێنڕێژی هاتووە، لەماڵەکانیان هاتنە دەرەوە و شەوەکەی"تبس"وەك ئەو کاتانەی کە هێمنی و ئاسایش بەرقەرار بوو چراکانی داگیرسابون.

بەهۆی جێگیر بونی ئاسایش و ئاشتی و سەرەتای خودای"ئاتون"ەوە چیتر جیاوازی لەنێوان سپی و ڕەشدا نەما و من بەچاوی خۆم چەندجارێك ئەوەم بینیوە کە دەوڵەمەندەکان میوانداری ڕەشپێستەکانیان بۆماڵی خۆیان دەکرد. هەمان شەو

لەکاتی گەڕانەوەم بۆ ماڵ لەشارەوە تێدەپەڕیم، دوو بەسەرهاتم بەچاوی خۆم بینی کە هەرگیز فەرامۆشیان ناکەم.

یەکێك لەوانەی چاوم پێی کەوت پیاوێك لەچینی وەجاخزادەکان لەکۆڵانێکی ڕەشپێستەکاندا میوانداری ڕەشپێستێکی بۆ ماڵەکەی خۆی دەکرد بۆئەوەی لەماڵەکەیدا پێکەوە نان بخۆن. دیمەنەکەی تریان یەکێك لەپاسەوانەکانی پەرستگای "ئامون"م بینی کە بەبریندارى لەکەنار شەقامەکەدا کەوتبوو و ناوی"ئامون"ی دەهێنایە زمان، بەڵام خەڵکی بەچواردەوریدا کۆبونەوە و بەبەرد مێشکیان تەقاند، تەنها لەبەرئەوەی بۆچی ناوی"ئامون"ی هێناوەتە زمان کە دە ڕۆژ لەوەوپێش ئەگەر کەسێك سوکایەتی بکردایە بە"ئامون"دەیانکوشت.

کاتێك دەمویست بڕۆمەوە بۆماڵی خۆم، ئەم دوو دیمەنەم بەچاوی خۆم بینی و سەرم بەهەردوو دەستم گرت و ڕۆچومە هزری خۆمەوە، چونکە تێگەشتم مەحاڵە ڕۆژێك لەڕۆژان خودایەك بێت کە بتوانێت نەزانی و گەمژەیی خەڵکی لەناو ببات، ئەوکات لەباتی ئەوەی بڕۆمەوە بۆماڵ بەرەو مەیخانەی"کلکی تیمساح" ڕۆشتم.

ئەو شەوە، لەو شەوانە نەبوو کە من بتوانم بڕۆمەوە بۆ ماڵ، چونکە بەهۆی نەزانی جۆری مرۆڤ و بیروباوەڕی سستیانەوە زۆر خەمگین بوم، بۆیە بەرەو مەیخانەی"کلکی تیمساح"کەوتمە ڕێ، بۆئەوەی بەخواردنەوە و گفتوگۆکردن لەگەڵ"مریت"دا کەمێك دڵنەوایی خۆم بدەمەوە. کاتێك گەشتمە ئەوێ ئەو سەربازانەی پارێزگاریان لەمەیخانەکە دەکرد، لەبەرئەوەی دەیانزانی من هاوڕێی"هورم هب"م چواردەوریان گرتم و وتیان:"مریت"دەڵێت تۆ دەتەوێت تۆڵە لەکەسێك بکەیتەوە و لەبەرئەوەی دەزانین هاوڕێیەکی دڵسۆزی"هورم هب"ی هەروەها لەبەرئەوەی ئەم مەیخانە هی کەسێکە کە لەڕابردوو کۆیلەی تۆ بووە، ئامادەین تۆڵەت بۆ بکەینەوە.

منیش لە"مریت"م پرسی: ئایا تۆ بەوانت وتووە لەخزمەتمدا بن بۆئەوەی تۆڵەم لەو کەسە بکەنەوە؟

ئەو ژنەش وتی: بەڵێ منیش لەوباوەڕەدام ئەگەر ئەمشەو تێپەڕێت و تۆ تۆڵەی خۆت لەو ژنە نەکەیتەوە کە تۆی فریو داوە و بەدبەختی کردی، چیتر جارێکی تر ئەم هەلەت بۆ نارەخسێتەوە، چونکە لەبەیانیەوە بارودۆخی"تبس"ئاسایی دەبێتەوە،

بەڵام ئەمشەو هێشتا بارودۆخ نائاساییە و هەرکەسێك دوژمنایەتی لەگەڵ هەر کەسێکی تردا بێت، دەتوانێت لەمشەودا تۆڵەی خۆی لێ بکاتەوە.

بەسەربازەکانم وت: لەگەڵما وەرن، بەڵام ئاگاتان لەخۆتان بێت کە ئەمشەو ئێوە فەرمانی"هورم هب"جێبەجێ دەکەن و ئەگەر بتانەوێت پێچەوانەی فەرمانەکانی ئەو ئەنجام بدەن، ئەوا سەرتان لەلاشەتان دەکەنەوە، بۆیە من ئەمشەو تەنها فەرمانی"هورم هب"تان پێ ڕادەگەیەنم.

ئەو قسەیەم کرد بۆئەوەی سەربازەکان بترسن و سەرپێچی لەفەرمانەکانی من نەکەن. سەربازەکانیش وتیان: دڵنیابە کە ئێمە بەپێچەوانەی فەرمانەکانی تۆ کە دەزانین فەرمانی"هورم هب"ە ڕەفتار ناکەین.

بۆیە وتم: چیتر دوای ئەوە نابێت هیچ کەسێك بمبینێت و بمناسێتەوە و ئێوەش چیتر ڕێتان پێنادرێت ناوی من بهێننە زمان، بەڵکو ئەگەر داوای ڕونکردنەوەیان لێکردن، بڵێن کە لەلایەن خودای"ئاتون"ەوە هاتوین بۆئەوەی تۆڵە لەدژمنەکانی بکەینەوە، ئێستا ماوەیەك چاوەڕێم بکەن، بۆئەوەی کەژاوەیەکم بۆ بهێنن سواری ببم و لەگەڵ ئێوەدا بێم.

"کاپتا"بەندەی ڕابردووم، کەسێکی نارد بۆئەوەی کەژاوەیەك بهێنێت و دوای کاتژمێرێك کەژاوەکەیان هێنا و من سواری بوم و لەگەڵ سەربازەکاندا کەوتمە ڕێ تا ئەوکاتەی گەشتمە بەردەرگای ماڵی"نفر نفر نفر".

لەوێ من بەسەربازەکانم وت: لەم ماڵەدا ژنێك هەیە کە لەهەموو ئەو ژنانەی کە لەوێن جوانترە و ئێوەش هەر لەیەکەم چاوپێکەوتنتاندا بەهۆی جوانی و شکۆمەندیەکەی دەیناسنەوە، بەڵام بەمەرجێك دوای ئەوەی چاوتان بەسەر تاشراوەکەی کەوت ئاشقی نەبن، بڕۆن و ئەو بهێننە ئێرە، ئەگەر بەرگری لەخۆی کرد، بە بنی نێزەکە دانەیەك بکێشن بەسەریدا بۆئەوەی بێدەنگ ببێت و دەست لەبەرگری کردن هەڵگرێت، بەڵام ئاگاتان لەوەبێت کە بەدڕەفتاری لەگەڵدا نەکەن، چونکە ئەگەر"هورم هب"ئاگاداری ئەوە بێت کە ئێوە بەدڕەفتاریتان لەگەڵ ئەم ژنەدا کردووەو جوانیتان لەناو بردووە، هەمووتان دەکوژێت.

لەناو ماڵەکەی"نفر نفر نفر"ەوە دەنگی ئاواز و موزیك دەهات و هەندێك لەکڕیارانی مەست کە لەو سۆزانیخانەدا بون بێتامیان کردبوو.

کاتێك سەربازەکان لەدەرگایان دا خزمەتکارانی ئەو ماڵە نەیانویست دەرگایان بۆ بکەنەوە، چونکە وایان دەزانی ئەو سەربازانە ناتوانن لەبەرامبەر خۆشی و ڕابواردنەکانیاندا پارەی پێویستیان پێبدەن، بەڵام بەزۆر خۆیان کرد بەوماڵەدا و ئەوانەی لەو ماڵەدا سەرقاڵی خۆشگوزەرانی بون، هەڵهاتن و زۆری نەخایاند بینیم کە یەکێك لە سەربازەکان"نفر نفر نفر"ی لەپارچە قوماشێکی ڕەشدا پێچاوە و هێنای بۆ کەژاوەکە.

کاتێك من ئەو ژنەم بەو پارچە قوماشە ڕەشە پێچراوەوە بینی، وام دەزانی مردووەو سەربازەکان لاشەی مردوی ئەویان بۆ هێناوم، بەڵام دوای ئەوەی ئەو ژنەیان لەناو کەژاوەکەدا لەتەنیشت منەوە دانا و منیش جوان پشکنینم بۆکرد بۆم دەرکەوت کە زیندووە، بەڵام لەهۆش خۆی چوبوو، وەك ڕابردوو جوانیەکەی خۆی لەدەست نەدابوو، سەرە تاشراوەکەی بریسکەی دەدایەوە.

بڕێك زیوم دا بەهەریەك لەو سەربازانە و دوای ئەوە بڵاوەم پێکردن و مەبەستم لەو بڵاوەیان ئەوەبوو کە سەربازەکان نەزانن من بۆ کوێ دەڕۆم.

ئەوکات بەو بەندەانەی هەڵگری کەژاوەکە بون وتم: من بگەیەننە ماڵەکەی خۆم کە لەشەقامی نزیك خودای ڕابردووە. ماڵی من لەوێ نەبوو بەڵام ویستم ناونیشانێکی هەڵەیان پێبدەمو دوای ئەوە بڵاوەیان پێ بکەم.

لەشەقامێکی نزیك پەرستگای"ئامون"پێم وتن ڕاوەستن و بەبەندەکانم وت کەژاوەکە بخەنە سەر زەوی.

خۆم لەوکەژاوەیە دابەزیم و"نفر نفر نفر"یش کە لەپارچەیەکی ڕەش پێچرابوو لەو کەژاوەیە هێنایە دەرەوە و کرێم دا بەبەندەکان دوای ئەوە بڵاوەم پێکردن.

دوای ئەوەی کۆڵبەرانی کەژاوەکە ڕۆشتن"نفر نفر نفر"م- کە هۆشی نەهاتبوو بەخۆیدا- بەرزکردەوە و بەرەو مردووخانەکە کەوتمە ڕێ.

دوای ئەوەی گەشتمە ئەوێ دام لەدەرگاکە و چەند کەسێك لەکارمەندەکانی مردووخانە هاتن و دەرگاکەیان کردەوە و بینییان کە بەڕوکەش مردوویەکم بۆ هێناون، دوای ئەوە دەستیان کرد بەقسەی ناخۆشکردن و وتیان مەگەر لەمڕۆژانەدا کاری ئێمە ئەوەندە ڕەواجی نیە کە تۆش لەمکاتە مردومان بۆ دەهێنیت؟

وتم: ئەو مردووەی من بۆم هێناون جیاوازە لەگەڵ مردووەکانی تردا....وەرن و تەماشای بکەن.

کارمەندانی مومیاکردنی مردووەکان مەشخەڵیان هێنا و کاتێك تەماشای"نفر نفر نفر"یان کرد بەشێوەیەك خۆشحاڵ بون کە دەستیان کرد بەپێکەنین و منیش کە ساڵهایە دەنگی پێکەنینی کارمەندانی مردووخانەم نەبیستبوو، بەپێکەنینی ئەوان لەرزم لێهات.

یەکێك لەوانە لە"نفر نفر نفر" نزیك بویەوە و دەستی لەسینە و مەمانی دا و وتی: پەنا بە"ئامون"....لاشەی ئەم ژنە هێشتا گەرمە.

وتم: ئەگەر دەتەوێت بەئاسودەیی بەردەوامی بەکارەکەی خۆت بدەیت و هیچ کەسێك رێت لێ نەگرێت، ناوی"ئامون"مەهێنە، لەبەرئەوەی خودای ئامون بونی نیە و لەباتی ئەو لەمرۆوە"ئاتون"خودای میسرە. بەڵام ئەم ژنە هەر بەوشێوەیەی کە هەستی پێدەکەیت گەرمە و منیش ئەوم بۆ لای ئێوە هێناوە بۆئەوەی پێتانی بسپێرم و باش چاودێری لێبکەن و بەشێوەیەك جەستەی مۆمیا بکەن کە هەرگیز نەگەنێت و ملوانکەی زێرین و خشلەکانی تری بەسە بۆئەوەی لەبەرامبەر کرێی کارەکەتاندا هەڵیگرن بۆ خۆتان. کاتێك خزمەتکاری مردووخانە زانیان ئەو ژنە زیندووە، تێگەشتن، من چی دەڵێم، بۆیە یەکێك لەوان وتی: ئەگەر من بزانم تۆ ئەی پیاوی نەناسراو پەیرەوی خودای تازەی میسری، من ستایشی خودای نوێ دەکەم، چونکە لەو ڕۆژەوەی کە خۆمم ناسیوە لێرەدا ژیان بەسەر دەبەم و بەردەوام لەگەڵ ژنانێکدا ڕامبواردووە کە لەزستان ساردتر بون، هەرگیز ئەوە ڕوینەداوە کە ژنێکی زیندوو لەئامێز بگرم، ئێستا بەهۆی تۆوە من و ئەوانی تر دەتوانین لەگەڵ ژنێکی زیندوودا ڕابوێرین و دڵنیابە بۆماوەی حەفتا کەڕەتی حەفتا ڕۆژ، لێرەدا پارێزگاری لێدەکەین و ئەگەر کەسێکیش لێی پرسین بۆچی لێرەدا ژنێکی زیندومان ڕاگرتووە دەڵێن، ئێمە ئەومان بەمردوویی لەکەسێك وەرگرتووە، بەڵام دوای ئەوەی خرایە ناو ئەو خوێیاوەوە یەکسەر زیندوو بوەتەوە.

من دەمزانی کە کارمەندانی مردووخانە لەسەرتاپای تەمەنیاندا بێبەش بوون لەوەی لەگەڵ ژنێکدا ڕابوێرن، بەهۆی ئەو بۆنە پیسەی جەستەیان، ڕێیان پێنادەن بچنە سۆزانی خانەکانەوە، بۆیە مەحاڵە بهێڵن"نفر نفر نفر"لەوێ بچێتە دەرەوە.

بەو شێوەیە تۆڵەی دایك و باوكم لە"نفر نفر نفر"كردەوە و ئێستا دەڵێم، سەرەڕای ئەوەی تۆڵە سەندنەوە چێژبەخشە و شەرابێكە كە مرۆڤ مەست دەكات، بەڵام ئەو مەستیەی زۆر زوو لەناو دەچێت. نازانم بۆچی دوای ئەوەی تۆڵەی خۆت كردەوە، پەشیمانی دێتەبون و تۆڵەسێن بەخۆی دەڵێت خۆزگە تۆڵەی خۆم نەكردایەتەوە.

لەوكاتەدا كە من"نفر نفر نفر"م دا بە كارمەندانی مردووخانە، بۆئەوەی دڵنەوایی خۆم بدەمەوە، بەخۆمم وت: من ئەم كارەم لەپێناو لاوانی ئاینده ئەنجام دا، چونكە تا ئەو ڕۆژەی ئەم ژنە جوانە ئازاد بێت، لاوانی سادە و شەرمنی وەك من، وەك ئەوكاتانەی كە لاو بووم، بەدبەخت دەكات.

دوای ئەوەی گەڕامەوە بۆ مەیخانەی"كلكی تیمساح"مریت بەرەو ڕوم هات و دەستی گرتم و داینیشاندم و وتی:"سینۆهە" بۆچی خەمگینی؟

وتم: لەبەرئەوەی ژنەكان لەهەموو كاتێكدا دەبنە مایەی دەردیسەری ئێمە، كاتێك ئێمە شەیدای خۆیان دەكەن، گرفتاری چاڵی چارە ڕەشی خۆیانمان دەكەن و كاتێكیش تۆڵەی خۆمانیان لێ دەكەینەوە دوبارە خۆمان بەكەسێكی بەدبەخت دەبینین.

"مریت"وتی:ئەم شێوازی بیركردنەوەیەی تۆ لەوەوە سەرچاوە دەگرێت كە تا ئێستا كەسێكت بەدەست نەهێناوە كە هەوڵی خۆشبەختكردنت بدات.

وتم:داوام لەخودای میسر و تەواوی خوداكانی ئەو نەتەوانەی كە سەردانی وڵاتەكەیانم كردووە كە من لەهەڕەشەی ئەو كەسانەی كە دەیانەوێت خۆشبەختم بكەن بپارێزێت، چونكە فیرعەون دەیویست نەتەوەی میسر خۆشبەخت بكات، بەڵام ئێستا بۆنی لاشەی كوژراوەكان هەوای شاری"تبس"ی پیس و بۆگەن كردووە.

لەم كاتەدا"مریت"پێكێك"كلكی تیمساح"ی دا بەدەستەمەوە و وتی: بیخۆرەوە... بۆئەوەی خەمەكانت لەبیر بكەیت.

من"كلكی تیمساح"م خواردەوە و كاتێك لەقوڕگم چووە خوارەوە هەستم بەوە كرد كە گۆڕانكاری بەسەر بیر و هزرمدا هات و چیتر بیر لە"نفر نفر نفر" ناكەمەوە، بەڵكو لەبیری "مریت"دا بوم.

پێم وت: "مریت"من ئەمشەو زۆر پێویستم بەتۆیە، چونكە ئەو تۆڵەی من لەو ژنەم كردەوە، هەموو گرفتێكی منی لەگەڵ ژناندا یەكلایی كردەوە.

"مریت"وتی: "سینۆهە" ئەگەر دەتەوێت بزانی ئایا ژنێك تۆی خۆش دەوێت یان نە؟ ئەو لەڕێی زێڕ و زیو یان ئەو دیاریانەی کە دەبێت لەئایندەدا پێی ببەخشیت تاقی بکەرەوە. لەوانەیە ژنێك لەمڕۆدا زێڕ و زیوت لیَ وەرنەگرێت، بەڵام لەگەڵتدا ڕادەبوێرێت بۆئەوەی لەئایندەدا دیاریگەلێکی مەزنترت لێومرگرێت، یان ئەوەی وەك "نفر نفر نفر" هانی ئەوەتبدات کە هەموو شتێکی خۆتی پیَ ببەخشیت.

تاکە ڕێگای کەرەستەی تاقیکردنەوەی سۆزی ژنێك لەبەرامبەر پیاوێکدا، ئەوەیە کە ئەو نەزێڕو زیوت لەبەرامبەر ڕابواردنەکانیدا لیَ وەرگرێت و نە چاوەڕێی ئەوە بکات کە لەئایندەدا شتێکی پێشکەش بکەیت، ئایا تۆ لەژیانتدا ڕوبەڕوی ژنێکی وا بویتەتەوە و ئامادە بووە لەگەڵتدا ڕابوێرێت

وتم: بەڵیَ....من لەژیانمدا ئاشنای ژنێك بوم کە زێڕ و زیوی لیَ وەرنەدەگرتم، بەڵام ئامادەش نەبوو لەگەڵمدا ڕابوێرێت.

"مریت" وتی: کەواتە ئەو ژنە تۆی خۆش نەویستووە.

وتم: ئەو خودای خۆی خۆش دەویست و دەیوت کە دەبێت کچێنی خۆی پێشکەشی خودای خۆی بکات.

"مریت" لەوشەوەدا منی بردە یەکێك لەژورە تایبەتەکانی ئەو مەیخانەیە و ئەوکات حەسیرەکەی خۆی ڕاخست بۆئەوەی لەسەر ڕاکشێم و بخەوم.

بۆچی کاتێك پیاوان ژنێکیان خۆش دەوێت، خۆیان لەبیر دەچێتەوە و گۆڕانکاریان بەسەردا دێتو ئەوە دەهێننەوە یاد خۆیان کە بەڵێنیان داوە لەگەڵ هیچ ژنێکدا ڕانەبوێرن.

ئایا کەسێك بەدی دەکرێت کە کاتێك ژنێکی جوانی بینی و ئاگاداری ئەوەبوو کە ئەو ژنە خۆشی دەوێت، پابەندی ئەو بەڵێنە بێت کە لەڕابردوودا لەبارەی ژنەوە داویەتی.

لەوباوەڕەدام هەروەك چۆن ڕۆن[69] کڵپە بەئاگرێکی لاواز دەبەخشێت، ژنێکی جوانیش بەشێوەیەك ئاگری پیاو هەڵدەگیرسێنێت کە لەو گەرمیەدا تەواوی ئەو پەیمانانەی کە لەڕبردوودا لەبارەی ژنەکانەوە داویەتی دەسوتێنێت.

---

[69] لێرەدە مەبەست نەوتی خاوە یان نەوتی ڕەش.

من بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر ڕۆژێك فیرعەون پێم بڵێت"سینۆهە"تۆ زانستەکانی خۆتم پێبدە و ببە بەکەسێکی نەزان و من لەبەرامبەردا تاجی فەرمانڕەوایی خۆمت پێدەدەم، من ئەو مامەڵەیەی پەسەند ناکەم، چونکە دەمزانی ژیان لەگەڵ نەزانیدا سەرەڕای ئەوەی ئەو مرۆڤە فیرعەون بێت هیچ نرخێکی نابێت.

بەڵام ئەگەر"مریت"پێی بوتایەم"سینۆهە"تۆ زانستی خۆتم پێبدە و دوای ئەوە ببە بەپیاوێکی نەزان و من لەبەرامبەردا هەموو شەوێك لەگەڵتدا دەخەوم، من بەو مامەڵەیەی ڕازی دەبوم، چونکە دەمزانی کە مەزنترین خۆشبەختی کات بەسەر بردنە لەگەڵ ژنێکدا کە خۆش ویستنێکی هاوبەش و دووڵاینە هەبێت لە نێوانیاندا.

لەو شەوەدا بیرم لەوە کردەوە کە بێ مەبەست بەدەریاکاندا کۆچم کردووە و بێ هودە ڕۆشتوم بۆ "سوریا و بابل و هاتی و کریت"، بۆئەوەی لەو وڵاتانەدا خۆشبەختی بەدەست بهێنم، بەڵام ئەو خۆشبەختیەی کە من بەدوایدا دەگەڕام نە لەدەریادا بوونی هەبوو و نە لە"بابل و هاتی" و شوێنەکانی تردا، بەڵکو ئەم خۆشبەختیە کات بەسەربردنە لەگەڵ ژنێکدا کە لەشارەکەی خودی من واتە لە"تبس"دا دەژیا.

بەڵام دەبێت ئەوەش بڵێین: مرۆڤ دەبێت بەنێو دەریاکاندا گەشت بکات و وڵاتانی تر ببینێت، بۆئەوەی تێبگات ئەو خۆشبەختیەی ئەو بەدوایدا دەگەڕێت لەشوێنەکانی تردا نیە، بەڵکو لەنیشتمانەکەی خۆدی ئەودا بەدەست دێت.

تا ئەوکاتەی مرۆڤ بەهۆی ڕێکردن، هەروەك ئەو ڕێکردنەی کە من لە"بابل"ەوە بەرەو "میتانی" لەکاتی هەڵهاتنندا بەپێ گرتمە بەر ماندوو نەبێت قەدری دانیشتن و حەوانەوە نازانێت، هەروەها پێش بەدەست هێنانی خۆشبەختی لەگەڵ ئەو ژنەی کە پیاوی خۆشدەوێت، مرۆڤ پێویستی بەوەیە بەرگەی ناسۆریەکانی بێبەشبون و دابڕان بگرێت.

ڕۆژی دوایی، کاتێك لەخەو هەستام"مریت"زەردەخەنەی بۆ کردم و پێی وتم:"سینۆهە"ئەگەر من بۆ زێڕ و زیو تۆم خۆشبویستایە و پێویستم بە کانزاکانی تۆ ببوایە، دەموت من لێرەوە ببە بۆ ماڵی خۆت، بۆئەوەی بتوانم لەوێ بەئاسودەیی بژیم، بەڵام من پێویستم بە کانزاکانی تۆ نیە و تۆم لەپێناو زێڕ و زیو خۆش ناوێت و هەر لەبەرئەوەش لێرەدا دەمێنمەوە.

وتم:"مریت"ئەگەر تۆ منت خۆش دەوێت، بۆچی نایەیت بۆ ماڵی من بۆئەوەی بەردەوام ئەویێ بکەیتە ماڵی خۆت؟

ژنەکە وتی: من لەبەر دوو هۆکار نایەم بۆ ماڵی تۆ. یەکێکیان ئەوەیکە ڕەواجی ئێرە پەیوەستە بەمنەوە، چونکە تەنها من دەتوانم خواردنەوەی"کلکی تیمساح" دروست بکەم و نهێنی ئامادەکردنی ئەو خواردنەوەیەش بەهیچ شێوەیەك ئاشکرا ناکەم، تا ئەوکاتەی ڕکابەرێکی بازرگانم نەبێت، لەبەرئەوەش ناتوانم لێرە بڕۆم و لەماڵەکەی تۆدا نیشتەجێ ببم.

سەرەڕای ئەوەش ئەوە تاقیکراوەتەوە کە کاتێك ژن و پیاوێك بێ لەبەرچاوگرتنی پێویستە مادیەکان یەکتری یەکتریان خۆش بوێت، ئەوا چاکتر وایە دور لەیەکتری بژین، بۆئەوەی هیچ کاتێك ئاگری هاوڕێیەتیان نەکوژێتەوە.

من ئەگەر لەماڵی تۆدا بژیم، دوای تێپەڕبونی وەرزێك یان دوو وەرز، وەك یەکێك لە شتەکانی ناو ماڵەکەتم لێدێت و تۆ دوای ئەوەی خۆت دەکەیت بەماڵدا حەزناکەیت تەماشام بکەیت، بەڵام ئەگەر دور لەیەکتری بژین، ئەوا تۆ بەبەردەوامی منت خۆش دەوێت.

*بەشی سی و یەك*

## "ئەخناتون" فیرعەونی میسر

ئەو ڕۆژە"هورم هەب"ڕۆشت بۆ لای فیرعەون و پێی ڕاگەیاند کە خودای "ئامون"سەرنگون کراوە و لەناوبراوە و خودای"ئاتون" لەجێگەکەیدا دانراوە و فیرعەونیش بەشێوەیەکی جێگیر ئەوی کردە فەرماندەی لەشکر و پێی وت: دەیەوێت بەیانی سەردانی پەرستگای"ئاتون"بکات، بەلام ئەمشەو لەکۆشکی فەرمانڕەواییدا پێشوازی لە هاوڕێکانی خۆی دەکات.

"هورم هب"لەبارەی منەوە لەگەڵ فیرعەوندا قسەی کرد و وتی: ئەم پزیشکە هەمان ئەو پزیشکەیە کەکاتێك تۆ جێنشین بویت لەگەڵ تۆدا هات بۆ بیابان، فیرعەونیش دوای قسەکانی"هورم هب" منی هاتەوە یاد و بە"هورم هب"ی وت: ئەمشەو کاتێك دێیت بۆ میوانیم ئەویش لەگەڵ خۆتدا بهێنە.

ئەوکات"هورم هب"لەبارەی منەوە چەند زانیاریەکی دا بە فیرعەون کەبەشێکی ئەو زانیاریانە زیادەڕۆ دەهاتە بەرچاو و پێی وتبوو کە: ئەم پزیشکە میسریە لەجیهاندا وێنەی نیە و هەڵگری تەواوی زانستە پزیشکیەکانی میسر و ولاتانی بیانیە و تا ئەمڕۆ سەدان کەسی لەمەرگی نەخۆشی و برینداری ڕزگار کردووە.

"ئەخناتون"[70]ی فیرعەون زیاتر تامەزرۆی ئەوە بوو کە چاوی بەمن بکەوێت و بەم شێوەیەش من بۆ یەکەمین جار بەناونیشانی کەسی بانگێشتکراو چوم بۆ لای

---

[70] ناوی یەکەمی ئەم فیرعەونە"ئامون هوتپ"ی چوارەم بووە، هەمان ئەم ناوەی ئەوە نیشان دەدات کە "ئامون"ی خۆشویستووە و دوای ئەوەی باوەڕی بە"ئاتون" هێنا و لەخۆشەویستی ئەو ناوی خۆی نا"ئەخناتون" کە واتای"خۆشەویستی ئاتون" دەگەیەنێت و هەمان ئەو خودایەش بەخودای تاك و تەنها لەقەڵەم دەدا و لەبەردەم بارەگای خودای تاك و تەنها و نەبینراودا لاڵە و نزای دەکرد.

فیرعەون‌و کاتێکیش خۆم کرد بەناو ئەو کۆشکەدا، بۆیەکەمین جار لەوێدا چاوم بەژنانی میسر بەمۆدیلە هاوینانەکەیانەوە کەوت.

ئەم مۆدێلە زۆر جوان بوو و ژنانەکانیش جلوبەرگی خۆیان بەشێوەیەك پۆشیبوو کە زۆر سەرنج ڕاکێش دەهاتە بەرچاو و هەروەها لەو میوانداریەدا ژنەکان چواردەوری چاویان سەوز و لێویان ڕەنگێکی سوری جەرگیان کردبوو.

"هورم هب"منی بردە لای فیرعەون و بینیم کە"ئەخناتون" کەمن بەمندالێ دەهاتە بەرچاوم زۆر گەورە بووە و بووە بەپیاو، بەڵام ڕوخساری لاواز و ئێسقانی دەرپەڕیو و چاوێکی درەوشاوەی هەبوو.

"ئەخناتون" پۆشاکێکی لەکەتان، کە بەکەتانی فەرمانڕەوایی ناوبانگی هەبوو لەبەردا بوو و کاتێك چاوی بەمن کەوت وتی:"سینۆهە" ئەوکاتەی من جێنشین بووم چاوم بەتۆ کەوتووە و ئەمڕۆ"هورم هب" باسی زانستەکانی تۆی بۆ کردم و وتی: کە لەمیسر و وڵاتانی تردا فێری هونەری پزیشکی بوویت. دوای ئەوە باسی خۆی کرد و وتی ماوەیەکە دوچاری سەرئێشە بوم و هەرکاتێك کەسێك بەپێچەوانەی خواست و ئارەزوەکانم قسەیەك بکات تۆشی ئەم سەرئێشەیە دەبم و بەشێوەیەك ئازارم دەدات کە ناتوانم نە نان بخۆم و نە بخەوم. پزیشکەکانی ئێرەش ئەم سەرئێشەیەی من بە بەدەرمانە هێورکەرەوەکان هێور دەکەنەوە، بەڵام زۆر لەم دەرمانانە بێزارم، چونکە دەزانم کەئەم دەرمانە هێور کەرەوانە هەستی مرۆڤ پەرتەوازە دەکات و دەبێتە ڕێگر لەبەردەم ئەوەی بەئاسودەیی بیر لەخودای خۆم بکەمەوە...."سینۆهە"...ئایا تۆ "ئاتون" دەناسی.

ئەو پرسیارەی فیرعەون لێی کردم پرسیارێکی زۆر هەڕەشە ئامێز بوو و دەبوو بەئاگاوە وەڵامم بدایاتەوە، بۆیە پێم وت: بەڵێ"ئاتون" دەناسم.

فیرعەون پرسی: ئەو بەچ شێوەیەك دەناسی؟

وتم: دەزانم کە"ئاتون" شتێکی مەزن و وڵاترە لەزانستی من و زانستی تەواوی مرۆڤەکان.

فیرعەون بەو وڵامەی من زۆر خۆشحاڵ بوو و وتی:"سینۆهە" ئەو وەڵامەی تۆ بەمنت دایەوە، زۆر باشترە لەو وەڵامانەی کە کەسانی تر بەمنیان داوە و ئێستا پێم بڵێ ئایا دەتوانی لەڕێی کونتێکردنی کاسەی سەری منەوە چارەسەرم بکەیت؟

وتم: "ئەخناتون"چارەسەر کردنی ئەو سەرئێشەیەت پێویستی بەکونتێکردنی سەر نیە، چونکە پزیشکێك دەتوانێت بەشێوەیەکی تر چارەسەری تۆ بکات مەگەر ئەوەی پزیشکەکان هیچ ڕێگایەکی تریان بەدەستەوە نەبێت ئەوکات پەنا بۆ کونتێکردنی سەر دەبەن.

فیرعەون وتی: "هورم هب"زۆر بەباشی ستایشی تۆیی بۆکردوم و منیش بەشێوەیەك لەوەلامەکەت دەربارەی"ئاتون"ڕازی بوم کە حەزدەکەم پلەوپایەیەکت پێبدەم. هەر بەوشێوەیەی کە دەزانی سەرکونتێکەری فەرمانڕەوایی پیر کۆچی دوایی کردووە و ئێستا جێگای ئەو خاڵیە و من تائێستا کەسێکم هەڵنەبژاردووە بۆئەوەی جێگەی ئەو پڕ بکاتەوە، بەلام تۆ لەم ساتە بەدەواوە دەبیتە سەرکونتێکەری فەرمانڕەوایی و لە ڕۆژی "ئەستێرەی سك[71]" بەدەواوە تۆ دەبیتە هەڵگری ئەو پلەوپایەیە و فەرماندەدەم کە لە"ماڵی ژیان"دا تۆ بەو پلەوپایە بناسێنن.

دوای ئەم گوتەیەی فیرعەون"هورم هب" منی لەفیرعەون دور خستەوە و ڕۆشتینە تەلارێکی تر کە تایبەت بوو بەشوێنی نان خواردن و"هورم هب"پێی وتم: سەرکونتێکەری فەرمانڕەوایی لەلای ڕاستی فیرعەون و خێزانەکەیەوەیە و دوای ئەوە من و"هورم هب" لەوێدا دانیشتین.

لەکاتی نان خواردندا، من بینیم کە فیرعەون گۆشتی مراوی و قاز و مەڕ و مانگا و ماسی ناخوات و لەبەرامبەر ئەو هەموو خواردنەدا تەنها نانێکی هەڵگرت و کردی بەدوو لەتەوە و دەستی کرد بەخواردنی و لەباتی شەراب ئاویان کردە ناو کاسەکەیەوە و دوای ئەوەی تێری خوارد وتی بەو کەسانەی کەلەوێ ئامادە بون: بە نەتەوەی میسر بڵێن کە خواردنی فیرعەن"ئەخناتون"ی ڕاستی و ئاشتی خواز تەنها نان و ئاوە و خواردنی ئەو هیچ جیاوازیەکی لەگەڵ هەژارترین بەندەکانی میسردا نیە، بەلام دوای ئەو شەوە من تێگەشتم- چونکە بەچاوی خۆم بینیم- کە فیرعەون گۆشتی قاز و مراوی و مەڕ و مانگاشی دەخوارد و شەرابیشی دەخواردەوە، بەلام

[71] ئەستێرەی"سك": بریتیە لە ئەستێرەیەکی درەوشاوە و بەشێکە لەکۆمەڵە ئەستێرەکانی"سەگی گەورەتر" کە ناوی یەکێك لە ڕۆژەکانی میسری مەزنە، بەشێوەیەکی جوانتر بڵێین کە "ئەستێرەی سك" یەکێکە لەناوی ڕۆژەکانی هەفتەی میسری ئەو سەردەمە.

لەنانخواردندا بەرنامەیەکی تایبەتی نەبوو، چونکە هەندێکات حەزی دەکرد نان و ئاو بخوات و بخواتەوە و هەندێکاتیش خۆی لەنانخواردن نەدەپاراست.

ئامادەبوانی ئەو میوانداریە دوای ئەوەی نانیان خوارد ڕۆشتنە ژورێکی ترەوە و لەوێدا بینیم کە پیاوێکی قەڵەو لێم نزیك بویەوە و منیش یەکسەر ئەوم ناسیەوە، بەڵام دوای ئەوەی تەماشای چاوانیم کرد، تێگەشتم "توتمس"ی هاوڕێی دێرینمە.

لەناسینەوەی زۆر خۆشحاڵ بوم و لەئامێزم گرت و ماچم کرد و وتم: "توتمس"من ڕۆشتم بۆ ئەو فرۆشگایەی کە یەکەمجار لەوێدا چاوم پێت کەوت و هەواڵم پرسیت، بەڵام پێیان وتم کە تۆ چیتر سەردانی ئەو فرۆشگایە ناکەیت.

"توتمس"پێکەنی و وتی:"سینۆهە"ئاخر من بومەتە پەیکەرسازی فەرمانڕەوایی و کەسایەتی گرنگی من ڕێی ئەوەم لێدەگرێت کە سەردانی ئەو جۆرە فرۆشگایانە بکەم، سەرەڕای ئەوەش چەند هاوڕێیەکم پەیدا کردووە کە بەردەوام بۆ خواردن و خواردنەوە میوانداریم دەکەن و چیتر پێویست بەوە ناکات بۆ خواردنەوە سەردانی ئەو جۆرە مەیخانانە بکەم.

وتم:"توتمس"لەبەرئەوەی بویتەتە پەیکەرسازی فەرمانڕەوایی، بەدڵنیاییەوە تۆ پەیکەرەکانی فیرعەونت بەسەر پایەکانی پەرستگاوە دروستت کردون؟

"توتمس"وتی: ئێمە کۆمەڵێك پەیکەرسازین کە پێکەوە کار دەکەین و سود لەهونەری ڕاستەقینە، هەروەك چۆن لە"کریت"دا گرنگیەکی زۆری پێ دەدرێت وەردەگرین و ئەوکاتەی خودای درۆینەی"ئامون"فەرمانڕەوایی میسری دەکرد ئێمە ناچار بوین شێوازەکانی هونەر پێشێل بکەین و لەدروستکردنی پەیکەر و وێنەکێشانەکاندا پەیڕەوی لەخودای درۆینە بکەین، ئەگەر کەمێکیش لامان بدایە کاهینەکانی ئەو خودا درۆینەیە ئێمەیان بەکافر لەقەڵەم دەدا و دواجاریش بەکوشتیان دەداین و هەر ئەوانیش دەیانوت هەرجۆرە هونەرێك کە پێچەوانەی یاساکانی خودای "ئامون" بێت، بەکفر لەقەڵەم دەدەین و هەرکاتێك هونەرمەندێك وێنەی شێوەیەك بکێشێت یان پەیکەرێك دروست بکات کە لەگەڵ شێوازەکانی هونەری"ئامون"دا نەگونجێت دەکوژرێت، ئێمەی هونەرمەندانی ڕاستەقینەش کە لەبواری هونەردا باوەڕمان بەئازادی بوو، چونکە نەماندەتوانی خۆمان لەگەڵ ژینگەی دوروبەرماندا بگونجێنین و دوای گەمژەیی پەیڕەوانی خودای ڕابردوو بکەوین، بۆیە بەسکی

برسیەوە ئاوجۆمان دەخواردەوە و هەندێکاتیش بگرە ئاوجۆشمان بۆ نەدەمایەوە، بەڵام ئەمڕۆ ئازادین و دەتوانین بەئازادیەوە سەرقاڵی هونەرەکەی خۆمان بین و هەرچیمان بوێت دەتوانین بیهێنینە بون.

منیش"توتمس"م بە"هورم هب"ناساند و پێم وت:ئەم پیاوەی کە چاوت پێی دەکەوێت، هونەرمەندێکی بێوێنەیە و فیرعەون نرخی دەزانێت، هەرلەبەرئەوەش کردویەتە پەیکەرسازی فەرمانڕەوایی.

"هورم هب" بەبینینی پەیکەرسازی فەرمانڕەوایی خۆشحاڵ بوو، بەڵام بەبۆنەی پلەوپایەی خۆیەوە زۆر خۆی بەخۆشحاڵ نیشان نەدا، بەڵام کاتێک"توتمس"چاوی بە"هورم هب"کەوت پێی وت:من زۆر حەز دەکەم پەیکەری تۆ دروست بکەم و لەپەرستگای"ئاتون"ی خودای تازەدا دایبنێم، چونکە تۆ ڕزگارکەری"ئاتون"و لەناوبەری خودای درۆینەی"ئامون"یت و شایستەی ئەوەی پەیکەرەکەت لە پەرەستگای تازەدا دابنرێت.

"هورم هب"بەڕادەیەک بەم قسەیە خۆشحاڵ بوو کە ڕوخساری لەخۆشیاندا سور وەرگەڕا و من تێگەشتم کە هۆکاری خۆشحاڵی ئەو ئەوەیە کە تا ئەو ڕۆژە هیچ کەسێک وێنەی ئەوی نەکێشاوە و پەیکەری ئەوی نەتاشیوە. و"توتمس"یش بۆ یەکەمجارە جەستەی لەبەردێک دەتاشێت.

کاتێک ئێمە لەبارەی پەیکەری"هورم هب"ەوە قسەمان لەگەڵ یەکتردا دەکرد، بینیم لەناوکاو هەستایە سەرپێ و هەردوو دەستی خستە سەر ئەژنۆی و کڕنوشێکی برد.ئێمەش ئاگاداری ئەو شوێنە بوین کە"هورم هب"سوژدەی بۆبرد و بنیمان"نفر تی تی" شاژن و هاوسەری "ئەخناتون" بەرەو ڕومان دێت، لەبەرئەوە ئێمەش هەستاین و سوژدەمان بەرەو ڕوی شاژنی جوانی میسر برد.

"نفر تی تی"پۆشاکی مۆدێلە نوێکەی پۆشیبوو و کاتێک گەشتە لامان دەستی خستە سەر سینەی و من بینیم ئەنگوستیلە و دەسبەندی لەدەستدا نیە، چونکە نەیدەویست بەهۆی دەستبەندو ئەنگوستیلەوە جوانی خۆی لەناو ببات.

شاژن پێی وتم:"سنیۆهە"دەستەکانم بۆ پەروەردە کردنی کوڕێک دانبەخۆداگری خۆی لەدەست داوە، چونکە فیرعەون خوازیاری کوڕێکە، بۆئەوەی دوای خۆی لەسەر تەختی فەرمانڕەوایی میسر دانیشێت، من و ئەو بەبۆنەی ئەوەی هێشتا کوڕێکمان

نەبووە زۆر نیگەرانین و لەو خودا درۆینەی کە لەناومان برد و دەزانین لەبۆسەی ئێمەدا دانیشتووە دەترسین. من دوو کچم بووە، بەڵام تائێستا کوڕم نەبووە و لەبەرئەوەی بیستومە کە تۆ پزیشکیت و زانیاریەکی تەواوت لەوڵاتانی دەرەوە بەدەست هێناوە، پێم بڵێ چ کاتێ دەتوانم کوڕم ببێت.

من هەوڵی ئەوەم دا جوانی فەرامۆش بکەم وبەچاوی پزیشکیەوە پشکنینێکی بۆ بکەم و وتم:

ئەی هاوسەری فیرعەون، باشتر وایە ئارەزوی لەدایك بونی کوڕێك نەکەیت، لەبەرئەوەی پانتایی ئەندامی بەشی دواوەوەتان زۆر کەمە و ئەو ژنانەی کە بەشی دواوەوەی ئەندامی جەستەیان پانتایی کەم بێت، هەرکاتێك کوڕێکیان ببێت، لەوانەیە لەکاتی لەدایك بونی ئەو کوڕەدا بمرن.

شاژنەکە وتی:سەرەڕای ئەوەش من خوازیاری کوڕێکم و تۆ دەبێت لەبواری پزیشکی خۆتدا کارێکم بۆ بکەیت کە من ببمە خاوەنی کوڕێك.

وتم: ئەی"نفر تی تی"هیچ کەسێك بێجگە لە"ئاتون"ناتوانێت کوڕێك کە لەسکی ژنێکدا دێتەبون لەڕوی نێرینەیی و مێیینەییەوە دەستنیشان بکات و من لەوڵاتانی تردا پزیشکگەلێکم بینیوە کە بانگەشەی ئەوەیان دەکرد کە کوڕێك یان کچێك بۆ ژنێك بهێننە بون، بەڵام زۆربەیان هەڵەیان دەکرد و هەرکاتێکیش لەوکارەیاندا هەڵەیان بکردایە ئەو ژنەی تازە منداڵی بووە بەوە تاوانبار دەکرد کە گوێڕایەڵی فەرمانەکانی ئەوان نەبووە و ئەوان دەیانزانی ئەو فەرمانانەی کە ئەوان دەیدەن بەڕادەیەك ورد و گرفت ئامێزە کە ناچار دەبن ئەو فەرمانانە بەسەر هەندێك ژندا نەسەپێنن و ئەوەیان وەك بیانوو دەهێنایەوە بۆئەوەی نەزانی خۆیانی پێداپۆشن، بەڵام من وەك ئەوان درۆت لەگەڵدا ناکەم و دان بەوەدا دەنێم کە ناتوانم دەرمانێکت پێ بدەم کە لەئایندەدا بتوانی کوڕێکت ببێت، بەڵام لەبەرئەوەی کچت بووە، دورنیە منداڵی سێیەمت کوڕ نەبێت، بەڵام لەو گوتەی دواییەشمدا بەڵێنی تەواوت نادەمێ.

"نفر تی تی" بەدەم بزەخەنەوە گوێ لەقسەکانی من دەگرت، دوای ئەوەی قسەکانم تەواو بوو، دڵتەنگی پێوە دیار بوو، من تێگەشتم کە گوتەکانم بێتاقەتی کردووە.

کاتێك"توتمس"بینی شاژن بێتاقە بووە، ئەویش بەشداری گفتوگۆکانمانی کرد و وتی: ئەی"نفر تی تی" بۆچی بەهۆی لەدایك بونی کچەوە بێتاقەت دەبیت. تۆ جوانترین ژنی جیهانیت و چی لەوە باشترە کە هەر کچت ببێت، بۆئەوەی کچەکانت وەك خۆت جوان بن و بەجوانیەکانت هەموو جیهان ڕوناك بکەیتەوە. من کچە گەورەکەی تۆم بینیوە و دەزانم کە چەنێك جوانە، ئەمڕۆ تەواوی ژنە وەجاخزادەکانی میسر هەوڵی ئەوە دەدەن بەشێوەیەك ئارایشتی خۆیان بکەن بۆ ئەوەی لەکچەکەی تۆ بچن و زۆریش حەز دەکەم پەیکەرێکت بۆ دروست بکەم، بۆئەوەی هەزاران ساڵ دوای مردنت خەڵکی چاویان بەجوانی تۆ بکەوێت و ستایشی ئەو جوانیەت بکەن و ناوی"نفر تی تی" بەردەوام لەجیهاندا پێناسەی جوانی بێت[72].

"نفر تی تی"زەردەخەنەیەکی کرد و ئاشکرا بوو کە چێژی لەگوتەکانی کابرای پەیکەر ساز وەرگرتووە و دوای ئەوە لێمان دور کەوتەوە.

ڕۆژی دوایی، من "مریت"م لە مەیخانەی"کلکی تیمساح" هێنایە دەرەوە و لەگەڵ خۆمدا بردم، بۆئەوەی چاوی بەفیرعەون بکەوێت کاتێك دەڕوات بۆ پەرستگا تازەکەی."مریت" مۆدێلی پۆشاکە تازەکەی لەبەرکردبوو و سەرەڕای ئەوەی بەخزمەتکارێکی مەیخانە لەقەڵەم دەدرا، کاتێك لەگەڵ ئەودا لەو مەیخانەیە هاتینە دەرەوە و لەشەقامەکانی"تبس"دا دەستمان کرد بەڕێکردن هەستم بەهیچ شەرمێك نەکرد، چونکە "مریت" ژنێکی جوان و ژیر بوو.

من لەگەڵ"مریت"دا بەرەو ڕوی پەرستگا تازەکە ڕۆشتین و لەبەردەم پەرستگاکەدا لەشوێنێك کە تایبەت بوو بەکەسە نزیکەکانی فیرعەون دانیشتین، لەوکاتەدا "مریت" دەستی خستە سەرشانم و سەرقاڵی تەماشاکردنی خەڵکی ناو ئەو کۆڕە بوو.

لەوباوەڕەدام لەو ڕۆژەدا تەواوی دانیشتوانی"تبس"لەبەرامبەر پەرستگا و ئەو شەقامەی کە فیرعەونی پێدا تێدەپەڕی ئامادە بوبون و لەهەردوو لای شەقامی "قۆچەکان"-بەبۆنەی ئەوەی ئەو شەقامە پەیکەرگلێکیان تێدا بوو کە سەریان وەك

[72] ئەو پەیکەرەی کە "توتمس" لەشێوەی شاژنی میسر دروستی کرد، لەئەمڕۆشدا هەیە و ماوەیەك لەمۆزەخانەی"بەرلین"دا بووە و "فوئاد"ی یەکەمی پادشای میسر داوای لەحکومەتی ئەڵمانیا کرد کە ئەو پەیکەرە، کە چاڵهەڵکەنەکانی ئەوروپا لەمیسردا دۆزیویانەتەوە، بگەڕێننەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی و حکومەتی ئەڵمانیاش ئەو پەیکەرەی پێدانەوە، بۆیە بەپێی ئەوگوتەیەش ئێستا دەبێت پەیکەری"نفر تی تی" لە یەکێك لەمۆزەخانەکانی میسردا بێت.

سەری بەران وابوو، هەر لەبەرئەوەش ئەو شەقامەیان بە شەقامی "قۆچ"ەکان بانگ دەکرد- قاپی پڕ لەگوڵیان بەدەستەوە بوو بۆئەوەی کاتێك فیرعەون لەوێوە تێپەڕی بیپرژێننە بەر ڕێگاکەی.

دوای ئەوەی من و"مریت"لەجێی خۆماندا دانیشتین، هەستم بەهەلومەرجێکی نائاسایی کرد، دوای ئەوەی لێی ورد بومەوە، زانیم کە ئەو هەلومەرجە نائاسییەوە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە کە خەڵکی بێدەنگ بون.

کاتێك کۆمەڵێك هەژار لەشوێنێکدا ڕادەوەستن، لەبەرئەوەی هەموویان قسە دەکەن و پێدەکەنن، بەردەوام دەنگەدەنگێکیان لێوە دەبیستریێت، بەڵام لەو ڕۆژەدا لەو شوێنەدا هیچ کەسێك قسەی نەدەکرد و بەشێوەیەك بێدەنگی باڵی بەسەر ئەو ناوچەیەدا کێشابوو کە مرۆڤی دڵگران دەکرد و تەنها دەنگی"قەلەڕەشە" و ئەو "واشانە"ی کە لەئاسماندا سەمایان دەکرد دەبیسترا، چونکە قەلەڕەشە و واشەکان، بەشێوەیەك لەلاشەی خەڵکی"تبس" تێریان خواردبوو، کە نەیاندەویست ئەو ناوچەیە بەجێ بهێڵن.

کاتێك فیرعەون بەسەر کەژاوەیەکەوە هات، بینیم کە گروپێك سەربازی ڕەشپێست کە ڕوخساریان ڕەنگاو ڕەنگ کردبوو، لەدوای کەژاوەکەوەن، بەڵام هەڵبژاردنی سەربازانی ڕەشپێست بۆئەوەی پاسەوانی تایبەتی فیرعەون بن، لەو ڕۆژەدا زۆر هەڵە بوو، لەبەرئەوەی لەنێوا تەماشاچیاندا کەسێك بەدی نەدەکرا کە لەکارەساتی کوشت و کوشتار و تالانی"تبس"دا بەدەست سەربازە ڕەشپێستەکانەوە زیانی لێ نەدرابێت.

هێشتا بەڕوخساری ژنەکانەوە پاشماوەی فرمێسکەکان مابون و برینی پیاوەکان هێشتا ساڕێژ نەبوبو و زۆرێك لەو خەڵکانەماڵیان نەبوو، چونکە ڕەش پێستەکان ماڵەکانیان سوتاندبون.

فیرعەون لەوڕۆژەدا تاجی دوو چینی بەسەرەوە بوو و بەپێی نەریتی دێرین بەیەکێك لەدەستەکانی گاڵۆکی گرتبوو وە لەسەر سینەی دانابوو، بەدەستەکەی تریشی یەوە قامچی دەبینرا کە هەردوکیان هێمای فەرمانڕەوایی و توانایان دەگەیاند. فیرعەون وەك پەیکەرێك تەکانی نەدەخوارد، چونکە لەکاتە گرنگ و سەرەکیەکاندا ئەوکاتانەی بەنێو ئاپۆرەی خەڵکیدا تێدەپەڕێت نابێت لەشوێن خۆیدا بجوڵێت.

کاتێك سەربازەکان چاویان بەفیرعەون کەوت، نێزەکانیان بەرزکردەوە و هاواری شادیان بەرزکردەوە و کەسە وەجاخزادە و دەوڵەمەندەکانیش وەك سەربازەکان دەستیان کرد بەهاوار کردن، بەڵام ئەم هاوارانە لەنێو بێدەنگی ساردی خەڵکیدا وەك دەنگی مێش وابوو کە لەڕۆژێکی زستاندا دەست بەویزە ویز دەکات.

ئەوانەی هاواری خۆشیان لێ بەرزکردەوە، کاتێك ئاگاداری ئەوە بوون خەڵکی بێدەنگی خۆیان نەشکاندووە بێدەنگ بون و دەمیان داخست.

ئەوکات"ئەخناتون"ی فیرعەونی میسر بەپێچەوانەی نەریتی دێرین کە بڕیار بوو فیرعەون وەك بتێك بێجوڵە ڕاوەستێت، دەستەکانی لەسەر سینەی هەڵگرت و گاڵۆك و قامچیەکەی بەدەستەوە جوڵاندەوە بۆئەوەی سڵاو بۆ خەڵکی بکات.

لەناکاو خەڵکی لەرزیان لێهات و دەنگێکی وەك دەنگی لافاو و زریان لەخەڵکیەوە بەرز بویەوەو هاواریان کرد-"ئامون"مان دەوێت-...."ئامون"مان دەوێت...."ئامون" پادشای خوداکانە.

هەڵگرانی کەژاوەی فیرعەون لەو هاوارە زۆر ترسان و ڕاوەستان، بەڵام ئەفسەرەکان پێیان وتن کە بەردەوامی بەڕۆشتنیان بدەن و کەژاوە بەرەو ڕوی دەرگای پەرستگای تازە کەوتە جوڵە. لەوکاتەدا خەڵکی بە هاوارێکی ترسناکتر لە نەڕەی شێر کەوتنە جوڵە و ڕێگای تێپەڕبونی کەژاوەکەیان گرت، دوای ئەوە بەشێوەیەك بارودۆخ تێکچوو کە دیار نەبوو چ کەسانێك لەچ شێوێنێکدا دەجەنگن.

تا ئەو شوێنەی چاوم دەیبینی ئەوەم بەرچاو کەوت کە شەڕ لەنێوان خەڵکی و سەربازە ڕەشپێستەکاندا بەرپا بووە و زۆریش بێبەزەییانە بوو.

سەربازەکان بەنێزە و شمشێر کەوتنە کوشتنی ژن و پیاوەکان و خەڵکیش بەچەقۆو بەرد و دار لەسەربازە سپی و ڕەشەکانیان دەدا و هەرئەوەی سەربازێك بکەوتایەتە دەستی ئەوانەوە یەکسەر دەیانکوشت. بەڵام هیچ کەسێك بەردی نەدەگرتە فیرعەون، چونکە فیرعەون وەك باوباپیرانی لەخۆرەوە هاتووەتە بون، بۆیە هیچ کەسێك نەیدەوێرا بگرە بەردباران کردنی فیرعەون لەهزریشیدا پەروەردە بکات.

من بینیم کە فیرعەون لەناو کەژاوەکە هەستایە سەرپێ و بێئەوەی گرنگی بە پلەوپایە و کەسایەتی خۆی بدات، بەسەر سەربازەکاندا هاواری کرد و وتی ڕاوەستن،

خەڵکی بەکوشت مەدەن، بەڵام سەربازەکانی بەڕادەیەك سەرگەرمی شەڕ و خوێنڕێژی بوبون، گوێیان لەهاوارەکانی فیرعەون نەبوو.

لەبەرئەوەی فیرعەون دەیزانی خۆی لەهەموو هەڕەشە و گرفتێك پارێزراوە، هیچ کەسێك بەمەبەستی خراپ پەلاماری نادات، بۆیە بێ هیچ ترسێك دیمەنی شەڕی نێوان خەڵك و سەربازەکانی دەبینی.

بۆ ساتێکیش هاواری"ئامونمان دەوێت" ڕانەدەوەستا و خەڵکی بەشێوەیەك توڕە بوبون کە بەرەو ڕوی شوێنی تایبەتی کەسە نزیکەکانی فیرعەون هێرشیان برد و ویستیان بمانکوژن.

کاتێك"هورم هب"بینی گیانی هەموو خاوەن پلەو پایە و وەجاخزادەکان کە لەنێویاندا ژنگەل‌و منداڵگەلێکی زۆریان تێدا بەدی دەکرا، کەوتبووە ژێر باری هەڕەشەوە، بۆیە فەرمانیدا فوو بەبوقەکاندا بکەن و دوای ئەوەی دەنگی بوقەکان بەرز بویەوە گالیسکە جەنگیەکان کەلەسەر کۆڵانەکاندا ڕاوەستابون کەوتنە جوڵە."هورم هب" بۆ کاتێکی تەنگانە گالیسکەکانی لەکۆڵانە لاوەکیەکاندا ڕاوەستاندبوو بۆئەوەی خەڵکی بەبینینیان نەوروژێن، لەهەمان کاتدا ئەگەر پشێویەك دروست بوو، بتوانێت دوبارە هێمنی و ئارامی بەرقەرار بکاتەوە.

لەگۆڕەپانی جەنگدا ڕم و داسیان لەپێش گالیسکەکانەوە داچەقاندبوو، بەڵام لەو ڕۆژەدا گالیسکەکان ڕم و داسیان پێوە نەبوو و"هورم هب" وتبوی ئەو ڕم و داسانەیان لێ بکەنەوە، بۆئەوەی بەهۆیانەوە خەڵکی بەکوشت نەدرێن.

گالیسکەکان بەجوڵەیەکی خێرا و بەیەك ڕیز هاتن و چواردەوری ئێمەیان گرت و هەندێکیش لەو گالیسکانە چواردەوری کەژاوەکەی فیرعەونیان دا، لەوکاتەدا خەڵکی ویستیان بەرگری لەخۆیان بکەن، بەڵام ئاگاداری ئەوە بوون کە لەژێر گالیسکەکاندا دەفلیقێنەوە، بۆیە ڕێگایان بۆ کەژاوەکە کردەوە و کەژاوەکەش دوبارە کەوتەوە ڕێ.

بەڵام نەچووە ناو پەرستگاکەوە، بەڵکو فیرعەون لەپەرستگاکە تیپەڕی و گەشتە ڕوباری "نیل"و لەکەژاوەکە دابەزی و سواری کەشتی فەرمانڕەوایی بوو و ڕۆشت، لەکاتێکدا کە کەشتیە جەنگیەکان بەدوایەوە بوون.

خەڵکی کاتێك بینیان فیرعەون نەیتوانی بڕواتە ناو پەرستگای خودای تازەوە و بەسەر کەشتیەکەوە لەبەرچاویان ون بوو، هاواری شادیان لێ بەرز بویەوە و پیاوە

دزو جەردەکانیش پەلاماری ماڵە دەوڵەمەندەکانیان دا و سەروەت و سانیان تاڵان کردن و بێ ڕەزامەندی ژنە جوانەکان دەست درێژیشیان کردە سەریان، بۆیە ئەم بارودۆخە گەشتە ڕادەیەك کە"هورم هب"ناچار بوو لەگەڵ سەربازەکانیدا بەنێو شاری"تبس"دا بگەڕێت و لەهەموو ناوچەیەکدا کۆمەڵێك جەلاد دابنێت و هەرکەسێك لەکاتی کوشتنی خەڵکانی تردا ببینن، لەهەمان ئەو کاتەدا بیکوژنەوە.

سەرلەئێوارەکەی، بەهۆی ئەو سەرانەی کە جەلادەکانی"هورم هب" لەلاشەکانیان کردبووەوە، هێمنی و ئاسایش گەڕایەوە بۆ شاری"تبس"و پێش ئاوابونی خۆر "قەلەڕەش و واشەو داڵەکەرخۆرەکان" لەئاسمانەوە دابەزینەوە ناو شاری"تبس" بۆئەوەی گۆشتی ئەو لاشانەی لەشاردا، بەتایبەت لەشەقامی"قۆچ"دا و لەبەردەم پەرستگای تازەدا کەتبوون بخۆن.

"ئەخناتون"ی فیرعەونی میسر، تا ئەو ڕۆژە بەرنگاری ڕاستەقینەی نەتەوەی میسر و ڕشتنی خوێنی خەڵکی بەچاوی خۆی نەبینیبوو، دوای ئەوەی چاوی بە خوێنڕێژی ئەو ڕۆژە کەوت، فیرعەون بەهۆی ئەوەی دانیشتوانی شاری "تبس" بەوشێوەیە لەبەردەم خودای ئەودا بەرنگاریان لەخۆیان دەکرد زۆر لێیان تورە بوو و فەرمانیدا هەرکەسێك ناوی"ئامون"خودای پێشوو بهێنێت، یان شێوەی"ئامون"لەسەر قاپ و کاسەی ناوماڵەکانیان ببینن، لە"تبس"دور بخرێتەوە و لەناو کانە کانزاکاندا بێگاری پێ بکەن، بەڵام خەڵکی بێدەنگ بون و هیچ کەس فیتنەیی لەسەر ئەویتر نەدەکرد.

فیرعەون ڕۆژی دوایی پرسی:چەند لەپەیڕەوانی"ئامون"دور خرانەوە؟

بەرپرسەکانیش وتیان:هیچ کەسێك دور نەخراوەتەوە، چونکە هیچ کەسێك ناوی"ئامون" ناهێنێتە زمان.

فیرعەون وتی:دەی کەواتە ئەو کەسانەی دوێنێ هاواریان دەکرد"ئامون"مان دەوێت کێ بون؟ ئایا ئەوانە دەستگیر ناکەن و بۆ بێگاری کردن نایانێرنە کانە کانزاکانەوە؟

بەرپرسەکانیش وتیان: دوێنێ ژمارەی خەڵکەکە زۆر زۆر بوو، بۆیە نەمانتوانی بیانناسینەوە و دەستنیشانیان بکەین، ناشزانین چ کەسانێك خودای درۆینەیان دەوێت.

ئەوکات فیرعەون زۆر تووڕە بوو و فەرمانی دا و ئەو فەرمانەی بۆ من بوو بەمایەی داخ، چونکە فەرمانی دابوو کە هەرکەسێك ئەوەی پەیڕەوی لە"ئامون"بکات ئاشکرا بکات، مافی ئەوەی هەیە دەست بەسەر سەروەت و سامانەکەیدا بگرێت، سەرەڕای ئەوەش کەسە دەست پاکەکان ئامادە نەبون پەیڕەوانی"ئامون"پیشانی بەرپرسەکان بدەن، بەڵام بەپێچەوانەوە کۆمەڵێك دز و کۆیلە بۆئەوەی دەست بەسەر سەروەت و سامانی خەڵکیدا بگرن، هەندێك کەسیان بەناونیشانی ئەوەی ئەمانە باوەڕیان بە"ئامون"ە پیشانی بەرپرسانی دەوڵت دا و بەرپرسانیش یەکسەر ئاڕاستەی کانە کانزاکانیان کردن و دز و بەندەکانیش دەستیان دەگرت بەسەر سەروەت و سامانی ئەو جۆرە کەسانەدا.

لەکاتێکدا ئەم ستەمکاریە لەشاری"تبس"دا بەردەوام بوو لەڕۆژی سێیەمی دوای ئەو ڕوداوەی بەردەم پەرستگای تازە، ئەوکاتەی من لەماڵدا خەوتبوم، لەکۆشکی فیرعەونەوە کەژاوەیەکیان بۆناردم و بردمیان بۆلای فیرعەون، کاتێك خۆم کرد بەکۆشکی فیرعەوندا زانیم ئەو نەخۆشیەی کە هەندێك جار سەرتاپای فیرعەون دادەگرێت دوبارە بۆی گەڕاوەتەوە و کۆمەڵێك پزیشك کە لە"ماڵی ژیان"ەوە هاتبوو لەوێ بون.

دیاربوو پزیشکەکان نەیاندەوێرا چارەسەری فیرعەون بکەن، بۆیە منیان بانگ کرد بۆئەوەی من لەم چارەسەرکردنەدا هاوبەشیان بم و بەرپرسیاریەتی چارەسەرکردنی فیرعەون دابەشی کەسانێکی زیاتر ببێت، سەرەڕای ئەوەش لەبەرئەوەی من سەرکونتێکەری فەرمانڕەواییم، بەواتا بومەتە پزیشکی تایبەتی فیرعەون، ئامادە بونی من زۆر پێویست بوو.

منیش لەفیرعەون نزیك بومەوە و لێدانی دڵیم گرت و زانیم کە لێدانی دڵی لاوازتر بووە و پەنجەی دەست و قاچی"ئەخناتون"سارده بووە، دوای ئەوە پێڵوی چاویم بەرز کردەوە، بەڵام بینیم کە چاوانی هەڵگری توانا و درەوشاوەیی خۆیەتی و کاریگەری تایبەتی چاوی ئەو جۆرە کەسانەی کە لەحاڵی گیانەڵاندا لەودا بەدی نەدەکرا و دەبێت کەمێك لەخوێنی فیرعەون دەربکرێت بۆئەوەی بگەڕێتەوە حاڵی ئاسایی خۆی.

پزیشکانی"ماڵی ژیان" وتیان ئێمە ناتوانین ئەو چارەسەریەی بۆ دەستنیشان بکەین، چونکە فیرعەون لاواز و کەمخوێنە و ئەگەر خوێنی لێ دەربکەین دەمرێت.

منیش وتم: ئەگەر ئەم حاڵەتی لەهۆش چونەی بەردەوام بێت دەمرێت، لەبەرئەوەی ورده ورده لێدانی دڵی لاوازتر دەبێت تا ئەو کاتەی دەمرێت، بەڵام دەبێت بەشێوەیەك خوێنی لێ دەربهێنین کە ئەو دوای ئەوەی هاتەوە هۆش خۆی، ئاگاداری ئەوە نەبێت کە خوێنیان لێ دەرهێناوە.

پزیشکانی"ماڵی ژیان" وتیان: ئایا ئەو بەرپرسیاریەتیە لەئەستۆ دەگریت؟

وتم: بەڵێ لەئەستۆی دەگرم، چونکە دڵنیام بەردەوام بونی ئەم لەهۆش چونەی هەڕەشەئامێز دەبێت.

پزیشکەکان وتیان، ئێستا هەرچیت دەوێت بیکە، منیش دەرزیەکەم لەجانتای کەرەستەی پزیشکیەکەمدا دەرهێنا و خستمە سەرئاگر و دوای ئەوەی لەناو ئاگرەکەدا دەرمهێنا و سارد بویەوە، چەقاندم بەڕەگی خوێنبەری فیرعەوندا و خوێنی لێهاتە دەرەوە، دوای چەند ساتێك فیرعەون دەمی کردەوە و هەناسەیەکی قوڵی هەڵکێشا، دوای ئەوە یەکسەر شوێنی برینەکەم بەست بۆئەوەی خوێنی لێ نەیەتە دەرەوە و ئەو کاسەیەی کە خوێنەکەی تێڕژابوو شاردەوە.

فیرعەون بەتەواوی هاتەوە هۆش خۆی و هەستایەوە سەرپێ و دانیشتەوە و هەرئەوکاتەی چاوی بەپزیشکانی"ماڵی ژیان" کەوت ئەوەی هاتەوە یاد کە"ماڵی ژیان"لەپەرستگای"ئامون"ە و بەهۆی ئەو ڕەقەی لەبەرامبەر"ئامون"دا هەیبوو فەرمانی دا پزیشکەکانی"ماڵی ژیان" لەکۆشکەکەی بکەنە دەرەوە.

دوای ئەوەی ئەوان ڕۆشتن فیرعەون وتی:"سینۆهە" بڕۆ و کەشتیەکانی من لەوە ئاگادار بکەرەوە کە خۆیان ئامادەی ڕۆشتن بکەن و بە سەوڵ لێدەرەکانیش بڵێ کە من دەمەوێت گەشتێك بکەم.

لێم پرسی: دەتەوێت بۆ کوێ بڕۆیت.

وتی: من چیتر لەم شارەدا ناژیم و بەکەشتیەکانی خۆم ئەوەندە ڕێدەکەم تا ئەوەی دەگەمە شوێنێك کە گونجاو بێت بۆ دروست کردنی شارێکی نوێ و لەوێدا شارێکی تازە دروست دەکەم و لەوشارەشدا نیشتەجێ دەبم و چیتر دوای ئەوە پێ نانێمە شاری"تبس"ەوە، چونکە دانیشتوانی ئەو شارە پەیڕەوی لە"ئامون"ی خودای درۆینە دەکەن و کەسانێکی پوچەڵ پەرستن و ئەو ڕەفتارەی کە ئەوان لەبەرامبەر

پەرستگای خودای"ئاتون" نواندیان بەهیچ شێوەیەك لەیاد ناچێت و من دڵنیام كە هیچ یەك لەباوباپیرانی من لەمیسردا، بەوشێوەیە ناحەقیان لەبەرامبەردا نەكراوە.

لەبەرئەوە تۆ دەبێت بڕۆیت و"هورم هب"لەوە ئاگادار بكەیتەوە كە من هەر ئەمشەو لە"تبس"ەوە بەكەشتی دەكەومە ڕێ و هەركەسێك منی خۆش دەوێت لەگەڵمدا بێت.

"هورم هب"فەرماندەی لەشكری میسر كە كەرەستەی كۆچكردنی فیرعەونی فەراهەم دەكرد پێی وتم:"سینوهە" ئەوە باشترە، چونكە بەم شێوەیە هەم دانیشتوانی"تبس"بەئارەزوی خۆیان دەگەن و ئەوەی دەیانەوێت بەدەستی دەهێنن و هەم فیرعەون ئەوەی دەیەوێت ئەنجامی دەدات، بێئەوەی لەگەڵ هیچ كەسێكدا جەنگ بەرپا بكات.

"ئەخناتون"ئەوەندە پەلەی ڕۆشتنی بوو، بۆئەوەی لە"تبس"بڕواتە دەرەوە، چاوەڕێی ئەوەی نەكرد خێزانی فەرمانڕەوا خۆیان ئامادەی ئەم كۆچە بكەن، بۆیە وتی: من دەڕۆم، ئەوانیش دوای من بێن و سواری كەشتی خۆیان بن، "هورم هب"یش كۆمەڵێك كەشتی بۆ پارێزگاریكردن و دواكەوتنی ڕاسپارد.

منیش لەگەڵ فیرعەوندا ڕۆشتم و لەكانگای دڵمەوە بەم كۆچە ڕازی بووم، چونكە دەمزانی گۆڕانی ئاو و هەوا بۆ ئەو زۆر بەسودە.

ئێمە بەرەو باكور و پشتی"تبس" و بەئاڕاستەی ڕوباری نیل كەوتینە ڕێ و كاتێك ماوەیەك لە"تبس"دور كەوتینەوە چارۆكە ئەرخەوانیەكانی كەشتی فیرعەونیان هەڵكرد بۆئەوەی خێراتر ڕێبكات و زۆری نەخایاند دیوار و كۆشك و پایە بەردینەكانی"تبس"-مەبەستم ئەو پایانەی كە لەحاڵەتی ستونی لەسەر زەوی دایانچەقاندبون، بۆئەوەی لەڕێی سێبەری ئەو پایانەوە كاتەكانی ڕۆژی پێ دەستنیشان بكەن- و كێوە سیانیەكانیش لەبەرچاو ون بون، بەڵام یادگاری پایتەختی میسر لەگەڵماندا بوو، چونكە هەندێكجار تیمساحەكانی ڕوباری"نیل"لەناو ئاودا دەكەوتنە جوڵەو كلكە درێژ و بەهێزەكانیان تەكان دەدا و دیار بوو كە سەرقاڵی خواردنی ئەو لاشانەبون كە ڕۆباری نیل لە"تبس"ەوە لەگەڵ خۆیدا دەیهێنا. هەندێك لەو لاشانە لەبەرئەوەی سەرئاو كەتبون بۆگەنیان كردبوو و بۆنێكی زۆر ناخۆشیان بەنێو هەوادا بڵاو كردبوویەوە و لەژورەكەی فیرعەون كە لەناو كەشتیەكەدا بوو بخوردیان دەسوتاند، بۆئەوەی ئەو بۆنە ناخۆش لەناو ببات.

دوای دە ڕۆژ گەشتینە شوێنێك كە لاشە تێدا نەدەبینرا و فیرعەون لەژورەكەی خۆی هاتە دەرەوە و لەسەر سەكۆی ناو كەشتیەكەدا ڕاوەستا و خۆی سەرقاڵی تەماشاكردنی كەنارەكانی "نیل" كرد.

زەویەكانی هەردوو لای ڕوباری"نیل"زەرد ڕەنگ بوو و لادێییەكانیش بەروبومی كشتوكاڵیان لەكێڵگەكاندا كۆدەكردەوە و دەیانبردەوە بۆ ناو لادێ و ئاژەڵەكانیشیان دەهێنایە كەنار ڕوبار بۆئەوەی ئاویان بدەن و هەندێك شوانیش لەوكاتەدا سەرقاڵی شمشاڵ ژەنین بون.

كاتێك خەڵكی كەشتی فیرعەونیان بینی، لەو لادێیانەی كە دەكەوتنە هەردوولای ئەو ڕوبارەوە، بەلقە خرمایەكەوە كە بەدەستیانەوە بوو ڕایان دەكرد و لقە خورماكەیان ڕادەوشاند و خۆشحاڵی خۆیان بۆ دەردەبڕی.

فیرعەون بە بینینی ئەو جۆرە خەڵكە چالاك و خۆشحاڵ بوو و هەندێجاریش پێدەكەنی، فەرمانی دا كە كەشتیەكە ڕاوەستێنن و ڕۆیشتە كەرنار ڕوبارەكەوە و لەگەڵ لادێییەكاندا قسەی دەكرد و دەستی بۆ ژن و منداڵەكان ڕادەوەشاند.

هەندێكجار مەڕەكان لەفیرعەون نزیك دەبونەوە و بۆنی دامێنەكەی بەریان دەكرد یان دەیانلیێسایەوە، فیرعەونیش بەبینینی ئەم جۆرە دیمەنانە وەك منداڵێك خۆشحاڵ دەبوو و پێدەكەنی.

من بەگۆڕینی لایەنی دەرونی"ئەخناتون"زۆر خۆشحاڵ بوم، بەلام لەلایەكەوە لەڕەفتارێكی ناڕازی بوم ئەویش ئەوەبوو كە دەیوت"ئاتون"خوداكەی ئەو خۆرە و لەسەر سەكۆی كەشتیەكەدا دادەنیشت و ڕوخسار و جەستەی خۆی دەخستە ژێر تیشكی خۆر، بەلام ئەم خودایە لەوەرزی هاوینی میسردا زۆر هەڕەشەئامێز دەبوو و لەگەرماندا مرۆڤی نەخۆش دەخست.

فیرعەونیش بەهۆی زۆر لەبەرخۆر ڕاوەستان "تا"ی لێدەهات و چاوەكانی بریسكەیان دەدایەوە، بەلام شەو تەندروستی باشتر دەبوو، لەناو سەكۆی كەشتیەكەدا دادەنیشت و تەماشای ئەستێرەكانی دەكرد و پێی وتم: من تەواوی زەویەكانی خودای ڕابردوو دابەش دەكەم بەنێو ئەو جوتیارانەدا كە تا ئەمڕۆ زەویان نیە و بەبەشێكی كەم ڕازی بوون، بۆئەوەی بتوانن گەنمێكی زیاتر بەرهەم بهێنن و مانگا و مەڕێكی زیاتر پەروەردە بكەن و ئەوەندە بخۆن كە منداڵەكانیان قەڵەوو ژنەكانیان

جوان بن و چیتر کینه و ڕقیان لەبەرامبەر یەکتریدا نەمێنێت. خودای"ئاتون"جیاوازی لەنێوان دەوڵەمەند و هەژاردا ناهێڵێت و کارێك دەکات کە چیتر بەندەکان ناچار نەبن لەبەرامبەر خواردندا هەموو تەمەنیان خزمەتی خاوەنەکانیان بکەن. "سینوهە"من لە"تبس"چومە دەرەوە، لەبەرئەوەی دەزانم"تبس" شارێکە کە تێیدا جیاوازیەکی مەزن لەنێوان دەوڵەمەند و هەژاردا بەدی دەکرێت و بڕێکی زۆری خەڵك کە هەژارن، ناچارن بەناونیشانی کرێکار و بەندە لەسەرتاپای ژیانیاندا کار بۆ کەسە دەوڵەمەندەکان بکەن و بەردەوام کەسێکی هەژار و برسیان لێ دەربچێت و هەرچی کاریش بکەن سەرئەنجام ئەو دەستکەوتەی بەدەستی دەهێنن بگەڕێتەوە بۆ ژێر دەستی کەسە دەوڵەمەندەکان. من ڕقم لە"تبس"ە کە دانیشتوانەکەی خودای ڕابردوو دەپەرستن، چونکە خودای درۆینەی ڕابردوو خوازیاری بەدبەختی و برسیەتی هەژاران و بەهێزکردنی دەوڵەمەندەکان بوو و تەواوی یاساکانی خۆی بەشێوەیەك دادەڕشت کە دەوڵەمەندەکان ساڵ لەدوای ساڵ دەوڵەمەندتر بن و هەژارانیش بە بەدبەختی و برسیەتی بمێننەوە. من دەزانم نابێت چاوەڕێی ئەوە لەدانیشتوانی شاری"تبس"بکەیت کە دەست لەخودای ڕابردوو هەڵگرن، چونکە ئەوان چێژیان لەسەروەت و سامان و خۆپەرستی وەردەگرن کە هەموو ئەمانە لەخودای ڕابردووەوە سەرچاوەی دەگرێت، تەنها ئومێدم بەلاوان و منداڵەکانە، چونکە تەنها ئەوانە دەتوانن باوەڕبە"ئاتون"بهێنن و بەهاری ئایندە نەتەوەی میسر پێك بهێنن، کاتێك منداڵ و لاوەکان لەسەردەمی لاویەتیەوە فێری باوەڕهێنان بەخودای"ئاتون"بون، چیتر ئامادە نین باوەڕ بە"ئامون"بهێنن و چیتر دوای ئەوەی گەورە بوو جگە لە"ئاتون"هیچ کەسێکی تر ناناسن. من بۆئەوەی وا لە منداڵان و لاوان بکەم باوەڕ بە"ئاتون"بهێنن، دەمەوێت فێرکارانی ڕابردوو لەقوتابخانەکان دەربکەم و لەباتی ئەوان چەند فێرکارێکی تازە لەقوتابخانەکاندا دابمەزرێنم، هەروەها بڕیاری ئەوەم داوە شێوازی نوسینی میسر بگۆڕم، چونکە یەکێك لەو هۆکارە کاریگەرانەی کە بووەتە هۆی ئەوەی جیاوازی لەنێوان هەژار و دۆڵەمەنندا هەبێت شێوازی نوسینی میسریە. من واهەست دەکەم بۆ ئەوەی بنوسین، پێویست بەوە ناکات شێوەی هەموو شتێك بکێشین، بەڵکو دەتوانین ئەوەی دەمانەوێت بەشێوەیەکی تر بینوسین. نوسینی ئەمڕۆی میسر جۆرە نوسینێکی زۆر دژوارە و هەژارەکان ناتوانن ساڵەکانی تەمەنیان بۆ فێربونی ئەم جۆرە

نوسینەی تەرخان بکەن، تەنها دەوڵەمەندەکان دەتوانن خۆیان بۆ ئەم جۆرە خوێندنە ئامادە بکەن، بۆیە هەر دەوڵەمەندەکان خوێندەواریان هەیە، لەگەڵ کەسانی هەژاردا جیاوازن، بەڵام کاتێك شێوازی نوسین ئاسان بوو دەتوانن بخوێننەوە و بنوسن، چیتر دوای ئەوە کەسە دەوڵەمەندەکان خوێندەواری بون ناکەنە تایبەتمەندیەك بۆئەوەی خۆیان لەکەسانی هەژار جیا بکەنەوە.

من لەم قسەیەی فیرعەون زۆر ترسام، لەبەرئەوەی دەمزانی کە شێوازی نوسینی تازە بەچ شێوەیەکە و دەشم زانی کە ئەو جۆرە نوسینە ئاسانە بەڵام زۆر ناشیرینە و هەموو عەریزە نوس و نوسەرێك زۆر ڕقیان لەم جۆرە نوسینەیە. بۆیە بەفیرعەونم وت:ئەو کارە نەکات و گۆڕانکاری بەسەر شێوازی نوسینی میسریدا نەهێنێت.

فیرعەون وتی: بۆچی؟

وتم: لەبەرئەوەی تەواوی یاسای خوداکانی میسر بەو شێوە نوسینە نوسراوەتەوەو ئەم جۆرە نوسینەش بەپیرۆز لەقەڵەم دەدرێت.

فیرعەون وتی: کاتێك ئەوشێوە نوسینە تازەیە لەنێو خەڵکیدا بووە باو و خەڵکی بەو جۆرە نوسینە یاسای خوداکانیان خوێندەوە، ئەوکاتە دەبێتە شێوە نوسینێکی پیرۆز.

وتم: گۆڕینی شێوازی نوسینی میسر زیانێکی تر لەخۆ دەگرێت؟

فیرعەون پرسی: چ زیانێك؟

وتم:ئەگەر شێوازی نوسین و خوێندنەوە ئاسان بکرێت، بەشێوەیەك کە هەموو کەسێك خوێندەوار ببێت، چیتر هیچ کەسێك بەدەستکانی خۆی کار ناکات و زەویەکان بێ کشتوکاڵ و جوتیار دەمێننەوە و چیتر کانزاکانیش دەرناهێنرێن. ئەوکات ئەم شێوە نوسینە ئاسانە بۆ نەتەوەیەك کە خەریکە لەبرساندا دەمرێت چ سودێکی دەبێت؟

چاوەکانی فیرعەون دوای بیستنی ئەم قسەیە بریسکەی دایەوە و وتی:"سینۆهە"من لە"تبس"دەرچوم، لەبەرئەوەی لەو خەڵکەی کەلایەنگری نەریتی ڕزیوی خودای کۆنن هەڵبێم و ئێستاش دەبینم کە یەکێك لە پەیڕەوانی ئەو بیروباوەڕە کۆنە لەتەنیشت منەوەیە."سینۆهە" تۆ ڕاستیەکان نابینیت، بەڵام من بەشێوەیەك ڕاستیەکان لەدوای ساڵەکانی ئایندەدا دەبینم، هەروەك چۆن ناو ئاوێکی زوڵاڵ و پاك

دێته بەرچاوم. کاتێك هەموو خەڵکی خوێندەوار بون، هەموویان بەدەستیان کار دەکەن و وەك کۆمەڵێك برا کارە دەستیەکانی وەك کشتوکاڵ و جوتیاریو دەرهێنانی کانزا و پیشەسازی و بازرگانی لەنێوان خۆیاندا دابەش دەکەن.

لەو جیهانەی کە خودای من"ئاتون"دەیهێنێتە بون هیچ کینە و ڕقێکی تێدا بەدی ناکرێت، هەروەها هیچ کەسێك لەو جیهانەدا نانی ئەوی تر بۆ خۆی زەوت ناکات، بەڵکو هەموو کەسێك نانی خۆی لەگەڵ خەڵکانی تردا بەش دەکات.

لەو جیهانەی کە هەموویان خوێندەوار و دانان، جیاوازی لەنێوان دەوڵەمەند و هەژاردا لەناو دەچێت و چیتر نەدەوڵەمەند بونی دەبێت و نە هەژار، چونکە هیچ کەسێك ناتوانێت بەناونیشانی ئەوەی لەویتر باشتر و تایبەتمەندترە ئەو بکاتە کرێکار یان بەندەی خۆی و هیچ کەسێك بەویتر نالێت: بڕۆ هەی سریانی پیس یان بڕۆ هەی ڕەشپێستی بۆگەن، لەبەرئەوەی هەموو کەسێك ئەویتر بەبرای خۆی دەزانێت، لەبەرئەوش چیتر دەوڵەمەند و هەژار بونی نەماوە هیچ کینە و ڕقێك بونی نامێنێت و جەنگیش لەنێوان خەڵکاندا دروست نابێت.

فیرعەون لەکاتی دەربڕینی ئەم جۆرە قسانە بەشێوەیەك وروژابوو کە ترسی دروست دەکرد و تێگەشتم کە دوبارە دوچاری"پەرکەم"بووەتەوە، ئەوم لەسەر حەسیرێکی سەر سەکۆی کەشتیەکەدا خەواند و دەرمانێکی هێورکەرم پێدا بۆئەوەی ئارام ببێتەوە.

بەڵام دوای ئەوەی فیرعەون ڕاکشا و ئارام بویەوە ئاگاداری ئەوە بووم کە گەرچی "ئەخناتون" هەندێکات دێوانە و شێت دەبێت، بەڵام ئەم شێتیەی ئەو لەیەکێکەوە و بۆ یەکێکی تر دەگوێزرێتەوە، بۆیە من کەوتمە ژێر کاریگەری گوتارەکانیەوە.

من نەتەوەگەلێکی زۆرم بینیوە کە لەبنەڕەتدا هەموویان لەیەك دەچن. هەروەها چاوم شارگەلێکی زۆری بینیوە و لەوەگەشتبوم کە لەبنەڕەتدا هەموو شارەکان لەیەك دەچن. جیاوازی بەرزی و نزمی دیوارەکان، ڕەنگی کۆشکەکان نەدەبووە هۆی جیاوازی نێوان شارەکان دا.

من پزیشکم بۆیە لەدیدی پزیشکێکەوە، نەخۆشێکی میسری و نەخۆشێکی سریانی و نەخۆشێکی ڕەشپێست یەکێکە و هیچ جیاوازیەك لەنێوانیاندا بەدی ناکرێت و تەنها ئەرکی پزیشك ئەوەیە چارەسەری هەرسێکیان بکات.

لەبەرئەوەی ئەمانەم دەزانی، کەوتمە ژێر کاریگەری فیرعەونەوە و بەخۆمم وت گەرچی ئەم پیاوە شێتە و شێتی ئەو بۆ کەسانی تر دەگوێزرێتەوە، بەڵام ئەم شێتیە بگوێزرێتەوە بۆ هەر مرۆڤێك چێژی پێدەبەخشێت.

لەناخمدا هەستم بەوە دەکرد کە فیرعەون ڕاستیەکی مەزن دەهێنێتە زمان، گەرچی ئەو ڕاستیەی ئەو لەجیهاندا بەکردار ناکرێت و تەنها لەجیهانی خۆرئاوادا[73] دەتوانرێت کرداری بکرێت، بەڵام دەبێت لایەنگری ئەوە بکەین ئەگەر جۆری مرۆڤ بتوانێت بەوشێوەیە بژیت و جیاوازی لەنێوان دەوڵەمەند و هەژاردا لەناو بچێت و نەمێنێت، خۆشبەختیەکی جاویدانی بەدەست دەهێنێت. من دەمزانی کە پێش فیرعەون"ئەخناتون"هیچ کەسێکی تر ڕاستیەکی ئاوا مەزن و درەوشاوەی نەهێناوەتە زمان و دوای ئەویش کەسێك نابێت کە بتوانێت ڕاستیەکی ئاوا بەرجەستە بێنێتە گۆ. من تێدەگەشتم کە لەبەر خۆویستی دەوڵەمەندەکان و نەزانی و گەمژەیی هەژاران، ئامادە نەبوون ئەم ڕاستیەی فیرعەون پەسەند بکەن بەو بۆنەیەوە خوێنێکی زۆر لەو پێناوەدا دەڕژێتە سەر زەوی-هەروەك چۆن لە"تبس"دا ڕێژرا- و لەوانەشە دەوڵەتی مەزنی میسریش بەو هۆیەوە لەناو بچێت.

بەڵام ئەوەی فیرعەوەن باسی دەکات شتێکە کە هیچ کەسێك پێش ئەو نەیوتووە و دوای ئەوەیش ناوترێت، ئەگەر بیشوترێت ئەوا لاسایی"ئەخناتون"ی کردووەتەوە. دوای ئەوە کاتێك تەماشای ئەستێرەکانی ئاسمانم دەکرد بەخۆمم وت: سینۆهە تۆ پیاوێکی کە نازانی لەکوێوە هاتوی و دایك و باوکت چ کەسانێکن.

دوای ئەوەی گەورە بویت، ژن و پیاوێك، ئەو پیاوەی پزیشکی هەژارانی"تبس"بوو کە ژنەکەی لەسەر ئاوی"نیل"تۆی لەناو سەبەتەیەکدا دۆزیوەتەوە و کوردویتیان بەکوڕی خۆیان و پەروەردەیان کردویت، ئێستاش تۆ پزیشکی هەژارانی"تبس"یت و بێئەوەی چاوەڕێی ئەوە بکەیت زێڕ و زیوت بدەنێ، چارەسەریان دەکەیت. کەواتە ئەگەر خودای تازە فیرعەون بڵاو ببێتەوە و جیاوازی لەنێوان دەوڵەمەند و هەژاردا نەمێنێت، تۆ هیچ زیانێك نابینیت.

---

[73] جیهانی خۆرئاوا لەمیسری کۆندا شوێن نیشتەجێبونی مردووەکانە و هەم جیهانی ژیانی هەمیشەیی و جاودانیە.

لەم حاڵەتەدا بۆچی لایەنگری ڕاستی خودای تازە ناکەیت و هانی "ئەخناتون" بدەیت کە ئەم ڕاستیە لەوڵاتی میسردا لەکاتی خۆیدا کرداری بکات. "سینۆهە" تۆ دەزانیت ئەو کارەی فیرعەون دەیەوێت کرداری بکات لەهیچ وڵاتێکدا جێبەجێ ناکرێت و لەهیچ شوێنێکدا جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار و خاوەن و بەندە و سەرکاریگەر و کرێکار لەناو نابرێت.

بەڵام لەوانەیە لەبەرئەوەی میسر وڵاتێکی دەوڵەمەندە و خاوەنی زەویەکی بەپیتە، بتوانێت ببێتە شوێنی کرداری کردنی ئەم ڕاستیە و هەرکاتێك ئەم ڕاستیە لەمیسردا کرداری بکرێت، بێگومان لەوێوە بەنێو هەموو وڵاتانی جیهاندا بڵاو دەبێتەوە و لەهەموو شوێنێکدا جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار و خاوەن کۆیلە و کۆیلە لەناو دەچێت. ئەوکات ساڵێکی جیهانی نوێ لەجیهاندا دەست پێدەکات[٧٤].

من تێگەشتم کە لەهیچ کاتێکدا هەلێکی ئاوا نەهاتووەتە بەردەستی هیچ مرۆڤێك کە بتوانێت خۆی بۆ هەمیشە خۆشبەخت بکات، چونکە هەرگیز فیرعەونێك لایەنگری ئەم ڕاستیە نەبوو کە دەبێت جیاوازی لەنێوان دەوڵەمەند و هەژار و خاوەن و کۆیلە و کرێکار و بەڕێوبەری کار لەناو ببات و لەوانەیە لەئایندەدا بەندەان و کرێکاوان هەوڵی ئەوە بدەن کە جیاوازی نێوان هەژار و دەوڵەمەند لەناو ببەن، بەڵام هیچ کەسێك گوێیان بۆ ناگرێت و گرنگی بەقسەکانیان نادات، ئەگەر گرنگیشی پێبدەن قسەکانیان بەکردار ناکرێت، چونکە دەوڵەمەندەکان هێزی بەندە و کرێکاران لەناو دەبەن.

بەڵام کاتێك فیرعەونی میسر "ئەخناتون" بڵێت دەبێت جیاوازی نیوان دەوڵەمەند و هەژار لەناو بچێت، لەبەرئەوەی توانای قسەکردن و جەنگ و زێڕ و زیوی هەیە، لەوانەیە بتوانێت قسەی خۆی بەکردار بکات و جیاوازی نێوان کەسەکان لەناو ببات، هەروەها نابێت ئەم تاکە هەلە بۆ دابینکردنی خۆشبەختی جۆری مرۆڤ لەدەست بدەین، چونکە مەحاڵە دوای ئەو لەمیسردا یان لە سوریا و بابل پادشایەك بێتەبون کە خۆی بیەوێت جیاوازی نیوان دەوڵەمەند و هەژار لەناو ببات.

---

[74] میسریەکان یەکەمین نەتەوە بون کە زانیان زەوی بەدەوری خۆردا دەسوڕێتەوە هەر بیست و حەوت هەزار ساڵ جارێك لەبەرامبەر ئەستێرەیەکی تایبەتدا ڕادەوەستێت و ئەم سوڕی بیست و حەوت هەزارساڵە بە "ساڵی جیهانی" بانگ دەکەن.

من لەکەنار کەشتیەکەدا ڕاوەستابوم، تەماشای ئەستێرەکانی ئاسمانم دەکرد و بیرم لەوە دەکردەوە و لەکەنارەکانی نیلەوە بۆنی کێڵگە گەنمەکان کە گەیی بون دەهات.

لەناکاو"کاپتا"ی بەندەی ڕابردووم کە ئێستا لە"تبس"دا خاوەنی مەیخانەی"کلکی تیمساح"ەو سەرمایەدارە، هاتەوە یاد و بیرم لەوە دەکردەوە ئەگەر لێرە بوایە و گوێی لەم گوتەیەی فیرعەون بوایە چی دەگوت؟

سەرەڕای ئەوەی"کاپتا"لێرە نەبوو، بەڵام من دەمزانی کە ئەو دوای ئەوەی گوێی لەبۆچونەکانی فیرعەون دەبێت چی دەڵێت.

ئەو دەیوت"سینۆهە"گریمان فیرعەون توانی جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار لەناو ببات و هەموو خەڵکی ببنە خوێنەوار و چیتر دوای ئەوە نە دەوڵەمەند و نەهەژارو نە خاوەنکار و نەکرێکار بونی نەمێنێت و هەموویان برایانە دەست بە کشتوکاڵ و پیشەسازی و بازرگانی خۆیان بکەن....ئایا دوای ئەو هەموو شتە، تەواوی بەدبەختیەکانی مرۆڤ لەناو دەچێت و چیتر کەسێك بەهۆی دەستڕەنج و هەوڵی کەسێکی ترەوە دەوڵەمەند نابێت؟

سەرەڕای ئەوەش کۆمەڵێك مرۆڤ لەمرۆڤەکانی تر هۆشیار تر دەبن و کۆمەڵێك گەمژە.... کۆمەڵێکیش کەسێکی فێڵبازیان لێ دەردەچێت و هەندێکیش سادە و ئەوانەی هۆشیار و فێڵبازن، گیرفانی کەسانی گەمژە و سادەکان خاڵی دەکەن یان بەفێڵەکانیان ئەو جۆرە کەسانە هانی ئەوە دەدەن کاریان بۆ بکەن و هەمیشە وابووە و دوای ئەوەش هەر وا دەبێت، چونکە مرۆڤ ئەگەر بتوانێت کەسێك فریو بدات، مەحاڵە بتوانێت خۆی لەفریودانی ئەو کەسە بپارێزێت، کەسێك کە بتوانێت زیان بەکەسانی تر بگەیەنێت، هەر زیانی خۆی پێدەگەیەنێت و لەنێو نەوەی مرۆڤدا ئەوانەی توانای زیان گەیاندن و ئازاردان و فریودانیان نیە، تەنها مردووەکانن.

تەماشای ئەم فیرعەونە بکە کە دەیەوێت جیاوازی نێوان دەوڵەمەند و هەژار لەناو ببات بزانە چی بەخەڵکی کردووە؟ ئەو ڕاستیەی کە تەنها فیرعەون و خوداکەی لایەنگرینی، تا ئەمڕۆ تەنها چەند جۆرێك گیانەوەر سودیان لێوەرگرتووە، بۆ نمونە قەلە ڕەشە و واشە و داڵەکەرخۆرە و تیمساحەکانی ڕوباری نیل و ئەوانەی کەماون بێجگە لە زیان هیچی تریان نەبینیوە.

بەڵام سەرەڕای ئەوە دەمزانی ئەگەر"کاپتا"ئامادە بوایە ڕەخنەی لەڕۆژانی ڕابردوو دەگرت، ئەوکاتەی فیرعەون باسی خودای خۆی و ڕاستیەکانی بۆ دەرکردم و منیش لایەنگری بۆچونەکانیم دەکرد و ئەویش بەم لایەنگریەی من خۆشحاڵ دەبوو.

لەڕۆژی پانزەیەمی دوای دەرچون لە"تبس"کەشتی فیرعەون گەشتە وڵاتێك کە بەهیچ وڵاتێکەوە پەیوەست نەدەکرا. زەوی ئەو وڵاتە لەکەنار ڕوباری"نیل"دا تەخت بوو و کەمێك دورتر چەند تەپۆڵکەیەك بەدی دەکرا کە هیچ درەختێکی پێوە نەبوو.

چەند شوانێك لەکەناری ڕوباردا سەرقاڵی لەوەڕاندنی مەڕەکانیان بون. لەوێدا فیرعەون لەکەشتەیەکەی دابەزی و خۆی خستە ژێر ڕکێفی خودای"ئاتون" و وتی: لێرەدا شارێك دروست دەکەم و ناوی"شاری ئاسوی ئاتون"ی لێ دەنێم.

دوای کەشتی فیرعەون، کەشتیەکانی تریش کە بەدوایەوە بون گەشتنە کەنار ئەو ڕوبارە و سەرنشینەکانیان دابەزین.

فیرعەون ئەندازیارەکانی خۆی بانگ کرد و وتی: لێرەدا دەبێت شارێك بێتە بون، هەر یەك لەو کەسانەش کە لەگەڵ ئەودا بوون دەبێت بۆ دروست کردنی خانوو پارەچە زەویەکیان پێبدرێت.

لەوشارەدا، بەپێی پلانەکەی"ئەخناتون"دەبوو پێنج شەقام لە باکورەوە بۆ باشورو پێنج شەقامیش لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژ ئاوا دروست بکرێت.

لەهەر شوێنێکی ئەو زەویەدا ماڵێك دروست دەکرا کە لەماڵەکانی بەرامبەر دەچوو، بەپێی فەرمانەکانی فیرعەون، نابێت هیچ خانوویەك لەخانوەکانی تر بەرزتر بێت و لەهەموو ماڵێکدا ژمارەی ژورەکان و شوێنی ژورەکان، هەروەها چێشتخانەکانیشیان دەبێت لەیەك بچێت.

فیرعەون دەیویست لەو شارەدا، هەموویان خۆیان بەیەکسان لەگەڵ کەسانی تردا لەقەڵەم بدەن و سوپاسگوزاری"شاری"ئاتون بن کە ئەم یەکسانییەی بۆ فەراهەم کردون.

بەڵام کاتێك ئەو شارە دروست دەکرا بیستم کە هیچ یەك لەو کەسانەی کە سەرقاڵی دروستکردنی خانون سوپاسگوزاری"ئاتون"نین، بەڵکو بەپێچەوانەوە نەفرەت لەو و فیرعەون دەکەن کە بۆچی فیرعەونی لە"تبس"ەوە هێناوەتە شوێنێك کە نە ئاواییەکی تێدایە و نەمەیخانەیەك.

هیچ ژنێك، لەو ماڵەی کە بۆ ژیانی ئەوو هاوسەر و منداڵەکانی دروست دەکرا ڕازی نەبوو، چونکە هەموو ژنێك حەزی دەکرد بتوانێت لەبەردەم ماڵەکەی خۆیدا ئاگر بکاتەوە و چێشت لێ بنێت، لەکاتێکدا ماڵەکانی ئەو شارە تازەیە، ئاگردانی چێشت لێنانەکانیان لەناو ماڵەکاندا دروست کردبوو.

ئەوانەی لە"تبس"دا لەسەر زەوی ماڵەکەیان کەبەگڵ سواخ درابوو، دەخەوتن، کاتێك بینیان لەماڵی شارە تازەکەدا زەوی ژوورەکان بە خشت فەرش دەکرێت، ناڕازیبونی خۆیان دەربڕی و وتیان: خشت بەهۆی سوان و وردبونیانەوە دەبنە تۆز و خۆڵ و دەبێتە مایەی دەردی سەرییان. هەروەها لەقوڕی شێلراوی ئەو شوێنەش ڕازی نەبوون و دەیانوت کە ئەم قوڕی ئەم خاکەش دوای ئەوەی وشك بویەوە، ترزی تێدەکەوێت و دەشکێت. نیشتەجێ بوانی ماڵی ئەم شارە، دەیانویست لەبەردەم ماڵەکەی خۆیاندا، سەوزە بچێنن بەڵام فیرعەون چاندنی سەوزەی لە بەردەم ماڵاندا قەدەغە کردبوو و پارچەیەك زەوی لەدەرەوەی شار بەهەر ماڵێك دابوو کە لەوێدا هەموو کشتوکاڵێکی خۆیان بکەن، بەڵام دانیشتوانی ئەو شارە ساکاڵای ئەوەیان دەکرد کە زەویەکانیان لەڕوباری نیلەوە زۆر دورە و زۆر بەگرانی دەتوانن ئاو ببنەوە بۆ کێڵگەکانیان. ژنەکانیش لەناوەڕاستی شەقامەکاندا تەنافیان لەمبەرەوە بۆ ئەو بەر دەبەست و جلە شۆراوەکانیان پێدا هەڵدەواسی بۆئەوەی وشك ببنەوە، فیرعەون ئەم کارەشی قەدەغە کرد.

فیرعەون وتبوی:دانیشتوانی ئەو شارە نابێت بزن و مەڕ لەماڵەکانیاندا بەخێو بکەن، بەڵام ژنەکان گوێیان بەم قسانە نەدەدا و بزن و مەڕیان لەماڵە تازەکانیاندا ڕادەگرت، بەڵام وردە وردە خویان بەشارە تازەکەوە گرت، گەرچی"تبس"یان فەرامۆش نەکردبوو، بەڵام گەر پێیان بوترایە بگەڕێنەوە بۆ"تبس"ئامادە نەدەبوون بگەڕێنەوە بۆ ئەوێ.

دوای ئەوە وەرزی پایز و کاتی هەڵسانی ڕوباری"نیل"هات وامان دەزانی کە بەبۆنەی هەڵسانی ڕوباری"نیل"ەوە فیرعەون دەگەڕێتەوە بۆ"تبس"، بەڵام لەکەشتیەکەی خۆیدا مایەوە و لەوێوە چاودێری لەخانووەکانی شاری"ئاسۆیی ئاتون"دەکرد. هەر بەردێك بەسەر بەردێکی ترەوە بنرایە دەبووە مایەی خۆشحاڵی فیرعەون و کاتێك دەیبینی خەریکە ماڵێك تەواو دەبێت، زەردەخەنەیەکی دەکرد.

فیرعەون بەشێك لەزێڕ و زیوی وەك دەستكەوتێك هێنابوو و لەشاری"ئاسۆی ئاتون"دا خەرجی كرد و زەوی خودای رابردووی لەنێو ئەو هەژارانەی كە حەزیان لەكشتوكاڵ و جوتیاری بوو دابەش كرد.

"ئەخناتون"بۆئەوەی بازرگانانی"تبس"بخاتە ژێر فشارەوە، تەواوی كاڵای ئەو كەشتیانەی كە بەرەو بەشی سەروی ڕوباری"نیل" و شاری"تبس" دەرۆشتن كڕی و بەشێوەیەك لەتەواوكردنی شاری نوێدا پەلەی دەكرد كە بەهای بەرد و دار بەتەواوی گران بوو، ئەگەر پیاوێك هەوڵی ئەوەی بدایە لەیەكەمین تاڤگەی ڕوباری نیل كە دەكەوێتە نزیك دارستانە مەزنەكانەوە، تەنها یەكجار لەوێوە تەختەی بهێنایە بۆ شاری"ئاسۆی ئاتون" دەوڵەمەند دەبوو.

برێكی زۆر لەكرێكارەكان هاتن بۆ"ئاسوی ئاتون"، لەكەنار ڕوباری"نیل"دا لەناو ئەو خانوانەی كە بەقامیش دروست كرابون نیشتەجێ دەبون و لەبەیانیەوە تا ئێوارە خشتیان دروست دەكرد و سوریان دەكردەوە و ڕێگەوبانەكانیان تخت دەكرد و جۆگەلەیان بۆ ئاودێری دروست دەكرد. دوای تەواوی بونی هەڵچونی ڕوباری نیل، هەزاران درەختی سێبەردار و درەختە میوەدرەكانیان لەملاو و لەولاوە هێنا و لەشاری تازەدا ناشتنیان و هەندێك لەو درەختانە، ساڵی دوایی بەریان گرت و خودی فیرعەونیش ئەو میوانەی كۆكردەوە.

لەكاتێكدا ئەندازیار و وەستا دیوار و كرێكاران سەرقاڵی كاربون و كەشتیەكانیش بەرد و تەختەیان دەهێنا، من كارێكی زۆرم بەدەستەوە بوو، چونكە هێشتا كۆتایی بەئاودزی زەوی ئەو شارە تازەیە نەهاتبوو و كرێكاران بەهۆی بونی گۆماوەكانەوە نەخۆش دەكەوتن، یەكێك لەوكارە بەسودانەی كە ئەنجام درا، تەلاری لەنگەرگای كەنار شار بوو، كاتێك لەنگەرگاكە تەواو بوو، باربەرانی ڕوبار لەهەڕەشەی تیمساحەكان پارێزران.

پێش ئەوەی ئەو لەنگەرەگایە تەواو ببێت، كۆڵبەرەكان ناچاربون بچنە ناو ئاوەكەوە، بۆئەوەی بتوانن باری ناو كەشتیەكە خاڵی بكەن و بیانهێننە كەنار ڕوبارەوەو لەوكاتەدا لەناكاو یەكێك لەكۆڵبەرەكان هاواری لێ هەڵدەستا و ئەوانی تر تێدەگەشتن كە تیمساحێك پەلاماری ئەو كۆڵبەرە بەدبەختەی داوە.

تەماشاکردنی دیمەنی ئەو کۆڵبەرەی کە نیوەی جەستەی لەدەمی تیمساحەکەدا بوو، زۆر ترسانك بوو، پێش ئەوەی هاوڕێکانی بڕۆن بۆئەوەی ڕزگاری بکەن تیمساحەکە دەیبردە ناو ئاوەکەوە بۆئەوەی بیخاتە ناو کونێکەوە تا دوای بۆگەنکردنی دەست بەخواردنی بکات.

بۆیە ناچار بون ڕاوچیانی تیمساح لەو ناچانەی کە ڕوباری نیل دەرژایە دەریاوە بهێنن و زێڕیان پێبدەن بۆئەوەی هەڕەشەی ئەم تیمساحانە لەناو ببەن، ئەوانیش لەماوەیەکی کەمدا تیمساحەکانیان لەناو برد، سەرەڕای ئەوەش تا ئەو لەنگەرگایە بەیەکجار تەواو نەبوو هەڕشەی پەلاماری تیمساح بەتەواوی لەناو نەچوبو.

من بیستبوم ئەو تیمساحانەی کە لە شاری"ئاسۆی ئاتون"دا بینراون هەمان ئەو تیمساحانەن کە لە"تبس"وە دوای کەشتی فیرعەون کەتبون، چونکە پێشبینی ئەوەیان دەکرد کە دوبارە خواردنی چێژبەخشی تریان دەست بکەوێت.

من ناتوانم لەوە تێبگەم تیمساح بەچ شێوەیەك دەتوانێت پەیوەندییەك لەنێوان جوڵەی کەشتی فیرعەون لە"تبس"ەوە و گەشتن بەشاری"ئاسۆی ئاتون"و بەدەستهێنانی خواردن پەیدا بکات، بەڵام لەزۆر کەسم بیستووە کە تیمساح گیانەوەرێکی هۆشیار و ژیرە. هەرلەبەرئەوەش دوای ئەوەی ڕاوچییەکان هاتن و دەستیان کرد بەڕاوکردنیان ئەو گیانەوەرە ترسناکانە ئەوەیان بەباشتر زانی کە شاری"ئاسۆی ئاتون"بەجێ بهێڵن، چونکە ئەگەر ژیر نەبونایە ئەو ناوچەشیان بەجێ نەدەهێشت، کۆچ کردنی ئەمانە لێرە، بەڵگەی ژیری ئەو گیانەوەرانەیە، چونکە لەوە گەیشتن، ئەگەر لەوێ بمێننەوە هەموویان بەکوشت دەدرێن.

بەڵام دوای بەجێ هێشتنی شاری"ئاسۆی ئاتون"ڕێگای شاری"تبس"یان گرتە بەر، چونکە لەوانەیە زانیبێتیان هێشتا نێوەندی فەرماندەیی"هورم هب"لە"تبس"دایە و لەوانەیە هێشتا لاشەی کوژراوەکان لەشار بکرێنە دەرەوە و بخرێنە ناو ئاوی نیلەوە.

پاش ئەوەی ڕوباری"نیل"دوای هەڵچون پاشەکشە دەکات"هورم هب"فەرماندەی لەشکری میسر لەلایەن فیرعەونەوە ئەوەی پێ سپێدرابوو کە ئەو لەشکرە هەڵوەشێنێتەوە و سەربازە ڕەشپێستەکان و سەربازەکانی"شردن"بڵاوە پێبکات-بەڵام

من دەمزانی چاوپۆشی لەجێبەجێ کردنی ئەم فەرمانەی فیرعەوندا دەکات- و خۆی کرد بەناو شاری"ئاسۆ"دا.

"هورم هب"لەبەرئەوە ئەو لەشکرە هەڵناوەشێنێتەوە کە دەیزانی سوریا دژی ڕادەپەڕێت و میسر بۆ دامرکاندنەوەی ئاگری شۆڕشی سوریا پێویستی بەلەشکرە.

بەڵام فیرعەون باوەڕی بەشۆڕشی سوریا نەبوو و دەیوت، سوریا ڕاناپەڕێت و باشتر وایە سەربازە ڕەشپێستەکان و سەربازەکانی"شردن" بڵاوە پێبکات چونکە خەڵکی میسر زۆر ڕقیان لێیانە و بگەڕێنرێنەوە بۆ وڵاتی خۆیان و چیتر خەڵکی چاویان پێیان نەکەوێت.

لەو ڕۆژەوەی"هورم هب"خۆی کرد بەناو شاری"ئاسۆی ئاتون"دا، هەرکاتێك پێویستی پاراستنی لەشکر و هەڵنەوەشانەوەی بۆ فیرعەون ڕون دەکردەوە، گفتوگۆیەکی درودرێژ لەنێوان ئەو دوانەدا بەرپا دەبوو.

"هورم هب" دەیوت: بارودۆخی سوریا زۆر خراپە و میسریەکان لەوێ زۆر لاوازن، ئەگەر دەست بەڕاپەڕین بکەن، میسریەکانی سوریا هەر لەیەکەم ڕۆژدا لەناو دەچن، تۆ دەبێت لەشکرت هەبێت بۆئەوەی بتوانی ڕێ لەڕاپەڕینی سوریا بگریت.

"ئەخناتون"وەڵامی دایەوە: ئایا تۆ کۆشکی منت بەشێوە جۆراوجۆرەکانی بینیوە؟ ئایا دەزانی لەوێنەکێشەکاندا هاوشێوەی وێنەکانی"کریت"یان لەسەر دیوارەکانی مندا کێشاوە. ئەگەر تۆ چاوت بەوێنەکانی کۆشکی من بکەوێت، بۆت دەردەکەوێت بەشێوەیەك کێشراوە کە وادەزانی بەڕاستی ماسیەکان لەناو ئاودا خەریکی مەلەکردنن و مراویەکانیش بەئاسماندا خەریکی فڕینن، بەڵام لەبارەی سوریاوە لەوباوەڕەدا نیم لەسوریادا شۆڕش و ڕاپەڕین بەرپا ببێت، چونکە خاچی ژیانم ناردووە بۆ تەواوی فەرمانڕەوایانی سوریا و هاوڕێیەتی من و پادشای وڵاتی"ئامورو"گەشتووەتە ڕادەیەك کە پەرستگایەکی بۆ"ئاتون"دروست کردووە. ئایا گومەزە مەزنەکەی"ئاتون"ت بینیوە کە من لەبەرامبەر کۆشکەکەی خۆمدا دروستم کردووە[75]

[75] دروست کردنی"گومەزە" لەسەردەمی"ڕۆمەکان"دا لەلایەن داگیرکەرانەوە کە بو بەباو، داهێنانی ڕۆمەکان نەبوو، بەڵکو ئەم نەریتەیان لەمیسر و "کریت"ەوە وەرگرتبوو، لەمیسر و "کریت"دا وەك خۆشەویستیەك بۆ خوداکانیان گومەزەیان بۆ دروست دەکردن.

من پێت دەڵێم برۆ و تەماشای ئەو"گومەزە" بکە، چونکە شایەنی تەماشاکردنە و ئەندازیاران و وەستاکان، زۆر جوان دروستیان کردووە، بەڵام من نەمدەویست بۆ دروستکردنی گومەزەی"ئاتون"لەکانەکاندا بەرد دەربهێنن و گرێکارەکان ئازار و ئەرک و زەحمەت بکێشن، بۆیە فەرمانم دا گومەزەی"ئاتون"بە خشت دروست بکەن.

"هورم هب"دەیوت: هەرکاتێك من خۆم دەکەم بەم کۆشکەی تۆدا، چاوم بەگومەزەی"ئاتون"دەکەوێت،بەڵام ئاگات لە پادشای"ئامورو"بێت...."ئەخناتون"یش وەڵامی دایەوە من حەز دەکەم ئەو نامانەی کە لەسەر تەختە قوڕەکان بۆی ناردووم ببینی، بۆئەوەی بزانی ئەم پادشایە بەچ شێوەیەك بووەتە موریدی"ئاتون" و لەبارەیەوە پرسیاری زیاترم لێدەکات، بۆئەوەی باوەڕێکی زیاتر بە"ئاتون" بهێنێت.

"هورم هب"وەڵامی دایەوە: من هیچ گرنگی بەو تەختە قوڕانە نادەم، چونکە ئەو ڕۆژەی پادشا بیەوێت شۆڕش بەرپا بکات، هەموو جۆرە نامەیەکی تەختە قوڕ و پەیمانێك پێشێل دەکات و هیچ شتێك بیّ لە زۆر ناتونێت پادشایەك ناچاربکات گوێڕایەڵی تۆ بێت، ئێستاش کە تۆ دەتەوێت ئەم لەشکرە هەڵوەشێنمەوە، بەلایەنی کەم ڕازی بە لەسەر ئەوەی لەسنورەکاندا کۆمەڵێك سەرباز دابنێم، بۆئەوەی نەتوانن سنوری میسر ببەزێنن.

ئێستاش ئەو خێڵانەی لەباشوری میسردا دەژین، بۆئەوەی ئاژەڵەکانیان لە لەوەڕگاکانی میسردا بلەوەڕێنن سنورەکانی میسر دەبەزێنن و دێنە ناو خاکی تۆوە و ئاگر بەردەدەنە ماڵی ڕەشپێستەکانەوە، لەکاتێکدا ئەم ڕەشپێستانە دۆست و پشتگیری و لایەنگری تۆ دەکەن و لەبەرئەوەی ماڵەکانیان لەقامیش دروست کراوە زوو دەسوتێت.

"ئەخناتون"یش بەم شێوەیە وەڵامی دایەوە:سنور بەزاندنی ئەو خێڵانەی کە لەباشوری میسردا دەژین لەهەژاریانەوە سەرچاوە دەگرێت، ئەگەر بتوانن ئاژەڵەکانیان لە لەوەڕگای خۆیاندا بلەوەڕێنن، ئەوا سنوری میسریان نەدەبەزاند، بەڵام لەبەرئەوەی لەوەڕگایان نیە، ناچارن بۆ لەوەڕاندنی ئاژەڵەکانیان سنوری میسر ببەزێنن، ئەگەر ئەو ڕەشپێستانەش کە لەباشوری میسردا دەژین، خۆیان لەگەڵیاندا بگونجێنن و ڕازی بن لەسەر ئەوەی ئاژەڵەکانیان لە لەوەڕگانیاندا بلەوەڕێنن، ئەوا هیچ کاتێك بەوشێوەیە ناسوتێت.

"هورم هب"یش پێی وتبوو: تۆ فەرمانم پێدەدەیت کە لەشکری سەربازی هەڵوەشێنمەوە و بڵاوە بەسەربازەکان بکەم، بۆئەوەی هەموویان بگەڕێنەوە شوێن خۆیان، بەڵام ئایا دەزانی پێش ئەوەی بڵاوە بەم لەشکرە بکەین دەبێت پاسەوانگەلێکی بەهێز لەناو میسردا دروست بکەیت، چونکە ئەو سەربازانەی بڵاوەیان پێدەکەین، تا ئەوکاتەی دەگەنەوە وڵاتەکەی خۆیان، هەزاران ماڵ تاڵان دەکەن و دەستدرێژی دەکەنە سەر هەزاران ژن.

فیرعەونیش وەڵامی دایەوە:ئەوە تاوانی تۆیە کە باسی"ئاتون"ت بۆ لەشکرەکەی من نەکردووە، چونکە ئەگەر ئەمانە"ئاتون"یان بناسیایە ئەوا"مریتاتون"ی کچم بەتەنهایی پیاسەی دەکرد و بێجگە لە ئاسکێك هیچ کەسێك هاوڕێ و پاسەوانی نەدەکرد و هەرگیز ئەوەش ڕووی نەدەدا کەسێك دەستدرێژی بکاتە سەر کچەکەم. سەرەڕای ئەوەش لەوباوەڕەدام پێش ئەوەی بڵاوە بەسەربازەکان بکرێت دەبێت گالیسکە جەنگیەکانیش لەناو ببرێن، چونکە بونی گالیسکەی جەنگی، ئەو پەیامە بە فەرمانڕەوایانی تر دەگەیەنێت کە ئێمە ئامادەی جەنگین، بەڵام ئەگەر گالیسکەی جەنگی بونی نەبێت، تێدەگەن کە ئێمە بیر لەجەنگ ناکەینەوە.

"هورم هب"بەگاڵتەجاڕیەوە وەڵامی دایەوە: ئایا وا باشتر نیە کە گالیسکە جەنگیەکان بفرۆشین، چونکە من لەوباوەڕەدام پادشای"ئامورو"لەسوریا یان "هاتی"یەکان ئامادەن ئەم گالیسکانەی تۆ بکڕن، بۆئەوەی ڕۆژێك لەڕۆژان دژی خۆت بەکاری بهێننەوە.

ئەم گفتوگۆیەی نێوان فیرعەون و فەرماندەی لەشکرەکەی بۆماوەی چەند ڕۆژێك بەردەوام بوو، بەڵام دواجار"هورم هب" توانی خۆی ڕاگرێت و فیرعەون بهێنێتە سەر ئەو باوەڕەی کە ڕازی بێت لەسەر ئەوەی لەمەرزەکانی"میسر"دا، چەند سەربازگەیەك دانێت، هەروەها لەناو شاریشدا پاسەوان دابنێت، بۆئەوەی ئاسایش و ئارامی ناو وڵات بپارێزن.

فیرعەون وتی:من بەو مەرجە ڕازی دەبم کە گروپێك پاسەوان دروست بکرێت کە نەتوانرێت لەڕۆژێکی پێویستدا وەك لەشکری سەربازی سودیان لێ وەربگیرێت.

بۆئەوەی ئەم گروپە پاسەوانیە وەك لەشکرێك سودیان لێ وەرنەگیرێت. فیرعەون بڕیاری دا کە چەکەکانیان تەنها نێزەبێت "بێ نوکە تیژەکەی" بێت.

"هورم هب"ئەم بڕیارەی لا پەسەند بوو، بەڵام لەهەمان ئەوکاتەی خەریکی هەڵوەشاندنەوەی لەشکری سەربازی و دروست کردنی گروپێکی پاسەوانی بوو بۆ پاراستنی ئاسایشی ناوەوەی وڵات، دوو نامەبەری یەك لەدوای یەك لەسوریاوە هاتن و هەواڵی ئەوەیان گەیاند کەپادشای وڵاتی"ئامورو"دوای ئەوەی بیستی لەناوشاری "تبس"دا شەر لەنێوان خودای کۆن و خودای تازە بەرپابووە و فیرعەونیش لە"تبس"ڕۆشتووەتە دەرەوە و لەشارێکی تازەدا نیشتەجێ بووە، ڕاپەڕیون و دەیانەوێت هەردوو شاری سوریا کە نزیکی وڵاتەکەی ئەوە داگیر بکەن، یەکێك لەو شارانە"مژیدو"یە و ئێستا پاسەوانانی میسر لەشاری"مژویدو"دا گەمارۆ دراون و داوای هاوکاری لە فیرعەون دەکەن.

فیرعەون دوای بیستنی ئەم هەواڵە وای بە"هورم هب"وت:

من لەوباوەڕەدا نیم پادشای وڵاتی"ئامورو"بێ هۆ ئەم ڕاپەڕینەی کردبێت، لەوانەیە بەرپرسانی میسری لەسوریادا سوکایەتیان پێکردبێت و ئەویان تووڕە کردبێت، تا ئەوکاتەی نەزانم ڕاپەڕینی ئەم پیاوە دەستی میسریەکانی تێدا نیە، بڕیاری تەمێکردنی نادەم، بەڵام ئەم ڕووداوە منی لەوە ئاگادار کردەوە کە من بەوشێوەی پێویستە گرنگیم بە سوریا نەداوە و هاتەوە بیرم کە تۆ"هورم هب"کاتێك لە"ئۆرشەلیم"بوی پەرستگایەکت بۆ"ئاتون"دروست نەکرد و ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە لەئۆرشەلیمدا شارێکی بۆ"ئاتون"دروست بکەم، بۆئەوەی ببێتە پایتەختی سوریا، هەرئەوەی"مژدیدو"ئارامی بۆ گەڕایەوە، لەوێشدا شارێك بۆ"ئاتون"دروست دەکەم، چونکە"مژیدو"ناوەندێکی مەزنی بازرگانیە و سەرە ڕێی کاروانە بازرگانیەکانە، ئەگەر لەوێدا شارێك بۆ"ئاتون"دروست بکەین، ئەو شارە ئاوەدانیەکی زۆری تێدەکەوێت.

کاتێك"هورم هب"ئەم وەڵامەی لەفیرعەون بیست، بەشێوەیەك تووڕە بوو کە دەسکی قامچیەکەی خۆی شکاند و پارچەکانی فڕێدایە سەر زەوی و ڕۆشتە دەرەوە و وتی بەمن: ئەم پیاوە شێتە، لەباتی ئەوەی لەشکری سەربازی بنێرێت و پادشای "ئامورو" سەرکوت بکات، دەڵێت دەمەوێت لەئۆرشەلیمدا شارێك بۆ"ئاتون"دروست بکەم و هەمان ئەو شارە بکەمە پایتەختی سوریا.

ئەو ڕۆژانەی"هورم هب"لە شاری"ئاسۆ"دابوو، دەربارەی گەشتەکانی من زۆر قسەی کرد و دەیویست بزانێت ئایا من توانیومە بەپێی داوا و ڕاسپاردەکانی، زانیاری سەربازی لەولاتانی تردا بەدەست بهێنم یان نە؟

کاتێك من دەستم کرد بەقسەکردن و باسی زانیاریە سەربازیەکانی ئەو ولاتانەم بۆ دەکرد، زۆر بەوردیەوە گوێ لێدەگرتم، ئەو ڕۆژەی چەقۆیەکیان لە"هاتی"دا پێدام، پێم نیشان دا و زۆر سەری لەبینینی ئەو چەقۆیە سوڕما و وتی: چەقۆ مسیەکانی ئێمە لەچاو ئەم چەقۆیەی کە تۆ دەڵێیت لەئاسن دروست کراوە وەك تەختە و دار وایە.

"هورم هب"پرسیاری سەرباز و چەکە جەنگیەکانی نەتەوەکانی تری لێدەکردم، لەدیدی مندا پرسیارەکانی منداڵانە دەهاتە بەرچاوم، بەلام دواجار ئاگاداری ئەوەبوم کە بۆیە "هورم هب"ئەو جۆرە پرسیارانەم لێدەکات لەبەرئەوەی سەربازە.

بۆنمونە پرسیاری ئەوەی لێدەکردم، کاتێك سەربازەکانی"بابل"ڕێیان دەکرد، ئایا یەکەم پێی چەپیان دەجولان یان پێی ڕاستیان، یان پرسیاری ئەوەی لیٚ دەکردم، ئایا لە"هاتی"دا ئەسپی گالیسکە جەنگیەکانیان، لەگەلٚ خودی گالیسکەکاندا ڕێیان پێدەکردن یان لەدوای گالیسکەکانەوە یان پرسیاری ئەوەی لێدەکرم کە چەرخی گالیسکە جەنگیەکانی"بابل"چەند تیرەی هەیە، ئایا چواردەوری ئەو چەرخە بەئاسن داپۆشراوە یان هیچ ڕوپۆشێکی ئاسنینی بەسەرەوە نیە.

یەکێك لەورشتانەی جێی سەرنجی"هورم هب"بوو ئەوە بوو کە دەیویست بزانێت جادە و پردەکانی"هاتی"و "میتانی" و "بابل" و ولاتانی تر بەچ شێوەیەکن.

هەموو ڕۆژێك نوسەرێك دەهات و ئەوەی من لەبارەی لەنگەرگا و جادە و ڕوبار و ژمارەی سەربازانی ولاتانی ترەوە دەدوام، دەینوسی، بۆئەوەی هەرکاتێك"هورم هب"خۆی بیەوێت چاوێك بەم زانیاریانەدا بخشێنێت.

بەلام ئەو ڕونکردنەوانەی کە لەبارەی خوداکانی نەتەوەکانی تر و تەلار و پەیکەر و وێنە و جۆری ئاو و ئاوەڕۆ و سەرئاوەکانی"کریت"کە هەمیشە ئاوی پێدا دەڕۆشت، بەوم دا هیچ سەرنجی ڕانەکێشا و وتی: سەربازێك پێویستی بەم جۆرە زانیاریانە نیە.

ئـەو ڕۆژەش"هـورم هـب"لەتوڕەییانـدا دەسـکی قامـچیەکەی خـۆی لەبەرامبـەر فیرعەونـدا شـکاند و ڕۆشـت و ویـستی دەسـت لـە فەرمانـدەی لەشـکر هـەلگرێت، بـەلام "ئـەخناتون" لەبەرئـەوەی ئـەوی خـۆش دەویـست، منـی نـاردە لای"هـورم هـب"و

وتی:پێی بڵێ بێت و لەگەڵمدا ئاشت بێتەوە، چونکە من حەز ناکەم ئەو بەدڵگرانی و ڕەنجاویەوە لێم جیا ببێتەوە.

بەڵام سەرەڕای ئەوەی فیرعەون و"هورم هب" لەگەڵ یەکدا ئاشت بونەوە و فیرعەون قامچیەکی تری پێدا"هورم هب"نەیتوانی فیرعەون بهێنێتە سەر ئەو ڕایەی لەشکرێك بۆ سەرکوت کردنی پادشای وڵاتی"ئامورو"بنێرێت.

"هورم هب"لەبەرئەوە مانەوەی لەشاری"ئاسۆ"دا بە بێهودە بینی، بۆیە بەرەو شاری"ممفیس"ڕۆشت بۆئەوەی لەوێدا گروپێکی پاسەوان بۆ دابینی کردنی ئاسایش و هێمنی ناوەوەی میسر دروست بکات، چونکە"ممفیس" دەکەوێت چەقی وڵاتی میسرەوە و لەشوێنێکدا جێگیرە کە مەودای نیوان باشور و باکوری میسر لەوێدا یەکسانە.

دوای ئەوەی"هورم هب"ڕۆیشت فیرعەون بەمنی وت:"سینۆهە"ئەگەر خواستی "ئاتون"بێت کە سوریان لەمیسر جیا ببێتەوە، باشتروایە ویستی"ئاتون"بەجێ بهێنرێت، لەبەرئەوەی زاڵبونی میسر بەسەر سوریادا بۆ میسر جگە لەزیان هیچ شتێکی تری نەبووە.

وتم:"ئەخناتون"تا ئەوشوێنەی من لەبیرم بێت و لەکەسانی ترم بیستبێت، زاڵبونی میسر بەسەر سوریادا لەبەرژەوەندی میسردا بووە، چونکە میسر سودێکی زۆری لەسامانەکانی سوریا وەرگرتووە و ئێستاش هەر سودی لێ وەردەگرێت.

فیرعەونی وتی:سامان یەکێکە لەوشتانەی کە نەتەوەکان بۆگەنتر و خراپتر دەکات، چونکە نەتەوەکان خۆپەرست و تەماڵ و بێبەزەیی دەکات.

نەتەوەی میسر، نەتەوەیەکی زەحمەتکێش و ڕازی و دانبەخۆداگر و بەبەزەیی بوو، بەڵام کاتێك سوریا کەوتە ژێر دەستەڵاتی میسرەوە، سامانەکانی سوریان گوازرانەوە بۆ میسر، لەوەو دوا میسریەکان کەسێکی تەماڵ و خۆپەرست و شەرواڵ پیسیان لێدەرچوو و هەندێك خووی خراپیان لەسریانیەکانەوە وەرگرت.

من سەرەڕای ئەوەی دەمزانی جۆرێك شێتی لەگەڵدایە بەڵام چاوەڕێی ئەوەم نەدەکرد ئەم جۆرە قسانە لەدەمی پادشایەکەوە ببیستم، چونکە پادشایەك، بۆ پاراستنی دەستەڵاتی خۆی نابێت زەوی وڵاتەکەی خۆی لەدەست بدات، بۆیە پێم وت:

ئەی"ئەخناتون"من ماوەیەك لەسوریادا بوم و لەشارەکانی"ئزمیر" و"مژیدو"دا ژیاوم و لە"ئزمیر"دا فەرماندەی پاسەوانی"میسری" کوڕێکی هەبوو بەناوی "رامسس". ئەم کوڕە کە لەو کاتەدا دە ساڵ تەمەنی بوو، بەجوانترین کوڕی سوریا لەقەڵەم ئەدرا و بەردەوام هەڵماتی بەردین یاری لەگەڵ منداڵەکاندا دەکرد، بەلام نەخۆش کەوت و هێنایان بۆلای من و من تێگەشتم کە توشی کرمی گەدە بووە و دواجار چارەسەرم کرد.

لە"مژیدو" ژنێکی میسری هەبوو کە هیچ پیاوێك نەیدەتوانی لەیەك جار زیاتر ڕوخساری ببینێت، چونکە ئەگەر دووجار چاوی بەڕوخساری بکەوتایە شەیدا دەبوو، ئەو ژنەش ڕۆژێکیان هێنایان بۆ لای من و بینیم ورگی ئاوساوە و پێم وت:دەبێت سکت هەڵدڕم، بۆئەوەی بتوانم ئەم نەخۆشیەت چارەسەر بکەم. هەرلەبەرئەوەش ڕۆشتم بۆماڵی ئەو ژنە و سکیم بۆ هەڵدڕی و چارەسەری ئەو نەخۆشیەم بۆ کرد.

فیرعەون پرسی: بۆچی ئەم قسانەم بۆ دەکەیت؟

وتم:لەبەرئەوە ئەم قسانەت بۆ دەکەم، کەهەمان ئەو کوڕە بەشمشێری سەربازانی سریانی پارچە پارچە بوو و ئەو ژنە جوانەش، دەستی سەربازە مەستەکانی سوریا کەوت و ئەوانیش بێگوێدانە هاوارەکانی سەرقاڵی دەستدرێژی خۆیان بون، ئایا ئەم ڕوداوانە بەلاتەوە هیچ گرنگیەکیان پێنادرێت و ئامادەیت ڕازی بیت لەسەر ئەوەی کوڕی میسری لە سوریادا بکوژن و دەستدرێژی بکەنە سەر ژنە میسریەکان؟

فیرعەون تەماشایەکی کردم و وتی:"سینۆهە"تۆ دەڵێیت چی بکەم؟ ئایا بڵێم لەبەرئەوەی لەسوریادا ڕاپەڕین بووە و دە کەس یان سەد کەسی میسریان کوشتووە، سەد کەرتی سەد سەربازی سریانی بکوژن؟

ئایا ئەگەر ئەم کارە ئەنجام بدرێت، بەبۆچونی تۆ کارێکی دروست و ژیرانەمان جیبێبەجێ کردووە.

مەگەر ئەو سریانیانەی کە بەهۆی کوشتنی هەندێك میسری دەکوژرێن، گیانیان نیە و خاوەنی ژن و منداڵ نین؟

ئەگەر من خراپە بەخراپە سزا بدەم، جگە لە خراپە چ دەرئەنجامێکی بەدەست یەت؟

بەڵام گەر سزای خراپە بەچاکە بدەمەوە، گەرچی لەوانەیە خراپەشی لێ بکەوێتەوە، بەڵام بەدڵنیاییەوە خراپیەکەی کەمترە لەوەی سزای خراپە بەخراپە بدەیتەوە.

ئەگەر تۆ پزیشکی منی و ناتەوێت من بەم گوتانەت نەخۆش بکەوم، باسی ئەوەم بۆ مەکە کە دەبێت لەسوریادا تۆڵە لەو خەڵکانە بکەینەوە کەمیسریەکانیان کوشتووە، چونکە ئەم جۆرە گفتوگۆیەی تۆ زۆر نیگەران و دڵگرانم دەکات، لەسەردەمی خودای"ئامون"دا خوێنیان بەخوێن دەشۆردەوە و لەبەر کوشتنی تەنها یەك میسری سەد کەسەیان لەدانیشتوانی ولاتانی تر دەکوشت.

هەرلەبەرئەوەش ڕق و کینە تا دێت توندتر دەبێت، لەبەرئەوەی ئەم سەد کەسە، ژنو منداڵ و خزمیان هەبوو و ئەوانیش لەبەرامبەر ئەم کەسەی خۆیاندا خوێنیان دەڕشت.

بەڵام "ئاتون"دەڵێت: نابێت لەڕێی خوێنڕشتنەوە تۆڵە لەخەڵکی بکرێتەوە، چونکە ئەگەر لەبەرامبەر کوشتندا ئێوەش بکوژن، هەرگیز کینە و ڕقەبەرایەتیەکان لەناو ناچن.

بۆیە پێت دەڵێم چیتر باسی ئەم جۆرە شتانەم بۆ مەکە و بهێڵە من لەگەڵ ڕاستیەکانی خۆمدا ژیان بەسەر بەرم و لەباتی کینە، لەلایەن"ئاتون"ەوە خۆشەویستی لەدڵی خەڵکیدا بڕوێنم.

*بەشی سی و دووەم*

## ئەو شارە تازەیەی کە فیرعەون دروستی کرد

من چیتر هیچم نەگوت، بەڵام نەمدەتوانی وا خۆم نیشان بدەم کە گوێم لەدەنگی ئەو "قۆچ[٧٦]"انە نیە کە دەدرێت لەدەروازەکانی"مژیدو" و دەمزانی کە هەموو ئەو ژنە میسریانەی کە دەکەونە دەستی سەربازە سریانیەکانەوە، بێ ڕەزامەندی ئەو ژنانە دەستدرێژیان لێ دەکەن، سەرەڕای ئەو هەموو شتەش خۆشحاڵ بوم بەوەی کە شێتێکی ئاوا سروشت چاکم بینیوە.

من هێشتا دەربارە کاربەدەستانی"ئەخناتون" کە لە"تبس"ەوە باریان کردووە و هاتون بۆ شاری"ئاسۆ"، هیچم نەوتووە، ئەمانە نەیانتوانی لەگەڵ فیرعەوندا بێن بۆ شاری"ئاسۆ" لەبەرئەوەی"ئەخناتون"ئەوەندە خێرا"تبس"ی بەجێ هێشت، کە کاربەدەستەکانی ئەو هەلەیان بۆ نەڕەخسا لەگەڵ ئەودا بێن، بۆیە لەدواییدا هاتن.

کاربەدەستان جگە لە ئامانجی ئەوەی بەردەوام لە"ئەخناتون"ەوە نزیک بن هیچ ئارەزوویەکی تریان نەبوو، کاتێك ئەو زەردەخەنە دەکات، ئەوانیش لەگەڵیدا زەردەخەنە بکەن و کاتێکیش مات و خەمگین بێت، ئەوانیش خۆیان بەخەمگین نیشان بدەن.

باوکانی ئەمانەش لەسەردەمی فیرعەونەکانی تردا هەمان کاریان دەکرد و بونیان جگە لەو حاڵەتە هیچی تر نەبوو، کوڕەکانیشیان کار و ناونیشانەکانیان لەباوکیانەوە وەك میراتێك وەرگرتووە.

---

[76] قوچ: واتای سەری بەران و یان سەری گا دەگەیەنێت، بەڵام لێرەدا واتای ئەو دارە گەورە و ئەستورانە دەگەیەنێت کە زیاد لە دە کەس هەڵی دەگرن و دەیدەن لەدەروازەی قەڵاکان بۆئەوەی بیشکێنن.....وەرگێڕ.

سەرەڕای ئەوەی زۆربەی کاربەدەستەکان هیچ کارێکیان ئەنجام نەدەدا، بەڵام بەرپرسی کارێکی تایبەتی خۆیان بون و کارەکانی خۆیان لەگەڵ یەکتردا بەراورد دەکرد و هەر یەکێك لەمانە هەوڵی ئەوەی دەدا، ئەوە بسەلمێنێت کە کاری ئەو مەزنترو بەرێزترە لە کاری کەسێکی تر.

لە لایەکیشەوە، کاتێك کار و بەرپرسیاریەتی یەکێك لەکاربەدەستان لەوی تر مەزنتر بوو، ئەویتریان وا خۆیان نیشان دەدا کە گەرچی بەڕوکەش پلەوپایەی ئەو بچوکترە لەوی تر، بەڵام لەبنەچەدا کار و بەرپرسیاریەتیەکەی ئەو گرنگتر و بەرێزترە، هەروەها هاوڕێیانی ئەو کەسەش وا خۆیان پیشان دەدا کە ئەو گوتەیەیان لا پەسەندە.

کاری کاربەدەستانی فیرعەون، بریتی بوو لە کاربەدەستی پیڵاو هەڵگرتن و کاربەدەستی چەترهەڵگر و کاربەدەستی نانەوایی و کاربەدەستی جلدورین و کاربەدەستی شەربەت دروست کردن و ئالەم جۆرە شتانە، بەڵام ئەمانە لەهەموو تەمەنیاندا بۆ جارێکیش پێڵاو و چەتری فیرعەونیان هەڵنەگرتووە و تەنها بۆجارێکیش نانیان بۆ دروست نەکردووە و بۆ جارێکیش پێکی شەرابیان نەداوە بەدەستی فیرعەونەوە، چونکە هەموویان بەشێك بون لەپیاوانی کاربەدەست و پێیان نەنگ بوو کە ئەم کارە بکەن.

ئەم جۆرە ئەرکانە دەکەوتە ئەستۆی کەسانی تری وەك بەندە و خزمەتکارەکانەوە، لەبارەگای"ئەخناتون"دا بگرە خەتەنەکەری فەرمانڕەواییش هەبوو و منیش بەسەر کونتێکەری فەرمانڕەوایی لەقەڵەم دەدرام، بەڵام سەرکونتێکەری فەرمانڕەوایی ناونیشانی ڕوکەشی پزیشکی تایبەتی فیرعەون بوو و وابزانم لەنێو تەواوی کاربەدەستاندا تەنها من کارم دەکرد بۆئەوەی بەردەوام ئاگاداری تەندروستی و بارودۆخی فیرعەون بم، ئەو ڕۆژەی کاربەدەستان بەسەر کەشتیەکانەوە لە"تبس"ەوە هاتن، هەرئەوکاتە لە شاری"ئاسۆ"نزیك بونەوە، دەستیان کرد بەوتنی سرودی "ئاتون"ی خودای نوێ، بۆئەوەی خۆیان وا بنوێنن کە باوەڕیان بەو خودایەی فیرعەون هەیە.

دوای ئەوە تا ئەوکاتەی دروست کردنی خانووەکانی شاری"ئاسۆ" تەواو دەبێت لەو چادرانەی لەکەنار ڕوباردا هەڵخرابوون نیشتەجێ بون، لەهەمان ئەو شوێنەدا

دەیانخوارد و دەیانخواردەوە و چێژیان لەژیان وەردەگرت، چونکە وەرزی زستانی میسر بەتەواوی کۆتایی پێهات و وەرزی بەهار هاتوو و باڵندەکان دەیانخوێند.

کاربەدەستەکان ئەوەندە خزمەتکار و بەندەیان هەبوو کە تەنها شوێنی نیشتەجێبونی ئەمانە خۆی بۆ خۆی پێویستی بەشارێك هەبوو، چونکە نەیاندەتوانی بێ بەندە و خزمەتکار بژین، هەندێك لەمانە توانای ئەوەیان نەبوو دەستی خۆشیان بشۆن و دەبوو بەندەکان دەستیان بۆ بشۆرن، بەڵام هیچکات ئەو شتەی فەرامۆشیان نەدەکرد و بگرە پشتگوێشیان نەدەخست ئەوەبوو کە فیرعەون لەهەرکوێ بێت ئەوانیش لەوێ بن بۆئەوەی"ئەخناتون"چاوی پێیان بکەوێت و ناو و سەروچاویانی لەبیر نەچێتەوە.

کاتێك ئەمانە زانیان فیرعەون تامەزرۆی ئەوەیە ئەم شارە زووتر تەواو ببێت، دەستیان کرد بەکارکردن، خۆم بەچاوی خۆم بینیم کە هەندێك لەژنە چوانەکانی کاربەدەستان بەرِوتی لەسەر زەوی دادەنیشتن و خشتیان دروست دەکرد و هەندێك لەپیاوانی کاربەدەستیش لەوکاتەدا کە بەندەکان چەتریان بەلاسەریانەوە گرتبوو، بۆئەوەی خۆر لێیان نەدات و زیانیان پێ نەگەیەنێت، خشتەکانیان بەسەر دیوارەکانەوە لەسەریەك هەڵدەچنی، وەستا ڕاستەقینەکانیش زۆر بێزاربون لەم جۆرە وەستا ناشی و خۆنوێنانەبوو، چونکە ئەو کاربەدەستانە کاری وەستاییان نەدەزانی و خشتەکانیان بەشێوەیەك لەسەریەك هەڵدەچنی کە وەستا ڕاستەقینەکان ناچار دەبون ئەوەی کاربەدەستەکان ئەنجامیان داوە، بیڕوخێنن و سەرلەنوێ دروستی بکەنەوە.

بەڵام کاربەدەستەکان زۆر شانازیان بەکارەکانی خۆیانەوە دەکرد و هەموو ڕۆژێك کارە پینەکراوەکانیان پیشانی فیرعەون دەدا، بۆئەوەی تێی گەیەنن کە چەنێك ئەرکیان لەپێناو دروست کردنی شاری خودای ئەودا کێشاوە.

دوای چەند ڕۆژێك کاربەدەستەکان لەکاری وەستایی بێزاربون و بۆئەوەی کارەکەیان جۆرایەتی لەخۆ بگرێت دەستیان کرد بەدرەخت ناشتن و باخەوانی کردن، ئەوکات نۆرەی باخەوانەکان بوو کە لەتورەییاندا پەنا بۆ خودای میسری ببەن، چونکە هەرچی باخەوانەکان دەیانناشت کاربەدەستانی فیرعەون وشکیان دەکردن و نەمامە تازەکانیان لەناو دەبرد و جۆگەئاوەکانیان پڕ دەکردەوە.

باخەوان و درەخت نێژەکان نەیاندەتوانی بەئاشکرا ناڕەزایی خۆیان لەبەرامبەر کارەکانی کاربەدەستان و ژنەکانیان دەربڕن و پێیان بڵێن دەست لەکاروبارەکانی ئەوانەوە نەدەن و ئەوانیش بەڕوانگەی ئەوەی کە هاوکاری باخەوانەکان دەکەن، هەموو ڕۆژێك دەبونە مایەی دەردیسەری و زیانبەخشینی ئەوان.

بەڵام پیاوان و خانمانی کاربەدەستان لە گوڵ و درەخت ناشتنیش بێزاربون و شەوانەش مێروولەکان ئازاریان دەدان و بەرەبەیانان دەهاتن بۆلای من بۆ چارەسەکردنی پێستیان کە مێرولەکان هێرشیان بۆ بردبوون و داوای کەرستەی پێچانی برینیان لێدەکردم.

هەندێك لەوانە بەدزیەوە گەڕانەوە بۆ"تبس"بۆئەوەی لەخۆشگوزەرانی و ڕابواردنەکانی ئەویٚ بێبەش نەبن، هەندی لەوانەش نەیاندەتوانی بەدزیەوە بگەڕێنەوە بۆ"تبس"چونکە ئەوەندە خۆیان پیشانی فیرعەون دابوو کە ون بونیان سەرنجی فیرعەونی ڕادەکێشا، بۆیە بەمێروله و گەرمای ئەویٚ ڕاهاتن و خۆیان بەخواردنەوە و یاری "زار"ەوە سەرقاڵ دەکرد.

بەڵام خانوو و تەلارەکانی شاری"ئاسۆ"پێشکەوتنی بەخۆیەوە دەبینی، چونکە خانووەکان بەرز دەبونەوە و درەختەکان گەشەیان دەکرد و زەویەکانی دەرەوەی شار بەگیا بەسودەکان داپۆشرا.

من نازانم بوجەی دروستکردنی شاری"ئاسوی ئاتون"چەنێکە، بەڵام ئاگاداری ئەوەم کە تەواوی ئەو زێڕ و زیوەی کە فیرعەون لەپەرستگای خودای ڕابردوو بەدەستی هێنا لەدروستکردنی شاری"ئاسۆ"دا هەمووی خەرج کرد و بەتەواوی بەشی دروستکردنی ئەو شارەی نەکرد.

دەبێت ئەوەش بڵێین کە تەواوی زێڕ و زیوی"ئامون" نەکەوتە دەستی فیرعەون، چونکە کاهینەکانی پەرستگای خودای پێشوو، پێشبینی ئەوەیان کردبوو کە فیرعەونی میسر خوداکەیان لەناو ببات، بۆیە خەزێنەی ئاڵتونەکانیان، پێش ئەوەی شەڕ لە"تبس"دا بەرپا ببێت گواستەوە بۆ شوێنێکی تر.

خێزانی فەرمانڕەوایانی میسر بەهۆی گواستنەوەی فیرعەون بۆ شاری"ئاسۆ"بون بەچەند بەشێکەوە و شاژنی پێشوو بەواتا دایکی"ئەخناتون"کە بە"تی ئی"بانگ دەکرد، ڕازی نەبوو بەوەی لە"تبس"دەربچێت و کۆشکی جوانی فەرمانڕەوایی ئەو

شارانە بەجێ بهێڵێت، "ئامی" کاهینی مەزنی پەرستگای مەزنی"ئاتون" یش کە من لەم سەرگوزەشتەیەدا پێشتر باسم کرد، لە"تبس"دا مایەوە و وەك ڕابردوو ژیان بەسەر دەبات، دوای ئەوەی فیرعەون"تبس"ی بەجێ هێشت، هیچ گۆڕانکاریەك لەبارودۆخی دانیشوانی شاردا ڕوینەدا و تەنها گۆڕانێك کە لە"تبس"دا ڕویدا ئەوە بوو کە فیرعەون لە"تبس"دا نەمابوو.

بەڵام خەڵکی بۆ ڕۆشتنی ئەو زۆر دڵگران نەبون، بەڵکو ئەویان بەفیرعەونێکی درۆزن لەقەڵەم دەدا و وایان لێك دەدایەوە کە لەنەهامەتی شەڕەکانی ڕزگاریان بووە.

"نفر تی تی"شاژن کە ئەویش هاتبوو بۆ شاری"ئاسۆ" بۆ منداڵبون گەڕایەوە بۆ"تبس"، چونکە نەیدەتوانی چاوپۆشی لە هاوکاری خێڵە ڕەشپێستەکان بکات و بۆ جاری سێیەم کچێکی تری بوو و ناوی"ئانخز ئاتون"یان لێنا و سەری ئەو کچەش وەك سەری دوو کچەکە تری"نفر تی تی" درێژ بوو.

لەبەرئەوەی خێڵە ڕەشپێستەکان، بۆئەوەی"نفر تی تی"لەکاتی منداڵبوندا، بەئاسودەیی منداڵەکەی ببێت، سەری کچەکەیان لەسکی شاژندا دەگوشی بۆئەوەی درێژ ببێت.

خەڵکی پێش لەدایك بونی ئەو منداڵە ئاگاداری دەستەماڵی خێڵە ڕەشپێستەکان نەبون، درێژی سەری کچەکانی فیرعەونی میسر بەیەکێك لەموعجیزەکان دەزانی و وایان لێك دەدایەوە کە لەجۆری سەری یەکێك لە خوداکانی مەزنە کە دراوە بە یەکێك لەخانمەکانی میسر و گەمژەیی خەڵکی گەشتبووە ڕادەیەك کە دەیانویست سەری خۆیان وەك سەری شازادە خانمی میسر بکەن، لەبەرئەوەی دوای لەدایك بون ناتوانن سەریان درێژ بکەنەوە و وەکو سەرەتای لەدایك بون درێژ ناکرێتەوە، بۆیە قژێکی دەستکردیان دەکردە سەریان بۆئەوەی سەریان درێژ دەربکەوێت.

شازادە خانمەکان بۆئەوەی بیسەلمێنن کە درێژی سەریان سروشتیە، نەك دروست کراو، هەندێکات بێ قژی دەستکرد، بەسەری کەچەڵەوە ئامادەی کۆڕ و میوانداریەکان دەبون و شاعیران بۆ پیاهەڵدان بەسەر سەریاندا شیعریان دەنوسی و پەیکەرتاشەکانیش نمونەی سەری ئەوانیان لەپەیکەرەکانیاندا بەکار دەهێنا.

دوای ئەوەی سێیەمین کچی"نفر تی تی"لەدایك بوو شاژنی میسر لە"تبس"ەوە گەڕایەوە بۆ شاری"ئاسۆ"و لەوێ بەیەکجاری نیشتەجێ بوو، بەڵام ماڵی

هاوسەرەکەی لە"تبس"دا بەجێ هێشت، لەبەرئەوەی حەزی نەدەکرد هاوسەرەکەی لەوەزیاتر دەرگیری کاروباری ناومالْ ببێت و ئەو توانا کەمەی کەهەیەتی لەچاودێری کاروبارەکاندا بیانخاتە گەڕ.

خودی فیرعەونیش زۆر حەزی لەژنەکانی تر نەدەکرد و تەنها هەندێکات بۆ ئەنجامدانی ئەرکی ژن و مێردایەتی گرنگی پێدەدان، من دەمزانی کە ئەو"نفر تی تی" لەهەموویان زیاتر خۆش دەوێت، چونکە لەژنەکانی تری زۆر جوانتر بوو و دوای لەدایکبونی سێ مندالْ هێشتا بەجوانترین ژنانی ئەو مالّە لەقەلّەم دەدرا.

سەرەڕای ئەوەش"نفر تی تی"بەهۆی ئەم خۆشەویست بونەی خۆی بەقەرزاری ڕەشپێستەکان دەزانی، نەك جوانی سروشتی خۆی، جادوگەرەکانی ئەو وڵاتە وتبویانە ئەگەر پارێزگاری لەئیشقی هاوسەرەکەی بکات، ئەوا ڕۆژێك دێت دەبێتە خاوەنی کوڕێك.

شاری"ئاسۆی ئاتون"دوای سالّێك تەواو بوو و هەموو کەسێك بینەوەی ئاگاداری مێژووی دروست بونی ئەوشارە بێت، خۆی دەکرد بەوشارەدا و وای لێك دەدایەوە کە بەلایەنی کەمەوە دروستکردنی ئەم شارە ماوەی دە سالّی خایاندووە.

چونکە دارخورما و درختە سێبەردار و بەروبومیەکان لەپێشەوە هەلّکەلّنراوە و هێنراوە بۆ ئەم شارە و ناشتونیان، بەلاّم زۆرێك لەو درەختانە وشك بون، لەبەرئەوەش پێشبینی ئەوەیان کردبوو کە بەشێك لەو درەختەکانە وشك دەبن، ئەوەندە درەختیان هێنابوو کە شاری"ئاسۆی ئاتون" گۆڕابوو بەباخێك لەسێبەر و درەختی میوەدار، لەجۆگەلەکاندا ماسیە بچوکەکان مەلەیان دەکرد و مراویەکانیش بەلاسەری شارەوە دەفڕین و ئاسکە مالّیەکانیش لەمالّەکاندا لەناوەڕاستی گولْ و گیادا ڕایاندەکرد و لەمالّەکانەوە لەکاتی چێشت لێناندا بۆنی جۆرەها دەرمانی خواردن دەهات.

بەمشێوەیە شاری"ئاسۆی ئاتون"بەناوی"ئاتون"ی خودای تازەی میسر هاتە بون و کاتێك بۆ جارێکی تر وەرزی پایز هات و ئاوی ڕوباری"نیل"هەلّچوو، فیرعەون بڕیاری دا کە بەشێوەیەکی ئاشکرا ئەوشارە پێشکەشی خودای تازە بکات.

ماوەیەك پێش پایز ئەندازیار و کرێکارەکان چوار شێوە شەقامیان دروست کردبوو کە لەشارەوە بەهەرچوار لادا دەڕۆشت و لەکۆتایی هەریەك لەو جادانە پەیکەرێکیان لەخودای"ئاتون"دانابوو. ڕۆژێکیان فیرعەون لەگەلْ خێزانی فەرمانڕەوایان و

کاربەدەستان بەرەو لای ئەو پەیکەرەی کە لەبەشی باکوری ئەو شارەدا جێگیر بوو ڕۆشت و لەوێ بەڵێنی دا کە شاری"ئاسۆ"بە بەردەوامی بەشاری"ئاتون"بزانێت و تا ئەو کاتەی لەژیاندایە، ئەوێ بکاتە بەرەگای هەمیشەیی خۆی و دوای ئەوەی مرد لاشەکەی مۆمیا بکەن و لەو کێوەی کە دەکەوێتە ڕۆژهەلاتی ئەو شارەوە بنێژن.

بەرد تاش و ئەو وەستای دیوارانەی کە دەبوو گۆڕی فیرعەون دروست بکەن، لەبەرئەوەی دەیانزانی کە بۆ ماوەی چوار ساڵ لەو ناوچە شاخاویەدا نیشتەجێ دەبن، بۆیە لەگەڵ ژن و منداڵەکانیاندا ڕۆشتن و پێش ڕۆشتنیان فیرعەون پێی وتن:من حەزناکەم بۆ دروست کردنی گۆڕەکەم توشی ئازار و ئەشکەنجە بدەن و پەلە لەکارەکەتاندا بکە، چونکە"ئاتون"ی خودای من دەڵێت نابێت هیچ کەسێك ئازار بدەیت، ئێوە ئەگەر ڕۆژێك بۆماوەی سێ کاتژمێرکار بکەن، دوای چەند ساڵێك گۆڕەکەم ئامادە دەبێت، بۆیە هەوڵی ئەوە بدەن کە خواردنی زۆر بخۆن و خواردنێکی زۆریش بدەن بەژن و منداڵەکانتان بۆئەوەی قەڵەو و جوان بن، چونکە"ئاتون"جوانی خۆشدەوێت، جوانی دەبێتە هۆی ئەوەی خۆشەویستی لەنێوان خەڵکیدا دروست ببێت و نەتەوەیەك کە هەموو پیاو و ژنەکانی جوان بن چیتر کینە و ڕق نایەتە بون.

کاتێك فیرعەون بڕیاری دا گۆڕەکەی خۆی دروست بکات، وەجاخزادە و کاربەدەستانیش بڕیاری ئەوەیان دا یەکی گۆڕێك بۆ خۆیان دروست بکەن، ئەم بابەتە فیرعەون و کەسانی تری لەوە ئاگادار کردەوە کە پێویستیان بە "مردوخانەیەك" هەیە، بۆئەوەی لاشەی مردووەکان لەوێ مۆمیا بکرێن و هەرلەبەرئەوەش فیرعەون فەرمانی دا کە بەرجەستەترین مۆمیاکارانی"مردووخانە"ی"تبس" بهێننە شاری"ئاسۆ"وە.

فیرعەون دەیزانی کە ئەو مۆمیاکارانە لەشاری"تبس"و مردووخانەی پەرستگای "ئامون"دا دەژین، بەڵام ئاگاداری ئەوە بوو کە کرێکارێکی مۆمیاکردنی مردووەکان نە "ئامون"دەناسێت و نە"ئاتون"و ئەو کەسەش پیاوێکە کە هەموو تەمەنی لەمردووخانەدا بەسەر بردووە و خۆی بەبونەوەرێك لەقەڵەم دەدات کە نابێت بەمرۆڤ لەقەڵەم بدرێت، چونکە بەشێوەیەك خووی بەمردووەکانەوە گرتووە کە ئەویش وەك مردووەکانی لێهاتووە.

ئەو ڕۆژەی کرێکارانی مۆمیای شاری"تبس"سوار کەشتی بون و هاتنە شاری"ئاسۆ"وە خەڵکی لەحەیبەتاندا لوتی خۆیانیان گرت و خۆیان کردەوە بەماڵەکانیاندا، چونکە بۆنی تایبەتی ئەو کرێکارانە لەناو هەوادا بڵاو بویەوە و

خەڵکی هانی هەڵهاتن لەوشوێنە دەدا و تەنها من لەو بۆنە هەڵنەهاتم، چونکە ئەوەم هاتەوە یاد کە ڕۆژێك لەڕۆژان منیش وەك ئەوان بوم و لە"مردووخانە"دا کارم دەکرد.

پێش ئەوەی مۆمیاکەران بێن، لەکەنار شاری"ئاسۆ"دا مردووخانەیەکیان بۆ دروست کردبون و فیرعەون منی کردە سەرپەرشتی دروست کردنی ئەو مردووخانەیە، لەبەرئەوەی دەیزانی کە کاهینەکانی خودای"ئاتون"ڕقیان لەمۆمیاکەرانە، چونکە وایان دەزانی ئەمانە پەیڕەوی خودای ڕابردوو دەکەن و هیچ کاهینێکی"ئاتون"ئامادە نیە چاودێری دروست کردنی ئەو مردووخانەیە لەئەستۆ بگرێت.

من ئەرکی خۆم زۆر بەجوانی ئەنجام دا و سەرەڕای ئەوەی زانیاریەکی تەواوم لەبواری پزیشکیدا هەبوو، چونکە خۆشم لەمردووخانەدا کارم کردبوو و دەمزانی کە مردووخانەیەکی ئامادە پێویستی بە شتگەلێك دەبێت و لەمردوخانەشدا چەندین گۆماو و هەسێری مەزنم بۆ سوێراو دروست کرد و چەندین تەلارم دروست کرد بۆئەوەی مۆمیاکاران بۆ خاڵی کردنی هەناوی مردووەکان و پێچانی شریتی جەستەی مردووەکان توشی هیچ گرفتێك نەبن، هەروەها لەبەرئەوەی دەمزانی شوێنی نیشتەجێ بونی بەردەوامی کرێکارانی مۆمیا لەناو مردووخانەدایە، بۆ نیشتەجێبونیشیان بەپێی پێویست ژورم بۆ دروست کردن، لەبەرئەوەی لەشاری "ئاسۆ"دا خانویەکیشیان بۆ من دروست کردبوو، بۆیە منیش لەو شارەدا نیشتەجێ بوم و چیتر دوای ئەوە لەژیانمدا شتێکی ئەوتۆ ڕوینەدا کە سەرنج ڕاکێش بێت، چونکە لەوانەیە هەندێجار چەند ساڵێك بەسەر تەمەنی مرۆڤدا تێپەڕێت و دوچاری هیچ ڕوداوێکی سەرەنج ڕاکێش نەبێت، هەندێکاتیش لەماوەیەکی کەمدا ڕوداوگەلێکی زۆری بەسەردا ڕوودەدات، من ماوەی دە ساڵم لەشاری"ئاسۆ"دا بەسەر برد و لەم ماوەیەدا کارەکانم نەگۆڕبوو.

هەموو ڕۆژێك نەخۆشەکانم لەماڵی خۆمدا چارەسەر دەکرد و هەموو ڕۆژێك دەڕۆشتم بۆ کۆشکی فیرعەون و هەندێکات تەنها لەژیانی من و دانیشتوانی شاری"ئاسۆ"چەند شتێك ڕویدەدا کە زۆر لەوساڵە نەگۆڕانەی پێشوو گرنگتر بوو.

لەو ماوەیەی لەشاری"ئاسۆ"دا بوم هیچ زانستێکی نوێ بۆ زانیاریەکانم زیادی نەکرد، بەڵام سودم لەوشتانە وەردەگرت کە لەسەردەمی لاویەتیدا فێری بوبوم و وەك ئەو هەنگە وابووم کە لەزستاندا هیچ هەنگوینێکی تازە دروست ناکات، بەڵام ئەوەی لەسەردەمی هاویندا کۆی کردووەتەوە سودیان لێوەردەگرێت. بەدوری نازانم کە

لەماوەی ئەم دە ساڵەدا تێپەڕبونی کات گۆڕانێکی لەمندا هێنابێتە بون، چونکە کاتێك ڕۆژ و شەو یەك لەدوای یەك تێپەڕێت، وەك تێپەڕبونی ئاو بەسەر بەردەکاندا کاریگەری خۆی بەجێدەهێڵێت.

سەرەڕای ئەوەی ئاو پاك و نەرمە، بەڵام بەرد دادەتاشێت و سافی دەکات، هەروەها تێپەڕبونی کاتیش بەهەمان شێوەی ئاو مرۆڤ دەتاشێت و شێوەیەکی تری پێدەبەخشێت.

من بەهۆی زۆری تەمەنەوە قورستر و کەمتر بانگەشەم بۆ زانست و کارەکانی خۆم دەکرد و چیتر وەك سەردەمی لاویەتی شانازیم بە زانست و زیرەکی خۆم نەدەکرد، لەوانەیە ئەوەی منی ئاوا کێش قورس کردبێت ئەوە بێت کە"کاپتا"لێرە نەبوو بۆئەوەی بەردەوام پێم بڵێت کە تۆ پزیشکێکی مەزنی و دەبێت هونەری خۆت بناسێنی، بۆئەوەی ڕێز لەکارەکانت بگرن.

"کاپتا" لەشاری"ئاسۆ"نەبوو لە"تبس"بوو، لەوێ مەیخانەکەی خۆیو دارایییەکەی منی بەڕێوە دەبرد.

شاری"ئاسۆ"سەرەڕای ئەوەی بەشوێنی نیشتەجێبونی"ئەخناتون"ی فیرعەونی میسر لەقەڵەم دەدرا، بەڵام ئەو بەشێوەیەك ڕەفتاری دەکرد وەك بڵێی لەجیهانێکی جیاواز لەمیسر لەدایك بوو بێت، ڕەنگدانەوەی ڕوداوە جیهانی دەرەکی یەکان بەشێوەیەك دەگەشتە شاری"ئاسۆ" وەك تیشکی مانگ کاتێك بەشەو لەئاودا هەڵدێتو دوای ئەوە ئاوا دەبێت. بۆ فیرعەون شارەکانی تری میسر وەك ئەوە وایە کە هەربونی نەبێت، لەبەرئەوەی هیچ زانیاریەکی لەبارەی ئەو شارانەوە نەبوو، هەروەها نەیدەزانی کە لەشارەکانی تردا وشکەساڵی و کەمدەستی و ڕەنجی نەداری باڵی بەسەردا کێشاون، چونکە کاربەدەستەکان، هەرگیز ڕاستیەکانیان بە فیرعەون ڕانەدەگەیاند، چونکە دەیانزانی کە نابێت هیچ شتێك بەو بوترێت بۆئەوەی نەبێتە مایەی دڵتەنگی ئەو.

ئەگەر هەندێجاریش ناچار بوایەن شتێکی پێ بڵێن-چونکە دەیانزانی هیچ ڕێگەچارەیەکی تریان لەبەردەستدا نیە- بەشێوەیەك ئەو بابەتەیان لەشتە باش و جوانەکانەوە دەپێچا (بۆنمونە لەهەنگوین و گوڵ و دەرمانە بۆندارەکانەوە دەپێچا) تا فیرعەون پەی بە بەڕوداوە دەرەکیەکان نەبات، هەرلەبەرئەوەش ڕاستیەکانیان پێ نەدەوت، بۆئەوەی توشی سەرئێشە نەبێت.

شاری"تبس"لەلایەن"ئامی"کاهینی مەزنی پەرستگای"ئاتون"ەوە بەڕێوە دەبرا و فیرعەون هەموو ئەو شتانەی کە لە فەرمانڕەوایی و بەرپرسیاریەتیدا ناشیرینە، بۆنمونە باج و سەرانە وەرگرتن و جێبەجێکردنی دادپەروەری و بازرگانی لە"تبس"دا بەجێی هێشتبوو، بۆیە"تبس"وەك جاری جاران بەپایتەختی ڕاستەقینەی میسر لەقەڵەم دەدرا و شاری"ئاسۆ"ش بەپایتەختێکی کاتی لەقەڵەم دەدرا. "ئامی" خەزورەی"ئەخناتون"بوو بەواتا باوکی ژنەکەی بوو و فیرعەونیش متمانەیەکی تەواوی بەو هەبوو، کاهینی مەزنی"ئاتون"وەك پادشایەکی ڕاستەقینە لە"تبس"دا فەرمانڕەوایی دەکرد.

دوای ئەوەی خودای"ئامون" ڕوخا و لەناوچوو، چیتر هیچ هێزێکی دژ لەبەرامبەر فیرعەوندا بونی نەمابوو کە بتوانێت فەرمانڕەوایی"تبس"بکات.

هەر بەو بۆنەیەوە"ئامی"بەناوی خودای تازەو فیرعەون، فەرمانڕەوایی"تبس"ی دەکرد، لەهەمان کاتدا بێ دژ و بەرامبەر بوو.

"ئامی"وای دەزانی، لەبەرئەوەی خودای کۆن لەناو چووە و هێزێکی نوێ فەرمانڕەوایی میسر دەکات، چیتر نائارامی و پەشێوی دروست نابێت.

دەستەڵاتی"ئامی"بەڕادەیەك فراوان بوو کە هەموو کەسێك و هەموو شتێکی دەرگرتەوە، ئەگەر دوو جوتیار یان دوو کۆڵبەر ناکۆکیان لەگەڵ یەکدا هەبوایە، دەبوو ناکۆکیەکانیان لەڕێی کاهینی مەزن یان ژێردەستەکانی چارەسەر بکرایە و"ئامی"زۆر خۆشحاڵ بوو بەوەی فیرعەون لەشاری"ئاسۆ"نیشتەجێ بووە و ناگەڕێتەوە بۆ میسر، چونکە دەیزانی ئەگەر فیرعەون بگەڕێتەوە بۆ"تبس"گرفت و ناکۆکی بۆ دروست دەکات.

کاهینی مەزن، بۆئەوەی فیرعەون خۆشحاڵ بکات، بۆ ڕازاندنەوەی شاری "ئاسۆ"دیارگەلێکی گرانبەهای بۆ دەنارد و فیرعەون هەرچەندێك زێڕ و زیوی بۆ تەواوکردنی ئەو شارە تازەیە بویستایە، کاهینی مەزن بۆی دەنارد.

"هورم هب" فەرمانڕەوایی"ممفیس"ی دەکرد و ئاسایش و ئارامی وڵاتی دەپاراست، هەروەها"هورم هب" هێزی ئەژنۆی هەموو باجکۆکەرەوەیەك بوو کە دەڕۆشت بۆئەوەی باج لەخەڵکی وەربگرێت، هەروەها بەزۆری بازوی هەموو بەردتاشێك لەقەڵەم دەدرا کە ناوی "ئامون"ی لەسەر پەیکەر و پەرستگاکاندا پاك دەکردەوە و لەجێگەکەیدا ناوی"ئاتون"یان دەنوسی.

فیرعەون فەرمانی دابوو بگرە گۆڕی باوکیشی بکەنەوە و ناوی"ئامون" لەناو ژوری مۆمیاییەکەیدا بکوژێننەوە و لەباتیدا ناوی"ئاتون"بنوسن. کاتێك گۆڕی باوکی "ئەخناتون"هەڵدرێتەوە بەدڵنیاییەوە گۆڕی کەسە ئاساییەکانیش هەڵدەدرێتەوە و ناوی "ئامون"یان دەکوژاندەوە بۆئەوەی لەجیاتیدا ناوی"ئاتون"بنوسن.

کاتێك ویستیان ناوی"ئامون"لەسەر گۆڕەکان پاك بکەنەوە و ناوی"ئاتون"بنوسن، سەرەڕای ئەوەی ڕێپێنەدراو بوو لەمیسردا گۆڕەکان هەڵبدرێنەوە، بەڵام "ئامی"هیچ ڕێگریەکی لێ نەکردن.

لەبەرئەوەی ئەو کەسێکی هۆشیار بوو و دەیزانی تا ئەوکاتەی فیرعەون جەنگی لەگەڵ مردووەکاندا بەرپا کردووە،ئەوا ئەم دەست تێوەردانەی ئەو هیچ هەڕەشەیەك لەزیندووەکان ناکات و مرۆڤ دەبێت گەمژە بێت کە ڕێ لەهێرشی فیرعەون بگرێت دژی مردووەکان و ئەو لەخۆی برەنجێنێت.

دوای جەنگی ناوخۆی"تبس"لەنێو لایەنگرانی خودای کۆن و خودای تازەدا کە پێشتر باسمکردن، وڵاتی میسر بۆماوەیەك هێمن و ئارام بوو و"ئامی"کاهینی مەزن کۆکردنەوەی باج و سەرانەی بە خوێندکاران سپاردبوو و ئەوانیش لەڕێی کۆمەڵێك خوێندکاری بچوکەوە، سەرانەیان لەخەڵکی دەسەند و دوای هەر ماوەیەك وەرگرتنی سەرانە، باجدەرە هەژارەکان کە بەپێی یاسای گشتی لەباجدەرە دەوڵەمەندەکان فشارێکی زیاتریان دەکەوتە سەر، بۆیە خۆڵەمێشان دەکرد بەسەری خۆیاندا و جلی بەریان هەڵدەدڕی بۆئەوەی سۆزی کاربەدەستان بەلای خۆیاندا ڕاکێشن، بەڵام هیچ کەسێك گرنگی پێنەدەدان، چونکە تەماشاکردنی پیاوێکی هەژار کە گرفتاری ستەمی کاربەدەستانی باج و سەرانە وەرگرە، بەڕادەیەك ئاساییە کە هیچ کەسێك دڵی بۆ ناسوتێت.

هەروەها دوای سوڕی وەرگرتنی هەر باج و سەرانەیەك خوێندکارانی باج وەرگر، لەساڵی ڕابردوو دەوڵەمەندتر دەبون و ئەمەش ڕەگ و ڕیشەیەکی کۆنی هەیە کە بەهیچ شێوەیەك چارەسەر ناکرێت، تا ئەوکاتەی ئەم جیهانە بمێنێت باج و سەرانەش لەخەڵکی وەردەگیرێت، کاربەدەستانی وەرگرتنی باج و سەرانەش بەزیانی حکومەت یان خەڵکی دەوڵەمەند دەبن و تەنها بەیەك شێوە دەتوانرێت ڕێ لەدەوڵەمەندبونی کۆکەرەوانی باج و سەرانە بگیرێت، ئەویش ئەوەیە کە ئەم سیستەمی باج و سەرانەیە لەبنەچەوە نەمێنێت، ئەمەش شتێکی مەحاڵە.

لەشاری ئاسۆدا"نفر تی تی"شاژنی میسر چوارمین کچی بوو، لەدایك بونی کچی چوارەم، بەدبەختیەکی زۆری لەگەڵ خۆیدا هێنا، کە ئەو بەدبەختیەی لەئەنجامی ڕاپەڕینی سوریا-بەشێوەیەك کە لەداهاتوودا بەوردی باسدەکرێت- لەگەڵ خۆیدا هێنابوی بەتەواوی فەرامۆش کرا.

"نفر تی تی"دوای ئەوەی چوارەمین کچی بوو، هەموو کەسێکی بەوە تاوانبار دەکرد کە جادوویان لێکردووە و هانی ئەوەیان داوە کە کچێکی تری ببێت، بۆیە ڕۆشت بۆ"تبس"بۆئەوەی داوای هاوکاری لە جادوگەرانی ڕەشپێست بکات، بۆئەوەی ئەوان کاریگەری جادووی کەسانی تری بۆ پوچەڵ بکەنەوە.

ئێستا ساڵی ١٣٦٤ سەدەی چواردەیەمی پیرۆزی ئیسلامە و لەوباوەڕەدا نیم کە تا کۆتایی ئەم سەدەیە، لەبازاڕی وێژە"ئەدەب"ی جیهاندا کتێبێك بڵاو بکرێتەوە کە لەڕوی مێژووی دێرینی وڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و لێکدانەوەی کۆمەڵایەتی و دەروننانسی ئەو مێژووەوە، بتوانێت لەبەرامبەر ئەم کتێبەدا کە "١٣٥٠ ساڵ پێش لە دایکبوونی مەسیح" نوسراوەتەوە بوەستێت.

ئێمە ئەم مێژووە لەسەرەتای دەسەڵاتی زنجیرەی نۆزدەیەمی فیرعۆنەکانی میسرەوە دەرمانهێناوە و بەشێوەیەك کە"سینۆهە"نوسەری ئەم کتێبە باسی دەکات شەش ساڵ دوای دەستپێکردنی دەسەڵاتی ئەو پیاوە لەمیسردا دور دەخرێتەوە و دەست بەنوسینی ئەم کتێبە دەکات و بۆئەوەی ئێمە دوچاری هیچ هەڵەیەك نەبین مێژووی نوسینی ئەم کتێبە لەساڵی١٣٥٠ی پێش زاین، کە بەساڵی فەرمارەوایی و دەسەڵاتی زنجیرەی نۆزدەیەمی فیرعەونەکانی لەقەڵەم دەدەین و ئاشکرایە بۆ بەدەست هێنانی مێژووی ڕاستەقینەی سەرەتای نوسینی ئەم کتێبە دەبێت ماوەی شەش ساڵ لە مێژووی هاتنە سەر تەختی ئەو پیاوە کەم بکەینەوە.

خوێنەرانی ئەم کتێبە ئیتر چ لاو بن یان بەتەمەن، سود لەخوێندنەوەی ئەم مێژووە دێرینە وەردەگرن کە لەهەمان کاتدا هەوێنێکە لەهەڵسەنگاندن و شیکردنەوەی کۆمەڵایەتی و دەرونی.

بەڵام ئەگەر لاون من ئەوەتان پێ ڕادەسپێرم دوای خوێندنەوەی، ئەو کتێبە لەدەست نەدەن و لەلای خۆتان هەڵی بگرن و بیپارێزن، بۆئەوەی کاتێك تەمەنتان گەشتە شەست ساڵی یان زیاتر، سەرلەنوێ ئەم کتێبە بخوێننەوە و لەوکاتەدا هونەری"سینوهە"نوسەری ئەم کتێبەتان جوانتر بۆ دەردەکەوێت و زیاتر پەی بەلێکدانەوەی کۆمەڵایەتی و دەرونی ئەم کتێبە دەبەن.




لەبڵاوکراوەکانی خانەی چاپ و پەخشی ڕێنما

نرخ (6500) دینار